# ناوەرۆک

# قسەیەك دەربارەی كۆمەڵگای ترس

### وەرگێڕانی لە فارسییەوە ڕێبین هەردی

تێکەڵەیەکی سەیرە ئەم گەلی عێراقە یان بەلانیکەمەوە ئەو بەشەی گەلی عێراق کە لەسەر شانۆکە دەردەکەوێت. ڕێکەوتنامەی ١٩٧٥ی جەزائیر ئیمزا دەکرێت خەڵکی دەڕژێنە سەر شەقامەکانو لەبەستنی ئەو ڕێکەوتننامەیدا سەما بۆ لێهاتوویی سەرکردە دەکەن... سەدام حسێن ڕێکەوتنامەی جەزائیر هەڵدەوەشێنێتەوە، دیسانەوە هەمان کۆمەڵ بۆ سەماو هەڵپەڕکێ دەڕژێنە سەر شەقامەکان، عێراق هێرش دەکاتە سەر ئێران، ئەو خەڵکە بە سەماو شایی‌و هەڵپەڕکێوە دەچنەوە سەر شەقامەکان، شەڕ ڕادەوەستێت دیسان شەقامەکانی عێراق دەبنەوە بەشانۆی سەماو هەڵپەڕکێی ئەو خەڵکە. عێراق کوەیت داگیر دەکات خەڵکی سەرقاڵی سەماو هەڵپەڕکێی خۆیان دەبن، عێراق بەوشێوە ئابروبەرانەیە! لەکوەیت دەکرێتە دەرێ‌و دیسان خەڵکی سەما دەکەنەوە...

بەراستی بۆچی خەڵکانێك بەمشێوەیە ڕەفتاردەکەن؟ بۆچی لەبری هەوڵدان بۆ ڕوخانی ڕژێمەکەیان، بەردەوام پشتیوانی لێدەکەن؟ بۆچی لە ساوێلکەبوونو جوڵە توتیوار بوونەکانی خۆیان تێناگەنو پەشیمانو شەرمەزار نابن؟.

نوسەری ئەم کتێبە بەدروستی دەڵێت هۆی هەموو ئەو ڕەفتارانە یەك شتە: ترس لەعێراقی بەعسدا (عێراقی پاش کودەتاکەی ساڵی ١٩٦٩) شێوەیەکی دەزگایی وەرگرتووە. خەڵکی عێراق دەترسن، لەهەموو کەس‌و هەموو شتێك تۆقیوون، باوك لە منداڵەکانی، مێرد لە ژنەکەی تۆقیوەو برایانو خوشکان لەیەکتری دەترسن، چونکە ڕژێمی بەعس ترس‌و تۆقاندنی لەناو دەرونی تاکەکاندا وەك دەزگایەکی بەردەوامو





هەمیشەیی جێکردۆتەوە.

ئامێری جەنگی عێراقی بەعسی دەستدرێژیکەر، لەگەڵ ئەوەی ملیۆنێك خەڵکی لەوجۆرەی بەخزمەت گرتووە (یان بەکارهێناوە)، بەڵام لە ڕوبەڕوکردنەوەی ئەو خەڵکانە لەگەڵ سەربازە جەنگاوەرەکانی ئێراندا تۆقیبوو. بەبڕوای نوسەر هۆی ئەم تۆقینە ئەوەبوو، گەر سەربازە تۆقیوەکانی عێراق (تۆقیوو لە ڕژێمی بەعس) لەبەرامبەر هێزێکی بەهێزتر لە بەعس ڕابوەستن، ترسیان لەڕژێمی بەعس بەجارێك نامێنێت‌و لەبەرامبەر هێزە تازەکەدا چۆك دادەنو دەسەڵاتی بۆشی سەدامیش لێکهەڵدەوەشێتەوە. ئەمە هەمان ئەو خاڵەیە کە بەعس پێشوەخت لێی دەترسا. ڕژێمی عێراق کە لەسەرکوتکردنی نەیارە ناوخۆیەکاندا (ئاشوری، کورد، شیعە، کۆمۆنیست) بەشێویەکی دەسەڵاتاوی ڕەفتاری دەکرد، بەتەواوەتی لەبەرامبەر جەنگاوەرە ئێرانیەکاندا تەسلم دەبوو، تەنانەت بۆ یەك کاتژێریش بەرامبەر هێزەکانی ئەمەریکاو هاوپەیمانان خۆی نەگرت‌و بەشێویەکی ئابروبەرانە نەك هەر پارێزگاکانی باشوری عێراق ـ واتە کوەیت ـ ی بەجێهێشت، بەڵکو بەشێوەیەکی بەرکارانە دەیبینی چۆن لەلایەن ئەمەریکاو هاوپەیمانانەوە بەشێك لەوڵاتەکەی داگیردەکرێ، بێئەوەی قسەیەك بکات.

**پشیلە شێرە لەگرتنی مشکدا**
**بەڵام مشکە لەبەرامبەر پڵنگدا**

بەقسەی نوسەری ئەم کتێبە، سوپای سەرفرازی عێراق لەسەرەتای سەربەخۆیی ئەم وڵاتەوە (١٩٣٦)، سەرجەم شانازیەکانی لەسەرکوتکردنی نەیارە ناوخۆییەکانەوە بەدەستهێناوە، نەك لە ڕوبەڕوبونەوەی ئیسرائیل کە لە سەرەتای پەیدابونیەوە بەدوژمنی ژمارە یەکی نەتەوەی عەرەب بەگشتی‌و گەلی عێراق بەتایبەتی، لەقەڵەمدراوە.

کەواتە گەر دەبینین سەرەڕای ئەو هەمو زیانە مرۆیی‌و مادییانەی عێراق لەجەنگی ئێرانداو سەرەڕای لەناوچوونی دەزگا ئابوری، سەربازی، کلتوری‌و کۆمەڵایەتیەکانی وڵات لە شەڕی کەنداوی فارسدا، دیسانەوە هەر ڕژێمی بەعس مایەوەو گۆرانی حەماسی بۆ خەڵکی بێ دەسەڵاتی وڵات دەچڕێ‌و بەخەیاڵێکی ئاسودەوە نەیارە ناوخۆییەکانی ـ بە بیانوی تابوری پێنجی ئێران ـ سەرکوتدەکات، لەبەرئەوە نیە

خەڵکی عێراق بەعسو سـەدامیان خۆشـدەوێت یان پشتیوانی لێدەکەن (چونکە لەو حاڵەتـەدا دەبـێ گومان لە زیرەکی سیاسـی ئـەو خەڵکە بکەین)، بەڵکو ئەو ترسـە قوڵەی بەدرێژایی بیستو چەند ساڵی رابردوو لەناو تانوپۆی دەرونی نەوەی هەنوکەی عێراقدا رەگیداکوتاوە، لەگەڵ لەناوچونی هەر جۆرە جێنشـینێکی سیاسی لە بەرامبەر حیزبی بەعسی عێراقدا، بۆتە مایەی ئەوەی بەعس سەرەڕای بەرهەمهێنانی ئەو هەموو کارەسـاتانە، لە گەزەندی روداوکان بەزیندووی بێتە دەرێو درێژە بەسـەرکوتکردنی خوێناوی نەیارەکانی بدات.

کتێبەکـە باس لەشـێوەی زەمینەسـازی حکومەتی بەعس دەکات لە سـەردەمی حوکمـی پاشـایەتی بنەماڵەی هاشـمیدا. تیوریسـتە ناسیۆنالیسـتەکانی وەك سـاتع حەسـری نەوەیەکیان پەروەردەکرد، کە چوارچێوەیەکی گونجاوی بۆ حیزبی بەعسو سیاسەتەکانی پێکدەهێنا. بەعس بە باشی سودی لە سۆسیالیزمو ناسیۆنالیزمی عەرەبی (یان یەکێتی عەرەبی)و کێشـی ئەم وشـانە لە جیهانی عەرەبیدا وەرگرتووە. هاوکات لەگەڵ سود وەرگرتنێکی بەربڵاو لە هێزی پۆلیسو سەرکوتکردنو توندونیژی رووت، بۆ لەناوبردنی نەیارەکانی، لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتیو کلتوریشدا زەمینەی حکومەتێکی بێ کێشەو دەردەسەری خوڵقاند: حکومەتێك لەسەر بناغەی ترسو تۆقاندنی ئاوێتە بە رەزامەندی دروستبوو. نوسەر بەدروستی دەڵێت بەعسیەکان دەزگای سوپایان لەرووی چەندایەتیو ئەندازەوە بەهێزکرد، بەڵام ئاسـتی چۆنایەتیان دابەزاند. سوپا دەستەمۆی پۆلیسـی نهێنیو دواجار ملکەچی خودی کەسـایەتی سـەدام حسێن بوو. کەواتە بە بوونی سـوپایەکی بەهێزو بەبەعسیکراو، هیچ ئومێدێك نیە بۆ ئەوەی رژێم لە رێگەی کودتاوە بگۆڕدرێت. بەرپابوونی شۆڕشێکی جەماوەریش وەك ئەوەی ساڵی ١٩٧٩ لە ئێران رویدا، لەبەرهەمان ترسـی بەدەزگایی کراو مومکین نابێت، چونکە بەرپابوونی شـۆڕش سـەرەڕای هۆکارەکانی دی، بە ئاپورەی خەڵکیەوە بەستراوەتەوە کە مردنو کوژران لەرێگەی ئامانجێکدا بەفەزیڵەت دەزانن، ئەمە لە کاتێکدا لەسایەی لە رژێمی بەعسدا کەمتر تاکی عێراقی مردن لەپێناوی ئامانجێکدا بە فەزیڵەت دەزانێتو بەگشتی چەندان ساڵە تاکی عێراقی هیچ ئامانجێکی نیە. لەسەردەمی رژێمی پاشایەتی عێراقدا



گەر کەسـێك لەبەر هۆی نەیاری سیاسـی لەگەڵ رژێمـدا بکوژرایە، وەك قارەمانو شەهیدی جەماوەر دەردەکەوت، بەڵام لە سایەی رژێمی بەعسدا بەمشێوەیە نیە، هیچ کوژراوێك نابێت بەقارەمان، چونکە ئەوەندە کوشـتن زۆرە، تەنانەت بەبیرهێنانەوەی ناوەکانیشـیان لـەرووی پراکتیکیەوە مومکین نیە. جگە لەمـەش مردن لە گومناویدا تەنانـەت ئـەو ئیمتیازەی لە قوربانی سـەندەوە، چونکە جگە لە کەسـە نزیکەکانی قوربانیەکە هیچ کەسـێکی دی ئاگای لە قەنارەدانی نیە. دەوڵەت خۆی قوربانیەکان دفـن دەکاتو پاشـان خێزانەکانیان ئـاگادار دەکاتەوەو رێگەش نادات پرسـەی بۆ دابنرێت. ئەگەر لەسـێدارەدانەکە بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەنجامبدرێت، ئیدی ئەوەندە لە مەراسـیمی لەسـێدارەدانەکەدا کاروانی شادی دەگێردرێتو دەسـتوپێوەندەکانی بەعس ئەوەندە سەماو هەڵپەڕکێ دەکەنو دەهوڵو زوڕنا لێدەدەن، کە رەنگە خودی قوربانیەکەش بکەوێتە گومانەوەو نەك هەسـت بە قارەمانێتی نەکات، بەڵکو لەبەردەم ئاپۆڕەی خەڵکی شـادو سەماکەردا، هەست بە پەشیمانیو شەرمەزاری بکات. بەڵێ حیزبی بەعس بەم هەنگاوانەی تەنانەت شانازی قارەمانبوونیش لە قوربانیانو نەیارانی سیاسی خۆی دەسێنێتەوە.

نوسـەر پێشـبینی ئەوە دەکات کە بە وردبونەوە لەئایدۆلۆژیـای بەعسو پێکهاتەو ماهیەتی دەسەڵاتی رژێمی عێراقو ریسکخوازی بەرپرسانی بەعسو بەتایبەتی سەدام، وڵات بەرەو کارەسـاتێکی گەورەتر لە کارەسـاتی جەنگی ئێـران پەلکێش دەکرێ، رەنگـە لەو حاڵەتـەدا رژێمی بەغـداد لەناوبچێتو بەرگریکارانـی ناوخۆی بەعس، بەشـێوەییەکی شەرمەزارانە رەفتاری پێشوی خۆیان ئاراستە بکەن. بەشی کۆتایی ئەم پێشبینیە تاهەنوکە راست دەرنەچووە، بەعسی عێراق بەرابەرایەتی سەدام حسێن پاش تێکشـکانە ئابروبەرەکەیان، هێشـتا (لانیکەم لەگەڵ خەڵکی بێ چەك و پشتوپەنادا) بەهەمان زمانی باوی تفەنگو توندوتیژیو سەرکوتکردنەوە قسەدەکەن[1].

(1) کاتێك وەرگێڕە فارسـیەکە ئەم کتێبەی وەرگێڕاوە، سـەدام حسێنو رژێمەکەی حوکمیان دەکرد، بەڵام هەنوکە کە ئەم کتێبە بەکوردی دەکەوێتە بەردەسـتی خوێنەر، ئیدی خوێنەر بۆی دەردەکەوێت کە کەنعان مەکیە لە دوا تێبینیشیدا راستی کردووە.

شێوازی دەسەڵات گرتنەدەستی رژێمی بەعس، ماهیەتی رژێمو ئایدۆلۆژیا باڵادەستەکەی، پەیدابوونیو گۆڕانی دەزگاکانی ناچارکردنو توندوتیژیو ترسو تۆقاندن، شێوەی هەڵوێستی بەعسیەکان لەگەڵ کەمایەتیە نەتەوەیی، زمانی، دینیەکان، رۆڵی رابەرایەتی سەدام (رابەرێك کە چالاکی سیاسی سەردەمی هەرزەکاری، بە تیرۆرکردنی خاڵی خۆی سەعدون ناسری دەست پێکرد)، پێوستی داتاشینی دوژمنێکی ترسناك (ئەگەرچی خەیاڵی)ی دەرەکی کە بە بەهانەی دژایەتیکردنیەوە، نەیارانی سیاسی ناوخۆ وەك تابوری پێنجەمی بێگانە سەرکوتبکات، ناسیۆنالیزمی عەرەبیو بەعسی عێراق، شۆڕشگێڕێتی زارەکیانەی حیزبی بەعس، روخساری لێکچونی هیتلەریسم، ستالینیزم لەگەڵ رژێمی بەعسی عێراق، هۆیەکانی دەستدرێژیکردنی عێراق لەجەنگی ئێراندا، پەیوەندی بەعس بەجەنگو توندوتیژیو سەرکوتکردنەوە، گۆڕینی سوپا لە حاڵەتی دەزگایەکی بەهێزو چارەنوسسازەوە بۆ دەستکەلایەکی سەدامو... زۆر شتی تر بەدورودرێژی لەم کتێبەدا باسکراوە.

هەڵە، کەموکوڕیو لادانەکانی کتێبەکە لەباسکردنی زۆر مەسەلەدا، لەوانەش باسکردنی مەسەلەکانی ئێران کەم نینو رەنگە ئەگەر کتێبەکە بۆ خەڵکێکی دی وەربگێڕدرایە، پێویستی بە پەراوێزدانانی زۆر بکردایە، بەڵام بە لەبەرچاو گرتنی تێگەشتنی بەرزی سیاسی خوێنەرانی ئێرانی، بەتایبەتی لەو مەسەلانەدا کە پەیوەندی بە عێراقو ئێرانەوە هەیە، رونکردنەوەو پەراوێزدانانی لەمچەشنە بە زیادە دەزانرێت.
لەکۆتاییدا خراپ نیە ئەوە بەبیر بهێنینەوە کە نوسەری کتێبەکە ـ دانیشتوی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا - لە چالاکی دەرەکیانەی پۆلیسی نهێنی عێراق نیگەران بوە، بۆیە ناوی راستەقینەی خۆی شاردۆتەوە[2]، پێویستیەك کە وەرگێرەکەی لەبارەی خۆیەوە بە پێویستی نازانێت.

**ئەحمەد تەدین**

(2) وەرگێڕی فارسی کاتێك ئەم کتێبەی وەرگێراوە نوسەرەکەی ناوی نهێنی سەمیر خەلیلی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو. دواتر لەگەڵ روخانی رژێمدا هەمو زانیمان سەمیر خەلیل هەمان نوسەری لیبرالی عێراقو عەرەب کەنعان مەکیە بوو.

# قسەیەك لەگەڵ خوێنەردا

خوێنەری ئازیز، ئەم کتێبەی بەردەستت لێکۆڵینەوەیەك نیە لەسەر حیزبی بەعسو رژێمەکەی کە لە دوای ساڵی ١٩٦٨ەوە بەتەواوەتی لە عێراق سەقامگیر بو، بەڵکو هەڵوەستەو روانینە لە ماناکانیدا. بێگومان گەلێك شێوازیش بۆ ئەو هەڵوەستەو بەدیهێنانی ئەو روانینە هەیە. لەم نوسینەدا هەوڵو کۆششەکانی خۆمم لەسەر ئەزمونەکانی پێش هەڵگیرسانی جەنگی عێراق ئێران چڕکردۆتەوە، کە رەگوریشەی لە توندوتیژیو ئایدیالە باڵاکاندا رۆچوبو، بۆیە من لە رێگەی توندوتیژییەوە لە حیزبی بەعس دەنوارم، چونکە دڵنیام ئەمە گرفتێکی راستەقینەو سەرەکیە کە لە ئایندەیەکی نزیکدا روبەروی ئەم وڵاتە کڵۆڵە دەبێتەوە، هەروەها پێشداوەری من لەسەر ئەم کارە رەنگە راڤەکردنی تایبەتی لەسەر بەعسی عێراق لێبکەوێتەوە. دەشێت تا رادەیەك لەبەر رۆشنایی راستیو بیروڕا بەکارهاتوەکان داوەری لەسەر دروستی ئەم راڤەکردنە بکرێ، لەلایەکی دی، پێویستە پشت بە بەهای هاوێنەو سەلامەتیو توانای وەرگرتنی ببەسترێت، لەمەشدا مەبەستم ئەوەیە چۆن لە روداوەکان دەڕوانمو ئەوانی دی تا چ ئاستێك نرخی بۆ دادەنێنو رەزامەندی لەسەر دەردەبڕن، بەتایبەتی ئەوانەی بەشێوەیەکی راستەوخۆ دەست نیشانم کردونو لەسەر دەستی ئەو حیزبە زیانیان لێکەوتوە.

گریمانە گشتیەکانی من سەبارەت بە رەفتاری سیاسی پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بەو بەڵگەو سەلماندنانەوە هەیە کە بەکارمهێناوە، هەروەها لەگەڵ ئەو فاکتو بەڵگانەی بۆ پشتگیری لێکردنی بەکارهاتوە.

**یەکەم:** تێفکرینو بیروڕای ئاشکرای سەرکردەو حیزبو هاوڵاتیان دەربارەی کاروباری سیاسی، ئەوانەی وتەکانیان بەتەنها گوزارشت لە راستییەکی ترسناك ناکات، بەڵکو بەشێکە لە راستیو واقیع، نەك خەیاڵ پێکدەهێنێت. هەمیشە کێشەکە لە هاوئاهەنگی نێوان وتەو کردارەکاندا دەمێنێتەوە، بۆیە بەرەئی من

بەشـێك لەو سەرچاوە زانیاریانەی لەسـەر حیزبی بەعسی عیراق، پشتگوێ خراوە، دەتوانرێ لە گوتار، بەرنامەی سیاسی حیزبو وتەی سەرجەم تیوریستو ئایدیۆلۆجیا دروستکارەکان بەدیبکرێ.

**دووەم:** سەرباری ئەوەی سەرکردەو دەوڵەتمەدارانی بەعس لە گوتارە بێناوەرۆکەکانیاندا پەنا بۆ درۆو گومڕایی دەبەن، بەڵام زۆربەی جار شتێك دەڵێن کە مەبەستیانە، زۆر بەوردی دەزانن چی دەڵێنو ئەوەی مەبەستیانە دەیڵێین.

**سـێیەم:** مـن خۆم لە هەمو جۆرە دیدێکـی پیلانئامێزی مێژوویانـە بەدوور دەگرم، بەتایبەتـی ئـەو کارانەی پەیوەندی بە رۆژئاواوە هەبێتو زیاتر جەخت لەسـەر دوو دیـدی دژ بەیـەك دەکەمەوە، لەلایەکەوە، روانینی تاکی ئاسـایی عیراقی دەربارەی گەورەیی دەسـەڵاتی نەفرەتئامێزی رۆژئاوا، لەلایەکی دی، کەمبونەوەی دەسەڵاتی رۆژئاوا لەسەر روداوەکانی ناوخۆی عیراق لەم قۆناغەدا.

**چوارەم:** ناکرێ ئەو ئاراستە سیاسیانەی لە رابردودا باوبون، لە ئایندەدا بەردەوامبن، هـەر چەندە هەمو هۆکارەکانیش وەك خۆیان بمێننـەوە. چونکە خەڵکی فیکریان دەگۆڕێتو دوا بەدوای ئەوەش رەفتاری سیاسـیان گۆڕانی بەسـەردا دێت. لێرەدا لێکۆڵینەوە لەسـەر پرۆسـەی گەشەسـەندنی مێژوو ناکەمو خۆم بەزانستی پوچەوە سەرقاڵ ناکەم، بۆیە پێویست ناکات هیچ شتێك پەیوەندی بەسەقامگیری ئایندەی حیزبی بەعسـەوە هەبێت بۆ ئەم کتێبە بگێردرێتەوە. ئەگەر سـبەینێ عێراق بە هۆی جەنگەوە لەبەریەکهەڵوەشـێتەوە، دیسـانەوە خەڵکی عێراق روبەروی ئەم مەسەلەیە دەبنەوە، چ هۆکارێك بوە مایەی ئەوەی رژێمی بەعس لە ساڵی ١٩٨٠دا ببێت بە تواناترینو سەقامگیرترین رژێم لە مێژووی هاوچەرخی عێراقدا.

هەر کەسـێك بیەوێت لێکۆڵینەوە لەسـەر مێژووی دوای سـاڵی ١٩٦٨ی عێراق بـکات روبەروی کەمی زانیاریو داتا دەبێتەوە. سـەرچاوەی ئـەم کەمی زانیارییەش دەگەڕێتەوە بۆ رەفتاری رەسـمی کە بەناوی پاراسـتنی ئاسایشی نەتەوەییەوە خەیاڵو گومان دەوروژێنێ. ئەم کتێبەش لە لێکۆڵینەوەی دەزگاکانی لەبابەت دەزگای پۆلیسی نهێنـیو سیاسـەتی تۆقاندن زیاد لە پێویسـت لە نوسـراوەکانی دی لەگەڵ ئەوجۆرە



گرفتانە دەست بەیەخە بوە. بۆ ئەوەی لەم بوارەدا شتێك بکەم، هەمو سەرچاوەکانم رونکردۆتـەوە، هەروەهـا پێم باش بوە هیچ حەکایەتێك، چەنـد بچوك بێت، یا ئەو واتەواتانەی دەماودەم دەکات، پشتگوێ نەخەم. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی عێراقی بەعـس، هێندێك جار ناوەرۆکی راسـتەقینەی حەکایەتێکی تایبەت، ئەگەر هێندەش گرنـگ نەبێـت، بەڵام لەو رووەوە کـە خەڵکی ئەو حەکایەتە وەك راسـتییەك قبوڵ دەکەن، گرنگی پەیدا دەکات، ئەم کارەش زۆر ترسـناکە، چونکە ئاکامو پاشـهاتی شەخسی هەیە.

لە پاڵ ئەوەشـدا ئەو ترسە لقو پۆی شەخسـی زۆری لێدەبێتەوە کە رەنگدانەوەی لەسـەر رەفتـاری خەڵکانی دی دەبێت، هـەر ئەمەش واملێدەکات لە نوسـینی ئەم کتێبـەدا، خـۆم بەقەرزاری دۆسـتەکانم بزانم کـە ژمارەیان لە ژمـارەی پەنجەکانی دەست تێناپەڕێت، لەبەر ئەوەی لە عێراقی بەعسدا ئاراستەی کاروبارەکان بەم شێوازە بەڕێوەدەچێـت، بۆیە ناتوانم ناویان ئاشـکرا بکەم، چونکە مەترسـی لەسـەر ژیانیان دروست دەکات، هەروەها لەبەر هەمان سۆنگەش ناتوانم ناوی خۆم ئاشکرا بکەم.

**کەنعان مەکییە**

**ئازاری ١٩٨٨**

# پێشەکی بۆ چاپی ساڵی ١٩٩٨

## وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف

لە ١٨ی ئابی ساڵی ١٩٩٤دا، چەند هەفتەیەك پێش ئەوەی سەرۆك سەدام حسێن دەست بکات بەگواستنەوەی لەشکرەکەی بۆ ئەوەی جیهان بهێنێتە سەر ئەو باوەڕەی کە خەریکی ئەنجامدانی کارێکە کەم کەس بیری لێدەکاتەوە ـ ئەویش داگیرکردنەوەی کوەیت بو ـ یاسای ژمارە ١٠٩ی دەرکرد. دەقی یاساکەش بەمشێوەیە بوو: "بەپێی مادەی ١، بڕگەی ٤٢ی دەستوری عێراقی، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاریدا، ئەو کەسانەی تاوانێك دووبارە دەکەنەوە کە بەهۆیەوە دەستیان بڕاوە، نێوچەوانیان بەنیشانەیەك لە شێوەی (X) داخدەکرێت، کە درێژی خەتە یەکتربڕەکانی یەك سەنتیمەتر دەبێ‌و پانییەکەشی یەك میللیمەتر".

ئەو تاوانەی "بەهۆیەوە دەستیان بڕابووەوە" دزیکردنو هەڵاتنیان بو لە سوپا. داخکردن بە شیشی گەرم سزایەك بو کە سەدام حسێن پاش جەنگی کەنداو بۆ ئەوجۆرە تاوانانە لە عێراقدا دایینابوو.

بەپێی ئەو یاسا تازەیە، سەربازانو ئۆتۆمۆبیل دزەکان بۆ ئەو لێپرسینەوەیە دەستنیشان کرابوون، بەپێی وتەی ڕۆژنامەکانی عێراق، ساڵی ١٩٩٣، سی‌و شەش هەزار سەیارە بەرۆژی ڕووناك لە شەقامەکانی بەغدا دزرابوون. ئەمە لە کاتێکدا هێزی پۆلیس شانازی بەوەوە دەکرد کە ڕێژەی تاوان لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە لەسایەی دەسەڵاتی ڕژێمدا لە دابەزیندایە.

یاسا نوێیەکە بەزاراوەیەکی گشتی دارێژرابوو: دزینی هەر شتێك بەهاکەی بگاتە ٥٠٠٠ دینار ـ ئەو بڕە پارەیە ساڵی ١٩٩٤ بەرامبەر بە ١٢ دۆلاری ئەمەریکی بو ـ بەپێی ئەم یاسایە هەموو عێراقییەك، جگە لە منداڵ، یەکەمجار دەستی دەقرتێندراو لە





دووەم جاردا نێوچەوانی داخدەکرا، بەڵام ڕەنگە لە حاڵەتی (عەلی عەبد عەلی)ی تەمەن سی‌و حەوت ساڵدا هەڵەیەك ڕوویدا بێت، چونکە لەیەککاتدا دەستیان قرتاندو نێوچەوانیشیان داخکرد. تاوانەکەی عەلی بریتی بو لە دزینی تەلەفزیۆنێك‌و ٢٥٠ دینار (کە دەیکردە ٥٠ سەنت). لە ٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٤دا تەلەفزیۆنی عێراقی عەلی لە نەخۆشخانە پێشاندا کە هێشتا بەنج بەرینەدابو، تەوێڵە داخکراوەکەشی لە نزیکەوە پێشانی بینەران دەدرا. یاسا تازەکە ئەوەی دیاریکردبوو پێویستە داخکردنەکە لە هەمان نەخۆشخانەدا ئەنجام بدرێ کە دەستی کەسەکەی تێیدا دەبڕێتەوە، بەڵام بەهۆی دووبارەکردنەوەی تاوانەکە، ئەوەش ئاشکرا بو کە عەلی ئەو کارەی نەکردبوو.

بەپێ قسەی سەربازێك کە ساڵی ١٩٩٤ بۆ کوەیت رایکردبوو، تا ساڵی ١٩٩٤ نزیکەی دوو هەزار سەرباز نێوچەوانیان داخکرابوو. ئێزگەی کوردە نەیارەکان لە باکوری عێراقدا بڵاویکردەوە کە هێزەکانی کورد هەشت سەد سەربازی نێوچەوان داخکراویان لە سنورەکانی ناوچە ئارامەکانی باکوری عێراقدا گرتوە. ئەم ژمارەیە ڕاست بێت یا نا گرنگ نییە، بەڵام ئەوەی گرنگ بێت داخکردن مەسەلەیەکی کەم بەها نیە.

ئەو شێوازانەی حکومەت بە بەرچاوی خەڵکییەوە جەستەی هاوڵاتیانی دەشێواند لە پەرەسەندندا بوو. بەپێی یاسای ژمارە ١٠٩و بەگوێرەی جۆری تاوانەکە نێوچەوانی تاوانبارەکە بە دوو خەتی ئاسایی‌و بەدرێژی سێ تا پێنج سەنتیمەتر، یا بەبازنەیەك، یا بەنیشانەی (X) داخدەکرا.

هەندێك سەربازی ڕاکردوو، ئەوانەی خۆیان لە خزمەتی سەربازی دزیبووەوە ئەوانەی داڵدەیان دەدان، سزای تایبەتیان هەبو، ئەویش: یەکەمجار بڕینی بەشی دەرەوەی گوێچکەیان بو، بەدووبارەکردنەوەکەی گوێچکەکەی تریان دەبڕی‌و نێوچەوانیشیان بە بازنەیەك داخدەکرا (قسەی ئەوەش هەیە گوایە هەندێك کەس بە وشەی جەبان ـ ترسنۆك ـ و دوو هێڵی ئاسۆیی بەدرێژیی سێ تا پێنج سەنتیمەتر نێوچەوانیان داخکرابو)، بەڵام سەربازی هەڵهاتوو پاش گرتنی بۆ سێیەمین جار لە سێدارە دەدرا. ئەمەش جۆرە چاکسازییەك بو لە ڕەوشەکە، چونکە پێش دەرچونی

ئەم یاسایە سەربازی هەڵهاتوو پاش گرتنی بێ سێ‌و دوو یەکسەر لە سێدارە دەدرا. سروشتی تاوان‌و سزا لە رژێمی سەدام حسێن دا بەردەوام لە گۆڕاندا بو.

کاردانەوەی خەڵکی ئاسایی بەرامبەر بەم یاسایە بێوێنەبو. لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٩٤ ئەوە بوو کە لە ناوجەرگەی شاری بەغدادا دوو قوڵبڕاوو گوێچکە قرتاو، خۆیان کوشت. پاش کوشتنی پزیشکێك لەلایەن دەستبڕاوێکەوە لە شاری ناسریەو بەردەباران کردنی بارەگای حیزبی بەعس لە شاری عەمارەو بڕینی گوێچکەی ئەو بەعسیانەی بەردەستی خەڵکی دەکەوتن، چەند سەد پزیشکێك دژی جێبەجێ کردنی ئەو سزا تازەیە، دەستیان بەمانگرتن کرد، بەڵام دوای ئەوەی هەڕەشەی ئەوەیان لێکرا، گەر یاساکە جێبەجێ نەکەن گوێچکەی خۆشیان دەبڕن، مانگرتنەکەیان شکاند. ئیدی دوا بەدوای ئەوە یەکسەر یاسای ژمارە ١١٧ دەرچو کە ئاراستەی سەرجەم پیشەی پزیشکیی کراوەو تێیدا هاتوە، هەر کەسێك بەشداری یا یارمەتی جوانکاری ئەو کەسانە بدات کە بەشێوەیەکی فەرمی بەشێکی جەستەیان شێوێنراوە، تووشی سزای دەستبڕین دەبێتەوە. یاساکە بۆ هێوڕکردنەوەی تووڕەیی خەڵکی، بەم وشانە کۆتایی پێهاتوە: ("ئەنجامی" سزای گوێ بڕین یا دەست قرتاندن لەلایەن میرییەوە چارەسەر دەکرێت، گەر سزادراوەکە کارێکی نیشتمانی قارەمانانە ئەنجام بدات).

## گۆڕانی شێوەکانی توندوتیژی:

لەو کاتەی کتێبی "کۆماری ترس"م تەواو کردوە، لە ساڵی ١٩٨٦ەوە تا ئەمڕۆ، بەدەزگاییکردنی ترس لە عێراقی سەدامدا گەیشتۆتە رادەیەك کە نەخۆشترین عەقڵ وێنای ناکات. کتێبی کۆماری ترس باس لەوە دەکات چۆن چیرۆکەکانی تۆقاندن لە وڵاتێکدا کە بەرەو پێشکەوتن دەچێت، بوون بە فۆرمێکی ئاسایی، باسی چۆنێتی دروستبوونی ئەو دونیا (کافکا)ییە دەکات، کە چۆن ترس‌و تۆقاندن بەرێوەیدەبات‌و بەیەکگرتوی دەیهێڵێتەوە. لەم جیهانەدا هاوڵاتی نموونەیی ئەو کەسەیە کە سیخوری بەسەر خەڵکییەوە دەکات. درۆو "لێکۆڵینەوە" تا رادەی قەدەغەکردنی



هەمو شتێکی دی، بەسەر گوتاری گشتیدا زاڵبوە. کتێبەکە باس لەوەش دەکات چۆن ترس شتێکی رێکەوت نیە، هەروەکو لە وڵاتە ئاساییەکاندا هەیە، بەڵکو بوە بەشێکی بنچینەیی سیاسەتی عێراق. حیزبی بەعس بەشێوەیەکی ئەوتۆ پەرەی بە سیاسەتی تۆقاندندا کە خزمەت بەئامانجی مانەوەی بکات، بەوەی زۆرترین ژمارەی خەڵکی ناچاربکات بەشداری لە تاوانەکانی رژێمدا بکەن. کێشەی تایبەتی توندوتیژی بەعس لەوێوە دەستپێدەکات کە بەسەدان هەزار کەسی ئاسایی بە شێوەیەکی رۆتینی لەم توندوتیژییەدا بەشدارن‌و زۆربەی کات لەم مەسەلانەدا هیچ جۆرە مافێکی هەڵبژاردنیان لەبەردەمدا نیە. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە کردەوەکانیان شەرعییەتی پێبدرێ، چونکە لە پێناوی شەرعییەت بەخشینە بە رژێمێك کە نابێت هیچ کەسێکی دەرەکی سەرزەنشتی پەیدابوونی بکات. حیزبی بەعس دیاردەیەکی تەواو خۆماڵییەو دەبێ تەنها لە چوارچێوەی قبووڵکردن‌و پەسەندکردنی خەڵکی لە مانەوەی لە دەسەڵاتدا تێبگەین. ساڵی ١٩٩١ جەنگی کەنداو هەمو شتێکی گۆڕی. ئەمەش پڕ کێشەترین خاڵە کە ئەم کتێبە هەوڵدەدا لێی تێبگات.

ئەشکەنجەدان لە لوتکەی سیستەمی سزادانە. مۆدێرنە لە عێراقدا بریتییە لەو سیاسەتەی هەمو هاوڵاتییەك چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە رەنگە لە بارودۆخێکی تایبەتیدا ئەشکەنجە بدرێت. لە ئێوارەی هەڵایسانی جەنگی عێراق ـ ئێران، لە سێپتەمبەری ١٩٨٠دا، سەدام حسێن سەرکردایەتی رژێمێکی دەکرد گشت ئەو پێوەرانەی گۆڕیبو کە کاریگەرییان لەسەر کۆمەڵگەدا هەبو، ئەمە لەگەڵ گۆڕینی ئەو توندوتیژییەی وڵاتی بەرێوەدەبرد. ئامرازەکانی توندوتیژی کە بریتی بوون لە سوپا، پۆلیس، دەزگای ئەمن، تۆڕێکی فراوانی سیخوری، میلیشیاکانی حیزب، بیروکراتەکانی ناو حیزب‌و دەوڵەت، گۆڕانکارییەکی گەورەیان تێیدا کرابو،و لەدژی ئۆپۆزیسیۆن بەکار دەهێنران. ئەو ئامرازانە لە بری ئەوەی فاکتەرێك بن بۆ گەیشتن بەئامانجێك، کەچی خۆیان ببوون بە ئامانجێکی ترسناك‌و لە سنورەکانەوە توندوتیژییەکی دڕندانەیان بە هەمو لایەکدا بڵاودەکردەوە.

"جەنگ، هەر جۆرە جەنگێك بێت، گرنگ نیە لەدژی کێ بێت، ئەنجامێکی

چاوەڕوانکراوی گەشەکردنی هۆکارەکانی توندوتیژییە، بەتایبەتی کاتێك بەشێوەیەکی ئەوتۆ دادەڕێژرێت کە خەڵکیکی زۆر ناچار دەکرێن بەشداری لە کردەوە تۆقێنەرەکانیدا بکـەن". ئەو وشـانەم لە بارەی جەنگی عێراق ـ ئێران، لە بەشـێکی کتێبەکەمدا لە ژێر ناوی (دوا کارەسـات)دا نوسـیوە. ئێسـتا کە بیر لە رابردوو دەکەمەوە، دەزانم لە هەڵبژاردنی وشـەکانمدا زۆر سـەرکەوتوو نەبوم، چونکە لەدوای ئەوە، کارەساتی گەورەتر روویدا، وەك داگیرکردنی کوەیتو لکاندنی بەعێراقەوە. ئەنگیزەی لۆجێکی ئەم کارەساتەش دەتوانین بەهەمان وشەکانی پێشوو وەسفبکەین. هەمان ئەو لۆجیکەی کە جەنگی سیپتەمبەری ساڵی ١٩٨٠ی هەڵگیرساند، لە ئۆگستی ساڵی ١٩٩٠ یشدا کاری پێدەکرا.

لـە کۆتایی جەنگـی عێراق ـ ئێراندا رژێم گەیشـتبوە ئاسـتی بـێ کەموکورتی، چونکە دەزگاکانی بە ساغی مابونەوە، بەڵام ئەو توندوتیژییەی جڵەوی بۆ شل کرابو گەیشـتبوە رادەیەك کە چیدی کۆنترۆڵ نەدەکرا. پێشکەوتنەکانی ئێران لە بەرەکانی شـەڕ لە سەرەتای ساڵانی جەنگدا، سەدام حسێنی لەسەر کورسی دەهێنایە خوارێ، گـەر رۆژئاوا بەهانایـەوە نەهاتایە (مۆڵـەت پێدانی لە بونیاتنانـی جبەخانەی چەکی کیمیایی، کە لە کۆمەڵکوژیدا چەکێکی چارەنوسسـازو جەنگەکەی لە بەرژەوەندی عێراق کۆتایی پێهێنا، ئەو چەکەی لە جەنگی کەنداوی سـاڵی ١٩٩١دا کێشـەی بۆ خودی رۆژئاوا دروسـتکرد). بە هەر حاڵ، دەسـەڵاتی سـەرۆکی عێراق لە ساڵانی هەشـتاکانو لە کاتـی جەنگدا لەلایەن عێراقییەکانەوە (جگـە لە کوردەکان) بەهیچ جۆرێك هەڕەشەی لێنەدەکرا.

لە ئەنجامی جەنگی هەشت ساڵەی عێراق ـ ئێراندا، کە ئامێرێکی گەورەی گۆشت هاڕین بوو، هێچ شـتێك وەکخۆی نەمایەوە. جەنـگ لە بەرژەوەندی عێراق کۆتایی پێهات، بەڵام توندوتیژی نەك هەر نەوەسـتا، بەڵکو کەمیشـی نەکرد، بەپێچەوانەوە، وەك جاران، ئاراسـتەی خۆی کرا، هەروەکو چۆن لە سـاڵانی ١٩٦٨ەوە تا ١٩٨٠، ساڵی دەست پێکردنی جەنگ ئاراستە دەکرا. یەك رۆژ پاش راگرتنی جەنگ، فرۆکە جەنگییەکانی عێراق گوندە کوردنشـینەکانیان بەچەکـی کیمیایی بۆمباران کردو لە



ئەنجامدا هەزاران خەڵکی سیڤیلی بێتاوان لە نێوان ٢٥ی ئۆگست ـ ٢٧ی سێپتێمبەری ١٩٨٨ بوون بە قوربانی هێرشـی جینوسایدی حکومەتی عێراق کە لەو کاتەدا پێیوابو ئـەوە دوا رێگەیـە بۆ ئەوەی جەنـگ بەرێتەوە. بە بۆچونی من ئەو هێرشـانەی ناوی "هێرشـەکانی ئەنفال"ی لێنرابو، نزیکەی سـەد هەزار قوربانـی لێکەوتەوە. چیرۆکی ترسناکیش دەبیسترا. ئەو راپۆرتانەی ساڵی ١٩٨٩ گەیشتنە (ئەمنێستی ئینتەرناشناڵ)، باس لەوە دەکەن کە بەسەدان منداڵ چاویان هەڵکۆڵرابو تا خزمە نزیکەکانیان ناچار بکەن دان بەتاوانەکانیان بنێن.

لە ساڵی ١٩٩٠ بەدواوە رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ، وەك رێکخراوی (ئەمنیستی ئینتەرناشـناڵ)و (هیومەن رایتس وۆچ)، بە مەبەسـتی کۆکردنـەوەی بەڵگەنامەکانو تۆمارکردنی پێشـێلکارییەکانی مافەکانی مرۆڤ لەلایەن حیزبی بەعسـەوە هەنگاوی گەورەیان نا، بەپێی وەسفی (ماکس ڤان دیرشتۆیل): "تاوانی زۆر گەورەن.. ئەوەندە گـەورەن کە لە سـاڵانی دوای جەنگـی جیهانی دووەمەوە هاوشـێوەیان کەمە". لە هەشـتاکانەوە دونیای عێراق، دونیاییەکی (کافکا)ییەو تەنانەت لە سـاڵی ١٩٩٧ەوە دونیایەکی سەیرتریشە.

هیچ شـتێکی نائەقلانی لەم سـەیرییەدا نیە، چونکە توندوتیژی لەسـەر توندوتیژی دەژیو پەرەپێدەدا. توندوتیژی شـێوەو فۆرمی خۆی هەیەو لەسـەر نەخشـەی خۆی دەڕواتو پێڕەوی لە یاساکانی خۆی دەکاتو مێژووی تایبەت بەخۆی هەیە. چۆنێتی پەرەسەندنی ئەم توندوتیژییە لە شێوەیەکی فەرمانڕەواییداو ئەو پرسیارەی بۆچی ئەوانەی تووشـی توندوتیـژی دەوڵەت دەبنەوە لە مـاوە جیاوازەکانی ژیانیانـدا پەرچەکرداری جیاواز دەنوێنن، دوو مەسـەلەن لە سیاسـەتدا زۆر شـت روونەدەکەنـەوە. بۆ نمونە، شێواندنی جەستە کولتورێك بوو لە حیزبی بەعسدا کە زۆر پێش ئەوەی یاسا سزادان، لە ساڵی ١٩٩٤دا، لەلایەن سەدام حسێنەوە دەربچێت، بوونی هەبو. کتێبی (کۆماری تـرس) ئـەوە دەگێرێتەوە کە ئەم کولتـورە لەو دادگا دڕەقیانەی بەشـێوەیەکی نهێنی ئەنجام دەدران، پەرەیسەندو وەك نواندنی ئەشکەنجە پێشکەش دەکرا.

مەبەسـت لە دادگاییەکانی ١٩٦٩ (بەشـی ٢)، نیشـاندانی هێزی گەشەکردوی

حکومەتــی بەعــس بوو تا لــە شــێوەیەکی نمایشــییدا توندوتیژییەکــی زۆر بەرامبەر بەقوربانییەکانی لە فۆرمی ناهاوتایی هێز لە نێوان قوربانیو چەوسێنەراندا پێشان بدات. ئەوەش لە کاتێکدا بو کە هێشتا لاواز بو. لەدوای ئەو ئەزمونانەو بەدرێژایی هەشت ساڵ جەنگــی عێراق – ئێران، خەڵکێکی زۆر کەم لە عێراقییەکان خەونیان بەوەوە دەبینی بەرامبەر بەو سزا سەختەی بەشێوەیەکی رۆتینی لەلایەن حکومەتەوە ئاراستەیان دەکرا، بتوانن بەئاشــکرا ناڕەزایی دەربڕن، بەڵام تواناو دەســەڵاتی بێســنوری ئەو دەوڵەتەی هەمو شــتێك دەزانێت لەوەدا بو نەیارەکانی بەزێنراوو لەناوبرابوون، بەواتایەکی دی، توانــای لەوەدا بو هەمو کردارەکانی بە بێدەنگییەکــی تەواو ئەنجامدەدران. لە کاتی سزاداندا هەمو شتێك بە نهێنی ئەنجام دەدرا، هەر لە گرتن، ئاراستەکردنی تومەت، لێکۆڵینــەوە، بەڵگە لێدەرهێنانو دادگاییکردنەوە تا دەگاتە حوکمدانو جێبەجێکردنی حوکم. ئەگەر جەستەیەك ئاسەواری مەسەلەکەی پێوە دیاربوایە، ئەوا تەرمەکەیان لە ســندوقێکی داخراودا بۆ کەسوکاری قوربانییەکە دەگێڕایەوە. ئەمە یاسای گەمەکە بو لە سیستمی دەستبەکاری نائاسایی ئەو دەوڵەتەی ئەم کتێبە باسیدەکات.

هەمــو ئەو شــتانە لــەدوای جەنگی کەنــداوی ١٩٩١دا گۆڕانی بەســەردا هات. عراقییەکان کەوتنە قسەکردنو گێڕانەوەی سەرگوزەشتەکانیان کە پێشوتر نەیاندەتوانی ئەو کارە بکەن. عراقییەکان بە سودوەرگرتن لە بەزینی حکومەت لەو جەنگەدا، نەك هەر کەوتنە قســەکردن، بەڵکو شۆڕشــیان بەرپاکردو دوو لەســەر سێی پارێزگاکانیان داگیر کردو بۆ ماوەی هەفتەیەك تا ســێ هەفتە زۆربەی شــارە گەورەکانیان کۆنترۆڵ کرد. هەروەکو عراقییەکان دەڵێن، لە مانگی مارتی ١٩٩١دا "دیواری ترس رووخا". خەڵکی عێراق ترســیان شــکا، بۆیە کارێکیان کرد کە بە خەیاڵی کەسدا نەدەهات، ئەویــش داوایــان لــە هێزی هاوپەیمانــان کرد، ئەو هێــزەی بۆ ماوەی شــەش هەفتە شــارەکانیانی بۆردومــان دەکرد، یارمەتیــان بدات بۆ ئەوەی لەدەســت ئەو رژێمەی فەرمانڕەوایــی دەکــردن، رزگاریــان بێت، ئەمــەش کارێك بو هەرگیز لە سیاســەتی عەرەبیــدا رووینەدا بــو. لەگەڵ گۆڕانی ئەو هەڵوێســتەدا، دەرفەتێکی باش رەخســا بــۆ ئــەوەی گۆڕانکاری بەســەر ناوچەکەدا بێــت، بــەڵام ئەوە رووینــەدا، چونکە نە



عەرەبــەکانو نە هێزی هاوپەیمانان کە عێراقی لە کوەیت دەرپەڕاند، پشــتگیرییان لە شۆڕشــگێڕەکان کرد، بۆیە شۆڕشگێڕەکان تارومار کرانو رژێمیش بازنەیەکی تەواوی بە دەوری خۆیدا کێشــاو گەڕایەوە بۆ ئەو شــێوازەی کە لە ســەرەتای فەرمانڕەواییدا پێــڕەوی لێدەکرد، واتە بەکارهێنانی ئەوپەڕی توندوتیژی، لەگەڵ ئەو جیاوازییەی کە زۆرداریییەکــەی رژێم بەرەو رووخان دەرۆیشــت. ژمارەیەکی بەرچاوی ســەربازان لە ســوپاکەی ســەدام هەڵدەهاتنو عراقییەکان بێپەردە قسەیان دەکرد (من کتێبی ترسم بەناوی خوازراوەوە بڵاوکردەوە، بەڵام لە ئێستادا پێویستم بەوە نیە)، تەنانەت ئەفسەرە پایە بڵندەکانی وەك وەفیق ســامەڕائی، بەرپرســی هەواڵگری ســوپاو نزاز خەزرەجی، سەرەك ئەرکانی سوپا، پەیوەندییان بەو نەیارانەی رژێمەوە کرد کە لە باکوری عێراق دەســتیان بەچالاکی کردبو (جگە لە دوو زاواکەی سەدام کە بەخۆیانو ژنەکانیانەوە بــۆ ئەردەن رایانکرد). بەهەر حاڵ، هاولاتییە شــارییەکانو چینی نێوەنجی رۆشــنبیر بۆ یەکەمین جار لە برســێتی تێگەیشــتن. نائومێدی باڵی بەســەر باشوردا کێشا، کە ســەرەنێزەی راپەرینــی مارتی ١٩٩١ بوو، ئێســتاش باجی راپەرینەکەیــان دەدایەوە. ئاسایشی شاری بەغدا داڕووخابو. لەم بارودۆخەدا ئەشکەنجەدانو گوللەباران کردن، نە دەشیاو نە کاریگەریشیان هەبوو.

کەواتــە (کۆماری ترس) باســی رژێمێــك دەکات کە لە پــاش جەنگی کەنداو، راپەریــن، حەوت ســاڵ گەمارۆی ئابوریو بەتایبەتکردنی ئابــوری، نەماوە. ئەمرۆ لە عێراقدا هیچ شــتێك وەك ئەو کاتەی رژێم نەماوەتەوە کە لەوپەڕی دەســەڵاتدا بوو، بەتایبەتی لە ساڵانی حەفتاکاندا، هەروەکو لەبەشی یەکەمدا باسم کردوە.

ســەدام حسێن هێشــتا لەدەســەڵاتدایە، دیکتاتۆرێکی بچوکە بەستاندارتی رۆژئاوا (بەبەراورد لەگەڵ هیتلەرو ســتالیندا)، هێشتا ئەو کەسەیە کە سیستمێکی مۆدێرنی لە رێگەی ترسەوە بۆ فەرمانڕەوایی دامەزراند. سەدام هەر خۆی ماوەو دوژمنەکانی (وەك ئایەتوڵڵا خومەینی، جۆرج بوش، مارگرێت تاچەر) هیچیان نەماون، ئیدی یا بەهۆی مردنەوە بێت یا بەهۆی دۆڕاندنی هەڵبژاردنەوە. بە راستی ئەم سەرکردە عێراقییە توانی بەرووی هەمو ئەو پێشبینیانەی باسیان لەلاچوونی دەکرد، بوەستێتەوە، یەکێك لەوانە

پێشبینی خۆم بوو.

## مامەڵەکردن لەگەڵ سەدام حسێن دا:

ئەم یاسا نوێیانەی سەدام حسێن هیچ پەیوەندییان بەناردنی ئەو فڕۆکەو کەشتیو سەربازانەوە نیە کە لەلایەن سەرۆك کلینتۆنەوە رەوانەی کەنداو کرابون، ئەگەر پەیوەندیشیان هەبێت، ئەوا دوو مەسەلەی جیاوازن، بەڵام پڕئاشکرایە کە سەدام خەریکی هەڵایسانی شەڕێکی دییە لەگەڵ سەرۆکی ئەمەریکاو کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، شەڕێك تا ئێستا لە دە بۆنەی پاش ئاگربەستی جەنگی کەنداودا گەیشتۆتە خاڵی روبەرونەوە.

ئابوریی عێراق چوار ساڵە تووشی قەیرانێکی سەخت بووە. بەهای دراوی عێراقی زۆر دابەزیوەو پشتگیری حکومەت لە خواردنە سەرەکییەکانی وەك ئاردو برنجو شەکر نەماوە، بۆیە نرخی ئەو خواردنانە زۆر بەرز بۆتەوە. بەهای یەك دیناری عێراقی بەفەرمی بەرامبەر بە سێ دۆلاری ئەمەریکاییە، بەڵام بەشێوەیەکی نافەرمی هەر دۆلارێکی ئەمەریکی بە چوار سەد ـ شەش سەد دیناری عێراقی دەگۆڕدرێتەوە. بە پارەیەکی کەم دەتوانیت هەمو شتێكو هەمو کەسێك بکڕیت (ئەمەش بارودۆخێکی گونجاوە گەر کەسێکی دەرەکی مەبەستی بێت)، هێزی پۆلیس توانای نەماوە بەر بەتاوانی دزیو تاڵانیو دەستدرێژی سێکسی بگرێت. سەدام حسێن ساڵی ١٩٩٢ بۆ کۆنترۆڵکردنی بازار (٥٥٠) بازرگانی سەرەکی شاری بەغدای دەستگیر کردو بە تومەتی سود وەرگرتن لە رەوشەکە (٤٢) کەسیانی لە قەنارەداو لاشەکانیانی بە ستونی تەلەفونی بەردەم دوکانەکانی خۆیانەوە هەڵواسیو تابلۆیەکی کردبوە ملی هەر یەکێکیان کە لەسەری نوسرابوو "بازرگانی چاوچنۆك". بەکورتی، لە کاتێکدا سەرۆکی عێراق لەگەڵ گەورەترین زلهێزی جیهاندا لە شەڕ دەگەڕا، کەچی لە کوشتنو دەستبڕینو داخکردنی نێوچەوانی هاوڵاتیانی خۆیدا بەردەوام بوو. لەگەڵ بێئاکامی هەمو روبەروبونەوەیەکیشدا بەهای دراوەکەی زیاتر دادەبەزیو گەمارۆی



ئابوری قووڵتر کاری لە تانوپۆی کۆمەڵایەتیو ئاکاری میلەتدا دەکرد. سەدام حسێن لە دەسەڵات ماوەتەوە، بەڵام ئەو سروشتە نەبەزییەی لە بەرچاوی خەڵکدا هەیبو، لەپاش ئەو گەمەی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا توشیبو، کاڵبۆتەوەو ماوەی حەوت ساڵیشە بەچەندین تاکتیك بەشداری لابەلای لە گەمەی نەتەوەکان (لعبة الامم)دا کردوەو توانیوێتی لێی دەرباز بێت.

ئەم وردە سەرکەوتنانە بوون بە ستراتیجێك لەلای سەدامو لە ٣٠ی ئابی ١٩٩٦دا تانکەکانیو چل هەزار لە گاردی کۆماری نارده هەولێرو ئەو ناوچانەی لە ساڵی ١٩٩١ەوە بەناوچەی دژە فڕین دادەنرا. پۆلیسی نهێنی چووە قووڵایی کوردستانی عێراقەوەو سەدان لەو نەیارانەی کوشت کە ئەمەریکا بەڵێنی پاراستنی پێدابوونو بەهەزارانیشی لێ دەستگیر کردنو فایلو بڵاوکراوەکانیان گیرانو ئەو دەزگای رادیۆ تەلەفزیۆنەی بە پارەی ئەمەریکا دامەزرابون، تەقێنرانەوە. بەمشێوەیە ئەزمونی پێنج ساڵەی خودموختاری کوردەکان کە لە سەدا (٢٠)ی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنن، کۆتایی پێهات.

هەمو ئەو کارانەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لە جەنگی کەنداوەوە جێبەجێی کردبو بۆ "راگرتنو سنوردانان"ی سەدام حسێن هەرەسیهێنا. تورکیاو سعودیا کە دوو کۆڵەکەی گرنگی هاوپەیمانی ئەمەریکابوون، ساڵی ١٩٩٦ نەیانهێشت خاکەکەیان بۆ تێسرەواندنی گورزێکی دی لە عێراق، بەکاربهێنرێ. سیاسەتی ئەمەریکا بەرامبەر بە سەدام حسێن کە لەدوو وشدا کورتدەکرێتەوە: "گەمارۆی ئابوری"و "سنور بۆ دانان" لەبەریەك هەڵوەشایەوە. ئەو عێراقیانەی دەیانویست رژێمی بەغدا بەهاوکاری ئەمەریکا بروخێنن، گەورەترین زیانیان بەرکەوتو بە سەدان کەسیان لێکوژراو بەهەزارانیشیان لێ دەستگیر کرا یا ناچاربوون بەرەو تاراوگە کۆچ بکەن. ژێرخانی بەرهەڵستکاران لە باکوری عێراقدا داڕووخا. ئەمە ئەو شتە بو کە لە هاوینی ١٩٩٦دا روویدا. ئەمەش سەرەڕای دابارینی موشەکی کروس بەسەر بەرگرییە ئاسمانییە لاوازەکەی سەدام حسێندا، هەروا مایەوە، ئەو سیستەمەی لە ساڵی ١٩٩١دا هیچ سودێکی بۆ کۆنترۆڵکردنی وڵاتەکەی نەما بوو. داڕێژەرانی سیاسەتی ئەمەریکا نەیاندەتوانی

یا نەیاندەویســت لەو تێبگەن کە هەمو جارێك بەخەرجکردنی ســەرفیاتێکی زۆر لە بەکارهێنانی هێزی دەریاییو ئاسمانی گەورەترین زلهێزی جیهان بەمەبەستی بەرواڵەت ڕێگرتــنو ســنوردانان بۆ ئەو دیکتاتۆرەی کە وایاندەزانی لــە جەنگدا بەزاندویانە، لە بەرچاوی خەڵکیدا بایەخی زیاتر وەردەگرێت.

حاڵەتــی عێــراق زۆر شــتمان فێر دەکات لــە بارەی ئەوەی چــی ڕوودەدا کاتێك ڕژێمێکــی یاخــی ناڕووخێندرێت، ئــەو ڕژێمەی لەبەر ئەوەی هەوڵی ســنوردانانی بۆ دەدرێ، بە بەردەوامی هەمو یاســاو فۆرمێکی نێودەوڵەتی پێشێلدەکات. ئەو ڕژێمەی دادەوەشێتو گەندەڵ دەبێت، بەڵام زۆرینەی هاوڵاتیانی بێزارو هەژار دەکاتو گۆڕینی ڕژێــم لەناوەوە دەکاتە کارێکــی دژوار. گەمارۆی ئابوری بەوجۆرەی ڕۆژئاوا باســی لێوەدەکات، کارا نیە. ئەو کەسانەی پێیانوایە گەمارۆ هەنگاوێکی کاتییەو چاوەڕوانی ئەوە دەکرێت نەیارانی ڕژێم بە هاوکاری ڕۆژئاوا، ڕژێم دەڕوخێنن، پێویستە جارێکی دی بەو هەڵویستەی خۆیاندا بچنەوە.

ڕۆشــنبیرێك کە ســەردەمانێك بەگەرمی لایەنگری لە ســەدام دەکرد، بە یوسف ئیبراهیمــی پەیامنێــری نیویۆرك تایمزی وت: "ئەم وڵاتە جــاران زۆر دەوڵەمەند بوو، بــەڵام ئــەمڕۆ تەنها یەك ملیۆن کەس بەراســتی دەژین، ئەوانەش پارێزەرانی ســەدامو ڕژێمەکەین. ئەو خەڵکانە خۆراکو پارەیەکی زۆریان پێدەدرێو باقی خەڵکەکەی دی لە هەژارییەکی ســوریالیدا دەژین، بەرادەیەك کە پرۆفیســۆرێکی زانکۆ بۆ دابینکردنی بەشــە خۆراکی، کەلوپەلی ناو ماڵەکەی دەفرۆشــێت. تانوپۆی کۆمەڵگە بە تەواوەتی شێواوە. کاتێك گوێم لە ڕادیۆیەکی بیانی دەبێت کە دەڵێت: تاکە ڕێگەی چارەسەر لابردنی سەدامە، ئیدی لە خۆم دەپرسم: "ئایا ئەو خەڵکانە ئێمە بە یاری پلەیستەیشن دەزانن؟ چۆن چاوەڕوانی گۆڕین لە میلەتێك دەکەن کە وزەی لەبەردا نەماوەو ڕۆژانە چاوەڕێی ژەمی داهاتویی دەکات".

لە بەهاری ساڵی ١٩٩٤دا، سەدام حسێن جۆرە ماندوبونێکی لە گەمەی بەزاندنی سەرۆکەکانی ئەمەریکا پیشاندا. لە وتارێکی تەلەفزیۆنیدا بە بۆنەی جەژنی ڕەمەزانەوە، ســەرۆك لــە بەرامبەر تازەکردنەوەی گەمــارۆدا، زۆر تووڕە دیار بــوو،و بەتوندی پێنج



کەڕەت دەســتی بەرانیدا هێنا. حکومەتەکەی ســەدام دە هەزار دۆلاری بۆ کوشتنی هەر کارمەندێکی نەتــەوە یەکگرتوەکان، ئەوانەی لە باکوری عێراق کاریان دەکرد، تەرخان کردبو. ســێیەکی گاردی کۆماری بەمەبەســتی هەڕەشەکردن لە کوردستان، بەرەو باکور ڕەوانەکرابوون، بەهەمان ئەو شــێوەیەی کە لە مانگی ئۆکتۆبەری هەمان ســاڵدا بۆ هەڕەشــەکردن لە کوەیت بەرەو باشــور ڕەوانە کرابوون. ســەرۆکی عێراق لە بەرامبەر میلەتەکەیدا وەك کەسێکی بێزارو ماندوو خۆی پێشــاندەدا (سەرکردەی لەوجۆرە هەرگیز ئەمە ناکات)، قســەکانی پەلەکردنو بێباکی پێوەدیاربوو، چاوەکانی ئاوســابوون. ئــەو چاوانــەی جــاران نەمابوون کــە بەســەیرکردنێکی ســاردو تووڕە بەرامبەرکەی ســڕو بێورە دەکرد. دەڵێن ســتالین چاوی لەوجۆرە چاوانە بوە، چاوی پیاوێکی ســەنگینو پڕباوەڕو لەخۆدڵنیا، کەسە نزیکەکانی دەتۆقاندو گەر بەرێکەوت بچوکترین شتیان لە دڵدا بوایە کاردانەوەی توندی لەلا دەوروژاند. جاران سەدامیش وەك ســتالین دەیوت: "ئەگەر یەکێك بیەوێــت خیانەتم لێبکات، پێش ئەوەی خۆی هەســتی پێبکات، من دەیزانم"، بەڵام ماوەیەکی کورت لە پێش دەرکردنی ئەو ســزا تازانە، ســەدام لەسەر شاشــەی تەلەفزیۆنی عێراقدا شێوەی زەلامێکی پێوە دیاربوو کە کەمتر لە خۆی دڵنیابوو.

مێــژوو پڕە لە چیرۆکی ئەو ســەرکردانەی کە لەمجۆرە چرکەســاتانەدا دەڕوخێن. شــای ئێرانو گاڵتێری جەنەراڵی ئەرجەنتین لە کاتی ســەرچڵیە شکستخواردوەکەی لە دورگەی فۆکلاند، لەو ســەرکردانە بوون. ڕەنگە کەرەســتەی ســەدام حسێن لەو پیــاوە ڕەقتــر بێت، بەڵام مانــەوەی بۆ ئەم ماوە درێژە لە دەســەڵاتدا نهێنییەکی ئەوتۆ نیــە کــە ڕوونەکرێتەوەو ئەو بایەخــەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریــکاش پێیداوە لە نەزانیو خەمســاردییەوەیە. ئەم بایەخدانە لە بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبەدا دەردەکەوێت کە ســاڵانی هەشتاکان بەناونیشــانی "پارێزەری لای چەپی نیشتمانی عەرەب" لەناو بازنە کاریگەرەکانی ئەمەریکادا بڵاوکرایەوە، هەروەها لە ناردنی ٤٥٠ هەزار ســەرباز لەوپەری جیهانەوە بۆ ئەوەی جەنگ لەدژیدا بکرێ، ڕووندەبێتەوە. هەمو ئەو شتانەی دوای ئەوە ڕوویاندا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کارەی کە تەواویان نەکردبو، بەراستی سەرقاڵی

ئەمەریکییەکان بە "ڕاگرتن‌و سنووردانانی" نەیارەکەیان بەمەبەستی دژایەتیکردنی بیری یارمەتیدانی میلەتانی عێراق بو لە لابردنی ســەدامدا. ئەو سیاســەتە گێل‌و بێمانایەی جارێك دەســت دەخاتە سەر قورگ‌و جارێك دەست لادەدا، پێشاندانی هێزو بازووە کە لە ســاڵی ١٩٩٤دا ســەدامی لە دەسەڵات هێشــتەوە، هەروەکو چۆن لە کۆتایی جەنگی ١٩٩١دا لە تۆڵەی خەڵکی ئاسایی عێراق پاراستی.

خاڵی وەرچەرخان لە سیاسەتی عێراقدا لە ٢٨ی شوباتی ١٩٩١، کاتێك ئاگربەست بەراســتی کاری پێکرا، دەســتپێکرد. کاروانێك تانک کە لــە کوەیتەوە رایانکردبو، رژانە گۆڕەپانی ســەعدەوە، کە گۆڕەپانێکی لاکێشەیی گەورەیە لە ناوەراستی شاری بەسرە، گەورەترین شاری باشوری عێراقە، فەرماندەکەیان سەرکەوتە سەر تانکەکەی‌و روویکردە وێنەیەکی زلی ســەدام بەجلی سەربازییەوە کە لە تەنیشت بارەگای حیزبی بەعسەوە بو، بەدەنگێکی بەرز وتی: "ئەو دۆڕان‌و شەرمەزاریی‌و ریسواییەی بەسەرماندا هات، لە ئەنجامی گەوجێتی‌و هەڵەو کردارە نابەجێکانی تۆوە بووا!". کۆمەڵێك خەڵك لێی کۆبونەوە، کەشــوهەواکە بارگاوی بوو. فەرماندەکە چووە ناو تانکەکەی‌و رووی لولەی تۆپەکەی کردە وێنەکەو چەند گوللە تانکێکی پێوەنا. سەدام نەماو شۆڕشێکی کلاسێکی بەرپابوو، کە پێی دەوترێ ڕاپەرین. لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا دەسەڵاتی دەوڵەت توایەوەو ســەدامیش بەرەنگاری گەورەترین هەڕەشــەی سەر دەسەڵاتەکەی بویەوە.

ڕووشکان‌و لە دەستدانی دەسەڵات لەم بەشەی جیهاندا مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە. یەکێك لە ســامانە هــەرە بەنرخەکانی مۆزەخانەی عێراق هەیکەلی بێســەری (ناپیر ـ ئاســو)یە، ژنی یەکێك لە شــا گرنگەکانی سووســە لە ســەدەی چواردەیەمی پێش زایینیدا. لە خوار پەیکەرەکەوە نوسراوە: "ئەو کەسەی پەیکەرەکەم دەبات، ئەو کەسەی دەیشکێنێت، ئەوەی نوسینەکانی سەری تێکدەدات، ئەوەی ناوم دەسرێتەوە، بەتوندی تووشــی شکســت‌و نەفرەتی (ناپیریشــا)و (کیریشا)و (ئینشــوتاك) بێتەوەو نــاوی بــەرەو نەمان بچێت‌و نەوەکانــی نەزۆك بن‌و هێزەکانــی (بێلتیا)، خوای مەزن بیفەوتێنێت". ئەگەر جارێکی دی ســەدام حســێن جەنگی هەڵگیرساند، ئامۆژگاری



ســەرۆکی ئەمەریکا دەکرێت پێش هەمو کاردانەوەیەك بە باشــی بیر لەوە بکاتەوە کە ســەدام حسێن وەك فەرمانڕەوا کۆنەکانی میســۆپۆتامیا، زۆر لەوە دەترسێت لەبەردەم دوژمنەکانیدا رووی بشــکێت (بەتایبەتی لەبەردەم میلەتەکەی خۆیدا کە بەگەورەترین دوژمنی خۆی دەزانێت)و لە هەمو چەکی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ناترسێت.

داڕێژەرانی سیاسەتی ئەمەریکا نەك هەر لەمە تێنەگەیشتن، بەڵکو لەوەی عراقییەکان لــە کۆتایی جەنگدا ئەنجامیانــدا، ڕۆحیان چوبوو. برێنت ســکۆکرۆفت راوێژکاری پێشــوی جۆرج بۆش لــە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ تەلەفزیۆنــی ABC دەربارەی "کارە تەواونەکراوەکە لە عێراقدا" ترســی حکومەتەکەی لەم بارەیەوە دەربڕی. کاتێك پیتەر جێنینگ لێی پرســی رای چییە لەسەر ئەو سەرهەڵدانەی عێراق‌و داواکاری نەیاران بۆ لابردنی دیکتاتۆرو تەواوکردنی کارەکە، برێنت وتی:

- بەراشــکاوی دەڵێــم خۆزگە روونەدایە، چونکە بەرەنگاری ئەگەری شۆڕشــێك دەبونەوە، ئەوسا دەبوایە شۆڕشەکە دامرکێنین، نەك توڕەبوونەکەیان ئاراستەی سەدام حسێن بکەن.
- جێنینگ: ئایا دەتوانم بڵێم کاتێك شۆڕشــێك لە باکورو باشــور پەرەدەسێنێت تۆ زیاتر حەز لە رودانی کودەتایەك دەکەیت؟
- ســکۆکرۆفت: بەڵێ، بەڵێ، بەئاشکرا حەز لە کودەتایەك دەکەین، هیچ گومانی تێیدا نیە.
- جێنینگ: ئایا بە راستی لەم قۆناغەدا، لە شوێنێکی ئەم دەوروبەرە...
- سکۆکرۆفت: بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ.

کتێبی (کۆماری ترس)، کە ساڵی ١٩٨٩ چاپی یەکەمی کرا، بەدوورو درێژی باسی ئەوە دەکات چۆن حیزبی بەعس، بەرێبەرایەتی ســەدام حســێن، لە ساڵی ١٩٦٨ەوە رژێمەکەیان بۆ "دژە کودەتا" ئامادە کردوە.

ئاســتی توندوتیــژی حیزبی بەعــس وادەخوازێت ســوپا بکرێتە پاشــکۆی دەزگا ئەمنییــەکان، ئەوەش لە مێژووی عێراقدا روونەدابو. وەڵامەکانی ســکۆکرۆفت ئەوە دەردەخــەن کــە ویلایەتە یەکگرتوەکانــی ئەمەریکا زانیاریان چەنــد کەمە دەربارەی

وڵاتێك كە ساڵی ١٩٩٠ ـ ١٩٩١ نزیكەی نیو ملیۆن سەربازیان لەدژی كۆكردبووەوە. جۆناسان ڕاندڵ، گەورە پەیامنێری ڕۆژنامەی واشنتن پۆست دەڵێت: ئەم كارە بەدەستی ئەنقەست بووە: "بەڵگەكان ئەوەمان بۆ دەردەخەن كە ئیدارەی بۆش بەمەبەست دژی دەستتێوەردانی نێو كۆمەڵگەی ئاڵۆزی عێراق بوە، ئیدی چ لەكاتی یا پاش داگیركردنی كوەیت بێت، بەهۆی ئەوەشەوە شتێكی بەسودی بۆ بەرهەڵستكارە عێراقییەكان نەكرد، ئیدی چ شیعە بێت یا سونە یا كورد. زۆر بەدەگمەن دەبینرێ زلهێزێك بەو هەمو هاوپەیمانییەوە، ئەوەندە سوپاو چەكی كۆكردبێتەوە، كەچی سروشتی دڕندانەی دوژمنەكەی لەگەڵ هاوڵاتیانی خۆیدا فەرامۆش بكات".

سەدام حسێن سود لەم بێباكییە وەردەگرێت. جۆرج بۆش پێنج یەكەی هەڵبژاردەی گاردی كۆماری بەسەلامەتی بۆ هێشتەوە. هەر لە پاش ڕێكەوتننامەی سەفوان لەگەڵ جەنەراڵ شوارتزكۆف، ئەو هێزانەو كۆپتەری سەربازی بۆ دامركاندنەوەی ڕاپەرینەكەی ئازاری ١٩٩١ بەكارهێنا. سەدام حسێن پاش تەواوكردنی ئەو كارەی، دەستیكرد بە نۆژەنكردنەوەی وێنەكانیو گێڕانەوەی "ڕووە" سیاسییەكەی كە لە زۆربەی ناوچەكانی عێراقدا شێوێندرابوون. هێشتا دابەشكردنی نوقڵ بە بۆنەی سەركەوتنی جۆرج بۆشەوە تەواو نەببو، ڕۆژنامەی "ئەلجومهوریە"، ئۆرگانی فەرمی حكومەت، وتارێكی بڵاوكردەوە كە تێیدا ئامۆژگاری دكتۆرە دەروونییەكانی جۆرج بۆش دەكات لە ژوورێكدا دەرگای لەسەر دابخەن بۆ ئەوەی لە خولیای عێراق ڕزگاری بێت. نە فیشەكە شێتەكانی جەنگی گەردەلولی بیابانو نە موشەكەكانی تۆماهۆت لە ڕوبەڕوبونەوەی عێراقو ئەمەریكا، شكستی سیاسەتی ئەمەریكا داناپۆشێت، لەبارەی لابردنی سەدام حسێن لە دەسەڵات، یا بەلانیكەمەوە ئاشكراكردنی تاوانەكانی بەشێوەیەك كە لە بەرچاوی میلەتەكەیو هەمو جیهان بكەوێت. ئەو كارەش وادەخوازێت ئاراستەی بایەخدانەكە بگۆڕدرێت لە گەمارۆدانو گەڕانی تیمەكانی لەناوبردنی چەكی كۆكوژ، بەپێی بڕیاری ٦٨٧ی نەتەوە یەكگرتوەكان بۆ بایەخدان بە كێشەكانی میلەتی عێراق.

ئەوەی جێگەی بایەخە ئەوەیە كە ڕای گشتی ئەوروپا لەژێر كاریگەری میدیای



ڕۆژئاوا ئاراستەی بیركردنەوەی گۆڕیو ئەوەشی دەست نیشانكرد كە لە ئایندەدا پێویستە چی بكرێ، ئەوەش كاتێك ڕوویدا كە كوردەكان لە نیسانی ١٩٩١دا لە ترسی تۆڵەسەندنەوەی سەدام بەرەو شاخەكان ڕایانكردوو ڕۆژانە بەهەزاران كەسیان لێ دەمردن. ئیدارەی بۆش بەنابەدڵی ناچاركرا بڕیاری نەتەوە یەكگرتوەكان دەربكات. بڕیارەكە نارەزایی بەرامبەر "چەوسانەوەی خەڵكی سیڤیلی عێراق لە زۆر ناوچەدا" دەردەبڕێتو داوا لە عێراق دەكات بەپەلە سنورەكانی بۆ گەیاندنی كۆمەك بكاتەوە. ئەمە یەكەمجار بو لە بڕیارێكی نەتەوە یەكگرتوەكاندا باسی كورد بكرێتو یەكەمجاریش بو نەتەوە یەكگرتوەكان بە پێداگرییەوە دەست لە كاروباری ناوخۆی ئەندامێكی خۆی وەربدات. لەناوەڕاستی نیسانی ١٩٩١دا ناوچەی ئارام كە هێزی نەتەوە یەكگرتوەكان پاریزگاری لێدەكرد، بۆ كورد دامەزراو بڕیارەكە ڕێگەی نەدەدا سوپای عێراق ناوچەكانی سەرووی هێڵی ٣٦ ببەزێنێت. بەرپرسێكی ئەمەریكی بەمشێوەیە هۆی بڕیارەكەی بۆ جۆناسان ڕاندڵ شرۆڤە كردوە: "بەراستی، ئێمە چاوەڕوان بووین شەڕی ناوخۆ كۆتایی پێبێت، بۆ ئەوەی ئەم تێكەڵاوبوونەمان وادەرنەكەوێت بڕیارەكە بۆ یارمەتیدانی شۆڕشگێڕەكانە، بەڵكو بڕیارێكە بەمەبەستی گەیاندنی یارمەتی مرۆییە".

## شەرەفو شوورەیی:

سەرۆكی عێراق بە پاساوی جێبەجێ كردنی یاسای ئیسلامی، یاسای (شەریعە) سزادانی ساڵی ١٩٩٤ دەركرد. بەپێی (شەریعە) چوار سزای دی دەستنیشان دەكرێو بەهەموشیان دەوترێ (حدود) كە (حق الله)یە، واتە "مافی خوداوەند". تاوانەكانی دی بریتی بوون لە پەیوەندی ناشەرعی سێكسی، بوختانكردن، خواردنەوەی شەرابو هەڵگەڕانەوە لە ئاین. بڕینی دەستو قاچ سزایەكە بەمەرجی زۆر تایبەتی بۆ دزی دانراوە (بەدەگمەن جێبەجێ دەكرێ)، بەڵام سزا بۆ ڕاكردن لە سوپا دانەنراوە، هیچ پێشینەیەك بۆ بڕینی گوێ نە لە ئیسلامو نە لە هیچ شوێنێكی دی

نیە. ژنانی خوارووی عێراق دەستو روخسارو سنگیان بەخاڵو بازنگ دەرازێننەوە، بەڵام بە کوتان، نەك بەداخکردن. داخکردن تەنها لە خەیاڵدانی سەدامدا هەیە کە هەمیشە خاکێکی بەپیتە بۆ ئەوجۆرە کارانە.

داخکردنو دارکاریو قامچی لێدان سزایەکە لە ئینگلتەرا لە کاتی گەڕاندنەوەی پاشایەتی ئەنجامدەدرا. بەڵام ساڵی ١٧٧٩ پارلەمان ئەم سزای هەڵگرتو لەبری ئەوەش سزای زیندانکردنو تۆبەکردنی دەرکرد، کەچی لە پاش جەنگی کەنداوەوە دەستبڕین بوو بە سزایەکی تازە. داخکردن سزایەك بوو کە دواتر بە خەیاڵە نەخۆشەکەی ئەنجامدەرەکەیدا هات.

بنچینەی داخکردن دەگەڕێتەوە بۆ کەموکورتی یاسای ژمارە ٥٩، ساڵی ١٩٩٤، بەپێی ئەو یاسایە سزای دزین بڕینەوەی قاچی چەپ بو لە ئەژنۆوە. لە بەغدا قسەی ئەوە بڵاوبوەوە کە سەدام لەگەڵ ئەم یاسایەدا تووشی کێشە بووە، چونکە بەسەدان جەنگاوەری دەستو قاچیان لە جەنگدا پەریووەو لە رووی فیزیاییەوە لە دزەکان جیاناکرێنەوە، بۆیە دەستو قاچ بڕین مەبەستی خۆی نەدەپێکا. شەرەفی میلەت لە مەترسیدا بوو.

کاربەدەستە پیوریتانتەکان لە رۆمانی (نامە سورەکە)ی هۆڤورندا لە چەرخی حەڤدەهەمدا شەرەفی خۆیان بە داخکردنی ژنە قارەمانی رۆمانەکە پاراست. پیرێژنەکانی شاری بۆستن زۆر لەوە توڕە بوون کە دادوەری شارەکە بەوەندە قایلبوو بەپیتی (A) لە بەرامبەر (خیانەتکار - Adultress) لەسەر دامێنی کراسەکەی (هێستەر پیرن) بچنرێت. یەکێك لە ژنە پەستەکان کە لە بەردەرگای زیندان چاوەروانی دەکرد بە توڕەییەوە دەڵێت: "هیچ نەبوایە بە شیشی سورەوەکراو لەسەر نێوەچەوانی داخبکرایە". ئەمە هەمان هەستی ئەو کاربەدەستە بەعسییانەیە کە لە کتێبی کۆماری ترسدا باسمکردووە.

بە مەبەستی گەڕان بەدوای ئەو سەرچاوە مێژووییانەی بەر لەبیرکردنەوەی ئەو یاسا تازانە بەمێشکی ئاڵۆزی سەدام حسێندا گوزەری دەکرد، گەڕامەوە بۆ حەوت بەرگەکەی (موسوعة العذاب)ی (عبود الشالجي) لەبارەی ئەشکەنجەدان لە جیهانی



ئیسلامدا. (عەبود ئەلشالجی) رۆحێکی عێراقی مەزنەو شارەزایی لە مێژووی سەدەکانی ناوەراستی جیهانی ئیسلامدا هەیەو لە ساڵانی سییەکانەوە پارێزەرو دادوەری گشتی بوەو ئەزمونێکی زۆری لەم بارەیەوە هەیەو هەمیشە دژی سزای قورس بووە. لەپاش خانەنشینکردنییەوە لە شاری بەیروت خەریکی تۆمارکردنی ئەو وردەکارییانە بووە کە دەسەڵاتداران لە مێژووی ئیسلامدا بەرامبەر جەستەی ژنو پیاوان ئەنجامیان داوەو زۆرێك لە جۆرەکانی سزادانی تۆمار کردوە. کارەکەی عەبود بریتی بووە لە وەسفکردنو پۆلینکردو تۆمارکردنو رێکخستنی ئەشکەنجەدان، هەروەها دەربڕینی دەنگی نارەزایی لە رۆژهەڵاتی ناوەراستی ئیسلامیدا. ئەم لێکۆڵینەوەیە زۆر پێویستە بۆ تێگەیشتنو راهاتن بەو لایەنەی مێژوومان کە زۆر جار نامانەوێت دانی پێدابنێین. کتێبەکە حەکایەتی ئەو ئەشکەنجەدانانە دەگێڕێتەوە کە لە ژێر ناونیشانی راکێشان، تێهەڵدان، راکێشان بەگوێ، هەڵواسین بە پەلێك، هەڵواسین بەدوو پەل، هەڵواسین بە مەمك، خەساندن، زیندە بەچاڵ کردن، بڕینەوە بە مشار، هتد، پۆلێن کراون. ئەوەی بە خەیاڵدا بێت فەرامۆش نەکراوە.

بەڵام لە ئینسکلۆپیدیا (٢٦٠٠) لاپەرەییەکەی شالجیدا بەڵگەیەکم بەرچاو نەکەوت تیشك بخاتە سەر ئەو شتانەی کە سەدام حسێن ساڵی ١٩٩٤ کردبوی. ساڵی ١٩٩٦ بەماوەیەکی کورت پێش مردنی لە شالجیم پرسی ئایا بەبیری ئەو هیچ پێشینەیەکی مێژووی هەیە بۆ ئەو یاسایانەی کە سەدام دەریکردوون. لە وەڵامدا چیرۆکی (خوارزمی) ی بۆ گێڕامەوە کە لە سەدەی دەیەمدا یەکێك بو لە نوسەرەکانی عەرەب. خوارزمی گومانی نادڵسۆزی لێدەکراو لە سزای ئەوەشدا فەرمانڕەوایەك نێوچەوانی داخکرد. لە ئەنجامدا خوارزمی هەرگیز نەدەچوە ناو خەڵکییەوە گەر دووجار مێزەرەکەی بەدەوری سەرییەوە نەپێچایەتەوە بۆ ئەوەی شێواندنەکەی بشارێتەوە.

ئەمە تەنها خاڵێکە بۆ ئەوەی لە خەیاڵی سەدام حسێن تێبگەین. هەمو شێوەیەکی سزادان گریمانەی سروشتی مرۆڤ دەکاتو چۆن ئەو سروشتە بۆ ناچارکردنی مرۆڤ بەکاردێت بۆ ئەوەی گوێڕایەڵ بێت. لە رۆمانەکەی جۆرج ئۆروێڵ (١٩٨٤)، وینستن، کاراکتەری سەرەکی رۆمانەکە، کاتێك دەروخێت کە هەڕەشەی بەشتێك لێدەکەن

که زۆر لێی دەترسێت، ئەویش بە جرج پەلاماری بدەن. چەوسێنەران بەنهێنی کاریان لەســەر ئــەوە دەکرد تــا بزانن بیرکردنــەوەی چۆنەو حەز لە چــی دەکاتو چی زۆر پێناخۆشە، تا بەشێوەیەکی زانستی خاڵە لاوازەکانی کەسایەتیو روخاندنی بدۆزنەوە. بۆیــە کاتێك باریدەکەن لەتاوانو لــەرووی دەرونییەوە دەیروخێنن، ئیدی ویســتنیش وەك هەر هاوڵاتییەکی ئاســایی (ئۆشــینیا)ی دێتەوە بەرچاو، وەك کەسێکی ئاساییش هەڵسوکەوت دەکات، بەڵام سزا تازەکەی سەدام بە پێچەوانەی ئەمەوە کاردەکات، چونکە مەبەست لە سزاکە ئەوە نیە سزادراوەکە لە خەڵکانی دی بچێتو بتوانێت بۆ دۆخی جارانی بگەڕێتەوە، بەڵکو مەبەســت ئەوەیە ناموسی بشکێتو وەك دزێك یا ترسنۆکێك داخبکرێتو هەتا ماوە هەست بەشەرم بکات، نەك بەتاوانباری.

تاوانباری حوکمێکە کاتێك هەستدەکەین لە مۆراڵێکی دیاریکراو لاماندراوە، بەسەر خۆمانیدا دەســەپێنین، ئەمەش شــتێکە سزادراوەکانی یاســا تازەکە هەستی پێناکەن، چونکە رژێمێکی ناشــەرعیو نادەســتوری ئەو ســزای بەسەردا ســەپاندون، بەڵام لە لایەکی دی، شەرەف، شتێکە رۆدەچێتە ناخی کەسایەتیو ناسنامەی کۆمەڵایەتییەوە. داخکردن پێشــێلکردنی ئەو شەرەفەیە، بێئەوەی گوێ بدرێت بەوەی ئەو کەسە چی کــردوە یــا چی نەکــردوە. ئەمەش وایە، چونکە زۆرێك لەو شــتانەی شــانازی پێوە دەکەین، لەو شــتانەی چــاوەڕوان دەکەین خەڵکانی دی چــۆن بیرمان لێدەکەنەوە، ســەرچاوە دەگرن. ئەم بیرکردنەوەیە پەیوەندی هەیە بە "ئابروچون"و بەوەی خەڵکی چۆن وێنامان دەکەن.

خێڵەکانی تکریت کە سەدام یەکێکە لەو خێڵە، لە سەردەمی عوسمانیدا ناوبانگیان لە"چاوشــکاندن"دا دەرکردبــو، خێڵەکانی تکرێت هەر حاکمێکیــان بەدڵ نەبوایە، خۆیو ژنو منداڵەکانیان بۆ ماڵی یەکێك لەسەرەك هۆزەکان داوەت دەکرد، لەکاتی گەڕانەوەیدا دەســتەیەك چەکداری دەمامك کراو، رێگەیان پێدەگرتنو حاکمەکەیان ریســوا دەکرد، بەزۆریش لەرێگەی لاقەکردنی ژنەکەیەوە ئەو کارەیان دەکرد، پاشان هێرشــکەرەکان دەمامکەکەیان لادەداو کەسایەتی خۆیان ئاشکرا دەکردو دەرۆیشتنو کەسیشــیان نەدەکوشــت، ئیدی حاکمەکە نەیدەتوانی کارەکانی لە تکریت ئەنجام



بدات.

لــە ســاڵانی حەفتاکاندا، ئەو هــۆزە بەمۆدێرنەکراوانە بوون بە ئامێرێك بەدەســتی بەعســییەکانەوە. زۆربــەی بەغدایییــەکان حەکایەتی ئــەو خێزانە ئۆرســتۆکراتیانەی پەیوەندییــان هەبو بەرژێمی پێشــووە دەگێڕنەوە کە چۆن لەلایەن کوڕەکەی ســەدامو داروەدەســتەکەیەوە چاویــان دەشــکاندن. کچــە گەنجەکانی ئــەو خێزانانە لە کاتی گەڕانەوەیــان لە یانە ناســراوەکانی بەغدا، لەســەر شــەقامەکان دەرفێنــران بۆ چەند هەفتەیەك وندەبون، پاشان دەهاتنەوە، ئیدی هەمو کەسێك دەیزانی کە لاقە کراون، بەڵام کەس، بەخودی قوربانییەکەشەوە لەم بارەیەوە قسەینەدەکرد. ئەو شەرمەزارییەی روبــەروی خێزانی ژنە رفێنراوەکەو خودی ژنەکــەش دەبوەوە، پەیوەندی بەوەوە هەبو کە رای گشــتی دەیانزانی چی روویداوە. ئەو زانینە شــەرمەزارییەك بوو کە لە خودی دەســتدرێژییەکە بەسوێتر بوو. دەســتبرینو داخکردنیش بەهەمان لۆژیك کاریدەکرد. جیاوازییەکە لەوەدا بو کە دزینو لە سوپا هەڵهاتن هەڕەشەیەکی راستەقینە بوو لەسەر ئاسایشــی رژێمو وەك حاڵەتی ژنە رفێنراوەکانی سەر شــەقامەکانی بەغدا لە خزمەتی ئارەزووە ناپەسەندەکانی نەوەکانی سەدام نەبو.

## راستی لە سەردەمە تاریکەکاندا:

من لە بەشــێکی کتێبــی (دڵڕەقیو بێدەنگی)دا، بە ناونیشــانی "توندوتیژی لە دژی ژنی عەرەب" درێژەم بەچەند خاڵێك داوە. لەو بەشــەدا باســی ناسنامەیەکم کردبو کە چۆن دەســتم کەوتبو. ناســنامەکە بەناوی (عەزیز ســاڵەح ئەحمەد)ە کە کارمەندێکی پۆلیســی ئاســایش بو. پیشــەکەی لە ناســنامەکەدا بە دەستدرێژیکردنە ســەر ژنــانو ئابرودبردنیان دەستنیشــان کرابوو. ئەو کاتە نوســیبوم، عەزیز ســاڵەح ئەحمەد کارمەندێکی پۆلیســی نهێنییەو ئاســایش لە بەرامبەر دەســتدرێژیکردنە سەر ژنانی عێراقی مووچەی پێدەدا. بۆیە کاتێك دەســتدرێژیدەکردە ســەر ژنێکی عەرەب یا کورد، لەبەرچاوی بەرپرســەکانیدا بەتەنها دەســتدرێژی نەدەکردە سەر ژنەکە وەك

تاکێك، بەڵکو دەستدرێژی دەکردە سەر پیرۆزی نامووسی هەموو خێزانەکەی. مەبەستی سەرەکی دەرهێنانی زانیاری نەبو، بەڵکو زڕاندنی نامووسی هەمو خێزانەکە بو. بەگوێرەی یاسا تازەکانی سزادانی سەدام حسێن، قوربانییەکانی (عەزیز ساڵەح ئەحمەد) وەك مرۆڤ سەیر ناکرێن، بەڵکو وەك ئامێرێك بۆ دەرخستنی شکۆو "نامووس"ی کەسێکی دی.

لە مایسی ساڵی ١٩٩٧دا نامەیەکی زۆر نائاساییم لە زەلامێکەوە پێگەیشت کە خۆی بە "ئەبو محەممەد" پێناساندبووم (دیارە ناوێکی خوازرابوو). ئەبو محەممەد پەنابەرێك بو لە ئەوروپا. لە نامە دورودرێژەکەیدا نوسیویێتی بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێت کە پێمرابگەیەنێت ماوەی حەوت ساڵ کارمەندی دەزگای ئەمنی عێراقی بوە. لە نامەکەیدا دەڵێت کتێبی "دڵڕەقیو بێدەنگی"ی خوێندۆتەوە کە لە چاپێکی بچوکدا بە زمانی عەرەبی لە هەولێر چاپکراوەو بەدزییەوە نیردراوە بۆ بەغدا، بەگشتی کتێبەکەی بەدڵ بوەو هیوادارە ببێتە مایەی "شکاندنی دیواری بێدەنگی لە دەوری ئەو تاوانانەی" کە حیزبی بەعس لە عێراقدا ئەنجامی دەدا، "هەروەکو عێراقییەکان لە گۆڕەپانی سەعد لە بەسرە دیواری ترسیان رووخاند".

بە هەر حاڵ پوختەی داواکارییەکەی لە نامە پێنج لاپەرەییەکەیدا ئەوەبو کە من هەڵەبووم لە لێکدانەوەی ئەو ناسنامەیەی ناوی (عەزیز ساڵەح ئەحمەد) هەڵگرتبو. دەیەوێت ئەوە بزانم کە هەموو ئەوانەی لە ئاسایشی رژێمدا کاریان دەکرد دڵڕەقو دڕندە نەبوون. بە ئەزموونی خۆی لەگەڵ ئەوجۆرە فایلانەدا دەزانێت ئەوە کاری لقێکی ئاسایشە لەناو دەزگایەکدا کە پێی دەوترێ (بەشی ٤٥). کاری ئەو لقە رێکخستنو پۆلینکردنی فایلە لە بارەی ئەو هاوڵاتیانەی لە "دەرەوەی دەزگاکەدا" بوون، ئیدی ئەو هاوڵاتیانە خەڵکی ئاسایی بن یا کارمەندی حکومەت، بە پلە جیاوازەکانیانەوە، بۆیە هەر کاتێك هاوڵاتییەك تومەتێکی دەخرێتەپاڵ، پێشەئەوەی لێکۆڵینەوەو پرسیاری لێبکرێ، لە لقی ٤٥ فایلەکەی دەکرێتەوەو تومەتەکەی، نەك پیشەکەی، لەسەر فایلەکەی دەنوسرێت. من دەرەوەی فایلەکە، نەك ناوەرۆکەکەیم دیوەو ئەنجامی هەڵەم لێهەڵگۆزیوە. لەوانەیە عەزیز ساڵەح ئەحمەد، کارمەندێکی



ئاسایی بێتو تومەتی دەستدرێژیی خرابێتەپاڵ، یا لەو بارەیەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کرابێت. (ئەبو محەممەد) گومان لەوە دەکات ئەو کەسە کارمەندێکی ئاسایش بێت، چونکە ئەمجۆرە فایلە هەستیارانە بەجیا لە (لقی مەسەلە سیاسییەکان)دا هەڵدەگیرێت. پاشان دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە "کتێبەکەت بۆنی راستی لێدێت، بەڵام زۆر رۆیشتویت کاتێك دەڵێیت "عەزیز ساڵەح محەممەد" دەستدرێژی دەکاتە سەر شتێك کە سەرکردەکانی بەفەرمی ناوی (شەرفی)ی لێدەنێن. ئایا ئەمە بەپێی لۆژیك تومەتەکانت پوچەڵ ناکاتەوە؟

بەرزراگرتنی ئەو بەهایانەی کە مرۆڤ بەئەنقەست پێشێلیدەکات، بەتایبەتی لە سیاسەتدا، نەریتێکی ئاسایی مرۆڤە. یاسا تازەکانی سزادانی سەدام حسێن، خۆیشی وەك هەمو کەسێکی دی دەگرێتەوە، هەر ئەوەشە خزمەت بەمەبەستە سیاسییەکانی دەکات، چونکە باش دەزانێت ئەو شتانە پێشێلدەکات کە کۆمەڵگە نایەوێت پێشێل بکرێن. ئەوەش بە بیانوی ئەوەی کە هەمو شتێك پابەندە بەمانەوەی لە دەسەڵاتدا. بۆیە کاریگەرترین سیاسەت لە بەرامبەر سەرکردەیەکی وەك سەدام حسێندا ئەوەیە کە ئەو یاسایانە لە دژی خودی خۆی بەکاربێن، بۆ ئەوەی خودی خۆی، نەك قوربانییەکانی لەبەردەم جیهانو میلەتەکەیدا "رووی بشکێت".

ئەمەش کارێکی ئاسان نیە. بەهەر حاڵ بۆ گەیشتن بەم ئامانجە دەتوانرێت هەڵمەتێکی ریسواکردن لەلایەنێکی نێودەوڵەتییەوە (وەك دادگای نێودەوڵەتی) بۆ چاودێریکردنو دادگاییکردنی هێندێك لە پایە بڵندەکانی رژێم، بەتومەتی ئەنجامدانی تاوان لەدژی مرۆڤایەتی، دەست پێبکرێت.

بەهەر حاڵ، خاڵی سەرەکی نامەکەی ئەبو محەممەد لەمەدا نیە، بەڵکو لەوەدایە ئایا بەراستی من لە مەسەلەکە گەیشتووم. نوسەری نامەکە ئەو باکگراوندو دەقانەی لایە کە لەلای من نیە، چونکە من لەسەر بەڵگەنامەی ناوفایلێك کارم دەکرد کە لەلایەن شۆڕشگێرە کوردەکانەوە بەدەستم گەیشتبو، ئەوان بەتەواوەتی لەوە دڵنیابوون کە عەزیز ساڵەح ئەحمەد، دەستدرێژکەرێکی فەرمی بوە. ئەبو محەممەد زۆر بەوریاییو بەوردەکارییەکی زۆرەوە باسی ئەوەی بۆ کردوم کە فایلە نهێنییەکانی رژێم چۆن کار

دەکەنو هەوڵێکی زۆری داوە هەموو وشەیەکی نامەکەی جێی بڕوابن.
گومانی تیایدا کە ژووری دەستدرێژیکردنی سێکسی لە زیندانەکانی عێراقدا هەبووە. لە کوەیتی داگیرکراودا ژوورە بەدناوەکانی لاقەکردن لە ناوچەی (شوەیخ)دا بوو. ئەو منداڵانەی لە ئەنجامی ئەو دەستدرێژیکردنانەدا هاتبونە دونیاوە، خرانە هەتیوخانەی (دار الطفولة)وە. چاوم بەو ژنە عێراقییانە کەوت کە لاقەکرابون، یا بەلانیکەمەوە، خەڵکی دەیوت لاقەکراون. ماوەیەکی زۆر لەگەڵیاندا دانیشتمو پێیان راگەیاندم کە لاقەکردن لە زیندانەکاندا شتێکی ئاساییە، بەڵام کاتێك براکان یا باوکیان یا مامەکانیان لەوێ دەبوون نکۆڵیان لەوە دەکرد کە دەستدرێژییان کرابێتە سەر، یا وەڵامیان نەدەدایەوە. من بۆ خۆم ژووری لاقەکردنم لە بارەگای ناوەندیی ئاسایش لە سلێمانی بینیو کۆمەڵێك جلوبەرگی ژنانەش لەو ناوەدا کەوتبون. بەبینینی ئەو دیمەنە هەستم بەرشانەوە دەکرد، هەروەها فیلمێکی ڤیدیۆییم پیشاندرا کە پێناسەکەی (عەزیز ساڵەح ئەحمەد)ی لە هەمان ژووری دەستدرێژیکردندا دەردەخستو شۆڕشگێرە کوردەکانیش دڵنیایانکردم کە پێناسەکە راستەو ساختە نیە. مێژووی سەر تەیپەکە ئەوەی پێشاندەدا کە چەند رۆژێك پاش راپەرین ئەو وێنە ڤیدیۆییانە گیرابوون. بەگوێرەی گەواهی ئەحمەد بامەڕنی لە ٢٦ی سێپتەمبەری ١٩٩١، لە پاریس، کاتێك بەندیخانەکانی پۆلیسی نهێنی گیراون، بەدەیان ژن لەگەڵ ئەو منداڵانەیان کە لە گرتوخانەدا لەدایك ببون، ئازاد کران. هەر لەو دانیشتنەدا کە من تێیدا ئامادەبووم، دکتۆر هیشام ئەلحەسەن، لە شایتنامەیەکی هەست بزوێندا باسی لەوە دەکرد کە ئەو نەخۆشانەی لە هەشتاکاندا سەردانیان کردبوو لەلایەن پیاوانی ئەمنەوە دەستدرێژییان کرابوە سەر. لەو بەڵگانەوە کە بەوردی لە کتێبی (دڵڕەقیو بێدەنگی)دا باسمکردون، لەوە دڵنیا دەبم کە دەستدرێژی فەرمی لەلایەن رژێمی بەعسەوە، بەشێوەیەکی بەربڵاو ئەنجامدەدرا، بەڵام رەنگە لە بارەی دامەزراندنی کەسێکی تایبەت بۆ لاقەکردنو دەستدرێژی هەڵەم کردبێت.



## قوربانیبوونو داهاتوو لە عێراقدا:

ئەو هەڵەیەی کردبووم لەوانەیە لە داهاتودا دووبارەبێتەوەو ئەنجامی خراپیشی لێبکەوێتەوە، هەر ئەوەش بو بەمایەی ئەوەی پیشەکەم وەك ئەندازیاری بیناسازی فەرامۆش بکەمو خۆم بۆ رەخنەکردنی وڵاتێك تەرخان بکەم کە هێشتا پێناسەکەی هەڵدەگرم، بۆیە نوسینی پێشەکییەك بۆ ئەم کتێبە بەگرنگ دەزانم. لە بارودۆخێکی وەك رۆژهەڵاتی ناوەراستدا بەهۆی شەڕی ناوخۆ، شۆڕش، راپەرین، تیرۆری کەسیو دەوڵەتیو رژێمی نەتەوەپەرستی تاك حیزبی، لەتوپەت بووە، زۆر ئاساییە حەز بەلایەنگری قوربانییەکانی ئەو بەدکارییانە بکەن، لە کتێبەکەشمدا هەوڵمداوە هەر ئەو کارە بکەم. لە بارودۆخێکدا کە خواو ئاین ئامادەگییەکی ئاشکرایان نەبێت (هەر نەبێ بۆ من)، مرۆڤ لەو جیهانە دۆزەخییەی تیایدا دەژی، پێویستییەکی زۆری بە دڵنیاکردنەوەیەکی ئاکاری هەیە. ئەڵتەرناتیڤی هاوسۆزی لەگەڵ قوربانییەکاندا دابەزینە بۆ هەستی گومانکردن لە هەمو کەسێكو رق لەخۆبوون، سەبارەت بەئەگەری رووخێنەری ئەم کارەش ئەم سەدەیە هەمو شتێکی پێوتوین کە پێویستە بیزانین. مەترسی ئەمجۆرە دیاریکردنەش دەبێتە مایەی لاوازی توانای رەخنەگرتنو کەمبونەوەی هەستکردن بەرامبەر بەراستییەکانی جیهان.
من لە کتێبی (دڵڕەقیو بێدەنگی)دا باسی ئەو خاڵەم کردوە کە چۆن رۆشنبیرانی عەرەبو لایەنگرەکانی عەرەب بەهۆی ئەو شکۆمەندییە زۆرەی بە قوربانییە فەڵەستییەکانیان داوە لە ئاست سروشتی رژێمی عێراق کوێراییان داهاتوە، هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی لە کاتی جەنگی کەنداودا ئەو هەڵوێستە وەربگرن. لە ئەنجامداو لەساتەوەختێکی چارەنوسسازی مێژووی عێراقدا، خزمەتی بەرژەوەندییەکانی عێراقیان کرد. بەهۆی ئەوەشەوە دڵی زۆر کەس شکا، شەڕە دەنوکی ناو ئەکادیمییەکان هەڕەشەی لێکراو و ئەو رۆحی هاورێتییەش نەما کە بۆ دەیان ساڵ دەگەڕانەوە. بۆیە جارێکی دی کە بەپاشماوەی ئەو هەمو شتانەدا دەچمەوە، ئنجا دەزانم ئەو هەڵەیەی

تووشـیبووین، هۆیەکـەی دەگەڕێتـەوە بۆ ئەوەی لـە خودی سروشـتی قوربانیبووندا شـتێك هەیە کە چارەسـەری ئاکاریی هەموو شتێك دەکات، بەڵام شتێکی لەوجۆرە نیـە، رەنگـە بەپێچەوانـەوە بێـت: قوربانیانی توندوتیـژی‌و ناعەدالەتی نـەك هەر لە چەوسێنەرانیان باشـتر نین، بەڵکو زۆرجار چاوەڕوانی ئەوە دەکەن جێگەیان لەگەڵدا بگۆڕنـەوە. ئەمەش ئەزمونی ئیسـرائیلییەکان بوو، بەتایبەتی لە سـاڵی ١٩٧٦ەوە کە بـوون بە هێزێکـی داگیرکەر، هەروەهـا ئەزمونی فەڵەسـتینی‌و کوردەکانیش بوو کە لەم سـاڵانەی دواییەدا خۆیان حوکمی خۆیان دەکەن. پێشـێلکردنی مافی مرۆڤ لە غەزە لەسـایەی دەسـەڵاتی نەتەوەییدا هێدی هێدی پەرەدەسـێنێت (کوشتنی فەرمی فەڵەسـتینییەکان بە تومەتی "ئابرووبردنی" فەڵەسـتینییەتی خۆیان‌و فرۆشـتنی زەوی بە جولەکەکان، لەو پێشێلکارییانەن)و لە باکوری عێراقیش لەو رۆژەوە کە شەڕی نێوان حیزبەکان لە مایسـی سـاڵی ١٩٩٤دا دەسـتیپێکرد، لە پەرەسـەندندایە (یەکێك لە گرنگترین ئەو پێشێلکاریانە داواکردنی مەسعود بارزانی بوو لە سەدام حسێن بۆ ئەوەی هەولێر داگیربکات کە لە ساڵی ١٩٩٢ەوە مەڵبەندی پارلەمانی کوردستان بوو).

ئەو نوسـەرانەی لـە من دەچن‌و ئەوانەش کـە لە (دڵڕەقی‌و بێدەنگـی)دا رەخنەم لێگرتـون، بەهـۆی دەسـتەپاچەبوونمان لـە ئاسـت ئـەوەی (جودیـس شـکلار Judith shklar) نـاوی لێدەنێت (چـڕی خراپەکاری The density of evil) پەنا بەرینە بەر مەسـەلەی "چەوساوەبوون". چەوسـاوەیی سروشتێك نیە، بەڵکو بارودۆخێکە لە کەسـایەتی چەوسـاوە کەمدەکاتەوە، هەروەها ئێمەش کە ئازار نەدراوین‌و دەنوسین، هەڵە دەکەین کاتێك توڕەیی‌و شـەرمەزاری لەناومان دەبات. مەترسـی لەوەدایە گەر بمانەوێـت لە ناوچەیەکی وەك رۆژهەڵاتی ناوەڕاسـت کە بارگاوییە بەکەشـوهەوای سۆزو هەڵچوون، ئەمە لە بیربەرینەوە، چونکە چەوساوەیی بارودۆخێکە دەشێت هەمو کەسێك، بەچەوسێنەرانیشەوە، بگرێتەوە.

بێگۆمان لە عێراقی سـەدام حسـێندا بارودۆخەکە بەمشـێوەیەیە. لە پاش جەنگی کەنداوی ١٩٩١دا رژێمە بێجڵەوەکەی عێراق خەڵکی عێراقی تاسـاندو ناچاریکردن ئامێز بۆ شتی بچوکتر بکەنەوە، وەك پەیوەندی خێزان، هۆزو تیرەی ئاینی، لە ئەنجامدا



بەرژەوەندی تاکەکەسـی. سـەدام حسێن لەو جیهانەدا لە دەسەڵات مایەوە کە شێوە سـەرەکییەکەی لە ناوەراسـتی حەفتاکانەوە دامەزرابوو. هەر چەندە سـەدام حسـێن پیاوێکی خراپەکار بوو، بەڵام خۆی نەك هەر بەسـەرکردەی بەشـێکی بەرتەسـکی تیرەیـەك دادەنا، بەڵکو خۆی بە سـەرۆکی هەمو عێراقییەکان دەزانێت‌و بەردەوام لەو مادە مرۆییەی لەبەردەستیدابوو، دوژمنەکانی دادەهێنا، هەروەها پێش کوشتنی هەر دوو زاواکەیشـی کە لە شوباتی ساڵی ١٩٩٦دا لە ئەردەنەوە بۆ بەغدا گەڕانەوە، بەردەوام ئەندامانی خێزانەکەی خۆیشی پاکتاو دەکرد. سەدام حسێن بە پێویستی دەزانی جار بەجـار ناوماڵەکەی رێکبخاتەوە، لەو رێکخسـتنانەوەدا قوربانی‌و چەوسـێنەرانی بەو بەهایانە گۆشدەکرد کە خۆی پێیان دەژیاو حوکمی لەسەریان دەکرد. ماوەی چارەکە سـەدەیەك سیاسـەتەکەی لەسـەر بەهای بێمتمانەیی، گومان، پیلانگێری‌و خیانەت بونیاتدەنا، ئەو بەهایانەش هەموو کەسـێك دەگرێتەوە. ئەمرۆ هەمو عێراقییەك، ئیدی چی لە ریزی ئۆپۆزیسـیۆندا بێت یا لە دەرەوەی، نیشـانەی قووڵی قوربانیبوونی پێوە دیارە. ئەو هێرشەی دەکرایە سەر کۆمەڵگەی مەدەنی (لە کتێبەکەمدا باسم کردوە)، ئەوەندە سـەختبوون چوار سـەد نوسەرو پرۆفیسـۆرو هونەرمەندو بارزگانی تاراوگەی ناچار کرد بەڵگەنامەیەك کە بەم دانپیانانە دەست پێدەکات، واژۆ بکەن:

کۆمەڵگـەی مەدەنـی لە عێراقدا بـەردەوام بەنـاو ئایدیۆلۆجیاوە پێشـێلدەکرێت، لـە ئەنجامـدا ئەو توڕەی ناسـکی‌و رەوشـتجوانی بەرهەم دەهێنێـت تەفروتونا بووە. داروخانی بەهاکان هاوکات بوو لەگەڵ رووخانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی ئازادو دوور لە زۆرلێکردن. لەم بارودۆخەدا ئەرکی سـەرەکی سەرشانی سیاسەتی نوێ بریتیە لە: ئەو کردەوە نامرۆڤانەیە نەهێڵێت‌و ژیانی مەدەنی رێکبخاتەوە.

دوای جەنگی کەنداو، ئەم مێژووە درێژەی پێشـێلکاری میراتییەکەی خسـتەکار. رژێم زۆر لاواز ببو، بۆیە زۆر باش دەیزانی تەنانەت بە بەکارهێنانی ئەو زەبرە زۆرەیش کە لە کتێبەکەدا باسمکردوە، ناتوانێت کۆنترۆڵی کۆمەڵگە بکات، لەبەر ئەوە ناچار بـوو پەنا بـۆ تیرەگەرای‌و هۆزگەرای بەرێـت وەك ئامێرێك بۆ حوکـم کردن. لەبەر ئەوەی عێراقییەکان ترسـیان لە پۆلیسـی نهێنی شـکابوو، بۆیە هاندەدران لە یەکتری

بترسن. دوای ئاگربەستی جەنگی کەنداو سەدام حسێن یەکسەر سیاسەتەکەی بۆ هاندانی تیرەگەرای نێوان سونەو شیعە گۆڕی (بەهەمان شێوەی سلۆڤۆدان میلۆڤیچی کۆنە شیوعی کە لە پێناوی مانەوەی لە دەسەڵاتی یۆگۆسلاڤیایەکی داڕووخاودا پەنای بۆ هاندانی نەتەوەپەرستی سربییەکان برد). گەر سەدام حسێن تا ئێستا لە دەسەڵات مابێتەوە لەبەر ئەوە نیە کە بە زیرەکی خۆی لە ئیدارەی ئەمەریکای بردۆتەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ئەو سونانەی خستویەتییە نێو سیاسەتەکەیەوە، لەوە دەترسن لەدوای ڕۆیشتنی سەدام چییان بەسەرا دێت. ئەم زۆردارە لە دوای جەنگی ١٩٩١ەوە لە دەسەڵاتدا مایەوە، لەبەر خۆشەویستی نیە (ئەمەیان هەرگیز لە عێراقدا نەبوە)، یا ئەو دەسەڵاتەی تا جەنگی کەنداو پەیڕەوی لێدەکرد (لە کتێبەکەمدا باسم کردوە)، بەڵکو لە ترسی ئەوەی ئایندە چی شتێکی لە دوتوێدا هەڵگرتوە.

ڕۆشنبیرێك کە لە بەغدا دەژیو نەیویست ناوی خۆی ئاشکرا بکات، پێی وتم: "ئەگەر ڕژێم ڕووخا دەتوانیت ئەو ئاژاوەیە بهێنیتە بەرچاو کە ڕوودەدا، هەژارەکان پەلاماری ئەو کەسانە دەدەن کە لە خۆیان باشترن. هەمو کەسێك چەکی هەیە، بۆیە وڵات ڕوبەڕوی ئاژاوە دەبێتەوە. هەندێك جار ڕژێم خۆی هانی بیرۆکەی ڕووخان دەدا، ئەمەش وەك ئەوەیە کە پێمان بڵێت: "سەیر بکەن گەر ئێمە نەمێنین، چی ڕوودەدا".

چەوساوەو چەوسێنەر زۆر بەئاسانی جێگۆڕکێ دەکەن. لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا زۆرجار ئەم شتە ڕوویداوە. ئەو کەسە ئاساییانەی ئەزمونەکەیان دیوە لەمە تێدەگەن (ئەگەر چی نەتەوەپەرستەکانی دەرەوە لەمە تێناگەن). لەم ڕاستییەوە دەگەنە ئەو ئەنجامەی دەبێ بەهەر شێوەیەك بێت لەدرامای ئاڵۆگۆڕکردنی ئەو توندوتیژییەی بەرامبەر یەکتری کە لەوانەیە سەرسەختانە ڕابکێشرێنە ناوی، خۆیان لابدەن.

ئەبو محەممەد کێیە؟ پێیموایە یەکێکە لەو ملیۆن عێراقییانەی کە جەنگی کەنداو باری ژیانی مادیو سایکۆلۆجیو شوێنی نیشتەجێ بوونو بۆچونی سیاسییانی گۆڕی. بێگومان ئەبو محەمەد دەیەوێت جارێکی دی بۆ عێراق بگەڕێتەوە، بەڵام حەز دەکات وڵاتەکەی بەهەمان شێوەی جارانی نەبینێتەوە. بەڕاستی هەر ئەوەندە دەزانم.



خۆی دان بەوەدا دەنێت کە پۆلیس بووە، بەڵام ناڵێت چەوساوەیە (هەر چەندە لە تاراوگە دەژێت). ئایا لە ڕاپەڕین بەشداریکردوە؟ ئایا حەز بەنامە نووسین دەکات؟ ئایا هەوڵی بێتاوانی خۆی دەدا کاتێك دەڵێت: "ئێمە هەموومان ئەوەندە خراپ نەبووین"؟ ڕەنگە وابێت. ئەی چی؟ کەسایەتییە نادیارەکەی گرنگ نیە، ئەوەی گرنگە جۆرە ڕاستییەك لە نامەکەیدا بەدیدەکەم. بەسەدان هەزار کەسی وەك ئەبو محەمەد لە عێراقدا دەژین. کتێبی (کۆماری ترس) حەکایەتی ئەوجۆرە کەسانە دەگێڕێتەوە کە چۆن بوون بە نوێنەری ترسناکترین دەزگای ئەو ڕژێمەی جاران بەهێزترین دەوڵەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو (جگە لە ئیسرائیل)، ئەو ڕژێمەی لەسەر بازنەی خراپەکاریو قوربانیبوون دامەزراوە. ئەو چەوسێنەرانە بەویستی خۆیان کارەکانیان ئەنجام نەداوەو ئێستاش بوون بەقوربانیو چاویان لەدوارۆژە، بەڵام هەست بەترس دەکەن لەوەی کە ڕەنگە لە داهاتودا بەرەنگاریان بێتەوە.

هەموو داهاتوویەکی دوای بەعس بەنزیکەیی وەك ڕۆیشتنە بەسەر تەنافداو ڕاگرتنی هاوسەنگی نێوان شکایەتی ئەوانەیە کە ستەمەیان دیوە لە بەرامبەر ئەوانەی ستەمیان کردوە، بۆیە تێکچونی ئەو هاوسەنگییە دەبێتە مایەی پارچەپارچە بوونی وڵات. عێراقی پاش سەدام حسێن دەبێت بەو وڵاتەی کە هەمو کەسێك تیایدا بەدوای دادپەروەریدا دەگەڕێت، ئەو دادپەروەرییەی ئەستەمە هیچ کەسێك بتوانێت دابینی بکات. ئەوجۆرە ڕاستییەی ئەبو محەممەد باسی دەکاتو زۆر کەس بەدوایدا دەگەڕێت، سەرەڕای تاریکی دونیای ڕاستو هەڵەو کێ چی لەدژی کێدا کردوە، زۆر ئەستەمە بۆ ئێمە کە دوور نین لە هەڵەکردن، هەمو کاتێك بەڕاستییەکان بگەین. بەهەر حاڵ، ئەوەی هەڵەکەی بۆ ڕاست کردمەوە، ڕۆشنبیرێکی هاوپیشەی خۆم نەبوو، بەڵکو پۆلیسێکی پێشوو بوو، ئەمەش هیوایەکم پێدەبەخشێت.

ئەزمونی توندوتیژیو بینینی بنی دۆزەخ، ئەو کەسانەی توندوتیژییەکە ئەنجام دەدەن، یا ئەوانەی توندوتیژییان بەردەکەوێت، والێدەکات نەك هەر سەیری ناوەوەی خۆیان بکەن، بەڵکو سەیری دەرەوەی خۆشیان دەکەنو هانیان دەدا کە سوربن لەسەر ئەوەی ژیانیان بگۆڕن. ئەم سوربوونەمان لەسەر ژیان دەمانباتە جیهانی هەمان

ئەو راستییانەی کە بەردەوام کار لەسەر هەڵوەشاندنەوەی دەکەین. بێگومان توندوتیژی خۆی لە خۆیدا هیچ شتێك دەستەبەر ناکات، بەتایبەتی لیبوردنو پێکەوە هەڵکردن، بەڵام رەنگە ئەو پەنجەرەیە بکرێتەوە کە لێمان داخراوەو بیر لە گۆڕینی ئەو یاسایانەش بکەینەوە کە دەسەڵاتداران ژیانمانی پێ رێکدەخەن.

هۆنراوەیەکی تیۆدۆر رۆسکە Theodore Roethke بەم دێڕە دەست پێدەکات: "لە سەردەمە تاریکەکاندا چاومان دەست بەبینین دەکات". شاعیرانو هونەرمەندان وەك ئەو ئەفسانانەی سروشیان لێوەرگرتووە، دەمێکە هەوڵی رەوینەوەی ئەو تاریکییە دەدەن بۆ ئەوەی دڵو دەرونمان بەســەر جیهاندا بکرێتەوە. دەبێ ئەوانەی ســەدام حســێن دەخەن، ئەم کارە بکەن. ئەبو محەممەد کە هێمای پۆلیسێکی ترساوی حکومەتەو لەم کتێبەدا باسمکردوە، لەوە دەچێت ئەو کارەی کردبێت. لە نامەکەیدا بەو دەرئەنجامە دەگات: "روبەروبونەوەی رژێمێکی خوێنرێژی بەئەزمون، وەکئەوەی ئێســتا لە بەغدا هەیە، تەنها بەو رێگەیە دەبێت کە هەموو دەمامکەکانی لابدەیتو مردنەکەی نزیك بکەیتەوە". من پڕ بەدڵ لایەنگری لەو بۆچونەی دەکەم.

# دوای کۆتاییو پێش دومایی

## بەپێنوسی ئەحمەد رائف

ئەزمونی سەدام حسێنو حیزبی بەعس لە عێراقدا ئەزمونێکی بێوێنەیە، لەو جیهانەی کە پێیدەوترێت جیهانی سێیەمو بە ستەمو چەوسانەوەو دەستدرێژی کردن دەناسرێتەوەو لە فۆرمو قەوارەیدا هاوتای نیە، بۆیە پۆلێنکاران لە تاکە دەفرێك (وعاء) دایاناوەو تەنها ناوێکیشیان لێناوە بۆ ئەوەی لە بۆتەی گەندەڵیو ستەمکاریدا بتوێتەوە.

ئــەم وڵاتانە لەســەر داروپەردوی خەونو خەیاڵێك دروســت بون کە خەسـڵەتی ســەرەکیان بریتیە لە حوکمی ســەرچڵو بەرەڵاو ستەمکارانو تێیدا مافەکانی مرۆڤو هاوڵاتییــون بــە تەواوەتیو بەشــێوەی جۆراو جۆر پێشــێلو هەتــك دەکرێن، ئەوەش کاتێــك دەگاتە چڵەپۆپە کە کاریگەری تەواو دەبێتو دەگۆڕێت بە تێرمێکی "قەوارە دۆزەخی"و دەبێتە شتێك کە مل بۆ جیهانی چەندو ژمارە کەچ دەکاتو دور لە رۆڵی ناو و بەهاکانی کەموزیاد دەکات، پاشــان کەمترین بایەخی نامێنێتو لە سەرجەمیدا شــتێکی خورافــی پێکدەهێنێت کە لە جیهانی واقیعی کاریگــەرو کارتێکراودا بوونی نامێنێت، ئەوەش پێیدەوترێت "میلەت".

رۆژئاوا سەردەمانێك لەبەر چەندین هۆ کە وردەکارییەکانی ئەو هەویرە ئاوی زۆری دەوێت، حوکمی رۆژهەڵاتی کردوە، بۆیە لێرەدا دەکرێ لە چەند وشــەیەکدا کورت بکرێتەوە: لەبەر لاوازبونی رۆژهەڵات، رۆژئاوا جڵەوی حوکمی گرتەدەست. رۆژئاوا لەســەر زۆرێــك بەهاو فیکر کە گرنگترین کۆڵەکەی ئیســلام بو، شارســتانی خۆی بونیات نا. رۆژئاوا لە رێگەی شەڕی خاچپەرستانەی لە رۆژهەڵاتو رۆژئاواداو پێکدانە دەریاییەکانــی نێوان بیزەنتییەکانو لە رێگەی شــەڕی ئەندەلوســییە موســڵمانەکانەوە

که شانشـینه مەسـیحییەکان لە باکوری ئیسپانیا پێی هەسـتان بۆ ئەوەی لە حوکمی
موسـڵمانەکان رزگاریان بێت، ئیسـلامی رۆژهەڵاتیان ناسی. لەسـەروبەندی هەمو
ئەوانەشـدا هاوسـەرگیریو گواسـتنەوەی بەهاو چەمكو تەبەنیکردنی بیروباوەڕەکان
روویدا کە دواتر بوە واقیعی ژیانی خەڵکی وڵاتانی ئەوروپا.

لە هەمان کاتیشـدا موسـڵمانەکان کەوتنە گێڕانەوەی ئەو فیکرو بەهایانەی رۆژئاوا
لێـی سـەندبون، بەڵام لە فۆرمی تـازەدا دارێژرابونو بە تۆکمەیـی بونیاتنرابونو وەك
قـەوارەی بەهێز بەدونیادا بڵاوبوبونەوە، ئەگەر چی موسـڵمانەکان تەنها شـتی بێنرخو
پوچـەڵو ناچیزیـان وەرگرتەوەو هیـچ کەلەبەرێکی پڕنەدەکردەوە. ئەم گواسـتنەوەو
بەیەکاچونە بەدرێژایی چەندین سـەدە بەردەوام بو تا گەیشـتە ئەوەی ئەمرۆ جیهانی
رۆژئاوا پێی گەیشتونو جیهانی رۆژهەڵات تێیدا چەقیون.

پاشان شەپۆلی رزگاربون لە کۆڵۆنیالیزم هاتەئاراوە کە بەهۆیەوە چەمكو بەهای نوێ
لە جیهانی رۆژهەڵاتدا سـەریان هەڵداو زۆربەشیان پێویستیان بە پێگەیشتنو کامڵبون
هەبو. لەم مشـتومڕو بگرەوبەردەیەدا خەڵکی بەریەکدەوتنو دەوڵەتەکانیش پشێوییان
تێکەوت، وڵاتان سەربەخۆییان وەرگرتو رۆڵەکانیان حوکمیان گرتەدەست، بێئەوەی
ئایدیـا یا وێنا یا بڕوا یا بونیادێکی سیاسـی بەئەزمونیـان هەبێت کە رێگە بە ئازادیو
پێشکەوتنو گەشەکردن بدات.

شـەڕی سەربەخۆییو هەوڵە خوێناوییەکانی رزگاری بە دەرئەنجامێکی زۆر خراپ
کۆتاییـان هات، ئەگەر بە تەلەسـکۆپ لێی بڕوانیـن، دەبینین نەوەیەك یا دوو نەوەی
بەخۆیـەوە گیرۆدە کردوە. راڤەکردنی ئەوەی لەو بوارەدا رویداوە درێژە دەکێشـێت،
چونکە نەك هەر مەسـەلەیەکی پڕ لقو پۆپەو پێویسـتی بەڕوانینو شـیتەڵکاری هەیە،
بەڵکـو کۆمەڵێك بەرەڵلای سـەرچڵ حوکمیان گرتەدەسـت کە هیچ شـتێکیان پێ
نەبو پێشکەشـی بکەن، حەزو ئارەزوویەکی بێسـنوریان بۆ دەسەڵاتی رەها هەبو، دڵو
دەرونیـان خاڵی بـو لە بەهای جوامێرانە، هیچ وێنایەکی دروسـت یـا کردەوەیەکی
ئایدیاڵیان نەبو کە دوانەی سکێکن.

رەنگە رۆژگارێك لێکۆڵیاران لەسـەر ئەوە بنوسـن کـە خراپترین ماوەی ژیانی ئەو



میلەتانـەی لە دەسـەڵاتی کۆڵۆنیالیـزم رزگاریان بوە، ئەو ماوەیە بێت کە لە سـایەی
حوکمڕانی رۆڵەکانی خۆیاندا ژیانیان بەسەر بردوە، پاشئەوەی سەربەخۆیان بەدەست
هێناوە. رەنگە خەڵکانێك بڵێن ئەوەش قۆناغێکی سروشتی هەمو کۆمەڵگەو میلەتێکە،
پاشان بەرەو ئایندەیەکی جیاواز دەڕۆن، دەشێت ئەوە راست بێت، چونکە لە ئایندەدا
مێژوو حوکم بەسەر دروستیو چەوتی ئەو چەمکە دەدا.

بـەڵام ئـەوەی گـومانی تێیدا نیە ـ دەرئەنجامەکانیش لە بەردەسـتمانە ـ خراپترین
قۆنـاغ لـە مێژووی ئەو وڵاتانـەدا بەچەمکە باوەکەی حوکمی نیشـتمانییەو میلەتو
نەتەوەکەشـیان بەرەو نادیارو تاریکییەك دەبەن کە ئاکامەکەی لە قۆناغی کۆڵۆنیالیزم
خراپترو ترسناکتر دەبێت، رەنگە گرنگترین سۆنگەی ئەو قۆناغە تاریکە کە لە بایەخی
مرۆڤـی کەمکردبێتەوەو زیانی پێدەگەیاندبێت، بریتیە لەهەوڵی وڵاتپارێزەکان "حاکمە
تـازەکان" بۆ ئەفراندنی قەوارەیەکی مـادیو مەعنەویی، بێئەوەی هەتەر یا زانیاریی یا
شـارەزاییان هەبێت. پاشـان ئامانجی ئیدارەدان بۆ خەونی باڵادەستیو چەوسانەوەو
پارێزگاریکردن بەدەسـەڵاتەوە لەدەست دەدرێ. ئەوەش ئەلیکسیر ـ یکی ئەهریمەنی
ئەفسـانەییە. سـەرئەنجام گومبونی هاوڵاتیانە لە تاریکی گۆڕ یا زیندانی یا ترسـێکی
مەزن کە بوونیان بەتەواوەتی دەسڕێتەوەو ئافەروزی دەکات.

تا دەسـەڵاتی نیشتمانی شەکڵی خۆیی وەردەگرێتو پاسـاوی بوونی دەهێنێتەوەو
سـتەمەکانی راڤە دەکات، پێویستە وشە دابهێنرێت یا چەمکگەلێك بەکاربهێنرێ کە
پێشتر داهێنراوە یا چەمكو ناونیشانێك گەلاڵە بکرێ کە خۆی هەبوەو زێدەڕەوی لە
راڤەکردنی ماناکانیدا دەکرێو مۆتەیەکی لێدادەهێنرێ کە قورگی خەڵکی لە وشیاریو
خـەودا دەگرێو لەناوبـردنو قەڵاچۆکردنیان، تەنانەت لە ویژدانـی قوربانییەکانیدا،
دەکاتە کارێکی شـەرعی، ئەو چەمکانەش بریتین لـە ئیمپریالیزم، زایۆنیزمو چەمکی
دی. لـە نمایشـکردنو بەکارهێنانیانـدا زێدەڕەویـان دەکردو لەگەڵ چەوسـانەوەو
هاڕینی هاوڵاتیاندا راسـتەوانە زیادیان دەکرد. ئەگەر بەهێمنی لە گێتیو پێکهاتەکانی
بڕوانیت، دەبینی زۆرێك لەو وشـانە بوونیان نیەو کەمێکیشـیان ئـەو کاریگەرییەیان
نیە تا پاسـاوی ئەو دڵڕەقییە بێئەندازەیە بداتەوە، بۆیە مەترسـی راسـتەقینە لە جیهانو

فیکری خۆماندایە، ئەوانەی کاتێك لە کاتەکاندا دەسەڵات بۆ خۆیان قۆرخ دەکەنو لە چەمکە ئاڵۆزەکانەوە بیانو دادەتاشن، بەتێپەربونی کات دەبێتە راستیەك وەك کۆت لە ملی خەڵکی دەئاڵێتو ناتوانن لێی قوتاربنو دەبێتە کارێکی بەڵگەنەویست کە بچوکترین هەڤپەیڤینو گفتوگۆ قبوڵ ناکات، بۆیە تا لوتبەرزیو فیزنواندنو فرۆفێڵی دەستەو تاقمی دەسەڵاتگەر زیاد بکات، ملکەچیو لاوازیی رەعییەتیش زیاد دەکات، بەجۆرێك کە ترسو برسێتیو هەژاری باڵ بەسەریاندا دەکێشێت.

گەر لە واقیعی ئێمەدا بەدوای چەمکی ئیمپریالیزمدا بگەرێیت، بەدەگمەن هەستی پێدەکەیت، بەڵام وەك راستییەك یا لە گوتارو فاکتو ئامرازەکانی جەبرو حوکمو چەوسانەوەدا زۆر بەروونی هەستی پێدەکەیت، بڕوانە زایۆنیزم، بۆت دەردەکەوێت کە ئەو دەستەیە زۆر زیاتری داوە لەوەی لێی وەرگرتوین، هەروەها دەبینیت ئەو رۆڵەی ئەمان لە قەبەکردنی گێراویانە زۆر مەزنترو گەورەترە لە هەر رۆڵێکی دی کە تیوریستو زاناو سەرکردەکانیان دەیگێڕن.

پاشان دەبینیت سەرت بۆ دادەنوێننو لە بونیادی ئەهریمەنی ستەمکاریدا شتێکت پێشکەش دەکەن کە نەتوانی رەتیبکەیتەوە یا خۆتی لێی بەدوور بگریت یا نارەزایی لەسەر دەربڕیو دروشمو وشەت بەسەرا دەبارێننو دەبێ باوەڕیان پێبهێنیتو پێڕەوییان لێبکەیت، هەر چەندە مانای ئەو وشانە لە مێشکی ئەواندا زۆر جیاوازترە لەوەی خەڵکی پێی ئاشنانو لێی تێدەگەن: ئازادی. یەکێتی. سەربەخۆیی.

ئازادییان لە لاوازیو چەوسانەوەو لەناوبردنو زاربەستنی تۆیە، بەژمارە دەتگۆڕنەوە، لە مرۆڤایەتی داتدەماڵنو مۆرکی ئاینیت دەسڕنەوە، ناچارت دەکەن بەبێ خواستی خۆت کار بکەیتو توانای رەتکردنەوەشت نیە. ئەو شتانەت خۆشدەوێت کە رقت لێیانە، ئەو شتەی سوکایەتی پێدەکەیت، گەورەو مەزنی دەکەیت، ناچارت دەکەنو فەرمانت پێدەکەن ئەو کارانە جێبەجێ بکەیت. تۆ لە جیهانی هێزو ستەمو جەبەروتدا جگەلە تۆزو خۆڵ شتێکی دی نیت.

کاتێك ناکۆکی زیاد دەکاتو چەمکی "ئازادی" دەبێتە چەمکێکی گاڵتەجاڕانەی قێزەون، ئیدی زاناو بیریاری زۆرت لێ پەیدا دەبێتو قسەوباسی وتاربێژان زۆر



دەبێتو وتەکانیان قوتت دەدا، راڤەکانیان قبوڵ دەکەیتو لە گێژاویاندا دەخولێیتەوە: ئەوەش ئازادی دەوڵەتە نەك، ئازادی تاکەکەس.

بەگشتی ئازادی دەوڵەت لە بەدیهێنانی ئامانجەکانو روبەروبونەوەی دوژمنەکانێتی. ئامانجی نادیارو دوژمنی دروستکراو. ئازادی ئەوە نیە کە تاك ئەوەی دەیخوازێت لەچوار چێوەی یاساو دابونەریتدا ئەنجامی بدات، بەڵکو ئازادی ئەوەیە هاوڵاتی بێقەیدو مەرج خۆی رادەستی دەسەڵات بکاتو وەك یەخسیرێکی بێئابرو حوکم بکرێو کەس بەدوای خۆبەخشییدا ناگەرێ. ئازادی لە تێگەیشتنی ئەو خەڵکە تازانەدا بریتیە لە زۆرترین چەوسانەوە، لەتواناتدا نەبێت رەفتار بەموڵکی خۆتەوە بکەیت، بڕوا بەوە بکەیت کە ئەوان دەیانەوێتو ئەگەر بشخوازن بۆ رۆژی دواتر دەتوانن بیگۆڕن. ئازادی لەلای ئەوان، بریتیە لەوەی لە هەر جێگەیەك بیت، لەخەو یا بێدار، دڵو دەرونت لە دەنگی ئەو پڕبێتو چاوت لەسەر میلی کاتژمێرەکەت بێتو چاوەڕوانی نادیار بکەیتو گوێت بۆ دەنگی دەرگا هەڵبخەیت تا بەرەو شوێنێکی نادیارت بەرن، پرسیاری شتێکت لێبکرێ کە نایزانیت، واژو لەسەر شتێك بکەیت کە نەتخوێندبێتەوە، پاشان دەگەڕێتەوە یا دەخرێیتە چاڵێکەوە، ئیدی یا بەمردویی یا بەشێوایی دەردێیتەوە، رەنگە هەمو شتانەشت بەسەرا بێت، بێئەوەی هۆکارەکەی بزانێت یا راڤەیەکت بۆی هەبێت، رەنگە بێئەوەی بەخۆت بزانێت، ژیانت لەو غەیبانییەتە کۆتایی پێبێت.

ئازادی ئەوەیە بەخۆشەویستییەوە لە مناڵەکانت بنواریتو سڵ لەوەش بکەیتەوە لەبەرامبەریان وشەیەك بڵێیت، مناڵو ژنو براکانت دەبنە چاو لەسەرت، ئەویش دوای ئەوەی دەوڵەت دەبێتە قەوارەیەکی گەورەو هەمو قەوارەکانی دی دەهاڕێ.

ئازادی ئەوەیە لەسەر بەڵگەنەویستترین شت کە پێویستی بەوە نیە گفتوگۆی لەسەر بکرێ لە دەوڵەت بپرسێت چی شتێك بڵێیت، بەدوای دەوڵەتدا دەگەڕێتو نایدۆزیتەوەو نایگریتو کەس نابینیت نوێنەرایەتی بکات، هەمو شوێنکت بۆ پڕدەکاتەوە، لە خەونو بێداریدا هەست بەزەبری دەکەیت، فیشکەی گوێت کەڕ دەکات، ستەمو چەوسانەوەی دەخزێتە نێو ئەو هەوایەشەوە کە هەڵیدەمژیت، دڵو

دەرونت پڕ دەبێت لە ترسـی سـزای تاوانێك كە نەتكردوە. تـۆ تاوانكاروتاوانباریو هێشتا كاتی سزادانت نەهاتوە.

رەنگـە نـۆرەت بێت یا هێشـتا كاتی نەهاتـوە، بەڵام دەبێ تا مـردن چاوەنواری بكەیت.

ئەمە جیهانی حیزبی بەعسە لە عێراقدا! یەكێتی بوون هاتەدیو هەمو مافەكان هەر لـە بنكـی هەرەمەوە تا لوتكە بۆ خودی رێبەر بو، هەمو ئازادییەك بۆ ئەو بو، خەڵكی بەخۆشی خۆیان یا بەتۆپزی وازیان لە مافەكانیان هێنا. ئیدی كەسێك هەبو فەرمانیان بۆ دەربكاتو لێیان بخۆرێت. بەهای تازە بۆ بەتوانایی رێبەر دروست بو كە ئایین هیچ پشـكێكی تیانەبو، مۆركی ئاكاریش بەو چەمكەی پیامبەرانو فەیلەسـوفو بیریاران باسیان لێوەكردوە، تێیدا بزر بو.

رێبـەرو دەوڵەتو هاوڵاتی هاڕدراو بوون بەیەكەیەكی تەواوكار كە یەك لەوی دی دەتوایەوە. ئەو یەكێتییەش هێندە گەورەو مەزن دەكرێ كە جگە لە رێبەر كەسی دی تێیـدا نابینرێو جگە لە دەنگی ئەو، دەنگی دی تێیدا نابیسـترێو فیكری دەوڵەتو سیاسـەتەكانی بریتیە لە خەمـزەی ئەهریمەنیو كەڵكەڵەی رێبەر. ئـەو كاروبارانەش گفتوگۆی لەسـەر ناكرێ، بەڵكو دەدرێت، ئەویش دوای ئەوەی لە جیهانی بەعسدا جێگەی پەرسـتنی گرتەوە. سۆسیالیزم داهێنراوی خۆیانەو مافی رەعییەتەكەیان رەچاو نەكـردوە، ئەوەش هیچ مانایەكی نەبو جگە لەوەی تاقمێك تاوانبار دەسـت بەسـەر سـامانێكی گەورەی نەتەوەیەكی دەوڵەمەندا بگرن كە رزقێكی تیروتەسـەلیان، بەبێ خواسـتی خۆیان لەژێر زەوییـەوە بۆ دێت، كەچی ئەو تاوانبارانـە هاوڵاتیان لەو مافە بێبەش دەكەن، یا ئەو مافەی دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی بێچەوسێنەوەو كۆنترۆڵی بكەن.

جیهانـی حیزبـی بەعس لە عێراقدا بریتیە لە جیهانی رێبەر یا خوداوەندێكی درۆزن كـە بەگوتەی خۆیـان لە وێنەیدا نیە، كەس پرسـیار لە كردەوەكانـی ناكاتو تەنها دەپرسێتەوە، ئەگەر بروانیت، شتی زۆر سەیرو سەمەرە بەدیدەكەیتو توشی بێبڕواییو گومڕایـی دەبێتو عەقڵت تێكدەچێت لەوەی هەوڵ بدەیت، بزانیت چی دەكات یا چ دەوێت؟ دەبینی جەنگێكی ماڵوێرانكەری لەدژی ئێرانی دراوسـێ هەڵگیرساندوە



كە تەنانەت ئامانجەكانی بۆ خەڵكە میلیتارەكانیش روونو ئاشـكرا نیە. گەر رۆژانی جەنگ پرسـیارێكی سـادەی وەك ئامانجی سـتراتیجی ئەم جەنگە چیە؟ ئاراسـتەی یەكێـك لـە جەنەڕاڵەكانی بەعس بكردایە كە پێویسـتە بیزانێتو توێژینەوەی لەسـەر كردبێت، دەبینی ناتوانێت وەڵامت بداتەوە.

گشـت ئۆپڕاسیۆنە سـەربازییەكان، ئەوانەی گیان لەدەست دەدەن، ئەو ئامێرانەی تێكدەشكێن، ئەو پارەیەی خەرجدەكرێ، ئەو شتانەش لە پێناوی ئامانجێكدا كە دەبێ ببێتو پێویسـتە لەسـەرتان بیزانن... ئەو ئامانجە چیە كە شەڕی لە پێناودا دەكرێ؟ ئایا داگیركردنی خاكە؟ ئایا گەیشـتنە بە تارانی پایتەخت؟ ئایا لەناوبردنی خومەینیە؟ ئایا تەنها شـەڕێكی بێئامانجو بێمەبەستە؟ یا ئامانجێكی ستراتیجی لە مێشكی رێبەردا هەیەو كەسی لێئاگادار ناكاتەوە؟ یا هیچ ئامانجێك لە مێشكی رێبەردا نیە؟ یا بەتەنها حەزێكی شپرزەی زانراو یا نەزانراوە؟

كاتێـك ماندوبوانی هەر دوولا بەمەبەسـتی خۆیان گەیشـتنو تا ئەوپەری توشـی بێتاقەتی بون، جەنگیش گەیشـتە كۆتایی. پاشـان دەپرسـین بۆچی لەدوای جەنگی جیهانی دووەمەوە دزێوترین شەڕ لە رۆژهەڵات هەڵگیرسا؟ وەڵامو راڤەیەك نادۆزینەوە، بەڵام تەنها جیهانی بەعسو دێوانەییو رێبەرپەرستی دەبینین.

كۆمەڵگـەی عێراق لە تێكەڵەیەكی نەتەوەی رەگەزو نەتـەوەی جیاواز پێكهاتوە، خاكێكـە وڵاتانی دراوسـێ بەناوی مافـی مێژووییەوە ململانێی لەسـەر دەكەن، ئەو وتەزایـەی لـەو رۆژگارەدا جگە لە گێلەپیـاوو ئەزانەكان، ئەوانـەی هیچ لە جیهانی سیاسەتو كۆمەڵناسی تێناگەن، پەنای بۆ دەبەن، ئەویش دەخوازرێت لەو تێكەڵەیە، تاكە پێكهاتەیەك دروسـت بكرێ، بەوەی نەتەوەی عەرەب یەك نەتەوەیەو هەڵگری پەیامێكی نەمرە، ئەمە لە كوێوە هاتوە.. چۆن دەبێت؟.

وڵاتێك رەگەزەكانی دابەشـی دەكات، رەگەز هەیە سـەر بەئێرانە، هەیانە سـەر بە توركیایە، ئاشـوری تێدایەو عەرەبی سـەر بەدورگەی عەرەبی تیایەو كوردی تێیدا دەژی، هەمو ئەوانە لە جوگرافیایەكدا دەژین كە ناوی عێراقی لێنراوە.

رەنگـە ئەمـەش شـرۆڤەی ئەوە بـكات كە بۆچـی دەوڵەتی هاوچەرخـی عێراق

لەسەردەمی پاشایەتی‌و سەردەمە تاریکەکانی دوای حوکمی پاشایەتیەوە هیچ رۆڵێکی نیشـتمانی یا نەتەوەیی یا مرۆیی لە دەوروبەرەکەیدا نەگێڕاوە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بوونــی یەکانگیرو یەکێتــی کۆمەڵگەیەك رەتدەکاتەوە کە گشــت گیانی لە پارچەی لێکتراوازیی لێرەو لەوێ، پێکهاتوە.

رەنگە دەوڵەتی هاوچەرخی عێراق تاکە دەوڵەتی عەرەبی بێت کە هیچ رۆڵێکی لە ململانێی عەرەبی ـ ئیسرائیلیدا نەگێڕاوە کە هەنوکە نیو سەدە بەسەر ئەو ململانێییەدا تێدەپەرێ.

رەنگــە عێراق تاکە وڵاتێکی دەوڵەمەندی عەرەبی بێت کە ماقرێکی نەك بەعەرەبە هــەژارەکان نەبەخشــیبێت، بەڵکو قەرزاری هێندێکیشــیانە. هۆی ئــەم رژدییەش بۆ ناهاوئاهەنگی‌و نایەکانگیرییەی میلەت ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ ئیرادەی رێبەر دەگەڕێتەوە کە ئەوەی ئەو بیەوێت بەسەریدا تەخشان‌و پەخشانی دەکات . تەنها دوو ئامراز هەیە بۆ ئەوەی ئەم کۆمەڵگەیە لە تاکە قەوارەیەکدا بتوێنرێتەوە، یا ئیسلام کە دەشێت ئەو پەرتەوازەییــە بەبێ دردونگی‌و بەیەکانگیری لەژێر چەتریدا کۆببنەوە، ئەوەش شــتێکە رێبەر نایزانێت. ئامرازی دوەم ترسێکی مەزن کە دڵ‌و دەرون دەردەهێنێت‌و دەتوانێت ئەو پەرتەوازەییە بۆ ماوەیەك بتوێنێتەوە. بۆیە پێویستە بگەڕێینەوە بۆ بیرۆکەی ئیسلامیزم تا ئەوەی خوداوەندی درۆزن شێواندویەتی، چاکبکرێتەوە. ئەوەش تەنها موسڵمانەکان دەتوانن ئەنجامی بدەن.

ستەم‌و چەوسانەوە لە ئامرازێکی خواروخێچی ئەهریمەنیدا کۆکرایەوە. ئەو ئامرازەش لە شەوی ٢ی ئەیلولی ١٩٩٠دا کەوتە جوڵەو کوێتی داگیرکردو پاشان لەسەر سنوری ســعودییە لەنگەری گرت‌و چاودێری کابەی دەکردو ئیرەیی بە کۆمەڵگەیەکی هێمنی سەقامگیری خۆشگوزەران دەبرد، چونکە سەروەت‌و سامان لەم وڵاتەدا بەشێوەیەکی دی ئاراستە کرا، نەك بۆ دروستکردنی گرتوخانەو گازی ژەهراوی‌و شەڕی کیمیایی‌و دەستدرێژیکردنە سەر دراوسێکانی.

کەســێکی ژیرو هۆشــمەند نادۆزیتەوە وێنای ئەوە بکات سعودی‌و وڵاتانی کەنداو بکەونە ژێر چەپۆك‌و ئاڵای حیزبی بەعسەوەو هەمان ئەو شتە رووبدات کە لە عێراقدا



روودەدا، هەروەکو بۆ هەمو لایەك روون‌و ئاشـکرایە. هەروەها هیچ کەسێکی عاقڵ‌و بەهزر بەو کارە رازی نابێت‌و وێناشی ناکات.

کاتێك سەدام حسێن لە وڵاتی حەجو خاکی ئیسلام نزیك دەبێتەوە، پێویستە وەك ئەوەی مەســیحی رزگارکاری موسڵمانان بێت، دروشمی درۆزنانە بەرزبکاتە. رەنگە مەســیحێکی جادوگەر بێت‌و خاك بەسوتماك بکات‌و زێر پەخشان بکات‌و نیعمەت بەسەر دەستوپێوەندە گەمژەکانیدا ببارێنێت.

ســەدام حسێن هەرگیز لە ســەرکەوتنەکانیدا ســەرکەوتو نەبوەو بەدرێژایی کاتیش حیســاباتەکانی هەڵەبوە. ئەو کەســێکی لێهاتو نیە بۆ ئەوەی هەڵسەنگاندنی دروست بکات‌و لە بیرکاریدا کەسێکی شارەزا نیەو دۆسیەی ژیانی لەبەردەستمانە بۆ کەسێك بییەوێت تەماشای بکات یا لێی بڕوانێت.

ســەدام حسێن لەوە تێنەگەیشــتبو کە دونیا گۆڕاوەو بەرەو تاك سیستمی دەچێت، سەردەمی دوو زلهێزی بۆ کۆنترۆڵکردنی جیهان بەسەرچوەو هەمویان بوون بەهێزێك‌و لەنــاو یەك سیســتمدا کۆدەبنەوە. ئــەو گۆڕانکاریانــە لەبەرچاوی روویانــدەداو لێی تێنەدەگەیشــت! دونیا لە پێش دوەم تاوانیدا گۆڕانی بەسەردا هاتبو، بەڵام ئەو دەرکی پێنەدەکرد! جیهان بەرەو سیستمێکی تازە هەنگاو دەنێت کە نەك هەر رێگە لە تاوان‌و داگیرکردن دەگرێ، بەڵکو دەســتدرێژیکار ســزا دەداو بەرپەرچی دەســتدرێژییەکەی دەداتەوەو رەنگە لەناویشی بەرێت.

هەمو رووداوەکان بەو ئاراســتەیەدا دەرۆن‌و بەو کۆتاییە حەتمییەش کۆتاییان دێت! هەمو دونیا ســورە لەســەر ئەوەی بەعس ناچار بکرێ لە کوەیت پاشەکشــێ بکات‌و دەســت لە هەڕەشەکردنی ســعودی‌و وڵاتانی کەنداویش هەڵبگرێ. ئایا هەمو ئەوانە بەشــتێك ناگات؟ ئایا ئەمە بەشــێکە لەو نمایشە گەورەیەی کە سەدام حسێن لەگەڵ ئەمەریکادا نمایشــی دەکات، هەروەکو شەیتانەکانی لە هەمو جێگەیەکدا ئەو قسەیە دەڵێنەوە؟ ئەم کارە دورە لە وێناکردن‌و لەگەڵ خەیاڵی دروستیشدا ناکۆك دێتەوە.

هەمــو جیهان رێکەوتون لەســەر ئــەوەی بەرپەرچی دەســتدرێژی عێراق لەســەر نەتەوەی عەرەب‌و جیهان بدەنەوە. سەدام عەرەب‌و موسڵمان نەبو، بەڵکو لە تکریتییە

شەیتانییەكان بو، بۆیە گریانی هێندێك گەمژە بۆ سەدامو چارەنوسی زۆر بێمانابو، داوای لێدەكەن بۆ گوناهەكانی بگریو خەم بۆ چارەنوسی بخواتو كار بۆ ئەو ئاكامە شومەی بكات كە لە ژیانی نزیك دەبێتەوە.

گەر پێویست بێت قسە لەگەڵ یەكێكدا بكەین تا ڕێگە لەو ئاكامە ترسناكە بگرین كە بەرەو رووومان دێت، ئەوا دەبێ قسە لەگەڵ تاوانبار بكرێ، نەك لەگەڵ ئەو پۆلیسانەی دەیانەوێت دەستگیری بكەن!

سازش لەسەر پەژیوان بونەوە لە دەستدرێژی كردن ناكرێو سەدام حسێنیش لەسەر ئەو تاوانە ترسناكەی ئەنجامیداوە، خەڵات ناكرێ.

ئەوەی لە تاریكیدا دەیرفێنی، لەبەر تیشكی رژباردا لێتوەردەگیرێتەوە، لە شەوێكی دەیجونی ئەنگوستەچاودا كە ساتو كاتی نازانێتو پەیپێنابات، پزیسكو كڵپەی ئاگرەكەی تێدەگرێو ئەوەی بونیاتی ناوە وەك كا گڕ دەگرێ، كاتی ئەوەی نابێت بانگەوازێك بكات، شەیتانەكانی پشتی تێدەكەنو بەفریای ناكەونو پێشئەوەی دەستی مردنی بگاتی، بەئاكامی ستەمەكەی خۆی دەزانێت، پاشان خەڵكی خۆیان بۆ چاككردنەوەی خراپەكارییەكانی تەرخان دەكەن.

سەدام حسێن كۆماری ترسو تۆقاندنی دروستكردو خۆی لە سەرویەوە دانیشت، بۆیە كاتێك وڵاتەكەی لێوان لێو بو لە ترس، ویستی ئەو ترسە بۆ وڵاتە ئارامەكانی دی بگوێزێتەوە. ئەگەر بێدەنگی لێبكرێ، لە ئاستێكدا راناوەستێو لەبەر ئەوە نابێت بێدەنگی لێبكرێ. هیچ ئاینو مرۆڤایەتییەك پشتگیری لێناكات. هێزێكی شەڕەنگێزی ستەمكارە ئەوەی لەدژی بوەستێتو بەشداری لەناوبردنی بكات، خوداوەند پاداشتی دەداتەوە. خۆی لە ریزی ئەو مرۆڤانە وەسفدەكات كە خوداوەند بە هۆی كاری خێرو ئاوەدانكردنەوەی گەردونەوە پاداشتی كردوە.

ئەوەی لەسەر ئەم فیتنە تاریكە دەوروژێنرێتو دەوترێت لەسەر ئەوەی كە پێویستە پارێزگاری لە هێزی عێراق بكرێ، چونكە هێزی عەرەبو موسڵمانە، بەڵام ئەو وتەیە لە دوورو نزیكەوە راستی تێیدا نیە.

لێرەدا وتەیەكی هێز هەیە كە زێدەڕەوی تێیدا دەكرێ، چونكە هێزی عێراق ئەو



هێزە نیە وەكئەوەی باسدەكرێ، ژمارەی فرۆكەكانی زانراوە، ئەو تانكانەی كڕیوێتی لیستێك بەژمارەو جۆرەكانییەوە هەیە، لەگەڵ ئەو رۆكێتە نادیارانەی كە كیمیاییو باروت هەڵدەگرن، ئەو چەكانەی كە بەدرێژایی هەشت ساڵ لەدژی ئێران بەكارهێنرا، بێئەوەی ئاكامێكی ئەوتۆی هەبێت شایانی باسكردن بێت. ئەو هێزە لەدژی موسڵمانان بەكاردێتو لەبەرامبەر هەزاران فرۆكەو تانكی كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی كە سورە لەسەر ئەوەی پاشەكشێی پێبكات، حیسابێكی ئەوتۆی بۆ ناكرێ. بۆیە دەبێ تەنها خاوەنی ئەو هێزە پارێزگاری لە مانەوەی بكاتو نەهێڵێت لەناوببرێت.

هێزی كیمیاییو بایۆلۆجی، گازی ژەهراویو میكرۆب دەرێژێت، ئایا ئەوانەی لەدەسپێكی ئیسلامییەوە قسەدەكەن، لەسەری رازین؟ ئەی ئەهلی كتێب، ئایا ئەمە رێگەی پێدەدرێ؟ ئایا جەنگ رێسای خۆی نیە كە ئیسلام وەك پرەنسیپو نەریت جیایكردۆتەوە؟ ئایا كەستان لە وێنەی ئەو ژنو منداڵو پیاوانەی نەنوارییوە كە بەهۆی گازی ژەهراوییەوە، لەسەر جادەو لەناو ماڵەكاندا گیانیان سپاردوە، ئایا سەیری وێنەی ئاژەڵە تۆپیوەكانتان نەكردوە كە سەدام لە هەڵەبجەی كوردنشیندا جیاوازی لەنێوان ئەو ئاژەڵانەو مرۆڤدا نەكردوە؟ ئایا ئەمەیە ئیسلام؟ ئەگەر ئێوە زانیارییەكتان هەیە، تكایە بۆمان روون بكەنەوە؟ ئایا سەدام حسێن هێزێكی شەڕەنگێزی ئەوتۆ نیە كە پێویستە دژایەتی بكرێو لەناوببرێت؟ ئایا لە مانگی موحەڕەمدا شەڕ دەكرێ؟ سەدام لە مانگی موحەڕەمدا كوەیتی داگیركردو هەڕەشەی لە دوڕگەی عەرەبی دەكرد، یەكێكە لەو مانگانەی شەڕ تێیدا حەرام كراوە! من دەزانم "عبدالله المؤمن" مانای موحەڕەم نازانێت چیە! بەڵام دەبێ یەكێك ئاگاداری بكاتەوە، مادامەكی ئاڵای ئیسلامی هەڵكردوە!

هەمو ئەوانە بێسود بون، چونكە خوداوەند ئەو دەرفەتەی پێشكەش بەهەمو ئەو لێقەوماو كڵۆڵو هەناسەساردانە كرد، بۆ ئەوەی لەستەمكاری شەڕەنگێزی گەندەڵ رزگاریان بێت، كە ترسو ملكەچی چاندبو، خەڵكی دەچەوسانەوەو بەبێ جیاوازی ژنو منداڵو پیرو ئاژەڵی دەكوشت. حوكمی لەسەر زەوی گرتەدەستو گەندەڵی تیا بڵاودەكردەوەو خوداوەندیش حەز بەخەڵكانی گەندەڵ ناكات.

هێزی سـەدام حسـێن، هێزێکی وێرانکەری گەندەڵەو پێویستە لە پێناوی ئیسلامو موسـڵمانانو لەسـەر حیسـابی ئەوان، نەك بەپێچەوانـەوە، خۆیو دەسـەڵاتەکەی لەناوببرێن.

ئەمـەش دەرفەتێکی باشـی جیهـاد بو لە پێنـاوی بەدیهێنانی ئیسـلامدا، چونکە کۆمەڵگەی ئیسلامی بەهاوکاریو بەپاڵپشتی ستەمکارو پۆشینی جلوبەرگی ساختەی ئیسـلامو پاساو هێنانەوە بۆ دەسـتدرێژیو ستەمکاریو بانگەشـەکردنی جەنگین لە ڕێگەی خوداوەندا، نایەتەدی.

لەنێو ئەو هەمو تاریکییەی کە سـەرەتاو کۆتایی نیە، هەسـت بە موسـڵمان بوونی خۆمان ناکەین، گەر لایەنگری لە پرەنسـیپ نەکەیـنو لەپێناوی بەدیهاتنیدا خۆمان بەکوشـت نەدەین. لەو کارە روونو ئاشـکرایانەی کە هیچ خەوشێکی تیانیە، نابێت هەست بە سەراسیمەو گومڕایی بکەین، ئەوەی پێویستە ئەو قسانە بکات، خەڵکانی موسڵمانو ئەوانەی کە داوای پیادەکردنی قورئان دەکەن. دەوڵەتو نەتەوەکان لەنێو دەچن، بەڵام تێڕوانینی راسـتو دروسـتی بیروباوەڕەکانو دروسـتی هەڵسەنگاندنی روداوەکان لـە جیهانێکـدا کە هـەقو ناهەق تێکەڵ دەبـن، بەتەواوەتی لەنێوناچن. چەوسـێنەرو سـتەمکاران عەبای ئایـن دەدەن بەشـانیاندا گەر پێیانوابێـت لە مردن دەیانپارێزێتو گۆییان لێدەگیرێت، خوداوەند بەستەمکاران دەزانێت.

با هەوڵو کۆششەکانمان بۆ ناساندنو بەرزکردنەوەی دەنگی هەقو بەگژاچونەوەی ناهەقی بێت، دیاریکردنی سنوری نێوان ئەوەی پێویستەو ئەوەی هەیە، خۆبەخت کردن بێت لە پێناوی بیروباوەر، نەك سـازش کردن لەگەڵ سـتەمکارانداو سەدام حسێنیش گەورەترین سـتەمکاری ئەم سەردەمەیە. با کۆماری ترس لە رەگوریشەوە دەربهێنین. دژایەتی مجێورەکانی بکەینو پەرسـتگاکانی دابخەین، با سـەیری خوداوەندەکەیان بکەین کە پێوەی نوساونو وازی لێناهێنو بیسوتێنینو بەئێشوئازارەوە لەناوییەرین.

کاتـی ئەزمونو تاقیکردنەوەمان نیە، رەنگەکان روونو خەتەکان ئاشـکرابونو ئەو میلەتـە نەگبەتانە ئـەو هەمو سـالانەیان بەفیرۆچوە، رۆلەکانیان لـە زیندانو بەترسو بەشـەڕی شـێتانەوە ژیان بەسـەر دەبەن، لە پێناوی ئەوەی سەدام حسێن لە کورسییە



نەرمو نۆڵەکەی دانشێتو جگەرەی کوری بکێشێتو بیر لەو ملیارە دزییانەی بکاتەوە کـە ماڵی ئەو موسـڵمانانەیە هیچیان نیـە خەرجی بکەن، ئەوانەی لـە رۆژهەڵاتو رۆژئاواو لە ئەفریقیا لە برسـان دەمرنو گەرما جەسـتەیان دەپرۆکێنێتو دڵۆپێك ئاوو پارویەك نانیان دەسـت ناکەوێت. خوداوەندی درۆزن شـەڕی ئاشەکانی با دەکاتو خەڵکی بەکارێکەوە سەرقاڵ دەکات کە حەزیان پێی نیەو کەسیش نازانێت ئەو چی دەوێت.

جیهانی گومڕاییو رێگەی راسـت هێڵێکی یەکلاکەرەوە لەیەکتریان جیادەکاتەوە، کەس ناتوانێت لە یەك کاتدا لە هەر دوولا بێت. یا هەق یا ناهەق. ناکرێت پێکەوە کۆبکرێنەوە.

سـیحرەکە پۆچەڵ بوەوە، بۆیە پێویسـتە ئەم ژانە بۆگەنە بگۆڕین بۆ جیهانێك کە ئاسۆی ئازادیو ئیسلامو پەرستنی خودای تاكو تەنها تێیدا روونو ئاشکرا بێت.

# تۆمارکردنی روداوە مێژووییەکان

## ساڵانی ماندەیت (ئینتداب) (١٩١٨ ـ ١٩٣٢)

**٣/ تشرینی یەکەم /١٩١٨:** ماوەی فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی کاتێك کۆتایی پێهات کە (فەیسەڵی کوڕی شەریف حسێن)ی حاکمی حیجاز، بەفەرماندەیی لەشکری ئەو خێڵانەی لەدژی حوکمی تورکی کۆیکردبونەوە، چوە ناو دیمەشقەوە.

**٢/ حوزەیران / ١٩٢٠:** شۆڕشی خێڵەکانی عیراق لە دژی حوکمی سەربازی بریتانیا هەڵگیرسا.

**٢٤/ تەموز/ ١٩٢٠:** هێزەکانی فرەنسا دیمەشقیان داگیرکردو فەیسەڵی کوڕی شەریف حسێنیان کارکەنار کرد، ئیدی لەو دەمەوە ماندەیتی فرەنسا لە سوریا دەستی پێکرد.

**٢٧ / ئاب / ١٩٢١:** بریتانیا لەسایەی ئینتدابی بریتانیاو بەڕەزامەندی کۆمەڵەی نەتەوەکان، فەیسەڵی کردە پاشای عێراق، هەر لەگەڵ هەڵایسانی ئەو شۆڕشەی بە شۆڕشی مەزنی عەرەب ناودەبرێ، دەستوپێوەندێك لەخەڵکی عیراقی لەدەوری خڕبونەوە، ساتع حوسەری یەکێك بو لەو کەسانە کە هێدی هێدی ئەرکی پەروەردەی لەوڵاتدا گرتەدەست.

**١٠ / تشرینی یەکەم / ١٩٢٢:** ئەو رۆژەی پەیماننامەی عێراق ـ بریتانیای تیا واژو کرا، ئەو پەیماننامەیەی مەودای دەستێوەردانی بریتانیای لە کاروباری ناوخۆی





عێراقدا رێکخست.

**١٦/ تشرینی دووەم/ ١٩٣٠:** پارلەمانی عێراق رەزامەندی لەسەر پەیماننامە تازەکەی بریتانیا ـ عێراق دەربڕی کە رۆژی کۆتایی هاتنی ماندەیتی بریتانیای لەعێراق دیاریکردبو، بەو مەرجانەی بەرژەوەندییەکانی بریتانیا بهێنێتەدی.

## شانشینی عێراق (١٩٣٢ ـ ١٩٥٨):

**٣/ تشرینی یەکەم/ ١٩٣٢:** دەوڵەتی عێراقی سەربەخۆ بو بە ئەندامی کۆمەڵەی نەتەوەکان.

**١٣/ کانونی یەکەم / ١٩٣٢:** یەکەم بانگەوازی شیوعی لەعێراق بەناوی (فەهد)ەوە بو کە دواتر بوە رێبەری حیزبی شیوعی عێراق.

**ئاب/ ١٩٣٣:** سەرهەڵدانی کێشەی ئاشورییەکان، سوپای عێراق بەفەرماندەی جەنەراڵ بەکر سدقیو بەئاگاداری حکومەتو لەسەروی خواستی شا فەیسەڵ قەسابخانەیەکی لەدژی ئاشورییەکان رێکخست، دوابەدوای ئەوەش سدقی بوە قارەمانێکی نیشتمانی.

**٨ / ئەیلول/ ١٩٣٣:** شافەیسەڵ کۆچی دوایی کردو غازی کوڕی جێگەی گرتەوەو بەرامبەر قەتلوعامی ئاشورییەکان، سەرسەختانە لایەنگری لەسوپا دەکرد.

**٢٩/ تشرینی یەکەم/ ١٩٣٦:** بەکر سدقی کودەتای بەسەر حکومەتدا کرد، ئەوەش یەکەم کودەتا بو لەجیهانی عەرەبیدا، سدقی پەیمانیدا ریفۆرمێکی کۆمەڵایەتی بەرفراوان بکات، کۆمەڵێك خەڵکی هێنایە ناو حکومەتەوە کە نوێنەرایەتی باڵی چەپییان دەکرد.

**٢٨/ نیسان/ ١٩٣٧:** سەدام حسێن لەشاری تکریت لە دایك بو.

**١١ / ئاب / ١٩٣٧:** بەهاوكاری كۆمەڵێك ئەفسەر بەكر سدقی تیرۆر كرا، دوا بەدوای ئەوەش شەش هەوڵی كودەتای دی درا كە دواهەمینیان كودەتاكەی ساڵی ١٩٤١ بو.

**١/ نیسان/ ١٩٤١:** بەئاگاداری چوار جەنەراڵ كە لایەنگرییان لە بزوتنەوەی عەرەبی دەكرد باری نائاسایی راگەیەنرا، حكومەتی بەرگری نیشتمانی بەسەرۆكایەتی رەشید عالی گەیلانیو چەند جەنەراڵێكی دی دامەزرا، ئەم حكومەتە یەكسەر لەلایەن وڵاتە سوێند خۆرەكانەوە (ئەڵمانیاو ئیتاڵیا) پێشوازی لێكرا، ئەوانەی لایەنگرانیان لە ئینگلیزیش دەكرد لە وڵات هەڵهاتن.

**ئایار / ١٩٤١:** هێزەكانی بریتانیا گەیشتنە بەسرەو لە ٢ / ئایار شەڕ لەنێوان هێزەكانی بریتانیاو عێراق هەڵایسا، لە ١٩/ ئایار سوپای عێراق تێكشاو لە ٢٩/ ئایار رەشید عالی گەیلانیو هێندێك لە جەنەراڵەكان بەرەو تاران رایانكرد، وەسی گەڕایەوە سەر تەختی پاشایەتیو سیاسییە عێراقییەكانیش، ئەوانەی لایەنگری بریتانیا بون، حوكمیان گرتەوەدەست.

**١/ حوزەیران/ ١٩٤١:** لەو كردەوە توندوتیژانەی كە هێندێك وردە ئەفسەر بەشداریان تیاكرد، ئەوانەی لە بارودۆخەكە نارازیبون، بەسەدان یەهودی گیانیان لەدەستدا.

**٢٤/ تەموز/ ١٩٤٣:** دەستەیەك كەلە دە كەس تێپەڕینەدەكرد، بەرنامەیەكی سیاسیان لە دیمەشق دەركرد، ئەم دەستەیەش سەرەتای بزوتنەوەی بەعسی عەرەبی بو.

**نیسان/ ١٩٤٧:** یەكەم كۆنگرەی حیزبی بەعس بەئامادەبونی چەند سەد نوێنەرێك بەسترا، بیری بەعسییەت ساڵی ١٩٤٩ لەڕێگەی وانەبێژە سورییەكانەوە گەیشتە



عێراقو ساڵی ١٩٥١ یەكەم هەوڵی رێكخراوەیی جیدی درا.

**٢٠ـ٢٧/ كانونی دوەم/ ١٩٤٧:** نارەزاییەكی گەورە لەدژی پەیماننامەی پۆرتسمۆس لەگەڵ بریتانیا سەریهەڵدا، حیزبی شیوعی عێراق وەك هێزێكی رێكخراوی سەرەكی ئەو نارەزاییە دەركەوت.

**١٤ـ ١٥/ شوبات/ ١٩٤٩:** حوكمی لەسێدارەدان بەسەر فەهدو دوو هاوڕێی لەسەركردایەتی حیزبی شیوعی عێراقدا جێبەجێ كرا.

**ساڵی ١٩٥٦:** جەمال عەبدولناسر كەناڵی سویسی خۆماڵی كردو هێرشی سێ قۆڵی كرایە سەر میسر، لەدوای ماوەیەكی كورت سەدام حسێن پەیوەندی بەلقی بەغدای حیزبی بەعسەوە كرد، پاشان ئەو لقەی بەناوی خۆیەوە ناو نا.

## حوكمی سەربازی ١٩٥٨ـ ١٩٦٨

**١٤/ تەموز/ ١٩٥٨:** رێكخستنێكی نهێنی كەلە دوو سەد ئەفسەری ئازادیخواز پێكهاتبون رژێمی پاشایەتیان لەعێراق سەرنگوم كرد، لەدوای بیستنی تەقەی سەركەوتن بەچەند كاتژمێرێك، خەڵكێكی زۆر رژانە سەر شەقامەكان، پارلەمان هەڵوەشایەوە، سوپا پاككرایەوە، بەمەبەستی دادگایی كردنی سەرانی حوكمی پێشو دادگای شۆڕش بەسەرۆكایەتی فازیل عەباس ئەلمەهداوی دامەزرا، لیوا عەبدولكەریم قاسم سەرۆكایەتی ئەنجومەنی وەزیرانو فەرماندەیی گشتی گرتەدەست.

**٢٤/ تەموز/ ١٩٥٨:** میشێل عەفلەق بەمەبەستی یەكگرتنێكی یەكسەری لەگەڵ كۆماری عەرەبی یەكگرتوی تازە دامەزراو، گەیشتە بەغدا، حیزبی شیوعی عێراق نارەزایی دەربڕیو عەبدولكەریم قاسمی بەتاكە سەركردە ناودەبرد.

**٣٠/ ئەیلول/ ١٩٥٨:** عەبدولسەلام عارف وەك جێگری سەرەك وەزیرانو وەزیری ناوخۆ دەستگیر کرا، عەبدولسەلام یەکێك بو لەو ئەفسەرە ئازادیخوازانەی لایەنگری لە پانعەرەبیزم دەکردو یەکێك بو لە رێکخەرانی کودەتاکەی ساڵی ١٩٥٨و هاورێو هاوکاری قاسمیش بو، لەدوای هەوڵە شکستخواردوەکەی بۆ کوشتنی قاسم دەستگیر کراو بەئاشکراش لەدادگاییەکەی مەهداوی دادگایی کرا. ئەم دابەشبونەی نێوان قاسمو سەلام، ناتەبایی‌و جیاوازی نێوان رێبازی پانعەرەبیزمو رێبازی عێراقچییەتی ئەو کەسانە دەردەخات کە کودەتاکەی ١٩٥٨ یان ئەنجام دابو.

**مارس/ ١٩٥٩:** هێندێك لە ئەفسەرانی ئازادیخوازی سەر بەحامییەی موسڵ، ئەوانەی لایەنگرییان لە پانعەرەبیزم دەکرد، راپەرینێکیان لەدژی قاسم سازکرد، بەڵام ئەم راپەرینە هەر بەزوویی سەرکوتکرا، شیوعییەکانیش هەڵچونێکی مەزنی ئەوتۆیان بەرپاکرد کە بەسەدان کەس تیایە بەتومەتی عەرەبچێتی کوژرانو جەستەیان شێوێنراو ململانیکەش مۆرکی دەمارگیری‌و کۆمەڵایەتی وەرگرت، لەو بارگرژییەدا عەبدولکەریم قاسم خەڵکانێکی زۆری لە نیشتمانپەروەرو بەعسیەکان لەناوبرد.

**١/ ئایار/ ١٩٥٩:** لەخۆپیشاندانێکی مەزنی نیو ملیۆن کەسیدا داوای دادگاییکردنی شیوعیەکان کرا.

**تەموز/ ١٩٥٩:** کوردە شیوعییەکان لەدژی تورکمانەکانی کەرکوك قەسابخانەیەکیان سازکردو قاسمیش هەڵمەتی گرتنی شیوعییەکانی دەست پێکرد، ئەم هەڵمەتە تا ئاب بەردەوام بو.

**ئەیلول/ ١٩٥٩:** نوسینەکانی میشێل عەفلەق کۆکرایەوەو بۆ یەکەمینجار بەناونیشانی لەرێگەی بەعسدا بڵاوکرایەوە.



**٧/ تشرینی یەکەم/ ١٩٥٩:** دەستەیەك لە بەعسیەکان نەیانتوانی قاسم بکوژن، یەکێك لەو دەستەیە بەرەو سوریا رایکرد، ئەو کەسەش گەنجێکی تەمەن بیستو دوو ساڵە بو بەناوی سەدام حسێنەوە، ئنجا بەرەو میسر هەڵهاتو حەفتاو هەشت بەعسیش درانە دادگاکەی مەهداوی، ئەو بەرەنگاربونەوەیان مۆرکێکی بەهێزی لەناخی خەڵکیدا بەجێهێشت.

**١/ کانونی دوەم/ ١٩٦٠:** عەبدولکەریم قاسم جگە لە حیزبی شیوعی عێراق رێگەیدا بەحیزبەکانی دی کاری سیاسی ئاشکرا بکەن، گرتنو راوەدونانیش تا کۆتایی حوکمی قاسم بەرامبەر بە شیوعییەکان بەردەوام بو.

**مارس/١٩٦١:** حیزبی بەعس لەسەر رێکخستنی خۆپێشاندنی گەورەو گرنگ بەردەوام بو.

**ئەیلول/١٩٦١:** سوپای عێراق یەکەم هەڵمەتی لەدژی کورد دەست پێکرد، لەبەهاری ساڵی ١٩٦٢دا شەڕی پارتیزانی دەستی پێکرد، ئەو شەڕەی کە عەبدولکەریم قاسم نەیتوانی لەنێوبەرێت.

**٢٤/ کانونی یەکەم/ ١٩٦٢:** حیزبی بەعس مانگرتنێکی گەورەو گشتی رێکخست، قوتابخانەو زانکۆکانیش بەشدارییان تیاکردو تا کەوتنی رژێم بەردەوام بو.

**٨/ شوبات/ ١٩٦٣:** لەدوای شەڕێکی قورسی چەند رۆژەی سەرجادە بەعسیەکان توانیان حوکمی قاسم بخەنو بۆ یەکەمین جار حوکم بگرنەدەست، لەچەند مانگی یەکەمی حوکمرانی بەعسدا شیوعی‌و لایەنگرانی پاکتاوکران، عەبدولسەلام عارفیش بوە سەرۆکی عێراق.

**١٨/ تشرینی دوەم/ ١٩٦٣:** ململانێیەکی تاڵ لەنێوان میانڕەو و توندڕەوەکاندا دروست بو، تا سەرئەنجام عەبدولسەلام توانی یەکەم حوکمی رژێمی بەعس

سەرنگوم بکات. لەوەشدا گروپێك لە ئەفسەره میانڕەوەکانی بەعس هاوکاریان کرد. میلیشیا بەعسیەکان کە بەعسیە مەدەنییەکان سەرپەرشتیان دەکرد پەنایان بۆ سەرجادەکان برد، بەڵام سوپا توانی سەرکوتیان بکات. عەبدولسەلام، ئەحمەد حەسەن بەکری کردە جێگری خۆی کە یەکێك لە ئەفسەرە ئازادیخوازو بەعسییە دێرینەکان بو. هەمو ئەو بەعسیانەی لایەنگری ناسر بون لە سوپا دەرکران.

**شوبات/ ١٩٦٤:** میشێل عەفلەق رایسپارد سەدام حسێن بۆ ئاستی سەرکردایەتی هەرێمی عێراق / لقی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بەرزبکرێتەوە.

**١٤/ تەموز/ ١٩٦٤:** یاسای گشتی خۆماڵیکردن بە هەنگاوێك بەرەو سۆسیالیستی عەرەبیو یەکگرتن لەگەڵ میسر، دانرا.

**١٨/ نیسان ٦/ ئاب/ ١٩٦٦:** عەبدولرەحمان بەزازی سەرەك وەزیران، بەمەبەستی کۆتایی هێنان بەشەڕی کورد، پەنای بۆ گفتوگۆ برد، هەوڵیدا ئیمتیازاتی سوپا کەمبکاتەوەو کەشوهەوایەکی لەبابەت رژێمی پێشوی خوڵقاند.

**حوزەیران/ ١٩٦٧:** شەڕی شەش رۆژە کارەساتی خوێناوی لێکەوتەوەو جیهانی عەرەبی توشی شۆك کردو هەمو رژێمە سەربازییەکانیش بڕواو متمانەی جەماوەریان لەدەستدا.

**٦/ ئەیلول/ ١٩٦٧:** بەعسیەکان خۆپیشاندانێکی مەزنیان لەدژی رژێمی تازەی عارف رێکخست، داوایان دەکرد هەمو رێوشوێنێکی پێویست لەدژی ئەوانەی پێیان دەوترا ستونی پێنجەم بگیرێتەبەر، ئەوانەی بونە هۆی شکستەکەی حوزەیران.

**١٧/ ئەیلول/ ١٩٦٧:** حیزبی شیوعی عێراق بوە دوو باڵەوە: باڵێکی سەرکردایەتی ناوەندی بەسەرکردایەتی عەزیز ئەلحاج، باڵەکەی دی، سەرکردایەتی ناوەندی سەر بەیەکێتی سۆڤێت.



**١٧/ تەموز/ ١٩٦٨:** حیزبی بەعس بە هاوپەیمانی هێندێك ئەفسەری نابەعسی لە کودەتایەکی سەرکەوتودا رژێمی عارفیان خست.

## دوەم حوکمرانی بەعس (١٩٦٨ ـ ١٩٨٠)

**٣٠/ تەموز/ ١٩٦٨:** حیزبی بەعس لە کودەتایەکی تازەدا کە ئامادەکارییەکی باشی بۆ کرابو لە هاوپەیمانە کۆنەکانی رزگاری بو، دەسەڵاتی باڵا درایە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشو سەرۆکەکەی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، ئەمینداری گشتی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، هەروەها بوە سەرۆکی دەوڵەتو فەرماندەی گشتی سوپاش، لەو دەمەدا سەدام حسێن جێگری ئەمینداری گشتی بو، پاشان بوە جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشو بەرپرسی ئەمنی ناوخۆ.

**شوبات/ ١٩٦٩:** عەزیز ئەلحاج سەرکردەی سەرکردایەتی ناوەراستی حیزبی شیوعی عێراق دەستگیر کرا، لەرێگەی دانپیانانەکانی ئەویشەوە هەمو بەرپرسە سیاسیەکانی حیزب دەستگیر کران.

**٨/ ئاب/ ١٩٦٩:** ئۆپراسیۆنە سەربازییەکانی سوپای عێراق لەناوچە کوردنشینەکاندا باڵایدەکرد، گوندی دێکانی ناوچەی موسڵ بوە شانۆی کردەوە توندوتیژو دڕندانەکانی سوپای عێراق.

**تشرینی یەکەم/ ١٩٦٩:** عەبدولرەحمان بەزازی سەرەك وەزیرانی پێشو ئەشکەنجەیەکی زۆر دڕندانە دراو بە تومەتی سیخوری کردنی بۆ زایۆنیزم بە پازدە ساڵ زیندانی حوکمدرا.

**١٤/ کانونی یەکەم/ ١٩٦٩:** تەلەفزیونی عێراقی وردەکاری بەناو گروپێکی بەکرێگیراوی زایۆنیزم پێشاندا کە ژمارەیەك یەهودی عێراقی تێوەگلابو، گوایە ئەو پیلانە لەشاری بەسرە ئاشکرا کراوە.

**٥/ کانونی دوەم/ ١٩٦٩:** یەکەم گروپی سیخوری درایە دادگاو لەنێو حەڤدە تاوانباری یەهوددا سیازدە کەسیان حوکمی سێدارەیان بەسەرا سەپێنرا، ئەم حوکمەش بەئاهەنگی گوتار خوێندنەوەو بە بەرچاوی سەدان هەزار کەس لە گۆڕەپانی تەحریر جێبەجێ کرا.

**٢١/ کانونی دوەم/ ١٩٧٠:** رژێم پیلانێکی نوێی راگەیاندو بەهەفتەیەك دوای ئەو راگەیاندنەش چلو چوار هاوڵاتی لەسێدارە دران.

**١١/ مارس/ ١٩٧٠:** لە ئاهەنگێکی پڕ شکۆدا بەیاننامەی یازدەی ئازار راگەیەنرا، بەپێی ناوەرۆکی ئەو بەیاننامەیەش، ئەو مافە نەتەوایەتیانەی دراوە بەکورد زۆر زیاتر بو لەو مافانەی لەسەردەمەکانی پێشوتردا بە کورد درابو، بۆیە ئاگربەست راگەیەنرا، ئیدی حکومەت سودی لەکات وەردەگرت بۆ ئەوەی خولێکی تازەی شەڕ لەدژی کورد دەست پێبکاتەوە.

**١٠/ تەموز/ ١٩٧١:** حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی پێشنیازی ئەوەی بۆ حیزبی شیوعی عێراق کرد کە بچێتە ناو بەرەی نیشتمانی پێشکەوتوخوازەوە ئەوەش بەپێی ئەو مەرجانەی کە پێشکەشیان کرابو، بەڵام سەرکردایەتی ناوەندی حیزبی شیوعی کاتی بەسەر دەبرد.

**ئاب/ ١٩٧١:** عەبدولکەریم نەسرەتی کۆنە بەعسی لەماڵەکەی خۆی بەچەقۆ کوژرا، نەسرەت رێکخەری ئەو میلیشیانە بو کە ساڵی ١٩٦٣ عەبدولکەریم قاسمیان لەدەسەڵات خست.



**١٥/ تشرینی یەکەم/ ١٩٧٠:** حەردان تکریتی لە کوێت تیرۆر کرا، حەردان بەرپرسێکی گەورەی حیزبی بەعس، ئەندامی پێشوی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، جێگری سەرەك وەزیرانو وەزیری بەرگری بو.

**ئەیلول/ ١٩٧١:** هێزەکانی ئەمنی عێراق نەیاتوانی سەرکردەی کورد، بارزانی، تیرۆر بکەن.

**تشرینی دوەم/ ١٩٧١:** فواد ئەلڕەکابی لەزیندان کوژرا، ئەلرەکابی ئەندامی سەرکردایەتی حیزبی بەعس بو، هەر لە دامەزراندییەوە تا ساڵی ١٩٥٩.

**نیسان/ ١٩٧٢:** پەیماننامەی دۆستایەتی نێوان عێراقو سۆڤێت مۆر کرا.

**ئایار/ ١٩٧٢:** بۆ یەکەمین جار شیوعیەکان بەشداریان لە حکومەتدا کرد.

**حوزەیران/ ١٩٧٢:** خۆماڵیکردنی کۆمپانیای پەترۆڵی عێراق.

**٨/ تەموز/ ١٩٧٣:** کودەتایەکی سەرنەکەوتو لەدژی حکومەت راگەیەنراو دوابەدوای ئەوەش نازم گزارو چەندین کەسی دی کە بەلانیکەمەوە خۆی سیو پێنج کەس حوکمی کوشتنیان بەسەرا درا.

**تەموز/ ١٩٧٣:** رێکەوتن لەنێوان حیزبی بەعس عەرەبی ئیشتراکیو حیزبی شیوعی عێراق ئیمزا کرا، رێکەوتنێك کە دارشتنەکەی بۆ یەکەم جار ساڵی ١٩٧١ دارێژرا بو، بەپێی ئەو رێکەوتننامەیە حیزبی شیوعی عێراق هەمو ئەو مەرجانەی قبوڵ کرد کە لە تەموزی ساڵی ١٩٧٠دا پێشکەشی کرابو.

**کانونی دوەم/ ١٩٧٤:** کۆنگرەی هەرێمایەتی هەشتەمی حیزبی بەعسی ئیشتراکی لە بەغدا بەسترا، راپۆرتێك لەسەر کارو چالاکییەکانی رابردو و نیازەکانی داهاتوی

حیزب پێشکەش کرا.

**مارس/ ١٩٧٤:** ڕێکەوتننامەی ئۆتۆنۆمی کورد (ساڵی ١٩٧٠) هەرەسیهێنا، شەڕ لەنێوان هەر دوولا هەڵایسا، چەندین شاری وەك زاخۆو قەڵادزێ وێران کرا، سەدان هەزار کورد شارەکانی خۆیان بەجێهێشت، کردەوەکان بەرادەیەکی بێوێنە دڕندانەبون.

**کانونی یەکەم/ ١٩٧٤:** پێنج زانای شیعە بەبێ هیچ هۆیەك لەسێدارە دران.

**٦ / مارس / ١٩٧٥:** ڕێکەوتننامەی جەزایر لەنێوان بەعسی عێراقو حکومەتی شای ئێران مۆر کرا، بەپێی ئەم ڕێکەوتننامەیە عێراق هەمو داواکارییەکانی ئێرانی بەڕەسمی دەناساند، بەو مەرجەی ئێران لەدژایەتی کردنی کورد یارمەتی عێراق بدات، بەوەش ڕێگە لە هەمو هاوکاریو یارمەتیەکی کورد گیراو هێزی بەرگری کوردیش توشی ئیفلیجی بو، پاشان حکومەتی بەعس دەستی کرد بەجێبەجێ کردنی سیاسەتی ڕاگواستنو کۆچ پێکردنی بەکۆمەڵی هاوڵاتیانی کوردو بەزۆر لە شوێنی دی نیشتەجێی دەکردنەوە.

**شوبات/ ١٩٧٧:** زانایانی شیعە بەبۆنەی ڕۆژی عاشوراوە خۆپیشاندانێکی مەزنیان سازکرد، دوا بەدوای ئەوەش نزیکەی هەزار کەس دەستگیر کرانو هەشت زانای شیعە لەسێدارە دران، ئیدی لەو ساتەوە پرۆسەی ڕاگواستنی بەکۆمەڵی شیعەکانیش بە بیانوی ستونی پێنجەم دەستی پێکرد، لەکۆتایی حەفتاکاندا نزیکەی دوو سەد هەزار عێراقی لەدوای ئەوەی دەست بەسەر ماڵو موڵکیان گیراو ڕەگەزنامەی عێراقیان لێسەنرایەوە، بەرەو ئێران ڕاگوێزران.

**تشرینی یەکەم/ ١٩٧٨:** خومێنی لە عێراق دەرکرا.

**شوبات/ ١٩٧٩:** شۆڕشی ئیسلامی ئێران بەرپا بو.



**حوزەیران/ ١٩٧٩:** سەدام حسێن بوە سەر کۆماری عێراقو ئەحمەد حەسەن ئەلبەکریش گشت بەرپرسیارییەکی لێسەنرایەوە، لە ماڵەکەی خۆیدا خرایە ژێر چاودێرییەوە.

**تەموز/ ١٩٧٩:** گەورەترین پاکتاوی بەکۆمەڵ لەنێو سەرکردایەتی حیزبی بەعسدا دەستی پێکرد، موحی ڕاشد، ئەمینداری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش ناچارکرا بەئاشکرا ئیعتراف بکات، ئنجا خۆیو هەمو ئەندامانی خێزانەکەی تیرباران کران، پاشان سێ یەکی ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەسێدارە دران، هەروەکو دەوترێ لە مانگی ئابدا نزیکەی پێنج سەد ئەندامی باڵای حیزبی بەعس لەسێدارە دران.

**١٩/ نیسان/ ١٩٨٠:** محەمەد باقر ئەلسەدرو خوشکەکەی بنتولهودا لەسێدارە دران کە هێمای بەرگری شیعەی عێراق بون لەدژی حکومەتی عێراقی.

**٢٢/ ئەیلول/ ١٩٨٠:** سەدام حسێن جەنگێکی سەرتاپاگیری لەدژی ئێران هەڵایسان.

# بەشی یەکەم

# دەزگاکانی توندوتیژی

## پۆلیسی نهێنی:

سالم خەریك بو لەسەر خوان دادەنیشت، گوێی لە دەنگی دەرگا بو. کاتێك دەرگاکەی کردەوە دوو کەسی لەبەر دەرگاکە بینی، بەڵام ئەو دوو کەسە نە هاتنە ژورەوەو نە ناسنامەی خۆیان پیشانداو هەر ئەوەندەی لە خودی سالم دڵنیابون، بەوپەڕی ڕێزەوە داوایان لێکرد بۆ ماوەی چەند خولەکێك هاوڕێیەتیان بکاتو وەڵامی چەند پرسیاریکیان بداتەوەو پاشان بگەڕێتەوە. هاوسەرەکەی سالم هەر چەندە دەترسا، بەڵام بەدەنگێکی بڵند قسەی دەکرد:

ـ بەدڵنیاییەوە هەڵەیەك هەیە، منو مێردەکەم هیچمان نەکردوە. هەر دوو پیاوەکەش بەزەردەخەنەوەو بەبێ ئەوەی ورتەیەك بکەن سەیری ژنەکەیان دەکرد، بەڵام ژنەکەی سالم بێئەوەی گوێ بەهیچ بدات بەردەوام قسەی دەکرد.

ئیدی سالم ئاوڕێکی لەژنەکەی دایەوەو دڵنیای کردەوە کە شتێکی ئەوتۆ نیە نیگەرانی بکاتو بەشێوەیەك قسەی لەتەکدا دەکرد وەکئەوەی بزانێت چ ڕوودەدا.

سالم بێئەوەی پاروە نانێك بخوات لەگەڵ هەر دوو پیاوەکە کەوتەرێو بەهێمنیش دەرگاکەی بەسەر ژنەکەیدا داخست.

هەر چەندە ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو ڕوداوەدا ڕۆیشتوە، بەڵام تاکو ئێستاش





سالم لەبیری نەچۆتەوە کە چۆن دەستەکانی عەرەقی کردوەو چۆن کاتێك سواری ئۆتۆمۆبیلەکە بوە هەستی بە سەرما کردوە هەر چەندە دنیاش گەرم بوە، هەر لەناو ئۆتۆمۆبیلەکە دانیشتوە یەکسەر هەستی بە ئازارێکی زۆری گەدەی کردوە وەکئەوەی ئامێرێکی بەهێز گەدەی بگوشێت.

ـ ئۆتۆمۆبیلەکە لەبەردەم بارەگای ئەمنی تایبەت بە ناوچەکەیان وەستا.

لەسەرەتای حەفتاکاندا بەغدا بەسەر چەند ناوچەیەکی ئەمنی دابەشکرابو، مەبەست لەو کارەش ئەوە بو کە هاوڵاتیان کەلوپەلەکانیان لە شوێنو نرخی دیاریکراوی حکومەت بفرۆشن. ئەو بارەگا ئەمنییانە وەك نێوەندێك بۆ چاودێری کردنو جموجۆڵی هاوڵاتیان بەکاردەهێنرا. ئەوانەی سەردانی بەغدایان دەکرد سەریان دەسوڕما لەوەی بەهۆی وێنەگرتنێکی ڕوباری دیجلەوە توشی لێپرسینەوە دەبون، چونکە ئەو جۆرە کارانە لە ڕیزی کارە قەدەغەکراوەکان بون، بۆیە ئەگەر یەکێك بۆ نمونە وێنەیەکی زەردەپەڕی ڕوباری دیجلەی بگرتایە بێئەوەی پێشوەخت ڕەزامەندی وەزارەتی ناوخۆ وەربگرێت، ڕوبەڕوی بگرەو بەردەیەکی زۆر دەبووەوە.

لە هێندێك لەو بارەگا ئەمنیانەدا کامیرای وێنەگرتن لە بنمیچی خانو یا لەنێو توحفەو پەیکەرەکاندا دانرابون، ئەو کامیرانە زۆربەی شەقامە سەرەکیو دوڕیانو گۆڕەپانەکانی بەغدایان رووپۆش دەکرد، تۆڕێکی چاودێریکردنی گەورە بەژوری نێوەندییەوە دەبەسترایەوەو لەویشەوە چاودێرییەکی وردی ناوچەکە دەکرا، سالم ـ یان بۆ یەکێك لەو بینایانە برد.

سالم هێشتا هەر لەیادی ماوە کە چۆن ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی دەکرد، بێئەوەی هۆی گرتنەکەی بزانێت، ئیدی بەبێ هیچ هۆیەك هێدی هێدی لەناخەوە هەستی بە ترسێکی زۆر دەکرد. کاتێك ترس لەناخەوە تەنگی پێهەڵچنی، یەکێك هاتو بەرەو ژورێکی گەورە ڕێنمایی کرد، سالم پێیوابو کامیرای وێنەگرتن لە هەمو سوچێکی ئەو ژورە روناکە دانراوە، ئەو روناکییەی لە هەمو سوچێکی ژورەکەوە بەریدەکەوتو ئەوەندەی دی ترسەکەی زیاد دەکرد، لەوەش تێنەدەگەیشت بەتایبەتی

بۆ چاودێریکردنی ئەو دانراوە یا بۆ کاری دی.

کوپێکی چایان بۆ هێناو زۆر بەئەدەبەوە قسەیان لەگەڵدا دەکرد، بەدڵەڕاوکێ قومی لەچایەکەی دەدا، پیاوێکی زۆر گەورە لەپشتی مێزێکەوە دانیشتبو یا سالم وایدەبینی، بەڵام هەرگیز نەیتوانی ناوی بزانێت، لەو کاتەی وەرەقەکانی بەردەمی هەڵدەگێڕایەوە لەسالمی پرسی چەند مانگێك پێش ئێستا فڵانە ڕۆژ لەکوێ بوە.

سالم هیچی دەربارەی ئەو ڕۆژە نەدەزانی، پێیوابو ئەگەر پرسیاری لە ناویشی بکردایە، بەهۆی ئەو ترسەی ناخی داگیرکردبو، بیری نەدەکەوتەوە.

پیاوە گرنگەکە وەرەقەیەکی خستە بەردەستی کە ژمارەی چەند ئۆتۆمۆبیلێکی لەسەر یاداشت کرابو، لێی پرسی:

- ئایا یەکێك لەو ژمارانە دەناسێتەوە؟

سالم زۆر بەزەحمەت ژمارەی ئۆتۆمۆبیلەکەی خۆی لەنێو ئەو ژمارانەدا ناسییەوە، لەنێو ژمارەی ئۆتۆمۆبیلو بەرواروئەو پرسیارانەی دادەبارین بەسەریدا ئەوەندە ترساو وڕو کاس بو، لەپرسیارەکە تێنەدەگەیشت، چجای ئەوەی وەڵامێکی قایلکەر بداتەوە، هەر چەندە زۆر بەهێمنیش پرسیارەکانی ئاراستە دەکرا.

لەناکاو پرسیارێك بەئاگای هێنایەوە، داوای لێکرا ئەوە ڕونبکاتەوە چۆن لەو ڕۆژەدا لەسەر کار بوە، کەچی ئۆتۆمۆبیلەکەی لەبەردەم ماڵەوە ڕاگرتوە، چونکە هەروەکو زانیارییەکانی ئەوان دەریدەخەن ڕۆژانە بە ئۆتۆمۆبیلەکەی خۆی دەچێتە سەرکار!

ترس گوشاری بۆ یادە ماندوەکەی دەهێنا کە لەپڕ توشی ئیفلیجی ببو، تا دواجار توانی ئەو روناکییە ببینێت کە بەرەو وەڵامدانەوەیەکی دروستی داواکراو ڕێنوێنی دەکرد. لەو ماوەیەدا بەهۆی قاچ شکاندییەوە چەند هەفتەیەك لە ماڵەوە کەوتبو، بەڵام کاتێك کەمێك وەزعی باش بو، دەیتوانی بجوڵێت، یەکێك لە خزمەکانی بەیانیان بە ماشینی خۆی دەیگەیاندە سەر ئیشەکەی، یەکێکی دی مناڵەکانی دەبرد بۆ قوتابخانەو هاوسەرەکەیشی بەجۆرێکی دی کاری خۆی مەیسەر کردبو.

بەشپرزەییو پەشۆکاوی باسی لەو وردەکارییانە دەکردو دڵنیاش نەبو کە لێکۆڵەرەکە



بڕوای پێدەکات یا نا، وشەکان بەخێراییو بەبێسەروبەرەیی لەزاری دەهاتنە دەرەوە، هێندێك ڕستەی هیچ مانایەکی نەبو، بەڵام لێکۆڵیارەکە هانیدەدا لەسەر قسەکانی بەردەوام بێت.

کاتێك قسەکانی تەواو بو، ئیدی چاوەڕوانی دەکرد فەرمانی کوشتنی دەربکەن، بەڵام بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە بینی وشەکانی لەلایەن لێکۆڵیارەکەوە بەباشی وەرگیراوە، ئەو قسانە بەلایەوە سەیر نەبو، وەکئەوەی پێشتر بەو هەمو وردەکاریانە بزانێت.

لەدوای چەند پرسیارێکی دی کەمێك هێوڕ بوەوە وەکئەوەی هەوڵێك بێت بۆ ئەوەی لەچەند خاڵێکی دی دڵنیابێت، بەهێمنیەوە کۆتایی لێپێچینەوەکەی ڕاگەیاند، سالمیش ئۆخژنێکی پیاهات، بێئەوەی بزانێت بەتەواوەتی داوای چ لێدەکرێ.

ئنجا لێکۆڵەرەکە لەناکاو نارنجۆکێکی بەرویدا تەقاندەوە!!

پیاوە دەسەڵاتدارەکە داوای لە سالم کرد لە ماوەی دە ڕۆژدا خانوەکەی چۆڵ بکات!! هەمو ناو ماڵەکەش لەگەڵ خۆیاندا بەرنو داوایشی لێکرد کلیلی خانوەکەیان لە یەکێك لەو هۆبانەی بارەگەکە بەجێبهێڵێت کە خۆی پێشانیداو دەبێ لەپێش گواستنەوەشدا ناونیشانە تازەکەی تۆمار بکات، هەروەها پێی ڕاگەیاند لەدوای تەواوبونی لێکۆڵینەوە پەیوەندیی پێوەدەکەن بۆ ئەوەی پێی بڵێن ئەو قسانەی کردویەتی ڕاستە یا نا.

سالم بەحەپەساوی سەیری پیاوە گرنگەکەی دەکردو نەیدەتوانی وشەیەك بخاتە سەرزمانیو نەیدەزانی چۆن پرسیارێك بکات یا نارەزاییەك دەربڕێ؟ لە هەمان کاتیشدا نەیدەتوانی جوڵە بکات. عەبوسیو نێوچەوان گرژی بە پیاوە گرنگەکەوە دیار بو، لە هەمان کاتیشدا سالمی تا سەرجادە ڕەوانەکرد، ئیدی ئەویش بۆ ماڵەوە گەڕایەوە.

کاتێك گەڕایە ماڵەوەو دەرگاکەی لەپشت خۆیەوە داخست هەستیدەکرد تازە لە دایك بۆتەوە.

خانوەکەیان چۆڵکردو کلیلەکانیشیان بۆ شوێنی مەبەست برد.

پاش چەند مانگێك لەو ڕوداوە سالم لە نوسینگەی ئەمنی ناوچەوە تەلەفونێکی بۆ

کراو پێیان ڕاگەیاند کە دەتوانێت کلیلەکانی لەهەمان شـوێن وەربگرێتەوە، هەروەها هەر ئێستاش دەتوانێت بۆ خانوەکەی بگەڕێتەوە.

سـەرباری ئـەو هەمو کارڕاییـیو لێپێچینەوانـە، نوسـراوێکی لەهیـچ لایەنێکەوە وەرنەگرتو هیچ لایەنێکیش داوای نوسراوێکی لەوجۆرەی لێنەکرد.

سـالم تا ماوەیەك لە هیچ حاڵی نەبو، باوەڕی بەوەش نەبو کە کێشـەکەی کۆتایی هاتوە، بەڵام بە تێپەڕبونی کات هەسـتی دەکرد بارگرانییەك لەسـەر شـانی لاچوە، وەکئـەوەی بایەکی زۆر سـارد دەموچاوی سـڕ کردبێت، بۆیە تەنهـا پاش ماوەیەك گەڕایەوە بۆ ژیانی ئاسایی خۆی[1].

هاوڵاتی ئاسـایی لە بابەت سـالم وەك دەزگایەکی قێزەونی ناشـیرین کە بەربینی خەڵکی دەگرێتو لە هەمو شـوێنێك راوەدوویان دەنێت، تەماشـای پۆلیسـی نهێنی دەکەن، دەزگایەك کە هەوڵێکی چڕو پڕی ترسـناك دەدا بۆ ئەوەی بزانێت هاوڵاتیان چ دەکەن. هێندێك خاوەن رەئی ئەو درکە گشـتیەی پێقبوڵ نیە کە پۆلیسـی نهێنی عێراق لەدوای کودەتای ١٩٦٨ەوە هەمو شـتێك بوەو زانیاری تەواوی لەسەر گشت روداوەکانـی ناو عێراق هەبوە، لەبەر ئەوەی هیچ کەسـێك زانیاری لەسـەر دەزگای پۆلیسـی نهێنی عێراق نیە. ئەمە لەکاتێکدا ئەم درکە گشـتیە پشـت بە راسـتییەك دەبەستێ کە لە سیاسەتی ئەمڕۆی عێراقدا رەگوڕیشەی هەیە.

ئەوەی لەسەر پۆلیسی نهێنی عێراق دزەی کردوە زۆر سنوردارەو لەم سەرچاوانەشەوە وەرگیـراوە، کودەتا شکسـتخواردوەکەی سـاڵی ١٩٧٣، هێندێـك بڕگەی راپۆرتی سیاسـی ١٩٧٤، ئەو بەڵگەنامانەی سـاڵی ١٩٧٩ دزەی کردبو، ئەو پروپاگەندانەی تایبەتبون بەو کارانەی لە دەرەوە ئەنجام درابون، سـەرنجو تێبینی چاودێرە بیانیەکان، هێندێك ئاماژەو وشەی راگوزەری ئەندامە چەنەبازەکانی حیزب، ئەزمونی تاکەکەس کە دەماودەم دەگێردرایەوە، دواتریش ئەو کتێبەی کە بە رووکەش لەلایەن سـەرۆکی دەزگای هەواڵگری (مەبەست توڕی سیخوری حیزب) نوسرابو. جگەلە لە هێندێك یاسـا کە بەمەبەستی رێکخستنی خەڵکی بڵاوکرابونەوەو دیاریکردنی چەندین بابەتی



جیـاواز کە دەبوایـە هاوڵاتیان لە دەوڵەتەوە مۆڵەتی بۆ وەرگرن، زانیاری پەخشـکراو لەسـەر رۆڵو ئامانجی دەزگا پۆلیسـیەکان لەبەردەستدا نیە. تەنها ئاماری پەخشکراو بـۆ سـەردەمی پاشـایەتی دەگەڕێتـەوە، تەنانەت ئەو ئامارەش پەیوەسـتە بەپۆلیسـی سەرکوتگەری دەوڵەتو پۆلیسی هاتوچۆو کاری دی لەو بابەتە. لە پێش کودەتاکەی ١٩٦٨دا شـتێك نیـە تایبەت بە نەریتی پۆلیس کە قابیلی ئـەوە بێت لەگەڵ دەزگای پۆلیسی ئێستادا بەراورد بکرێ.

لـە کـۆی ئەو زانیارییـە کەمەی پێمگەیشـتوە، بەو دەرئەنجامە گەیشـتم کە ئەو شوێنەی لە کۆتایی حەفتاکاندا سالمی دەستگیر کرد، سەرەتا وەك یەکەیەکی تایبەتی لقـی عێراقی حیزبی بەعسـی عەرەبی ئیشـتراکی دامـەزرا کە لە سـاڵانی ١٩٦٤ ـ ١٩٦٦دا لەژێر ناوی دەزگای تایبەت (الجهاز الخاص) بەنهێنی کاری دەکرد، بەڵام لەژێـر ناوی (جهاز حنين). حەنین لێهاتوترین کادری حیزبی لەخۆیدەگرت، پاشـان لە بواری هەواڵگریدا بون بەخەڵکانی لێهاتو. ئەندامەکانی دەزگای حەنین چەکدار بونو لەروداوەکانی کودەتا بەعسییەکەی ١٩٦٨دا رۆڵی هەستیاریان هەبو[2].

دەزگای حەنیـن هەر لە سـەرەتاوە وەك هێزێکی حیزبـی ئەڵتەرناتیڤ دامەزرا کە حیزب بنکەکەی بو تا روبەروی ئەو هێزە بێتەوە کە کادرە بەعسـییە سـەربازییەکان کۆنترۆڵیان کردبو، ئەوانەی هێزو دەسەڵاتیان لە پێگەی ستراتیجییانەوە، وەك ئەفسەری سـوپای دەوڵەت، سـەرچاوەی دەگرت. یەکەم حوکمڕانی حیزبی بەعس لە سـاڵی ١٩٦٣دا کاتێك داڕوخا کە سـەربازە بەعسـیەکان لەگەڵ ئەفسـەرە ناحیزبیەکان بۆ لەناوبردنی گاردی میلی بەعسی (حرس قومي) یەکیانگرت.

هەمـان شـتیش لە سـوریا رویدا کە بـوە مایـەی لێکترازانێکی قـوڵ لەنێو هەمو رێکخسـتنەکانی حیزبدا، سـاڵی ١٩٦٤ بە رێنمایی میشـێل عەفلەق، دامەزرێنەری حیزبی بەعس، سەدام حسێن بۆ ئاستی ئەندامی فەرماندەی هەرێمایەتی بەرزبوەوە کە بەرزترین ئۆرگانی بڕیار وەرگرتن بو لەناو حیزبی بەعسی عێراقدا. ئەو بەرزکردنەوەیەش خاڵێکـی یەکلاییکـەرەوەی نێو حیزبی بەعسـی عێراق بو، چونکە سـەدام حسـێن

ئەندازیاری دەزگای حەنین بو، ئاگاداری وردو درشتیی بو، لە چوارچێوەی دەزگا تایبەتەکانی پۆلیسی نهێنی لە دوەم ئەزمونی حوکمڕانی حیزبی بەعسدا. یەکەمین بەڕێوەبەری ئەمنی ناوخۆی دەوڵەت نازم گزار بو کە ساڵی ١٩٦٩ لەلایەن سەدامەوە دامەزرا، کەسێکی بەهەوڵو جدی بو، لە ساڵی پەنجاکاندا کاتێك هێشتا خوێنکار بو پەیوەندی بەحیزبی بەعسەوە کرد، یەکێك بو لەو شیعە کەمانەی لە پێگەی بڕیار وەرگرتندا بو، تواناو لێهاتویی لە روداوە پڕ بەسوێکانی یەکەم حوکمڕانی حیزبی بەعس، لە ساڵی ١٩٦٣دا بەدیار کەوت، بێبەزەییو کارە دڵڕەقەکانی ناوو ناوبانگێکی ئەوتۆی بۆ پەیدا کردبو کە تەنها بەناوهێنانی ترسو دڵەڕاوکێی لەنێو ریزەکانی حیزبدا دەخولقاند. بۆ نمونە خۆی لێکۆڵینەوەی دەکردو بەدەستی خۆی زیندانیەکانی ئەشکەنجە دەداو چێژی لەوەش وەردەگرت کە سیگارەکانی لەناو چاوی بەند کراوەکان بکوژێنێتەوە[3]. گزار دەزگایەکی تۆکمە دەکرد کە پێویستی بە لێهاتوییو پسپۆری هەبو، لە ساڵانی ١٩٥٨ ـ ١٩٦٨دا فرمانی لە سوپاوە وەردەگرت.

لەسەردەمی گزاردا بەهەزاران هاوڵاتی لەسەردەستی پۆلیسی نهێنی ئەشکەنجە دران، بە دیاریکراویش نازانرێ چەند کەسیان گیانی لەدەستداوە، بەڵام زۆربەی قوربانیەکان لە شیوعیو کورد بون. بۆ نمونە ساڵی ١٩٧١ باڵێکی حیزبی شیوعی عێراق لیستێکی بە ناوی ٤١٠ ئەندامی حیزب بڵاوکردەوە کە لە زیندانی "قەسری نیهائی" کوژرابون[4]. نازم لەو بڕوایەبو کە کێشەی کورد بە لەناوبردنو پاکتاوکردنی کورد کۆتایی پێدێت. بۆیە پیاوانی گزار لە دوای مۆرکردنی بەیاننامەی ئازار بەماوەیەکی کورت، دوو جار هەوڵی کوشتنی رێبەری کورد مەلا مستەفای بارزانیان دا، ئەو بەیاننامەیەی کە بەعسییەکان پێیانوابو ئەمنو ئاسایشو ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد دەهێنێت.

بێگومان دەربارەی قۆناغی حوکمی نازم گزار وەك فەرماندەی پۆلیسی نهێنی لەمە زیاتر نازانین، چونکە لە تەموزی ساڵی ١٩٧٣دا خۆیو سێو پێنج کەسی دی لە سێدارە دران. ئەوانە لەلایەن دادگای حیزبەوە دادگایی کران کە هێندێك لەئەندامانی



ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، سەرۆکایەتیان دەکرد، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە دوای ساڵی ١٩٦٨ ەوە بەرزترین دەسەڵات بو، بەهەر حاڵ دادگایی کردنەکە زۆر کورت بو، رژێم راستییەکی ناچیزی ئاشکرا کردو گەلێك نهێنیش لە پشتی پەردە مایەوەو هەرگیز ئاشکرا نەکران. گزار وەزیری بەرگریو ناوخۆی وەك بارمتە گرتبو. دەنگۆی ئەوە هەبو کە ویستبێتی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر بکوژێت، بەڵام کاتێك ئەو هەوڵەی بێئاکام بو، خۆیو دەستو پێوەندەکانی بەرەو سنوری ئێران رایانکرد، کاتێکیش زۆری بۆ هات هەر دوو وەزیرە بارمتەکەی کوشت. ئەم روداوە بە مەبەستی پاکتاوکردنێکی بەرفراوانی ناو حیزب قۆزرایەوە.

راپۆرتی سیاسی ساڵی ١٩٧٤ کە تایبەت بو بە حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، رەهەندێکی قووڵ بە حوکمڕانی بەعس لە عێراق دەبەخشێت، ئەو راپۆرتە زۆر بەڕاشکاوی کردەوەکانی رابردویی شیدەکردەوەو بەتایبەتیش سەردەمی نازم گزار، فەرماندەی پۆلیسی نهێنی رەخنەدەکرد. لە راپۆرتەکەدا هاتوە: "سەرباری کارە خزمەتگوزارییەکانی دەزگای ئەمنی دەوڵەت کە تا رادەیەکی زۆر لەلایەن ئەندامانی حیزبو نیشتمانپەروەرە سەربەخۆکانەوە پشتگیری دەکرا، بەڵام لە سەردەمی رژێمەکانی پێشودا وەك ئامرازێکی تۆقاندنو سەرکوتکردن لەدژی حیزبو بزوتنەوە نیشتمانپەروەرەکان بەکاردەهێنرا، ئەمەش هەستێکی دەرونی گشتی پڕ لەنامۆبونی خولقاندبو. هەر لەهەمان رووەوە ئەنجامدانی ریفۆڕم لەو دەزگایە بۆ ئەوەی ببێتە هەڵگڕی بەهاو رێوشوێنی تازە، کارێکی دژوارو سەخت بو. بێگومان لە ماوەی ١٩٦٨ ـ ١٩٧٣دا هەڵەی کوشندەی کردوە، ئەوەش لەسەر حیزب و سیاسەتی حیزب بە خراپی کەوتەوە. بۆیە سەرکردایەتی هەڵەی کرد کە چاودێرییەکی توندو وردی نەخستە سەر ئەو دەزگا هەستیاریە. هێندێك لە ئەندامانی حیزب ئەو متمانەیەی حیزبیان ئەوەندە بە خراپی بەکاردەهێنا تا کار گەیشتە ئەوەی لەدژی حیزب هەڵگەڕێنەوە، هەروەکو لە ٣٠ حوزەیرانی ١٩٧٣ رویدا. ئەو هەوڵە تاوانکارانەیە حیزبی وشیار کردەوەو ئەو مەترسیانەشی بۆ رونبوەوە کە لە نەبونی چاودێرییەکی وردو

تۆکمە دەکەوێتەوە، ئەمەش بوە مایەی ئەوەی گۆڕانکارییەکی بەرفراوان لەو دەزگایەدا بکات[5]".

مەسەلەی گزار بە توندی رژێمی راچڵەکاند، لەپاڵ ئەوەشدا دەرکەوتنی "هەستێکی دەرونی نامۆ" لە خزمەتگوزاری ئەمنی دەوڵەت لەزنجیرەیەك تاوانی قورسی ئاوارتەدا زۆر روونو ئاشکرا بو، کە یەکسەر دوای ئەو پاکتاوکردنەی لە راپۆرتی سیاسیدا ئاماژەی پێدرابو، رویدا. پیاوکوشتنیش بە ئەندازەی کودەتا رژێمی رادەچەڵەکاند، بۆیە حیزبی بەعس شانازی بەوەوە دەکرد کە تێکرای تاوانەکانی بەغدا زۆر کەمیان کردوە، دەیانوت پۆلیسی فریاگوزاری دەتوانێ لە ماوەی چەند خولەکێکدا بگاتە شوێنی تاوانەکە، بەڵام زنجیرەیەك کردەوەی دزینی ماڵانو کوشتنی خێزانەکانیان ئەو متمانەو بڕوایەی بە پۆلیسی فریاگوزاری لەقکرد.

ئەبو تەبر لەگەڵ باندێك لە پۆلیسەکانی گزار ئەو دزی کردنو تاوانەیان ئەنجام دەدا. لە دادگاش ئەوەی رونکردنەوە کە بۆ ئەوەی نەکەونە داوەوەو دەستگیر نەکرێن، پێشوەخت زانیاری تەواویان لەسەر شەپۆلی رادیۆیی پۆلیسی نهێنی هەبوەو بۆ ئەو مەبەستەش سودیان لێوەرگرتوە.

خۆماڵی کردنی نەوت کەوتە دوای کودەتاکەی گزارو تاوانەکانی ئەبو تەبرەوە، هەروەها پێش کەوتنی حکومەتەکەی لیندیش کەوت لە چیلی (ئەیلولی ساڵی ١٩٧٣). ئەو خوێنەرانەی بە سروشتی کاری حیزبی بەعسو پێکەوە گرێدانی روداوەکان ئاشنانین، ناتوانن پەیوەندی نێوان روداوەکان ببینن، بەڵام سەدام حسێن لە ٢٤ / ئەیلول، لە وتارێکیدا، کوباو عێراقی (کە ببونە مایەی سەرئێشە بۆ ئیمپریالیزم) لە بەرامبەر چیلی (بارەگای شاراوەی ئیمپریالیزم بوە مایەی سەرنگوم کردنی حکومەتەکەی لیندی) دادەنێت:

"ئێمە دەزانین ئیمپریالیزم دڵنیابوە، بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٧٢دا کە شۆڕشی عێراق حاڵەتی (شۆڕشی رێگە پێدراوی) تێپەڕاندوە، ئەوەی ئیمپریالیزم راهاتوە نمونەی لەجیهانی سێیەمدا ببینێت...



ئێمە بەڵگەمان هەیە کە ئیمپریالیزم لەسەر ئەو فرە شێوازەی لەم وڵاتەدا گیراوەتەبەر، توشی سەرسوڕمان بوە. پێشتر شۆڕشەکانی لە بابەت شۆڕشی کوبا ئیمپریالیزمی توشی سەرسوڕمان کردبو، بۆیە هەرچەندە لە عێراقدا بەدوای هۆکاری نادیاردا بگەڕێت، ئەوا هەرگیز ناتوانێت پاشەکشێ بە شۆڕشەکەمان بکات یا شۆڕشەکەمان بەرەو هەڵدێرو داروخان بەرێت.

هێندێك کەس پێیانوایە کە شۆڕشەکەمان لە روداوەکانی چواردەوری بێئاگایە، بەڵام چاوی شۆڕش کراوەیەو دەزانێ چ شتێك لە چواردەوری رودەدا، بەوپەری ئازایەتیو بێدڵەڕاوکێ یا ترس دەتوانێت رۆڵی خۆی ببینێت. هەروەها گشت ئەو روداوانەی کە لەم رۆژانەدا گوێبیستی دەبینو دەیخوێنینەوە، بەو روداوانەشەوە کە لەم دواییانەدا رویانداوە، ئامرازی تازەیەو بۆ روبەروبونەوەی شۆڕش دەقۆزرێتەوە تا بەشێوەیەکی دەرونی لەنێوببرێت. ئەو تاوانانەی ئەنجامدراون تاوانگەلێکی سادی(السادیة) نیە هەروەکو هێندێك کەس پێیانوایە، بەڵکو تاوانێکن بەدەستی کرێگرتە ناپاکەکان ئەنجامدراون.

ئەوانەی خۆیان بە بێگانە فرۆشتوە هەرگیز بەبێ سزا رزگاریان نابێت. ئەوانەی ئەو کارەیان ئەنجام داوە خەڵکانێکی بەکرێگیراونو لەم قۆناغە دژوارەی کە پێیدا تێدەپەڕین، بەشێوازێك لە شێوازەکان بەکارهێنراون، بەڵام نابێت بێباکانە قسە لەسەر توانای هێزو چەمکەکانی خۆمان یا ئیمپریالیزم بکەین. پێویستە شارەزای جموجوڵی ئیمپریالیزم بینو بەوردی چاودێری بکەین. پێویستە بەوپەڕی وردبینییەوە گۆڕانکارییە چاوەڕوانکراوەکانی لە پلانو هێزو فاکتەکانی لە ناوەوەو دەرەوەی وڵات بخەینە ژێر چاودێرییەوە. پێویستە ئامادەباش بین، چونکە ئەو پلان، چەمك، دیدوبۆچونو هێزە ناوخۆییو یەدەکیانەی تا رۆژی یەکی مارس / ١٩٧٣ بەکارمان هێناوەو چۆکمان بە کۆمپانیا مۆنۆپۆڵەکان هێنا، بەس نیە بۆ ئەوەی لێرە بەدواوە روبەروی ئیمپریالیزم بینەوە کە بەردەوام پلانو دیدوبۆچونی تازەی هەیە. بۆیە ئێمە دەزانین کاتێك ئیمپریالیزم بەم جموجوڵەو رێوشوێنە شۆڕشگێڕانەیە توشی شۆك بوە، ئیدی بەخۆیدا دەچێتەوە بۆ

ئەوەی دژە هێرش بکات. لەبەر ئەوە لەخۆئامادەکردنی هێزی تایبەتین بۆ ئەوەی رێگە لە ئیمپریالیزم بگرین پیلانەکانی جێبەجێ بکات، بۆیە گشت برا هاونیشتمانیەکان دڵنیا دەکەینەوە کە ئیمپریالیزم ناتوانێت بمانکات بە لیندی یەکی دی"[6].

ئەم گوتارە جەختکردنەوەیەك بو لەسەر ئەو هۆیانەی پێ لەسەر دامەزراندنی دەزگایەکی پۆلیسی نهێنی بەهێز دادەگرێت، ئەمە لەکاتێکدا متمانەکردن بەم دەزگایە لە ئاستێکی زۆر نزمدا بو. بەڵام "چاوانی" شۆڕش، "پەردە هەڵماڵین" لەسەر رووی دوژمنانو "ئامادەیی جۆراوجۆر"یش بەتەنها ئەرکی دەزگای زانیاریو هەواڵگرییە. سەرلەبەری گوتارەکە جەختکردنەوە بو لەسەر ئەو زانیاریانەی کە حیزبی بەعس دەیزانێتو بەڵگەی وردو کۆنکرێتی لەسەر هەمو مەبەستێكو پێویستییەك هەیە. ئەم جۆرە زانیارانە بەقسە یا بەشیکردنەوەی ئایدیۆلۆجی رووت بەدەست ناهێنرێت، بەڵکو بەچاودێرییەکی وردیی دروست لەسەر ئەو شتەی پێی دەوترێ ئیمپریالیزمو "فاکتە شاراوەکانی" ناو عێراق، بەدەست دەهێنرێ، ئەم چاودێری کردنەش جگە لە دەزگای پۆلیسی نهێنی کە ئەنگیزەیەکی سیاسی هەیە، کەس ناتوانێت دەستەبەری بکات.

لەو کاتەی بیروباوەرە نهێنیو پیلانەکان لەناوکۆی گوتارەکەی سەدام حسێن تێکەڵو پێکەڵ دەبن، ئیدی شەپۆلێك لە چەمکی نوێ لەسەر خیانەت دێتەئاراوە، وشەی خیانەت مانایەکی بەرفراوانی هەیەو بەزەحمەت سنوری دیاریدەکرێ، چونکە خیانەت وشەیەکی سیحرئامێزە کە تاوانەکانی ئەبوتەبرو جیهانی دەرەوە پێکەوە دەبەستێتەوە. ئەو گشتێتیو سەرتاپاگیری تاوانەکان بە سۆنگەی سەرەکی تاوانەکانیان دەزانێت. لە هێندێك وڵاتدا، لەعێراقی پێش حوکمی بەعس، خیانەت تاوانێکی زانراو و مانایەکی رونو ئاشکرای هەبو، بۆ نمونە دزە پێکردنی نهێنی دەوڵەت بە وڵاتێکی بێگانە، نەخشەکێشانو پیلانگێڕان بە مەبەستی کودەتاو سوکایەتی کردن بە کەسایەتی پاشا، لەو حاڵەتەشدا سزای ئەوجۆرە تاوانانەی دەکەوتنە خانەی خیانەتەوە، سزایەکی رونو بەپێی رێوشوێنی یاسایی ئەنجام دەدرا، ئەمە سەرباری ئەوەی سزایەکی زۆر قورس نەبو.



لەبەر ئەوەی بەعس شەرعییەتی بوونی لە "میللەت"و "شۆڕش"ەوە وەردەگرتو هەر لە پێناوی ئەوەشدا هەڵقولابو، بۆیە دەوڵەتو پەیماکەی دەبون بەیەك شت کە هاوتای وشەی "نەتەوەی عەرەب" یا "میللەتە"و لە کەشوهەوایەکی لەوجۆرەشدا کەس ناتوانێت جیاوازی لەنێوان ئەو شتانەدا بکات. لەبەر ئەوە بۆ هەر تاکێك زۆر زەحمەت بو لە نێو ئەو هەمو مانا جەلاتینیە بێقەوارەیەدا دژی ئەو کۆجەستە دژوارە بوەستێتەوە، ناتوانرێت هیچ کارێك وەك نارەزایی راڤەبکرێ، بەڵام زۆر ئاسانە کردەوەیەکی ناچیز وەك تاوانێك دژی بیرۆکەی سەروەری کە ناکرێ لەکەدار بکرێ لە قەڵەم بدرێ.

لە زەینی بەعسدا دژایەتیو رکەبەرایەتی کردنی سەرجەم "میللەت" لە خیانەتی کۆنو باو مەزنترە، چونکە پەلاماری سەرچاوەی دەسەڵاتیان دەدا، وەکئەوەی هەوڵی کودەتایەك بێت لەدژی دەسەڵاتی ئەوانەی حوکمڕانی دەوڵەت دەکەن، تا ئەو رادەیەی کە وێنای دەکەین سوکایەتی کردن بە خۆنازینی میللەت خراپترە لە سوکایەتی کردنی رژێمێکی گەندەڵ، هەرچەندە ئەم کارەش لەرووی سیاسییەوە تا رادەیەکی زۆر بێمانایە. ئەگەر رژێمێك جگە لەو رژێمانەی لە رژێمی بەعس دەچن، پەیوەندیەکی کەمتری بەو جۆرە خەڵکانەوە هەبێت، رەنگە هەوڵنەدات پەیوەندی لە نێوان کردەوەکانی ئەبوتەبرو خیانەت بدۆزێتەوە، بەلانیکەمەوە لەبەر ئەوەی دەستوپێوەندەکانی لە کارمەندانی دەوڵەت بون، بەڵکو رژێمێکی لەو جۆرە ئەو خەڵکانە بەتومەتبار نەك بەخیانەتکار دادگایی دەکات. کردەوەکانی ئەبوتەبر خەڵکی توشی دڵەراوکێو ترس کردبو، بۆیە تا زیاتر قسەیان لەسەر کردەوەکانی دەکرد زیاتر دەترسان. ئەم بارودۆخەش بێوێنە بو، دەبوایە لەکاتی شیکردنەوەو بیرکردنەوەدا لەبەرچاو بگیرێت، هەروەها دەبوایە هۆیەك بۆ ئەو ترسو دڵەراوکێیەش بدۆزرێتەوە کە دواجار دەبوە مایەی بوونی حیزبی بەعس، ئەو ترسەی بەس بۆ ئەوەی هێرش بکرێتە سەر حیزبو رەخنە بکرێ، بەڵام سەدام حسێن هەوڵیدا ئەو هۆیە بۆ نیازێکی تۆبەکارانە نەگێرێتەوە، بەڵکو بەدەرئەنجامی بیروباوەڕی سیاسی لە قەڵەم دا.

گوتارەکەی سەدام حوسێن بەجۆرێك دارێژرا بو خیانەتی دەکرد بە کارێکی بێقەوارەی نادیاری ئەوتۆ کە زۆر بە زەحمەت پێناسە بکرێ، شتێکی هەست پێکراوی ئەوتۆش نەبو کە بەئاسانی گوزارشتی لێبکرێ، خیانەتێك کە چیدی بەتەنها لە کردەوەی مرۆڤ بەدیار ناکەوێت، بەڵکو لەبیرو ئەندێشەشیان بەدیدەکرێ. مەزنی خیانەت دەتوانرێ بەشێوەیەکی بەرجەستەو روون نەك بەتەنها لەسادەیی ئەبو تەبر بەدیبکرێ. ئەم شێوە بیرکردنەوەیە لە ئایدیۆلۆجیای بەعسەوە سەرچاوەی دەگرت کە لەگەڵ ئاراستە ئایدیۆلۆجیا بەرفراوانەکانی ئەوروپای سەدەی نۆزدەهەمدا هاوئاهەنگ بو. سەدام لەبەر رۆشنایی ئەزمونو پێشینەکانی فاشیزمو نازیزمو ستالینیزمی ساڵانی نێوان هەر دوو جەنگی جیهانیدا تەنها لاساییکەرەوەیەك بو نەك داهێنەر، لەگەڵ ئەوەشدا بوە سیاسەتێکی گونجاوی، چونکە سوربو لەسەر ئەوەی ئەو بیروباوەڕانە لەناو عێراقدا پیادە بکات، لەپاڵ هەمو ئەوانەشدا سەرکەوتنی بەشێوەیەکی تایبەتی دەگەڕایەوە بۆ جەختکردنی نائاسایی لەسەر چەمکی تاوانی سیاسی. تاوانی سیاسی مانایەکی نادیارو سەرتاپاگیرو پڕدەنگەدەنگی پەیدا کرد. لەدیدی ئەو خیانەت بەمانای هەڵمەتێکی مەزن بو بۆ سەر تەواوی میللەت، نەك هەڵمەتێك بێت بۆ سەر تاکەکەس، لەهەمان کاتیشدا تاوانێك بو بەزەحمەت دەست نیشان دەکرا، مادامەکی خیانەت بەم شێوەیە شاراوەیە ئاڵۆز بو، بۆیە کاتێك خیانەت ئەمجۆرە رەهەندە پەیدا دەکات، ئیدی کارو کردەوەی پۆلیس بەشێوەیەکی لۆجیکی جێگەی سیاسەت دەگرێتەوە.

لە راپۆرتی سیاسی ساڵی دواتردا گوناهی کارو کردەوەکانی گزار خرایە ئەستۆی کۆمەڵێك ئەفسەرو میراتی دەزگای بیرۆکراسی پۆلیس. دەکرا زیاتر بێدەنگیی لەسەر ئەم مشتومڕە بکرێ تا بێدەنگبون لەسەر بانگەشەکانی سەدام حسێن، لەبەر ئەوەی ئەم مشتومڕە بەشێوازێکی واقیعی خۆی دەردەخستو هەوڵی نەدەدا کاروباری مرۆیی بەشێوازێکی ئامانجگەرانە رونبکاتەوە. لەگەڵ هەمو ئەوانەشدا ئایا گزار کوری حیزبو شۆڕش نەبو کە لەناوییرد؟ ئایا ئەو حاڵەتە دەرونیە نامۆ تایبەتەی کە راپۆرتی سیاسی باسی لێوەکردوە، دیاردەیەکی نوێ یا کۆن بو؟ ئایا هەر کام لە نازم گزارو



ئەبو تەبر لە ئایندەدا وێنەی یەکتری نەبون؟ ئایا کارێکی نامۆو سەیرە کە برادەرانی یەکێکیان، برادەری ئەوی دی بون؟.

دەتوانین بڵێین کەسانێك هەیە کە باوەڕیان بەچەمکی ئەبستراکتی لەبابەتی هەمەلایەنەو گشتگیری ئیمپریالیزم، هۆکاری نهێنیو سیاسەتی سنوردار بۆ جیاوازی کردن لەنێوان خیانەتو ئەمانەتدا هەیە. ئایا کەس دەتوانێت ئەمجۆرە پرسیارانە لەو خەڵکانە بکات؟ لە کوێ ؟ لە وەڵامدا دەڵێن ماوەیەکی زۆرە پرسیارێکیان نیە چونکە سەرلەبەری راستیەکان بەهۆی نهێنیبونی کاری پۆلیسەوە بە زەرورەت لەبەینبراوە. دەزگایەکی پۆلیسی نهێنی بەهێز، تاکە دەزگایە کە دەتوانێت شێوازی پێویست دەستەبەر بکات بۆ ئەوەی ئامادە باشی تەواو بکاتو راستی پێویست بخوڵقێنێت تا لە هەمو شوێنێکدا ئیمپریالیزم تێکبشکێنێت. بەتەنها پرسیارێکی بێمەبەست دەربارەی ئەبو تەبر دەبێتە مایەی گومانو پرسیارکەر دەخاتە خانەی خیانەتەوە. ئەگەر روداوەکانی دوای نازم گزار ئاماژەیەك بێت بەوەی دەزگای پۆلیسی نهێنی لەدەست دەرچوەو کۆنترۆڵ ناکرێ، ئەوا پشتی روداوەکانو ئەوەی رویدا بەرونی ئاشکرای دەکەن کە تەنگژە گرنگەکان لەناو جەستەی رژێمی تازەدا بەهۆی باڵاکردنی هێزی پۆلیسەوە بەدیاردەکەون.

پلەوپایەی رەسمی نازم گزار لێڵو نادیار بو، سەرباری ئەوەی هەرگیز پەیوەندی بەسەربازییەوە نەکردبو، کەچی پلەیەکی بەرزی سەربازیی هەبو (لەبەر ئەوەی سەدام حسێنیش هەمان شتی بۆ خۆی کرد بو، هیچ نارەزاییەکی بەرامبەر گزار نیشان نەدا چونکە هاورێی بو). لە وڵاتێکدا کە لە ساڵی ١٩٥٨ ـ ١٩٦٨ لەلایەن سەربازەوە بەڕێوەدەبرا، ئیدی دەبوایە فەرماندەی پۆلیس بەجلوبەرگی سەربازییەوە دەربکەوێت، بەڵام ئیدارەی نازم گزار کە تەنها لەرووی تیۆرییەوە لەژێر فەرمانی وەزارەتی ناوخۆو دەرەوە بو، ئەو دوو وەزیرەی لەکاتی راکردنەکەیدا بە بارمتە گرتبونی، چونکە گزار پلەوپایەی لەناو حیزبدا لە هەر دوو وەزیرەکە بەرزتر بو، هەر دووکیان لەدوای ساڵی ١٩٦٨ەوە بەهۆی حیزبەوە باڵایان کردبو، هەروەها گزار دژی باڵادەستی سوننە بو

لەنــاو حیزبدا. گزار خوازیاری ئەوە بو کە تەنها ئەندامانی فەرماندەیی هەرێمایەتی بە پلــەی وەزیر دامەزرێن (ئەو دوو وەزیــرە بارمەتەیەش ئەندامی فەرماندەیی هەرێمایەتی نەبــون، تەنها لەبەر ئەوەی بەشــدارییان لە کودەتا کردبو ئەو پلــەو پایەیان پێدرابو)، هەروەها خوازریای پاکتاوکردنی گشــت راســتڕەوەکانو ئەو حیزبیانەش بو کە تەنها لەبەر وەرگرتنی پلەوپایە ببون بەحیزبی.

لەپاڵ ئەوەشــدا کێشەی گزارو وەزیرەکان، کێشمەکێشێکی دی لەنێوان سەرۆکی دائیرەی ســەربازی (کە لەگەڵ گزاردا لە سـێدارەدرا)و هەمان وەزیری بەرگری هەبو کە کۆمەڵێك فەرمانی دائیرەی ســەربازی پشــتگوێ خســتبو[7]. بەکورتی، گرفتو کێشــمەکێش لەنێوان حیزبو دەوڵەت ســەریهەڵدا. لەســاڵانی یەکەمی حوکمڕانی بەعســدا ئەم شــیکردنەوەیە وەك ململانێی نێوان دەســەڵاتی بەهێزی پۆلیسی نهێنیو دەسەڵاتی سیاسی سوپا راڤەدەکرا. شکستی گزار ئەوەی رونکردەوە کە ئەم ململانێیە لە بەرژەوەندی سوپاو لەدژی بەرژەوەندی باڵی مەدەنی حیزب یەکلاییبۆتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەم شــیکردنەوەیەش بڕێك لە راســتی تیا بێت، ئــەوا دواتر روداوەکان ئەوەی دەرخست کە ئەو سەرکەوتنە جگە لە سەرکەوتنێکی کاتی شتێکی دی نەبو.

لەو دەمەدا ســەدام حســێن جێگری ســکرتێری گشــتی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشــتراکیو جێگری ســەرۆکی ئەنجومەنی ســەرکردایەتی شــۆڕش بو، هەروەها لە حیزبیشــدا ســەرۆکی راســتەوخۆی گزار بو. رەنگە کردەوەکانی گــزار بۆ ماوەیەك هەڵوێســتی ســەدام حســێنی لاواز کردبێت، چونکە دەنگۆی ئەوە هەبو کە لەپشت کردەوەکانــی گــزارەوە بێت، بۆیە زۆر بە پەلە دەســتوری کاتــی گۆڕانکاری تیاکراو دەسەڵاتێکی زیاتریش بە ئەحمەد حەسەن بەکری سەرکۆمار درا. بەکر لە پێگەیەکدا بو کە دەیتوانی قەیرانەکە چارەســەر بکات، چونکە لە ســاڵی ١٩٦٥ەوە ســکرتێری گشــتی فەرماندەیــی هەرێمایەتــی بەعس بــو، یەکێك بو لــەو ئەندامانــەی هەر لە ســەرەتای دروستبونی حیزبی بەعسەوە پەیوەندی پێوەکردبون، لە ساڵی ١٩٦٤یشەوە بەڕێزترینو شایســتەترین ئەندامی حیزبی بەعس بو، بۆیــە کاتێك بوە رێبەری حیزب



کۆتایی بەململانێی ناوخۆی حیزب هێنا، لەســەروی ئەوانەشــەوە، لەنێو ئەفســەرانی ئازادیخوازاندا کە رژێمی پاشایەتیان سەرنگوم کرد، رێزێکی تایبەتی هەبو. لەودەمەدا هیچ کەسێکی دی لەعێراق ئەو خەسڵەتانەی بەکری تیا نەبو.

بەکر بەرپرســیارێتی وەزارەتی بەرگری گرتە ئەســتۆو گرژی نێوان سوپاو حیزبیشی کەمکردەوە، بۆیە لەتوانای ســەدام حســێندا نەبو ئەو هەمو بەربەســتانە لەنێوبەرێت، هەروەها ســەدام پەیوەندی خزمایەتیشــی لەگەڵ بەکردا هەبو، ئەمە سەرباری ئەوەی هەردوکیــان تکریتیو ســەر بەخێڵێــك بونو لە ســاڵی ١٩٦٤یشــەوە پەیوەندییەکی توندوتۆڵــی کار لەنێوانیاندا هەبو، بەوەی ســەدام حیزب کۆنتــڕۆڵ بکاتو بەکریش ببێتە سەر کۆمارو فەرماندەی گشتی سوپا. لەگەڵ هەمو ئەوانەشدا ئەگەر سەدام سێ هەنگاوی بنەرەتی نەهاویشتایە لە پیلانەکەی گزار رزگاری نەدەبو.

ســەرەتا سەدام حســێن گەورەترین پێشــبڕکیکاری خۆی لەم مەسەلەیەوە گلاند، ئەویش عەبدولخالق ئەلسامەرائی، خاوەن فیکرو ئایدیۆلۆجیستی حیزب بو، سامەڕائی لەرووی پێگەو جامەوەرەوە بەکەسی سێیەمی وڵات دەژمێردراو لەدوای بەکرو سەدام حســێنەوە دەهــات. ســامەرائی بەتومەتی پروپــوچو بێبەها حوکــم درا، بەڵام بەکر حوکمەکــەی واژو نەکرد، بۆیە بەحوکمی هەتاهەتایی زیندانی کراو ســاڵی ١٩٧٩، دوای ئەوەی لە ئەلبەکر رزگاری بو، تیربارانی کرد.

دوەم هەنگاوی سەدام حسێن بریتی بو لە پیادەکردنی رێوشوێنی توند بۆ لەناوبردنی ئەو بێســەروبەرەییەی لەریزی میلیشــیا حیزبیەکاندا بڵاوببــوەوە، لەبەر ئەوەی وەلائی زۆربەی ســەرکردە ناوچەییەکان لەنێوان گزارو رێبەرانی حیزبو دەســەڵاتی دەوڵەتدا دابەش ببون، بۆیە خودی سەدام حسێن فەرماندەیی میلیشیا دڵسۆزەکانی حیزبی دەکردو ئەوپەری دەسەڵاتیشی پێدان بۆ ئەوەی چییان دەوێت لە بەغدا بیکەنو بۆ راوەدونانی گــزار بەکاریدەهێنــانو پەلاماری ئەو پێگەو مۆڵگە بەهێزانەشــی پێدان کە پێشــبینی دەکرا گزار پەنای بۆ بەرێت، لەهەمان کاتیشــدا سوپای لەم ئۆپراسیۆنە دورخستەوە. هەرچەنــدە پۆلیســی نهێنی بەهۆی روداوەکانی حوزەیــرانو تەموزی ١٩٧٣ەوە لاواز

بو، بەڵام پێگەی سیاسی سوپا لەرێگەی رێوشوێنە تۆکمەکانی سەدامەوە بەتەواوەتی پەکیکەوتبو، حزبیش لەسایەی رێبەرایەتی ئەوەوە خۆی رێکدەخستەوە.

سێیەم، خودی سەدام حسێن هەستا بەرێکخستنەوەی پۆلیسی نهێنی، ئەو دەزگایەی سالمو خێزانەکەی بانگهێشت کرد لەو رێکخستنە تازەیەدا بو. سەرئەنجام سێ دەزگای دامەزراند کە هەر یەکەیان راستەوخۆ بەرامبەر بە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بەرپرسیار بو.

نوێکردنەوەو چاکسازی لە ئەمنی ناوخۆدا کرا، واتە هەمان ئەو دەزگایەی کە گزار ئیدارەکەی دەکرد. سەدام لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٣دا لەگەڵ ئەندرۆپۆف، سەرۆکی دەزگای هەواڵگری ئەو کاتەی سۆڤێت لەچوارچێوەی هەمان پەیمانی دۆستایەتی ساڵی ١٩٧٢ عێراق ـ سۆڤێت، رێکەوتنێکی نهێنی هەواڵگریشی مۆر کرد، (ئەو رێکەوتنە دەرئەنجامی ئەو گفتوگۆیانە بو کە خودی سەدام ئەنجامی دابو). هەواڵی ئەو رێکەوتنەش لەرێگەی بەعسیەکی نەیارەوە گەیشتە رۆژئاوا کە دوای پاکتاوکردنەکەی ساڵی ١٩٧٩ توانی رابکات[8]. ئەم رێکەوتنە بریتی بو لە:

**أ‌ـ رێکخستنەوەی هەمو لایەنەکانی ئەمنی ناوخۆ، ئەوەش لەسەر راسپاردەی دەزگای هەواڵگری سۆڤێت بو.**

**ب‌ـ سۆڤێت ئامرازی پێشکەوتویی لێکۆڵینەوەو چاودێری بە عێراق دەدا.**

**پ‌ـ مەشق پێکردنو راهێنانی عێراقی لە فێرگە جیاوازەکانی دەزگای هەواڵگری سۆڤێتدا.**

**ت‌ـ ئاڵوگۆڕی زانیاری ئەمنی کە پەیوەندی بە هەواڵگرییەوە هەبێت.**

**ج ـ ئەو وڵاتانەی باڵیوزخانەی سۆڤێتی تیا نیە دەبێ ئەو کەسانەی لە باڵیوزخانەی عێراق کار دەکەن زانیاری هەواڵگری بە ئاژانسی سۆڤێت بدەن.**

بەجۆرێك ئامادەکارییەکی تازە کرا کە هەواڵگری سەربازی کۆنترۆڵی زۆرینەی ئەو کارانەی دەکرد لەدژی عێراقیەکان یا هاوڵاتی هەر وڵاتێکی دی لە دەرەوە ئەنجام دەدرا، ئەم دەزگا هەواڵگرییانە زیاتر فەرمانبەری باڵیۆزخانەکانی بەکاردەهێنا، بەتایبەتی ئەوانەی لە مولحەقی سەربازی باڵیۆزخانەکان کاریان دەکرد، رەنگە ئەو فەرمانبەرانە



لەبەر ئەوەی پێشینەیەکیان لە سوپا هەبو، توانای ئەوەیان هەبوبێت ئەرکی سەرشانیان ئەنجام بدەن، بەڵام سەبارەت بەم کارەش زانیاری وردو دروست لەبەردەستدا نیە.

## بەڵگەنامەی خەلیل ئەلعەزاوی:

ساڵی ١٩٧٩ بەڵگەنامەیەکی چل لاپەڕەیی لەلایەن خەلیل ئەلعەزاوی، بەڕێوەبەری چالاکییە هەواڵگرییەکان دزەی کرد کە لە پلانێکی ستراتیجیدا، ئامانجی لقەکانی دەرەوە دیاریکرابو، بەڵام کاتێك لاپەڕەکانی ئەو بەڵگەنامەیە هەڵدەدەیتەوە هەست دەکەیت حکایەتێکی سوکو ئاست نزمی پۆلیسی دەخوێنیتەوە. بۆ نمونە داوا لە نوسینگەی مولحەقی سەربازی لە لەندەن دەکات، راپۆرتی وردو دروست پێشکەش بکات دەربارەی "دەزگاکانی چەکی ئەتۆمیو بەکتریالۆجیو کیمیاییو شوێنەکانیان، لەگەڵ ئەوەی بەپێی تواناش وردەکاری لەسەر تواناو هەمباری یەدەکییەکانیان لەراپۆرتەکەدا بنوسێت". هەروەها ئەو بەڵگەنامەیە ئەوەش روندەکاتەوە کە سەرباری ئەو شتانەی سەرەوە، داوای زانیاری لەسەر ئەزمونی تایبەتو داتا لەسەر بۆچونی کەسێتی هێندێك لە زانایانی ئەو دەزگایانە دەکاتو هەروەها داواش دەکات بە تیروتەسەلی بنکە دەریاییەکان بە نەخشەو وێنەی فۆتۆگرافی ئاسمانی وەسف بکرێ.

بەشێکی سەربەخۆی پلانی ئەو کارنامەیە دەربارەی پەیمانی ناتۆ بو، بەوەی رێنمایی بەسیخورە بەعسیەکان درابو بەلانیکەمەوە پشکنینو لێکۆڵینەوە لەسەر سروشتو پەیکەری هێزەکانی ناتۆ بکەن... هەروەها راپۆرت لەسەر بنکە ئاسمانیو زەمینیو ئاوییەکانیان لەسەرتاسەری جیهان، بەتایبەتی لەناوچەی دەریای ناوەراستدا بنوسن، سەرەڕای ئەوەش داوایان لێکرابو زانیاری لەسەر چەكو هێزی ئاساییو ئەتۆمیو ئامانجو جموجوڵی هێزەکانیان لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا کۆبکەنەوە.

سیخورە عێراقیەکان ئامۆژگاری دەکرێن بەوەی پلاندانەرانی کارنامەکە پێیانوایە

پیاوەکانیـــان لـــە وڵاتە بیانیەکاندا تەنانـــەت ناتوانن رۆژنامەیەکیش بســـەنن، بێئەوەی لەسەر چۆنێتی دەستکەوتنی ئەو رۆژنامەیە وردەکاریان بۆ رەوانە نەکەن[9].

## پاسەوانیکردن لە ئەبو نیزاڵ:

لەگەڵ ئەوەشدا، نابێت بەسوکی تەماشای ئەو رێکخراوە پۆلیسیانە بکرێن، لە دوای هەڕەشـــە بەناوبانگەکەی ســـەدام کە لە شـــوباتی ١٩٨٠دا وتی: " دوژمنانی شۆڕش لە هەر کۆییەك بن، دەستی شۆڕشیان پێدەگات"، ئیدی دوا بەدوای ئەو وتەیە چەندین ســـەرکردەی نەیاری عێراقی لە بەیروت تیرۆر کرانو بەلانیکەمەوە هەوڵێکی تیرۆیـــش لە پاریـــس درا[10]. عەبدولـــرەزاق نایف لـــە لەندەن تیرۆر کـــراو و یارمەتی لۆجیســـتیو مادی ئەو کەســـانەش دەدرا کە لە مارسی ١٩٨٠دا باڵیۆزخانەی ئێرانیان گەمـــارۆ دابـــو. ئەگەری ئەوەش هەیە ســـاڵی ١٩٨٠ لەرێگەی گروپـــی ئەوبو نیزاڵەوە بەشـــداریان لە تیرۆر کردنی چەندین ســـەرکردەی فەڵەســـتینی کردبێت، بۆیە کاتێك رێکخراوی ئازادیخوازی فەڵەستین ویستی تۆڵە لە ئەبو نیزاڵ بکاتەوە کە لە یەکێك لە نەخۆشخانەکانی لەندەن چارەسەر دەکرا، ئەوا هیچ یەکێك لە پیاوانی ئەو رێکخراوە دەســـتیان پێرانەگەیشت، چونکە عێراقیەکان نەخۆشخانەکەیان کردبو بە قەڵایەك کە چونە ژورەوەی زۆر زەحمەت بو[11].

## گروپەکانی مەرگ:

رۆژنامەی گاردیان ناوی سیخورێکی هەواڵگری بڵاوکردۆتەوە کە سەرکردەی گروپێکی مەرگ بوەو پەلاماری شـــۆڵۆمۆ ئەرگۆف-ی، باڵیۆزی ئیسرائیل لە لەندەن، داوە، ئەو روداوەش بوە پاســـاوێك بۆ ئەوەی ئیســـرائیل، هێرش بکاتە ســـەر لوبنان،



هەروەها دەڵێت شـــەش گروپی مەرگی جوداجودا لە بەغداوە رەوانە کراون بۆ ئەوەی نەیارانی عێراقی لە دەرەوەی وڵات تیرۆر بکەن[12]. ئەو لیستی مەرگە لەلایەن پۆلیسی بریتانیاوە ئاشکرا کراو لەچوارچێوەی لێکۆڵینەوەیەکی خێرای وەزارەتی ناوخۆدا، بڕیار درا پارێزگاری لە سەرجەم ئەو خوێندکارانە بکرێن کە لە لیستەکەدا ناویان هاتوە[13]. هەروەها لە ١١ / کانونی دوەم / ١٩٨٣دا لە دیترۆیت ســـیخورەکانی حیزبی بەعس بەکوشتنی ناپلیۆن پاشا تاوانبار کران کە رۆژنامەنوسێکی بە رەگەز عێراقی دژ بەرژێمی بەعس بو، سەرباری کوشتنی سێ کەسی دی کە ئەویش هەر لە دیترۆیت بو لەساڵانی ١٩٧٧ - ١٩٨٠دا، ئـــەو ســـێ کەســـەش خوێندکارێكو دوو تـــازە پەناهەندەی کارا بون [14]. لەپاڵ ئەوانەشدا، هێندێك کەسایەتی ناسراوی غیرە عێراقی وەك عیسمەت ڤانلی، سویسری بە رەگەز کورد، ئامانجی تیرۆری حیزبی بەعس بون[15].

## وڵاتانی جێی ئامانج:

نمونەیەکی خراپی دی شێوازی هەواڵگری بابەتی هانز میلین-ی فەرماندەی پۆلیســـی کۆچی ســـوید بو کە لە ٥ / شـــوبات ١٩٧٩دا بە تومەتی پێدانی زانیاری بە پیاوانی هەواڵگری لە باڵیۆزخانەی عێراقی دەســـتگیر کرا. لە هەمان رۆژیشـــدا ســـێ فەرمانبەری باڵیۆزخانە لە ســـوید دەرکران. میلین دەســـتی بە پازدە هەزار دۆســـیەی پەناهەندەی نیشتەجێی سویدی، بەپەناهەندەی کوردیشەوە، دەگەیشت. گشت ئەو زانیارییانە لەســـەر کوردەکانی نیشـــتەجێی دەرەوە لەو وڵاتانەی پێی دەوترێ "وڵاتانی جێی ئامانج" بایەخی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە بەشـــێکی گرنگ بو لە کارنامەی پلانی ســـتراتیجی[16]. هەروەها دیپلۆماتێکی دی لە نەرویج بەناوی ئارنە تریهۆلت بە تۆمەتی سیخوری کردن بۆ سۆڤێتو عێراق بە بیست ساڵ زیندانی حوکمدرا[17].

## دەزگای هەواڵگری:

بەڵام دەزگای هەواڵگری بریتیە لە دەزگای زانیاری حیزب کـە بەهێزترین‌و ترسناکترین ڕێکخراوە لەنێوان ئەو سێ ڕێکخراوەی ناویان هاتوە.

ئەم دەزگایە بەجۆرێك دامەزرا تا چاودێری هەمو دەزگا پۆلیسیەکانی دی بکات، هەروەها لێپرسـراوی هێندێـك دەزگای دی بو وەك سـوپاو فەرمانگە حکومیەکان‌و ڕێکخراوە جەماوەرییە تایبەکانی بۆ نمونە گەنجان‌و ژنان.

بەشـێکی هەواڵگری هەبو کە پێی دەوترا "هۆبەی ئەمنی تایبەت"، سەرپەرشـتی میلیشـیا چەکدارەکانی حیزبی دەکردو برا بچوکەکەی سـەدام‌و سـەعدون شاکری ئەندامی فەرماندەیی هەرێمایەتی سەرۆکایەتیان دەکرد. دەزگای هەواڵگری لەمناڵدانی " دەزگای حەنین"، لەدایك بو، ئەو دەزگایەی سـەدام حسـێن لە سـاڵانی یەکەمی کاری سیاسیدا دایهێنا.

بەهۆی کەمی‌و دەگمەنی زانیاری لەسـەر ئەو هەڵوێسـتە، ئەستە پەیوەندیی نێوان نـازم گزارو ئەم دەزگایە دەسـت نیشـان بکەین، هەروەها زەحمەتـە ئەوەش بزانین کـە ئـەم دەزگایە ڕۆڵی لـە روداوەکانی سـاڵی ١٩٧٣دا هەبوە یا نـا، بەهەرحاڵ لە ڕێکخسـتنەکانی حیزبی بەعسـدا هاوکات لەگەڵ باڵاکردنی کێشی سیاسی، هەمو شـتێك مۆرکی نهێنی بەخۆیەوە دەگرێت. تا ئـەو جێگەیەی ئێمە ئاگادار بین، تاکە ئامـاژە لەسـەر بونی هەواڵگـری دەگەڕێتەوە بۆ ئـەو دوو بڕگەیەی کـە لە ڕاپۆرتی سیاسـی سـاڵی ١٩٧٤ دا هاتوە: "لەسەرەتای هەڵایسـانی شۆڕشدا، حیزب بڕیاریدا دەزگایەکی تایبەت بە ئەمن دامەزرێنێت، لە هەوەڵەوە ناوی "نوسـینگەی پەیوەندییە گشـتییەکانی" لێنا، پاشـان ناوەکەی بۆ "دائیرەی هەواڵگری گشـتی" گۆڕی. ئەم دائیرەیـە لەرێگـەی دامەزراندنی هێندێـك لە ئەندامانی حیـزب‌و خەڵکانی بێلایەنی نیشتمانپەروەر لە پۆستی هەستیاری ناو ئەم دەزگایەدا، دەستی بەسەر ئەمن‌و پۆلیسدا



گرت، ئەمە سـەرباری ئەوەی ئەم دەزگایە بەپێی چەمکی شـۆڕش‌و پێداویستیەکانی قۆناغە تازەکە ڕێکخرایەوە.

سـەرجەم کارمەندانـی ئـەم دەزگا ئەمنییە تازەیـە لە خەڵکانی حیزبـی‌و نمونەی لێهاتویـی‌و دڵسـۆزی بون بۆ سـەرکردایەتییەکەیان‌و لەئەنجامـدان‌و جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیانـدا زۆر وردەکاربـون، هەرچەندە کارمەندانی ئەم دەزگایە پێش شـۆڕش هیچجۆرە ئەزمونێکی پیشـوەختیان لەم بوارەدا نەبو، بەڵام ئەو خەڵکانە پێشـئەوەی دەسەڵات بگرنە دەست لەرێگەی ئەزمون‌و هەڵەی هێندێك بواری چالاکی حیزبیەوە هونـەری ئەم کارە فێربون. ئەوانـە بەرزی لێهاتویی خۆیان لە ئاشـکراکردنی پیلانی دەرەکی‌و ناوخۆیی‌و سەرکوتکردن‌و پاکتاوکردنی پیلانگێڕانەوە سەلماند، هەروەها ئەم دەزگایە ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی لە پاکتاوکردنی تۆڕە تێکدەرەکاندا هەبو"[18].

هەواڵگری بەپێچەوانەی سـەرجەم دەزگاکانی پۆلیسـەوە بەتەواوەتی دەستەیەکی سیاسی بون، بۆیە بەتەنها دەزگایەکی تایبەتی دەوڵەت نەبو کە بەرپرسیارێتی پاسەوانی ئاسایشـی نەتەوەیی لە ئەسـتۆ گرتبێت، بەڵکو ئەندامە سـەرەتاییەکانی ئەم دەزگایە بێئەزمونی پیشەیی‌و زانیاری سیاسیان، نەك دڵسۆزی‌و وەفاداری، پێکەوە کۆکردبوەوە. هەروەهـا تواناو لێهاتوییان وەك خەڵکانی بەرپرس لەم دەزگایەدا، زیاتر پێشـینەیەکی سیاسـی‌و دڵسـۆزی بۆ ڕێبەر هەبو، لەبەرامبەر ئەوەشدا گرنگ نەبو ئەگەر لە زانیاری هونەریی‌و ئەلەکترۆنی باوی سیستمی زانیاری نوێدا بێخەبەرو ناپسپۆر بون.

بەکورتی، ئەو دەزگا ئەمنیەی لەژێر فەرمانی نازم گزاردا کاریدەکرد، بەشێوازێکی زۆر دڕندانە کارەکانی جێبەجێ دەکردو ڕەفتاری بەرچاویان لەو کاتەدا بو کە گاردی بێئەزمونـی نیشـتمانی لە سـاڵی ١٩٦٣دا هەر کەسـێکی بەرچاوکەوتایـە بە تومەتی کۆمۆنیسـت بون یا بەتومەتی لایەنگیریی کردن لە عەبدولکەریم قاسـم دەستگیریان دەکـرد. سـاڵی ١٩٦٨ لەرێگـەی دەزگا ئەمنییـە کۆنەکـەوە کە هێندێك بەعسـی سـەرۆکایەتییان دەکرد بەهەمان شـێواز کەوتنەوەکار. لەودەمەدا بەعسـیەکان بەپێی ڕاپۆرتی سیاسـی ١٩٧٤ حیزبێکی بچوك بون، بۆیە بەمەبەسـتی پڕکردنەوەی پۆسـتە

گرنگەکانی دەوڵەت بــە کادری هونەریی‌و بەتوانا روبەروی گرفتی زۆر دەبونەوە[19]. کاتێك کەسێکی وەك گزار لێپرسراوێتی دەزگایەکی لەوجۆرە دەکات، ئیدی سەرجەم دەزگاکە روبەروی داڕوخان دەبێتەوە.

## سەدام حسێن‌و ڕێکخستنەوەی ئەمن:

کاتێك سەدام حسێن کەوتە ڕێکخستنەوەی ئەمن، سەرۆکێکی بیروکراسی حیزبی بۆ دانا، هەروەها ئەو دەزگایە وەك جاران دەزگایەکی فشەڵ نەبو، بەڵکو بوە دەزگایەکی ئاڵۆز، لەجیاتی ئەوەی لێپرسراوێکی بەتوانای هەبێت، کۆمەڵێك لێپرسراوی هەبو، کە یەکێکیان کۆنترۆڵی ئەوەی ژێردەســتی خۆی دەکردو چاودێرییەکی وردی ســەرویی خۆیشی دەکرد. دەرئەنجامی ئەم ڕێکخستنەش کۆنترۆڵی رەهای حیزب بو لەڕێگەی هەواڵگری‌و بەرەسمی ناساندنی سیستمی سیخوری بەسەر سیخورەکانەوە. بەمشــێوەیە جیــاوازی نێوان ئەمن‌و هەواڵگری لەســەردەمی حوکمی گزاردا رۆشــن نەبو، هەمو دەزگا ئەمنیەکان بەپلەی یەکەم ببونە دەزگایەکی سیاســی‌و حیزب توانی دەوڵــەت کۆنترۆڵ بکاتو بچوکی بکاتەوە کــە دەبوایە پێچەوانەکەی روبدات. ئەم دەزگایە لەڕێگەی باڵادەستی ترسەوە زۆر چالاکانە کارەکانی ڕاییدەکرد، ئەو ترسەی نەك هەر بەرۆکی ســەرلەبەری خەڵکی گرتبو، بەڵکو ســەرتاپای ئەو کارمەندانەشــی گرتبۆوە کەلە دەزگای پۆلیســی نهێنی کاریان دەکــرد، بەدەر لە بەرزی‌و نزمی پلەو پایەی وەزیفییان. دەشــێت ئەو خەڵکە سوكو ریســوایانە بەخۆیانو سەرۆکەکانیانەوە خەڵاتو جیاکارییان چنگ کەوتایە. بەڵام سبەی چی رویدەدا، ئەوا کەس نەیدەزانی، رەنگە هەمو شــتێك هەڵبوەشــایەتەوە. ئەو روداوە نادیارو ئاڵۆزەی سالمو خێزانەکەی روبــەروی بونــەوە، رۆژانە لەلایەن ئەو دەزگایانەوە لەبەر هــۆی دیارو نادیار روبەروی هەمو هاوڵاتییەك دەبوەوە.



## کتێبەکەی دکتۆر فازیل بەڕاك:

دوا بەڵگەمان لەم بوارەدا لەســەر پۆلیسی نهێنی، بریتیە لە کتێبەکەی دکتۆر فازیل بەڕاك کە ساڵی ١٩٨٤ لەسەر فێرگە یەهودی‌و ئێرانیەکانی ناو عێراق بڵاوبۆەوە. پروپاگەندەیــەك بڵاوبوەوە کە ســاڵی ١٩٨٢ فازیل بەڕاك لەجێگــەی بەرزان تکریتی زڕ برای ســەدام حسێن دەبێتە ســەرۆکی دەزگای هەواڵگری، بۆیە ئەگەر ئەو هەواڵە راست بێت، ئەوا ئەم دامەزراندنە دەستیاری برادەرەکەی دەدا چەندین بەرگ لەسەر سروشــتی ئەو ڕێکخستنە بنوسێتەوە کە سەدام حسێن دایمەزراندبو، هەروەها ئەوەش روندەکاتەوە کە ئەو ڕێکخســتنەوەیەی لەلایەن ســەدام حسێنەوە ئەنجام درا، چەند پڕکێشــەو ئاڵۆز بوە. ســەردەمی ئەو ســەرۆکانەش بەســەرچو کە جگە لە پەیوەندی خزمایەتی‌و پیاو کوشتن هیچ تواناو لیهاتوییەکی دییان نەبو، لەجیاتی ئەوانەش خەڵکانی روناکبیرو تەکنۆکرات دانران، تەنانەت لەو کاتەشدا کە سەرۆکایەتی دەزگایەکی وەك دەزگای هەواڵگریان دەکرد، دەستیان لە نوسین هەڵنەدەگرت.

بەڕاك ســەرنج بۆ ئەو دەرفەتە زانستیە بێوێنەیە رادەکێشێت کە لە ڕێگەی ئەزمونی تاکەکەســی وەك ئەکادیمی‌و ئەندامی حیزبێك‌و بەهۆی ئەو "وەزیفەیەی کە شەرەفی بەرپرســیارێتیم پێبڕاوە"، بە بەقســەی بەڕاك[20]، بەدەســتی هێناوە. ئــەم کتێبە لەژێر چاودێری‌و بەرەزامەندی راســتەوخۆی دیوانی ســەرۆکایەتی بەچاپ گەیەنرا. بەڕاك زانیاری ئەم کتێبەی لە دۆســیەی پۆلیســەوە وەرگرتوەو زۆر بەوردی لە ســەرچاوەی کتێبەکەی ئاماژەی پێداوە.

دیدوبۆچونی خوێنەر لەســەر ئەو کتێبە هەرچییەك بێت، دواجار هەوڵێکی فیکرییە لەلایەن پۆلیسی نهێنییەوەو بەرجەستەی توانایەك دەکات کە تا ئەودەمە هیچ دەزگایەکی نهێنــی دەوڵەت لە عێراقدا شــتێکی لەوجــۆرەی بەخۆییەوە نەبینیــوە. بەڕاك دەڵێت بیرۆکەی نوســینی ئەم کتێبە بۆ گوتارێکی ســاڵی ١٩٧٩ ســەدام حسێن دەگەڕێتەوە

کە تێیدا سەرنج رادەکێشێت بۆ " ئەو ئامرازە کۆمەڵایەتیو سیاسیە وێرانکارییەی شەڕەنگێزە فراوانخوازەکان لەناو عێراقدا پیادەیان دەکرد"، سەدام پەروەردەی وەك مەڵبەندێك وەسفدەکرد کە گەنجانی عێراقی لە رێگەی فێرگە یەهودیو ئێرانیەکانی ناو عێراق بەرەو "کۆیلایەتی عەقلیو رۆحی پەلکێش دەکرێن"(21).

## فێرگە یەهودیو ئێرانیەکانی ناو عێراق:

لێکۆڵینەوەکە ئاماژە بەوە دەکات کە فێرگە یەهودیو ئێرانیەکان هەوڵدەدن ئامانجە سیاسییە دور مەوداکانیان بهێننەدی، سەبارەت بە یەهودییەکانی عێراق سەرچاوە زایۆنیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە لە سەدەی حەوتەمی پێش زایینیەوە هەمو هیواو ئاواتەکان لەسەر گێرانەوەی سەرزەمینی زایۆنیەکان هەڵچنرابو، ئەو هیوایەی لەدێر زەمانەوە "هێزێکی رۆحی سەرەکی" بەگشت یەهودییەکانی عێراق دەبەخشی، ئەو کارەی یەهودییەکانی والێکرد لە هەمو قۆناغەکانی بوونی بریتانیا لە عێراق هاوپەیمانیان لەتەکدا ببەستن. بۆیە کاتێك بەڕاك قسە لەسەر سەردەمی نوێ دەکات، ئەوا پشت بە بەڵگەنامەی ساختەی دژە سامییەت دەبەستێت کە پۆلیسی نهێنی تزاری ئامادەی کردبو، هەروەها ئاماژە بە پرۆتۆکۆڵەکانی پیرانی زایۆنیش دەکات. بەڕاك دەڵێت: ماسۆنییەت ئەو پەیوەندییە توندو تۆڵەی نێوان بەرخوازی سەرکردایەتی زایۆنیزمی جیهانیو ئیمپریالیزمی بریتانی پێکدەهێنێتو چالاکی یەهودیەکانی عێراقیش لە خزمەتی ئەو سێ کوچکە بیانییەدا بوە.

بەڵام نابێت ئەوەمان لەیاد بچێتەوە کە خودی ماسۆنییەت لەلایەن پیرانی زایۆنیزمەوە رێبەرایەتی دەکرا، ئەوانەی پرۆتۆکۆڵەکانیان لەشاری باڵ-ی سویسری واژو کرد. ئەوانەی پیلانیان دەگێڕا بۆ ئەوەی لەشێوەی بیرۆکەی نادروست سود لە زانستو پەروەردە وەربگرنو بەیارمەتی ئەم ئامرازە گرنگەش پیلان لەدژی عێراق بگێڕن.



بۆیە سەرچاوەکانی پۆلیسی نهێنی کە لە کتێبەکەی بەڕاکدا ئاماژەی پێدراوە ئەوە دەردەخات "بۆ ئەوەی پیلانی زایۆنیەکان لە داگیرکردنی فەلەستین جێبەجێ بکرێ، فێرگە یەهودیەکانی عێراق گرنگیەکی زۆری بە زانستی سەربازی دەدا، هەڵبەتە بەشێوەیەکی تێکدەرانە"(22)، هەمان ئەفسانەش سەبارەت بە ئێران کە وەك تابوری پێنجەم لە عێراقدا کاری کردوە لە کتێبەکەی بەڕاك ئاماژەی پێدراوەو دەڵێت لەساڵی ٥٣٩ پێش زایینەوە ئێران پیلان لە دژی عروبەی عێراق دەگێڕێت(23).

لە سەرتاسەری جیهاندا پۆلیس لە روانگەی پۆلیسییەوە روداوەکان دەخوێنێتەوە، هەروەها تیورەی یەکێتی عەرەب کە سەرلەبەری روداوەکان لە پیلانی دەرەکی دەبینێت لەلایەن ئایدیۆلۆجیستو بیریارانی نەوەی پێشووە زۆر لێزانانە دانراوە. لە راستیدا بەڕاك جگەلە پیاوی پۆلیس شتێکی دی نیە، لە روانگەی ئەویشەوە مێژوو جگە لە پەردەیەك بۆ داپۆشینی کارە راستەقینەکەی شتێکی دی نیە. ئەم تیورەیە لە کتێبە سێ سەد لاپەڕەییەکەی بەڕاکدا تەنها دە دەرسەدی کتێبەکەی گرتۆتەوە، بۆیە دەپرسین مەبەست لە نوسینی ئەم کتێبە چی بو؟

## ئامانجی راستەقینە لە کتێبی هەواڵگری:

بەڕاك بەشێوەیەکی سەرەکی سەرقاڵی ناونانی خەڵکیو پۆلین کردنیانو ئامادەکردنی لیست بو، هێندێك کەڕەت بە نوسراو زانیاری شەخسی پێشکەش دەکردو هێندێك کەڕەتی دی بەشێوەی خشتە لیستی لەسەر ئەو فێرکارو ئیداریو فەرمانبەرانە پێشکەش دەکرد کە لە فێرگە ئێرانیەکانی عێراقدا کاریان دەکرد، بەڕاك توانی لەسەر (٥٥٣) کەس وردەکاری شەخسی کۆبکاتەوە، هەروەها تێزێکی دەربارەی بیانیی بونی بنەچەی ئەو کەسانەش ئامادەکردبو، لەپاڵ لیستێك لەسەر هەمو فێرگە یەهودیو ئێرانیەکان کە لەسەردەمی عوسمانییەوە لە عێراق دەژیان لەگەڵ مێژوویەکی

ورد لەسەر ئەوەی کردویانە بە ژمارەی دەرچوانیشیانەوە، ناوی هەمو خێرخوازو بەرپرسی فێرگەکان، ناوی ئەو یەهودیانەی بەکاری تێکدەرانەو تیرۆر تۆمەتبار کرابون یا سیخوریان بۆ زایۆنیزمەکان کردوەو پەیوەندییان بەفێرگە یەهودیەکانەوە هەبوە، ناوی ئەوانەی لەچەندین دەیەی ڕابردو لە سنوری ئێران پەریونەتەوە، پاشان بەشێوازی نادیارو ناشەرعی رەگەزنامەی عێراقییان بەدەست هێناوە، ئەوەش بەمەبەستی بەدەست هێنانی وەزیفەیەکی سەرەکی بو، ئیدی چ لە حکومەتدا بێت یا لەبواری بازرگانیدا یا پەیوەندی کردن بە ئۆپۆزیسۆنەوە بێت، گەمارۆدانی ماڵو موڵکی ئەوانەی زیانیان بە ئابوری عێراق گەیاندوە، رۆڵیان لە مایەدانی پەرگیرەکانی حیزبی دەعوە لە ساڵانی دواییدا، لەگەڵ گفتوگۆیەك دەربارەی چۆنێتی گەیشتن بە (١٤٠) کەسی بەئەسڵ ئێرانی کە دزەیان بۆ بانکی نێوەندو دەزگا داراییەکانی دی کردبو تا ئابووری عێراق وێران بکەن، هەروەها گەمارۆدانی هەمو بازرگانە یەهودیو ئێرانیەکان لە قۆناغە جیاوازەکاندا کە بەپێی جۆری کاڵا بازرگانییەکانیان وەسفو پۆلێن کرابوونو ئاستی دەسەڵاتیانو کاریگەرییان لەسەر ئابوری عێراق لەسەرەتای پەنجاکاندا، ناوو چالاکی کۆمەڵە نهێنییە ئێرانیو یەهودییەکان، لەگەڵ لیستێکی (٢٤٥) کەسیو زانیاری لەسەر کەسێتی ئەو یەهودانەی لە حیزبی شیوعی عێراقدا ئەندام بون.

## لیستی پۆلین کردنی هاوڵاتیان:

لە عێراقدا ناو پەیوەستە بەخێزانەوە نەك بە تاکەکەسەوە، بۆیە پێویستە ئەوە لەبەرچاو بگرین کە ژمارەی ئەو کەسانەی لەم کتێبەدا ناویان هاتوە زۆر لە هەزار کەس زیاترە. لە پاڵ ئەوەشدا کاتێك بەڕاك ژمارەیەك تۆمار دەکات، بۆ نمونە کە دەڵێت لە حەفتاکاندا تەنها لە بەغدا ٣٢٤٥ بازرگانی ئێرانی هەبون، دەبێ ئەوەشمان پێقبوڵ بێت کە بەلانیکەمەوە ٣٢٤٥ فایل لەسەر ئەو خێزانانە لە ئەرشیفی پۆلیسدا هەبوە کە



هەمویان بە بەشێك لە تابوری پێنجەم دەژمێردران، خودی بەڕاکیش جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ئەو کۆمەڵانەی ناوی تابوری پێنجەمی لێنابون خزمو مناڵەکانیان لە پێگەی ستراتیجی گرنگدا دانابو تا بتوانن خراپەکاری زیاتر بکەن.

پێویستە ئەو هەوڵەی تەرخانکرا بۆ ناولێنانو پۆلین کردنی خەڵکی لەگەڵ شەپۆلە یەك لەدوای یەکەکانی دەرکردن کە بەعس لە وڵاتدا پیادەی دەکرد لەبەرچاو بگیرێت. ساڵی ١٩٧١ ـ ١٩٧٢ یەکەم شەپۆلی راگواستن چل هەزار کوردی شیعە (فەیلی) گرتەوە، ئەو شیعانە کەمایەتیەك بون لەناو کەمایەتییەكو لەناوچە سنورییەکانی ئێراندا ژیانیان دەگوزەراند. لە نیوەی دوەمی حەفتاکاندا دوو سەد هەزار کەسی دی بەبیانوی ئێرانی بوونیان جیاکرانەوەو وەك تابوری پێنجەمو سەرەنیزەی چاوچنۆکی فراوانخوازییەکانی ئێران تاوانبار کران، ئەم راگواستنەش پێش شەڕی عێراق ئێران ئەنجامدراو "بەڵگەنامەکانیش ئاماژە بەوە دەدەن کە دەرکراوەکان بەزمانی عەرەبی قسەیان دەکرد. بەڕاکیش ناراستەوخۆ دانپیادەنێتو دەڵێت زۆربەیان خاوەنی رەگەزنامەی عێراقی بون"[24] کە بەزۆری بەشێوەیەکی ناشەرعی بەدەستیان هێنابو، ئەم دانپیانانەی بەڕاك بوە مایەی قەڵسبونو ئازاری دەرونی کۆمەڵێك خەڵك، بەڵام لەدیدی خودی بەڕاکەوە ئەوە بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگر بو لەسەر رازو نیازی دەستدرێژیکارانەی ئەو خەڵکانە لەسەر ئەمنو ئاسایشی وڵات. بەڕاك بۆ ئەوەی شتەکان رونبکاتەوە، هەوڵدەدا بیوگرافیایەکی کورت لەسەر ئەو خەڵکانە پێشکەش بکات، بەڵام ئەوەندە خۆی ماندو ناکات بەڵگەیەك لەسەر رازو نیازی خیانەتئامێزی ئەو ئەو خەڵکانە بهێنێتەوە، رەنگە ئەم بەڵگەیەی لەو "شیکردنەوە" ئایدیۆلۆجیاوە هێنابێتەوە کە ئەو لێکۆڵینەوەیە پێوەی پەیوەست بو، ئەمەش حەکایەتی خراپەکارێکە: "ئیبراهیم محەمەدی ئێرانی ساڵی ١٩٥٤ هاتۆتە عێراقەوە، سەرەتا لە ناوچەی شۆرجە وەك حەماڵ دەستی بەکار کرد، پاشان دەستی بە کڕینو فرۆشتنی سندوقی بەتاڵو گونی کرد، ئنجا لەگەڵ دۆستێکی خۆیدا لەپشت بینایەی دەمەرچی کۆشکێکی بچوکی کردەوە. لە ساڵی ١٩٥٨ بەدواوە دەستی کرد بە بازرگانی چای، بەهۆی

قۆرخکردنی چای ئەبو غەزالە کە لەو دەمەدا داواکاری زۆری لەسەربو، بازرگانیەکەی بـرەوی پەیداکـرد. بـۆ ئەوەی درێـژە بـەکارە ناڕەواکانـی بـدات، وەك ئیماندارو چاکەخوازێك خۆی دەردەخسـت، ڕێورەسمی پرسـەنامەی لەخانوە گەورەکەی لە عوتەیفیە دەگێڕا، پێشـئەوەی لەوڵات دەربکرێ خاوەنی سـەد هەزار دینار بو، لەپاڵ ئۆتۆمۆبیلێکی میرسدیسی ٢٨٠ ئێس، نرخی خانوە گەورەکەشی خۆی لە سەد هەزار دینار دەدا"[25].

جیاوازی هەیە لە نێوان پۆلیسـی نهێنی کە تاوانبارو ئۆپۆزیسـیۆنی سیاسـی بوونی دەسـەپێنێتو ئەو پۆلیسـە نهێنییـەی ئەو ئەرکەی نیە، لە حاڵەتـی ڕژێمی F. B. I و C. A. I ئەمریکی یا تەنانەت سـاواکی بەدناوی ئێرانیو هەواڵگری میسـری شـدا، دەبێ کەسـەکە پروپاگەندەیەك بخاتە مەحەکی لێکۆڵینەوەوە، چونکە سـەبارەت ئەو کارەی ئەو دەزگایانە ئەنجامیان داوە یا مەبەسـتیانە ئەنجامی بدەن گوتەی ڕاسـتو نادروستی زۆر وتراوە، تەنانەت سەبارەت کاروکرداری ئەوانەی تاوان ئەنجام دەدەن، ئەوا سەرزەنشـت ئاراسـتەی ئەوانی دی دەکەن، چونکە دەستگیرکردنی کەسێكو سزادانی لەسەر بنەمای گومان کارێکی نادروستە.

## شۆڕش دوژمنەکانی خۆی هەڵدەبژێرێت:

پۆلیسی نهێنی عێراق لە دوای ساڵی ١٩٥٧ەوە، بە پێچەوانەوەی ئەو دۆخەوە دوژمنانی خۆی دادەهێنا. بۆیە پۆلیس وەك هێزێکی کاریگەرو بزوێنەر کاری نەدەکرد، چونکـە قوربانییەکانی پێویسـتیان بەوە نەبو کارێك بکەن بـۆ ئەوەی تاوانبار بکرێن. کاتێك پۆلیسی نهێنی وەك بەهێزترین دەزگا لە عێراق بەدیارکەوت، ئیدی هەمو جۆرە بەرگرییەکی ڕێکخراو بوونی نەما. دوای ئەوەی شۆڕشـی کورد بەهۆی پەیماننامەی جەزائیر، لە سـاڵی ١٩٧٥دا شکسـتی هێنا، حیزبی بەعس بە پێڵاوی قورس کەوتە



وێزەی حیزبی شـیوعی عێراقو لە پۆستەکانیانیشـیان دەرکران، ئەو پۆستانەی ساڵی ١٩٧٣، وەك باجـی دانان بەحیزبی بەعس، بەوەی پێشـەنگی سوسـیالیزمە، پێیان بەخشرا بو.

بەڵام ئەمرۆ پێویسـت ناکات تاوانباران کارێك بکەن بۆ ئەوەی ببنە قوربانی لەبەر ئەوەی هەروەکو سـەدام دەڵێت هەڵبژاردنیان بە ئاگاداری شـۆڕش دەبێت: "شۆڕش دوژمنەکانی هەڵدەبژێرێت، ئێمە بۆچی دەڵێین دوژمنەکانی خۆی هەڵدەبژێرێت، چونکە دوژمنانی شۆڕش لە نێو خەڵکانێکەوە هەڵدەبژێردرێن کە دژایەتی بەرنامەکەی دەکەنو دەیانەوێت زیانی پێبگەیەنن. شـۆڕش دوژمنانی لە نێو خەڵکانێکەوە هەڵدەبژێرێت کە دەیانەوێت حیزب والێبکەن لە ڕەونسـیپە سـەرەکییەکانیو خاڵی دەسپێکی لابدات، بەڵام سـەبارەت بەو خەڵکانەی شـۆڕش دەپارێزن، ئەوا شـۆڕش وەك دۆستی خۆی هەڵیاندەبژێرێت"[26].

لەبەرامبەر ئەوەشدا شتێکی نالۆجیکی نیە کە لە ئایندەدا بەو کەسە گومانلێکراوانەی مەبەسـتیانە زیان بە شـۆڕش بگەیەنن ئـاگادار بکرێنەوە کە چ شـتێك چاوەڕوانیان دەکات. بەڕاك دەڵێت کتێبەکەی بەتەنها بەشێکەو هیچی دی، چونکە وادیارە بەشی دی هەیـە کە ئامادەباشـی بۆ کراوە لەسـەر "بوونی فێرگـە بیانیەکانی دی کە ڕۆڵی خراپیـان لـە کۆمەڵگەی ئێمەدا گێڕاوە، ئەو فێرگانـەش بریتین لە فێرگەی ئەمریکیو زانکـۆی حیکمەتو سـەرجەم فێرگەو پەیمانگەکانی دی کـە هاوڵاتیانی عێراقی بە خودی خۆی نامۆ کردوە بەمەبەسـتی لاوازکردنی ورەی نەتەوەکەمان"[27]. بێگومان ئەگەر بتوانیت مەبەستێکی ئایدیۆلۆجی بە واقعێك بگۆڕیت، ئەوا تۆ کارێکت کردوە کە هێرکولی (هرقل) ناتوانێت ئەنجامی بدات.

## هاوڵاتی تومەتبارە ئەگەرچی هێشتا تاوانیشی نەکردبێت!

بەهەر حاڵ سالم بە هەڵەدا چوبو، چونکە لە واقیعدا پۆلیسی نهێنی حوکمی عێراقـی هاوچەرخی نەدەکرد، ئەوان تەنها بەوشـێوەیە خۆیان دەردەخسـت کە ئەو کارە دەکـەن، لەبەر ئەوەی تەنها ئەوان بە تەواوەتی جێ بڕوای دەسـەڵاتی باڵابون، بەڵکو لە راستیدا جێبەجێکاری سیاسەتەکانی ئەو دەسەڵاتە بون. ئەو شتانەش پۆلیسی نهێنی بەعسـی لە هەمـو دەزگاکانی دی جیادەکردەوە کە کەمتـر جێی متمانەبون، بەڕاك نەیدەویسـت دوژمنی ناوخۆ لە قاڵبێکدا دابڕێژێت، لەبەر ئەوەی ئایدیۆلۆجیای بەعـس ئاماژەی پێدەکرد کە سـەدام حسـێن دایڕشـتوە، لەگەڵ ئەوەشـدا لە هەمو ئایدیۆلۆجییەکی گشـتیەوە لیسـتێك ناوی یەهودیو ئێرانی هەڵدەگۆزی. بەڕاك بەم کارەشـی فۆڕمێکی تایبەتی بە دوژمن دەبەخشی. ئیدی خەڵکی بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە دەیزانی چ کەسێك پێویستە دوور بکەوێتەوەو نەفرەتی لێبکات، لەوەش گرنگتر خەڵکی دەیانزانی کە دوژمنو گومانلێکراو لە هەمو شـوێنێکدا بوونیان هەیە تەنانەت ئەگەرچی هێشـتا تاوانیشـیان نەکردبێت. ئەمەش جەوهەری وتەیەکی ساڵی ١٩٧٩ سەدام حسێنە کە وردبینیو زوو پەیپێردنی ئەو دەسەلمێنێت، چونکە ئەوە دەردەخات کـە سـەدام پێـش روداوەکان دەکەوێت، هیـچ دەزگایەکی پۆلیس لـە هیچ کام لە حکومەتەکانی پێشوی عێراقدا دەسکەوتی لەوجۆرەی بەدەست نەهێنابو.



# سوپـــا

## ئەفسەری سەرکوتکردن، نەك ئەفسەری نەبەرد

سـوپای عێراق بۆماوەی شەش دەیە ئامرازی سەرکوتکردنی هاوڵاتیانی خۆی بو، پێش جەنگی عێراق ـ ئێران تەنها یەك جەنگی لەگەڵ هێزی دەرەکی کردوە، ئەویش ئەو جەنگە دۆڕاوەی بو کە لەمایسـی ١٩٤١دا دژی ژمارەیەکی دیاریکراوی سـوپای بریتانیا کردیو بەداگیرکردنی عێراق کۆتایی هات. بەشـداریکردنی سـوپای عێراق لەجەنگەکانی عەرەب ـ ئیسـرائیل لەسـاڵانی ١٩٥٦ـ ١٩٤٨ـ ١٩٦٧دا بەشدارییەکی رەمزی بوە، سـاڵی ١٩٧٣ دوو تیپو بەشێك لەهێزی ئاسمانی رەوانەی بەرەی سوریا کرد، بەڵام زۆرینەی سوپای عێراق بۆ سەرکوتکردنی کوردە عێراقییەکان بەکاردەهێنرا. رژێم زۆر بەشانوباڵی بەشداربونی سوپای عێراقی هەڵدەدا لەجەنگی تشرینی یەکەمدا، ئەوەش لەبەرئەوەی دەیانویسـت هەڵوێستی ناشایستەی یەکەکانیان لەئوردن لەشەڕی ئەیلولی ١٩٧٠دا (ئەیلولی رەش) دژی فەلەستینییەکان بشارنەوە. سوپای عێراق لەرۆژی سەربەخۆیی عێراقەوە تەنها لەسەرکوتکردنی خێڵو هاوڵاتیانی مەدەنی سەرکەوتو بوە. ئەو روداوانە زۆر بەوردی عەقلییەتی ئەفسەرانی عێراقی داڕشت بو.

## سوپاو کودەتا سەربازییەکان:

یەکەمین کودەتا لە جیهانی عەرەبیدا ساڵی ١٩٣٦ لەسەر دەستی بەکر سدقی رویدا، ئەو یەکێك بو لەو ئەفسەرانەی کە سێ ساڵ پێش کودەتا، قەسابخانەیەکی لە دژی ئاشورییەکان ئەنجامدا. لەو رۆژەوە تا پەلاماری ئینگلیز لە ساڵی ١٩٤١ بۆ سەر عێراق، زنجیرەیەك کودەتا رویدا. رژێمی پاشایەتی لە رێگەی دوو کەرتکردنی سوپاوە

توانی بەر بەو کودەتایانە بگرێت، ساڵی ١٩٤٠، عێراق ١٧٤٥ ئەفسەرو ٤٤٢١٧ سەربازی هەبو، ساڵی ١٩٤٣ بەسەدان ئەفسەر یا زیندانی کران یا خانەنشین‌و ژمارەی سەربازانیش بۆ ٣٠ هەزار کەمکرایەوەو دوو لەسەر سێی ئەو ژمارەیەش لە خزمەت رایانکرد بو[28]. لە دەیەی دوای جەنگی ساڵی ١٩٤٨دا (جەنگی عەرەب ـ ئیسرائیل) جارێکی دی چاکسازی لە سوپای عێراقدا کرا، بەڵام مادامەکی ئەو بارودۆخەی سوپای بەرەو سیاسەت کێشدەکرد هەر لەئارادا بو، پاکتاوکردنە ناکۆتاکانیش بێئەنجام دەبون. زۆرێك لەو گەمەکارە سەرەکییانەی سەر شانۆیی سیاسی عێراق لە دوای ساڵی ١٩٥٨ەوە لەو کەسانە بون کە لە پاکتاوکردنەکەی ساڵی ١٩٤١ رزگاریان ببو. عەبدولکەریم قاسم کە ساڵی ١٩٥٨ دینەمۆی سەرەکی لەناوبردنی رژێمی پاشایەتی بو، وەك سەربازێك لەژێر فەرماندەیی سدقی خزمەتی دەکرد، بۆیە هەمیشە ستایشی سدقی دەکرد. ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر، سەر کۆماری دوەم دەورەی حوکمڕانی بەعس، ساڵی ١٩٣٨ پەیوەندی بە سوپاوە کردبو، لە ساڵی ١٩٤٢یشدا ئاکادیمی سەربازی تەواو کردبو.

لە نێوان ساڵانی ١٩٥٨ ـ ١٩٦٨دا عێراق دە کودەتاو هەوڵی کودەتای بەخۆیەوە بینی، لەپاڵ دوو شۆڕشی چەکداری‌و جەنگێکی نیمچە بەردەوام لەگەڵ کوردەکانی وڵات. سەربازەکان لە ٢٥ ـ ٣٥٪ پۆستە وەزارییەکانیان بەدەستەوە بو، "لەنێوان ٥٠٪ تا دوو لەسەر سێی پۆستە باڵا بڕیار بەدەستەکانیشیان بۆ خۆیان قۆرخ کردبو. سێ سەرکۆمار، هەمو سەرەك وەزیرەکان، جگە لە یەکێکیان، هەمو جێگری سەر کۆمارەکان، جگە لە یەکێکیان، گشت وەزیرە ناوخۆو بەرگرییەکانو زۆریك لە وەزیرەکانی راگەیاندن، سەرباز بون"[29]، ئەفسەرەکان لە فەرمانگە پیشەسازییە حکومی‌و کارخانەکان دادەمەزرانو هێندێکیشیان وەك بریکاری وەزیر لە وەزارەتی پیشەسازی دادەمەزران. ئەو سەربازانە یەکراست لە سەربازگەکانیانەوە دەگوێزرانەوە بۆ ئەو شوێنانە، ئەمە لە حاڵێکدا لە ژیانیاندا جگە لە مانۆر، مەشقی سەربازی‌و کوشتنی هاوڵاتیانی عێراقی ئەزمونێکی دییان نەبو. جگە لە بەکرو چەند ئەفسەرێکی



دی، باقی ئەوانی دی نە بەفلتەری حیزبدا تێپەریبون، نە هیچ شارەزاییەکیان لە کاری مەدەنیدا هەبو. بودجەی سوپا لە ساڵانی نێوان ١٩٥٨ تا ١٩٦٦دا دوو بەرابەر زیادی کرد، ئەمە لە حاڵێکدا بودجەی بەرنامەی ئاوەدانکردنەوە وەك خۆی مایەوە، یا کەمیدەکرد[30]. بەهەمان رێژەی زیادبوونی بودجەی سوپا، کارایی پیشەیی رووی لە کزی دەکردو جەنگی ١٩٦٧یش ئەم ناکارایی‌و کەموکورتییەی بەجوانی دەرخست[31]. جەنگی شەش رۆژە سیمای ئەو داڕوخانەی سوپای بەجوانی خستەروو، ئەوەش رۆڵێکی مەزنی بینی بۆ ئەوەی حیزبی بەعس رەخنە لە رژێمی سەربازی بگرێت، تا سەرئەنجام ساڵی ١٩٦٨ بە سەرنگوم کردنی ئەو رژێمە کۆتایی هات‌و بەعس بۆ جاری دووەم حوکمی گرتەدەست.

## سوپا لە سایەی دوەم حوکمرانی بەعسدا:

لە دوەم حوکمڕانی بەعسدا چی بەسەر سوپادا هات؟ لە ناوەراستی حەفتاکاندا گۆڕانکاری بەسەر ئەرکی سەرەکی سوپادا هات، کە تایبەت بو بە سەرکوتکردنی شۆڕشە ناوخۆییەکانو بەشێوەیەکی سەرەکی توندوتیژی دژی کورد زیادیکرد، ئەو توندوتیژییەی بەپێی گوزارەی حیزبی دیموکراتی کوردستان گۆڕا بە "شەڕی رەگەزپەرستانە بۆ لەناوبردنی کورد"[32]. یەکێك لەو روداوانەی ئاراستەی نەتەوە یەکگرتوەکان کرا، روداوی ٨ / ئاب / ١٩٦٩ گوندی "دێکان"ی سەر بە موسڵ بو، شەست‌و حەوت مرۆڤی کورد لە ژن‌و مناڵ‌و پیرەمێرد لە ترسی تۆپبارانی سوپای عێراق بەرەو ئەشکەوتێك دەچن، سوپاش ئاگر لەئەشکەوتەکە بەردەداو بەزیندوێتی دەیانسوێنێت[33].

## شەڕی لەناوبردنی کورد:

لە ئازاری ١٩٧٤دا دوا قۆناغی شەڕی کورد هەڵایسا. لە یەکەمین مانگی ئەو شەڕەدا شارۆچکەی زاخۆو قەڵادزێ کە ژمارەی دانیشتوانەکەیان ٢٥٠٠٠و٢٠٠٠٠ هەزار کەس دەبون، لەگەڵ خاکدا یەکسان کران. فرۆکەکان بەشێوەیەکی رێکوپێكو رۆتینی بە بۆمبی ناپاڵمو چەندین بۆمبی دی گوندەکانی کوردستانیان بۆردمان دەکرد. بەسەدان هەزار کورد لە شارو شارۆچکەو پێدەشتەکانەوە بەرەو چیاکانی کوردستان هەڵاتن[34]. لە نێو خەڵکە راکردوەکاندا بەدەیان مامۆستا، کرێکار، پزیشك، یاسازان، خوێنکار بە خۆیانو سەرلەبەری خێزانەکانیانەوە دەبینران[35]، لەئەنجامی ئەو روداوانەی وڵاتی تەنیبو، شەپۆلێك لە گرتنو راگواستنو لە سێدارەدانی هەڕەمەکی (بۆ نمونە لەسێدارەدانی پێنج خوێنکاری کورد لە زانکۆی بەغدا)، تیرۆر، لەسێدارەدانی ئاشکرا (لەوانە هەڵواسینی ١١ نوێنەری کورد لە هەولێر)، ئەمە لە پاڵ ئەوەی کە هەزاران کەس لەشەڕی یەکساڵەدا بریندار بون، سەرچاوە کوردییەکان پێیانوایە لەکاتی داڕوخانی شۆڕشی کورددا، پێنج هەزار کەس لە ژنو منداڵو پیرەمێرد، ئەوانەی توانای هەڵگرتنی چەکیان نەبو، لەکاتی راکردندا گیانیان لەدەست داوە، هەروەها هەزاران پێشمەرگەش لەو کاتەی خۆیان رادەستی حکومەتی عێراق کردوە، دەمودەست گولەباران کراون[36]، ژمارەیەکی زیاتریش روویان لە ئێران کرد.

## حەکایەتی عەلی عەباس:

"عەلی عەباس یەکێك بو لەو پێشمەرگانەی لەریزی پێشمەرگەکانی مستەفا بارزانی، پێشمەرگە بوە. لەدوای داڕوخانی شۆڕشی کورد، بەهاورێیەتی هەزاران پێشمەرگەی دی روویکردۆتە ئێرانو لە ئەسفەهان نیشتەجێ بوە، لەکاتی راوکردندا



ئاشنایەتی لەگەڵ ئەفسەرە ئێرانیەکاندا پەیدا کردوە، کچە تازە لەدایك بوەکەی ناونا " غەریبە"، کە حکومەتی عێراقی جارێکی دی لێبوردنی دەرکرد لەگەڵ بیست خێزانی دی بۆ عێراق گەڕایەوە.

هەر کە لە سنورەوە ئاودیوی عێراق بوە، هەستی بە نیگەرانی کردوە، دەترسا لەوەی کەوتبێتە داوەوە، چونکە تێگەیشتبو کە حکومەتی عێراق دەستی کردوە بە دەرکردنو راگواستنی هەزاران کورد، ئەوانەی بۆ نیشتمان گەڕاونەتەوە، لەوپەڕی باشورو ناوچە عەرەبنیشینەکاندا نیشتەجێ کراونەتەوە، بەڵام عەباس لەوە نەدەترسا هەروەکو بە لیژنەی پێشوازی راگەیاند، بەڵکو لە خراپتر دەترسا، وەك دەست بەسەراگرتنو ئەشکەنجەدانو تەنانەت لەسێدارەدانیشی، ئەمەش بەتەنها دڵەڕاوکێی ئەو نەبو، بەڵکو هەمو گەڕاوەکان ئەو ترسەیان هەبو، بەدڵنیاییشەوە باوەڕیان بە وتەی پیاوانی دەوڵەت نەدەکرد، بەوەی ئەو شتانە هیچی رونادات‌و هەمان رۆژ بۆ گوندەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە"[37].

## تراژیدیای نیشتەجێ کردنەوەی کوردەکان:

پێوەری راستەقینەی هەر رژێمێکی تیرۆریستی لە ژمارەی قوربانیەکانیی سەردەمی ئاشتیدا دەردەکەوێت، نەك ژمارەی ئەو قوربانیانەی لە ئەنجامی شەڕەکانی رژێمدا گیان لە دەستدەدن. لە ئازاری ساڵی ١٩٧٥دا شۆڕشی رزگاریخوازی کورد لە ئەنجامی لە رێکەوتنامەی جەزائیر، لەنێوان ئێران ـ عێراقو پشتتێکردنی شای ئێران، هەرەسی هێنا. بەوەش رێگە لەبەردەم سوپای عێراق ئاواڵە بو تا بە کۆمەڵ کورد بۆ ئەو ئۆردوگایانە بگوێزێتەوە کە لە ناوچە بیابانیەکانی باشوری رۆژئاوای عێراقدا بۆیان ئامادەکرابو. خێزانە کوردە هەشبەسەرەکان بەسواری ماشینی سەربازی بۆ رۆژئاوای روباری فورات دەگوێزرانەوە.

بەئاگاداری "ئەنجومەنی باڵای کاروباری باکور" کە سەدام حسێن، سەرۆکایەتی

دەکرد، شـوێنی نیشتەجێکردنی کوردەکان دەستنیشـان دەکرا. سوپا شەوانە خێزانە لادییەکانی بەسـواری ئۆتۆمۆبیل لەشـێوەی کاروانی سـەربازی دەگواستەوەو کاتێك دەگەیشـتنە شـوێنی مەبەسـت، هەر پێنج خێزانیان لە گوندێکی بچوك نیشـتەجێ دەکرد، پارەیەکی ناچیزیان بە هەر خێزانێك دەدا، ئنجا پیاوەکانیان لەسەر ئەو پیشەو وەزیفانە دانا کە حکومەت دیاریدەکردو رێوشوێنی توندیشیان بۆ جوڵەو جێگۆڕکیان گرتەبەر. لە ٨٥٪ی ئەو کوردانەی لەدوای لێبوردنەوە گەڕانەوە بۆ عێراق، یا لەلایەن شاوە دەرکران، ڕەوانەی ئەو ئۆردوگایانە کران.

بەعسـیەکان هەوڵیاندا کوردی پارێزگاکانی دیالە (سـەعدیە، خانەقین، شارەبانو مەندەلی)، کەرکوك (کفریو توزخورماتو)و موسـڵ (سەفین، سنجارو عەین زالە) بۆ ئـەو ئۆردوگایانە بگوێزنەوە کە لانیکەمی خزمەتگوزارییان تێیدا نەبو، ئەو هەواڵانەی لەرێگەی ئەو سـەربازە عێراقیانەی پاسـەوانی ئۆردوگاکانیـان دەکرد دزەیان دەکرد، باسیان لەوە دەکرد کە چۆن ئەم میلەتە سەرفرازە چیاییە لەو بیابانەدا بەدوای تانکەری ئاودا رایاندەکرد تا ئەو بەشە ئاوەی حکومەت بۆیانی دیاریکردوەو بەشی هیچ ناکات، وەربگرن[38].

تا دۆسـیەی مەسـەلەی کورد نەخرێتەروو، ناتوانرێ ژمارەی راسـتەقینەی کوردە دورخـراوەکان بزانرێت. بەڵام خەملاندنەکان جیاوازن، گۆڤاری ئیکۆمۆنیسـت ئەو ژمارەیە بە ٥٠٠٠٠ کەس دەقەبلێنێ، ئەویش لە وتارێکدا کە ستایشـی حیزبی بەعس دەکات، سـەبارەت بـەو ریفۆرمە ناوخۆیانەی لە عێراقـدا جێبەجێی کردوە، کەچی ئاماری ئۆپۆزیسـیۆنی کوردو بەرەی نەیاری حیزبـی بەعس ئەو ژمارەیە بە ٣٠٠٠٠٠ ٣٥٠٠٠٠ کـەس لەقەڵـەم دەدەن[39]. لە راسـتیدا تاوانێکی بـەو قەوارەیە کە دوای چەندین سـاڵ هێشـتا هەر بە ئاڵۆزی ماوەتەوە، گەورەترین بەڵگەیە لەسـەر سروشتی تاوانکارانـەی رژێمی بەعس. بەڵام ئەو سـوپایەی کە لە نیـوەی دووەمی حەفتاکاندا سیاسەتی حیزبی بەعسی پیادە دەکرد زۆر جیاوازە لەو سوپا کۆنەی کە لە شەستەکاندا لە چوارچێوەی حکومەت یا لە دەرەوەی حکومەت ئەرکەکانی ئەنجام دەدا. سوپای



دەیەی شەسـتەکانی عێراق بە ئامرازێکی رامکراوی حیزبی بەعس گۆڕا. لێرەدا سـێ هۆکار ئەم گۆڕانە راڤەدەکات:

یەکەم گۆڕان هەڵمەتی پاکتاوکردنی پلە باڵاکانی ناو سوپای عێراقی گرتەوە، کە لە کۆی سـێو پێنج کەس شازدە کەسیان پاکتاوکران، ئنجا پاکتاوکردنە ئەو کەسانەی گرتەوە کە لە دەرەوەی حیزبی بەعس بون، پاشان ئەوانەی هاوسۆزییان لەگەڵ حیزبی بەعسـدا نەبو، وەك نایف، داود، ئەنسـاریو عوقەیلی، دواتـر پاکتاوکردن ئەندامە ناوادارەکانی سوپاشی گرتەوە، ئەوانەی هێزو توانایان لەناو خودی سوپاوە سەرچاوەی دەگرت، وەك حەردان تکریتی، عەماش، نەقیبو نوسرەت، سەرئەنجام پاکتاوکردن گەیشتە ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرو تاقمەکەی لە ساڵی ١٩٧٩دا (بڕوانە بەشی دووەم). گشـت ئەو رێوشوێنانە جەخت لەسـەر قۆناغەکانی دامەزراندنو بەهێزکردنی حیزبی بەعس لە عێراق دەکەنەوە.

هەڵبەتـە پاکتاوکردنـی گروپی یەکەم کە ئەفسـەرگەلێکی لەبابەت نایفو داودی لـە خۆدەگـرت، کارێکی حەتمیو قابیلی پێشـبینی کردن بـو، چونکە چۆن دەبێ ئەو ئەفسـەرانەی رۆڵێکی بەرچاویان لە سـەرنگونکردنی رژێمی عەبدولسەلام عارفدا هەبو، ئەوەندە ساکاروسـاوێلکە بن فەرمان لە حیزبی بەعسـەوە وەربگرن، بێئەوەی ئینتمایان بۆی هەبێتو بیشانەوێت لەدەسەڵات بمێننەوە. بەڵام لایەنی یەکلاکەرەوەی گروپی دووەم حەردان تکریتی بو، کە لە سـاڵی ١٩٦٣دا فەرماندەی هێزی ئاسـمانی بەعسـیەکان بو، ساڵی ١٩٦٨یش بوە سەرۆکی ئەرکانو وەزیری بەرگری، هەروەکو زانـراوە حەردان تکریتی، وەك ئەحمەد حەسـەن ئەلبەکرو سـەدام حسـێن خەڵکی تکریـت بو، کاتێك حـەردان بوە لایەنگری باڵی میلیتاری نـاو بەعس لە دژی باڵی مەدەنـی، ئیدی بیر لەدەرکردنـی کرایەوە، ئەوەش بەناکۆکی خسـتنە نێوان خۆیو عەماشـی نەیاری بو، عەماشی وەزیری ناوخۆو ئەندامی بەرجەستەی حیزبی بەعس، باڵـی مەدەنی بەرێبەری سـەدام حسـێن لایەنگری لە عەماش دەکـرد، بەوەش هەر دوولایان لاوازبون.

دوودڵی‌و دڵەڕاوكێ كەوتە نێو ریزەكانی حیزبەوە، ئەمەش بەكری والێكرد لە ٣ / نیسانی / ١٩٧٠دا حەردانو عەماش وەك دوو جێگری خۆی دامەزرێنێت، بەوەش لە دوو هەستیارترین وەزارەتی دوورخستنەوە (وەزارەتی ناوخۆو بەرگری)، بەڵام بەوە كێشەكان كۆتایی نەهات، لەكاتێكدا حەردان لەدەرەوەی وڵات بو، لە پۆستەكەی لابراو كرا بە باڵیۆزی عێراق لە كوێت، بەڵام حەردان ئەو پۆستەی رەتكردەوە، بۆیە دوای ماوەیەك لە رێگەی چوار چەكدارەوە كە نە دەستگیركراون، نە ناسراونەتەوە لە كوێت تیرۆركرا[40]. بەڵام ئەفسەرو پلەدارو سەربازەكانی دی زۆر بەسانایی پاكتاوكران. لەسەرەتای گەیشتنی بەعس بەحوكم، پاكتاوكردنی ئەفسەرو سەربازان كارێكی زۆر ئاسایی بو، تا كار گەیشتە ئەوەی یەكێك لە ئەندامانی حیزبی بەعس بە "داڤید هێرست" رابگەیەنێت "كاتێك دەمبینی بەهەزاران سەربازی پیشەیی پاكتاودەكرێن، سەبارەت بەتوانای سەربازیی توشی نیگەرانی دەبوم، بەڵام جەنگی تشرینی یەكەمو سەركوتكردنی كوردەكان نادروستی ئەم بۆچۆنەمیان سەلماند"[41].

راپۆرتی سیاسی ساڵی ١٩٧٤ بیرۆكەی سیاسیەتی پاكتاوكردن لە نێو ریزەكای سوپای عێراقدا روونده‌كاتەوە:

"زۆر دەمێكە حیزب بەپەرۆشەوە هەوڵدەدا سەركردایەتی لەناو هێزە چەكدارەكاندا پتەوبكاتو هەمو پیلانگێرو گومانلێكراوێكیش پاكتاو بكاتو پرەنسیپی نەتەوەیی عەرەبو سۆسیالیستی لەنێو سەربازەكاندا بچێنێت، فیكری سیاسیو سەربازی بەجۆرێك بونیات بنێتەوە تا یەكە سەربازییەكانی عێراق بە باشترین شێوە ئەركەكانیان جێبەجێ بكەن، دژی لادانەكانی رژێمی قاسمو عارفو دەستوپێوەندە ئۆرۆستۆكراتە سەربازییەكان بیانپارێزێت، بەمشێوەیە سوپاو میلەت بە رێبەری حیزب یەكگرتو دەبێت"[42].

بەڵام گۆڕانكاری دوەم كە یارمەتی بەهێزكردنو یەكپارچەیی حیزبیدا، دەركردنی سیستمێكی تازەی دیاریكردنی بەرپرسیارییەت بوو، كە رێگەی بە ئەندامانی حیزب دەدا لەئیشوكارەكانیاندا سەرپێچی لەفەرمانی بەرپرسە ناحیزبیەكانیان بكەن، ئەگەر



بچوكترین گومان لە سروشتی ئەو فرمانە هەبێت یا لەگەڵ رێنماییەكانی حیزبی بەعسدا ناكۆك بكەوێتەوە.

لاوانی بەعسی، ئەوانەی قۆناغی ئامادەییان تەواوكردبو لە كۆلێجی سەربازی وەردەگیرانو بەگوێرەی پلەی حیزبایەتیان مەشقی شەش، دوازدە یا بیستو چوار مانگەیان پێدەكرا، پاشان وەك ئەفسەر پەیوەندییان بەیەكە سەربازییە جیاوازەكانی سوپای عێراقەوە دەكرد تا كار بكەن بۆ ئەوەی ئەگەر بڕیارێكی گرنگ، بەبێ رەزامەندی حیزب دەربچێت، جێبەجێی نەكەن.

"حیزب لە ماوەی چەند ساڵێكدا توانی سیستمێكی كارا لە نێوەندی هێزە چەكدارەكان لەژێر سەرپەرشتی سەركردایەتی حیزب دامەزرێنێت، هاورێیانمان لە سوپادا سەلماندیان كە خاوەنی دیسپلینێكی بەرزن لە دڵسۆزیان بۆ حیزب، ئەو هەڤاڵانە بەفیكرو چالاكیان بەشداریان لە گەشەپێدانو بەهێزكردنی حیزب كرد، تا كار گەیشتە ئەوەی حیزب لەگەڵ ئەفسەرو سەربازە دڵسۆزەكاندا بوونەتە باسكی بەهێز بۆ پاراستنو سەركەوتنی گەلە مەزنەكەمان"[43].

گۆڕانی سێیەم، بریتی بو لە دوورخستنەوەی سوپا لە سەركردایەتی حیزبو رێگەنەدان بەسەركردایەتی عەسكەر پۆستی باڵا لە سەركردایەتی حیزب بەدەستبهێنن، هەروەها كۆلێجی سەربازی تەنها ئەوانەی وەردەگرت كە ئەندامی حیزبی بەعس بوونو هەمو ئەو ئەفسەرو سەربازانەش خانەنشین كران كە گومان لە بەعسیبونیان دەكرا، هەر چالاكییەكی سیاسی پەیوەندی بە حیزبی بەعسەوە نەبوایە بە خیانەت لەقەڵەم دەدرا.

گۆڤاری "آفاق عربیة"ی ئۆرگانی تیوری بەعس، لە وتاریكیدا پوختەی ئەم سیاسەتەی حیزبی روونكردۆتەوە: "بڕیاری مۆنۆپۆڵ كردنی چالاكی سیاسی لەناو هێزە چەكدارەكان تەنها بۆ ئەندامانی حیزبی بەعس، پەیوەستە بەوەی كە تەنها وەفاداریو دڵسۆزی بۆ بەعس یەكریزی سوپاو ئەنجامدانی ئەركە میلیو نەتەوەییەكانی زامن دەكات، ئەمە سەرباری ئەوەی دەرگا لەبەردەم خەڵكانی دژ بەمیلەتیش دادەخا..

لەبەر ئەو هەمو هۆیانە شۆڕشو سەرکردایەتیەکەی هەتەر (حریص) بون لەسەر ئەوەی ڕێگە بە هیچ رەگەزێکی سیاسی بە بەرەی پێشکەوتوخوازیشەوە (ئیتلافی بەعسیەکان لە حکومەتدا) نەدەن، چالاکی سیاسی لەناو هێزە چەکدارەکاندا بکەن. هەر لە سەرەتاوە رامانگەیاندوە " هیچ بەرەیەك لەناو هێزی چەکداردا نیە"، تەنها حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، مافی پیادەکردنی سیاسەتی لەناو هێزە چەکدارەکاندا هەیە، بۆیە هەر کەسێك چالاکی سیاسی لەدەرەوەی چوارچێوەی حیزبی سەرکردە، حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی لە ناو سوپادا بکات، توندترین سزا دەدرێت"[44].

هەر سەربازێکی عێراقی تەنها ئینتمای بۆ هەر ڕێکخستنێکی سیاسی هەبێت، ئیدی بەدەر لەوەی سروشتی چالاکی ئەو ڕێکخستنە چییە، بەس بو تا بە خیانەتی مەزن تاوانبار بکرێ، ساڵی ١٩٧٦ چەندین سەرباز بە تومەتی ئەندامبونیان لە حیزبی شیوعی عێراق، لە سێدارەدران، "لەپاڵ ئەوەشدا هەر سەربازێك لە دوای ١٧ / ٧ / ١٩٦٨ەوە لە خزمەتی سەربازی دەربکرایە، یا هەر پۆلیسێك ئینتمای بۆ ڕێکخراوێکی سیاسی هەبوایە، جگە لە ئینتمای بۆ حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، لە سێدارەدەرا"[45]. لە راستیدا هەر داوایەك دژی هەر پۆلیس یا سەربازێك، بەوەشەوە کە دوای مۆڵەتی ئاسایی بۆ سەر کارەکەی نەگەڕاوەتەوە، سزای لەسێدارەدانی بەسەرا دەسەپێنرا.

ساڵی ١٩٧١ سەدام حسێن بەدڵنیاییەوە ڕاگەیاند: "لەسایەی حیزماندا، هیچ ئەگەرێك نیە، کە چەند سەرچڵێك لە سوپای عێراق، ئەوانەی لەگەڵماندا ناگونجێن، بەسواری دوو تانکەوە ڕژێمی حوکم سەرنگوم بکەن، سەردەمی ئەو جۆرە شێوازە بەسەرچو"[46]. هەروەها سەدام حسێن ساڵی ١٩٨٢، لە چاوپێکەوتنێکی دەگمەندا لەگەڵ گۆڤاری "شیتیرن"ی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، جەختی لەسەر ئەم ڕەوتە تازەیە کردەوە:

**- شیتیرن: هەروەکو زانراوە کە جەنابتان لە سەرکردایەتی سەربازی رازی نین. ئایا راستە بەم دواییانە سێ سەد گەورە ئەفسەری سوپای عێراق لە سێدارەدراون؟**



**- سەدام: نا، بەڵام تەنها دوو فەرماندەی تیپو فەرماندەیەکی یەکەی میکانیکی لە سێدارەدراون، لەجەنگدا ئەمجۆرە کارە ئاساییە.**

**- بۆچی ئەو کەسانە لەسێدارەدران؟**

**- سەدام: لەشەڕی موحەممەرە (خورەمشەهر) لە ئاستی بەرپرسیاریدا نەبون[47].**

ئەو لەسێدارەدانانەی پەیامنێری شیتیرن وروژاندی هیچ پەیوەندییەکی بە پاکتاوکردنەکانی پێشترەوە نەبو، کە بەململانێی هێزو دەسەڵاتەوە پەیوەست بوون، بەڵکو جۆرە دانپیانانێك بو لەسەر بابەتی لێهاتویی سەربازیی.

لەپێش کەوتنی موحەممەرە واتەواتێك لە عێراق بڵاوبۆوە کە سەرکردایەتی سوپای عێراق بڕیاری دەست لەکار کێشانەوەی (پاکتاوکردنو گوللەبارانکردن) زۆرێك لە ئەفسەرانی سوپای داوە، ئەوانەی هۆکاری یەکەم پاشەکشێ بون. یەکێك لەو واتەواتە بەسەرهاتی سەرکردەیەکی سەربازیی دەگێڕێتەوە کە فەرمانی بەسەربازەکانی دابو لەبەردەم شەپۆلە یەك لەدوای یەکەکانی پاسدارانی شۆڕشی ئیراندا، پاشەکشێ تاکتیکی بکەن. واتەواتەکە دەڵێت: کاتێك سەرکردەکەیان هێنایە بەردەم سەدام حسێن، لەپڕ دەمانچەکەی دەردەهێنێتو لەپێش ئامادەبوان دەیداتە بەر ڕێژنەی گوللە. ئەم روداوە ڕاست بێت یا نا، سروش لە گەلێك شت دەکات، لەجیاتی ئەوەی فەرماندە سەربازییەکان لەبەرامبەر کۆمەڵگەکەیان خەڵات بکرێنو پاساو بۆ پاشەکشێکەیان بهێنرێتەوە، بەوەی لەبارودۆخێکی دیاریکراودا روویداوە، کەچی بەو شێوازە فەرماندەکان دەکوژرێن، ئەمە لەپاڵ ئەوەی ئەمجارە هۆی کوشتنەکە لەوانەی پێشوتر جیاوازتر بو، چونکە ئەمجارە هۆی کوشتنەکە سیاسی نەبو، بەڵکو هۆی لێنەهاتویی بو، واتە شکست بو لە گۆڕەپانی جەنگدا. شێوەی کوشتنی ئەو ئەفسەرە ئاماژە بەواقعێکی تازە دەکات: سوپا گۆڕابو بە گیانەوەرێکی رامکراوو دەستەمۆی حیزبی بەعس.

زۆرێك لە دوورخراوە عێراقیەکان لە دەیەی رابردودا چاوەڕوانی کودەتایەکی سەربازی بون، تا بەوشێوەیە لە چورتمی (باڵای) بەعس رزگاریان بێت. ئەم چاوەڕوانییە لە

سوپاو وەهمی تواناو ئیرادەی سوپا رەگوریشەی لەنێو چەپگەراو لایەنگرانی یەکێتی عەرەبیدا هەیە کە هەمیشە سوپا بە پێشەنگو رەمزی هێزی زیندوکردنەوەی نەتەوەیی دەزانن[48].

ئەگەر لە روانگەی مێژووییەوە لەم کێشەیە بڕوانین، بۆمان دەردەکەوێت کە کۆمەڵگەی مەدەنی عێراقی بە مەبەستی بەرجەستەکردنی ناسنامەی خۆی لەسەر شانۆی سیاسی، هەمیشە پشتی بە سوپا بەستوە ( ١٩٣٦ ـ ١٩٤١، ١٩٥٨ ـ ١٩٦٨)، بەڵام بە بنجداکوتانی فیکری بەعس لەناو سوپادا، هەمو ئەو شتانەش گۆڕانکاریان بەسەردا هات، روداوێکی بێوێنەو پێشبینینەکراوی وەك جەنگی عێراق ـ ئێران ئەوە نیشاندەدا کە سیاسەتی عێراق لە دەریایەکی پڕشەپۆلی بێنەخشەدا ئەمبەرو ئەوبەر دەکات.

## میلیشیای حیزب:

زۆرجار چەکگەرایی کارێکی لاوەکی بوە سەبارەت بە بینای بنکەی جەماوەری حیزبی بەعس، بەڵام ساڵی ١٩٥١ جۆرج حەبەش، پێشنیازێکی دایە میشێل عەفلەق، کە حیزبی بەعس پێویستی بە"ددان" هەیە. حەبەش پێشنیازی کرد رێکخراوی نیمچە سەربازی حەبەش لەگەڵ حیزبی بەعسدا یەکبگرن. عەفلەق پێشنیازەکەی رەتنەکردەوە، بەڵام گفتوگۆکان کاتێك گەیشتنە بنەست کە عەفلەق پێداگری دەکرد لەسەر ئەوەی پێویستە گروپەکەی حەبەش پەیوەندی بە حیزبی بەعسەوە بکەن. ئەمەش یەکەمین هەنگاوی بەعس نەبو دەربارەی بە رێکخراوەیی کردنی توانای سەربازی، بەڵام ئەوە دەردەخات کە لایەنگری کردنی بەعس لە رێکخراوێکی نیمچە سەربازی تا رادەیەك سیاسی بوە. ئەم لایەنگری کردنەش لە ئاستی چاودێری کردنی تۆڵەسەندنەوەو خاڵی کردنی گرێو بێبەشبون زیاتر دەڕوات[49].



بەڵام لە عێراقدا رێکخراوی نیمچە سەربازی سەر بە حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی پەنجاکان کە گاردی میلی (حەرەس قەومی) بە فەرماندەیی عەبدولکەریم نوسرەت تێیدا دامەزرا ( نوسرەت ساڵی ١٩٧١ تیرۆر کرا). یەکەکانی حەرەس قەومی بۆ یەکەمین جار ساڵی ١٩٦٣ لە روخاندنی رژێمی قاسمدا بەکارهێنران، کاتێك نزیکەی دوو هەزار کەس لە میلیشیا چەکدارەکانی بەعس بە جلوبەرگی سەوزو بازوبەندەوە لە گەرەکی ئەلئەعزەمییەی بەغداوە کەوتنەرێو پەلاماری بینای وەزارەتی بەرگریان دا[50]، ئەمە لە کاتێکدا خەڵکانی دی بۆ تیرۆر کردنی کەسایەتیە سەرەکییەکانی رژێم راسپێردران، حەرەس قەومییەکان لەو شەڕانەدا روبەروی لایەنگرە مەدەنیەکانی قاسمو حیزبی شیوعی عێراق بونەوەو لەماوەی سێ رۆژی شەڕی سەر جادە، نزیکەی ١٥٠٠ ـ ٥٠٠٠ کەس کوژران، هەروەها لەو شەڕانەدا تەنها ١٠٠ سەرباز کوژران کە لە بینای وەزارەتی بەرەڤانی، بەرگرییان لە قاسم دەکرد، پاشان لەرێگەی لیستی ئەو ناوانەی کە پێشوەخت ئامادە کرابون، راوەدونانی شیوعییەکان لەسەر جادە، یانە وەرزشییەکان، سینەماو ناوچەی کیفاح دەستی پێکرد، هێندێك لە ماڵەکانیشیان وەك زیندانیو نیوەندی سەرۆکایەتی میلیشیاکان بەکاردەهێنا، لە شەش مانگی حوکمڕانی بەعسیەکاندا (١٩٦٣) تەنها ١٤٩ شیوعی بە شێوەیەکی رەسمی لە سێدارەدران، ئەمەش مشتێکە لە خەروارێك، چونکە بە سەدان کەس، ئەوانەی لە ئامارە رەسمییەکاندا ناویان نەهاتوە، لە گرتوخانەکانی حیزبی بەعسو لە سەرۆکایەتی میلیشیاکاندا لە ترسانو بەهۆی ئەشکەنجەدانەوە گیانیان لە دەستدا. لەو نێوەندانەدا خەڵکانی وەك نازم گزار فێری دزێوی شێوازی ئەشکەنجەدان بون، لەم بارەیەوە "حەنا بەتاتۆ" بە پشتبەستن بەسەرچاوە رەسمیەکانی حکومەت، دەنوسێت:

"بەتەنها نوسینگەی لێکۆڵینەوەی تایبەت بە حەرەس قەومی ١٠٤ کەسی کوشتوەو تەنها ٤٣ تەرم لە ناوچەی ئەلجەزیرەو ئەلحسوە لە ساڵانی ١٩٦٣ و ١٩٦٤ دۆزراوەتەوە، لە ژێرزەمینەکانی قەسری نیهائی کە نوسینگەی نیوەندی لێکۆڵینەوە بەکاریدەهێنا،

چەندین ئامرازی ئەشکەنجەدانی وەك سیمی کارەبایی نوکتیژ کە زیندانیەکانیان ناچار دەکران لەسـەری دانیشـن، هەروەها ئەو پەنجە قرتاوانەی کە بەهۆی ئامێری تایبەت دەبڕانەوە، لەگەڵ پەرۆپاتاڵی خوێناویو پاشـماوەی پەڵەی خوێن لەسـەر دیوارەکاندا دەبینران"(51).

لەتشـرینی دوەمی ساڵی ١٩٦٣دا سـوپا بە سەرکردایەتی ئەفسەرە بەعسیەکان، لە بەعسـیە مەدەنیو حەرەس قەومییەکان هەڵگەڕانـەوەو دوای پێکدادانێکی خوێناوی ناو شـارەکان، حەرەس قەومییەکانیان لە چەك داماڵی، لەو بەیاننامەی عەبدولسەلام عارف دەریکردوە، بەمشێوەیە پاساوی ئەو هەڵوێستەیان دەداتەوە:

"هێـرشو پەلامـاری ئـەو حـەرەس قەومییانەی بـە خوێنی جەمـاوەر تینو بوون، پیرۆزییەکانیان پێشـێل دەکردو یاسایان پشتگوێ دەخست، ئەو برینە قوڵەی کردیانە جەسـتەی گەلو نیشـتمانو یاخیبونی چەکدارانەیان لە ١٣ی تشرینی دوەمی ساڵی ١٩٦٣دا، هەمو ئەو کارانە ئێمەی ـ ئێمە بەشـێکین لە نیشـتمانی عەرەبی ـ روبەروی دوارۆژێکی ترسـناك کردەوە، ئەوەی لەتوانامانـدابو کردمان، تا حەوسەڵەو ئارامیمیان زیاتر بوایە، حەرەسـە ناقەومییەکان کردەوەی تیرۆریسـتی زیاتریان ئەنجام دەدا، بۆیە سوپا وەپیر بانگەوازی میلەتەوە هات بۆ ئەوەی لەم تیرۆرە رزگاریان بکات"(52).

میلیشـیاکانی حیزبی بەعس بۆ جاری دوەم بەشـێوەیەکی چالاکانەتر لە گەرمەی روداوەکانی کودەتاکەی تەموزی ١٩٦٨دا بەدەرکەوتنەوە، ئەمجارەیان میلیشـیاکانی بەعـس بەشـێوەی یەکەی بەهێـزی جوداجودا دەرکەوتنەوە، بەڵام سـەدام حسـێن لەروداوەکاندا زۆر بەوردی کادرەکانی لەنێو "دەزگای حەنین"دا هەڵدەبژارد، ئەوانەی لـە کودەتاکەی تەمـوزدا رۆڵێکی بەرچاویان گێڕا، پاشـان ئەم دەزگایـە بوە ناوکی سـەرەکی دەزگای هەواڵگری حیزبی بەعس. میلیشیا بە پێچەوانەی ساڵی ١٩٦٣ەوە لە ساڵانی یەکەمی هاتنە سەرکاری رژێمی بەعس بۆ جاری دوەم، وەك رێکخراوێکی نیمچە سـەربازی رۆڵێکـی گرنگیان لە کودەتاکە نەگێڕا. پۆلیسـی نهێنی زۆرێك لە ئەرکەکانی حەرەس قەومی گرتە ئەسـتۆ. ئەفسـەرانی سـوپا هێشـتا زبریو تەڵخی



یادەوەرییەکانی ١٩٦٣ یان لەیاد نەچۆتەوە.

بوونی میلیشـیای سـەر بەحیزبی بەعس پێویستییەکی سەرەکی فیکری بەعسە، بۆ ئەوەی هاوسـەنگییەك لەگەڵ سوپادا هەبێت، کە بەردەوام حیزبی بەعس لێیدەترسا. بەعس هەرگیز بەدگومانی بەرامبەر بە سـوپا ـ روداوی تشـرینی دوەمی ساڵی ١٩٦٣ لە یادەوەریدا بو ـ لەیادنەکرد. سـاڵی ١٩٦٦ لە سـوریا هەمان روداوی ساڵی ١٩٦٣ دوبارەبوەوەو لە دوتوێی روداوەکانیدا میشێل عەفلەق لە سوریا دەرکراو حیزب کەوتە ژێر کۆنترۆڵی ئەفسـەرەوە. لە دوای روداوەکان، لە راپۆرتی سیاسـی حیزبدا هاتوە: "ئـەوەی رویدا شۆڕشـێکی نەتەوەیی بو کـە تێیدا هێزە چەکـدارەکانو جەماوەری چەکـدار پێکـەوە لەژێر فەرماندەیی حیـزب هەوڵیانەدا گۆڕانێکی شۆڕشـگێڕانە لە کۆمەڵگەی عێراقیدا بهێننەدی، بەڵام بەداخەوە ئەو مەترسیانەی هەڕەشەی لە شۆڕش دەکرد، رێگر بو لەبەردەم جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیە"و شۆڕشـی شـەش مانگەش کەوتە دەسـتی "سەربازە راسـتگەرا"کان. هەروەها لە درێژەی راپۆرتەکەدا هاتوە کە حیزب بیری لەوە کردۆتەوە "سوپای کۆن هەڵوەشێنێتەوەو سوپایەکی شۆڕشگێر لەسەر بنەمایەکی نوێ دامەزرێنێت"، بەڵام لەبەر دژواری جێبەجێ کردنی، نارەزاییەکی توند لەو پێشنیازە گیرا، بۆیە رەزامەندی لەسەر دەرکردنی هێندێكو دامەزراندنی هێندێکی دی وەرگیرا، بەراستیش گفتوگۆ لەسەر ئەمەیان کرا (53).

سیسـتمی میلیشـیا هەرگیـز ئەوەنـدە گۆڕانـی بەخۆیـەوە نەدی تا بۆ سـوپایەك بگۆڕێت یا تێکەڵ بە سـوپا بکرێت، بەڵام ساڵی ١٩٧٤ هەموویان تێکەڵ بە دەزگای پۆلیـس کران، ئەویش لەدوای کێشـەکەی نازم گزارەوە بو کـە زۆرێك لە یەکەکان دەربارەی دلسـۆزیو وەلایان توشی سەرلێشێواوی ببون. سەرلەنوێ جەیشی شەعبی رێکخرایـەوەو لەلایـەن دەزگای هەواڵگرییەوە بەرێوەدەبرا، لـە کۆتایی حەفتاکانداو لەدوای ئەوەی سـوپا هێزی سیاسی لەدەسـتدا، ئیدی هێزی میلیشا فۆرمێکی تازەی وەرگرتو وەك هاوکار یا ئەڵتەرناتیڤی سـوپا تەماشـای دەکراو لەنێو ئەو یەکانەشەوە خەڵکانێـك لـە سـوپا وەردەگیران. میلیشـیا بـوە گرنگترین ئامـرازی کۆکرنەوەی

جەماوەرو بڵاوکردنەوەی بەهاو فیکری حیزبی بەعس لەنێو لاواندا، بۆیە نەرمییەکی زۆر لەمەرجەکانی بەئەندامبوونی تێیداکرا، سەرەتا بوون بەئەندام تایبەت بو بەو پیاوە حیزبییانەی تەمەنیان لەسەرووی ١٨ ساڵەوە بو، بەڵام ساڵی ١٩٧٥ خەڵکانی ناحیزبیو ساڵی ١٩٧٦ ژنانیشی وەردەگرت. ئەندامانی جەیشی شەعبی ساڵی دوو مانگ مەشقیان دەبینی. لەسەرجەم دانیشتوانی عێراقدا بە پیشەو ئاینزای جیاوازەوە ئەندامی وەردەگرت، دەبوایە خاوەن پیشەکان کارمەندانی خۆیان بنێرنو ڕێگەی بە خوێنکارانیش دەدا لەکاتی مەشقدا نەچنەوە بۆ قوتابخانەو زانکۆکانیان، زۆرێکیان وەك مەشق بینین بەشداریان لە شەڕی ناوخۆی لوبنان کردو لەلایەن فێرگە تایبەتو ئەو کەسانەشەوە مەشقیان پێدەکرا کە هەمان فێرگەیان تەواو کردبو، ڕژێم لە پاڵ مەشق لەسەر شێوەی بەکارهێنانی چەك، وانەی ڕۆشنبیریشی پێدەوتنەوە. لە سەرەتای حەفتاکاندا ژمارەی جەیشی شەعبی لە چەند هەزار کەسێك تێپەری نەدەکرد، لەگەڵ دەست پێکردنی جەنگی عێراق ـ ئێران لەناکاو وەك قارچك گەورە بو، ساڵی ١٩٨٢ ژمارەی ئەو جەیشە گەیشتە نزیکەی نیو ملیۆن کەس(54). ئەمڕۆ سیستمی میلیشیا بوە بە دەورەیەك کە بە ملیۆنان کەس پیاگوزەری کردوە. بیرۆکەی ئەمجۆرە میلیشیایە بۆ یەکەمجار لە ڕاپۆرتی سیاسی ساڵی ١٩٧٤ی حیزبدا هاتوە:

"گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانە لە قۆناغی داهاتودا هەوڵو کۆششێکی زۆری لێمان دەوێت بۆ جەختکردنەوە لەسەر بەها نیشتمانی، عروبە، ئازایەتی، خۆبەختکردن، بەرپرسیارییەتو ڕێزگرتنی کاری بەکۆمەڵ....

.... لەم بارەیەوە مەشقپێکردنی سەربازی بە جەماوەر، پێگەی تایبەتی خۆی هەبو، پێویستە ئەم مەشقپێکردنە زۆرترین ژمارەی هاوڵاتیان لە خۆبگرێ، بەتایبەتی ڕێکخراوە گشتیەکانو لاوان. مەشقکردن لەسەر چەکو بەباشی بەکارهێنانی، دەبێ لەخەسڵەتی هاونیشتمانی تازەوکۆمەڵگەی نوێ بێت، ئەمە لەپاڵ ئەوەی مەشقپێکردنی زۆرترین هاوڵاتی، هەمیشە جەختێکە لەسەر ئەوەی کە لە وڵاتدا سوپایەکی یەدەك لەتەنیشت سوپا نیشتمانییەوە هەیە، بەجۆرێك کە بتوانێت بە شێوازێکی زۆر چالاکانە



بەشداری لە پاراستنی شۆڕشو وڵاتو هێنانەدی ئامانجەکانی حیزب بکات"(55).

## ژمارەی چەکدارەکان:

ساڵی ١٩٨٤ ژمارەی هێزە چەکدارەکانی عێراق ٦٠٧٠٠٠ سەرباز بو، ئەمڕۆ بەدڵنیاییەوە ئەو ژمارەیە زیادیکردوە. سەرباری ئەوەش، ژمارەی ئەندامانی جەیشی شەعبی نزیکەی نیو ملیۆن کەس دەبو، بێگومان ئەو ژمارەیەش لە زیادبووندا بو، ئەم دوو ژمارەیە سەرنجێکی شێواوی لەسەر سروشتی جەنگی عێراق ـ ئێران نیشان دەدا. ساڵی ١٩٨٠ لە مێژووی دوەم حوکمڕانی حیزبی بەعسدا، ساڵێکی یەکلاکەرەوە بو، چونکە ئەگەرێکی زۆر هەیە بڕیاری جەنگی تێیدا درابێت، تا بەراستیش شەڕ دەستی پێنەکرد، هێزی یەدەك بانگ نەکرا. حیزبی بەعس بەشێوەیەکی ڕەها بەسەر وڵاتدا باڵادەست بو، لەلایەکی دی، دوارۆژێکی پرشنگداری لەبەردەم بو، لەڕووی ئابوریەوە یەدەکی داراییو نەختینە لە هەمو کاتێك بەرزتر بو، دەرامەتی نەوتیش وەك سەرچاوەیەکی ناکۆتا دەهاتەبەرچاو، لەڕووی سیاسیشەوە، بەرەی ئۆپۆزیسیۆن لەئارادا نەبو، حکومەت خۆی بۆ میوانداری کۆنگرەی لوتکەی وڵاتە بێلایەنەکان ئامادە دەکردو سەدام حسێن لە جیاتی فیدڵ کاسترۆ سەرۆکایەتی کۆنگرەی وەردەگرت. ساڵی ١٩٨٠ ساڵێکی یەکلاکەرەوەی نێوان دوو سەردەمدا بو لە مێژووی عێراقو حیزبی بەعسدا.

ئەوانەی چەك هەڵدەگرن، واتە ئەوانەی دەتوانن چەك بەکاربهێنن، پێویست ناکات بەردەوام چەك هەڵگرن، ئەوانە لەبەرامبەر کردەوە گەلێکدا موچەو هەق دەستی خۆیان وەردەگرن، لەوانەش بەرگری کردن لە نیشتمان، چاودێریکردنو لێدانو کوشتنی هاوڵاتیان، هێندێك جار کۆمەڵگەش کۆنترۆڵ دەکەن، هەمو کارێك دەکەن کە حیزبی بەعس بە "ئاسایشیی نەتەوەیی" لەقەڵەم بدات. لەگەڵ ئەم پێناسەیەدا جارێکی دی پرسیارەکەمان دووبارە دەکەینەوە: ئایا عێراق لەساڵی ١٩٨٠دا چەند

چەکداری هەبو؟

## میلیشیای حیزبي:

لە ناوەراستی حەفتاکاندا ژمارەی میلیشای حیزبی گەیشتە ٥٠٠٠٠ کەس[56]. لە کتێبی "لێکۆڵینەوەی ئەمریکا بۆ ناوچە بیانیەکان"دا هاتوە، ساڵی ١٩٧٨ "ژمارەی ئەو میلیشیانە لە ١٠٠٠٠٠ کەس تێدەپەری‌و سەرکردەکانی عێراقیش ئاواتەخوازبون ساڵی ١٩٨٠ ئەو ژمارەیە بگاتە ٢٠٠٠٠٠ کەس، بەوەی لە رێگەی بەمیلیشیاکردنی خەڵکی شارو گوندەکان، ئەو ژمارەیە پڕبکەنەوە، هێندێك لە چاودێران پێیانوایە ساڵی ١٩٧٨ حیزب بەوە ژمارەیە گەیشتبو"[57]، بەدەست پێکردنی شەڕیش خەڵکێکی زۆر خۆبەخشانە بەرەو ناوەندەکانی میلیشیا رۆیشتن، بۆیە لە ساڵانی ١٩٨٠ - ١٩٨١ ژمارەی ئەو هێزە گەیشتە چارەکە ملیۆنێك[58]. ساڵی ١٩٨٠، پێشئەوەی هێزی یەدەکی جەنگ بانگهێشت بکرێ، ژمارەی ئەو هێزە بە ١٧٥٠٠٠ کەس گەیشتبو.

## سوپا:

سەرچاوە گەلێکی جیاواز ژمارەی سوپای عێراق لە رۆژی هەڵایسانی جەنگدا بە ٢٤٢ هەزار سەرباز دیاریدەکەن، بەلانیکەمیشەوە بە ٢٢٢ هەزار سەرباز دەیخەملێنن[59]. سەربازگیری سەرچاوەیەکە سەرباز بەو دەزگایە دەدا، ساڵانە نزیکەی ١٢٠ هەزار کەس بۆ خزمەتی سەربازی بانگهێشت دەکرێن، ساڵی ١٩٧٨ ئەوانەی خزمەتی سەربازی دەیگرتنەوە بە پێی ئاماری رەسمی گەیشتە ملیۆن‌و نیوێك سەرباز. هەر کەسێك دوای ئەوەی خزمەتی سەربازی تەواو دەکرد، تا ماوەی ١٨ ساڵ ئەگەری ئەوەی لێدەکرا وەك هێزی یەدەك بۆ یەکێك لە یەکەکانی مەشق بانگهێشت بکرێ‌و زۆرجاریش هێزی یەدەك بۆ خزمەتی کاتیی بانگدەکرا. ساڵی



١٩٧٨ هێزی یەدەك خۆی لە ٢٥٠ هەزار کەس دەدا، سەرباری ئەوەی خزمەتی سەربازی بە دوو ساڵ دیاریکرابو، بەڵام لە کاتی خۆیدا تەسریح نەدەکران، بەڵکو هێندێك کەرەت دەگەیشتە پێنج ساڵ‌و زیاتریش[60].

خشتەی ژمارە یەك گۆڕانکارییەکانی دوای ١٩٦٨ روندەکاتەوە. هێزی مرۆیی لە سایەی حکومەتە میلیتارییەکاندا لە (١٩٣٦ - ١٩٤١)و (١٩٥٨ - ١٩٦٨) زیادبونێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە، لەماوەی دوازدە ساڵی حوکمڕانی بەعسیشدا سێ بەرامبەر زیادیکردوە. لەو رژێمانەی کە سەرباز حوکمی دەکات، گەشەسەندنی دەزگای سەربازی کارێکی نامۆ نیە، بۆ نمونە تا ساڵی ١٩٦٨ عێراقیش وەك وڵاتانی سێیەم بارودۆخێکی لەو جۆرەی هەبو، بەڵام ساڵی ١٩٧٧ ژمارەی سوپای عێراق گەیشتە دوو ئەوەندەو نیوی سوپای جەزائیر، ئەمە لە کاتێکدا ئەم دوو وڵاتە لە زۆر شتدا لەیەك دەچن. لە سەرەتای هەشتاکاندا سوپا عێراق لە نێو وڵاتە عەرەبییەکاندا بە ژمارە لەدوای وڵاتی میسرەوە، بە پلەی دوەم دەهات[61].

**خشتەی ژمارە ١**

**زیادبوونی ژمارەی سوپا بەرامبەر بە ژمارەی دانیشتوان**

| ساڵ | روداوە گرنگەکان | تێکرای ژمارە بەهەزار | ژمارەی دانیشتوان بەهەزار | ڕێژە |
|---|---|---|---|---|
| ١٩٣٣ | راستەوخۆ دوای سەربەخۆیی | ١٢ | ٣,٣٠٠ | ٤ |
| ١٩٣٦ | یەکەم کودەتای سەربازی | ٢٠ | ٣,٦٠٠ | ٦ |
| ١٩٤١ | ترۆپکی بزوتنەوەی پانعەرەبیزم | ٤٦ | ٤,١٠٠ | ١١ |
| ١٩٤٣ | شکستی سوپا بەرامبەر بەبریتانیا | ٣٠ | ٤,٤٠٠ | ٧ |
| ١٩٤٩ | | ٤٥ | ٥,١٠٠ | ٩ |
| ١٩٦٣ | سەرنگونکردنی قاسم | ٥٠ | ٧,٥٠٠ | ٧ |
| ١٩٦٧ | جەنگی تەموز | ٨٢ | ٨,٥٠٠ | ١٠ |
| ١٩٧٢ | بەعس لە دەسەڵاتدا | ١٠٢ | ١٠,٠٠٠ | ١٠ |
| ١٩٧٧ | باڵادەستی حیزب | ١٨٨ | ١٢,٠٠٠ | ١٦ |
| ١٩٨٠ | هەڵایسانی جەنگی عێراق ئێران | ٢٤٢ | ١٣,٠٠٠ | ١٨ |
| ١٩٨٢ | بەردەوامی جەنگ لەگەڵ ئێراندا | ٣٤٢ | ١٤,٠٠٠ | ٢٤ |
| ١٩٨٤ | = = = = = = = = | ٦٠٧ | ١٤,٦٠٠ | ٤٢ |

**تێبینی/ ئەم ژمارانە هێزی یەدەک، ئەمن، پۆلیسو میلیشیاکانی حیزبی دوای ١٩٦٨ تێیدا نیە.**

بەڵام گرنگترین بەراورد ئەوەیە لە عێراقی بەعسدا بەرامبەر بە هەر (١٠٠٠) هەزار هاوڵاتــی مەدەنــی، (١٨) هەژدە کەس کە توانای چــەك هەڵگرتنیان هەبو، لە ریزی هێــزە چەکدارەکاندا خزمەتیان دەکرد. ئەمە لەحاڵێکدا لە ســەردەمی شــای ئێرانو



لە لوتکەی شــکۆمەندی ســەربازییدا، تەنها نیوەی ئەو ژمارەیە لەخزمەتدا بون (واتە هەر ٩ کەس بەرامبەر بەهەزار هاوڵاتی)، هەروەها دوو بەرامبەر بەمیســری ســاڵانی حەفتــاکانو دوازدە بەرامبــەر بە بەرازیل بو کە گەورەترین ســوپای ئەمریکای لاتینی هەیە. ئەو خشــتەیە ئەوەش نیشــاندەدا کە بەرزترینو بێوێنەترین رێژەی دانیشتوان لە سەرەتای هەشــتاکاندا پەیوەندییان بەهێزی ســەربازییەوە کردبوو مەشقی سەربازییان بینــی بو، ئەگەر دژوارتر بوونی هەلومەرجی مانەوەی ســەربازێتی لە دەورەی بەعسو گەشەکردنو گرنگی هێزە یەدەکییەکان لەبەرچاو بگیرێن، ئنجا گەورەیی کاریگەری سوپا روونتر دەردەکەوێت.

**خشتەی ژمارە یەك سێ خولی گەشەکردن روونەدەکاتەوە:**

**خولی یەکەم،** لەدوای سەربەخۆیی بونەوە (ساڵی ١٩٣٢) تا ترۆپکی بزوتنەوەی پانعەرەبیزمو شکستی سوپای عێراق بەدەست هێزەکانی بریتانیا بەردەوام دەبێت.

**خولی دوەم،** بریتیە لە ماوەی گەشەکردنێکی رێکوپێك، کە دەکەوێتە ماوەی نێوان یەکەم حوکمڕانی بەعس لەساڵی ١٩٦٣ تا ١٩٦٨، ئەو ماوەیەش بەوە جیادەکرێتەوە کە چەندین حکومەتی ســەربازی عروبــەوی بەخۆیەوە بینیوە، لەســەردەمی حوکمرانی عەبدولکەریم قاســمدا (١٩٥٨ ـ ١٩٦٣)، دەورەی زیادبونێکــی بەرچاوی خەرجی ســەربازیو مافــو کەلوپەلی سەربازی بو، نەك زیادبونێکی بەرچاوی هێزی مرۆیی.

**خولی سـێیەم،** گەشەســەندنی هێزی مرۆیی سوپا لەگەڵ دوەم حوکمڕانی بەعسی عێراق دەست پێدەکات، لێرەدا تێبینییەکی گرنگ هەیە، ئەویش پەیوەندییەکی مێژووی لە نێوان زیادبونی ژمارەی سوپاو باڵاکردنی فیکری پانعەرەبیزمدا هەیە.

زیادبوونــی مــەزن تەنها لەدوای ســاڵی ١٩٦٨ەوە دەســتی پێکرد، واتــە لەدوای پاکتاوکردنی فەرماندە باڵاکانو لەدوای ئەوەی بەعس بەتەواوەتی دەسەڵاتی کۆنترۆڵ کرد (خشتەی ژمارە یەك، ساڵانی ١٩٧٢، ١٩٧٧، ١٩٨٠). ئەوەی روونو ئاشکرایە ئەم گەشــەکردنە هیچ هەڕەشــەیەکی لەسەر باڵادەســتی بەعس دروستنەکرد، بەڵکو یارمەتیدەری بو، هەروەها پێویســتە سەرنجی ئەوەش بدەین کە توانای کودەتا کردن

لەگـەڵ زیادبونـی ژمارەی سـوپا کەمدەبێتەوە، چونکە دەسـەڵاتی سـەربازی لەنێو ئەفسـەراندا بە فراوانـی دابەش دەبێـت. هەڵبەتە ئـەم کارەش پاکتاوکردنی زۆرێك لـە ئەفسـەران راڤەنـاکات. لە رابـردودا، پێشـئەوەی بەعس بـۆ دوەم جار حوکم بگرێتەدەسـت، سوپا بەشێوەیەکی راسـتەوخۆ حوکمی دەکردو ئامرازێکی سەرەکی سەرکوتکردنی ناوخۆ بو. بەڵام لە دەورەی حکومەتی بەعسدا گەشەکردنی سوپا زۆر بە خێرایی روویداو هاوکات لەگەڵ دوورکەوتنەوەی سوپا لە سیاسەت، رۆڵی مێژوویی وەك ئامرازی سـەرکوتکردن بە دەزگای دی سپێردرا. ئەم دەورەیە دەورەی کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵگە بو، ئەمەش پرتوانایی سەرکوتکردنی حیزبی بەعس بە بەراورد لەگەڵ تێکرای رژێمەکانی پێش خۆی روونەکاتەوە.

## پۆلیس

لـە رۆژانی پاشـایەتیدا هێزی پۆلیس، لە سـاڵی ۱۹۲۰ تا ۱۹٤۱ لە ۲۵۰۰ پۆلیسـەوە گەیشتە ۱۲۳۰۰ پۆلیس، بەڵام ساڵی ۱۹۵۸ ئەو ژمارەیە گەیشتە ۲۳٤۰۰ پۆلیس، لەم ژمارەی دواییەدا ۸۳٦۸ ئەفسـەرو سـەربازیان سـەر بەهێزی سـەرەکی سـەرکوتکردن بوون[62]. لە ماوەی نێوان ۱۹۵۸ ـ ۱۹٦۸ پۆلیس هاوکاری سـوپای دەکرد، تەنانەت لە سەرچاوەو داهاتەکانیشیدا.

ژمارەی پۆلیس لە خولی دوەمی حوکمڕانی بەعسـدا لەبەردەستدا نیە، بەحوکمی ئەوەی سـەرلەبەری چەمکـی پۆلیس لەم خولەدا گۆڕانی چۆنایەتی بەسـەردا هاتوە. ئەمـڕۆ دەتوانرێ لە ژێر ناوی "پۆلیس"دا باس لە ژمارەیەك دەزگای جوداجودا بکرێ کە پەیوەندی نێوانیان زۆر ئاشـکرا نیەو هەموشـیان لە سوپاو هێزی میلیشیای حیزبی سـەربەخۆنو ئەم دەزگایانـەش لەخۆدەگـرێ: ئەمن، موخابەرات، ئیسـتخبارات، پاسـەوانی سـنور، هێزی پۆلیسی تێسـرەواندن، بەرێوەبەرایەتی گشـتی رەگەزنامەو بەرێوەبەرایەتی گشتی پۆلیس کە ئەم بەشانە دەگرێتەوە، هاتوچۆ، مادە بێهۆشکەرەکان،



لێکۆڵینەوەی هونەری، گومرك، پۆلیسـی خۆجێیەتی پارێزگاکان، رێەری سیاسـی، ئەمنـی هێڵی شـەمەنەفەر، بینا، کۆلێجی پۆلیس، پۆلیسـی فریاگـوزاریو هتد. ئەو هەمـو دەزگایانە لە ژێر چاودێری ئیسـتخباراتو دەزگاکانـی نەبون، بەڵکو هەمویان سـەر بـە وەزارەتی ناوخۆ بون. موخابەرات لەژێر چاودێـری ئەو وەزارەتە نەبو، بەڵام کارمەندەکانی خۆیان وادەردەخسـت کە سـەر بەو وەزارەتـەن. پیاوانی موخابەرات لە سـەرتاپای دەوڵەتو کۆمەڵگەو رێکخراوەکانیـدا بڵاوببونەوە. کاروباری پۆلیس، ئەمـن، رەگەزنامەو کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی لە دەرەوەی دەسـەڵاتی وەزارەتی ناوخۆدا بون، بەڵکو ئەرکیان لە عۆدەی وەزارەتی نیشـتەجێ کردن، رۆشـنبیری، گەیاندن، کاروباری کۆمەڵایەتی، ئابوریو وەزارەتی دەرەوە بون[63].

لە بەشـی کاروباری سـەرۆکایەتیدا، دەزگای موخابەراتی هەشـتەم هەبو، کاری کۆکردنەوەی زانیاری بو، کارمەندانی ئەم بەشە لە ئەمن یا موخابەرات یا لەهەردووکیان بـون، سـەربەخۆیی لە هەمـو دەزگاکانـی دی زیاتر بو، راسـتەوخۆش پەیوەندی بە سـەرۆکەوە هەبو. کاتێك سەدام حسێن بوە سـەر کۆمار، بەرپرسیارێتی ئەم دەزگایە زۆر گەورەتر بو. لە نیوەی دوەمی حەفتاکاندا تەنها یەك سـەرچاوە قەوارەی ئەم دوو هێزەی هەڵدەسەنگاند:

"هێزی پاسـەوانی سنورو هێزی بڵاوبونەوەی خێرا بە ٥٠ هەزار کەس دەخەمڵێنرا. پاسـەوانی سـنور لە باکوری عێراق لەسەر سـنورەکانی تورکیا، ئێرانو سوریا مۆڵیان خواردبـو تا رێگە لە قاچاخچیو دزەکردنی خەڵکی بیانی بگرن. هێزی بڵاوبونەوەی خێرا هێزێکی پۆلیسی بو، بەڵام مۆرکێکی سەربازی هەبو، بەمەبەستی سەرکوتکردن بەکاردەهێنراو لە حاڵەتی پشێوی ناوخۆدا دەردەکەوت. خاوەنی چەکی سوكو تۆپخانەو زرێپۆش بو. تیمی کاری تایبەتی هەبو کە دژی شۆڕشی کورد بەکاردەهێنرا"[64].

ئەو دوو دەزگایە، دوو دەزگای پسـپۆری بـونو وەك ئەمنو موخابەرات لە هەمو شوێنێکدا ئامادەییان نەبو.

هیـچ کام لـەو ژمارانـە، ژمارەیەکی وردو تەواو نیە، چونکە لەم بوارەدا پشـتم بە

ژمارەکانی وەزارەتی ناوخۆو بەشی کاروباری سەرۆکایەتی کۆمار لەبارەی ئەندازەو گەشەی ئەو هێزانە بەستوە، لەبەر ئەوەی هەڵسەنگاندنی نزیکەیی گشت توانای پۆلیسی عێراق لەو خەملاندنەوە هاتوە. ئیستخبارات (دژە زانیاری سوپا) بە بەشێك لەو هەڵسەنگاندنە ناژمێردرێتو بەشێکە لە پێکهاتەی سوپا.

وەزارەتی ناوخۆ گەورەترین وەزارەتی حکومەت بو. ژمارەی کارمەندەکانی لە سالانی ١٩٧٦ - ١٩٧٧دا لە ١٠٢٤٢٢ بۆ ١٥١٣٠١ کەس زیادی کرد. بەشی کاروباری سەرۆکایەتی کۆمار لە ٢٤٠٧٣ بۆ ٥٧٧٦٨ کەس زیادیکرد[65]. ژمارەی ئەم وەزارەتە لەنێو ٢٣ وەزارەتی دەوڵەتدا، لە هەمو وەزارەتەکانی دی بەزرتر بو. ساڵی ١٩٧٩ وەزارەتی ناوخۆ رایگەیاند "بەمەبەستی راپەراندنی کاروباری هاوڵاتیان بەزووترین کات" پێویستی بەزیادکردنی هێزی ئەمنی ناوخۆ هەیە، بێئەوەی ژمارەی ئەو زیادەیە دیاریبکات[66]. گریمان زیادبوونی سالانی ١٩٧٨ - ١٩٨٠ی ئەم دوو دەزگایە بەهەمان ئەندازەی سالانی ١٩٧٦ - ١٩٧٧ زیادیکردوە، ئەوا لەبەر ئەوەی ژمارەی ١٩٧٦ - ١٩٧٧مان لەبەردەستە، دەتوانین ژمارەی ساڵی ١٩٨٠یش بەنزیکەی ٣٤٦ هەزار کەس بخەملێنینو گریمان چوارەیەکی ئەو ژمارەیە پەیوەندییان بە ئەمنی نەتەوەییو پۆلیسەوە نیە، دیسانەوە ٢٦٠ هەزار کەس لەجۆرە جیاوازەکانی پۆلیس، ئەمنو ئیدارەکانی دی دەمێنێتەوە، تەنانەت ئەگەر رێژەی ٥٠٪ ی ئەو ژمارەیەش راست بێت هەرچەندە شتێکی ماقوڵ نیە دیسانەوە ژمارەی پۆلیسو میلیشیا حیزبیەکان لە سوپا زیاتربوون، دوو هێندەی سوپای ئێرانی سەردەمی شا بون[67].



## خشتەی ژمارە ٢

## رێژەی ژمارەی چەکدار سەبارەت بە ژمارەی دانیشتوان

| ناو | تێکرای ژمارە | ژمارەی رێژەیی بۆ هەر هەزار هاوڵاتی |
|---|---|---|
| میلیشیای حیزب | ١٧٥٠٠٠ | ١٣ |
| سوپا | ٢٤٢٠٠٠ | ١٨ |
| پۆلیس | ٢٦٠٠٠٠ | ٢٠ |
| کۆی گشتی | ٦٧٧٠٠٠ | ٥١ |

لە خشتەی ژمارە دوودا وێنای ساڵی ١٩٨٠، واتە ساڵی چڵەپۆپەی دەسەڵاتی بەعسی عێراق دەردەکەوێت. پێنجیەکی کارای دانیشتوانی عێراق، واتە پێنجیەکی هێزی کاری وڵات کە دەکاتە ٣,٤ ملیۆن مرۆڤ لە کاتی ئاشتیدا (١٩٨٠) وەك کەسێکی رێکخراو بەشێوەیەك لە شێوەکان سەروکاری لەگەڵ توندوتیژیو تیرۆردا هەبو. ئەم وێنەیە زۆر نامۆیەو لە هیچ وڵاتێکی دی ئەم جیهانە وێنا ناکرێ. لەوجۆرە کۆمەڵگەیانەدا بوونی ئۆپۆزیسیۆن یا نەیاریکردنی دەوڵەت تەنها لەعەقڵو خەیاڵی خەڵکیدا هەیە، بۆیە لەواقیعدا هیچ ئۆپۆزیسیۆنێك بوونی نەبو، لەجیاتی ئەوەش ئەو پێوەرانەی بۆ راڤەکردنی "ئەمن" بەکاردەبرا، بەردەوام گۆڕانکاری بەسەردا دەهات، لەبەر ئەوە بەهۆی ئەو شێوازەی کە رژێمی پێدارێژرایەوە، دەبوایە ئۆپۆزیسیۆنێك بخوڵقێنرێ کە بوونی راستەقینەی نەبێت. هەر کە ئەو ماشینە زەبەلاحە دەست بە خولانەوە دەکات، ئیدی گشت بایەخدانێکی راستەقینە بەکۆمەڵگە لەنێودەچێت.

بێگومان دەرامەتی نەوت ئەو حاڵەتە نامۆیەی لە عێراقدا خوڵقاند. لە وڵاتانی دی بەرهەمهێنی نەوت ئەو دەرامەتە لەپێشخستنو وەکاربردنو خۆشگوزەرانی خەڵکێدا بەکاردەهێنرا. زۆر زەحمەتە بتوانین راڤەی ئەوە بکەین کە چۆن هەڵاوێرد لە خەرجکردنی ئەو دەرامەتە مەزنەی نێوان ئەو وڵاتانە کرا، بەڵکو تاکە راڤەیەك کە پێمان قبوڵ بێت یا پێشکەشی بکەین، بە بیروباوەری حیزبی بەعسەوە پەیوەستە.

## حیزب و دەوڵەت:

زیادبونی ڕێکخراوە سەرکوتکەرەکان هاوشان لەگەڵ زیادبونی ئەندامانی حیزبو زیادبونی کارمەندانی دەوڵەت گەشەیان دەکرد. ئەندامانی حیزبی بەعس بە هەمو پلە حیزبییەکانەوە لە ساڵی ١٩٦٨دا لەچەند هەزار کەسێك تێنەدەپەڕین، بەڵام لەساڵی ١٩٧٦دا ژمارەی ئەندامانی حیزب گەیشتە نزیکەی نیو ملیۆن کەس. لە نێو ئەوانەشدا بەلانی زۆرە دە هەزار کەسیان پلەی ئەندامێتی تەواویان هەبو، ئەوانی دی لە لایەنگرانی حیزب بونو هەمو ئەرکێکی حیزبیان لەسەرشان بو، بێئەوەی هەمان مافی ئەندامیان هەبێت. بۆ باڵاکردن لە ئەندامێتی حیزبداو پەرینەوە لە پلەیەکەوە بۆ پلەیەکی دی، دەبوایە ئەندام بە پرۆسەی مەشقکردنی فێرگەی ئامادەکردنی حیزبیدا تێپەڕێت. "کۆنە بەعسییەکان لەنێو ئەم توێژەدا بون، ئەوانەی ساڵی ١٩٥٩ هەوڵی کوشتنی عەبدولکەریم قاسم یان داو لە کودەتای ١٩٦٣ و ١٩٦٨ دا بەشدارییان کردبو، پلەو پایەیان لە هەمو ئەندامانی دی بەرزتر بو"[68].

ساڵی ١٩٨٠ سەدام حسێن لە وتەیەکیدا وتی: "زیاد لە ملیۆنێك مرۆڤی ڕێکخراو لە چوارچێوەی حیزبدا، بەشێوەیەکی بەرفراوان دیموکراسی ئەزمون دەکەن، گفتوگۆ لەسەر کاروباری خەڵکی دەکەنو ئاگاداری لەسەر بڕیارەکانی ئەوانی دی پەیدا دەکەن"[69]، سەرئەنجام، ساڵی ١٩٨٤ لە کتێبێکی هاودڵی ڕژێمی بەعسدا هاتوە، "نزیکەی ملیۆنو نیوێك عێراقی ١٠٪ یا لە ٧ر١٠٪ کۆی دانیشتوانی چواردە ملیۆن کەس، لایەنگرو دۆستی حیزبی بەعس بو، بەڵام ژمارەی ئەندامی تەواو لە ٢٥ هەزاردا بو، کە دەکاتە کەمتر لە ٢ر٠٪ سەرجەم دانیشتوان"[70]. ئەو ژمارانە بەتەواوەتی لەگەڵ گەشەکردنو پەرەسەندنی حیزبدا دەگونجێتو ڕەنگە بشێت ئیعتباری بۆ بکرێو بەلۆجیکیی تەماشای بکرێ.

زۆرێك لەحیزبەکان بەو خێراییە گەشەیان نەکرد. بۆ نمونە حیزبی بۆلشەفیك لەساتەوەختی شۆڕشی ١٩١٧دا کەمێك لەسەرووی ٢٣٠٠٠ ئەندامی هەبو،



بەساڵێك دوای شۆڕش ئنجا گەیشتە ١١٥٠٠٠ ئەندام. لەکاتی شەڕی ناوخۆدا ژمارەی ئەندامەکانی گەیشتە ٦٥٠ هەزار ئەندام. ساڵی ١٩٢٤ لەسەر داوای لینین ژمارەی ئەندامەکانی حیزب بۆ ٤٧٢ هەزار ئەندام کەمکرایەوە. بەڵام لە ماوەی حوکمڕانی ستالینداو لەدوای مردنی لینین بە دوو ساڵ ژمارەی ئەندامانی حیزب گەیشتە ١٠٧٨١٨٢ ئەندام. ئەم زیادە "باڵایە" کە بە ڕێنمایی سەرەوە بو، زۆرێك لە کرێکارانو جوتیارانی ناسیاسی ناونوس کران[71]، ئەمجۆرە گەشەکردنەش لە گەشەکردنی لە حەفتاکانی حیزبی بەعس دەچو.

ئەگەر گەشەکردنی حیزبو دەزگا سەرکوتکەرەکان بەلاوەبنێین، ئەوا ئامارەکان لە پەنجاکانەوە بەردەوامیان هەیە. هەروەکو لە خشتەی ژمارە (٣)دا دەردەکەوێت، وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست زۆر گرنگیان بە بیناکردنی دەزگای زەبەلاحی دەوڵەتو ئاستی مەدەنی بەرز داوە، بۆیە دەبینین دەوڵەت بە شێوەیەکی زۆر نامۆ گەشەیدەکرد، تەنانەت لە وڵاتێکی وەك عێراقیش لە کۆتایی حەفتاکاندا لە حاڵەتی سروشتی خۆی لادەدا، ڕەنگە ئەمەش لەبەر ئەو هۆیانە بێت کە پەیوەندی بە جوگرافیاو مێژووەوە هەیە. بۆ نمونە حکومەتی شا لە ساڵی ١٩٧٧دا ٨٠٠ هەزار فەرمانبەری هەبو، ئەگەر سەرجەم کارمەندانی کۆمپانیا ئابورییەکانی دەوڵەتو دەزگا داراییەکانیشی بخەینە سەر ئەو ژمارەیە ئنجا دەتوانین بڵێین "ڕێژەی ئەوانەی لە حکومەتدا کاریان دەکرد دەگەیشتە لە ١٠٪ کۆی کارکەران[72]. لە عێراقدا ئەو ژمارەیە گەیشتە نزیکەی ٣٠٪. ساڵی ١٩٨٠ ژمارەی فەرمانبەرە مەدەنییەکانی دەوڵەتو سوپاو نیوەی هێزی میلیشیا، بەو گریمانەیەی کە نیوەکەی دییان کاری حکومەتییان هەبو، دەگەیشتە ١ر٢ ملیۆن کەس، ئەوەش دەکاتە نیوەی هێزی کاری ئەوانەی چالاکی ئابورییان هەبو، ئەم ژمارەیەش لە وڵاتێکە کە لە ٦٥٪ دانیشتوانەکەی بەپێی ئامارە ڕەسمییەکان شارنشین بون.

**خشتەی ژمارە (٣)**

**گەشەکردنی دەوڵەت بەبێ هێزە چەکدارەکان**

| ساڵ | ژمارەی فەرمانبەران | دانیشتوان بەملیۆن | ژمارەی رێژەیی |
|---|---|---|---|
| ١٩٣٨ | ٩٧٤٠ | ٣,٨ | ٣ |
| ١٩٥٨ | ٢٠٠٣١ | ٦,٥ | ٣ |
| ١٩٦٨ | ٢٢٤٢٥٣ | ٨,٧ | ٢٦ |
| ١٩٧٢ | ٣٨٥٩٧٨ | ١٠ | ٣٩ |
| ١٩٧٦ | ٥٢٦٥٧٨ | ١١,٦ | ٤٥ |
| ١٩٧٧ | ٥٨٠١٣٢ | ١١,٦ | ٤٨ |
| ١٩٧٨ | ٦٦٢٨٥٦ | ١٢,٤ | ٥٣ |
| ١٩٨٠ | ٨٣٥٠٠٠ | ١٣,٢ | ٦٣ |

گەشەکردنی دەزگا سەرکوتگەرو رێکخراوە حیزبیی و دەزگا دەوڵەتییەکان گەلێك هۆکاری لێکدابڕاوی جیاوازیان هەبو. ئامارو ژمارەکان وردنەبون. سەرەتا هەمو میلیشیاکان ئەندامی حیزب نەبون، ئەگەر چی لەنیوەی دوەمی حەفتاکاندا ئەم هاوکێشەیە گۆڕانکاری بەسەردا هات. کارمەندانی پۆلیسی نهێنی فەرمانبەری دەوڵەت بون، بۆیە خۆبەخۆ دەزگا موخابەراتیەکانی حیزب، بون بە بەشێك لەدەزگا رەسمیەکانی دەوڵەت، هەرچەندە ساڵی ١٩٦٨ بەقسە دەگوترا فەرمانبەرانی دەوڵەتو ئەندامانی حیزب دوو شتی جیاوازن، بەڵام ساڵی ١٩٨٠ ئەو بارودۆخەش گۆڕانکاری بەسەردا هات، چونکە یەك ملیۆن ئەندامی حیزب تێکەڵ بەدەزگاکانی دەوڵەت کران، ئیدی حیزبو دەوڵەتو کۆمەڵگە بوون بە بارستەیەکی گەورە.

لە راپۆرتی سیاسی ١٩٧٤ ی بەعسدا هاتوە: "حیزب پێشئەوەی دەسەڵات بگرێتەدەست روبەروی ئەرکێکی زۆر مەزنی وردبووەوە، چونکە دەزگاگەلێکی ئەوتۆی نەبو تا جێگەی دەزگاکانی دەوڵەت بگرێتەوە، هەروەکو بۆ نمونە شۆڕشی چین



ئەو کارەیکرد، کاتێك شۆڕش لەناکاو دەبێتە دەوڵەت، ناتوانێت دەمودەستو زۆر بەخێرایی رژێمی کۆن لەنێوبەرێتو رژێمێکی تازە لە جێگەیدا دامەزرێنێت، هەروەکو لە روسیادا روویدا. لەیەککاتدا هەڵوەشانەوەی تەواوی رژێمی کۆنو دامەزراندنی رژێمێکی نوێ لەجێگەیدا، وڵات بەرەو ئاژاوەو پشێوییەکی گەورە دەبات"[73].

سەرئەنجام حیزب بەرنامەیەکی گەشەسەندنی خێرای گرتەبەر، کە بەپێی ئەو بەرنامەیە ئەندامانی تازەی بەو رەوشە نوێیە پەروەردە دەکردو لەسەر ئیدارەدانیش مەشقی بە کادرە کۆنەکانی دەکرد، پاشان هێدی هێدیو بەشێوەیەکی بەرفراوان کەوتە موتوربەکردنی کادرە حیزبییەکانی لە دەزگاکانی سوپاو پۆلیسدا، "بەکارڕایی دورو درێژو ئاڵۆزو پلەبە پلە گۆڕانکاری پێویستی لە گشت دەزگاکانی دەوڵەت (دادوەری، راگەیاندن، رۆشنبیریو پەروەردە) ئەنجامدا"[74]، بێگومان لەو بوارەدا دەرئەنجامی سەرسوڕهێنەریان بەدەستهێنا. هەرچەندە گەلێك بەربەستو گرفت لەبەردەم پەرەسەندنی حیزب دەبینرا (لینیش لەبەر هۆی دی، لەدوا ساڵەکانی تەمەنیدا کارێکی لەوجۆرەی گرتەبەر)[75]، بەڵام حیزب رێگەیەکی دی نەبو:

" تەنها هەلومەرجی خودی نەبو کە حیزبی لە پێشوەچونی بەرنامەی دانانی تەدریجی ئەندامەکانی لە پۆستە گرنگەکانی دەوڵەتدا راگرت، بەڵکو گرفتی گەورەی کادرو دانانیان لە پۆستە جیاوازەکانیشدا هەبو. ئەمە سەرباری ئەوەی خودی حیزب بۆ راپەراندنی کاری حیزبایەتی پێویستی بەکادر هەبو، چونکە حیزبیش بەردەوام لە حاڵەتی گەشەو چوونەناو بواری تازەی چالاکیەوە بو... ئەزمونی شوباتی ١٩٦٣ ئەوەندەی نەخایاند تا حیزب بتوانێت رێنمایی بکات. خەباتی بەر لە شۆڕش بوە مایەی زیندانیو دوورخستنەوەو تیاچوونی زۆرێك لە ئەندامانی حیزب، بۆیە جگەلە ژمارەیەکیان ئەوانی دی شارەزایی هونەریو ئیداری تازەی ئەو سەردەمەیان نەبو.

رۆژگارێك نێوان بەرپرسیارێتی حیزبیو حکومەت جۆرە تێکەڵیو ئاڵۆزکاوییەکی تێیدابو... سەرئەنجام، زۆرێك لە هەڤاڵان خۆیان بۆ هەمو بەرپرسیارییەتێکی گەورەو بچوك ئامادە دەکرد... ئەم بۆچونە نادروستەش دژوارییەکی زۆری لێکەوتەوەو

پەیوەنـدی دەسـەڵاتدارانی دەوڵەتی بەعسو نابەعسـییەکانی تاریكو شـلۆق کرد. زۆرێـك لە ئەندامانی حیزب لەو باوەڕەدابون کە توانای حیزب، پەیوەندی بەژمارەی ئەندامانـی حیزبەوە هەیە لە دەزگا دەوڵەتییەکانداو لەسـەر ئەو گریمانە نادروسـتەش لایەنگری دامەزراندنی بەعسـیەکان بون لەسـەر گشت ئاستەکانی دەوڵەتدا، هەر لە وەزیرەوە تا خزمەتگوزارێك...

خێراییەك کە لە دوتوێیدا ئەندامانی حیزب لە پۆسـتە بڕیاردەرەکان دادەمەزران... پێشـهاتی ناخۆشـی لێکەوتەوە. هێندێك لـە ئەندامانی حیزب هەر کە پۆسـتێکیان وەردەگـرت لەخۆیـان بایی دەبونو هەڵەی گەورەیـان لێدەردەکەوت، ئیدی حیزب ناچاردەبـو بەردەوام بەدانانو بڕیارەکانی خۆیـدا بچێتەوە. بەرزکردنەوەی حیزبیەکان بـۆ پلەوپایـەی دەوڵەت جۆرێك لـە کێبەرکێی نابەجێـی لەنێـوان ئەندامانی حیزبدا دروستکرد"[76].

عێراق لەسـایەی دەسـەڵاتی بەعسـدا روبەروی دوو جۆر لە سـتەمگەری بووەوە: سـتەمگەریو ئامـرازە توندوتیـژو سـەرکوتگەرەکانی لەلایـەك، دەزگا ئیـداریو وەزیفییەکانی لەلایەکی دی. سـەربوردی سـالم ـ یش جەخت لەسەر بوونی ئەو دوو هۆکارە دەکاتەوە. هۆکاری دوەم (دەزگای ئیداری) لە هۆکاری یەکەم (ستەمگەری) لقوپۆدارتـرو بەرفراوانتـر بو، هەروەها گرەنتیەکی سـەرەکی پاراسـتنی رژێمی نوێیش بو[77].

مسـتەفا حیجازی لەدوا کتێبیدا سەرنج بۆ سایکۆلۆجیای پەیوەندی نێوان دەزگای ئیداری فەرمانڕەواو هاوڵاتیانی جیهانی سـێیەم رادەکێشێو گوزارەیەکی زۆر سەیرمان لەسـەر "هێنانەدی کەسایەتی لەرێگەی توندوتیژی بێسنوری ستەمگەرەوە" پێشکەش دەکات[78]. هەروەها دەڵێت دەزگای سیاسـی لەسـەر ئەو بنەمایە خۆی راگرتوە کە هەر ئاستێك لە زنجیرەی پلەبەندی توانادا راستەوخۆ سوکایەتی بەپلەی خوار خۆیەوە دەکات تا هەمو لەشـوێنی خۆی بهێڵێتەوە. سەرلەبەری دەوڵەت وەك تاکە دەزگایەك روبەروی هاوڵاتیان دەبێتەوە وەکئەوەی نزمترین پێگەی هەیە. هەمو کەسـێك هەر لە



سـادەترین نوسـەرەوە تا گەورەترین وەزیر، هەر کارێك ئەنجام دەدا، دەبێ جۆرێك مامەڵـەی باشو جوامێـری بەرامبەر بەهاوڵاتیان نیشـان بدات. ئـەو چەمکانەی لە دەزگا حکومییەکانـی وڵاتە جیاوازەکاندا حوکم لەسـەر کاردەکات، وەك خزمەتی گشـتی، هەلومەرجی باڵاکردن لەسەر شایسـتەیی، مافی هاوڵاتیانو کارەکانی دی، لـە کۆمەڵگـەی حیزبی بەعسـدا کە جگە لە سـەرکردەیەکی خودایـی هیچی دی تیـا بەدیناکرێ. لە جیاتی ئەوەش، چەمکی ململانـێو دڵەراوکێی نێوان کارکەرانو سوکایەتیکردن بەوی دیو خۆبەگەورەزانین بەسەر خەڵکیدا لە هەمو ئاستەکانی دەزگا ئیدارییەکاندا زاڵ بو. هەمو ئەوانەش دەبێتە مایەی هاڕینی تاك لە بەرامبەر دەسەڵاتدا یـا ئەوەی نوێنەرایەتـی دەکات، ئیدی چ گەورە بێت یا بچوك، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی بەدوای شـێوازی کەسیدا بگەڕێت بۆ ئەوەی مافی خۆی وەربگرێت (واسیتە)، شایستەییو ناشایستەیی بەهیچ شێوەیەك رەچاوناکرێ، گرنگ ئەوەیە کلیلی چارەسەری کێشەکان بدۆزیتەوە، رووکەش بەسەر ئەو جیهانە داتەپیوەدا زاڵو سەروەر دەبێ، ئیدی پرسیار لەسەر ئەوە دەکرێ: تۆ کێی؟ چ دەپۆشیت؟ چ توانایەکت هەیە تـا خۆت بگەیەنیتـە جیهانی بەرژەوەندییەکانو بەدیهێنانـی بەرژەوەندییەکانت؟ بۆیە هەروەکـو وتمان هیچ بوارێك بەمانـای رەها بۆ بوونی هەق نامێنێتەوەو جگە لەتوانا، بەدەر لەشەرعییەتی، شتێکی دی نامێنێتەوە.

سـادق ئەلعەزمو فواد ئەلعەجمی بەشێوازێکی دی جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە کـە دەوڵەتـە عەرەبییەکان دوورن لـە هاوڵاتیانی خۆیانو رقیـان لێیاندەبێتەوەو هەمو رایەڵەیەکـی پەیوەنـدی لەنێوانیاندا پچڕاوە "هاوڵاتیـان داوا دەکەن وازیان لێبهێنرێو لەشـەڕەئەنگیزیو میزاجییەتی دەسەڵاتی دەوڵەت بەدووربن، دەوڵەت بەپێی چەمکی دەوڵەتی سـتەمگەری رۆژهەڵاتی حکوم ناکات، بەڵکـو فەرمان دەردەکاو تەحەکوم دەکات"[79]. ئـەو دوو نوسـەرە بیریـان لەشکسـتی دەوڵەتـە عەرەبیـەکان لەدوای سـەربەخۆبوونیان دەکردەوە کە لوتکەی ریسوابونیان شکستی شەش رۆژەی جەنگی ١٩٦٧ بو. بۆیە تا دەوڵەت ئامرازەکانی سـەرکوتکردنو توندوتیژی بەدەسـتەوەبێت،

تەحەکوم، نەك حوکم بەهاوڵاتیانی خۆیەوە دەکات، چونکە ئەو توندوتیژییەی مستەفا حیجازی قسەی لەسەر دەکات، پێگەیەك بۆ رەزامەندیو رێکەوتنو هاوئاهەنگی ناهێڵێتەوە. دەوڵەت دەسەڵاتی لە هێزو توانایەوە وەردەگرێت، نەك قابیلکردنی هاوڵاتیان: "بەشێوەیەکی گشتی عەرەب ئینتماو دڵسۆزیان بۆ دەوڵەت نیە، بەڵکو وەفادارییان بۆ خێزانو خێڵەکانی خۆیان هەیە"[80].

ئەگەر ئەمە ئەو یاسایە بێت کە حوکمی دەوڵەتێك بکات، ئەوا فەرمانەکانی تا ئەو شوێنە بڕ دەکات کە دەستی سەرکوتکردنی پێیدەگات. شەڕی ناوخۆی لوبنان جەخت لەسەر ئەم چەمکە تراجیدییەی دەسەڵاتو شەرعییەتی دەوڵەت لە وڵاتە عەرەبییەکاندا دەکاتەوە.

لێرەدا دوو کێشەی راستەقینە روبەرومان دەبێتەوە: یەکەم، کێشەی دەوڵەت لە روبەروبونەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی، واتە کۆمەڵگەیەك کە هەمو هاوڵاتییەکانی لە دەوڵەت دوورخراونەتەوە. کێشەی دوەم، کێشەی دەسەڵاتە لە رژێمی دەوڵەتێکدا کە تایبەتە بەتوندوتیژیو سەرکوتکردن نەك حوکم کردن. لە کۆمەڵگە زۆر بچوکەکانی وەك لوبنان یا گەورەکانی وەك میسرو ئێران، کێشەی یەکەم کاریگەری لەسەر رژێمی حوکمدا دەبێت. بەڵام لە حاڵەتی مامناوەندی وەك عێراق کە حیزب لەهەوڵی دەسەڵاتو باڵادەستیە، واتە پرۆسەی "بەدەوڵەت بون"، ئیدی کاراکتەرەکان بەجۆرێك دەردەکەون وەکئەوەی دەوڵەت کۆمەڵگەی مەدەنی قووت دەدا[81].

حیزبی بەعس رژێمێکی بەمیراتی بۆ مابوەوە کە زۆر جیاواز نەبو لەو رژێمەی کە ئەلعەجمیو ئەلعەزم وەسفیان دەکرد، توانی بەسەر ئەو کێشەیەدا زاڵ بێت، بەوەی هەمو هاوڵاتیانی کرد بە فەرمانبەری دەوڵەت. بەو کارەشی کێشەی دەسەڵاتی لەو رژێمە کۆنە چارەسەر کرد کە بنکەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریکراوی هەبو، ئەو دۆخەی ئاڵوگۆڕی دەسەڵاتی لە رێگەی جەنگو کودەتاوە سانادەکرد. بەعس ئەم کێشەیەی نەهێشتو کێشەی ململانێی ئیداری نێو دەوڵەتێکی داتەپیو جێگەی گرتەوە، بەڵام سەقامگیری رژێم فەراهەم بو، چونکە سەرباری بەکارهێنانی توندوتیژی



لەسەر ئاستێکی باڵا، حیزب توانی بنکەیەك بۆ خۆی دروست بکات، بەوەی توێژێکی کۆمەڵایەتی خۆی بەقەرزارباری رژێمی تازە دەزانی. هەر لەم دەسپێکەوە ئەو بناغەیەی کە حیزبی بەعس ساڵی ۱۹۸۰ لەعێراق خۆی لەسەر راگرتبو، هەمان ئەو دەزگایە بو کە سەروکاری لەگەڵ سەرکوتکردنو توندوتیژیدا هەبو، ژمارەشیان بەنزیکەیی دەگەیشتە ٦٧٧ هەزار کەس بو. لێرەدا خەڵکانێك هەیە ئەو ژمارەیە ٨٣٥ هەزار کارمەندی دەوڵەتو یەك ملیۆن ئەندام لە هەمان ساڵدا دەخەملێنێن.

حیزبی بەعس بەهۆی ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییە مەزنەوە نەك تەنها ئەو کێشانەی چارەسەرکرد، بەڵکو لەرێگەی دەوڵەتەوە توندوتیژی لەنێو بچوکترین وردەکاری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی هاوڵاتیاندا چاند، ئەم کارەش پەیوەندی بەو مافانەوە نیە کە پێشتر هەبونو دواتر لەنێوبران، هەروەکو حیجازی بانگەشەی بۆ دەکرد، بەڵکو لەبەر ئەوەی هێزە ململانێکارە کۆنەکان زۆر بێبەزەییانە لەنێوبران.

دەسەڵاتی دەوڵەت لە سەردەمی پێش حیزبی بەعسدا مایەی نوکتەو دروشمی تەنزئامێزو هەجو بو، ئەویش دەروازەیەك بو کە خەڵکی بەمەبەستی راکردن لە توندوتیژی دەوڵەت پەنایان بۆ دەبرد. بەڵام بەهاتنی حیزبی بەعس ئەو شتانە کۆتاییان پێهاتو کەس نەیدەتوانی گاڵتە بەدەوڵەت بکات، چونکە هەمو دەترسان. بەرامبەر بەهێزێکی لە شکست نەهاتو، ئەو هێزەی تاکە لاوازەکان دەهاڕێت، کەسایەتی هاوڵاتیان لەنێوچو.

1ـ سەربوردێکی راستەقینەیەو تەنها گۆڕان لە وردەکارییەکانیدا کراوە.
2ـ دیڤید هێرست لە ٢٦ / تشرینی دوەم / ١٩٧١ لە گاردیان ئاماژەی بە دەزگای "حەنین" کردوە. دەزگای حەنین لە گەشتی ژیانی نیمچە رەسمی ئەمیر ئەسکەندەردا هاتوە، بەناونیشانی "سەدام حسێن: تێکۆشەر، بیریارو مرۆڤ"، پاریس هاچیت، ١٩٨١، ل١٠١, ١٠٤,١٠٥.
3ـ بڕوانە راپۆرتی عەلی هاشم لە ئەلنەهار، ٨ / تەموز / ١٩٧٣، ل٨.
4ـ هەمان سەرچاوە.
5ـ ئەم بەڵگەنامەیە لە هەشتەمین کۆنگرەی هەرێمایەتی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، ساڵی ١٩٧٤ لە بەغدا بڕیاری لەسەردرا، ئەم بەڵگەیە لە دەقە ئینگلیزییەکەیەوە وەردەگرم، شۆڕشی ١٩٦٨ی عێراق.. ئەزمونو دوارۆژ (لەندەن، چاپخانەی ئاتاکا، ١٩٧٩، ل١٠٦

The 1968 Revolution in Iraq: Experience and Prospect (London: Ithaca press, 1979). 106).

لێرە بەدواوە وەك راپۆرتی سیاسی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی ئاماژە بەم راپۆرتە دەدرێ.
6ـ سەدام حسێن: دەربارەی روداوەکانی عێراق (لەندەن لۆنگمان، ١٩٧٣) ل١٧ـ ١٨
7ـ بڕوانە ئەلنەهار، ٨/ تموز/ ١٩٧٣، ل٨.
8ـ گۆڤاری Now لەندەنی، ١٤/ ئەیلول/ ١٩٧٩، ل٥٤ـ٦٢.
9ـ هەمان سەرچاوە.
10ـ رۆژنامەی ئەلغەد، ٦ / نیسان / ١٩٨٢.
11ـ سەندای تایمز ٢٩ / اب / ١٩٨٢، ئیکۆنۆمیست ٩ / تشرینی یەکەم /١٩٨٢، گاردیان ٧ / ئازار/ ١٩٨٣
12ـ گاردیان ٧ / ئازار / ١٩٨٣.
13ـ لە بڵاوکراوەکانی یەکێتی خوێندکارانی عێراق لە بریتانیا.
14ـ CARDRI, Iraq Solidarity Voice, London, No 10 (Spring, 1983); Nahnu Nudeen (paris French Committee Against Repression in Irag, 1981)
15ـ میلەتێکی بێ نیشتمان.. کوردو کوردستان، عیسمەت فانلی، لەندەن، ١٩٨٠.
16ـ گۆڤاریNow، ١٤/ ئەیلول/ ١٩٧٩.
17ـ نیویۆرك تایمز، ٢١/ حوزەیران / ١٩٨٥.
18ـ ئەم بەشەم لە دەقە عەرەبییەکەوە بۆ ئینگلیزی وەرگێڕاوە. لە وەرگێرانەکەی ئاتاکاوە (جهاز الخاص) وەرنەگێڕاوە. جهاز الخاص تا پێش ساڵی ١٩٦٨، ناوی جهاز حنین بو. بڕوانە شۆڕشی ١٧ تەموز: ئەزمونو ئاسۆ (بەغدا، حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، ١٩٧٤، ل١٣٩).





19ـ راپۆرتی سیاسی حیزب، ل٤٠ ٤١، ل١١٠ ١١١.
20ـ فازیل بەڕاك، فێرگە یەهودیو ئێرانییەکانی عێراق، بەغدا، ١٩٨٤، ل١٣. بەڕاك لە یەکێتی سۆڤێتدا
دکتۆرای وەرگرتوە، تێزی دکتۆراکەی لەسەر ئەزمونی یەکێتی عەرەبیی ساڵی ١٩٤١ لە عێراق نوسیوە. بڕوانە بەشی پێنجەم.
21ـ هەمان سەرچاوە، هێندێك کەرەت رەگەزپەرستی بەعس دەکەوێتە گەمژەییەوە، بۆ نمونە "دار الحرية"، نێوەندی پەخشی دەوڵەتی عێراق، ساڵی ١٩٨١ لەسەر ئاستێکی بەرفراوان نامیلکەیەکی بڵاوکردەوە بە ناونیشانی: ئەو گیانەوەرانەی نەدەبوایە خوداوەند دروستیان بکات: ئێرانی، یەهودو مێش. خێروڵڵا توڵفاح نوسەری ئەو بەرهەمە کە پێشتر پارێزگاری بەغدا بو، خاڵو خەزورو بەخێوکەری سەدام حسێنیش بو. توڵفاح دەنوسێت "ئێرانییەکان گیانەوەرێکن کە خوداوەند بە بیچمو پەیکەری مرۆڤ دروستی کردون". یەهود"تێکەڵەیەکن لە پیسیو پاشماوەی مرۆڤی جۆراوجۆر"و مێشیش گیانەوەرێکی حەقیرە "نازانرێ خوداوەند بۆچی دروستیکردوە". لە "نحن ندين" وەرگیراوە، ل٦٤ ٧٢.
22ـ گشت ئەو وتانە لە فێرگە... وەرگیراوە، ل٢٠, ٢٦, ٤٨.
23ـ رەگوریشەی ئەم دوژمنایەتییە دەگەڕێتەوە نارۆدیزمی (شعوبیە) ئێرانی کە رقی لە عەرەبگەرایی دەبوەوە. بگەڕێرەوە بۆ بەشی شەشەم.
24ـ فازیل بەڕاك، فێرگە یەهودیو ئێرانییەکان. ل١٤٣.
25ـ بەڕاك، فیرگە، ل١٥٧.
26ـ سەدام حسێن، عێراقو سیاسەتی دەولی (بەغدا، دار الحرية، ١٩٨١)، ل١٦٤.
27ـ بەڕاك، فیرگە، ل ١٣.
28ـ لە ساڵی ١٩٤١ ١٩٤٢، نزیکەی ٣٢٤ ئەفسەر خانەنشین کران، تا ١٩٤٨ یش ١٠٩٥ ئەفسەری دی لە خزمەت دەرکران. بڕوانە حەنا بەتاتو، چینە کۆمەڵایەتیو بزوتنەوە شۆڕشگێڕەکانی عێراق، بیرنستون، ١٩٧٨.
29ـ phebe A. Marr. “The Political Elite in Iraq.” In Political Elites in the Middle East. ed. George Lenczowski: (Washington d. c. American Enterprise Institute. 1975). 125 – 126.
30ـ هەمان سەرچاوە، ٢٨ ١٢٧.
31ـ بەمەبەستی ئاگاداری لەسەر راڤەکردنی چاودێران دەربارەی هەلومەرجو بارودۆخی رەوانەکردنی هێزەکانی عێراق لە ١٩٦٧ بگەڕێرەوە بۆ:

Edith Penrose and E. F. Penrose, Iraq: International Relations and National

Development (London. Ernest Benn.1978). 384.

32ـ بڕوانە: Lorenzo Kent Kimball, The Chaning Pattern of Political Power in .Iraq. 1958 to 1971 (N. Y. Robert Spellers and Sons. 1972). 156

33ـ هەمان سەرچاوە. ل١٥٥ ١٥٦.

34ـ لەنێو ملیۆنو نیوێك دانیشتوان لە نێوان ٦٠٠ ٧٥٠ هەزار کەس دەربەدەر بوون، ١٠٠ هەزار کەس بۆ ئێران ڕۆیشتن. بڕوانە: ئیدوارد مۆتایمەر، تایمز، ٢٧ / نۆڤەمبەر/ ١٩٧٤.

35ـ "زۆربەیان بۆ یەکەمجار ئەم کارە ئەزمون دەکەن. بڕیاری گەڕانەوە بەحەزو ئارەزو وەرنەگیرا. زۆرینەیان لەم بڕیارەدا بەترسو لەرزەوە لەنێو هاوکاری چالاکانە لەگەڵ ڕژێمی بەعسو زیندان یا مەرگ دەستیان بەهەڵبژاردن کرد"، مۆرتایمەر، تایمز، ٢٨/ نۆڤەمبەر/ ١٩٧٤.

36ـ بڕوانە ڕاپۆرتی تایمزمالی، ١/ حوزەیران/ ١٩٧٥، ٢٤/ ئازار/ ١٩٧٥ دەربارەی بارودۆخی پەناهەندەکانی ئێران.

37ـ David Hirst, “Rebel without Resourse” The Guardian December 7, 1976, p.2

38ـ باسکردنی ڕاگواستن لە ڕاپۆرتێکی دەستنوسی ١٥ لاپەرەیی شاهیدێکدا پوخت کراوەتەوە کە سەرچاوەی کوردە ئۆپۆزیسۆنەکان ئامادەیان کردبو. لە بەڵگەنامەکەدا باس لە ڕێکخراوی حیزبی بەعس لە کوردستاندا دەکات، لەگەڵ ناوی ئەو بیرۆکراتانەی پلەوپایەی بەرزیان هەیە. لەو ڕاپۆرتەدا باس لە تەعریبکردنی ناوچە ڕاگوێزراوەکانو یاسا تازەکانی دەکاتو لەبارەی گۆڕانکاری دانیشتوانیشەوە ڕوونکردنەوەیەکی کورت دراوەو لە کۆتاییشدا باس لە بارودۆخی کارەساتباری خێزانە ئاوارەکانی ناوچە بیابانییەکان دەکات.

39ـ ئیکۆنۆمیست، ٢٧/ نۆڤەمبەر/ ١٩٧٦، ل٨٥، داڤید هێرست لە وتارێکیدا دەنوسێت کە ژمارەی ٥٠ هەزار کەس لە ڕێگەی کوردێکەوە بەناوی بەکر پشدەری گەیشتۆتە ڕۆژنامەکان، دەبێ وەك سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو پشتی پێببەسترێ. هەروەها هێرست دەڵێت: "زۆربەی بەرپرسانی عێراقی دانیانیان بەوەدا ناوە کە گوندە سنورییەکانیان بەقوڵایی دە کیلۆمەتری چۆڵ کردوەو لەبارەی گوندەکانی سەر سنوری سوریاش کارێکی لەوجۆرەیان لەبەردەستدا نیە، بەڵام لەوێش هەمان بارودۆخ لە ئارادا بو. ئەوەی جەخت لەسەر ئەو حاڵەتە دەکاتەوە، وتەی ئەندازیارێکی لولەی نەوتی ڕۆژئاواییە کەلە ٧ / کانونی یەکەمی / ١٩٧٦ دا بۆ ڕۆژنامەی گاردیان دەدوێت، لەیەکەم دیداریدا گوندی فیشخاپوری بینیوە، بەڵام لە گەڕانەوەیدا شوێنەوارە ڕوخاوەکەی ئەو گوندەی بینیوە".

40ـ خەدوری، عێراقی سۆسیالیستی، لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر سیاسەتی عێراق لە ساڵی ١٩٦٨وە، واشنتن دی، سی، پەیمانگەی ڕۆژهەڵاتی نێوەند، ١٩٧٨، ل٥٧ ٦١.





41ـ هێرست، گاردیان، ٨ / کانونی یەکەم / ١٩٧٦، ل٢.

42ـ حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، ڕاپۆرتی سیاسی، ل١٠٣.

43ـ هەمان سەرچاوە، ل١٠٥.

44ـ "کاری سیاسی لەناو هێزە چەکدارەکان"، گۆڤاری "افاق عربیە"، ١١/ ٧/ ١٩٧٨، ل٦. ئەم وتارە سەرەتا لە ڕۆژنامەی "ئەلسەورە" بڵاوبوەوە، پاشان لەشێوەی نامیلکەیەك چاپکراوەیە، دواتر وەزارەتی ڕاگەیاندن بەمەبەستی دابەشکردنی لە دەرەوەی وڵات وەریگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی.

45ـ بڕیاری ژمارە ٨٨٤، لە ڕۆژنامەی ڕەسمی بڵاوکرایەوە، الوقائع العیراقیە (٣٦)، ٦/ ٩/ ١٩٧٨، ل٦.

46ـ ئەم دەقە لەوتارێکی داڤید هێرست، بەناوی "ئەو ترسەی لە تکرێتەوە دێت" وەرگیراوە، گاردیان، ٢٦/ ١١/ ١٩٧٦.

47ـ ئەم بڕگەیە لەدەقی چاوپێکەوتنێکی عەرەبی لە "البدایە" وەرگیراوە، ساڵی ١٩٨٢، هانۆڤەر ئەڵمانیا.

48ـ بۆ نمونە بڕوانە "طریق الشعب"، ژمارە ٤٦، ئاب / ١٩٨٢، زمانحاڵی حیزبی شیوعی عێراق، ئەم داوایە لەژێر ناوی "ئەی سەربازە بەشەرەفەکان ڕیزەکانی خۆتان ڕێکبخەنو پەیوەندی بەشۆڕشگێڕانەوە بکەن" بڵاوبۆتەوە، "سوپای عێراق بەشداری زۆرێك لە نەبەردەکانی میلەتی کردوە... ڕۆڵی بەناوبانگی لە شۆڕشی شکۆداری ١٤ی تەموزی ١٩٥٨دا، شاکارێکی مەزنی ئەو تێکۆشانەیە... دارودەستەی ستەمگەری بەعس گەورەترین فینتەی لەمێژووی هێزە چەکدارەکان خوڵقاندوە، ئەم ڕاستییەش ڕۆڵەکانی سوپا هاندەدا لە پێناوی خەباتێکی یەکگرتودا ڕیزەکانیان یەکبخەن".

49ـ لەدوای شەڕی ١٩٤٨دا جۆرج حەبەشو هانی ئەلهیندی هێزی نیمچە سەربازییان دامەزراند. باسل ئەلقوبەیسی، یەکێك لەسەرکردە ناوچەییەکانی عێراق، بزوتنەوەی ناسیونالیستی عەرەب، پاشان "بەرەی نیشتمانی ڕزگاریخوازی فەلەستین" ڕۆڵی سەرەکی بینی لە پەیوەندی کردن بەحیزبی بەعسەوە. بڕوانە بزوتنەوەی نەتەوەخوازانی عەرەب، بەغدا، دار العودە، بەبێ بەروار، ل٧٤ ٩٤.

50ـ ئۆرێڵ دان، مێژووی سیاسی عێراق لەسایەی حوکمی قاسم دا ١٩٥٨ ١٩٦٣، نیویۆرك، پرایجەر، ١٩٦٩، ل٣٦٧.

51ـ بڕوانە، باتاتو، "ساڵە پڕ بەسوێکانی چینە کۆمەڵایەتێکان"، ١٩٨٥ ١٩٩٠.

52ـ ماجد حەدوری، کۆماری عێراق: لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر سیاسەتی عێراق لە ١٩٥٨، لەندەن، چاپخانەی زانکۆی ئۆکسفۆرد، ساڵی ١٩٦٩، ل٢١٦.

53ـ ڕاپۆرتی سیاسی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، ل١٠٢ـ ١٠٤.

54ـ Christine Moss Helms, Iraq: Eastern Flank of the Arab World

(Washington D.C: The Brooking Institution, 1984), 284.

55ـ حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، راپۆرتی سیاسی، ل١٧٥.

56ـ خەدوری، سۆسیالیستی عێراقی، ل٤٤.

57ـ ریچارد نیروپ. عێراق: لێکۆڵینەوە لەسەر دەوڵەت، وانشتن، ١٩٧٩، ل٢٨٤.

58ـ Helms, Eastern Flank, 100.

59ـ هەمان سەرچاوە، ١٧٢. ئەمەش نزمترین خەمڵاندنە. بەرزترین خەمڵاندنیش لە ئۆبزێرڤەر، ٢٨/ سێپتامبەر/ ١٩٨٠، ل١٣و گاردیان، ٢٤/ سێپتامبەر/ ١٩٨٠، ل١٣دا هاتوە. وردترین هەڵسەنگاندنیش لەسەر سوپاو پۆلیسی عێراق لەم سەرچاوەیەی خوارەوەدا هاتوە:

Nyrop. Iraq: A Country, ch. 5.

نایروپ پێیوایە لە ساڵی ١٩٧٨دا کادری چالاکی سوپا ٢٣٠ هەزار کەس بوە (ل٢٣٨)، بەم حیسابەش بێت بەرزترین هەڵسەنگاندنی ١٩٨٠ وردترە.

60ـ هەمان سەرچاوە. ل٤٤ ٢٣٩.

61ـ رووی من لە کێشەی کۆمەڵایەتییە. توانای جەنگ راستەوخۆ پەیوەندی بەژمارەوە نیەو لە سەردەمی ئاشتیشدا لەرووی سیاسییەوە قابیلی ئاوڕلێدانەوە نیە. ئەم مەسەلەیە لە بەشی هەشتەمدا دەربارەی جەنگی عێراق ـ ئێران لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە. بەراوردەکان لەسەر ئەو ژمارانەی بەدەست هاتوە، لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە:

J. Stork and J. Paul. “Militarization of the Middle East,” MERIP Reports 112 (Feb 1983): table 11. Idem. MERIP Reports 110 (Nov, Dec. 1982): 7.

62ـ بەتاتو. چینە کۆمەڵایەتییەکان، ل٣٣.

63ـ زۆرینەی ئەم رێکخراوانە لە بەشی "سیاسەتی ناوخۆ" لە: دائیرەی مەعاریفی عێراقی ئەمڕۆدا هاتوە (بەغدا، دار العربیة للموضوعات، ١٩٧٧ ) ٩١١ ـ ٢:٨٩٨ بەسەرپەرشتی ك . العانی. لە پێشەکییەکەیدا جەخت لەسەر ئەوە کراوەتەوە کە هەر پێشڤەچونو دەستکەوتێکی شۆڕش لە ناساندنی دوژمنانی میلەت، پاکسازی ناوچەکە لە تۆڕە جاسیوسییەکان، گۆشەگیرکردنی گومانلێکراو، خائینو رەگەزە دوژمنکارەکان لە بناغەوە لەگەڵ هەر پێشڤەچونێکی بەرزفڕانەو شۆڕشگێرانە پێچەوانە دەکەوێتەوە. ئەوەی کە باس لە دەزگاکانی پۆلیس نەکراوە، لە بەشی "موخابەراتو ئەمن" لە ئامارەکانی دەوڵەت بە بەشێکی تایبەتی وەزارەتی ناوخۆ حیساب کراوەو کاروباری پۆلیس ئەرکێکی گەورەی وەزارەتی ناوخۆیە، لێرەوە دەگەینە ئەوەی کە سەرپەرشتیاری دائیرەی رەسمی مەعاریف ئەوانەی لەکام بەشەوە هێناوەو بابەتەکانی خۆی چۆن چۆنی خستۆتەروو.

64ـ ریچارد نایروپ، عێراق: لێکۆڵینەوە لەسەر دەوڵەت، ل٢٤٩.





65ـ ئامارەکانی ساڵانی ١٩٧٦، ١٩٧٨ (وەزارەتی پلاندانانو بەدواداچون).

66ـ ئەلسەورە، زەمانحاڵی بەعس، هەروەها بڕوانە: MERIP Reports 97 (June 1981): 16

67ـ بەراوردکردنی ئەو دوو شتە لەتوانادا نیە، بەڵام فردهالیدی لە کتێبی ئێران: دیکتاتۆریو فراوانخوازیدا دەڵێت: لەنیوەی دەیەی ساڵی ١٩٧٠دا ژمارەی کارمەندانی ساواك لەنێوان ٣٠ ـ٦٠ هەزار کەس بوە. ئەو رێکخراوی دی دەناسێنێت کە کاریان لەکاری میلیشیاکان دەچو. بۆ نمونە لە کۆتایی دەیەی ١٩٧٠دا ژاندامیری شاهانەی ئێران ٧٠ هەزار کارمەندی هەبو. بەڵام ساواك کە گەورەترین ئامرازی ئەمنییەتی شا بو، چەندین چالاکی دی دەکرد، بەگشتی لە دەرەوەی ماموورییەتی بو. لەوانە ئیدارەی زیندانیەکان، چاودێری کردنی دادگاکان لەمەڕ تاوانە سیاسییەکان، خۆهەڵقورتاندن لە مانگرتنەکان، چالاکی کردن لەدەرەوەی سنور، دەستوەردانە هەر کارێك کە پەیوەندی بە "ئەمنییەتی میلەت"ەوە هەبێت. ئێرانییە دوورخراوەکان لەدوای شۆڕشی ١٣٥٧وە لەسەر ئەو زانیاریانەی بەدەستهاتوە، دەیانوت کە ژمارەو ئامارە خەملێنراوەکانی سەردەمی شا دەربارەی ساواك زیادەرەوی زۆر تێیدا کراوە.

68ـ Batatu, Social Classes. 1078.

69ـ ئەمیر ئەسکەندەر، سەدام حسێن: تێکۆشەر، بیریارو مرۆڤ . ل٣٤٣.

70ـ کار، مێژووی روسیا، لەندەن، پینگوێن، ١٩٧٠.

71ـ E. H. Carr. History of Russia (London: Penguin, 1970), Vol. I: The Bolshevik Revolution 1917 – 1923, 211 – 13.

72ـ هالیدی، ئێران: ١٥.

73ـ حیزبی بەعسی بەعس عەرەبی ئیشتراکی، راپۆرتی سیاسی، ١١٠.

74ـ هەمان سەرچاوە.

75ـ "لە پشت پەردەی خودو عەقلی دروستەوە، رەفتاری (هێندێك برادەر) لە بیرۆکراسەکان دەچێت کە دیدو جۆشو خرۆشی شۆڕشگێڕییان نەمابو. لە ئیدارەکانی دەوڵەتدا جێگە خۆشدەکەنو کتومت وەك کارمەندانی رژێمی پێشو لە هەوڵو کۆششی داهێنەرانەو شۆڕشگێرانە دوور کەوتونەتەوەو نە هاوکارانو هاورێیانیان بەرەو خۆیان کێشدەکەن، نە خەڵکانی وڵاتپەروەر دەهێننە ناو حیزبو شۆڕشەوەو نە حەماسەتو گیانی لەخۆبوردەیی شۆڕشیش بەوان دەگەیەنن" هەمان سەرچاوە، ١١١.

76ـ هەمان سەرچاوە. ل٤١ ـ ٤٢.

77ـ هەر چەندە ژیانی گشتی دەستەمۆی دەزگای ئیداری بێت، توندوتیژی کێشێکی زیاتر پەیدادەکا. لەئیدارەیەکی خەملێوو بەرفراواندا چیدی کەسێك نامێنێتەوە تا سەری گفتوگۆیەکی لەگەڵ دامەزرێنێتو کێشەکانی بۆ باس بکەیتو بیخاتە ژێر گوشاری توانایەوە. ئیدارە فۆرمێکی حکومەتە کە تێیدا هەمو لە ئازادی سیاسیو توانای کارکردن بێبەش بون، چونکە حکومەت لەلایەن هیچ کەسێکەوە مانای نەبوونی

حکومــەت ناگەیەنێ. کاتێك هەمومان بەیەکســانی بێتوانا دەبین، ئیدی ســتەمگەری بەبێ ســتەمگەر سەرهەڵدەدا". هانا ئارێنت، توندوتیژی.

78ـ مســتەفا حیجازی، دواکەوتویی کۆمەڵایەتی، سایکۆلۆجیای مرۆڤی سەرکوتکراو. بیروت، ١٩٨٠، بەشی شەشەم، ل١٣٤ ١٣٥.

79ـ Fouad Ajami, The Arab Predicament: Arab Political Thought and Practice Since 1967 (Cambridge, 1981).

٣٢ - ٣٣ . سادق ئەلعەزم: رەخنە لەخۆگرتن لەدوای شکستدا (عەکا. دار ئەلجەلیل، ١٩٦٩).

80ـ Ajami, Arab Predicament. 33

81ـ دەبێ بوترێ ئەگەر جەنگی شــەش رۆژەی ١٩٦٧، شــەڕی ناوخۆی لوبنان، شۆڕشی ساڵی ١٣٥٧ (١٩٧٨) ئێران راســتییەك بێت لەســەر ســـتو لاوازی سیســـتمی دەوڵەت، دەبێ دەربارەی جەنگی عێراق ـ ئێران چاوەروانی ئەوە بکرێ کە سیستمی دەوڵەتی بەعس جیاواز بێت. من لە بەشی ئەنجامگیریدا بەدواداچون بۆ ئەم خاڵە دەکەم.

# بەشی دووەم

# جیهانی ترس

## پێنج شەممە/تشرینی یەکەم/١٩٦٩

کاتێك لەجادەی نیزاڵەوە دەمویست بگەڕێمەماڵەوە، دەستێکم بەدەستی کچەکەمەوە بو، بەدەستەکەی دی دوو بوتڵ پۆدرەی ئاوی پرتەقاڵم هەڵگرتبو. لەناکاو کامیۆنێکی گەورە دەرکەوت کە تانکێکی رەشی جەنگی زەبەلاحی هەڵگرتبو، زۆر بەخێرایی لێمان نزیك دەبویەوە، سەرەتا سەرنجی خێرایی کامیۆنەکەم نەدا، بەڵام کاتێك ئاگاداربومەوە، هەوڵمدا زۆر بەخێرایی لەگەڵ کچەکەمدا بۆ سەر شۆستەکەی ئەوبەرەوە بپەڕینەوە. هەر دوو بوتڵەکە لەدەستم بەربوەوەو لەناوەراستی شۆستەکەدا وردوخاش بون، روبەری یەك مەتر دوجای شۆستەکەش رەنگی ئاڵتونی پۆدرەکەی گرت، لەچرکە ساتێکدا تێگەیشتم کە دەبێ چی بکەم، خۆمو کچکەم بەبێ جوڵە لەشوێنی خۆماندا وەستاین، چونکە پێموابو شۆفێری کامیۆنەکە رودواوەکەی بینیوە، ئەگەر واشبێت، ئەوا گومان لە شتێك دەکات، رەنگە ئەوەش وەك بیانویەك لەدژی یەهودییەك بقۆزێتەوە.

کامیۆنەکە بەدەنگێکی پڕ لە زیکەو هوڕەوە لەنزیکمانەوە وەستا، شۆفێرێکی قەڵەوی کەتەی تەمەن دەوروبەری چل ساڵە بە جلوبەرگی سەربازییەوە لە ئۆتۆمۆبیلەکەی دابەزیو نزیکتر بووەوە تا بزانێ "چیم کردوە"، سەربازێکی دی لەخۆی مناڵتر کە لە تەنیشتییەوە دانیشتبو، بەپەلە بەچەکەوە دابەزی. شۆفێرەکە کە سور هەڵگەڕابو بەچاوێکی پڕگومانەوە تەماشای پۆدرە پەرشوبڵاوەکەی سەر زەوییەکەی دەکرد. سەربازەکەی دی بەتوڕەبونەوە سەیری دەکردمو شەڕ لە چاوانی دەباریو رووی





چەکەکەی کردە سەری کچەکەم، هەروەکو لەکاتی روبەروبونەوەدا ئەو کارە دەکات. شۆفێرەکە روویدەمی تێکردمو بەتوڕەییەوە پێیوتم "ئەمە چ جۆرە پۆدرەیەکە کە بەئەنقەست لەسەر رێگەکەمدا بڵاوتکردەوە؟!" زۆر بەئارامی هەوڵمدا قەناعەت بەخۆیو برادەرەکەی بهێنم کە ئەوەی رژاوە پۆدرەی پرتەقاڵەو شکاندنیشیان تەنها رێکەوت بوەو هیچی دی، بەڵام بێسود بو. باوەریان بەقسەکانم نەبو. کەمێك لە پۆدرەکەم لەسەر زەوییەکە هەڵگرتەوەو خستمە سەر دەمم تا زۆر بەسانایی بۆیان بسەلمێنم کە پۆدرەیەو هیچی دی، بەڵام دیسانەوە بێسود بو. شۆفێرەکە داوای ناسنامەی لێکردم، کاتێك ناسنامەکەم پێشاندا داوای لێکردم بۆ لێپێچینەوە لەتەکیدا برۆم بۆ سەربازگەی رەشید. کاتێك کچەکەم ئەو قسانەی بیست لە ترسا دەستی بەگریان کرد، هیچم نەوت، تەنها بۆ چەند ساتێك تەماشای شۆفێرەکەم کرد، ئەوەی زیاتر ئازاری دەدامو دەیترساندم، ئەو سەربازە بو کە لولەی چەکەکەی کردبوە سەر سەری کچەکەم، ئەوەش لەناخەوە وێرانی کردبوم.

خەڵکێکی زۆر لە چواردەورمان کۆبونەوەو پرسیاری بێمانایان دەکرد، ئەم دیمەنە نزیکەی چارەکە کاتژمێرێکی خایاند، پاشان یەکێکی تارادەیەك شیکپۆش لەناو ئاپۆرەکەوە هاتە دەرەوەو داوای لەهەر دوو سەربازەکە کرد سواری ماشینەکەیان بنو برۆن، مادامەکی هیچ رووینەداوەو زیان بەکەسیش نەکەوتوە، ئیدی ژنێك گسکێکی لەدوکانێکەوە هێناو بەپەلە کەوتە پاککردنەوەی وردەشوشەو پۆدرەی سەر شۆستەکە. شۆفیرەکەش هەستی بەشەرمەزاری کردو بەتوڕەبونێکەوە دەستی سەربازەکەی هاورێی گرتو سواری کامیۆنەکەیان بون، بەدەم رۆیشتنیشەوە رووی تێکردم: "تۆ، ئەی یەهودی، تۆ زۆر بەختەوەرو حەکیم بوی کە لە شوێنی خۆتدا وەستایتو جوڵەت نەکرد! هەر ئەوەش ژیانتی رزگار کرد!"[1].

کاتێك ماکس ساودایی ئەم سەربوردەیە دەگێڕێتەوە، نازانێت تا ئاستێك چانسی هەبوە. ئەو لەگەڵ سەربازێکدا مامەڵەی دەکرد، نەك لەگەڵ لایەنگرێکی حیزب، هێشتا خەڵکانێك مابون لەسەر جادەکان لەوە نەترسن سۆزو هەستی خۆیان بەرامبەر

بەوانی دی دەربڕن، یا ئەو هەســتەیان لە خزمەتی ئامانجە پڕشــکۆکاندا نەشێوابێت، لە ســاڵانی داهاتودا ئەو هەســتو جۆرە خەڵکانە نەك هەر نەمــان، بەڵکو ئەوجۆرە گردبونەوانەش روینەدەدایەوە، ئیدی چ بۆ پشــتگیریو هاودڵی ئەو بێچانســانە بێت کە قوربانی هەلومەرجێك بوون یا تەنانەت بۆ تەماشــاکردنو ترســاندنیش بێت، بۆیە دوای تێپەڕبونی چەند ســاڵێك بەســەر ئــەو روداوە، کامیۆنەکان بێئــەوەی هێزێکی گەورە بەکاربهێنن، پەلاماری ماڵە شیعەکانیانداو خێزانو ماڵو موڵکیان لە گەشتێکی بێگەڕانەوەدا بەرەو ســنورەکانی ئێران برد، کەسێك نەبو رێگە لەو کامیۆنانە بگرێت. گواســتنەوە لــە حاڵەتێکەوە بــۆ حاڵەتێکــی دی لەرێگەی چاندنی تــرسو تۆقاندنی بەردەوامــەوە هاتەدی. ئەو ترســەی دوای تێپەربوونی پــازدە مانگ لە تەمەنی رژێمی تازەدا، لەپاش نیوەرۆیەکی رۆژی پێنج شــەممەدا، ســەرتاپای جەســتەی ســاودایی داگیرکرد، بوە ئەزمونێکی عەیار تەواوی بەعس بۆ گروپو ئاییزاکانی عێراق.

## یەکەمین دیمەن:

کارەســاتی شکستی عەرەب لە جەنگی شەش رۆژەی ساڵی ١٩٦٧ لەگەڵ ئیسرائیلدا رێگەی خۆشکرد بۆ ئەوەی بەعسیەکان بەدەسەڵات بگەن. ژیانی سیاسی لەرزۆك بو، بۆیە دەرچون لەو حاڵەتی شــۆکە، پێویســتی بەوەڵامدانەوەی یەکسەری هەبو، بزوتنەوەی فەڵەستینیش لە وڵاتە هاوسنورییەکانی ئیسرائیلدا یەکێك لەو وەڵامانە بو. لەبەر ئەوەی عێراق لەبازنەی جەنگ دوور بو، بۆیە بەعسیەکان بەدوای وەڵامێکی دەستەهەست (ملموس)و دیاریکراودا دەگەڕان کە لەگەڵ دیدو رەفتاریاندا بگونجێت. دژایەتیکردنی ســامییەت کە لە ساڵانی ١٩٦٧ - ١٩٧٠دا بەجیدی هەوڵیان بۆ دەدا، خەسڵەتێکی سەرەکی سیاسەتێکی پاساودەر بو بەئەنقەست بۆ سڕینەوەی شوێنەواری شــۆکی شکســتی عەرەب دارێژرابو، بۆ ئەوەی زۆرترین کەس بەرەو راستیبوونی ئەو مەســەلەیە رابکێشرێ. ئەم سیاسەتەی بەعس بەزیانی یەهودییەکانی عێراق تەواو بو،



ئەوانەی هەر چەندە بەژمارە کەمبون، بەڵام لە رۆژگارێکدا پێشــکەوتنێکی تایبەتیان هەبو.

بەعسییەکان ساڵێك پێشئەوەی لە عێراق دەسەڵات بگرنە دەست، لە ٦/ ئەیلول/ ١٩٦٧، لە خۆپێشــاندانێکی گەورەدا لەدژی عەبدولرەحمان عارفی سەر کۆمار، ئەو داوایەیان گەلاڵەکرد. لەو خۆپێشــانەدا داوایاندەکرد دەوڵەت هەنگاوی جدی دژ بە زایۆنیزمو ئیمپریالیزم بنێت، بەوەش شــتێکیان هێنایە ســەر شــانۆی سیاسەتی جیهانی عەرەبی کە تا ئەو کاتە کەس بیری لێنەکردبوەوە: ستونی پێنجەم بەرپرسیارە لە شکستی کارەســاتباری جەنگی شــەش رۆژە. بەگوێرەی ئامارە رەســمیەکان زیانی عێراق لەو جەنگەدا دە کوژراوو نزیکەی ســی بریندار بوە[2]. بەعســیەکان ئەو ژمارە بچوکەیان کردە بیانویەك تا مەســەلەی یەکێتی عەرەب گەڵاڵە بکەنو خۆیان وەك قارەمانی ئەو یەکێتیە بناسێنن. گوناهی دەیان هەزار کوژراوو برینداری میسری، سوری، ئەردەنیو فەڵەســتینی، داگیرکردنی خاكو نیشتمانو گوناهی داڕوخانی سوپای عەرەبیو ئامیرە جەنگییەکانیان، خستە گەردنی کۆمۆنەیەکی بچوکی یەهودییەوە، ئەو کۆمۆنەیەی لە دەیەی ١٩٤٠وە بەتەواوەتی لە هەمو بوارەکانی ژیاندا پاشەکشێی کردبو.

یەهــود لــە دوای ســەربەخۆیی عێــراقو لــە مــاوەی ململانێــی عــەرەب ـ ئیســرائیلدا، بونــە چینێکــی کۆمەڵایەتــی بێزراوبــون، ئەگــەر مــرۆڤ بیەوێــت لــەو حاڵەتــەش تێبــگات، پێویســتە بگەڕێتــەوە بــۆ دەرکەوتــنو باڵادەســتی ئایدیۆلۆجیــای پانعەرەبیــزم کــە لــە ژینگــەی ململانێیەکی تاڵی ناوخۆوە گەشــەی کردبــو، هــەر دوو پەلامــارە ســەرەکییەکەی دژە ســامیزم لــە سیاســەتی عێراقــدا (١٩٤١ و ١٩٦٧ - ١٩٧٠) پەیوەندییەکــی توندوتۆڵــی بــە باڵادەســتیو دەســەڵاتی پانعەرەبیزمــەوە هەبو. لەلایەن حیزبی شــیوعی عێراق یا عێراقیــە نەتەوەخوازەکان یا تەنانەت سەرکردە تەقلیدییەکانیشەوە هێرشو پەلاماری کۆمۆنەی یەهودی نەدەدرا.

ئەو گوشارەی حیزبی بەعس لە دوا مانگەکانی حوکمی عارف دا پیادەیان دەکرد زنجیرەیــەك رێوشــوێنی نامرۆیانەی لــەدژی یەهودییەکانی عێــراق لێکەوتەوە. هەمو

مامەڵەیەکی خانوبەرەیان لێقەدەغەکرا، پارەو داراییان بلۆك کرا، هەمو گرێبەستو کۆنتراکتو یارمەتی حکومەت بۆ خوێندنو وەزیفەی تازە هەڵوەشێنرایەوە، هەروەها سیستمی پشكو کۆتو بەندی دی بەسەر ئەو یەهودییانەشدا سەپێنرا کەلە زانکۆکانی عێراقدا وەرگیرابون. لەماوەی نێوان جەنگی ١٩٦٧ تا ساڵی ١٩٧٠ کە رژێمی بەعس حوکمی گرتەدەست، نزیکەی سەد یەهودی زیندانی کرانو چل کەسیان بەماوەی جوداجودادا ئازادکران، بەڵام نە کەسیان لێکوژرا، نە کەسیشیان ئەشکەنجەدرا.

بەتێپەربونی رۆژ بەعسیەکان لە رێگەی یاریکردن بەدروشمەکانەوە لێهاتویی خۆیان سەلماند، بەوەی واقعێکی شەڕەنگیزی بدەنە پاڵ دیدوبۆچونە ئایدیۆلۆجیا گشتیەکەیانو هێرشێکی دڕندانەیان کردە سەر نوسینگەی کۆمپانیای کۆکاکۆلا لە عێراقو خاوەنو بەرێوەبەری کۆمپانیاکەیان دەستگیرکرد کە هەر دووکیان موسڵمان بوون. جگە لە ناوبانگی بەرهەمەکەیان، چ شتێك بوونی ئیمپریالیزم بەرجەستە دەکات! لەدوای چەند رۆژێك تەرمی شێواوی هەر دووکیان درایەوە بەخێزانەکانیان. چ چەمكو مانایەك لە قوم بەقومی بێگوناهی کۆکاکۆلا دەچێنرا کە لە ئایندەیەکی نزیکدا خۆماڵی دەکرا؟ کاتێك وڵات گیرۆدەی ئەوجۆرە سەرسامییە هاتبو، ترسو لەرزێکی قوڵیش یەخەی بە خەڵکی گرتبو، ئا لەو حاڵەتەدا یەهودییەکانی عێراقیش یەك یەكو دوو دوو، لەگەڵ وەزیر، کارخانەدار، ئەفسەر، رۆشنبیر، پزیشكو خاوەن پێشە ئازادەکان دەستگیر دەکرانو رەوانەی زیندان دەکران.

حکومەت لە ٩/ تشرینی یەکەم/ ١٩٦٨دا تۆڕێکی گەورەی سیخوریی زایۆنیستیان لە بەسرە ئاشکرا کرد. لە ئەنجامی ئەوەشدا حەڤدە یەهودیان بە فرۆکە بۆ سەربازگەیەکی بەغدا گواستەوە، پاشان بەمەبەستی لێپێچینەوە بۆ بنکەیەکی حیزبی گوێزرانەوە، پرۆسەی دەستگیرکردنیش تا مانگی تشرینی دوەم درێژەی کێشا. لە ٢٥ هەمان مانگدا تۆپخانەی عێراق لە ئوردن کەوتە تۆپبارانکردنی ئیسرائیل، بەڵام لە ٤/کانونی یەکەم/١٩٦٨دا فرۆکەکانی ئیسرائیل بۆردومانی ئەو یەکەیەیان کرد، ئەو بۆردومانەش ١٦ کوژراو ٣٠ برینداری لێکەوتەوە، هەر چەندە بەگوێرەی



دەنگوباسەکەیان زیانەکان زۆر لە ژمارەی راگەیەنراوی رەسمی زۆرتر بو. رۆژی دواتر لەرێگەی رێکخراوەکانی حیزبی بەعسەوە خۆپێشاندانێکی گەورە سازکراو لە گۆڕەپانی تەحریرەوە بەرەو کۆشکی سەرۆکایەتی بەرێ کەوتن. ئەو خۆپێشاندانەی تەرمی کوژراوەکانیان لەسەرشان بو، نزیکەی چل هەزار کەس دەبونو بەرپرسە حیزبیو حکومیو گروپێکی بچوکی چەکدارە فەڵەستینییەکانیش لەپێشەوەی خۆپێشاندەرەکانەوە بون. ئەحمەد حەسەن ئەلبەکریش گوتارێکی دوو سەعاتی خوێندەوە کە راستەوخۆ لە تەلەفزیۆنەوە پەخش دەکرا:

"رێك لەو کاتەدا کە روبەروی گوشارێکی زۆر دەبینەوەو سوپا پاڵەوانەکەمان روبەروی هێرشو پەلامار دەبێتەوە، لەناوخۆشدا روبەروی مشتێك لە خائینانی ستونی پێنجەمو پارێزەرانی ئەمەریکاو ئیسرائیل دەبینەوە، ئەوانە لەپشت ئەو ماسكو دروشمانەی میلەت بەرزیان دەکاتەوە خۆیان حەشارداوە، ئەو جوڵە گومانلێکراوانە ئەرکێك جێبەجێ دەکەن کە پێیان سپێردراوەو رۆڵی دیاریکراوی خۆیان لەپیلانی ئەمەریکادا ئەنجام دەدەن، ئەوانە گەرەکیانە بەکاری کوشتنو خراپەکاری لەپشت سەنگەرەکانی سوپای قارەمانەوە، ترسو دڵەراوکێ بچێنن، بۆ ئەوەی لە شەڕی چارەنوسساز لەگەڵ ئیسرائیلدا دوورمان بخەنەوە.

... ئێمە بە مشتێکی ئاسنین لەو پیلانگێڕانەو ستونی پێنجەم دەدەین، ئەوانەی بونەتە بوکەڵەیەك بەدەستی ئیمپریالیزمو زایۆنیزمەوە"[3].

بەکر پڕ بەگەرووی هاواریدەکرد "چیتان دەوێت؟"، وەڵامێکی بروسکەئاسا لەنێو حەشاماتەکەدا دەدرایەوە: "مردن بۆ بەکرێگیراوان، دەبێ سیخورانو بەکرێگیراوان بەبێ دواکەوتن لە قەنارە بدرێن".

لە ئێوارەی ١٤/ کانونی یەکەمدا تەلەفزیونی عێراقی چاوپێکەوتنێکی گەورە بەرپرسێکی لەگەڵ دوو موسڵماندا پێشاندا، ئەو دوو کەسە دوای ئەوەی دانیان بەتاوانەکانی خۆیاندا نا، کەوتنە گێڕانەوەی حەکایەتی چۆنێتی سیخوری کردنەکەیان (ئەو دانپیانانەش وای لەداواکاری گشتی کرد داوا لە دادگا بکات تاوانەکەیان لە

هەڵواسینەوە بۆ حوکمی هەتاهەتایی کەمبکاتەوە). سێ وڵاتی (ئیسرائیل، لوبنان‌و ئێران)، سەرۆکێکی پێشوی لوبنان بەناوی کەمیل شەمعون‌و سیاسەتمەدارێکی مەسیحی لوبنانی بەناوی هێنری فیرعەون، بەشداریان لەو پیلانە کردبو، هەروەها گواستنەوەی چەک‌و تەقەمەنی لەنێوان عێراق ـ ئێران‌و تەقاندنەوەی پردێك لە شاری بەسرە (زۆربەی خەڵکی پێیانوابو بەهۆی روداوی پێکدادانی دوو ماشینەوە ئەو پردە روخابو)، پلانی دی بۆ کردەوەی لەوجۆرە، مەشقپێکردنی یەهودییەکانی عێراق، لەلایەن سیخورە ئیسرائیلییەکانەوە لەناو خاکی ئێرانداو گواستنەوەی پارەیەکی زۆری ئیسرائیل بۆ کوردەکان لە رێگەی ئێران‌و بەهۆی یەهودو عێراقییەکانەوەو بەهاوکاری کۆمپانیای کەشتییەوانی پاکستانی‌و کۆمپانیای ئۆتۆمۆبیلی فۆردیش لە عێراق دەستی لەو پیلانەدا هەبوە، ئەوانە هەموی تاوانی ئەو دوو کەسە بون.

یەهودییەکانی عێراق لەسەرووی لیستی پیلانگێرانەکانەوە دانرابون، لەپاڵ چەند دەستەیەکی ناچیز لەو موسڵمان‌و مەسیحییانەی کە رۆڵێکی لاوەکیان وازیدەکرد، نەخشەسازی ئەو پیلانانەش بازرگانێکی یەهودی بەسرایی بو بەناوی نەجدی زلخا، کە لەرێگەی دەزگای بێسیمەوە لە کڵێسایەکەوە پەیوەندی بە ئیسرائیلەوە دەکرد. لە کۆی ئەو ١٧ یەهودییە بەکرێگیراوانەی دەستیگرکرابون، ١٣ کەسیان وەك یەکەمین دەستەی بەکرێگیراو لە ٥/کانونی دووەم/١٩٦٩دا، درانە دادگا. ئەو دادگاییەش لە هەر دوو دادگاییەکەی پێشتر دەچو: دادگای ئەلمەهداوی لەماوەی حوکمڕانی قاسمدا (١٩٥٨ ـ ١٩٦٠)و دادگاییکردنی فەهدو هاورێکانی لە حیزبی شیوعی عێراق (١٩٤٧ ـ ١٩٤٩). داڕوخانی لەسەرخۆیی چۆنێتی ئەم دادگا نمایشییانە بە ئاشکرا بەدیدەکرا.

ساڵی ١٩٤٧ لە سایەی رژێمی پاشایەتیدا تاوانبار دەیتوانی گاڵتە بەدەستەی داواکار بکات‌و خۆی بە رۆحی میلەت بگەیەنێت‌و دانیشتنەکانی دادبینی بگۆڕێت بەداواکاری لەدژی رژێم، بەو شێوەیەش حوکمی لە سێدارەدان بۆ حوکمی هەتاهەتایی بگۆڕێت، لەدوای ئەوەش بەدوو ساڵ فەهد لە زیندانی کوتەوە رێبەرایەتی



حیزبی شیوعی عێراقی دەکرد، ئەو زیندانەی کە ١٢٥ شیوعی لەخۆگرتبو، گۆڕا بە یانەیەکی گشتی گفتوگۆکردن. لەدوای خۆپیشاندانە مەزنەکەی ساڵی ١٩٤٨ دژی پەیماننامەی پۆرتسمۆس (پەیمانی عێراق ـ بریتانیا)، جارێکی دادگاییکرانەوەو حوکمی لەسێدارەدان بەسەر فەهدو دوو هاورێیدا درا، جەستەی هەڵواسراویشیان بۆ ماوەیەك لە بەغدای پایتەختدا هێڵرایەوە، لەو رۆژەشەوە حیزبی شیوعی عێراق، فەهدی کردوە بە سیمبولی شەهادەت[4].

زۆرێك لەسەر ئەو مانۆرو رێوشوێنە قێزەونانە نوسرا کە سەرۆکی دادگای گەل، کۆڵۆنێل (عقید) فازیل عەباس ئەلمەهداوی گرتبویەبەر، لەم دادگایەدا بەپێچەوانەی دادگاکانی رژێمی پاشایەتی، چیدی تاوانبار دەرفەتی ئەوەی پێنەدەدرا دادگا بکاتە شانۆی راگەیاندن‌و سود لە ئامادەبوانی دادگا وەربگرێت. ئامادەبوان بە گاڵتەجاری‌و سوکایەتییەکانی ئەلمەهداوی بە سەرانی رژێمی پێشو هۆرایان دەکێشاو هاتبونە جۆش‌و خرۆش، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا لەتوانادا بو کەسێکی وەك سەعید قەزاز، وەزیری ناوخۆی رژێمی پێشو، بەوپەڕی رەقییەوە بە سەرۆکی دادگا بڵێت: چاوەڕوانی ئەو رۆژە دەکات کە پەتی سێدارە لە گەردنیدا ببینێت، ئیدی بەهای راستەقینەی ئامادەبوان لە هۆڵی دادگادا دەرکەوت، بەوەی بەترسەوە لێیبڕوانن، کاتێك بەدەم گیان دەرچونەوە لەسەر پەتی سێدارەکەیدا لنگەفرتێی دەکرد. هیچ عێراقییەکی بەتەمەن ئەو وەڵامەی قەزازی لەنێو دادگادا بیرنەچۆتەوە.

بەپێچەوانەی ئەوەشەوە، راوێژکاری بەرگری ساڵی ١٩٦٩ لە یەکەم دانیشتنی دادگادا خۆی دەناسێنێت‌و پۆزش بۆ دەستەی دادگا دەهێنێتەوە بەوەی بەرگری لە خائنان دەکات‌و لە جیاتی ئەوەی بەرگری لە نوینەرگر (موکل)ەکانی بکات، دەیوت: "چاوی بەرایینادات خائنان بەبێ سزادان ببینێت"[5]. تاوانباران لەسەرەتای کردنەوەی دادگادا هێندە ئازایەتیان نواند کە بڵێن "بێتاوانین"، کەچی روبەروی پێکەنینی گاڵتەئامێزی رۆژنامەنوسانی ناو دادگا دەبونەوە. بەڵام ئەدای بەعسیەکان دوای هەفتەیەك گەیشتە چڵەپۆپە، بەوەی داواکاری گشتی روبەروی هەقیقەتێکی

حاشاهەڵنەگری کردنەوە، ئیدی یەك لەدوای یەك دانیان بەتاوانەکانی خۆیاندا نا، چونکە ویژدانیان رێگەی پێنەدەدان راستیەکان بشارنەوە.

فەهد لەدوای مردنی بوە سۆپەرمان، تەنانەت سەعید قەزازیش رێزو سۆزی گەلی بەلای خۆیدا راکێشا، بەڵام لەسایەی رژێمی بەعسدا (١٩٦٨) یەهودییە سیخورەکان لەسەر شانۆی بەعسدا وەك بوکەڵە رەفتاریان دەکرد، تەنانەت ئەمرۆ کەس ناویانی لەیادنەماوە، تا ئەوەی وەك فەهد ببن بە قارەمان، لەم ساتە وەختەوە قوربانیەکانی بەعس لەگومناویدا دەمرن.

ئەو پروپاگەندەیەی هاورێ بو لەگەڵ دادگا نمایشییەکانی کانونی دووەمی ١٩٦٩ی بەعسدا، بو بە مایەی ئەوەی میلەت وەك قەوارەیەکی سەربەخۆ لەسەر شانۆ کارکەنار بکرێ. چاپەمەنیو سەرجەم راگەیاندنەکانی دیکەش بەشێوەیەکی سەرشێتانە پشتگیریان لە توندوتیژی دەکرد. بەردەوام لە رادیۆوە داوا لە بەکرێگیراوەکانی ستونی پێنجەم دەکرا (بێئەوەی ناویان بهێنرێ)، خۆیان بەدەستەوە بدەن. ئۆتۆمۆبیلی بۆمبڕێژکراو لەجادەکانی بەغدا دەتەقینەوە، زۆرجاریش پێشئەوەی ئەو ئۆتۆمۆبیلانە بتەقنەوە ئاشکرا دەکران، رۆژ بەرۆژیش ژمارەی ئەو سیخورانەی دەکەوتنە داوەوە زیادیدەکرد.

سەرەتا خەڵکی عێراق بەرێزو جۆشو خرۆشێکی زۆرەوە تێکەڵاوی ئەو دونیا تازەیە بون، بەڵام بەتێپەربونی کات بەهۆی ئەو ترسە زۆرەی دڵو دەرونیانی داگیرکرد زیاتر خۆیان لەبەرامبەری دەپاراست. ژمارەی ئەو کەسانەی بۆ تەماشاکردنی لاشەی هەڵواسراوەکانی گۆڕەپانی تەحریر هاتبون بە ١٥٠ تا ٥٠٠ هەزار کەس دەخەمڵێنرا[6]، گوندنشینەکان لە هەمو لایەوە هاتبون تا تەماشای رێورەسمی لاشەی هەڵواسراوان بکەنو گوێ لە گوتارو ئۆرکسترا بگرن. ئەو دیمەنە لە پاڵ لاشەی هەڵواسراوەکاندا ماوەی ٢٤ کاتژمێری خایاند. ئەحمەد حەسەن ئەلبەکرو کۆمەڵێك گەورە بەرپرسی دی گوتارییان لە کەشوهەوایەکدا دەخوێندەوە کە زیاتر لە کەرنەڤاڵ دەچو. خەڵکی لەگەڵ سرود خوێندنو بەردەباران کردنی لاشەی هەڵواسراوەکاندا، گوێیان بۆ وتارە



پڕ جۆشو خرۆشەکەی سەڵاح عومەر ئەلعلی، وەزیری فێرکردنو ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دەگرت کە بەدەنگێکی گڕەوە گوتاری بۆ ئەو جەماوەرە دەخوێندەوە:

"ئەی گەلی عێراقی مەزن، عێراقی ئەمرۆ هیچ خائین یا سیخور یا بەکرێگیراوێك لە بەکرێگیراوەکانی تابوری پێنجەمی پێ قبول نیە! تۆ ئەی ئیسرائیلی حەرامزادە، ئەی ئەمریکاییە ئیمپریالیستەکان، ئەی زایۆنیزمەکان گوێ رادێرن! هەمو فروفێڵەکانتان ئاشکرا دەکەین، بەکرێگیراوەکانتان سزا دەدەین! گشت سیخورەکانتان، تەنانەت ئەگەر بەهەزاران کەسیش بن، لەسێدارەیان دەدەین! ئەی گەلی عێراقی مەزن! ئەمە تەنها سەرەتایەکە! گۆڕەپانەکانی عێراقی نەمرومەزن بەلاشەی خائینو سیخورەکان پڕدەبنەوە! تەنها چاوەڕوانی بکەنو ببینن!"[7].

سەڵاح عومەر ئەلعلی راستی دەکرد! ئەمە تەنها سەرەتا بو، دوای چەند ساڵێك پیلانو دادگاییکردنی سیخوران بوە کارێکی ئاسایی رۆژانە. ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر گوتار لەدوای گوتار رایدەگەیاند کە "دەستێکی پەنهان لەپشت ئەو هەمو تاوانانەوە هەیە"[8]، تەنها لە ساڵی ١٩٦٩دا لەسێدارەدانی رەسمی سیخورەکان (یا ئەو لەسێدارەدانانەی راگەیەنرا) لەم بەروارانەدا ئەنجامدراون: ٢٠ی شوبات، ١٤و ٣٠ی نیسان، ١٥ی ئایار، ٢١و ٢٥ی ئاب، ٨ی ئەیلولو ٢٦ی تشرینی دوەم. ئەمجارەیان زۆربەی قوربانییەکان موسڵمانو مەسیحی بونو جاربەجاریش بەمەبەستی رۆپۆشیو چەواشەکردن یەك دوو یەهودییان تێدەخست. بەکر لەمانگی شوباتدا لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا لەو رەوتە دەرچو،و جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە سیخورەکانی داهاتو هەمویان موسڵمانن. ئەوەش بەوپەڕی لێهاتوییەوە مانایەکی پێچەوانەی لەخۆدەگرت، بەهەر حاڵ تا ژمارەی گیراوەکان زیاتربوایە، ئەگەری ئەوەش دەکرا کە یەهودی تێوەگلێ، بۆیە لەدادگاییکردنی سەعید بەزازی سەرەك وەزیرانی پێشودا، لە کۆی ١٣ تاوانباردا دووانیان یەهودی بون. مادامەکی یەهود لە چینێکی کۆمەڵایەتی بێزارەوە گۆڕاوە بە گروپێکی ستونی پێنجەمو بەکرێگیراوی

زایۆنیزم، ئیدی بونی یەهودییەك یا دوو یەهودی لەنێو دەیان تاوانباری دی، ئەو ئامانجەی دەپێکا، بۆ نمونە بوونی دوو یەهودی لە دادگاییکردنی بەزازدا مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئەویش سیخوری ئیسرائیل بوە.

بەکر لە گوتارەکەی تەموزی ساڵی ١٩٦٩ یدا سەبارەت بە ستایشکردنی ستراتیجیەتی حیزبی بەعس لە لێدانو بنبڕکردنی پیلانەکان، زۆر روونو ئاشکرا قسەی دەکرد:

"تێکشکاندنی تۆڕە جاسوسیەکان مانای چینی شۆڕشگێری هەیە، چونکە پەیوەندییەکی ئۆرگانی لەنێوان جاسوسانو چینە سەرکوتکەرەکاندا هەیە (مەبەست لەو وشەیە بۆرجوازی، لیبرالەکانی لایەنگری رۆژئاوا، بیانیو کەرتی تایبەت بو)، هەروەها مانایەکی تاکتیکیشی هەیە کە لە چوارچێوەی ئەرکە رزگاریخوازەکانیدا مانا پەیدا دەکات. هەر پلانێك ببێتە مایەی سەرکەوتن بەسەر دوژمندا، پێویستە پاکتاوکردنی ئەو باندانەش لەبەرچاوبگرێ کە زانیاری بۆ دوژمن دەستەبەر دەکەن، هەروەها رۆڵی پروپاگەندەی بڵاوکردنەوەی شڵۆقیو بێئارامی بارودۆخەکەشیان پێدەسپێردرێ، پاشان لاوازکردنی ورەو ئیرادەی گەل لەسەر سەرکەوتن. ئەمەش دەبێتە مایەی ورەبەردانو خۆ ئامادەکردن بۆ شکستهێنان. کاتێك بەورەی بەرزەوە بڕیارماندا شەڕی ئەو تۆڕە جاسوسیانە بکەین، ئاگامان لەو هەمو شتانە هەبو، دەمانزانی لێدانی ئەو تۆڕانە پێویستە هاوڕێ بێت لەگەڵ هێرشو لێدانی بنکەی فیودالیو سەرمایەداری چەوسێنەردا تا نەتەوەو ئابورییەکەی لە چنگاڵی کونترۆڵی ئیمپریالیزم رزگاریان بێت"[9].

لە ٢١/ کانونی دووەم/ ١٩٧٠دا پیلانێکی تازە ئاشکراکرا[10]، چەند کاتژمێرێك دوای بڵاوکردنەوەی ئەو راگەیاندنە لە رادیۆی بەغداوە، لەسێدارەدان دەستی پێکرد، لە ماوەی کەمتر لە یەك هەفتە (٤٤) کەس لە سێدارەدران. ژمارەیەکی نادیار دەستگیرکرانو ماڵو موڵکێکی زۆریش دەستی بەسەرا گیرا. پیلانگێڕان بەوە تاوانبار دەکران کە کار بۆ بەرژەوەندی ئێران دەکەنو بەپارەو دەزگای پێشکەوتوی سیخوریو (١٣٠) تەن چەك هاوکاریانی کردوە، هەمو ئەو شتانەش زۆر بەوردی لە بەغدا نمایش



کران، پارچە چەك، سندوقی کەلوپەل، کاسێتو بەڵگەنامەکان لەپشتی شوشەوە دانرابون، ئەوانەش لەو بەڵگە کۆنکرێتیانە بون کە رژێم ئامادەی کردبون. هەڵبەتە لە روانگەیەکی دیاریکراوەوە نەدەتوانرا بوترێ کە هەمو شتانە قایلکەر نەبون، کەسیش نەیدەتوانی بوونی پیلان رەتبکاتەوە، بۆیە خۆپێشاندانو کۆڕو کۆبونەوەی گەورە بەرپا دەکران، بۆ ئەوەی بەهەمو لایەك رابگەیەنرێت کە شۆڕش قابیلی شکست نیە، لەهەمان کاتیشدا ئاخو حەسرەت بۆ ئەو دوو سەربازە دەکێشرا کە لە روبەرونەوەی پیلانگێڕاندا گیانیان لەدەست دابو. دانپیانانە تۆمارکراوەکانو وێنەی فۆتۆگرافی ئەنباری چەکەکان بەنێو خەڵکیدا دابەشکران، هەمو ئەو نامانەی بەدەست نوسرابون لەگەڵ جفرەو ئەو وردەکارییانەی زۆر پێویست نەبون، پێشان خەڵکی دەدران، ژنان پاکانەیان (بەرائەتیان) لە پیاوەکانیان دەکرد، بەچاوێکی زۆر سوكو قێزەون تەماشای پیلانگێڕان دەکرا. پیلانگێڕان بەرنامەی ئەوەیان داڕشتبو، گەر نەیانتوانی هەمو سەرانی بەعس بکوژن، ئەوا بەغداو سامەڕرا نوقمی ئاو دەکەن. بەعسییەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، بەر لە ساڵێك سی کەسی خۆیان لەنێو ریزی پیلانگێڕاندا چاندوە. رۆژنامەی ئەلئەنوار وردەکاری پیلانگێڕانو ئەو کۆبونەوەیەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی بڵاوکردەوە کە پێش سەعاتی سفری پیلانگێڕان بەستبویان بۆ ئەوەی ئاگایان لە جموجۆڵیان بێت. پیلانگێڕان بەدەستگیرکردنو روبەروکردنەوەیان بە بەڵگەی کۆنکرێتی ساڵێك بەدواداچون، دەمودەست دانیان بەتاوانەکانی خۆیاندا نا، ئیدی یەکسەر هێندێکیان گولەباران کرانو هێندێکی دییان لە سێدارەدران. لەنێو پیلانگێڕاندا لیستێکیش بەناوی وەزیرانو بەرپرسە حکومییەکانی ئاییندە ئاشکرا کرا، بەوەش دەستیان بەزۆرێك ناوی دی گەیشت کە بەڵگەی زۆرتری لێکەوتەوە، پرۆسەکە هەروەکو وێنایان کردبو بەوپەڕی وردبینییەوە بەڕێوەدەچو، تەنانەت هێندێك کەس بە مۆتەیەکی ترسناکی جارسکەریان دەچواند. سەدام حسێن لە وتەیەکیدا بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەم پیلانە راستەوخۆ دەگەڕێتەوە بۆ دوای شۆڕشی ١٩٥٨، بە مەبەستی گێڕانەوەی عێراق بۆ ژێر دەسەڵاتی ئیمپریالیزمی ئینگلو ئەمەریکا،

واته گێڕانەوەی حوکمی پاشایەتی. وردی کاتنانەوەکەشی بۆ لاوازکردنی تێکۆشان لە دژی ئیسرائیلو لەناوبردنی هەمو هەوڵێك بو کە بۆ بەئاشتی چارەسەرکردنی کێشەی کورد دەدرا.

راڤەکردنی وردەکاری هەمو پیلانو بەڵگەنامەکان بۆ گەل تا ساڵی ١٩٧٠ بەردەوام بو، بەڵام حیزبی بەعس ساڵی ١٩٧٤ لەگەڵ ئەو هەمو دڵڕەقییەیدا پەنای بۆ فێڵێکی دی برد، هەر لەو ساڵەدا ١٦٠ پیشەکار، بازرگان، ئەکادیمیو رۆشنبیریان بە تومەتی پەیوەندیان بە بەفراماسۆنیزمەوە (ماسۆنی) دەستگیرکرد. هەروەکو دەوترێ ئەو کەسانە ناویان لە سندوقی ئەمانەتدا پارێزرابو، ئەوانەی ساڵی ١٩٤٢ کۆڵۆنێل (چادویك) بۆ ماڵەکەی خۆی بانگهێشتی کردبون، خۆیشی لە ساڵی ١٩٥٨ەوە عێراقی بەجێ هێشتبو. دەسەڵاتداران دوای (١٥) ساڵ ئەو سندوقەیان کردەوەو دەستیان بەو ناوانە گەیشت. هێندێك لە دەستگیراوەکان لە ساڵانی یەکەمی حوکمی قاسمدا لەسەرکردایەتی حیزبی شیوعی بون، بەتەمەنترین قوربانیش تاوانباری سەرەکی بو کە ٩٢ ساڵ تەمەنی هەبو، ساڵی ١٩٠٨، واتە رێك دەیەیەك پێش داڕوخانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی پەیوەندی بە کۆمەڵەی فراماسیۆنیەوە کردبو[11]. هەوڵدان بۆ ئەوەی پەیوەندی لەنێوان ئەم پیلانەو هێزی دەرەکی بدۆزرێتەوە زۆر بەئاشکرا بوە مایەی لە دەستدانی ئەو ئامانجە سەرەکییەی کە بەعس بەدوایدا دەگەراو سەرلەبەری ئەو هەوڵەش بو بە گاڵتەجارییەکو خرایە پاڵ گاڵتەجارییەکانی دی رژێم، هێندێك جار حەکایەتەکان بە جۆرێك دادەرێژران کە لانیکەمی تەبایيو لۆجیکی تێیدا نەبو، دواجاریش جێ متمانەیی خۆیان لەدەستدا. بەهەر حاڵ وادەردەکەوێت تا بەعس لە لەناوبردنی نەیارە گریمانەییو خەیاڵییەکانیدا بەتواناتر بێت، جێ متمانەییەیان بەو کەسانەش کەمدەبێتەوە کە باوەڕییان بە حەکایەتە پیلانگێڕییەکان هەیە (تەنانەت بۆ خودی خۆشیان)، بۆ ئەوەی پارێزگاری لە چالاکی یا هێزی کاریگەریی خۆیان بکەن.

ماناو چەمکی نمایشی ئەو چوار مانگەی بەدەسەڵاتی حیزبی بەعس دەستی پێکردو لەگەڵ پرۆسەی لەسێدارەداندا لە کانونی دوەمی ١٩٦٩ گەیشتە چلەپۆپە، لە سێ خەسڵەتی سەرەکی بەعسەوە سەرچاوە دەگرێ:

یەکەم، ئەو دادگاییە نمایشیانە ئاگاداریو پێشەکی لەسێدارەدانی دی لەوجۆرە بون، کە دواتر گرنگیی سیاسیان دەردەکەوت، بەوشێوەیەش دەیانویست بە جەماوەری بسەلمێنن کە تێزو پیلانگێڕی ئیمپریالیزمو زایۆنیزم دژی کۆماری ئازادیخوازی عێراق تێزێکی هەستپێکراوو بەرجەستەیە، نەك وتەی ئەبستراکت. بۆیە رژێمی عەبدولکەریم قاسمو شیوعییەکان لە ساڵی ١٩٦٣دا لەبەر ئەو هۆیانە نەکوژران. تاریق عەزیز، ئەندامی سەرکردایەتی ئەنجومەنی شۆڕش، لە وتارێکیدا کە لەگەڵ روداوەکاندا دێتەوە لە ١٧/تەموز/١٩٧٢ لە رۆژنامەی ئەلسەورە دەنوسێت:

"با بەراشکاوی بدوێین، میلەت هەر لەساڵی ١٩٤٠ ەوە تا شۆڕشی ١٩٦٨ بەتاقیکردنەوە گەیشتبووە ئەوەی کە گومانی لە ورەو توانای هەر رژێمێك هەبێت، بتوانێت ئەو تۆڕە بەکرێگیراوانە لە رەگوریشەوە دەربهێنێت.

میلەت لەو باوەرەدا بو کە هەڵمەتێکی لەوجۆرە جگەلە خەیاڵ شتێکی دی نیەو سەرئەنجام بە سازشێك کۆتایی بەو مەسەلەیە دێت، هەروەها میلەت پێیوابو کە چاوی ئەو تۆڕە جاسیوسیانە گەیشتۆتە بەرزترین پلەوپایەی حکومەتی عێراقی، بۆیە شۆڕش بڕیاریدا بێبەزەییانە ئەو تۆڕانە بهاڕێتو گومانلێکراوانیش لە گۆڕەپانە گشتییەکاندا لەقەنارە بدات. کەس پێیوانەبێت ئەو سەدان هەزار مرۆڤەی تەماشای لاشەی ئەو هەڵواسراوەکانیان دەکرد، خەڵکانێکی بەربەریو ناشارستانین، چونکە ئەوە هەم ناڕەوایە، هەم سەرنجێکی نادروستیشە. ئەو روداوە پەیکەری متمانەی شۆڕش بو لە گرنگترین گۆڕەپانی بەغدا دانرا تا بە بەڵگەوە بە میلەت بڵێت ئەوەی ئەستەم بو، ئێستا بوە بە راستییەکو خۆی دەدوێ"[12].

خەسڵەتی دوەم، ئەڵقەی کانونی دوەمی ساڵی ١٩٦٩، بەشێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەستی بەئاشکرا کردنی هەوڵی کودەتا (واقعی یا خەیاڵی) یا لەناوبردنی نێوەندی هێزە ئەلتەرناتیڤەکانی دەوڵەتەوە نەبو (پاکتاوکردنی سەربازو ئەندامانی حیزب)،

بەڵکو لەسەرووی ئەوەشەوە، لەدادگاییکردنی دوا پیلان زۆر تۆکمەتر بو. لەم بوارەدا دەکرێ دادگاییەکانی کانونی دوەمی ساڵی ١٩٦٩ی عێراق لەگەڵ دادگاییکردنەکانی مۆسکۆی سییەکاندا بەراورد بکرێ. لە واقیعدا ئەو دادگاییانە نمایشێکی دی هێزبون، هێزێك کە تاوانباران لەبەرامبەر رێبەرێکی بەتوانادا دان بەهەمو شتێکدا دەنێن. دادگاییەکانی ساڵی ١٩٣٦ ـ ١٩٣٨ سەرەتا تەنها دەیان کەسی پاسەوانە دێرینەکانی بۆلشەفیزمی گرتەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەوە لوتکەی چیایەکی مەزنی سەهوڵبەندانی تیرۆر بو کە بەملیۆنان مرۆڤی لە دەزگاکانی دەوڵەتو کۆمەڵگەی مەدەنی گرتەوە. کەچی قوربانییەکانی بەعس تائێستا نەناسراون، بەڵام بەدڵنیاییەوە ژمارەیان بەئەندازەی قوربانیەکانی دادگاییەکانی مۆسکۆ نیە.

خەسڵەتی سێیەمی دادگای نمایشی ساڵی ١٩٦٩، ئەوەیە کە لەگەڵ دادگا هاوشێوەکەی لە دەیەی ١٩٣٠ی سۆڤێتدا جیاوازی هەبو. لەسێدارەدانەکانی کانونی دوەمی ١٩٦٩ تەنها ژمارەیەکی کەمی لە قوربانیەکان گرتەوە، بەڵام رێگەدان بەژمارەیەکی زۆری خەڵکی بۆ ئەوەی بەشداری لە رێورەسمی لەسێدارەدانەکان بکەن، شەرعییەتی بەحیزبی بەعسی عێراق دەبەخشی. ئەو رەوایەتییەش بۆ حیزبی بەعس زۆر پێویست بو کە لە رێگەی ئەو شۆڕشەی بڕوای پێی هەبو بە دەسەڵات نەگەیشتبو. لە پرۆسەی هەڵواسینەکانی ساڵی ١٩٦٩دا چڕی بەشداربوونی جەماوەر لە مەیدانی ئازادی لە بەغداو پەرچەکرداری دەستەهەستو بەرجەستەیان لەسەر جادەکان کارێکی بەڵگەنەویست بو، بەڵام لە دادگاییەکانی مۆسکۆی دەیەی سییەکاندا، پاشماوەی گروپی دروستکاری (صناع) راستەقینەی شۆڕشی ساڵی ١٩١٧ روسیا، روبەروی پاکتاوکردن بونەوە. ئەو دادگاییکردنانە ئەوەندە بەوردیو هێمنی بەرنامەرێژی بۆ کرابو، شتێکی هەرەمەکی لەو کردەوانەدا بەرچاو نەدەکەوت. ئەو گروپەی ستالین دادگایی دەکردن پێکەوە لەحیزبی بۆلشەفیك کاریاندەکردو رێبەرایەتی شۆڕشیان دەکرد، بەڵام قوربانیو تاوانبارانی بەعسی عێراق لە ساڵی ١٩٦٩دا خەڵکانی نێوان حیزبو جەماوەر بون (دواتر پاکتاوکردنەکانی نێو حیزب



ئەنجام دران). لە عێراق مامەڵەکردن لەگەڵ یەهوددا وەك توێژێکی بێزراوی پەراوێزکراو کارێکی بەڵگەنەویست بو، بۆیە دەوڵەت پێویستی بەسەلماندنی ئەم مەسەلەیە نەبو، بەڵکو دەیویست بۆ سەلماندنی مەسەلەیەکی گەورەتر سودی لێوەرگرێت، ئەویش بەعس "لەپێناوی بەرژەوەندی جەماوەر" کاردەکاتو هەمیشە پاسەوانی لە ئەمنییەتیان دەکات.

جیهانی دیار (الظاهر) بۆ هەر دوو رژێمی ستالینیو بەعسی جگە لە ماسکێك بۆ حەقیقەتێکی مێژوویی قوڵتر شتێکی دی نەبو (لەدیدی حیزبی بەعسەوە، ئەو حەقیقەتە مێژووییانە ئیمپریالیزم، زایۆنیزمو یەکێتی عەرەبی بوون) کە تەنها بەرووکەش جیاوازنو پەیوەندییان پێکەوە نیە[13]. داڕوخانو داوەشانی ئەو جیهانەی واقیعی تێیدا دەبینرێو دەبیسترێ یا هەستی پێدەکرێ، لەبەرامبەر بەو جیهانەی زەین بە شیتەڵکاری دروستی دەکات، بەشێکە لە پێکهاتەو سروشتە دەروونییەکەی، تەنانەت پێشئەوەی گەمەکاران نمایشی بکەن، ئەم واقیعیەتە دیارو ناسراو بوە. دانپیانانو دادگا نمایشییەکانیش جەخت لەسەر هەقیقەتێك دەکەنەوە کە پێشو دوای ئەزمونکردن، سەلمێنرابون.

دڵسۆزیو پەرۆشیو نەزمی بیروباوەری ئەندامانی حیزبی بەعسی عێراق، تەنها لەگەڵ کۆدەنگییەکی هاوبەشی راستەقینە بەراورد دەکرێ کە حیزبی بەعس لە کۆتایی شەستەکاندا پشتی پێدەبەست. تەنها لەسەر بنەمای ئەو کۆدەنگییە، ئیدی چ لەسەر ئاستی حیزب (یەکێتی سۆڤێت)، چ لەسەر ئاستی سەرجەم کۆمەڵگە (عێراق) بێت، دەکرێ دادگای لەوجۆرە لە کردەوە دزێوەکانیدا سەرکەوتو بێت. ئەندامانی حیزبی بەعس بەپەرۆشەوە لەو باوەڕەدابون کە پێویستە "شەوو رۆژ بە تفەنگەکانی دەستیانەوە ئامادەبن بۆ ئەوەی دژی هەر پیلانێك بەرگری لە شۆڕشو حیزب بکەن"[14]، لە راستیدا خەڵکی ئاسایی عێراق لەو رۆژگارەدا پێیانوابو دەوڵەت تۆڕێك بەکرێگیراوی بیانی ئاشکرا کردوە. هەر چۆنێك بێت ئیمپریالیزمو زایۆنیزم، بەپێی سروشتی خۆیان، دەبێ سیخوریان هەبێت، ئەگەر هەمو یەهودییەکانی عێراق سیخوریان نەبن، ئەوا بەدڵنیاییەوە هێندێکیان تاوانبارن، کەواتە گەر نەتوانرێت قاییل

بکرێــن دان بەتاوانەکانیاندا بنێن، ئەوا کارێکی ئاســاییە گریمانــەی ئەوە بکەین کە پیادەکردنی یاسا، بەئاوێتەکردنی لەگەڵ ئەو یاسایەی گرنگییەکی مێژوویی هەیە، کە پیادەکردنی ئەو یاســایەی لەلایەن خەڵکانی مامناوەنــدی کۆمەڵگەوە قبوڵ دەکرێ، خزمەت بە رەوتی عەدالەت دەکات.

لەهەمان دەسپێکەوە ناکۆکی رووکەشی ئەم یا ئەو کارە هەندەکییە لەگەڵ ئەوەی کــە حیزبــی بەعس لەمەڕ گوناهــی تاوانبــارانو تێڕامانی نمایشــەکانەوە دەیوت، بە بێدەنگی هەڵدەبژێردرا. حەقیقەت لە رژێمی بەعسدا لە حەسارێك دەچو کە گەواهیە هەستییەکان توانای ئەوەیان نەبو هێرشو پەلاماری بدەن. نمایشەکانی کانونی دووەمی ١٩٦٩ هیــچ دەردە دڵییەکی گشــتی بۆ قوربانیــەکان لەگەڵدا خۆیــدا نەهێنا. بەڵام ناشــبێت وێنای ئــەوە بکرێ کە بیروباوەڕی گشــتی خەڵکی عێراق هــاوڕای ئەنتی یەهودییەت بو، لەبەرامبەر ئەوجۆرە لە سێدارەدانەشــدا هیچ پەرچەکردارێکی نیشــان نەدا. بەپێچەوانەوە پێویســتە بڵێین کە لە عێراقــدا بیروباوەڕی ئەنتی یەهودی هەرگیز بوونــی نەبــو. ئەو رەفتــارەی خەڵکیش نیشــانەی ئەوەبو کە کۆمەڵگــەی عێراقی تا چ ئەندازەیەك گۆڕانکاری بەســەردا هاتبو. لــەم وڵاتەدا کۆمەڵگەی مەدەنیو عەقڵی دروست لە حاڵەتی داڕوخانو گیانەڵا بو، بەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی جێگەی خۆی بۆ گەشــەکردنی مەزنی حیزبی بەعسو دەوڵەتی بەعس چۆڵکردو عەقڵی دروســتیش پێگەی خۆی بە ئایدیۆلۆجیای بەعس بەخشی.

سەرەڕای پروپاگەندەی ئەو ساتەوەختە، کەچی دادگا نمایشییەکانی کانونی دووەمی ١٩٦٩، بەتەواوەتی چانسی خۆی لەو کتێبگەلە تازەیە وەرنەگرت کە لە ئەوروپا لەسەر عێراقی نوێ بەچاپدەگەیەنرا، بەدڵنیاییشــەوە هیــچ کەس رەوایەتی حکومەتی حیزبی بەعســی لــە دەورەی دوای کودەتاکەی ســاڵی ١٩٦٨ەوە بۆ ئــەو رووداوە پڕبایەخانە نەدەگێرایەوە. بەڵام ئەگەر یەکێك بیەوێت لە روانگەی ســتەمو توندوتیژییەوە بڕوانێتە حیزبی بەعس کە ببو بە سیفەتێکی لکێنراوی بەعس، ئەوا نمایشەکانی کانونی دووەمی ســاڵی ١٩٦٩ ئەو بارودۆخە بێوێنەییەی پەیداکرد. سەبارەت بەدیدوبۆچونی من، ئەو



نمایشو دیمەنانە بەشدارییەکی مەزنی لە خوڵقاندنی جۆرە ترسێکی تایبەت کرد، ئەو ترســەی کە (ماکس ســاودای)ی روبەروی بوەوە، ترسێك کە بەقوڵیو بەشێوەیەکی جیــاکار بنچــی بە هێزو توانــای رژێمی بەعســەوە داکوتابو، ترســێك دوای ئەوەی مەسەلەی یەهود لە خەیاڵدانی خەڵکیدا فەرامۆشکرا، رۆژ بەرۆژ گەشەیدەکرد.

## جۆرێکی تازەی ترس:

دادگا نمایشــییەکانی کانونــی دووەمی ١٩٦٩ لەگــەڵ دادگاییەکانی دوای خۆی جیاوازییەکی گەورەی هەبو، چونکە جەماوەرێکی زۆر لە دادگاو سێدارەکانی دواتر بەشــدارییان نەدەکرد. لەراســتیدا کاتێك لە ٢٠ی شوباتی هەمان ساڵدا شەش موســڵمانو دوو مەســیحی لەپێش چــاوی خەڵکیدا هەڵواســران، ترســێك لەناخی تەماشــاکاران ـ هــەر چەندە ژمارەیــان کەمتر بو ـ چەکەرەی کرد. تــرس بۆ قوڵایی ناخی جەماوەر شــۆڕبوەوەو لەبەرامبەر ئەوەشــدا، پاشەکشــێو دڵەڕاوکێو دوودڵیو بەدگومانیو ترســێکی بەرفرە جێگەی بەشداری جەماوەری لەو رێورەسمە نمایشیانە گرتەوە، کە ئەوەش لە تایبەتمەندییە باوەکانی سایکۆلۆجیای جەماوەر بو.

بەڵام بەهەر حاڵ، بەپلەی یەکەم جەماوەر بوە هۆی ئەوەی ترس تا ئەو ئاستە باڵا بکات، هەڵبەتە ئەگەر چەند خۆپیشــاندانێکی بچوك لە ساڵانی ١٩٦٧ ـ ١٩٧٠دا بە بەڵگەی پشتیوانی جەماوەر بژمێردرێت، ئەوا ئەو هێزی پشتیوانییە، هێزێکی لاوازو روو لەنەمان بو. بەڵام دڵخوازی جەماوەر لەگەڵ رژێمو بەشدارییان لە یەکەمین دادگاییو لەســێدارەدانی نمایشیدا ئەوەندە گەورە بو کە رژێم بۆ چەندین ساڵ لەسەری دەژیاو هەمان پێشتوانیشی بۆ گەشەکردنی دێوئاسای دەزگا حیزبیو حکومییەکان قۆستەوە. رەوشــی بــە دەوڵەتبونی کۆمەڵگــەی عراقی لە دوای ســاڵی ١٩٦٨ەوە بەپێچەوانەی جیهانی ســێیەمەوە، لەرێگەی تێوەگلانی میلەت لەو تیرۆرو ستەمەی بەعس پەیڕەوی دەکــردو لــە رێگەی هاندانو ترســاندنیانەوە گەشــەی دەکرد بۆ ئــەوەی پەیوەندی

بەریزەکانی پۆلیسی نهێنیو سوپاو هێزی میلیشیاوە بکەن، بۆیە دەکرێ تەنها لەم دیدەوە لە گەورەیی رۆڵی ترس لە عێراق تێبگەین.

کاتێك جەماوەر چالاکانە گیرۆدەی ئەم کێشەیە بو، کە لە جیهانبینی تاكو کۆیدا، نە تەنها کۆمەڵێك هەڵگۆزینی مایەپۆچی بێناوەرۆکی (لەبابەت ئیمپریالیزم، زایۆنیزمو کۆنەپەرستیی عەرەب)، بەڵکو"فۆرم"ی کاریکاتۆرئاسای ئەو هەڵگۆزینانەشی وەك هۆکاری هەمو بەدبەختیەك قبوڵ کرد، ئیدی هیچ جیاوازییەکی لەنێوان راستو درۆ هەستپێکراوو ئەزمونکراوەکانی خۆیشی لەبەرچاو نەدەگرت. تا ئەو کاتەش کۆمەڵگە وەك گشتێك تەماشادەکرا کە لە بەشی جوداجودا پێکهاتبێت، بەڵام هەنوکە وەك یەکپارچە تەماشا دەکرێ کە هیچ کەس مافی ئەوەی نیە قسە لەسەر جودایی بکات. ترسو تۆقاندنیش لە هەمان روانگەوە داوی خۆی لە هەمو سوچێکی کۆمەڵگە دەنایەوە.

بۆ نمونە گەر دادگای نمایشی ساڵی ١٩٦٩ بە دیمەنێکی دی رژێمی بەعس، لە ساڵی ١٩٦٣دا بەراورد بکەین. ساڵی ١٩٦٣ کاتێك بەعس بۆ یەکەمین جار بەدەسەڵات گەیشت، دەیویست بەو نمایشەی ناوو ناوبانگی سەرۆك عەبدول کەریم قاسمی کوژراو لەنێو بەشێك لە شیعەکانی بەغدا بسڕێتەوە. لە هەفتەی یەکەمی کودەتای بەعسیەکانەوە خەڵکی ناوچەی ئەلسەورە لە دڕندانەترینو خوێناویترین نەبەردی سەرجادە لە مێژووی عێراقدا، روبەروی سوپاو میلیشیاکانی بەعس بونەوە. شیعەکان باوەڕیان نەدەکرد کودەتا بەسەر قاسمدا کراوە، چونکە پێیانوابو عەبدول کەریم قاسم، وەك مەهدی مونتەزەر دەردەکەوێتەوە تا دژی شۆڕشی چەواشە رێبەرایەتی جەماوەر بکات[15].

بەعس لەو دەمەدا کە رادیکاڵترین دەستەی ناو حیزب رێبەرایەتی دەکرد، لەرێگەی پێشاندانی جەستەی تیربارانکراوی عەبدولکەریم قاسمەوە مامەڵەی لەگەڵ ئەو خەیاڵە پڕ لەسۆزە دەکرد. بەدرێژایی چەندین شەو جەستە بەگوللە کونکراوەکەی لە تەلەفزیۆنەوە نمایشدەکراو شەو لە دوای شەویش لە گەیاندنی ئەو پەیامە پڕ ترسەیدا



سەرکەوتوتر دەبون. ئەو سەربازەی لە ستۆدیۆ جەستەی قاسمی ئەمدیوو ئەودیو دەکرد دەیویست بە بینەرانی پیشان بدات کە بەراستی قاسم مردوە. کامێرای تەلەفزیۆنەکە دەسوڕایەوەو لەسەر وێرانەی وەزارەتی بەرگری دەگیرسایەوە کە دوا بنکە بو بەرگری لە قاسم دەکرد. پاشان جارێکی دی کامێراکە دەسورایەوە وێنەی شێواوی هاوکارانی قاسمی (فازیل مەهداوی، وەسفی تایەرو خەڵکانی دی) پێشانی بینەران دەدا، ئنجا دەگەڕایەوە بۆ ستۆدیۆو دەچوە سەر جەستە کونکونکراوەکەی قاسم. ئەو دیمەنی ترسو مەرگبارانە لە هەوەڵەوە تا کۆتایی بەشێوەی یادەوەری لە یادنەچو لە زەینی بینەراندا دەچەسپی. سەربازی ناو ستۆدیۆکە لە جەستەی قاسم نزیك دەبوەوەو مووی سەری بەدەست دەگرتو سەرە شۆڕبووەکەی بەرزدەکردەوەو تادەمی دەیگرت تفی لێدەکرد.

بەعسیەکان بەم دیمەنەو دیمەنەکانی دی دەیانویست بەشێوەیەکی راستەوخۆ ترس، کە ئاستی دڵڕەقی بەسۆیی روونو ئاشکرا بو، بە خەڵکی بگەیەنن. پەیامی بەعسیەکان پەیامێکی کۆنو گەلێك سادەبو: قاسم مردو دەبێ باوەڕ بکەن. ئێمە دەتوانین هەمان شتیش بەسەر ئێوەدا بهێنین. جیاوازی ئەم پەیامە لەگەڵ پەیامە وێکچوەکانی رابردو لەوەدابو کە بەوێنەوە لە رێگەی تەلەفزیۆنەوە دەگەیەنرایە شوێنە دوور دەستەکان، ئەگینا ناوەرۆکی پەیامەکە هەمان پەیام بو. ئەمجۆرە ترسە هێزێکی سیاسی مەزنیی لەپشتەوە بو کە هەرگیز ناتوانرێ بەکەم وەربگیرێ. بەڵام ئەگەر لەم ئاستەدا بوەستێت، ئیدی دەبێتە پەیامێکی رووکەشو راگوزەر. بەعسیەکان لەدوای نۆ مانگ خرانە دەرەوەی دەسەڵات، لەبەر ئەوەی خەڵکی لە دژی زیادڕەوەییەکانیان وەستانەوەو ئەو جەماوەرە بەرفراوانەش لێیان تەکینەوە کە لەدوا ساڵەکانی حوکمی قاسمدا بەعس بەلای خۆیدا رایکێشابو.

بەڵام بەعسیەکان ساڵی ١٩٦٩ لە گۆشەنیگایەکی دییەوە تەماشای ترسیان دەکرد، بە بۆچونی ئەوان ترسو تیرۆر لە ساڵی ١٩٦٣دا ناکامڵ بو، بۆیە بەخراپی مامەڵەی لەتەکدا کرا، بەڵام لە دەورەی دوەمی دەسەڵاتیاندا بە لێهاتوییەوە سودیان لە ئەزمونو

ناکامییەکانی دەورەی یەکەم وەرگرت. خەڵکی گۆڕانکاریان بەسەردا هاتبو، بەگشتی
جۆرێك لە بێزاریو کەمتەرخەمیان بەرامبەر بەسیاسەت پەیداکردبو، لەوەش گرنگتر
دیدی کۆمەڵگە دەربارەی واقیعەتی خۆیشی سەبارەت بەدەیەی پێشو گۆڕانکاری
ئاشکرای بەخۆیەوە بینیبو. لێرەدا پێویستە سەرکەوتنی بەعسیەکان لە ساڵی ١٩٦٨و
قۆناغەکانی دواتردا بۆ ئەم گۆڕانە بگێڕینەوە.

کاتێك ساڵی ١٩٥٨ دوای بەدوای کەوتنی رژێمی پاشایەتی خەڵکی بەخۆشیو
شادییەوە رژانە سەر جادەکان، زۆر بە رەمەکی دروشمی یەکێتیو هاوبەشی کوردو
عەرەبیان لەخاکی نیشتمان بەرزکردەوە، شەقامەکانی بەغداش بەو دروشمو وێنانە
رازانەوە کە جەختی لەسەر ئەو دیدە دەکردەوە. هەمو بەو فرە رەنگییە شادو دڵخۆش
بونو ئاهەنگیان دەگێڕا. لەو سەردەمەدا کورد رۆڵێکی ئەوتۆیان لە سیاسەتی عێراق
نەدەگێڕاو بەدڵنیاییشەوە کاریگەریان لەنێو ئەفسەرانی ئازادیخوازیشدا نەبو، کە جگە
لە قاسم هەمویان دیدی عەرەبگەرایان هەبو. هونەرمەندی عێراقی جەواد سەلیم،
لە دروستکردنی ئارمێکی نوێی دەوڵەتی کۆماری عێراقدا بەهرەی لە هەمان هەستی
یەکێتی باوی کۆمەڵایەتیەوە وەردەگرت. لەجیاتی هەڵۆو تفەنگ کە بوە نیشانەی
دەورەی دواتری یەکێتی عەرەبی، رەنگی جیاوازی درەوشاوەو سیمبولی ئەبستراکت
بوە رەگەزی پێکهێنەری عێراق، واتە رۆژو زەوی بۆ کشتوکاڵو پیشەسازی، رەگەزی
کوردو عەرەب بوە نیشانەی عێراق.

هەمو ئەو شتانە لە دەیەی دواتردا لەنێوچون، لەو رۆژگارەدا کەس نەیدەتوانی بیر
لە باڵاکردنی شەڕی بەعسییەکان لەدژی کورد بکاتەوەو ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٨دا
بە چ درندایەتییەك کوردیان دەکوشت، بەبێ پاڵپشتی جەماوەر لەتوانادا نەبو.
بەعسییەکان نەك هەر کوردیان بە "شەریك"ی نیشتمان نەدەزانی، بەڵکو بەخۆفرۆشو
بەکرێگیراوی ئاژانسی هەواڵگری ئەمریکاو ئیسرائیلو ئێرانیان لەقەڵەم دەدا. تەنانەت
ئەو دەربەستبونەی رژێم لە ئازاری ١٩٧٠دا بەرامبەر بەکورد هەیبو، هێدی هێدی
لێی دوور دەکەوتەوەو تێگەیشتنی غەریزەیی هاوڵاتییەکی ئاساییش ئەوەبو کە بەعس



بەپەرۆش نیە رێز لە رێکەوتننامەی ئازار، تایبەت بە ئۆتۆنۆمی کورد، بگرێت، رژێم
دەیویست لەرێگەی حیزبو جەماوەرەوە ئەو رێکەوتننامەیە پوچەڵ بکاتەوە کە لە
نیوەی دوەمی دەیەی حەفتاکاندا ئامرازێکی گوێرایەڵ بون بەدەستییەوە.

بەکوردیو بەکورتی، جەماوەر لەساڵانی ١٩٥٨ تا ١٩٦٨دا خەسڵەتی باوەڕ
بەخۆبونی لەدەستداو بۆشاییەکی ئەخلاقی جێگەی گرتەوە، چونکە جەماوەر تەواوی
ئەو زانستە رەمەکیەی لەسەر خودی خۆی لەماوەی چەند دەیەی دوای سەربەخۆیی
لە پرۆسەیەکی لەسەرخۆیی سیاسیدا بەدەستی هێنابو، یا لەدەستی چو، یا بوە مایەی
پرسیار. چیدی "حەقیقەتیان" شتێك نەبو قبوڵ بکرێو بوە یا دەیانویست بەشتێکی
دی بگۆڕێت. ئەوەی کە هەمو کەسێك شایستەی سزادان بێتو دەستی رژێم تا
دوا ئەندازە لە سزادانی خەڵکی ئاواڵە بێت، ترسی خستە ناخی کۆمەڵگەوە. ئەم
ترسە هێزێکی نائاساییو گونجاوی بۆ رژێم دروستکردو بو بە مایەی یەکانگیریو
مکۆمکردنی. بەعس ئاگاداری ئەو راستیە بو، بۆیە زۆر بەگەرمی قۆستییەوەو لە عێراقدا
پیادەی دەکرد. هێدی هێدیو لەماوەی چەندین ساڵدا بەعس توانی جێگەی ئەمجۆرە
ترسە تازەیە لەنێوەندی هەلومەرجی عێراقی نوێدا بکاتەوەو بەردەوامیو پایەداری رژێمی
بەعسیش لەسەر هەمان ترسی جەماوەر خۆی راگرتبو. هاتنەسەر حوکمی ئەمجۆرە
رژێمانەو مانەوەیان پەیوەستە بەهێزو توانای کپکردنی گواستنەوەی حەیکایەتو
هەواڵەکان. ئەوەی زۆر گرنگو پڕبایەخ بێت، ئەوەیە کە دەماودەم کردنی حەکایەتە
سەرزارەکییەکان یا گواستنەوەیان لە رێگەی چاپەمەنی یا رۆژنامەوانی یا ئامرازەکانی
راگەیاندنەوە تاکە شێوازە کە مانایەك بە چالاکیە سیاسییەکان دەبەخشێت. بێگومان
هەمو کەسێك حەکایەتەکان بەوجۆرە دەگێڕێتەوە کە خۆی بینیویەتی، بەڵام بەبێ
گێڕانەوەی ئەو حەکایەتە جیاوازانەی دەوروبەری روداوەکە، ئەو حەکایەتە توانای
مانەوەو پایەداری نابێتو نابێت بەشێك لە کۆیادەوەریدا. ئەمەش بواری سیاسەت
(بواری کاروباری گشتی) بۆ نمونە لە کاری هونەری داهێنەرانە یا داهێنانێکی
فیکری جیادەکاتەوە، چونکە لە بواری هونەرو فیکردا، هەر داهێنانێکی هونەری یا

فیکری دەبێتە خاوەن مانایەك کە ئەو مانایەش لە کاروباری تایبەتیو تاکەکەسیدا لە داهێنەرەکەی جودا دەبێتەوە.

لە جیهانی بەعسدا گێڕانەوەی هەواڵو حەکایەتەکان لە هەمو بوارەکانی ژیاندا، "شیکردنەوەی"پڕ لەدرۆ، جێگەی ئەنگیزە گرنگەکانی مرۆڤ دەگرێتەوە. کەسێك کە لە دەرەوەی ئەو جیهانە بێت، ئەم چەمکەی بەعس لە بواری گشتیدا شەرمەزار دەکات، چونکە بڕوای بە ناکاریگەریبونی هەیە. ئەو کەسەی لەدەرەوەی جیهانی بەعسە، ناتوانێت ئەو هەلومەرجە هەرسبکات کە بەیاننەکردنی هەواڵو حەکایەتەکان دەربارەی کاروباری گشتی بەتەواوەتی لە ترسی خەڵکییەوە سەرچاوە دەگرێ. لە کۆتایی حەفتاکاندا لە عێراقی بەعسزەدە، گفتوگۆی سیاسیو ئاخاوتن لەسەر کاروباری گشتی ـ کە سەردەمانێك وێردی سەرەکی هەمو بۆردو ئەنجومەنێك بو ـ بەتەواوەتی پێوار (بزر) بو. بەڵام ئەو عەقڵانەی هەستیارتربونو سەرباری ئەو گوشارە مەزنەی سەریان، هەر پەیوەندیان بە بەعسەوە نەکرد، لە هەمو چالاکییەکی سیاسی دوورخرانەوە. ئەو جۆرە چالاکییانە بەکاری قێزەونو سوك لە قەڵەم دەدران. ئەو وڵاتو کۆمەڵگە سیاسییەی دەڵێت "هەمو شتێك سیاسییە" ئەمڕۆ لە خەڵکانێك پێکهاتوە کە هەمویان ناسیاسی بون. ئەم گۆڕانە قوڵە فیکریو فرە ئاراستانە لە ماوەی چەند ساڵێکدا رویاندا. دەرئەنجام میلەتێکی هەستیارو زیانلێکەوتو پەیدابو کە نەیدەتوانی "بیر" لە خۆی بکاتەوە، یا کاتێك لەگەڵ خۆیدا دەبو، شتێك لە ئەزمونەکانی خۆیەوە هەڵگۆزێت، ئیدی بوە نیچیرێك کە زۆر بەئاسانی بڕوای بەدرۆگەلێك دەکرد کە لە قوتوی هیچ عەتارێکدا نەبو.

دەکرێ لەرێگەی تۆڕێکی پانو پۆڕی هەواڵگرەکانەوە رێگە لە گواستنەوەی حەکایەتەکان بگیرێ، کە گرنگترین کاری دەست نیشانکردنی کەسانی شەڕەنگێزو خراپەکار نیە، بەڵکو دەبێ ترس لەنێو زۆرترین ژمارەی خەڵکیدا بڵاوبکاتەوە، هەروەها سەرکەوتنی ئەو تۆڕەش لەوەدایە کۆمەڵگە ئامادە بکات کردەوەکانی پۆلیس لەسەر خۆی پیادە بکات. هەواڵگر کێیە؟ لەعێراقی بەعسدا هەمو کەسێك هەواڵگرە، هەمو



ئەندامانی حیزبو لایەنگرە رێکخراوەکانی کە ساڵی ١٩٧٦ ژمارەیان دەگەیشتە نیو ملیۆن کەسو ساڵی ١٩٨٠یش ژمارەیان گەیشتە یەك ملیۆن کەس هەواڵگربون. ئەوانە لەو هەواڵگرانە نەبون کە بەرێکەوت هەواڵێکیان دەست دەکەوێتو بەرامبەر بە بڕێك پارە بە حکومەتی بدەن، ئەوانە خەڵکانێکی رێکخراونو پێویستە خەبەر لە هەمو کەسێك بدەن، تەنانەت سیخوری بەسەر بەئەندامانی حیزبی بەعسیشەوە دەکەن.

هەمو ئەندامانی یەکێتی قوتابیانی عێراقو ئەوانەی لەماوەی دە ساڵی رابردودا لەلایەن حکومەتەوە نێردرابونە دەرەوە، بەشێوەیەك لە شێوەکان هەواڵگرو جاسوس بون (واتە هەمو ئەوانەی لە دەرەوە دەیانخوێند، لەبەر ئەوەی خوێندن لە دەرەوەی وڵات لەسەر خەرجی تایبەتی خوێندکار قەدەغە بو، هەروەها قبوڵ کردنی هەر خویندنێك کە سەرچاوەکەی لەلایەن حکومەتەوە پشتگیری لێنەکرێ، لە پێنج ساڵەوە تا پازدە ساڵ زیندانی لەسەر بو). لە ئایاری ١٩٧٩دا یەکێتی خوێندکارانی بریتانیا ئەندامێتی یەکێتی قوتابیانی عێراقی هەڵوەشاندەوە، چونکە رێنماییەکی ناوخۆی ئەنجومەنی جێبەجیکاری ئاشکرا کرد کە داوای لە هەزاران ئەندامی یەکێتییەکە دەکرد خەبەر لەو کەسانە بدەن کە لە زانکۆکانی بریتانیا چالاکی لەدژی بەعس ئەنجام دەدەن. ئیدی یەکێتی خوێنکارانی بریتانیا رێنماییەکی بۆ ئەندامەکانی دەرکرد بەوەی رێوشوێنی پێویست بۆ پاراستنی قوتابیانی عێراقی بگرنەبەر کە ئەندامی یەکێتییەکەی عێراق نین، پاشان یەکێتی خوێندکارانی بریتانیا بڕیاریدا مەسەلەی بەرگری راستەقینەو پاراستن بۆ فەرمانگەی کۆلێجەکانو وەزارەتی دەرەوە بەرزبکاتەوەو یەکێتی خوێندکارانی وڵاتانی دیشی هاندا رێوشوێنی لەو بابەتە بگرنەبەر[16].

زۆرێك لەو کەسانەی لەلایەن رژێمی بەعسەوە دەستگیر دەکران، پاش ماوەیەك بەشێوەیەکی زۆر ئاساییو تەنانەت هێندێك جار زۆر بەپەرۆشەوە دەکەوتنە درکاندنو زانیارییەکانیان دەخستە بەردەستی پۆلیس: ئەو کارەشیان دەبوە مەسەلەی تاقیکردنەوەی دڵسۆزیو وەفاداری بۆ دەوڵەتو جەختیش لەسەر توانای دەکاتەوە کە دەتوانێت دەستگیراوەکە ئازاد بکات، تەنانەت لەو کاتەشدا کە دەوڵەت دەزانێت

هەمو تومەتەکانی بێبناغەو دوورن لەراستییەوە. لە سەرەتای حەفتاکاندا لقێکی حیزبی شیوعی عێراقی بەیەکجارەکی هەمو پەیوەندییەکی لەگەڵ ئەو ئەندامو لایەنگرانەی پچڕاند کە لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانی عێراقەوە بانگهێشت دەکران.

سەرئەنجام کەسانێکی بەراستی بێگوناح هەبون، بۆ نمونە منداڵێکی بچوکتر لە دە ساڵان لە کۆبونەوەیەکی یەکێتی جەوانانی بەعسدا دەڵێت باوکیو دایکی هێندێك شت قبوڵ ناکەن، ڕۆژی دواتر باوكو دایکەکە بۆ لێپێچینەوە بانگهێشت دەکرێن، یا مامۆستایەکی قوتابخانەیەکی سەرەتایی لە کاتی پشوی نێوان وانەکانو لە ژووری مامۆستایاندا چاو بەیەکێك لە ڕۆژنامەکاندا دەگێڕێتو دەڵێت جلوبەرگەکەی سەدام حسێن لەگەڵ پلەو پایەی کەسایەتی سەرکۆماردا ناگونجێت، ئیدی بۆ ماوەی دوو هەفتە خۆیو خێزانەکەی بێسەرو شوێن دەکرێن، لەدوای گەڕانەوەشی هەمو شتەکان بەشێوەیەکی ئاسایی دەبینێتەوە، وەکئەوەی هیچ شتێك ڕوینەدابێت[17].

یەکێك لەو ڕۆژنامەنوسانەی سەردانی بەغدای کردبو، بەمجۆرە کەشوهەوای جەماوەری هەواڵگرەکان وەسفدەکات:

"سەرجەم دیپلۆماتەکان هاوڕان لەسەر ئەوەی کە ناتوانن چاوپێکەوتن لەگەڵ عێراقیەکاندا بکەن، نوێنەری دەوڵەتێکی ئەوروپی بێلایەن دەڵێت "هێندێك دیپلۆمات دوای سێ ساڵ مانەوەیان لە عێراق، هیچ عێراقییەکیان نەناسیوە، ئیدی وڵاتیان بەجێهێشتوە". هەروەها دیپلۆماتەکان دەڵێن کاروبارە بازرگانیە ڕەسمیەکان لە کورترین ماوەدا بێئەوەی گفتوگۆی جیدی لەسەر بکرێ، ئەنجام دەدرا، بەشێوەیەکی گشتیش یەکێك لەبەرپرسە عێراقیەکان ئامادە دەبو.

زۆرجار بەرۆژو بەشەو ڕاڕەوی ئوتێلەکان جمەی دەهات لە خەڵکانی بێکار کە شوێنێکی زۆریان دەگرتو یارییان بە تەزبیحەکانیان دەکردو چاودێری میوانەکانیان دەکرد، بەتایبەتی کاتێك میوانەکان دیداریان لەگەڵ بازرگانە عێراقیەکاندا دەکرد، ئەمەش بەدڵنیاییەوە هەستی کلۆسترۆفۆبیای لەلایان زیاتر دەکرد، ئەو هەستەی کە زۆربەی بیانیەکانی ناو عێراق بەدەستیەوە دەیانناڵاند، ئەوەش هیچی لە هەستی



بەتەنهایی بیانیەکان کەمتر نەبو، کاتێك بەو ڕاستییەیان دەزانی کە عێراق ناهێڵێت هیچ بڵاوکراوەیەکی بیانی بێتە ناو عێراقەوە. چاودێریکردنی بیانییەکان لەعێراقدا لە هەر پلەیەکدا بێت، لەچاو چاودێریکردنی هاوڵاتیانی عێراق زۆر کەمتر بو. دیپلۆماتو ئەو بیانیانەی لە عێراقدا کاریان دەکرد ئەو بۆچونە پشتراستدەکەنەوە، بۆیە یەکێك لە دیپلۆماتە ئەوروپاییەکان لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەو هەستە لە هەمو شوێنێك هەستی پێدەکرێ کە سێ ملیۆن عێراقی چاودێری یازدە ملیۆن عێراقی دی دەکەن".

یەکێك لە شارەزایانی کاروباری عەرەبی باڵیۆزخانەیەکی ڕۆژئاوادا دەڵێت، کاری پۆلیسی بەپلەیەك لەنێو کۆمەڵگەدا ڕۆچوبو کە "کەس ئەوی دی نەدەناسی"[18].

دەزگا نیمچە ڕەسمی "تەقریر ـ ڕاپۆرت" یەکێك بو لەو دەزگایانەی لە خولقاندنی ئەو کەشوهەوایەدا بەکاردەهێنرا، نوسینی ڕاپۆرتی جۆراوجۆر، چالاکییەکی گرنگی ئەندامانی حیزب بو، ئەوانەی تەماعیان زیاتر بو ڕاپۆرتیان لەدۆستو برادەرەکانی خۆشیان دەنوسی. زۆرجار خودی کەسەکە داوای ڕاپۆرتی لێدەکرا، یا هێندێك کەس خۆبەخشانە ڕاپۆرتیان دەنوسی، یا لە چوارچێوەی کاری ڕۆتینی ڕۆژانەدا بو. ئەو ڕاپۆرتانە لە هەمو ئاستەکاندا بە گوێرەی پلەو پایەی هەر ئەندامێك بەرێکخراوە حیزبییەکان دەدرا. زۆرجار ئەو ڕاپۆرتانە شتی ڕۆتینی ڕۆژانە بو، بەشێوەیەکیش دادەڕێژرا کە بەرپرسە بەرزەکان حەزیان بەخوێندنەوەی دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا بڕبڕەی پشتی ڕژێمێکیان پێکدەهێنا کە دەیویست بە پەخشکردنی درۆ، ڕووپامایی، بوختان، سوکایەتیکردنو هاندانی خیانەت، ڕێگە لە گواستنەوەی حەکایەتەکان بگرێ. بۆ ئەوەی ڕژێم درێژە بەکارو کردەوەکانی خۆی بدات، بەهای ڕاستەقینەی ئەو ڕاپۆرتانە مەسەلەیەکی ئەوتۆ نەبو، بەڵکو تەنها بوونیان بەس بو تا کەشوهەوایەکی پڕ لە تومەتبار کردنی گونجاوو ترسی لێوەهەڵقوڵێتو زۆرترین خەڵکیش بە توندوتیژییەکانی بەعسەوە تێوەگلێنێ.

هیچ شتێك بە ئەندازەی گومانێکی هەمیشە لە بوونی خەبەرلێدەر هاوکاریو دەستیاری کۆمەڵ لەبەریەکهەڵناوەشێنێتەوەو لەو حاڵەتەشدا متمانە بەنەفسی خۆیان

لەدەستدەدەنو خۆیان دەبن بە پۆلیس بەسەر خۆیانەوەو خەبەر لەیەك دەدەنو خەڵك لە فەرمانڕەواکانیان جیادەبنەوە. تۆڕی راپۆرت نوسەکان ژیانی تاکەکەس داگیر دەکەن، هەمو ویستو ئارەزویەك بۆ کاری هاوبەشو رامان لە کاری سیاسی خەفە دەکەن، یا هەمو ئەو هەستو غەریزانە دەکەنە شتێکی ئەوتۆ کە زۆر سڵی لێبکرێتەوە. بەم کارەشیان واقعیەتی قەڵەمڕەوی جەماوەر نابوت دەکەنو ئەوەشی دەمێنێتەوە بە سێبەرو تاریکی دەگۆڕێت. لە دونیایەکی لەوجۆرەدا توندوتیژی دەزگاکانی دەوڵەت لەبابەت لە سێدارەدان، بێسەروشوێن کردن، کوشتن، پەرچەکردارو ئەشکەنجەدان، مانایەکی کۆمەڵایەتی تازە وەردەگرێت. هیچ شتێك وەکخۆی دەرناکەوێتو ناتوانرێت هیچ شتێکیش بە رەهاو بەڵگەنەویست بزانرێت.

ژمارەی قوربانیەکان وەك کەشوهەوای سایکۆلۆجی گرنگ نیە کە بەردەوام دەوروژێنرێ، کاتێك رێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی، ساڵی ١٩٨١ رایگەیاند زیاد لە ٣٥٠ کەس لەعێراقدا بەرەسمی لە سێدارەدراون، یا کاتێك لیژنەی دژی سەرکوتکردن وردەکاری لەسەر لەسێدارەدانی ٧٩٨ کەسی بڵاوکردەوە (لەگەڵ ٢٦٤ کەسی نەناسراوو ٤٢٨ کەسی دەستبەسەر کە حوکمی لەسێدارەدانیان بەسەردا نەسەپێنراوەو ژمارەیەکی دی بێسەروشوێن کراو)[19]، لە عێراقدا هەمو ئەو شتانە پێودانگێك نیە بۆ ترسو توندوتیژی، بەڵکو چۆنێتی مردنی ئەوانەی بەرچاو ناکەون، کێشەی سەرەکی ئەو خەڵکانەیە کە تا هەنوکە لەژیاندا ماون، بەهەر حاڵ زۆربەی قوربانیەکان روبەروی چارەنوسی جیاواز دەبونەوە، بەڵام ئەو شێوازەی پیاوانی رژێم پیادەیان دەکرد، بریتی بو لەوەی کەسێك لە شوێنی کارەکەی هەڵدەبژێرنو وەپێشخۆیانی دەدەن، یا بەشەو دەچنە سەر ماڵەکەیو لەماڵەوە دەریدەکەنو لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن، لەم حاڵەتەدا بەپێچەوانەی حاڵەتە رەسمیەکانەوە، هیچ جۆرە روونکردنەوەیەك نادرێت. ئەم حاڵەتەی عێراق لەگەڵ حاڵەتەکانی ئەمریکای لاتیندا جیاوازی هەیە، بەوەی لەوێ دەوڵەت نکۆڵی لەوە دەکات کە پەیوەندی بەو بێسەروشوێن کردنانەوە هەبێت، بەڵام بەعس لە عێراقدا لادانێکی ترسناك بەم مەسەلەیە دەکاتو بەمەبەستی چاندنی



تۆی ترسو توندوتیژی لە ناخی هاوڵاتیاندا بەهرەی لێوەردەگرێ. بەعس دوای چەند هەفتە یا رەنگە دوای چەند مانگێك لە بەرواری بێسەروشوێن کردنەکەوە، شتێکی تەرمئاسا لە تابوتێکی مۆر کراو دەداتەوە بەخێزانەکەیو بەڵگەنامەی مردنێکیان پێ واژو دەکات کە ئەو کەسە بە سوتان یا خنکان یا هەر رواداوێکی دی لەو بابەتە گیانی لەدەستداوە. تەنها رێگە بە کەسێك لە ئەندامانی خێزانی کوژراوەکە دەدرێ هاورێیەتی پۆلیسو تابوتە مۆرکراوەکە بکاتو بەشداری لە رێورەسمی ناشتنی بەناو تەرمەکەی بکات، بەڵام رێگە بەهیچ کەسێك نادرێ، چ ژن، چ پیاو، تەماشای جەستەکەی بکات، تێچونی رێورەسمی ناشتنەکەش، پێشەکی لەخێزانی کوژراوەکە وەردەگیرێ. ئەم مەسەلەیە هەر لە لێدانی دەرگای ماڵی کوژراوەکەوە تا ناشتنی تەنها یەك دوو کاتژمێر دەخایەنێت[20].

بۆشایی نێوان رەسمیو راستی مردنێکی لەوجۆرە لەلایەن ئەو کەسانەی پەیوەندیان بەو کارەوە هەیە، بە خێزانی قوربانیەکەشەوە، بەدرۆیەکی گەورە پڕ دەکرێتەوە، بۆیە ئەگەر بیانویستایە پرسەی بۆ دابنێن، دەبوایە دەربارەی مردنەکەی درۆ بکەنو لەسەر بنەمای درۆش گوزارشت لە غەمو پەژارەیان بکەنو پرسەی سەرەخۆشی لەخەڵکی قبوڵ بکەن، ئەم درۆیەش جێگەی ئەو حەقیقەتە ترسناکەی دەگرتەوە کە لە تابوتەکەدا نێژرابو. کاتێك ژیانی گشتی دەبێتە گۆڕەپانی ئەمجۆرە درۆیانە، تەنانەت خۆپەرستیش کە شتێك دەڵێتو شتێکی دی دەکات، بەشپرزەیەیو شێواوی هەستدەکاتو بیردەکاتەوە. هەمو ئەوانە دەبنە بەشێك لەهەلومەرجی هەمیشەیی تاکی عێراقی کە چیدی مەرجەعییەتێکی تۆکمە نامێنێت تا بتوانێت بەدەوریدا بیروباوەرو داوەری بەهێزو پایەداری لەسەر بونیات بنێت. هەمو شتێك بەجۆرێکی ئاڵۆزی ئەوتۆ پەردەپۆش دەکرێ کە هەمو فیکرو کارلێکێکی کۆمەڵایەتی دادەپۆشێ.

ئەگەر دوو دژ وەربگرین تەنانەت فریودانی ئەو دەزگایانەش کە خزمەتی خودێکی راست دەکەن، دەپوکێتەوەو دەبێتە ئاینێکی سەیروسەمەرەی بوونی مرۆڤ کە لە جیهانێکی نزمەوە هەڵدەقوڵێتو وەك وەهمێك یا ئاکامی مۆتەکەیەك دەردەکەوێت.

ئەو حەکایەتانەی لە کۆتایی حەفتاکاندا لە ناوخۆی عێراقەوە دزەیان دەکرد باس لە حاڵەتی ژەهراویکردن بە ژەهری کانزای قورس دەکەن. ئەو تاوانبارانە یا کەسوکاری هەڵهاتوەکان بێئەوەی هیچ گومانێك بوروژێنن بەجۆرێك ژەهرخوارد دەکران کە لە ماوەیەکی دوردا ماکەکانی دەربکەوێت (مادەی تالیۆمو قورقوشم)، ئەوەش لە کاتی لێکۆڵینەوەدا بەشێوەی شەربەت دەرخواردیان دەدرا. ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی لە ئایاری ١٩٨٠دا ڕاپۆرتی لەم بابەتەی پێدەگەیشتو لە ئەیلولی هەمان ساڵیشدا گەیشتە ئەو قەناعەتەی دەبێ نامە بۆ سەدام حسێن بنوسنو داوای لێبکەن لەوبارەیەوە لێکۆڵینەوەیەکی گشتی ئەنجام بدات. پزیشکە بریتانییەکان بەلانیکەمەوە لەبارەی دوو کەسیانەوە (یەکێکیان گیانی لەدەستدا) دڵنیابوون کە بەمادەی تالیۆم ژەهرخوارد کرابون، هەروەها پازدە کەسی دی لەناو عێراقدا بەهەمان شێوە گیانیان سپاردبو کە لە دەرەوەی عێراق ناوەکانیان بڵاوکرایەوە[21].

گۆڤاری نیوساینتیست ـ ی بریتانی لەبارەی حەکایەتی دەرمانخوارد کردنەکە لەنێو زانا عێراقیەکاندا دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد:

"شەوکەوت ئاکرەیی ـ ڕاوێژکاری پیشەسازی کیمیایی ـ دەرچوی زانکۆی لیدز، توانی ئەو گفتوگۆ تەلەفۆنیەی لە نەخۆشخانەی بەغداوە بۆی کرابو بگەیەنێتە گۆڤاری (نیوساینتیست)، قسەکەرەکە بەزمانی کوردی قسەیدەکرد (ئەو پلانەی بۆیان دارشتبوم، نەیکوشتم، بەمەبەستی چارەسەرکردن لەرێگەی شەربەتەوە تالیۆمیان پێدام، خواحافیزی لەهەمو ناسیاوان دەکەم)، ئیدی خەت دەپچڕێو گفتوگۆکەش لەوێدا کۆتایی پێدێت"[22].

ئەشکەنجەدانی ناوازە لەدوای ساڵی ١٩٦٨ەوە بەشێوەیەکی ڕێکوپێك لە هەمو بنکەکانی لێکۆڵینەوەی پۆلیس پیادە دەکرا، بێئەوەی لە جیهانی دەرەوەدا هیچ شتێکی لەسەر باسبکرێ. لەلایەکی دی ڕێوشوێنەکانی ساواکی ئێرانی لەئاستێکی بەرفراواندا لە ڕۆژنامە جیهانیەکاندا بڵاودەبونەوە، ئەمە سەرباری ئەوەی شای ئێران پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ وڵاتە ڕۆژئاواییەکاندا هەبو، ئەمەش نیاز خراپی ڕۆژئاوا نیشان نادات،



هێندەی گوزارشت لە داخرانو کۆمەڵگەی ترساوی عێراق دەکات، کە هەمو کارێك بەوپەڕی نهێنییەوە تێیدا ئەنجام دەدرێ، ئەمە لەحاڵێکدا لە ئێرانی سەردەمی شادا بەوشێوەیە نەبو. لەساڵانی حەفتاکاندا عێراقییەکانی تاراوگە بەهۆی ئەو ترسە زۆرەی لە ڕژێمی عێراق هەیانبو خۆیان دەپاراست بەرەو ڕێکخراوەکانی لەبابەت ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی بڕۆنو بەسەرهاتی خۆیان بگێڕنەوە. ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی نەیتوانی تا نیسانی ١٩٨١ ئەو ڕوداوانە بەدوکۆمێنت بکات، چونکە لەو ماوەیەدا ئەو پازدە عێراقییە ئەشکەنجەدراوەی لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە ئازاد کرابون، ڕایانکردو دەرچونە دەرەوەی عێراقو بەو شێوەیەش ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی دەستی بەدوکۆمێنتی پزیشکی گەیشت. تەنها دوو کەس لەو پازدە کەسە لە عێراق دادگایی کرابون. بەپێی گەواهی نامەی ئەو پازدە کەسە، بۆیە ئەشکەنجەدرابون تا واز لەبیروباوەری خۆیان بهێننو بیروباوەری ئەوانی دی ڕەتبکەنەوەو هێندی جاریش گوشاریان بۆ دەهێنان بۆ ئەوەی پەیوەندی بەحیزبی بەعسەوە بکەن یا واژۆیان لەسەر نوسراوێك پێبکەن کە بیروباوەڕی ڕابردوی خۆیان شەرمەزار بکەن[23].

هەر کەسێك ڕۆژگارێك ڕوبەڕوی ئەو نائەمنییەتە گشتیە بوبێتەوە، بەباشی لە قوڵی ئێشوئازاری تراجیدیا ناخودئێیو ڕەتکردنەوەی کەسایەتی مرۆڤی عێراق لە ساڵانی حەفتاکان تێدەگات. ئەو جۆرە ترسو تۆقاندنە، مرۆڤ بۆ مشتێك هەستی کارلێکراو دەگۆڕێتو خۆی بۆ لێدانی دواتر کە بەسەریدا دێت، ئامادەو کۆدەکاتەوە، بەدەرکەوتنی ئەو لێدانەش هەمو بەها نیشتمانیو تەندروستو هەر جۆرە هەستێك بەرامبەر بەکۆمەڵو تەنانەت توانای بیرکردنەوەی شەخسی کەسێتیو ڕامانیش لە نێودەبات. ئەو هەستانە هێدی هێدی لەنێونەچون، بەڵکو هەر کە ئەوجۆرە ترسە بۆ گیانو دەرون دزە بکات، بەدەر لەوەی ڕۆژگارێك چ کولتورێکی بەرزی هەبوە، یەکسەر ئەو هەستە لەبەیندەچێت. بۆ نمونە ئەگەر بیر لەو خوێندکارانەی نیشتەجێی دەرەوە بکەینەوە، ئەوانەی بەهیچ شێوەیەك سەروکاریان لەگەڵ سیاسەتدا نەبوە، کە چۆن لەکاتی سەردانیان بۆ باڵیۆزخانە بە مەبەستی ڕاپەڕاندنی هێندێك کاروباری

ڕۆتینی، چەند برادەرێکی خۆیان لە سوچی جادەکان بڵاوەپێدەکردو جاربەجاریش خۆیان پێشاندەدان تا دڵنیایان بکەنەوە لەوەی هێشتا نەرفێنراونو ڕەوانەی عێراق نەکراونەتەوە. ئەو فیکرە ترساوە جۆرە عەقلانییەتێکی تێیدایە کە ڕەگوریشەی لە درندایەتی دەزگا باوەکانەوە سەرچاوەی گرتوە.

## دڵڕەقیو دەسەڵات:

پیادەکردنی ئەشکەنجەدانی سیستماتیکیانەی دەزگاکان، تەنها کارێکی میکانیکی نیە بۆ لابردنی تەپوتۆزو ئاشکراکردنی ئەو ڕاستیانەی پەیوەندی بەلادانە زانراوەکانەوە هەیە، یا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی خێرا زانیاری بەدەست بهێنرێ، هەر چەندە ئەمە هەروەکو ئاماژەی پێدەدرێ، یەکێکە لەپاساوەکانی پیادەکردنی ئەشکەنجەدان لە ئەمەریکای لاتینیدا، بۆ نمونە تاوانبارە عێراقییەکان (ناسیاسیەکان) بەدەگمەن ئەشکەنجە دەدرێن، بەڵکو لەڕاستیدا هێندێك جار ـ ئەگەر لەگەڵ خەڵکانی دی بەراورد بکرێن ـ بارودۆخێکی شارستانیان هەیە[24]. بۆیە عەقڵ دەرکەوتنی ئەو هەمو دەزگایانە ڕوونناکاتەوە کە لەڕووی سیاسییەوە گرنگی یەکلاکەرەوەییان هەیە. دەزگاکانی لێکۆڵینەوە کە پڕەنسیپی سەرەکیان ئەشکەنجەدانە، بەگشتی دوای پاکتاوکردنی هەمو ئۆپۆزیسیۆنێکی سیاسی دەردەکەون (پێوەری ئەو دەزگایانە لە ژمارەی ئەشکەنجەدراوەکانیاندا نیە، بەهەمان شێوەش ژمارەی لەسێدارەدراوەکان پێناسەکاری سیستەمی مافەکانی سزای لەسێدارەدان نیە)، دواجاریش کۆتایی هەمو هەڕەشە یەکسەرییەکان کە پێویستیان بە لەناوبردنی خێرا هەیە لە ڕێگەی ئەشکەنجەدانەوە ئاسانتر دەبێ، بارودۆخەکە لە عێراقدا لەدوای ساڵی ١٩٧٥دا کە گەشەکردنی مەزن لە دەزگاکانی ئەشکەنجەدان ڕویدا هەر بەو شێوەیە بو، نەك لە ساڵانی یەکەمی حوکمی بەعسدا کە لە حاڵەتی ناجیگیریو ناسەقامگیریدا بو.

بەگشتی ئامرازو شێوازو کارنامەی ئەشکەنجەدان کە وڵاتانی جیهانی سێیەم



پێویستیان پێی هەبو لە دەرەوە هاوردە دەکران. (لان گۆت) جەخت لەسەر ڕۆڵی ئەمەریکا دەکاتەوە لەمەڕ فەراهەمکردنی هاوکاری هونەریو ڕاوێژکارییو مەشقپێکردنو تەنانەت ئایدیۆلۆجیاش (جۆرێکی تایبەت لە عەقلییەتی شەڕی سارد لە بنکەکانی مەشقکردن حوکمفەرما بو) لە سێ وڵاتی ئەمەریکای لاتینیدا، بەڵام لە عێراقدا ئەو ڕۆڵە بەیەکێتی سۆڤێتو ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات سپێردرابو، لە هەر دوو حاڵەتەکەشدا پێداویستی ناوخۆ لەسەر شارەزایانی لێکۆڵینەوەو ئەشکەنجەدان، پێش هەناردەو هاوردەکردنو سەرچاوەکانی (بۆ نمونە نەوت) دەکەوت کە ئەم گەشەکردنە نابەرهەمهێنەی لەتوانا (مومکین) دەکرد.

ئەگەر پروپوچی ئابوریو تیورەی فێرگەکانی گەشەی تازەگەری بخەینەلاوە، ئەوا مرۆڤ لەحاڵەتی عێراقدا، سەبارەت بەدەرکەوتنی جۆرێکی تازە لەتاکی نوێ کە لە "گەشەکردن دەوەستێت"، ناچارە گرفتێکی تازەی تایبەت لەبەرچاو بگرێ. ئەم تاکە (چ ژن، یا پیاو) بەپێچەوانەی هاوتا ڕۆژئاواییەکانی سەدەی هەژدەو نوزدەهەمیانەوە، بەهۆی بوونیان لە حوکمەتدا دەهاڕدرێنو سەرچاوە مەزنەکانیش بۆ داگیرکردنی سیستماتیکانەی ژیانی کەسێتیو نکۆڵی لە تاکێتیو خولقاندنی ترس بەکاردێت، بەڵام ئەشکەنجەدان لە لوتکەی ئەم ڕژێمەدا بو. لەم دەسپێکەوە کێشەی تازەگەری لە وڵاتێکی وەك عێراقدا لەگەڵ دەرکەوتنی حکومەتدا دەگاتە جۆرە لێکحاڵیبونێك کە هاوڵاتیانی لە سایەی هەلومەرجێکی تایبەتدا بەهەمو دڵنیاییەکەوە پێشبینی ئەشکەنجەدان دەکەن.

بوارە پراکتیکەکانی دەزگا سەرکوتکەرەکان لە عێراقی هاوچەرخدا ـ دانپیانان، هەڵواسینی ئاشکرا، نمایشکردنی جەستەی کوژراو، لەسێدارەدانو ئەشکەنجەدان ـ بەمەبەستی بڵاوکردنەوەو برەوپێدانی ترس بو لەنێو هاوڵاتیاندا، بەڵام ئەو پراکتیکانە ڕووی دیارو نادیاری دەسەڵاتو درێژەپێدەری مافەکانی دەوڵەت بو لە هێرشو پەلاماردانی بۆ سەر دوژمنانی میلەت. یەکەمین نمایشی گشتی لەوجۆرە لە کانونی دووەمی ساڵی ١٩٦٩دا ئاوێتەیەکی دادوەریو سیاسی بو، ئەو کەسانەی تێیدا "سزادرا" کە لەگەڵ

خەڵکانی بیانیدا خیانەتیان لە نەتەوەو نیشتمان کردبو. بەقسەی ئەوان سەروەرییەکیان گێڕاوەتەوە کە لە دەرەوە لەڕێگەی زایۆنیزمەوە بریندار کرابو، بەڵام لە راستیدا ئەو سەروەرییە لە ناوەوە لە حاڵەتێکی لەرزۆکدا بو. دەکرا گەورەیی دەسەڵاتی سەروەری گەڕاوە لەڕێگەی ئەو کەسانەوە بەدیبکرێ کە بەشداریان لە ئاهەنگە شکۆدارەکاندا دەکرد. ڕێورەسمی لە سێدارەدانی نەیارانی رژێم لە کانونی دوەمی ۱۹٦۹، لە بەغدا، هەر چەندە لەگەڵ ڕێورەسمی ئەو نمایشە جەنگییەی لە شەشی کانونی هەمو ساڵێکدا (ڕۆژی دامەزراندنی سوپای عێراق) کە هێزی سەربازی نمایشدەکرد، هیچ جیاوازییەکی نەبو، بەڵام جۆرە سروتێکی بێوێنە بو لەمەڕ ئاهەنگگێڕان بۆ سەرەتایەکی نوێ، نەك ئاهەنگی بەردەوامیو جێگیربونی دەسەڵات. بەهۆی ئەم بۆنەیەوە دەخوازرا بەوپەڕی زێدەڕەوییەوە دڵڕەقی نمایش بکرێ، چونکە مەبەست لەو روداوە جێبەجێ کردنی حوکمی دادگا نەبو، بەڵکو شکاندنو مایەپوچکردنی کەسایەتی حوکمدراوەکان بو. لەمجۆرە بارودۆخە ناهاوسەنگەدا، بینینو هەستپێکردنی پێویست بو تا بەتەواوەتی سەقامگیری دەوڵەت هەڵسەنگێنرێ[25]. لێرەدا کاری هەرە گرنگ چڕکردنەوەو بەهێزکردنو تیشك خستنەسەر ئەو ناهاوسەنگییە بو، بەجۆرێك کە تا ئەوپەڕی توانا پێ لەسەر ئەو دڵڕەقیە دابگیرێ.

دەپرسین ئەگەر ئامانج خولقاندنی ترسو تۆقاندن بێت، کەواتە دوا شکڵی توندوتیژی لە بابەت ئەشکەنجەدانو مردن بەو شکڵە ئەفساناوییە ترسناکە لەپای چی؟ لێرەدا نیازی دەوڵەت ڕێك پێچەوانەی ئامانجی یەکەم بو. لەم بارەیەشەوە هەمو شتێك ئەنجام دەدرا، هەر لە دەستگیرکردن، تومەتبارانکردن، لێپێچینەوە، بەڵگە دروستکردن، دادگاییکردن، حوکمدان، جێبەجێکردنی حوکمو کوشتنەوە تا ئەو جەستانەی کە نیشانەی دوا تۆمارگەی هەمو روداوەکانی هەڵگرتبو. ئەو سزادانەی لەسەرەتای بەدەسەڵات گەیشتنی بەعسییەکاندا کارێکی ئاشکراو هەستپێکراوبو، لە ئێستادا وەك بەتیورەیەکی رووتو ئەبستراکتو هەستپێنەکراو دەردەکەوێت. ئێستا دەتوانین لەوە تێبگەین بۆچی ناتوانین خۆمان لە مردنێکی ترسناكو نادیاری



هەلومەرجێکی تایبەت دووربخەینەوە، ئەو سەروەرییەی دەبوایە بۆ دەسەڵات بگێردرایەتەوە، هەنوکە بوە بە بوونێکی ترسناکی ئەوتۆ کە بوارێك بۆ زانینی سنورو تێگەیشتنی نەماوەتەوە. جۆرێکی دی لە ترس بو بە مەرجی پێشوەختی دەسەڵاتێکی چڕو یەکانگیر، ئەو دەسەڵاتەی لە ڕێگەی بەشداریکردن لە تاوانو ستەمدا چاوی هەڵدەهێناو نشونمای دەکرد.

گەندەڵی بەربڵاو یا ئەو نمایشەی هاورای دەوڵەمەندییەکی زۆرو زەوەندەو بەشێوەیەکی بەرفراوان لە وڵاتانی کەنداودا پەرشوبڵاوەکرێتەوەو بو بە هۆی روخاندنی شای ئێران، هەرگیز لەگەڵ دەزگاکانی ئەشکەنجەداندا ڕێك نایەتەوە، کە بەلێهاتوییو سەلیقەوە کاریان دەکرد. لەوجۆرە حاڵەتەدا ـ گەندەڵیو سامان ـ نەك بەتەنها ترس ناتوانێت حوکمفەرما بێت، بەڵکو جدییەتێکی پێویستو بوونی ئیرادەیەکی سیاسیش نامێنێت. ئەشکەنجەدان لە کەشوهەوایەکی پڕ گەندەڵیدا جێمتمانەبی سیاسی خۆی لەدەستدەدا. لێرەدا زەبرو زەنگی ئایدیۆلۆجیای حیزبی بەعسی عێراقو بەدواداچونی بەردەوامی بۆ هەمو کردەوەیەکی "تێکدەرانەی ئابوری" پێگەیەکی یەکانەو ئاستێکی تایبەت بەخۆی هەیە.

یاسا بەمانا بۆرجوازییە کلاسیکییەکەی ناتوانێت حوکمی جیهانی بەعس بکات، لەبەر ئەوەی لە ژینگەیەکی تژی لەترس، رەتدانەوەی خۆشدوویی (مجاملە)، بێمانا دەبێت، لەپاڵ ئەوەشدا یاسا لە باشترین حاڵەتیدا، لەسەرخۆو هێدی هێدی کاری پێدەکرێو پشت بەو تاکانە دەبەستێت کە توانای خۆگۆڕینیان نیەو بەتێپەربونی کات بەرامبەر بەکردەوەکانی خۆیان بەرپرسیار دەبن، (زیندانی کردنی تاکەکانیش لەسەر هەمان گریمانە دەبێ). بەعسیە نمونەییەکان یاسا تێدەپەڕێنن لەبەر ئەوەی شوناسو رەفتاریان بەتەواوەتی لەبیروباوەڕیاندا تواوەتەوە (بڕوانە بەشی شەشەم). هاوڵاتی عێراقی ئەمڕۆ بەردەوام خۆی لەنێو پرۆسەیەکی ناکۆتادا دەبینێتەوەو بۆ دیاردەیەکی دی دەگۆڕێتو یاسا لەباشترین حاڵەتیدا گرنگییەکی لاوەکی هەیە، بۆیە هاوڵاتی عێراقی ناتوانێت لە لۆجیکی سزادانی لەبابەت ئەشکەنجەدان رابکات، چجای ئەوەی

بتوانێت لەو فرمانو ڕێورەسمانە رابکات کە وەك باران بەسەریدا دەبارێت.

لەسیستمی ئەشکەنجەداندا تاکی پڕتواناو پایەبڵند لە واقیعدا بەجۆرێك دەردەکەوێت وەکئەوەی لە هەمان کانزای خەڵکی ئاسایی داڕێژرابێت. دیاردەی لادێیەکی هەژار کە روو لە شار دەکاتو لەرێگەی پۆلیسی نهێنییەوە بەپلەی بەرز دەگات (بۆ نمونە نازم گزار)، پاشان هەمان لادێی سەرەك وەزیرانی پێشو (عەبدولرەحمان ئەلبەزاز) رادەکێشێتە بەردەم مێزەکەی کە ئامرازەکانی ئەشکەنجەدانی لەسەر دانرابو، خۆی لە خۆیدا سیمبولێکی بەهێزیی مەترسی جیاکارو تواناو دەسەڵات لە جیهانی ترسدا دەخاتەروو، بەمشێوەیە دەبینین ئەشکەنجەدان هۆکارێکە لە هۆکارەکانی یەکسانی نێوان مرۆڤەکان.

لەگەڵ ئەوەشدا، مەبەست لە ئەشکەنجەدان نەهێشتنی هەمو جیاوازییەکە، ئەوەش لەکاری نەشتەرگەرێکی بایۆلۆجی دەچێت بۆ ئەوەی بە جۆرێك مل بە تاك کەچ بکات کە لە واقیعدا "نەیهێڵێت". دانپیانان بەڵگەیەکە لەسەر لادانی تاکێك کە پێشتر ئەو لادانەی نەزانیوەو بیری لەوەش نەکردۆتەوە لادانێکی لەوجۆرەی تیابێت. قوربانیە ئەشکەنجەدراوەکان ئەگەر بەزیندوێتی بمێننەوە هەرگیز وەك جارانیان لێنایەتەوە، تەنانەت ئەگەر برینی ئەشکەنجەکانیشیان سارێژبێتەوە، یادەوەری ئەشکەنجەدانەکە، هەروەکو قوربانییەکان دەیگێڕنەوە، قەت لەیادناچێتەوە. ئەم حاڵەتە لە کوانوی راستییەکدا کە ئەشکەنجەدەر وێڵی دۆزینەوەیەتی، منەکردنێکە (بحث) بۆ دۆزینەوەی واقعی "خود" لەپشت رووکەشیی تاکی ئەشکەنجەدراودا. هەمان راستی ئەو رووندەکاتەوە کە بۆچی یەکێك بەخاتری دەربەستبونو بیروباوەری خۆی، نەك لەرووی درندایەتییەوە، ئەشکەنجەی هاورەگەزەکانی خۆی دەدا.

ئەشکەنجە لەو رژێمانەی لەسەر ترسو تۆقاندن بونیات نراوە تەنها بەمەبەستی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی ئەنجام نادرێ، بەهەمان شێوەش زیندانەکان لە رژێمە بۆرجوازییەکاندا بەتەنها لایەنی تۆڵەسەندنەوەیەکی رووتی نیە. لەرژێمی ترسدا دەبێ تاك بەو ئەندێشەیەوە خووبگرێ کە دەسەڵات لەرووی پرەنسیپو زەرورەتی



ئایدیۆلۆجیاوە ئەوەندە گشتگیر بێت تا دەستی بەراستی بگات، راستییەك ئەوەندە کامڵ بێت کە چیدی بەربەستێك لەسەرە رێگەی دەسەڵات دروستنەکات. لەم حاڵەتەدا چەمکی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی لەگەڵ چەمکی "دروستکردن"، "فۆرم پێبەخشین"و "لەقاڵبدان"ی خەڵکی تێکەڵ دەبنو بەناویەکدا دەچن. ئەشکەنجەدان لەبواری سیاسەتدا ئەنجامێکی سروشتی هاوواتای ئەوجۆرە چەمکانەیە. لە کۆمەڵگەی بۆرجوازیشدا لەبەرامبەر ئەو چەمکانەدا، گوزارەی "دروستکردنەوە"ی رەفتاری دوژمنکارانەو سەرپێچیکارانە بەکاردەبرێت. بۆیە ئیدی تاوانباران نابن بە ئامانجی ئەشکەنجەدان، بەڵکو نەخۆش یا ئەوانەی لەرووی ئەخلاقییەوە تەواونین، دەبنە ئامانجی ئەشکەنجەدان، ئەو نەخۆشخانەی کە لادانی شەخسیان هەیە، نەك لەبەر ئەوەی سەرپێچییەکی دیارو هەستپێکراو ئەنجام دەدەن. ئەوانە ئەشکەنجەدەدرێن تا جارێکی دی بەفۆرمێکی تازە دارێژرێنەوە، تەنانەت ئەگەر دوبارە دارشتنەوەیان ببێتە هۆی مردنی ئەشکەنجەدراوەکانیش، چونکە بەلانیکەمەوە خەڵکانێك هەیە، هەوڵ دەدەن شتێك بکەن. کاتێك بەعسیەکان قسە لەسەر دروستکردنی "مرۆڤی نوێ"و "کۆمەڵگەی نوێ" لە عێراقدا دەکەن، نابێت وابیر بکەینەوە کە ئەو وشانە، وشەگەلێکی خوازراون، بەڵکو مەسەلەگەلێکی هەستیاری سیاسین، ئەو مەسەلانە لە گشت چواردەوری ژیاندا ئامادەگیو بوونیان هەیە، لەبەرنامەی خوێندن، راگەیاندن، بەرنامەی کۆمەڵایەتیو سیستمی رێکخستنی سوپاو میلیشیاو حیزبدا ئامادەگی بەهێزیان هەیە.

گواستنەوە لە موبیلیزەکردنی جەماوەرەوە بۆ تێگەیشتن لە دەسەڵات لە فۆڕمی دیمەنی پڕ قسوەت لەدژی ئەوی دی کە تێیدا دەسەڵاتی شەخسی لە ڕێگەی ترسەوە وەك مەسەلەیەکی ئەبستراکتو هەست پێنەکراو پیادە دەکرێ (بەڵام دەسەڵاتێك لەناخەوە سەوز دەبێ، وەکئەوەی خەسڵەتێکی سایکۆلۆجی بێت لە هەمو بووندا بڵاوبوبێتەوە)، پێوەرێکە بۆ تێپەربونی بەعس بەرەو سەردەمێکی نوێ. وشیاری کۆمەڵایەتی هەر تاکێك لەگەڵ تاکەکانی دی بەتەواوەتی جیاوازی هەیە. ئەم دوا دیاردەیە گۆڕانێك

لەخۆدەگرێــت کە دەتوانرێ بەخەیاڵی ئەدەبی ناوبنرێ. لــە هەمو ئەوانەش گرنگتر، تازەگەری لەلای بەعس لەجۆرێکی نوێی تێوەگلان لەگەڵ بیروکراسـیەتدا سـەرچاوە دەگرێ. چیدی دەسەڵات هێزێکی دەرەکی نییە کەسێك بتوانێت لێی قورتار بێتو پەنا بۆ ئارامی ماڵو خێزانی بەرێتو لەسەر شانۆی روداوەکانی لەبابەت بەشداری نەکردن لە رێورەســمی لەسـێدارەدانەکاندا دەرنەکەوێت، هەمو کەسێك هەست بەدەسەڵات دەکات، بەخودی ئەو کەسانەشــەوە کە حوکم بە ئامرازەکانی دەسەڵاتەوە دەکەن، چونکە جۆرە زانســتێکی نوێو ئەزمون بەمەبەستی بەکاربردنی دەسەڵات، زەرورەتی هەیە. مردنی بێناونیشــانو دانەوەی تەرم لە تابوتی مۆرکراودا، بەردەوامبونی جیهانی کافکاییــە لــە ئەزمونی ئەمڕۆی عێراقــدا. ئیدی کەس ناتوانێت مردنێکــی قارەمانانە بەدڵخــوازی خۆی هەڵبژێرێــت، چونکە مردن لەزیندانەکانو لــە گومناویدا دەرفەتی مردنی قارەمانانە یا شەهیدبون لە قوربانیەکان دەسێنێتەوە.

بێگومان گواســتنەوە لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکــی دی، پەیوەندی بەکۆنترۆڵکردنی کۆمەڵایەتیەوە هەیە، بەهەر حاڵ ئاکامەکەشــی بریتیە لە کۆنترۆڵکردن بەشـێوەیەکی جیاواز لە هەمو شـێوە زانراوەکانی پێش ســەردەمی تازەگەری یا سەرەتای سەردەمی تازەگەری. لەدیدی دەوڵــەتو حیزبی بیروکراتییەوە ئەوەی لەپێش چاوماندا روودەدا درێژکراوەیەکی ســادەو لۆجیکی سانســۆر، لەنێوبردنی ئازادیو بیروڕایە. نەهێشــتنی جیاوازی نێوان تاکەکان یا جیاوازی نێوان ئەوەی پەیوەندی بەخاوەندارێتی دەوڵەتەوە هەیــە لەگەڵ ئەوەی پەیوەندی بەخاوەندارێتی تاکەوە هەیە زۆر بەئاســانی بەســەریدا تێدەپەردرێت. لەدیدی کەســی قوربانییەوە سەرەتای چۆنێتی حاڵەتێکی کاتی جیاکار کــە تێیــدا مرۆڤ لە حاڵەتێکی ســایکۆلۆجیای بەربڵاو بترســێت، ئەوەیە کە مرۆڤ لەرێگەی ترسەوە حوکم بکرێ. لەماوەی یەکەمین لەسێدارەدانە نمایشییەکاندا تەنها چەند هەزار یەهودییەك بەو شـێوازە حوکم دەکران، بەڵام لەدوای تێپەربونی دە ساڵ ئەم حاڵەتە هەمو شوێنێکی گرتەوەو بوە حاڵەتێکی گشتیو بەشێوەی نمایشی بێوێنەی دی دەگشتێنرا.



## نمایشی میللی مەزنی پێش کۆتایی:

ئــەو گفتوگۆیــەی بە ترســاندنی گروپێکی بچــوك لە بێزراوە سیاســییەکان دەســتی پێکرد، ســاڵی ١٩٧٩ بە پاکتاوکردنێکــی مەزنی ســەرکردە پایەبەرزەکانی حیزبــی بەعس کۆتایی هــات. بەپێچەوانەی روداوەکانی ســاڵی ١٩٦٨ ـ ١٩٦٩ کە هەوڵــدەدرا لەرێگەی جەماوەرەوە رەوایەتــی بەکردەوەکانیان بدەن، ئەوا ئەم روداوانە لەناوخۆی حیزبدا چڕکرایەوەو بەوپەری نهێنیشــەوە ئەنجام دەدرا. ئەوەی لەسەر ئەو روداوانە دەزانرێ ئەوەیە کە لە مانگی حوزەیراندا ئەحمەد حەســەن ئەلبەکر لەلایەن ســەدام حســێنەوە کار کەنار کراو خۆی بوە ســەر کۆماری عێراق. ســەدام حسێن لەماوەی مانگێکدا خێزانی ســێیەکی ئەندامانی فەرماندەی قوتری بە بارمتە گرتو تا هەمو بەڵگەنامەو نوســراوەکانی تایبەت بەپاکتاوکردنیان واژو نەکرد، رێگەی پێنەدان دەربکەونەوەو لەهەمان کاتیشدا بەسەدان لایەنگریان پاکتاوکران، لەکۆتاییدا بەکۆمەڵ لەگــەڵ چەندین خێزاندا لە ســێدارەدران، هەمو ئەوانەش لــە دوای ئەوەی لە ٢٠ی تەموزدا کۆبونەوەیەکی نائاســایی ســەرکردایەتی حیزبی بەعســی عەرەبی ئیشتراکی بەســترا، ئەنجام دران. لە ١/ئەیلول/١٩٧٩دا بەســەدان کەس لە کەســوکاری پایە بڵندەکانی ســەرکردایەتی حیزبی بەعس لەســێدارەدران کە بەنزیکەیی بەپێنج ســەد کــەس دەخەمڵێندرێ. تــا هەنوکە نازانین چەند کەس کوژراوەو ترسو تۆقاندنیش لە ئاستە جیاوازەکانی حیزبدا تا چ رادەیەك بوە.

راڤەکردنی ئەو هۆیانەی بوە مایەی پرۆسەی پاکتاوکردن، جەخت لەسەر جیاوازی سیاسی نێو سەرکردایەتی حیزب دەکەنەوە. مەسەلەی هەڵسەنگاندنی شۆڕشی ئێران، ئاســتی بەکارهێنانی دڵڕەقی دژی ئۆپۆزیســیۆنی شــیعەی عێراق، جیاوازی دەربارەی یەکێتی لەگەڵ ســوریا، وەك رەگەزی سەنتەرگەرای ئەنگیزەی "عەقلانی" ئەو هەمو خوێنڕێژییە لە قەڵەم دەدرا.

رەنگە هەڵسەنگاندن ببێتە مایەی ئەوەی بەهەڵە حوکم لەسەر پەیوەندی ئەو دەمەی

نێوان سەدام حسێن‌و ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر بدرێ. لە دەیەی یەکەمی حەفتاکاندا بەکر لە سیاسەتی عێراقدا زیاتر سەرۆکێکی رێورەسمی بو، واتە پێگەو پایەی بەرزی لەناو حیزبدا، لەپاڵ پلەو پێگەی لەنێو ئەفسەراندا ئەوەندە گرنگ بو، کە بوە مایەی پرۆسە یەك لەدوای یەکەکانی پاکتاوکردن‌و تێیدا باڵی مەدەنی بەسەر باڵی سوپادا باڵادەست بو. لە ماوەی ئەو دە ساڵەی لەگەڵ سەدام حسێندا لە دەسەڵاتدا شەریك بو، کەمتر سودی بۆ سەدام حسێن هەبو. بەڵام لە نیوەی دووەمی حەفتاکاندا هێدی هێدی دەسەڵات لەدەست سەربازە حیزبییەکان دەرچو، بەهێزو تواناوە لەناو بونیادی حیزبدا تەوەرەی بەست. لەراستیدا جیاکاری لەنێوان ئەو دوو باڵەدا مەسەلەیەکی بێمانابو، چونکە لەهەمو عێراقدا ئەفسەرێك نەبو کە ئەندامی حیزبی بەعس نەبێت‌و لەبەرامبەر حیزبدا بەرپرسیار نەبێت‌و لە نزیکەوە لەژێر چاودێری هەواڵگری حیزبدا نەبێت. لەهەمان کاتیشدا ئەگەر مرۆڤ بەوردی لەپاشخانی هێندێك لە ئەندامانی سەرکردایەتی شۆڕش بڕوانێ، ئەوانەی ساڵی ١٩٧٩ پاکتاوکران، دەتوانێت بڵێت ئەوەش شێوازێکی دی بەعس بو بۆ چارەسەرکردنی جیاوازییە سیاسییە گرنگەکان کە جار ناجارێك لەسەر شانۆ دەردەکەوت. بەلانیکەمەوە دوو لە قوربانییەکان، عەدنان حسێن‌و غانم عەبدولجەلیل، لە لایەنگرە نزیکەکانی سەدام حسێن بون‌و هیچ پێگەیەکی حیزبییان نەبو. بەڵام هەر زۆر زوو لە دوو نوسەری بچوکەوە گەیشتنە پلەی سەرکردایەتی قوتری، ئیدی لەودەمەوە بەهاوکاری سەدام بوون بە سێبەری کەسانی راستەقینە. دواجار هەر دووکیان بەتومەتی پیلانگێڕان کە رەگوریشەی ئەو جۆرە پیلانانە بۆ جیاوازی راستەقینەی سیاسی دەگەڕێتەوە، گوللەباران کران، کۆتایی هاتنی ئەو جووتەش لە کۆتایی هاتنی کەسێك دەچێت، بەڕە لەژێر پێی خۆی دەربهێنێت.

بێگومان ئەم پاکتاوکردنە ئاماژە بە لوتکەی ئەو ساتەوەختە دەکات کە سەدام حسێن وەك "رێبەر" تێیدا دەرکەوت، لەسەروی ئەوەشەوە ئەم پاکتاوکردنە لەچوارچێوەی دوا خولی ترس‌و تۆقاندنی گشتی دەژمێردرێت، پێشئەوەی سەدام حسێن دوا سیناریۆی خۆی نمایش بکات، واتە پێش شەڕی عێراق ـ ئێران. شتێکی



رەوایە بگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە پاکتاوکردنی ساڵی ١٩٧٩ پێشەکییەکی گرنگ بو بۆ شەڕی خاچپەرستانەی ساڵی ١٩٨٠و ئەو شەڕەی ناوی "قادسیەی سەدام"ی لێنرا، رژێم لەگەڵ هەڵگیرساندنی شەڕدا ئەو دەستەواژەیەی بەکارهێنا.

لە کانونی دووەمی ١٩٦٩دا جەماوەر چ لەدەرەوەو چ لەناوەوە چالاکانە بەشداری لە کاری حیزبی دەکرد، بەڵام هەمان جەماوەر لە تەموزی ساڵی ١٩٧٩دا بە تەماشاکارێکی پاسیڤ گۆڕان. ئەمەش لە دەرهێنانی ئەو شانۆگەرییە دەچێت کە بۆ جاری دووەم نمایشدەکرێ، نەك بەخاتری ئەوەی سودی بۆ خودی هونەرمەندەکان هەبێت، بەڵکو لە پێناو ئەو تەماشاکارە حەپەساوانەی کە هەر جارەی پەردە لادەدرێت چێژ لە دیمەنی تازە وەردەگرن. پاکتاوکردنەکەی ساڵی ١٩٧٩ بەشێوەیەك نەخشەرێژی بۆ کرابو کە هەمو دەسەڵاتێك لە حیزبی بەعس بسەنرێتەوەو لە کەسێتی خودی سەدام حسێن دا بەرجەستە بکرێ، ئەمەش لە پێویستیەکانی حیزب بو، چونکە ئیدی هیچ ئۆپۆزیسیۆنێکی سیاسی لە ئارادا نەمابو، تەنها دەسەڵاتێکی رەهای راستەقینە لە گۆڕەپانەکەدا ئامادەگی هەبو، بەڵام هەنوکە دابەشکردنی رووکەشیی دەسەڵات بەتەواوەتی دوور خرابوەوەو زۆردارەکی‌و ستەمگەری رەهاش بەشێوەیەکی ئەبستراکت نمایش دەکرا. سەرئەنجام ئەو دەوڵەتە حیزبییەی بەعس دروستی کردبو دەبوایە ستالین یا هیتلەر لەهەناوی خۆیدا هەڵبهێنێتەوە.

ئەو ئەفراندنەی سەدام بەرێوەی دەبرد شەقڵی تایبەتی‌و شێوازی شەخسی خۆی لەسەر بو. یەکەم کەس "موحی عەبدولحسێن رەشید"، ئەندامی قوتری شۆڕش ئیعترافی کرد، کە سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەی بە بارمتە گیرابون. وێنەی دانپیانانەکە گیرابو، پاشان لە کۆبونەوەیەکی حیزبیدا پێشان درا کە بەسەدان بەرپرسی حیزبی لەسەرتاسەری وڵاتدا ئامادەی ئەو دانیشتنە بون[26]. سەدام حسێن لێو بەبارو چاو بەفرمێسك، وتەیەکی بۆ ئامادەبوان خوێندەوەو بەشێوەیەکی درامی ئاماژەی بۆ هەڤاڵە دێرینەکانی خۆی کرد، ئیدی گاردەکانی سەدام کەوتنە پەلکێش کردنی ئەو خەڵکانە، پاشان داوای لە وەزیرو گەورە بەرپرسەکانی حیزب کرد لەنێوان خۆیاندا

گروپی تیرباران دروســـت بکەن. ئەمەش ئەو شـــێوازە بو کە ســـتالین‌و هیتلەر هەرگیز بیریان لـــێ نەکردبووەوە. ئەگەر قوربانییەکان ئەوەندە جوامێرییان هەبوایە گەڵاڵەنامەی کارکەناری ســـەدام ئامادەو جێبەجێ بکەن، ئایا لە قۆناغی دوای ســـەدام دەیانتوانی وەك "ئایخمان" خۆیان بە نوێنەرو شایســـتە بزانن‌و بڵێن بەتەنها فرمانەکانی سەرەوەی خۆیان جێبەجێ کردوە؟. ئایا تاکتیك لەمە ژیرانەتر هەیە کەسێك دوژمنە گریمانەکانی خۆی لەدوتویی رێبازێکی سیاسیدا بەرەو نەمری رێنمایی بکات؟ سەدام بەو شێوازەی رێبەرە حیزبیەکانی ناچارکرد ئایندەی خۆیان بە چارەنوســـی شەخســـی خۆیەوە گرێ بدەن، رێك وەکئەوەی کە پێشـــتر خەڵکی ناچار کردبو ئایندەی خۆیان بەچارەنوسی حیزبەوە ببەســـتنەوە. بەشداریکردن لە تاوان کە نیشانەکەی لە سێدارەدانەکانی ساڵی ١٩٦٩ بو، رێگەی بۆ بەدەســـەڵات گەیشـــتنی ســـەدام هەموار کرد. تیرۆرو تۆقاندن یەخـــەی تاوانبارانیشـــی گرتەوە، هەروەکو هەمیشـــە ئەو کارە لە نـــاو خودی تیرۆردا خـــۆە متکردوە، بەڵام بازنەی تاوان‌و بەرپرســـیارێتی دادەخرا، ئەوەش کارێك نیە کە هەمیشەو لە هەمو شوێنکدا روبدات.

1 ـ ماكس ساوادایی: هەمو لە چاوەڕوانی هەڵواسیندا: یادەوەری دوای جەنگی شەش ڕۆژە (تەل ئەبیب، لواندا، ١٩٧٤)، ٦ ـ ١٤٥. لەم كتێبەدا هەڵبژاردەیەك لە یادەوەری یەهودییەكی عێراقی هاتوە كە ساڵی ١٩٧٠ بەهاوكاری كوردەكانی عێراق رایكردوە. بڵاوكردنەوەی ئەم كتێبە بەئەنقەست دواخراوە تا هەمو كەسوكارەكەی بەهەمان شێوازی ئەو لە وڵات رایانكردوە. ئەم كتێبە تایبەتە بەو روداوانەی لە ساڵانی یەكەمی تیرۆری بەعسدا بەسەر تاكەكاندا هاتوە. لەبارەی سوراخكردنی وردەكاری یەهودییەكانی عێراقو دادگاییەكانی كانونی دوەمی ١٩٦٩دا پشت بەم كتێبە بەستراوە. بەڵام گرنگی واقعی ئەم كتێبە لە خستنەرووی كەشوهەوایەكی هەستپێكراوی نائارامو جۆرە ترسێكە كە لە جیهانێكی دیارو ئاوەژودا یەخەی خێزانێكی ئاسایی دەگرێت.

2 ـ Hana Batatu, the Old Social Classes and the Revolutionary Movements of Iraq (Princeton Univ. Press, 1978). 1065.

3 ـ ئەم گوتارە لە نامیلكەیەكی سەربەخۆدا هاتوە بەناوی: كل شيء من اجل المعركة (بەغدا، وەزارەتی راگەیاندن، ١٩٧٠)، ٦ ـ ٧. ئەلبەكر سەرباری دەستەواژەی لەبابەت "چەوسێنەران"، "تڵپە"، "داگیركاران"و "ستونی پێنجەم" هێندێك جار دەستەواژەی ئەوتۆی بەكاردەهێنا كە زۆر بەوردی بە ئینگلیزییەكەی نەدەهاتەوە: گومانلێكراوان "ئەوانەی بە گومان ئالودەن"و گەمەكاران " كەسانێك كە بەرژەوەندی میلەت دەكەنە بوكەڵە"

4 ـ بەتاتۆ، چینە كۆمەڵایەتییەكان، ٥٦٩.

5 ـ ساوادایی: هەمو لە چاوەڕوانی... ٨٤.

6 ـ كەمترین ژمارە ساوادایی (هەمو لە چاوەڕوانی، ل٩٨) دەربارەی خۆپێشاندانەكەی سەرلەبەیانی ٩ی ٢٧ كانونی دوەم داویەتیو كیمباڵ ـ یش گەورەترین ژمارەی داوە:

Lorenzo K. Kimball, The Chaning Pattern of Political power in Iraq. 1958 to 1971 (New York. Robert Speller &Sons, 1973), 148.

7 ـ ساوادایی، هەمو لە چاوەڕوانی.. ٩٩. بە قسەی لۆرینسیو كیمباڵ رادیۆی بەغدا داوای خەڵكی كردوە "بێنو چێژ لە جەژنو مێوانداری وەربگرن"و هەڵواسینی تاوانبارانی بە"یەكەمین هەنگاوی بوێرانە بەرەو سەربەخۆیی فەڵەستین" لەقەڵەم دەدا. رۆژنامەی ئەهرامی میسری بەمشێوەیە دەنوسێت: "هەڵواسینی چواردە كەس لە گۆڕەپانێكی گشتیدا بەدڵنیاییەوە مایەی دڵگەرمی نیەو شوێنی هەڵواسینەكەش نابێتە كاروانی شادی" كیمباڵ، هەمان سەرچاوە، ل١٤٨. ئەمەش تەنها نارەزایی نێودەوڵەتی بو بەرامبەر بە لەسێدارەدانە نمایشیەكانی بەغدا. پاشان بەعسیەكان فێربون لەجیاتی هەڵواسینی نمایشی، تابوتی مۆركراویان بۆ كەسوكاری كوژراوەكە دەناردەوە.

٨ ـ بروانە وتاری ٨/شوبات/١٩٦٩ كە چەند هۆكارێك پێكەوە دەبەستێتەوە، خستنی بەعسیەكان لە ساڵی ١٩٦٣، هەوڵە بێئاكامەكانی یەكێتی لەگەڵ سوریادا، بێكاریگەری خۆماڵی كردنەكانی نێوەی





دەیەی ١٩٦٠، مەسەلەی كوردو كۆمەڵێك شتی دی بۆ "هەمان دەست گێراوەتەوە كە لە كارەساتی ٥/ حوزەیران/١٩٦٧ رۆڵی هەبوە": لە وتەكانی سەرۆك (بەغدا، وەزارەتی پەروەردە، ١٩٦٩)، ١٥ ـ ٢٤.

9 ـ هەمان سەرچاوە، بەرگی دوەم، (بێ مێژوو)، ل ٥٨.

10 ـ زانیاری ئەم پیلانە لە راپۆرتێكی ٤٨ لاپەرەیی گۆڤاری ئەلئەنواری لایەنگری بەعس وەرگیراوە (بیروت، ١٩٧٠) بەناونیشانی "پیلانی شكستخواردو لە عێراق: سەرەتاو كۆتایی".

11 ـ گاردییان، ١٥/كانونی یەكەم/١٩٧٤.

12 ـ لە وتارێكی تاریق عەزیزەوە وەرگیراوە بەناونیشانی شۆڕش بەشێوەیەكی نوێ، نامیلكەیەكی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراكی، ١٩٧٧ بو.

13 ـ لە وتەكانی تاریق عەزیزدا ئەوە بەدیدەكرێ كە رووكەشو حەقیقەت تا چەند جیاوازییان لەگەڵ لەیەكتریدا هەیەو بۆچی هەمو ئەندامەكانی حیزب لەیەكناچن: "ئەو تێكۆشەرەی گیانی بەخۆنازینی هەیەو ئەمرۆ وەك كەسێكی مەقبول نایەتە بەرچاو، هەزارجار زیاتر سود بەشۆڕش دەگەیەنێت تا ئەو كەسەی كە هیچ پێشینەیەكی خەباتی نیەو قبوڵ دەكرێ. هەمان تێكۆشەر كە پێشینەیەكی راستەقینەی هەیەو ئەو پێشینەو غەریزەیەشی بەرەو رێگەی دروستی دەبات. بەڵام دادوەری كردن دەربارەی كەسێكی بێپێشینەی خەباتو تێكۆشان كارێكی گوماناوییەو پشت بەخەمڵاندن دەبەستێت. كاتێك نادروستیو ناپەسەندی سەرهەڵدەدا، پێویستە كەسی شۆڕشگێر بێهیچ دوودڵییەك ئەو شتانە بەهەند وەرنەگرێو فریوی شتی رووكەشی نەخوات. چونكە خۆراگرتن بەرامبەر كاری نادروست، دەبێتە مایەی ئاشكراكردنی درۆو بەرپەرچدانەوەی". لەراستیدا هەوڵو كۆششەكانی تاریق عەزیز بۆ ئەوەیە سوكایەتی بەواقیع بكاتو بڵێت ئەوەی راستو دروستە بەشێكە لە "رووكەش": Revolution of rhe New way . ٧٠.

14 ـ The 1968 Revolution in Iraq : Experience and Prospects, (London, Ithaca press 1979).

15 ـ راپۆرتی مۆرنینگ ستار، ٢١/ئایار/١٩٧٩.

16 ـ هەر دوو حەكایەتەكە لەرێگەی كەسی سێیەمەوە پێمان گەیشتوە.

17 ـ نیویۆرك تایمز، ٣/نیسان/١٩٨٤.

18 ـ رێكخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی، راپۆرتی ساڵانە، ١٩٨٢ (لەندەن، بڵاوكراوەكانی لێبوردنی نیو دەوڵەتی، ١٩٨٢)، ل٣٢٩، نحن ندين (پاریس، كۆمیتەی فرەنسی دژ بەسەركوتكردن لە عێراقدا، ١٩٨١).

19 ـ ناو، ساڵو پیشەی ٨٢ كەس لە ئەشكەنجەدراو، تیرۆركراو، هەڵواسراو یا دەرمانخوارد كراوەكان لە ساڵی ١٩٨٢دا لەرێگەی دەنگی هاوكاری عێراقی لە لەندەن، ژمارە ١٠، ئاشكرا كراوە (بەهاری ١٩٨٣)، ٨ ـ ٩ ، تەرمی زۆربەیان بەو شێوازەی باسكراوە دراوەتەوە بە كەسوكارەكانیان. ئەو كوژراوانە لەهەمو چینو توێژەكانی كۆمەڵگەی عێراقی بوون: كرێكاری بینا، قوتابی، فەرمانبەر، شۆفێر، جگەرەفرۆشو خوێندكاری زانكۆ.

20 ـ ڕێکخـراوی لێبوردنـی نێودەوڵەتـی، ڕاپۆرتـی سـاڵانە (١٩٨١)، لەنـدەن، بڵاوکراوەکانـی لێبوردنی نێودەوڵەتی، ١٩٨١، ٣٥٩، نحن ندين، ٥١ ـ ١٤٨.

21 ـ نیو ساینتیست (جیهانی نوێ) ٢/نیسان/١٩٨١، ل ٤ . ئەم ڕاپۆرتە نایابە جەخت لەسەر چەوسانەوەی زانـا کـوردەکان دەکاتـەوە، هەروەها چاوپێکەوتنـی لەگەڵ قوربانییـەکان تێیدایەو وەسـفی ڕوداوو حاڵەتە کەسێکان دەکات.

22 ـ گشت وردەکارییەکان لە ڕاپۆرتی لیژنەی لێبوردنی نێودەوڵەتی وەرگیراوە، عێراق: داتاکانی ئەشکەنجەدان (لەندەن، بڵاوکراوەکانی لێبوردنی نێودەوڵەتی، ١٩٨١).

23 ـ لانگۆت، تیرۆری شاراوە (نیو یۆرك، پانتیۆن، ١٩٧٨).

24 ـ مایکل فۆکۆڵت لە کتێبی، دیسپلینو سزادان: لەدایکبوونی زیندان، نیۆ یۆرك، کتێبی ڤینتیج، ١٩٧٩، ٤٨ ـ ٤٩. سەبارەت بە ئەوروپای سەدەی هەژدەهەم ئاماژەی بەم خاڵە کردوە.

25 ـ زانیـاری پەیوەسـت بەو پاکتاوکردنە لـە ڕاپۆرتێکی نهێنی وەرگیراوە کە لەلایەن گۆڤارێکی سـەرەکی ئەوروپییەوە ئامادە کراوەو ناخوازێت ناوی ئاشـاکرا بکرێ. ئەلنەهار ئەلعەرەبی ئەلدەولی لە ١٢/ئاب/١٩٧٩، ئەلتەیار گۆڤارێکە سەر ئۆپۆزیسۆنی شیعەی عێراقەو هەفتانە لە لەندەن دەردەچێت لە ژمارەی تەموزی ١٩٨٣دا ناوی ٥٧ بەعسـی پایەبەرزی بڵاوکردۆتەوە کە سـاڵی ١٩٦٨ بەشێوازی جۆراوجۆر کوژراون، لە سەرچاوەی شەخسـییەوە وەرگیـراوە. ئەم دوو ڕاپۆرتە جیاوازییـان هەیە، بەڵام مانای گشـتی پاکتاوکردنەکە تارادەیەك هاوبەشە.

26 ـ بەعسـیەکان قەنارە نمایشـییەکانیان بەکامێرای ڤیدیۆ تۆمار دەکردو هێندێك لەو کاسێتانەش بۆ دەرەوە دزەیان کرد، ئیدی حیزبی بەعس دەستی بەو کاسێتانە ڕانەدەگەیشت تا لەنێویان بەرێت، بۆیە ئەو کاسێتانە خزمەتـی بەلایەنـی نەیار دەکـرد، بەپێچەوانەی ئەو ئامانجانەی کـە لە پێناوێدا تۆمار کرابـون. هێندێك لە کاسـێتەکان کەسایەتی گرنگی بەعسی ڕووندەکردەوەو بەمەبەسـتی پێشاندانی ڕەوانەی نێوەندەکانی حیزب دەکران. کاسـێتێك لەسەر دانپیانانەکانی ڕەشید تۆمار کرابو، ئامادەکارێکیش قسەی لەسەر وردەکارییەکانی دەکرد، بەهەر حاڵ من ئەو کاسێتەم نەدیوە.

# بەشی سێیەم

# فیکری بەعسو جەماوەر

## ئایدیۆلۆجیاو ڕێکخستن

"ئەزمونەکان ئەوە دەردەخەن کە وێناکردنو دەست نیشانکردنی چوارچێوەی ئایندە، بەبێ دیاریکردنی ماوەیەکی دیاریکراو، دەتوانێ زۆر کاریگەر بێتو نارەحەتییەکی کەم لەگەڵ خۆیدا بهێنێت، ئەوەش لە حاڵەتێکدا دەبێت کە پێشبینی کردنی ئایندە شێوەی ئەفسانە لەخۆبگرێت کە خاوەنی بەهێزترین میتۆدو ئارەزوی نەتەوەیەك، حیزب یا چین بێت، ئارەزوییەك لەتەواوی هەلومەرجی زیندەگیدا لەگەڵ دەسەڵاتێکی لەبابەت غەریزە گوروژم بۆ زەین دەهێنێتو لایەنێکی واقیعیش بە ئومێدی کارێکی یەکسەرەو راستەخۆ دەخاتەروو کە میلەت بە هاوکاری ئەو کارە، زیاد لە هەر شێوەیەکی دی دەتوانێت حەزو سۆزو چالاکییە هزرییەکان چاکبکات[1]".

ئەو فەیلەسوفانەی لەگەڵ ڕێنوێنیەکانی ناپلیۆن پۆناپارتدا نەدەگونجان بە"ئایدیۆلۆجیست" ناویدەبردن، پاشان کەنارگیری دەکردن، بەڵام ئەو لایەنانەی لە ئایدیۆلۆجیای مارکسیزمەوە نزیکبون، لە دەست نیشانکردنی بونیادی کۆمەڵایەتیدا پشتیان بەچینەکان دەبەست، ئەمە لە کاتێکدا ئەم بونیادە لەدیدی بیریارێکی وەك دۆرکایم یا لیڤی شتراوس مانایەکی دی دەگەیەنێت. ڕۆژئاوا وەك فیکرێك لە ئایدیۆلۆجیا دەڕوانێت کە خزمەت بە بەرژەوەندی هەڵگرەکانی دەکات. بۆیە کاتێك لە ڕۆژئاوا قسە لەسەر ئایدیۆلۆجیا دەکرێوکەسێك بە ئایدیۆلۆجیست ناودەبەن کە لە بڕیار وەرگرتندا بابەتیو لۆجیکی نەبێ.





ڕێك بەپێچەوانەوە، جیهانی سێیەم لەدوای جەنگی جیهانی دوەمەوە هەوڵدەدا ئەو ئایدیۆلۆجیانە بەرز رابگرێت کە لەناوخۆیی وڵاتدا هەڵدەقوڵێن. جیهانی سێیەم بەدوای ئایدیۆلۆجیا جیهانییە ئامادەکراوەکاندا ناگەڕێت، هەروەکو بیریارە ڕۆژئاواییەکان، هەر لەسەردەمی ڕۆشنگەرییەوە تا زەمانی مارکس بەدوایدا دەگەڕان (ئەمە سەرباری ئەوەی کە ئەو ئایدیۆلۆجیانە بەئەسڵ ئەوروپی بوون)، لە جیهانی سێیەمدا ئایدیۆلۆجیا کۆمەڵێك بنەمایە لەچوارچێوەی نەتەوەییدا کە لەگەڵ ئەنگیزەی کارو ڕێوشوێنی سیاسیدا موتوربەکراوە، بەتایبەتی ئەگەر چالاك بێت، چەشنی هەمو شتێکی دی وەك حەقیقەت وەردەگیرێ، بۆیە ئینتما بۆ جیهانی سێیەم ئەو چەترەیە کە هەمو ئەو ئایدیۆلۆجیا خۆجێیەکان پەنا دەدا. بەپێی پێناسە ئایدیۆلۆجیا شێوەی تێڕوانیە لە هەمو جیهان، بەڵام بەتەنها لە گۆشەنیگاو بەرژەوەندی رووتی جیهانی سێیەمەوە کە بەشێکە لە جیهان. ئایدیۆلۆجیای جیهانی سێیەم چەندین جۆری میلیگەرا، دژە ئیمپریالیزمو دواتریش بونیادگەرایی ئیسلامی لەخۆگرتوە، بەڵام پەیوەندی بەسەرنجە گشتیترو جیهانییە مرۆیەکانەوە نییە (هێندێك جار دژایەتیشی دەکات)، ئەم ئایدیۆلۆجیایە هەر چییەك بێت پەیوەندیی بەمارکس یا فەیلەسوفەکانی ناپلیۆنەوە نییە.

حیزبی بەعس ئەم چەمکانەی (دژایەتی کردنی ئیمپریالیزم، ئینتما بۆ جیهانی سێیەم، نەتەوەگەرا) تا ئەوپەری سنور هەڵگرت، ئەویش کاتێك بڕیاری دا هەموو شتێک ڕێژەیی لە پرۆسە بوندایەو هەر چی شتێکیش دەستکردی بەعسیەکان نەبێت، شەرعییەتی نیە. ئەو ئامانجانەی پێویستە بێتەدی، ئەو ئامانجانەیە کە ڕێز لە بەرژەوەندی نەتەوایەتی دەگرێ. سەدام لە وتارێکیدا بەرامبەر بەئەندامانی حیزبی بەعس دەڵێت: " ئەو پڕەنسیپو ئەزمونانەی ئێوە دیاریدەکەن، هەمان ئەو پڕەنسیپو ئەزمونە راستەقینانەیە کە بەشداری لە بونیاتنانی نەتەوەی عەرەبدا دەکەن"، هەروەها لەهەمان گوتاردا داوایان لێدەکات دیوارێك لە ناخیاندا دروست بکەن تا لە شەڕەئەنگیزی ئەو بیروباوەرو کاریگەرە دەرەکیانە بپارێزرێن کە ئاڕاستەی نەتەوەی عەرەب دەکرێن[2]. سەدام حسێن لە وتارێکی دی سەبارەت بە نەرمی نواندن لە کاری شۆڕشگێرێتیدا

هێرشـی کردە سـەر ئەوانەی خودی نەرمی نواندن وەك ئامانج دەبینن، چونکە درك بـەوە ناکەن کە مەرجی سـەرەکی شۆڕشـگێڕێتی هێـرش‌و روبەروبونەوەیەو دەکرێ شۆڕشگێڕ لە پێناوی مانۆڕێکی تاکتیکیدا کەمێك بەلاوەیبنێت[3].

فیکـری بەعس کـە زۆر بەزەحمەت لە کۆمەڵگەی عەرەبـی یەکگرتودا جێبەجێ دەکرێ، لە دەوری هێندێك بیروباوەڕی ئەفسانەیی تەوەرە دەبەستێت کە لە کەلەپوری عەرەبی‌و ئیسلامییەوە وەرگیراوەو بە فیکری چەپ رووپۆش کراوە، دروشمی یەکێتی عەرەبـی، ئازادی‌و سۆسـیالیزم‌و بەرەنگاربونەوەی کۆلۆنیالیزم‌و زایۆنیزم بەشـێکە لەو ئەفسـانانەی کە لە واقیعدا جێبەجێ ناکرێ، ئەم دروشـمانە نە بیرۆکەیەکمان لەسەر واقیعی کۆمەڵگەی عەرەبی پێدەدا، نە ئەو بارودۆخەی کۆمەڵگەی عەرەبی دەیەوێت پێیبگات، بەڵکو تەنها هێواو ئاوات خواستن بو.

ئـەوەی لەم دروشـمانەدا گرنگ بێت پەیوەسـت نیە بەواقیعبوونیانـەوە، هێندەی پەیوەسـتە بەو هەنگاوانەی کە حیزب بۆ بەدیهێنانی ئەو دروشـمانە دەیگرێتەبەر. ئەو ئەفسـانانە وەك سەرەتای راستییەك پێشـکەش بەکۆمەڵگەیەکی باشتر دەکرێن، نەك وەك مشـتێك سـاختە بخرێنەروو. لەسـەر هەمان بنەماش بەعس هەوڵی دەدا بۆنو بەرامەیـەك بۆ بانگەشـەکانی زیاد بـکات، لەجیاتی ئەوەی وەك سـتالین هەوڵبدات زانستیبوون‌و بابەتیبوونیان بسەلمێنێت:

"ئەو لێکۆڵیارو مێژووناسـانەی بانگەشەی بابەتیبوون دەکەن، چەندین دیدوبۆچون بـۆ راڤەکردنـی دیاردەیـەك پێشـکەش دەکـەن‌و بەتەنهـا هەڵگۆزیـن بـۆ خوێنەر بەجێدەهێڵن، بەڵام حیزبی بەعس هەرگیز بەو شێوازە لەگەڵ مێژوو و مەسەلە فیکری‌و کۆمەڵایەتیەکانی دی مامەڵە ناکات. پێویستە نوسینەوەی مێژوو هەمان شێواز بگرێتەبەر کە حیزبمان دەیگرێتەبەر، بەمانایەکی دی پێویستە نوسینەوەی مێژووی عەرەب پشت بەبەدیدوبۆچونی ئێمە ببەسـتێت، لەسەر شـیکردنەوەی رووداوەکان، نەك گێڕانەوەی چۆنێتی رودانی.

بۆ نمونە کاتێك گفتوگۆ لەسـەر بیرۆکەی یەکێتی عەرەب دەکەین، نابێت باسـی



دابەشبون‌و پارچەپارچەبوون بۆ قوتابیان بکەین، هەروەها نابێت هەوڵی سەلماندنی ئەوە بدەین کە ئێمە یەك میلەتین یا نا، بەڵکو ئەوەندە بەسە پێیان بڵێین ئێمە یەك میلەتین کە ناکرێ دابەش بکرێت‌و ئەوەش وەك واقعێك‌و حەقیقەتێکی رەها بگەیەنین، تەنها کۆلۆنیالیزم هەمیشـە هەوڵدەدا جیاوازی بخاتە نێوانمانەوەو پەرتمان بکات تا بتوانێت کۆنترۆڵمان بکات. بەهەمان شێوەش کاتێك لەسەر حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی وەك حیزبێکی رێبەر قسـەیان بۆ دەکەین، دەبێ بەشـێوەیەك قسـەیان بۆ بکەین کە ئەم ئامانجە بەراسـتی هاتۆتەدی، بەڵام سـەبارەت بەچۆنێتی بەدیهاتنی ئەم ئامانجە، تەنها ئەوەندە بەسـە بۆیان روونبکەینەوە، چۆن حیزب لەرێگەی شۆڕشـەوە توانیویێتی پارێـزگاری لە میلـەت بکات، بێئەوەی لەم قۆناغەدا مێشـکی منداڵان بەوردەکاری فیکری یا فەلسەفی یا سیاسیەوە سەرقاڵ بکەین"[4].

سـنورداریێتی‌و داهێنانی ئەفسانە لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی فیکری بەعسە، چونکە جیهانی دەرەکی دوژمنی بەعسەو هەمیشە هەوڵدەدا ریزەکانی لەتبکات، ئەم جیهانە بەرپرسی ئەو هەمو شتانەیە کە لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی بەعسدا بوونی هەیە، تەنانەت بچوکترین رەگی گەندەڵی رژێمیش لەم دوژمنە پۆخڵە دەرەکییەوە سەرچاوە دەگرێ. پاراستنی یەکێتی‌و دامەزراندنی نەتەوەی عەرەبی (بەعسی) یەکگرتوو تەنها بەلابردنی بەربەسـتەکانی بەردەم ئەو یەکێتیە نایەتـەدی، بەڵکو بە بەدیهێنانی یەکێتییەکی مەزن یا گەیشـتن بە ئاستێکی باڵای رێکخسـتن دێتەدی، دەشێت جیهانی دەرەکی تەنها بەهێزی رێکخسـتێکی چالاك شکسـتی پێبهێنرێ. ئەوەندە بـەس نیە بڕوا بەفیکری بەعـس بهێنین، بەڵکو گرنگـە ئەوەیە خۆمان رێکبخەین، سروشـتی دوژمنکارانەی حیزبی بەعس لەم بیرۆکەیەوە سەرچاوە دەگرێ.

لە روانگەی حیزبی بەعسـەوە ئایدیۆلۆجیا چوارچێوەی هەمو کارێکی سیاسـییە، هـەر چەندە سـەرئەنجام ئایدیۆلۆجیا کاروبارەکان ئاراسـتە دەکات‌و شـەرعییەتیان پێدەبەخشـێ، بەڵام ئەو کـارەی حیزب یا رێبەر ئـەنجامی دەدا بـەهیچ شـێوەیەك پێویسـتی بە ئاراسـتەکردن‌و رێنواری نیە، ئەم سـنوربەندییەی نێـوان جێبەجێکارانو

تیوریستان لەسەردەمی ناپلیۆن‌و فەیلەسوفەکانیدا شتێکی باو نەبو، بەڵام لەدیدی حیزبی بەعسەوە، رێکخستن‌و ئەفسانە یەك شتن‌و هەرگیز جیانابنەوە. لەم یەکێتییە سەیرو نامۆیەدا ئەفسانە بەتەواوەتی بێدابەشکردن وەردەگیرێ، لەبەر ئەوەی ئایدیۆلۆجیا یا هەموی وەردەگیرێ یا بەتەواوەتی فەرامۆش دەکرێ، بەڵام چۆن رێکخستن لە عێراقدا ئەفسانەی بۆ واقیع گۆڕیوە؟.

## گرنگی لاوان:

بەعسییە واقیعی‌و راستەقینەکان باوەڕ بەو کەسانە ناکەن کە پێش ١٩٦٨/٧/٣٠ لە دایکبوون، ئەمە سەرەڕای ئەوەی "ئامانجی حیزب بریتیە لەوەی، هەمو عێراقییەکان بکاتە ئەندامی حیزبی بەعس‌و بڕوا بەبیروباوەری بەعس بهێنن"، نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو بەپەرۆشبون هەمو نەتەوەی عەرەب بکەن بە بەعسی. بەڵام پێویستە حیزب بزانێت کە لاوان ماوەیەکی زیاتر دەژین، بۆیە دەتوانن لە پێناوی حیزبدا شتی زیاتر پێشکەش بکەن، سەرئەنجام چالاکانەتر بەشداری لە پرۆسەی گۆڕانی شۆڕشگێڕانەدا دەکەن[5].

جدیی بوونی حیزبی بەعس لە پیادەکردنی بیروباوەریدا، تۆکمەترین وێنەی لەو شێوازەدا رووندەبێتەوە کە لە رێکخستنی لاواندا دەگیرێتەبەر. منداڵانی قۆناغی سەرەتایی دەبن بە پێشڕەو، ئەوانەی لە هەر دوو رەگەزەکەدا تەمەنیان لە نێوان ١٠ بۆ ١٥ ساڵ بێت، پێیاندەوترێت پێشەنگ (طلائع)، بەڵام لاوانی تەمەن ١٥ ـ ٢٠ لە رێکخراوی لاواندا (فتوة) رێکدەخران، ئەوانە لە دیدەوانی (الکشافة) نەدەچون، بەڵام بەشێوەیەکی کارا بەشداریان لە چالاکییەکانی حیزب دەکرد. ساڵی ١٩٧٤ کۆنگرەی حیزبی عەرەبی ئیشتراکی ئەو ئامانجانەی بەمشێوەیە کورت کردۆتەوە:

" ئەوەی لەم بوارەدا بەدیهاتوە هێشتا هەر سەرەتایەو ناگاتە ئاستی ئامانجو بەرخوازیی‌و پێداویستییەکانی قۆناغی نوێی حیزب، بۆیە پێویستە لەسەر حیزب هەوڵێکی



زۆر بدات بۆ کاراکردنی رێکخراوەکانی لاوان‌و باڵاکردنیان، دەبێ ئەو رێکخراوانە زۆرینەی کوڕان‌و کچانی لەخۆبگرن‌و لەسەر بنەمای نەتەوایەتی عەرەب‌و سۆسیالیزم پەروەردەیان بکەن، هەروەها پێویستە فێربکرێن‌و رابهێنرێن بۆ ئەوەی چالاکانەتر بەشداری لە بونیاتنانی شۆڕشگێڕی‌و بەرگری لە نیشتمان‌و ئەرکە نەتەوایەتییەکانی عەرەبدا بکەن"[6].

چەند ساڵێك دوای کۆنگرەی هەشتەمی حیزب، زۆرینەی لاوانی عێراق لەو رێکخراوانەی لاوانەوە تێپەڕیبون. ئەندامانی ئەم رێکخراوانە سوێندیان دەخواردو یەك جۆر جلو بەرگیان دەپۆشی‌و بەپێی پلەبەندی ئیداری حیزب رێکدەخران. رێکخراوی پێشەنگ کە ساڵی ١٩٧٣ دامەزراوە، گرنگترین رێکخراویی ئەو سێ رێکخراوە بو، کۆنگرەی نیشتمانی‌و هەرێمایەتیی‌و ناوچەیی خۆی گرێدەداو "نوسینگەی ناوەندی" خۆی هەڵدەبژاردو ئەویش لەلای خۆیەوە "لیژنەی ناوەندی" هەڵدەبژارد. هیچ یەکێك لەو رێکخراوانەی لەسایەی "یەکێتی گشتی لاوانی عێراق"دا گردببونەوە، بەرەسمی سەر بەئۆرگانەکانی حیزبی بەعس نەبون، بەڵکو سەر بەدەوڵەت بون، بەڵام حیزب رێکخراوی لاوانی تایبەتی بەناوی "پارتیزان"ەوە هەبو.

سەرباری ئەوەش، لاوان لە قوتابخانەکاندا کۆبونەوەی خۆیان دەکردو هێندێك لەئەندامە پایە بڵندەکانی حیزبیش یا لایەنگرەکانیان وانەو بنەمای گشتی شۆڕشگێڕێتیان پێدەوتنەوە. هەروەها داوایان لێدەکرا راپۆرت بنوسن‌و زانیاری جیاواز کۆبکەنەوە، هەر چەندە بەئەندامبون لەوجۆرە رێکخراوانەدا بەزۆر نەبو، بەڵام ترس کردبوی بە کارێکی ئیجباری. بەمشێوەیە دوای تێپەڕبونی چەند ساڵێك، هەر کەسێك تەمەنی بگەیشتایەتە دە ساڵ یا زیاتر لەمجۆرە رێکخراوانەدا رێکدەخرا، بەڵام لە پێش تەمەنی دە ساڵیشدا فیکری بەعسیان پێدەوتنەوە، واتە لە تەمەنی پێنج شەش ساڵیدا، ئەو کاتەی لە قوتابخانە وەردەگیران.

پەڕگیری (رادیکاڵییەت) لە فیکری بەعسدا بەمەبەستی شکاندنی دابونەریت‌و گۆڕینی رەفتاری کۆمەڵگەی عەرەبی، لەرامکردنی ئەو هێزەی لەم رێکخستنەوە

بگوێزنەوە بۆ ئەوەی درێژە بەهەمان ڕێاز بدەن. ئەمەش وەك كارێكی مەزن دەردەكەوێت ئەگەر لەگەڵ هەمو تاوانەكانی دی حیزبی بەعسدا بەراورد بكرێ، هەر لەتوشبون بە گرێی ترس لە بیانی تا دەگاتە پاكتاوكردنی جەستەیی ئۆپۆزیسیۆن یا ئەوانەی بەرامبەر بەحیزب گومان لە دڵسۆزیان دەكرێ. منداڵی عێراقی، نەك بەشێوەیەكی ناراستەوخۆ لە ڕێگەی بەرنامەی خوێندنو ژمارەی قوتابخانەكانەوە، بەڵكو لەقوڵایی فیكری ئازادو پێكهاتەی كەسایەتییەوە لێدانی قوڵی بەركەوت.

هەمو خێزانێكی عێراقی لەمڕووەوە حەكایەتی تایبەتی خۆی هەیە. حەكایەتی منداڵێكی یازدە ساڵیان بۆ گێڕامەوە كە لە قوتابخانە شتێكی لەدەم دەرچوە، ئیدی دەمودەست لێپێچینەوەی لەتەكدا كراوەو ماوەی دوو مانگیش دایكو باوكیان بێسەرو شوێن كردوە. زۆرجار لەدوای ونبونێكی لەوجۆرە شتەكان بۆ دۆخی جارانیان دەگەڕێنەوە.

ئەو دایكو باوكانەی بەعسی نین لەبەرامبەر منداڵەكانیان نابەعسیبونی خۆیان دەشارنەوە، بەڵكو زۆرجاریش ناچاریان دەكەن پەیوەندی بەڕێكخستنەكانی لاوانەوە بكەن، بەوەش سەلامەتی ژیانی خۆیانو منداڵەكانیان دەپارێزن.

لە وتەكانی سەدام حسێندا سوربون لەسەر گۆڕانكاری شۆڕشگێڕانە بە جوانی دەردەكەوێت، كاتێك دەڵێت سەرباری ئەو دەسكەوتە گەورانەی بەدەستمان هێناوە "بەڵام بەرخوازییەكانمان زۆر لەوەی بەدەستمان هێناوە گەورەترە"، هەروەها سەدام لەوتەكانیدا ئاماژە " بەئەزمونە شكستخواردوەكانی جیهانی سێیەم" دەداو هۆی ئەو شكستەش دەگێڕێتەوە بۆ نەگۆڕان یا ناكامی سەركردەكان، لەوەی ئەوانی دی بە ڕۆحی شۆڕشگێڕێتی پەروەردەبكەن. لەبەر ئەو هۆیە گرنگی مامۆستای سەرەتای لە هاوڵەكانی لە قۆناعی ئامادەی زیاترەو ڕۆڵی ئەویش لە ئوستازێكی زانكۆ زیاترە، چونكە خوێنكار لە زانكۆدا دەگاتە ئاستێك كە چیدی چاوەڕوانی گۆڕانی لێناكرێ[8].

سەدام حسێن چەمكی تەقلیدی لەسیستمی زنجیرەی وەزیفیو كۆمەڵایەتی ئاوەژو كردەوە، ئیدی ئوستازێكی زانكۆ ئەو گرنگی یا پێگە كۆمەڵایەتییە بەرزەی جارانی



سەرچاوەی دەگرت، خۆی متكردبو. بۆ نمونە بەمەبەستی داغانكردنی خێزانی عەرەبی لەم وتانەی سەدام حسێن وردبەرەوە:

"لەپێناوی لەناوبردنی دەسەڵاتی كۆنەپارێزی باوكانو دایكان، لەناو خێزاندا، پێویستە هاوكاری بچوكەكان بكەین بۆ ئەوەی كاریگەرییان هەبێت، هێندێك لە باوكانمان لە دەست چوە، بەڵام بچوكەكانمان لە بەردەستەو بەشێوەیەك ئامادەیان بكەین تا ئەو گۆڕانكاریە لە ناو خێزاندا بگرنەدەستو ئەو ماوەیەش بقۆزنەوە كە لەناو ماڵەوەدا بەسەری دەبەن، هەروەها پێویستە منداڵان لە كارێگەرە خراپەكانیش بپارێزین.

پێویستە یەكانگیری خێزان لەسەر چەمكی كۆنەپارێزی بونیات نەنرێ، بەڵام پێویستە لە تازەكردنەوەی كۆمەڵگەدا پشت بە پرەنسیپی شۆڕشو سیاسەتەكانی ببەسترێت ، كاتێك ناكۆكییەك دەكەوێتە نێوان یەكانگیری خێزانو ئەم پرەنسیپانەوە پێویستە ئەو ناكۆكییە لەبەرژەوەندی پرەنسیپەكاندا تەواو بێت.

پێویستە لە ڕێگەی بچوكەكانەوە دەوری گەورەكان بدرێت، تا ڕێگەی ڕاكردنیان لێبگیرێتو سود لە ئامرازەكانی دیش وەربگیرێ. قوتابیان فێر بكەن چۆن نارەزایی دەربڕنو باوكانیان ئاگادار دەكەنەوە كاتێك گوێیان لێدەبێت باس لە نهێنییەكانی دەوڵەت دەكەن. فێریان بكەن چۆن باوكانو دایكانیان سەرزەنشت دەكەن، كاتێك دەبیستن قسە لەسەر نهێنییەكانی حیزبو ڕێكخراوەكانی دەكەن. دەبێ لە هەمو گۆشەیەكدا ڕۆڵەیەكی شۆڕش دابنرێ، ئەوانەی بەعەقڵو بەچاوێكی كراوەوە ڕێنمایی لە دەسەڵاتی ناوەندی شۆڕشەوە وەردەگرن. فێریان بكەن چۆن بەرێزەوە نارەزایی لەسەر باوكو دایكیان دەربڕن، گەر تێبینیان كرد سەروەتو سامانی نیشتمان بەهەدەر دەدەن، ئەو سامانەی لە سەروەتو سامانی شەخسیان پڕ بەهاترو ئازیزترە، چونكە ئەگەر دەوڵەت سامانی نەبێت، ئەوانیش سامانی تایبەتیان نابێت، دواجار سەروەتو سامانیان بریتیە لە سەروەتو سامانی دەوڵەت. هەروەها منداڵان فێر بكەن لەو قۆناغەدا لە خەڵكانی بیانی دوربكەونەوە، لەبەر ئەوەی چاوی دەوڵەتەكانی خۆیانو

هێندێکیشیان دوژمنی شۆڕشو خەڵکانی خراپەکارن. هاورێیەتی خەڵکی بیانیو قسەکردن لەگەڵیاندا، بەبێ کارمەندی کۆنترۆڵ کارێکی یاساغە، لەناخی منداڵاندا وریایی‌و چاوکراوەیی بچێنن بۆ ئەوەی زانیارییان لەسەر نهێنییەکانی دەوڵەتو حیزب پێنەدەنو هاورێو ناسیاوو کەسوکاریشیان بە گەورەو بچوکەوە ئاگادار بکەنەوە کە قسە لەگەڵ بیانیەکاندا نەکەن. منداڵ لەبەردەستی مامۆستاکەیدا لە پارچە مەرمەڕی بەردەستی پیشەکارێکی شارەزادا دەچێت کە دەتوانێت پەیکەرێکی هونەری نایابی لێدروست بکات یا بۆ فاکتەری کات یا گۆڕانکاری سروشتی بەجێیهێڵێت "[7].

لەبەرچاونەگرتنی ئەو وتانە بەبیانوی ئەوەی پوختەی عەقڵێکی نەخۆشی کەسێکی بەتواناو دەسەڵاتی عێراقە، لەبەرچاونەگرتنی پێشینەیەکی دورودرێژی بزوتنەوەیەکە کە بەردەوام جەخت لەسەر چەمکی پەروەردە دەکاتەوە، بۆ نمونە میشیل عەفلەقو سەلاحەدین ئەلبەیتارو ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر مامۆستا بون، ئەم ئاراستەیە کە لە بڕگەکانی پێشوتردا تێبینیمان کردوە، لەماوەی قۆناغێکی دورودرێژی بیناکردنی حیزبدا بەسەر زۆربەی بەڵگەنامەکانی حیزبو کۆنگرەکانیدا زاڵبوە. وادەردەکەوێت ئەو بڕگانە لە وتەو وتارەکانی پێشوتری حیزب توندتر بوبێت، چونکە سەدام حسێن قسەی بۆ کۆمەڵێك کارمەندی وەزارەتی پەروەردە دەکرد. بارودۆخەکە زۆر لەبار بو، بەتایبەتی ئەگەر ئەوە لەبەرچاو بگرین کە ئیرادەی حیزب لە کەسایەتی سەدام حسێندا بەرجەستە ببو، هەروەها لە پشت رێکخراوە مەزنەکانی وەزارەتی پەروەردەشەوە کە بەریوەبەرەکانیان لەو کۆبونەوەیەدا ئامادەبون، هێزێکی مەزنتر لە پۆلیسی نهێنیو هەواڵگر لە نێو کادرانی ئەو وەزارەتەدا ئامادەگییەکی بەرچاویان هەبو.

لە جوڵەی بێئەمان بەرەو سیستمێکی نوێ، ئەرکی نەوەی ئێستایە قوربانی بدات لە پێناوی ئەوەی هەلومەرج بۆ نەوەی داهاتو فەراهەم بکات. ئەو نەوەیەی کاری بۆ جێگیرکردنی چەمکەکانی حیزب دەکردو پاشان هێزو توانای پێبەخشیو سەرجەم خەڵکە بێلایەنەکەی کوژران، هەرگیز خەونی بەوەوە نەدەبینی بەوجۆرە لە کوانوی حیزبدا قوربانی بدات. پێویستە لەسەریان ئەو بارە قورسە بۆ جگەرگۆشەکانیان



نەما کە لە هاوڵەکانی قۆناغی سەرەتایی‌و ئامادەیی جیادەکردەوە، بەڵکو مامۆستایەکی سەرەتایی گرنگییەکی زیاتری پەیداکرد، چونکە پەیوەندی بە کادرە (منداڵەکان) سەرەتاییەکانی شۆڕشەوە هەبو. هەمو کەسێك لە بەرامبەر پۆلیسدا یەکسانە، سەدام حسێن ئەوەی بەدیموکراسیەت دەزانی، ئەوەش ئەو بیرۆکەیە بو کە سەدام لە وتەکەیدا بەناوی، "دیموکراسی سەرچاوەی هێزو توانای تاكو کۆمەڵگەیە" جەختی لەسەر دەکردەوە:

"هیچ ناکۆکییەك لەنێوان دیموکراسیو دەسەڵاتدا نیە. نابێت هیچ کەسێکتان لەو باوەڕەدا بێت یا وابیربکاتەوە کە دیموکراسی پێگەی دەسەڵات لاواز دەکات. پاڵپشت بە هاوسەنگی زانراوی نێوان دیموکراسیو نیوەندێتی، هیچ جیاوازییەك لە نێوان نێوەندێتیو پیادەکردنی دیموکراسیدا نیە. تەنها گێلەپیاوان پێیانوایە ناکۆکی لە نێوان چاودێرێکردنو رەفتاری برایانە یا لە نێوان پارێزگاری رۆڵو سەرکردایەتیدا هەیە"[9].

سەدام حسێن دەیویست دەسەڵاتی هەرەمی تەقلیدی لەنێوبەرێت کە دەسەڵاتی راستەقینە لە لوتکەی هەرەمەکەدا چڕدەبێتەوەو تا بەرەو بنکی هەرەمەکەش بڕۆیت دەسەڵات تێیدا لاواز دەبێت[10]. هەر ئاستێك لە ئاستەکانی وەزیفیی لەو هەرەمەدا دەسەڵاتێکی گەورەتری لە ئاستەکەی خوار خۆیو دەسەڵاتێکی کەمتر لەوەی سەروی خۆیەوە هەیە. ئەمەش فۆرمی ئەو دەسەڵاتەیە کە لە کۆمەڵگە عەرەبییەکاندا لەسەردەمی دوای سەربەخۆیی بوونەوە پێرەوی لێدەکرێ. بەڵام لەرژێمی سەدامدا دەکرێ شتەکان بە بازنەیەك بچوێنرێ کە چەندین خاڵی یەکسان لە بەهاو بایەخ لەسەر رووی ئەو بازنەیەدا بڵاوبونەتەوەو هەموشیان بە سەرچاوەی تاکە هێزێکەوە بەستراونەتەوە کە لەناوەندی بازنەکەدایە. منداڵ لە کۆمەڵگەی تەقلیدی عێراقیدا کەمترین ئازادی لە خێزاندا هەبو، بەڵام لە رژێمی سەدامدا منداڵ بەیەکسانی لە ئاست باوكو دایکی دادەنرێو دەسەڵاتو مەرجەعییەت لە باوانیان لێدەسەنرێتەوەو داوا لە منداڵان دەکرێ بەرێزەوە سیخوریان بەسەرەوە بکەن. لە دیموکراسیەتی

سـەدام حسـیندا هێز لە فۆڕمی "بەوپەڕی وردی‌و بەپەرۆشەوە مل بۆ فرمانەکان کەچ بکرێ" پێناسـە دەکرێ، لەم حاڵەتەشدا هێز شتێکی شەخسی نیە، بەڵکو مەرجێکی سـەرەکی‌و بابەتییە، بەڵام دەسەڵاتەکانی دی، دەسـەڵاتی راستەقینە نین‌و پەیوەستی بەکات‌و شوێنی تایبەت‌و دیاریکراوەوە هەیە[11].

سـەدام هانی گوێگرەکانی دەدا رۆحی سیسـتم‌و دیسـپلین لەنێو لاواندا بچێنن، لەبـەر ئەوەی نەزم‌و سیسـتم "یەکێکە لە نهێنییەکانـی بونیاتنانی کۆمەڵگەی نوێ"، ئەمـەش ئاماژەیەکە بەوەی کە ئەزمونی حیزبی بەعس شکسـت ناهێنێت، هەروەکو ئەزمونی وڵاتانی جیهانی سـێیەم شکسـتی هێنا. بەڵام مەبەست لە "سیستم" چییە؟ وتارەکەی چەند نمونەیەکمان پێدەدا: رێزگرتن لە کات‌و بەچاکی بەکارهێنانی، جوان دانیشـتن لەکاتی نانخواردندا (لێرەدا نیو لاپەرەی تەواو تەرخاندەکات لەسەر چۆنێتی بەکارهێنانـی چنـگاڵ‌و چەقۆ لەکاتی نانخواردنداو وازهێنان لە نانخواردن بەدەسـت کە نەریتێکی عەرەبی بو)، رێزگرتن لەباوک‌و دایک، رێزگرتن لە سامانی (سۆسیالیزم) گشـتی، دوور کەوتنەوە لە خووڕەوشـتی بۆرجـوازی (بێ راڤەکردنی وشـەکە)و لە دوایشـدا: "ئەو قوتابییەی بەو رێنماییانەوە دەربەست دەبێ، ئەگەر پێویست بکات، دەتوانێ شـەوو رۆژ بێئەوەی چاوڵێك بنێت، دەست بەتفەنگ لەبەر هەتاو بوەستێت‌و ئەرکی سەرشـانی جێبەجێ بکات. کاتێك داوای لێدەکرێ لەناوچەیەکی پڕ ئاژاوەدا روبـەروی ئیمپریالیـزم یا هەر دەسـتدرێژکارێکی دی ببێتەوە، دەمودەسـت ئەو کارە ئەنجام دەدا، چونکە هەر منداڵییەوە فێری دیسپلین‌و سیستم بوە"[12].

لە هاوینی ١٩٨٣دا تەلەفزیۆنی بی. بی. سی بریتانی چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ هێندێك یەخسـیری ئێرانیدا پێشـکەش کرد، کە لە یەکێك لە ئۆردوگاکانـی عێراقدا ژیانیان بەسـەر دەبرد، کاکی دەرهێنەریش بەناقەسـت هێندێك دیمەنی منداڵانی پێشـەنگ (طلائع)ی بەجلی سەربازییەوە نمایشدەکرد، کە لەبەردەم گروپێك ئەفسەری قەڵەوی عێراقی‌و بەرپرسـی حیزبی، سـرودیان بۆ شـکۆداری سـەدامی رێبەرو حیزبی بەعس دەخوێندەتەوە. هەڤپەڤینێکی ناهاوتا لەنێوان کارمەندێکی تەلەفزیۆنەکەو مێردمنداڵێکی



سـیازدە ساڵەی یەخسیری ئێرانی شەل‌و جل شڕی سەرتاشراو رویدا، هەڤپەڤینەکەش بەمشێوەیە بو:

**پ:** ئایا کاتێك هێرشـتان کردە سەر سوپای عێراق نەدەترسای، هەروەکو خۆشت باش دەتزانی کە تۆو زۆربەی هاورێکانت دەکوژرێن؟

**و:** ئەوانەی مردن، بەهەشتیان بۆ خۆیان بردەوە. بەڵام من وەك پێویست نەجەنگام تا بڕوانامەی شەهادەت بەدەست بهێنم. بەدڵنیاییەوە جارێکی دی ئەو شەڕە دەکەم‌و شەهادەت بەدەست دەهێنم.

**پ:** ئایـا دایك‌و باوکت نیگەرانی تۆ نین؟ ئایـا ناتەوێت بگەرێیتەوە بۆ لایان، لەم هەمو دەردەسەرییە دوور بکەوێتەوە؟

**و:** رەنگە ئێستا زۆر خەمباربن لەبەر ئەوەی لە پێناوی ئیسلامدا بڕوانامەی شەهادەتم بەدەست نەهێناوە.

ئـەوەی لـەلای سـەربازێکی سـەنگەر بەدیسـپلین‌و ملکەچی بێقەیدو شـەرت دەژمێردرێـت، لـەلای ئـەو مێردمنداڵە ئێرانیە ئیمانێکی راسـتەقینە بـو. لەهەر دوو بەرەکەشدا ئامادەگی ئایدیۆلۆجی‌و رێکخراوەیی پێویست بو. بەڵام لەجەنگدا کێشی رێژەیـی تـا رادەیەکی زۆر جیاواز بو، قوڵی‌و گەورەیی شۆڕشـی ئێران بەشـێوەیەکی باشـتر رەنگدانەوەی هەبو، بۆیـە دەبینین ئەو منداڵە نارێکخراوانە روبەروی سـوپای مەشـقدیدەی پڕچەکـی عێراق دەبونەوە، بەعسـیەکان هەرگیز پشـتیان بەو ئەزمونە جەماوەرییەی شۆڕشی ئێران نەدەبەست، لەبەر ئەوە ناچاربون لەسەرەوەو بەهاوکاری دەزگاو رێکخراوەکان کاربکەن‌و هێزو توانا بەدەسـتبهێنن، بەڵام خومەینی دەسەڵاتی لەخوارەوە بەدەستهێنا، سەرباری ئەوەش هەر دوو لایان زەرەرو زیانیان لێدەکەوت.

تەمەنی چل دەر سـەدی دانیشـتوانی عێراق لەخوار ٢٥ سـاڵەوە بو، بۆیە ئەوانەی حیزبـی بەعس لە شـەڕی ئێراندا رەوانەی مردنی دەکـردن، خەڵکانێك بون لەدوای ١٩٦٨/٧/٣٠ گەورەبـون. ئەگەر جەنگی عێـراق ـ ئێران بەمەحەك وەربگرین، ئەوا حیزبی بەعس توانی لاوان لەسەر بیروباوەری خۆی لەقاڵب بدات، بەڵام ئەو شکستەی

چەند یەکەیەکی سوپا لەم جەنگەدا ، لەکاتی روبەروبونەوەی شەپۆلێك لەو منداڵە ئێرانیانەی شەهیدبونیان دەخواست، توشی هات، لەو دەمەدا بو کە ویژدانیان رێگەی پێنەدەدان ئەو منداڵانە لەنێوبەرن. بەمشێوەیە وادەردەکەوێت هێندێك لە لاوانی سەدام حسێن، ئەوانەی بێماندوبونو بێزاربون، شەوو رۆژ چەکیان بەدەستەوە بو، هێزی بەزەیی لە دڵو دەرونیان جوڵابێت. لەم روداوە ساکارەوە کە جەخت لەسەر مرۆڤگەرایی لەلای مرۆڤ دەکات، زەرورییە کەمێك ئومێدو هیوا لەو کەسانەدا بەدیبکەین.

## پەروەردەکردنی جەماوەر:

پەروەردەکردنی تاك بۆ ئەوەی ئامادە بێت جەنگ بکات، پێویستی بەدارشتنەوەی رۆڵی تاكو دیاریکردنی پێگەکەی هەیە. کۆمەڵگەی ئاینی، هەروەها پەیوەندییە خێزانیو رەگەزییەکانیش لە رێگەی لەدایکبونەوە دیاریدەکرێ، تەنانەت کۆمەڵگەی عێراقی پێش ساڵی ١٩٥٨یش وەك تێکەڵەی کۆمەڵێك بەشی ناچونیەك شتێکی قبوڵکراو بو، هەر چەندە لەرووی ئیدارییەوە بەوجۆرە نەبو[13]. کاتێك ئەم چەمکەی کۆمەڵگە وەك چەترێك هەمو بەشەکان دەخاتە ژێر سێبەرییەوەو هۆکاری یەکگرتنەوەش لەبەرچاو ناگیرێت، مەسەلەیەك دێتە ئاراوە، ئەویش چۆن ناسنامەی کۆمەڵگە لەگەڵ چەمکی بەعسدا یەکانگیر بکرێ. فیکری بەعس کە بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەسەر فیکری یەکێتی نەتەوەی عەرەب دامەزراوە، دەخوازێت دڵسۆزی لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا بەشێوەیەکی باو نەبێت، بەڵام چۆن دەکرێ بیرکردنەوەی خەڵکی لەسەر شێوەی ئایدیای بەعس دابڕێژرێتەوە؟

لە سەردەمی پاشایەتیدا عێراق شێوازی روبەروبونەوی ئەمنیەتی (لێکۆڵینەوە، گفتوگۆ، ئاخاوتنو دەردە دڵ کردن لەگەڵ خەڵکیدا) بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی وشیاری سیاسی جەماوەر دەگرتەبەر، ئەو شێوازەی کە سەدام دەیویست لەناوییەرێت،



هەروەها رادیۆو تەلەفزیۆنیش دوو شێوازی دی بوون، بەڵام هەمو دیاردەیەکی ئازادیی لەبابەت گفتوگۆی گشتی سیاسیو پێکهێنانی حیزبی سیاسیو تەنانەت قسەکردن لە کاروباری سیاسیش لەئەنجامی تیرۆرو سەرکوتکردن، کە میلەتی عێراق تێیدا دەژیا، بەتەواوەتی لەبەینبرا. بۆیە دەبوایە شتێك ئەو بۆشاییە پڕبکاتەوە.

بەوتەی ئەندرۆسۆن، دروستبوونی کۆمەڵگەی نەتەوەیی لە سەدەی شازدەهەم، لە ئەوروپای رۆژئاوادا، دەرئەنجامی "وێنایەکی Imagining" تازە بو. بەڵام بڵاوبونەوەی چاپخانەو خوێندەواری لەنێو خەڵکیداکە بوە مایەی ئەوەی وشیارییەکی تازە سەبارەت بە کۆمەڵگە شکڵ بگرێتو هۆکاری کەمکردنەوەی بایەخی نەریتو دەسەڵات بو. گفتوگۆی باوو بەربڵاوی نێوان عامی خەڵکی بەزۆری بەو شێوەیە بو. سەیرو سەمەرەی ئەم سەردەمەی ئێمە لەوەدایە کاتێك دوای گەشەسەندنی هونەری، نەهێشتنی هەمو جۆرە حەکایەت گێڕانەوەیەکو دەردە دڵی نێوان خەڵکی لەتوانادا دەبێت، ئیدی هەمان گەشەسەندن لەخزمەتی ئامانجێکی بەتەواوەتی تازەدا دەبێت. هەوڵو کۆششی ستالین بۆ ئەوەی خەڵکی سۆڤێت کەسایەتی تروتسکی لەبیر بکەنو پەیوەندی بەمێژوویی شۆڕشی روسیاوە نەهێڵن، سەرباری نەهێشتنی نەخوێندەواری لە کۆمەڵگەدا، خۆی لە خۆیدا نمونەیەکی زەقی سنوری توانای هەنوکەیی کۆمەڵگەو دەوڵەتە. ئەگەر رۆژێك لە شوێنێکی سۆڤێتدا کەسێك تروتسکی یاد بکاتەوە، لەبەر ئەوەیە کە رۆژئاوا یادەوەریی تروتسکی بە زیندوێتی راگرتوە.

بەڵام ئەمرۆ سەردەمی ستالین بەتەواوەتی لە ژیانی یەکێتی سۆڤێتدا فەرامۆشکراوە، چونکە ئەو ترسەی خستبویە دڵو دەرونی جەماوەرەوە تەنها بەمردنی ستالین کەمێك سوك بو. بزوتنەوەی هاوکاری پۆڵۆنیاش بەو شێوەیە بو. خەڵکانێك کە ئامادەییو توانای دوبارە ئەفراندنی قەڵەمڕەوی گشتیان هەبو، "گدانیسکی" قارەمانیان هێنایە سەرشانۆو حەکایەتە بچوکەکانی خۆیان دەربارەی بیروکراسیەتی پۆڵۆنی دەگێڕایەوە[14]. ئسپانیای دوای فرانکۆ، پورتوگالی دوای سالازارو ئەرجەنتینی دوای هەڵبژاردنە گشتیەکەی ساڵی ١٩٨٣، شکۆفەی پڕ حەکایەت گێڕانەوەو خولقاندنی

دونیایەکـی تازەیـان ئەزمون کردوە یا لە حاڵەتـی ئەزمونکردنی دنیایەکی تازەن، ئەو ئەزمونەی لەپاش چەندین ساڵی ژیانی ناو تاریکی رودەداتەوە.

بەڵام لە عێراقـدا کۆنترۆڵکردنی تەواوی دەزگاکانی راگەیاندن لەلایەن دەوڵەتەوە رۆڵـی زۆر گرنگـی لـە کۆنترۆڵکردنی جەمـاوەردا بینـی. عێراق توانـی لەرێگەی باڵیۆزخـانەو مـولحەقە رۆشنبیرییەکـMـانی دەرەوەی وڵات، ٩,٧٥٠,٠٠٠ دانـە لـە رۆژنامـەی "ئەلسـەورە"و "ئەلجومهوریە" هەناردە بکات، لەپـاڵ ٤,٢٣٥,٠٠٠ دانە گـۆڤارو بڵاوکراوەی جۆراوجۆرو ١٨,٠٠٠ دانە لەچاپکراوەکانی وەزارەتی پەروەردە. بەڵام لەناوخۆدا رژێم بانگەشـەی ئەوەی دەکرد کە سـاڵانە ١٠,٠٥٠,٠٠٠ کتێبو ١٧٦,٤٠٠,٠٠٠ گۆڤاری تایبەت بەمنداڵان دابەشکردوە [15]و تەنها لە ساڵی ١٩٧٨دا ٣,٠٠٠,٠٠٠ کتێب کە نۆزدە وتاری سەدام حسێنی لە خۆگرتوە، دابەشکراوە[16].

بەپێچەوانەوە حیزبی شیوعی عێراق لە ساڵانی ١٩٤٧ و ١٩٤٨دا، واتە ئەو کاتەی لەوپـەری دەسـەڵاتو خاوەنـی جەماوەرێکی بەرفـراوان بو، دابەشـکردنی رۆژنامە یاسـاغکراوەکەی "ئەلقاعدە" نەدەگەیشـتە ٣٠٠٠ دانە. "لـەو رۆژگارەدا ژمارەیەك بڵاوکـراوەو رۆژنامـەی عێراقی تیـراژی بەرزتریان هەبـو"[17]. لەپاڵ ئەوەشـدا گەر بڵاوبونەوەو دابەشـکردنی دوو گەورە چاپکراوی بەعسـی لەسـاڵی ١٩٨٠دا لەگەڵ ئـەم بابەتانـەی خـوارەوەدا بەراورد بکـرێ، خاڵی سـەرنجراکێش دەخاتـەروو: لە سـاڵی ١٩٠٨ ـ ١٩٠٩دا، ١٨ رۆژنامـەی جیاواز بەزمانی عەرەبی، تورکیو فارسـی دەردەچون، ئەمە جگە لەو کتێبانەی بەشەش زمانی وەك عیبری، سیریانیو کلدانیش بڵاودەبونـەوە، سـاڵی ١٩١٧ ژمـارەی رۆژنامەکان گەیشـتە ٦٩ رۆژنامە کە تیراژی هیـچ یەکێکیان لە ٥٠٠ دانە تێنەدەپەڕیو تەنها سـێ دانەیـان حکومی بوون. بەڵام لە پەنجاکانو پێش شۆڕشـی سـاڵی ١٩٥٨دا زیاد لە ٣٥٠ رۆژنامەو گۆڤار لە عێراق دەردەچون. تێکرای رۆژنامەو گۆڤارەکان لەنێوان ساڵانی ١٩٥٨ ـ ١٩٦٣دا دەردەچونو هێندێکیان بۆ یەکەمجار بە زمانی کوردی بڵاودەبوەوە[18].

چـۆن دەتوانرێ ئـەو گۆڕانکارییە بەرچاوەی سـاڵی ١٩٨٠ راڤە بکرێ؟ سـەرەتا



ئـەو سانسـۆرە مەزنەی بوە مایەی بنبڕ کـردنو لەنێوبردنی هەمو جـۆرە لێکۆڵینەوەو گفتوگۆیەکی گشـتی، هەمان ئەو لێکۆڵینەوانە لە رۆژنامەو بڵاونامە سـەربەخۆکاندا بڵاودەبونـەوە. دوەم یاسـای بەزۆر خوێنـدن گەلێك یارمەتی بڵاوبونـەوەی فیکری بەعسیدا، سەرباری ئەوەی کە ئەو یاسایە ساڵی ١٩٥٨ دەرچوە، بەڵام تا ساڵی ١٩٧٠ جێبەجـێ نەکراو هەمو منداڵان پەیوەندییان بـە قوتابخانەکانەوە نەکردبو. ناوەرۆکی خوێندنیش بەتەواوەتی گۆڕانکاری بەسەردا هات.

"پێویسـتە لە پێنج سـاڵی داهاتـودا بەرنامەی خوێندن بەشـێوەیەك دابرێژرێت کە لەگـەڵ بیروباوەڕی حیزبو شۆڕشـدا تەبـاو یەکانگیر بێت. کات لـە بەرژەوەندی شۆڕشـدا نیە. بۆیە پێویسـتە بەرنامەی نوێی هەمو قۆناغەکان، هـەر لە دایەنگەوە تا زانکۆ لەگەڵ پرەنسـیپەکانی شـۆڕشو حیزبدا رێکبێتەوەو دەبـێ هەمو بیروباوەڕێکی بۆرجوازی کۆنەپەرستو لیبراڵی لەو بەرنامەیەدا ریشەکێش بکرێ. پێویستە نەوەکانی ئاینـدە لە بەرامبەر هەمو ئـەو فیکرو کولتورانە بپارێزرێن کە لەگـەڵ ئامانجو روانینی نەتەوەی عەرەبدا ناگونجێن، واتە یەکێتیو ئازادیو سۆسیالیزم "[19].

سـاڵی ١٩٨٠ رێـژەی نەخوێنـدەواری لـە ٥٠٪ کەمتر بـو، بە بـەراورد لەگەڵ سـاڵی ١٩٥٧دا کـە رێـژەی لـە ٨١,٧٪و لەدوا سـاڵەکانی حوکمی عوسمانیشـدا رێـژەی لە ٩٩,٥٪ دانیشـتوان نەخوێندەوار بون. ئەزمونی عێـراق لەدژایەتی کردنی نەخوێندەواریـدا، بەهەمـو پێوەرێك ئەزمونێکـی مەزن بو، ئەوەش لـە ئەنجامی ئەو رێوشـوێنانەی کە دوای ساڵی ١٩٦٨ گیرایەبەر[20]. کارو هەنگاوی بەعسیەکان لەنێو بەتەمەنە نەخوێندەوارەکانیشدا هەنگاوی لە بەرچاوبون. لە مایسی ١٩٧٨دا هەڵمەتی نیشـتمانی بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری دەستی پێکردو بۆ ئەم مەبەستەش ئەنجومەنی میلـی پێکهێنرا کـە نوێنەرانی وەزارەتی پەروەردەو بەرگریو هێزی ئاسـایشو حیزبی بەعسـی لەخۆگرتبو. بەمشـێوەیە ئەنجومەنی باڵا پێکهێنراو لەسـەر ئاستی حکومیو ناوچەییشـدا ئەنجومەنـی هاوشـێوەیەی ئەنجومەنـی باڵا دروسـتکراوو بەپێی بڕیارە مێژووییەکانی کۆنگرەی هەشـتەمی حیزبی بەعس لەسـاڵی ١٩٧٤دا دەسـتی بەکارو

چالاکییەکانی خۆی کرد[21]. لەو هەڵمەتەدا هێزە چەکدارو ئەمنییەکانیش بەشدارییان پێکرا.

بڕیار درا گشت ئەو نەخوێندەوارانەی تەمەنیان لەنێوان ١٥٤٥ ساڵ بو پەیوەندی بە بنکەکانی نەهێشتنی نەخوێندەوارییەوە بکەنو دەبوایە لەماوەی بیستو یەك هەفتەدا کۆتایی بەو پرۆسەیەش بێت. پاش ئەو ڕێوشوێنانە کۆمەڵێك قانون دانرا بۆ سزادانی سەرپێچیکاران هەر لە زیندانی کردنەوە تا دەگاتە پێبژاردنو دانەمەزراندنو مۆڵەت پێنەدان یا بێبەشکردنی لە سولفەی بانك. بەمشێوەیە بەهاتنی ساڵی١٩٨١ نزیکەی دوو ملیۆن کەس پەیوەندییان بە نێوەندەکانی تایبەت بەنەهێشتنی نەخوێندەواری کردبو، کە ژمارەیان ١٧٧٩ بو یا فێرگە میلیەکان کە ژمارەیان ٢١٨٥٣ بو[22]. ساڵی ١٩٦٥ لە عێراقدا ٣٦٨ بنکەی نەهێشتنی نەخوێندەواری بو. ئەنجومەنی باڵا ساڵی ١٩٧٩ لەسەر قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری خەڵاتی یۆنسکۆی وەرگرت[23].

وڵات لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا دوچاری پەتای نەبەرد ببو. بەسەدان هەزار نەخوێندەوار ڕوویان کردە نێوەندە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەت، "قوتابخانەکانی سەر ئاو"ی نێو قامیشەڵەکانی باشورو "قوتابخانە سەفەرییەکان"ی گوندو ناوچە دورەکان بۆ ئەوەی فێری خوێندەواری ببن. دەزگاکانی ڕاگەیاندنو سەندیکا پیشەییو یەکێتییەکانو بەرنامەی ڕادیۆو تەلەفزیۆنەکان کە ڕۆژانە پەخشیان لەسەر نەخوێندەواریو پێویستی لەناوبردنی دەکرد، خۆیان بۆ ئەم مەسەلەیە مۆبیلیزە (بەسیج) کردبو. ڕۆژانە لە تەلەفزیۆنەوە بەرنامەی وانە وتنەوە بۆ بەتەمەنەکان پەخشدەکرا، هەروەها بڕیار بەسوککردنی سزای ئەو زیندانیانەش دەرچو کە دەتوانن ئەو بەرنامەیە تەواو بکەن. زۆرینەی شیعەکانی باشور پەیوەندیان بەو بنکانەوە کرد لەبەر ئەوەی ڕێژەی نەخوێندەواری لەنێوانیاندا زۆر بەرز بو[24]. فێرکردنو گشت پێداویستیەکانی لەکتێبو ئامرازەکانی دی خوێندن لە ساڵی ١٩٧٤ بۆ هەمو قۆناغەکان بە خۆڕایی بو.

دواتر یاساگەلێك دانران کە کاروباری ئیداری بۆ هەڵمەتی نەهێشتنی نەخوێندەواری



ڕێکدەخست، مادەی دوازدە مامۆستایان ناچار دەکات، کە بنەماو پرەنسیپەکانی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی جێبەجێ بکەن[25].

لە یاسای ساڵی ١٩٧٨دا بەمشێوەیە پێناسەی نەخوێندەوار کراوە: نەخوێندەوار ئەو کەسەیە کە خوێندنەوەو نوسین نازانێتو کەسێکە نەگەیشتۆتە ئاستی شارستانی پێویستو هەر کەسێك بەهاوکاری خوێندنو نوسین بەو ئاستە بگات، دەتوانێت ئەرکە نیشتمانیەکانی جێبەجێ بکات. ئەو زانیاریانەی مرۆڤ بەدەستی دەهێنێ، پێویستە بەردەوام لە حاڵەتی پێشکەوتندا لەگەڵ پەرەسەندنی کۆمەڵایەتیو ئامانجەکانی نەتەوەی عەرەبدا تەباو هاوڕێك بێت (یەکێتیو ئازادیو سۆسیالیزم)[26].

ئەو شێوازانەو گەلێك شێوازی دی خەڵکێکی زۆری خستە داوی فیکری حیزبی بەعسەوەو ئەو هەڵمەتانەی تێکەڵ بەترس بون، نەوەی کۆن، ئەو نەوەیەی لە کانیاوی فیکری جیهانی نۆشکردبو، والێکرد بۆ دواوە بگەڕێتەوەو خۆی گۆشەگیر بکاتو زەمینەیەك بۆ کۆمەڵگەیەك فەراهەم بکات کە فیکری بەعسی وەکاردەبرد.

بەمشێوەیە کۆمەڵگەیەکی نوێ دروست بو کە پێکهاتەکی بەعسیانەی هەبو، ئەو کۆمەڵگەیەی دیدو ڕوانگەی تاکەکانی لەگەڵ دیدو ڕوانگەی کۆمەڵ یەکانگیرەو دڵسۆزیو وەفاداری هەمویان بۆ فیکری بەعس بو. لەو وەفادارییەدا هەمویان یەکسانن، واتە وەفاداری تاکەکان بەیەکسانی کۆتدەکرێ، ئەو وەفادارییەش دەشێت لەڕووی بیروباوەڕەوە بێت یا لەڕووی ترسەوە، لە خزمەتی پاراستنی بەرژەوەندی شەخسیدا دەبێت. لە عێراقی بەعسدا ناسنامەی مرۆڤەکان، یەکانگیری لەدایکبون، خاك، ئاینزاو تەنانەت چینیش دیارینکات. ئەو یەکانگیرییەی لە ڕابردودا بوە مایەی پەیدابونی هەمەڕەنگی وەفاداری. هەمەڕەنگی وەفاداری ئەو شتەی کە بەعسیەکان هیچ خۆشییەکیان پێی نەدەهات.

ڕێك بەهەمان شێوە کە سروشتی زاتی یەکێتی عەرەبی لە واقعیکی پەرتەوازەی عەرەبەوە دەردەهێنرێت، پەروەردەی تاکی عێراقیش بەشێوەیەك بو کە بتوانێت لە دەوروبەرە کەسێکەی بەرزتری بباتو بەرەو جیهانی بەعسی بەرێت. ئامانجی بەعس

خولْقاندنی مرۆڤێكی جەماوەری تازە بو، ئەم خاڵەش بەردەوام لە راگەیاندنەكانی بەعسەوە جەختی لەسەر دەكرایەوە. بەمشێوەیە مەبەست لە نەهێشتنی نەخوێندەواری ئەو پەروەردەیەی بەدەست هاتبو وەربگێڕدرێتو بۆ هێزێكی كۆمەڵایەتی هاندەری بگۆڕێت[27].

## پێگەی ژن:

سەرباری ئەوەی رێژەی نەخوێندەواری لە نێو ژناندا دوو كەرەتی پیاوان بو، كەچی لەگەڵ ئەوەشدا ساڵی ١٩٦٥ تەنها لە ١٢٪ی نێوەندەكانی نەهێشتنی نەخوێندەواری بۆ ژنان تەرخان كرابو، هەر چەندە ئامارێكمان بۆ ساڵی ١٩٨٠ لەبەردەست نیە، بەڵام بەپێی وتەكانی رۆژنامەی "ئەلجومهوریە"، لە كۆی ٧٦٢ فێرگە ٤١٦ یان بۆ ژنان تەرخان كرابون، ئەمە سەرباری ئەوەی ٣١ فێرگەی تێكەڵیش هەبون. لە پۆلی چوارەمەوە رێژەی ژنان زیاتر دەبو، رەنگە ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بێت كە پیاوان لە ژنان زووتر خوێندیان بەجێدەهێشت، لەپاڵ ئەو نێوەندانەی نەهێشتنی نەخوێندەواریدا، نێوەندی تایبەت بە چاودێری كردنی منداڵانیش دەبینرا.

خوێندەواركردنی ژنان بە یەكێك لەدەستكەوتەكانی حیزبی بەعس دادەنرێت. ژمارەی خوێندكارە ژنەكان بۆ هەمو قۆناغەكانی ساڵی خوێندنی ١٩٧٩-١٩٨٠ بەمشێوەیە بو: قۆناغی سەرەتایی ١١٦٥٨٥٦، قۆناغی ئامادەیی ٢٧٨٤٨٥، قۆناغی زانكۆ ٢٨٦٤٧ خوێندكاری ژن بو، ئەمە لە كاتێكدا ژمارەی خوێندكارانی ژن بۆ ساڵی خوێندنی ١٩٧٠-١٩٧١ بەمشێوەیە بو: قۆناغی سەرەتای ٣١٨٥٢٤، قۆناغی ئامادەیی ٨٨٥٩٥، قۆناغی زانكۆ ٩٢١٢ خوێندكاری ژن بو[28]. لە ساڵی ١٩٨٠دا لە ٤٦٪ بواری وانە وتنەوەو ٢٩٪ پزیشكانو ٤٦٪ پزیشكی ددانو ٧٠٪ دەرمانسازانو لە ١٥٪ ژمێریارانو لە ٤٦٪ كرێكاری كارگەكانو ١٦٪ كارمەندی كەرتە خزمەتگوزارییەكان



لە ژنان پێكهاتبون. هەروەها لە ٤٧٪ بەرنامەسازانو لە ٣٠٪ سەرپەرشتیارانی بیناسازی لە وەزارەتی نەوت (پیترۆڵ) لە ژنان بون. بەشداریكردنی ژنان لە بەرێوەبەرایەتیە گشتییەكاندا لە ساڵی ١٩٨٠ەوە لە ٤٪ بەرەو زیادبون دەرۆیشت. ساڵی ١٩٦٧ ژمارەی ژنان لە كەرتی كشتوكاڵدا لە ٧٪ بو، بەڵام ساڵی ١٩٨٠ بۆ ١٩٪ بەرز بوەوە[29].

زۆرێك لە یاسای كار بەجۆرێك هەمواركرابون لەگەڵ بارودۆخی ژنو یەكسانی لەگەڵ پیاودا بگونجێن، وەك كرێی یەكسانو مۆڵەتی منداڵبونو دایەنیو داگرتنی ساڵی خانەنشینی.

ژنانی عێراقییش، وەك لاوان لە یەكێتی گشتی ژنانی عێراقدا رێكدەخران. ئەو یەكێتییە ١٨ لقی هەبو، واتە لەهەر پارێزگایەكدا لقێكی هەبو، لەسەرتاسەری شارەكانیشدا ٢٦٥ نوێنەری هەبو، ٧٥٥ نێوەندی لەو گوندانەدا هەبو كە ژمارەی خێزانەكانیان دەگەیشتە ٢٠٠ خێزانو لەو گەڕەكانەشدا كە دانیشتوانەكەی لە ٦٠٠٠ تێدەپەرین، ئەمە سەرباری ١٦١٢ لیژنەی بۆ پەیوەندی كردن بە باقی گوندو گەرەكەكانی دی هەبو[30]. ئەنجومەنی گشتی یەكێتییەكە لە رێگەی كۆنگرەو هەڵبژاردنەوە پێكدەهات، لە رێگەی ئەنجومەنی گشتیشەوە ئەنجومەنی نێوەندی بە ٣٨ ئەندام هەڵدەبژێردرا، پاشان نوسینگەی جێبەجێ كردن دادەنرا. بەكورتی ژنان تەنها بۆ ئەوە نەیاندەخوێند تا رێگەی زانكۆكان بگرنەبەرو ببنە بەشێك لە هێزی كاری وڵات، بەڵكو وەك هەر گروپێكی دی بەشێوەیەكی كارا رێكدەخران.

ئەو گۆڕانكارییانە لە بارودۆخی ژنانی عێراقدا، لە یاسای باری كەسێتیدا كە بەعسیەكان ساڵی ١٩٧٨ دەریانكرد، بایەخێكی زۆری پێدرا. لە پێشەكی ئەو یاسایەدا هاتوە، بڕگەكانی لەو بەشەی شەریعەتی ئیسلامییەوە وەرگیراوە كە لەگەڵ رۆحی سەردەمدا دەگونجێت[31]. پاشان بەسەر ئەو نەریتانەشدا زاڵبو كە ئازادی ژن لە دوو بواری گرنگدا كۆتدەكرد، یەكەم: ئەو دادوەرانەی حكومەت دایمەزراندبون، دەسەڵاتی ئەوەیان پێدرا بەڕەنگاری دەسەڵاتی ئەو باوكانە ببنەوە كە كچەكانیان

بەمندالّی بەشـوو دەدەن، دووەم: یاسای نوێ، دەسـەڵاتی تەقلیدی لە سەرۆك خێڵو کەسـوکاری ژنان وەك مامو خاڵسـەندەوە کـە بەزۆر کچەکانیان بەشـوو دەدەن. یاسـادانەر بەئاشکرا دەیویست دەسـەڵاتی خێزانی باوکسـالارانە نەهێڵێتو خێزانی نموونەیـی جێگەی خێزانی گـەورەی تەقلیدی بگرێتەوە کە پێگەی ژن تێیدا زۆر نزم بو.

ستراتیجییەتی حیزبی بەعس بریتی بو لە: ئەنجومەنێکی میلی بەمەبەستی وردبینیو سـەرنجدانی یاسـای باری کەسـێتی لە هەمـو دادگایەکی شـەرعیدا دامەزرێنێت. ئـەو ئەنجومەنانە لە پێنـج کەس پێکدەهاتن کە بەلانیکەمـەوە دوانیان ژن بون. ئەو رێکخراوە جەماوەرییانەی ئەندامانی ئەو ئەنجومەنانەی لێهەڵدەبژێردراو یەکێتی گشتی ژنانی عێراقیش سـەرۆکایەتی دەکرد، لە یاسادا باسـی لێوەکرابو. ئەو رێکخراوانە لە هەڵبژاردنـی ئەندامـی ئەنجومەنەکاندا رەچاوی ئینتمای سیاسـیان دەکرد (بەتایبەتی دەبێ شارەزایی تەواوی لە ناوەرۆکی راپۆرتی سیاسی ساڵی ١٩٧٤ی حیزبی بەعسدا هەبێت)[32]. ئەرکی سەرەکی ئەو ئەنجومەنانە بریتی بون لە چاودێریکردنو چارەسەری ئەو کێشانەی پەیوەندی بەو منداڵانەوە هەبو کە دایكو باوکیان لەیەکتری جیاببونەوە، ئەویش لەدوای ئەوەی لێکۆلینەوەی پێویسـتو چاوپێکەوتنی راسـتەوخۆیان دەکرد، راسپاردەکانی بۆ ئەو دادوەرە بەرزدەکردەوە کە لەلایەن دەوڵەتەوە دامەزرابو تا بڕیاری لەسـەر بدات، هەر چەندە دوا بڕیار لە دادوەرەوە دەردەچو، بەڵام ئەنجومەنی میلی بەرپرسیاربو لەو راسپاردانەی کە پێیدەگەیشت.

بەگشـتی بەشـداری بەرفراوانی ژنان لە کۆڕە تازەکانی بڕیـار وەرگرتندا کارێکی بەڵگەنەویسـت بو، بەڵام ئەو پێشـڤەچونە زیاتر بە رەگەزیانەوە نەك بەکەسایەتیانەوە پەیوەسـت بـو، ئەویش لە چوارچێوەیەی ئەو بەشـداربونەی کە تـا رادەیەکی زیادو نازەروری کارێکی "سیاسـی" بو. بەشـێوەیەکی گشتی ئەو ئەرکانەی بەو ئەنجومەنە میلیانـە دەسـپێردرا، بریتـی بو لە گوشـار خستنەسـەر باوان تـا ئەو بڕیارانـە قبوڵ بکـەن کە لەگـەڵ رێنماییەکانی حیزبدا تەباو گونجاوبو، هەرچەندە دەشـێت دژ بە



بەرژەوەندییەکانی خۆشیان بێت. لەو دۆخەشدا بابەتگەلی وەك دەقی یاساو مافەکانی تـاك لەبەرچـاو ناگیرێت. هەروەها کاتێـك کۆتو بەندی تەقلیدی پیاو لەسـەر ژن کەمدەکرێتەوە یا لەنێو دەبرێت، ئیدی خودی دەوڵەت لەسەرەوەو لەجیاتی "رەگەزی ژن" ئـەو کارە ئەنجـام دەداو پێگەی ژنیـش وەك تاکێك کە بەخاتـری رەگەزییەوە دوچاری چەوسانەوەو جیاوازی دەبێ، گەشەو باڵا ناکات.

یاسـای سـاڵی ١٩٧٧ کە مەبەسـتی پەیوەندی ژنان بە سـوپاوە دەرکرابو، هیچ ئاماژەیەکـی بەئەرکی سـەربازی ژنان نەدابـو، واتە "ئەوەی بەسـەر پیاودا جێبەجێ دەکرا، بەسەر ژنیشدا جێبەجێ دەبو، جگە لەو ئەرکانەی کە لەگەڵ سروشتی ژناندا نەدەگونجان. لەدەقی یاسـاکەی سـەرەوەدا هاتوە، ژن بەئەفسەر دادەمەزرێت ئەگەر هەڵگری بڕوانامەی زانکۆ بێت لە یەکێك لە بوارەکانی پزیشکیی وەك دەرمانسازی، پزیشـكو پزیشـکی ددان[33]. شـتێکی پڕئاشـکرایە کـە لەبـەر زۆری ژن لەبواری تەندروستیدا، سوپا زۆر ژنی وەردەگرت. هەروەها ئەو ژنانەشی پەیوەندییان بە هێزی میلیشیاوە کردبو هەمان حاڵیان هەبو. ساڵی ١٩٨٢ نزیکەی ٤٠ هەزار ژن لەریزەکانی ئەو ملیشیانە خۆیان ناونوس کردبو[34].

ئەم یاسـا بوێرانەیە لەگەڵ گرنگی ئەو ریفۆرمە میانڕەوەی لەباقی سـەرزەمینەکانی دی ئەنجام دەدراو بەشـێوەیەکی راستەوخۆ کاریگەری لەسەر ژن وەك تاکێك هەبو، پێویسـتە لەبەرچاو بگیرێ. ئەو یاسـایانە سـنوری بۆ گەلێك لەو حوکمە شـەرعییە ئیسلامیانە دانا کە پەیوەندی بەکاروباری ژنانەوە هەبو وەك فرەژنی، جیابونەوە، میراتی. سـزای داوێن پیسـی وەك ئەوەی لە شەرعدا هەیە، نەمایەوە، تەنانەت ناوەکەیشی لە یاسـای عێراقدا بە خیانەتی هاوسـەرگیری گۆڕا. بەکورتی گۆڕانکاری رادیکاڵانەی عێراق لەو هەموارکردنەی تونسـیەکان گەورەتر بو کە ساڵی ١٩٥٦ ئەنجامیاندا یا لە گۆڕانکارییەکانی شای ئێرانو کەمال ئەتاتورك لە ساڵی ١٩٢٦دا رادیکاڵانەتر بو.

گرنگتریـن ئامانـج لە گشـت یاسـاکانی تایبەت بـەژن ئەوەبو کە ئەو یاسـایانە زیاتـر لایەنی تێشـکاندنی کۆتی نەریتی لەخۆگرتبو. سـەرباری ئـەو هەوڵە جدییەی

بۆ رزگارکردنی ژن دەدرا، بەڵام بانگەوازی بەعس بۆ بەشداریکردنی ژن لە کاردا لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامدا ناکۆك‌و ناتەبا نەبو. لەلای رژێمی بەعس فەزیلەتی خێزانی گەورە یا پیرۆز راگرتنی دەسەڵاتی باوك‌و دایك شایانی بایەخپێدان نیە. ئەگەر بتوانرێ خێزانی ناوکی، بیروکراسی دەوڵەتی یا "ئەنجومەنی میلی" جێگەی دەزگا تەقلیدییەکانی سەرەوە بگرێتەوە، هەر چەندە نەریتی کۆمەڵناسی عەرەبی بە رەگوریشە قوڵەکانیشیەوە لاواز دەبێ (کارێك کە لە سەرجەم کۆمەڵگە ئیسلامییەکان باوو ئاساییە)، ئەوا بەها ئیسلامییەکان لە بەرگی ئایدیۆلۆجیادا وەك خۆی دەمێنێتەوە. هەڵبەتە هەوڵ‌و کۆششەکانی حیزبی بەعس بەمەبەستی مۆبیلیزەکردنی (تجنید) ژن کارێکی نائیسلامی نەبو، هەر چەندە ئەو هەوڵانە نیشانەی دابڕانی رادیکاڵ‌و کۆمەڵگەی تەقلیدی‌و بەهای قوڵی ژنیشە کە دەتوانێت ئاکامێکی هەبێت. ئەوەندە بەسە کە ئەو ژنە سەرپۆش بەسەرانەی رابونی ئیسلامی ئێران بەیادبهێنینەوە، کە نەك تەنها دژی شا بون، بەڵکو تەنانەت دژی ئەو ژنە خۆپێشاندەرانەش مۆبیلیزەکرابون کە نارەزاییان بەرامبەر بەفرمانەکەی خومەینی لەمەڕ سەرپۆشکردن دەربڕی.

لەنێوان ناوکی ئایدیۆلۆجیادا کە بەشێوازێك لەسەر پایەی بەها ئەخلاقییە نەریتیەکان خۆیراگرتوەو رادیکالیەتی پڕتوانای بەعس، جیاوازییەکی سەرەکی هەیە کە ئەمەی دوەم دەتوانێ بەربەستە کۆمەڵایەتی‌و پێشداوەرییەکان بەشێوەیەکی بێبەزەییانە لەبندەربهێنێت کە چەندین سەدەیە بەوپەری سەرسەختییەوە بەردەوامیان بەخۆیان داوە. یەکێك لە خراپترین راڤەی ریفۆڕمە گونجاوەکانی بەعس لە دونیای باری کەسێتی ژناندا ئەوەیە کە بڵێین لەترسی ئاینزاو پەرچەکرداره ئەگەرییەکانی، لەم بوارەدا هەنگاو بەهەنگاو بەرەو پێشەوە دەڕۆن. لە پاڵپشتی کردنی ئەوجۆرە بەڵگەهێنانەوەیە بچوکترین بەڵگەو دۆکومێنت لەبەردەستدا نیە. راڤەکردنێکی لەوجۆرەی جیاواز لەگەڵ توندڕەوی بەعسیەکاندا، پەیوەندی بەو هەنگاوانەوە هەیە کە لەقەڵەمڕەوو حاڵەتی کۆمەڵایەتی ژناندا ئەنجامیان داوە. تەنانەت ریفۆڕمی توندڕەوانەی ۱۹۷۸ یش نەبوە مایەی سەربەخۆیی ژن وەك تاکێك لە کۆمەڵگەی عێراقداو ئەوەش لە ماوەیەکی دووردا



دەیتوانی کێشەمەکێش لەگەڵ کولتوری گشتگیری عەرەبی ئیسلامی دروستبکات، کە سەرئەنجام بەعسی دەخستە سەر ئەو"دووریان"ەی کە رەسام قسەی لەسەر دەکرد. بۆچی بەعسیەکان لەشوێنێکدا توندڕەوی دەنوێنن‌و لەشوێنێکی دی هەنگاو بەهەنگاو بەرەو پێشەوە دەڕۆن؟ ئەمەش پرسیارێکی گرنگە.

پێویستە لەسەر بەهای رێوشوێنەکانی بەعس زیادەرەوی نەکەین. هیچ یەکێك لە توێژو رێکخراوەکان، بەرێکخراوی ژنانیشەوە، بەمەبەستی ئەنجامدانی رێفۆرم گوشاریان لەسەر دەوڵەتی عێراق دروست نەدەکرد. بەڵام کاتێك بەعسیەکان لە یاساداناندا لەم بوارەدا سود لە شێوازی تایبەتی خۆیان وەردەگرن، ئەوە نیشان دەدەن کە ئەگەر "لە مەنگەنەی داواکارە ناکۆکەکانی تازەگەری‌و پێشکەوتن‌و خاتری کولتوری"دا گیرنەخۆن، چۆن بیردەکەنەوە[35]. ئەو دوڕیانە پەرێزە کاتێك پڕمانا دەبێت کە وتەکانی خودی بەعس بەجدی وەربگرین. بەعسیەکان لە پیادەکردنی دیدوبۆچونەکانی خۆیاندا دەربارەی تازەگەری‌و ئیسلام تا ئاستێکی باش لۆجیکانە کاریان دەکردو دوچاری ناکۆکی نەدەبونەوە. دەربارەی دیدوبۆچونی بەعس لەمەڕ یەکێتی عەرەبی‌و ئەزمونی ئیسلامی لە بەشی شەشەمدا گفتوگۆی لەسەر دەکەین. پێویستە روانینی تایبەتی بەعس لەمەڕ بارودۆخ‌و هەلومەرجی ئێستای عێراق لەبەرچاو بگرین‌و تێگەیشتنی پێشومان لەبارەی تازەگەرییەوە هێندە قابیلی ئاوڕلێدانەوە نیە.

ئایدیای بەعس کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بەئەزمونی ئیسلامییەوە هەیە، سەرچاوەیەکی سەرەکی دەسەڵات‌و دوا پێوەرە بۆ ئەوەی کاروبارەکانی پێبپێورێ، تەنانەت دەسەڵاتی رێبەریش لەو ئایدیایەوە سەرچاوە دەگرێ‌و هەر پێوەرێکی دی لەدەرەوەی ئەو پێوەرە هەڕەشەیەکی راستەوخۆ لەسەر فیکری بەعس دروستدەکات‌و دەسەڵاتی تەقلیدی باوان، مام‌و خاڵەکانیش دیاریدەکات کە زیاد لە نیوەی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنێت. بەمشێوەیە ئەگەر وەفاداری‌و دڵسۆزی نوێ بۆ رێبەر بێتەئاراوە، ئەوا ژنان بەشێوەیەکی خۆبەخۆ لەدەسەڵاتی مێردو کەسوکاری نێرینە رزگاریان دەبێ، ئەمەش گرنگترین شت بو کە یاسای باری کەسێتی ۱۹۷۸ دەیویست بەدیبهێنێت،

بەڵام تەنانەت ئەو ئازادییەش کە ئیسلام بەژنی بەخشی بو، رژێمی بەعس لێی سەندنەوەو رێگەی پێنەدەدان بەرپرسیارێتی منداڵەکانیان هەڵگرن. رژێمی بەعس دەسەڵاتی پیاوی بەسەر ژندا کەمنەکردەوە: ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش کە هەمویان پیاوبون، فەرماندەیی باڵای سوپاو دەسەڵاتی رەهای سەدام حسێن کە لە هەمو باوکێك بەدەسەڵاتترو ترسناکتر بو جێگەی دەسەڵاتی کلاسیکی پیاوی گرتەوە. تەنها جێگەی رەوایەتیو وەفاداری لە عێراقدا گۆڕانی بەسەردا هات، ئەنگیزەی ئەو جێگۆڕکییەش لەژندا وەك تاکێك تێکەڵەیەك بو لە گوێرایەڵی تەقلیدی بۆ پیاوو ترسو تۆقاندن. رەنگە ئەو گوشارەی لە خوارەوە دەهات، بتوانێت رژێمی بەعس لەسەر شانۆ لەناوبەرێت، بەڵام سەبارەت بەژن رۆژێك لە رۆژان ئەمجۆرە گوشارە لە هاوکێشەکەدا نەبو.

## پێشکەوتن یا ئازادی:

نێوان مۆبیلیزەکردنی جەماوەرێکی بەرفراوان بەمەبەستی باشکردنی باری خۆیانو پێشکەوتن لەبواری بەرهەمهێنانی ملیۆنان نوسخە لە بەرهەمی چاپەمەنیدا، زیادبونێکی بەرچاو لە ژمارەی قوتابخانەکانو بەشداریکردنی ژمارەیەکی زۆری ژنان لە هێزی بەرهەمهێنانو کاردا، پەیوەندییەکی خەسڵەت بەعسی بوونی هەیە. خودی ئەو پێشکەوتنەش پەیوەندی بە رێکخستنێکی پێشکەوتووەوە هەیە. ئەزمونی کۆمەڵگەی عێراق ئەوە نیشان دەدا کە لە نێوان زاڵبون بەسەر دواکەوتنو کەمبونەوەی ئازادی سیاسی، پەیوەندییەکی ئاشکرا بوونی هەیە. بەهەمان شێوەش پەیوەندییەکی لەوجۆرە لەنێوان خوێندەواریو ناوەرۆکی داواکراوە سانسۆرکراوەکاندا هەیە. ئەم پەیوەندییەی نێوان هۆو کاریگەر بەزۆری نیشانە ئابوری ـ کۆمەڵایەتییەکانی بەچاو دەبینرێو بۆ وڵاتێك کە لە حاڵەتی گەشەکردندا بێت گرنگیەکی زۆری هەیە (بۆ نمونە گۆڕانکاری



لە رۆڵی کۆمەڵایەتی ژناندا). رژێم ترسی لەهۆکاری زیادبونی بەرچاوی ئاستی ژیانی خەڵکی عێراقدا هەیەو بەوەشەوە دەنازێ کە ژیانی پێکهاتە پاپەتییەکانی کۆمەڵگەی باش کردوەو هاوتاکردنی دەرامەتو لەنێوبردنی جیاوازی گەورەی دەرامەتکە لە ساڵی ١٩٥٨ دەستی پێکرد بو زۆر بە پەلە بەردەوامی پێداوە[36].

گۆڕانکارییەکان لەم بوارەدا گۆڕانکاری بەرچاوبون: دەوڵەت هاوکاری زۆربەی کاڵا زەروریو سەرەکییەکانی دەکرد، لانیکەم هەقدەست لەگەڵ تۆنی هەڵئاوساندا هاوسەنگ بو، ئاستی هەڵئاوسان زۆر نزم بو، لە یاسا تازەکاندا دڵنیایی کار بەتەواوەتی فەراهەم کرابو، دەوڵەت دەرچوانی زانکۆکانی دادەمەزراند، خوێندن لە هەمو ئاستەکانداو چاودێری تەندروستی بەخۆرایی بو. داهاتی ساڵانەی تاك لە ساڵی ١٩٧٠دا تەنها ١٩٥ دیناری عێراقی بو، ئەمە لەکاتێکدا ١٩٧٩ گەیشتە ٧٥٦٤ دینار[37].

بەڵام ئەوەی کە ئەوجۆرە دەستکەوتانە پەیوەندی بە زیادبوونی داهاتی نەوتەوە هەیە یا دەرئەنجامی لێهاتویی بەرێوەبەرانی ئابورییە، لەدەرەوەی ئەم لێکۆڵینەوەی ئێستای ئێمەدایە، هەرچەندە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لەدوور مەودادا گرنگی خۆی هەیە. هەڵمەتی هەمەلایەنە لەدژی نەخوێندەواری کە کەمەری نەخوێندەواری لە عێراقدا شکاند، رەهەندێکی سیاسی پەیداکرد کە شێوازی مسۆگەرکردنی بودجەی هەڵمەتەکەی دەخستە ژێر کاریگەری خۆیەوە، هەمان کاریش لەبارەی زیادکردنی خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان، گەیاندنی کارەبا بە گوندەکان، تۆڕێکی گەورەو گرانی رێگەوبان کە هەمو وڵاتی پێکەوە گرێدەدا، یاساگەلی کۆمەڵایەتی ئایندەبین، پێشکەوتنی سیستمی گواستنەوەو گەیاندن، پەیوەندی رێگە دوورەکان، بەپیشەسازی کردنو بەرنامەی دروستکردنی خانوی زۆر گەورەش، راستە[38].

ئەو هەمو پێشکەوتنانە یەك مەسەلەو دووڕیانێکی هێنایە گۆڕێ کە لەم سەدەیەی ئێمەو لەنەریتی کۆمۆنیستیدا بەشێوەیەك لە شێوەکان وەڵامیان دراوەتەوە. ئەزمونی روسیا لەدوای شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە کاریگەرییەکی قوڵی بەجێهێشت لەسەر ئایدیای

پەیوەست بە پەیوەندی نێوان ئازادی سیاسی‌و پێشکەوتن لە وڵاتێکی دواکەوتودا. تروتسکی لێکۆڵینەوەی لەسەر دژایەتی ئەو پەیوەندییە کردوە. تروتسکی لە کتێبی شۆڕش خیانەتی لێکراوە، هێرشێکی توندی ئاراستەی ستالین کردووەو هەوڵیداوە دیاردەی ستالینیزم روونبکاتەوە. ئەو دەنوسێت دیسپۆتیزمی دەوڵەتی تازە، ئاکامی "زەرورەتێکی ئاسنینی بو کە بەدەرکەوتنی کەمایەتییەکی نایاب‌و پارێزگاری لێکردنی، دەگەشایەوە"، چونکە وڵات دواکەوتو بو، دەمانبینی کە "توانای سۆڤێتە دیموکراتەکان سنوردارو تەمەن کورت بو، دەستوری کاری ئەو کاتەش پارێزگاری لە هەمان کەمایەتی نایاب دەکرد کە بوونی بۆ زێرەڤانی، پیشەسازی، تەکنولۆجیاو زانستەکان بەپێویست دەهاتە بەرچاو"[39]. لەمجۆرە مەسەلانەدا هۆی ئەو دیوی شتەکان دادەتاشرێ، هۆیەك کە لەپشت خۆتێوەردانی مرۆڤەکاندا خۆی متکردوە: پێویستە بەخاتری پێشکەوتنی ئاینده، دەست لە ئازادی ئەمرۆ هەڵبگیرێ. ئەمانە وتەی ئابوریناسێك، ئاکادیمیەك یا شۆڕشگێڕێك نیە، بەڵکو وتەی رێبەرێکی کاراو روناکبیرێکی پێشرەوی شۆڕشی روسیا بو کە خودی خۆی لەسەر بنەمای "زەرورەتی ئاسنینی" لە رەوشی شۆڕشدا کارکەنار کرا.

ئەو گرفتەی کە لە دیدی تروتسکییەوە هەم جیهانی بو، هەم شەخسی‌و تەنها لە رێگەی شۆڕشی جیهانیەوە چارەسەر دەکرا، لەگەڵ ئەزمونی ستالینیدا لەسەرجەم شورشەکانی دواتردا بە شێوەی جۆرێك لە پاشەکشێی نەتەوەگەرایانەو ناوچەگەری لە فۆرمی نەگۆڕیی قانونی پرۆسەی مێژوویدا دەردەکەوت. ئایدیۆلۆجیاکانی جیهانی سێیەمیش کە خۆیان لەبەرامبەر ئەو زەرورەتە ئابورییە دەبینییەوە بە رەتکردنەوەی ئازادی بۆرجوازی‌و رووکردنە جیهانی گشتگیر، لەجیاتی ئەوەی لەبواری سیاسی‌و کۆمەڵایەتیدا روو لە ئازادی "راستەقینە"بکەن، رووویانکردە بواری ئابوری. لەسەرجەم شۆڕشەکانی سەدەی بیستەمدا (چین، ڤێتنام، کوباو جەزائیر)و گشت شۆڕشە میلییەکانی دوای جەنگی جیهانی دوەم (ناسریزم، پرۆنیزمو بەعسیزم) بەرووکەش جەختیان لەسەر زاتیونی گرفت‌و دووڕیانی پێشکەوتن یا ئازادی دەکردەوە.



(عەلی بەدور)، مافزانی سوری‌و رەخنەگری ئەدەبیاتی پانعەرەبیزم بەراشکاوی قسە لەسەر ئازادییەکانی سیستمی فرەحیزبی میسر، لە پێش ساڵی ۱۹۵۲دا (کودەتای عەبدولناسر) دەکات. (بەدور) لە دوو وتاریدا لە شۆڕشی ساڵی ۱۹۵۲ دەکۆڵێتەوەو دەڵێت کێشەی ئابوری میسر کاتێك چارەسەردەکرێ کە رژێمی تازەی میسر بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە میراتی قۆناغی کۆلۆنیالی میسر، واتە سیستمی فرە حیزبی لەنێوبەرێت. ئەو خوازیاری کاری نەشتەرگەری ئەم "نەخۆشی رێبەری"یە بو، دەڵێت سەقامگیری "دیکتاتۆری بە بەرنامە" لە سەرتاسەری جیهانی عەرەبیدا دەبێتە مایەی یەکێتی عەرەبی‌و گەشەسەندنی ئابوری:

" بڕوامان بە بەها دیکتاتۆرییەکان بڕوایەکی تیوری نیە... ئەم بڕوایە لە پێویستی بە یەکێتی عەرەبی... و سەربازی سەرچاوە دەگرێ کە لە هیچ هەلومەرجێکیدا نابێتە رژێمێکی دیموکراتی‌و نەرم... ئازادی وەك پێویست هاوماناى دیموکراسی نیە.. ئازادی هاوماناى دابینکردنی پێویستی خواردن، پۆشاك، خانو، بیمەی تەندروستی، ئاگایی کولتوری‌و بەشداری کارایە لە چارەسەرکردنی مەسەلە میلییەکاندا. من نازانم هاوڵاتی میسری لە حاڵی حازردا زیاتر خوازیاری ئازادی رۆژانی پاشایەتی، حیزبە سیاسیەکان، یاسای سەرەکی‌و ئازادی چاپەمەنییە یا نا، چونکە لەو رۆژانەدا هەمو شتێك ئازاد بو، بەڵام هەمو شتێکیش بەهایەکی هەبو"[40].

حیزبی شیوعی عێراق شانۆی سیاسەتی بۆ حیزبی بەعسی ئیشتراکی چۆڵکرد (بڕوانە بەشی حەوتەم)، چونکە لەو باوەڕەدابو کە بەعسیەکان ئەو حوکمە مێژووییە جێبەجێ دەکەن کە (عەلی بەدور) لێکۆڵینەوەی لەسەر کردبو. روناکبیران جگە لە چەند حاڵەتێکی ئاوارتە، لە ساڵی ۱۹۵۸ەوە هێدی هێدی کورتیان هێنا، هەر چەندە بەرامبەر بەهێندێك زیادەرەوی پەرچەکرداریان نیشاندەدا، بەڵام ئەوانەش بە یارمەتی ئایدیای ستالینیزم، ماویزیم یا هەر نمونەیەکی تازەتری گۆڕان، مەسەلەکەیان چارەسەر دەکرد. جەماوەریش هەمان شتیان کردو پێویستیان بە روونکردنەوەو سەفسەتەی روناکبیران نەبو. ماوەیەك پێشئەوەی بەعسیەکان حوکم بگرنەدەست

لە ١٩٥٨دەربارەی پەکخستنی پارلەمان هاودەنگیەکی گشتی هەبو. کودەتا یەك لەدوای یەکەکان سالّانی نێوان ١٩٥٨ ـ ١٩٦٨ یش ئەوەی پشتراستدەکردەوە کە جەماوەر ئامادەیە دیموکراسی سیاسی بکات بە قوربانی سەقامگیری ئابوری[41].
لەگەڵ گەیشتنی بەعس بەدەسەڵاتو تەبەنیکردنی ئایدیۆلۆجیایەك بەهاوکاری زۆری داهاتی نەوتو بەسود وەرگرتنی لەرادە بەدەر لە توندوتیژی (باڵاکردنو پێشکەوتن) ئەو کارەش وەك دیاردەیەکی پڕجۆشو پێشبینیکراو لەعێراقدا روویدا. ئیدی نەك تەنها دروستی تیورییەکانی بەعس، بەڵکو پەیبردنی کۆمەڵگەی عێراقی لە چییەتی هەلومەرجی وڵاتدا ماوەیەك پێشئەوەی بەعس بەدەسەڵات بگات، پاڵپشتی لێدەکرا.

بەمشێوەیە پەیوەندییەکی ساختە لەنێوان حیزبی بەعسو جەماوەردا دروست بو کە دەسەڵاتو گەورەیی توانایانی دەرئەنجامی سروشو تەڵقینی حیزبی بو، دەیتوانی بەسەر هەمو کۆسپێکدا زاڵ بێت. ئەم پەیوەندییانە لە ئەزمونێکی هاوبەشەوە بو کە جیهانی ئەفسانەیی بەعسی لەگەڵ گریمانە کۆمەڵایەتییە گەورەترەکانو لەڕووی ئایدیۆلۆجیاوە یەکسان بە پێشکەوتن یا ئازادی، پێکەوە دەبەستەوە. سەیرەکە لێرەدایە بەروبەروبونەوەی ئەم دیاردەیە، شەرعییەتی کاری سیاسی پوختو سادە لەبەینبراو رەوشێکی بەتەواوەتی تازەش بەدیارکەوت. ئەو واقعیەی بەعسیەکان لە حەفتاکاندا خوڵقاندییان پشتگیری لە ئەفسانەگەلێك دەکرد کە خەڵکی عێراق لە پەنجاو شەستەکاندا دروستیان کردو لایەنگیریشیان لێدەکرد: یەکێتی عەرەب (یەکێتی، ئازادی، سۆسیالیزم)، "هێز" یا "یاساکانی" پێشکەوتن لەنێو ئەو ئەفسانانەدا بون.



## دواکەوتن وەك پاساوێك:

گریمان هێشتا هەلومەرجی ئازادی لە کۆمەڵگەی عێراقدا لەبار نیە، کەواتە ئەم هەمو توندوتیژییە بۆچی؟ بەمانایەکی دی، ئایا ئەم توندوتیژییە لەرادە بەدەرە خزمەت بەکام کاری مێژوویی دەکات؟ لێگەڕێن با رای نوسەری مارکسی، ئیسحاق دویچەر بخەینەروو:

"ئێستا روونبۆتەوە کە ستالینیزم دەرئەنجامی کۆمەڵگەی دوای شۆڕشە، کۆمەڵگەیەکی دواکەوتویی گۆشەگیر بەهۆی دەوڵەتەوەو لەرێگەی خاوەندارێتی گشتییەوە هەنگاوی گەورە بەرەو پێشکەوتنو بەپیشەسازیکردن دەنێت. ستالینیزم وەك سیستمێکی سیاسیو فیکری لەیەککاتدا بەمانای دواکەوتنی ژینگەیەکی میلیو پێشکەوتنی پیشەسازی دێت، بەمشێوەیەش سروشتێکی دوانەیی ناکۆکی هەبو. ستالینیزم هەوڵیدەدا توندوتیژی لەگەڵ گۆشەگیرییەکی سەرەتایی بەکاربهێنێتو شێوازی بەرهەمهێنانی تەقلیدی روسیی بە بەرنامەی نوێ بگۆڕێت کە پشت بە شێوازی پەروەردەی جەماوەریی دەبەستێت. دان بەوەدا دەنێم کە ناتوانرێ گشت دیاردە ستالینییەکان تەنها بەهاوکاری ئەم هۆکارانە روونبکرێنەوە، بەڵام بەلانیکەمەوە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی دیاردەکە نیشان دەدەن"[42].

خاڵی هاوبەش لەنێوان بەعسگەراییو ستالینیزمدا ئەوەندە زۆرە، گەر لە وتەکانی سەرەوەدا لە جێگەی ستالینیزم، "بەعس"و "بەعسگەرایی" دابنێین، هیچ جیاوازییەك بەدیناکرێ. دویچەر ستالینیزمی لە چوارچێوەیەکدا پێناسەکردوە، گەر هەمو وڵاتە دواکەوتوەکان ئاگایانە بیانەوێت بەسەر کێشەی دواکەوتوییدا سەرکەوتوبن بەشداری لەو چوارچێوەیەدا دەکەن. دویچەر لە فۆرمۆلەی "پێویستی ئاسنین"ی تروتسکیدا دەیویست راڤەی ئەوە بکات کە سەردەمی ستالین بەسەرچوەو تیرۆری ساڵانی سییەکانیش لەگۆڕنراوەو شتی تازە لە یەکێتی سۆڤێتدا جێگەی گرتۆتەوە.

ستالینیزم وەک حکومەتێکی ترس لە سیی‌و چلەکانی سەدەی رابردودا تا دەگاتە ساتەوەختی مردنی ستالین‌و لەسێدارەدانی (بیریا) لەلایەن جێنشینانی ستالینەوە، چوارچێوەو نمونەیەکی گونجاو بۆ تێگەیشتن لە فیکری بەعسدا فەراهەمدەکات، هەروەها ستالینیزم ئایدیۆلۆجیایەکی ئەسڵی جیهانی سێیەمە کە بەعس‌و سەرجەم ئایدیۆلۆجیاکانی بزوتنەوە نەتەوەگەراکانی دوای جەنگی جیهانی دووەم لاسایی دەکەنەوە. ئەگەر هەمو ئەو مەسەلانەی پەیوەستن بە بەرهەمهێنانەوە بەلاوەبنێین‌و بەهەمان شێوەی دویچەر تەماشای "سیستمی حکومەت‌و ئایدیۆلۆجیا" بکەین، ئەوا بەکۆبەندییەکی ئیجباری دەگەین: هەر چەندە ئەم دوو دیاردەیە (بەعسیزم‌و ستالینیزم) لەرووی سەرهەڵدانییەوە بەتەواوەتی نامۆن بەیەکتری، بەڵام لەرووی بونیادەوە یەکسانن.

تەنانەت ئەگەر هۆکارەکانی توندوتیژی رژێمی ستالینی بەتەواوەتی لەگەڵ ئەنگیزەکانی بەعسدا جیاواز بێت، دیسانەوە هەر دەبێ بوترێ هێشتا توندوتیژی فۆڕمی هاوشێوەی هەر دوو حکومەتەکە پێکدەهێنێت. کاتێک پلانێکی مێژوویی سەرسوڕهێنەرو بەرزەفڕ لە یەکێکدا هەیەو لەوی دی نیە، ئەوا هاوشێوەیی لەنێوناچێت. ئەم ئەنجامگیرییە بەدەر لە جیاوازبونی گۆڕانی دواتری هەر دوو رژێمەکە لەدوای کۆتایی هاتنی خولی ترس لە عێراقدا، تا رادەیەکی زۆر توشی گێژیت دەکات. راستییەکەشی ئەوەیە بەعس ئاگایانە شێوازی ستالینی بەمەبەستی گەیشتن بەدەسەڵات وەرگرتوە. لە هەموی گرنگتر ئەوەیە کە بەعس توانی جەماوەری حیزبی کۆمۆنیستی عێراق بەلای خۆیدا رابکێشێت.

بەداخەوە بەوردبینییەکی زیاتر لە وتەکەی دویچەر ئەوە روونەبێتەوە کە بەڵگەهێنانەوەکەی زۆر قوڵ نیە. ئەم روونکردنەوانە لە ئاراستەکردن‌و شرۆڤەکردنەکانی دویچەر زیاتر هەڵدەگرێت. لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ئەم پرسیارە هەر خۆی دەسەپێنێت: سەرباری نەبونی ئازادی ئەو توندوتیژییە لەپای چی بو؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا هەر یەک لە دویچەرو تروتسکی لەم مەسەلەیەدا پشت بەوە دەبەستن کە دەگمەنی،



هەلومەرجی توندوتیژی فەراهەمدەکات. سەرەڕای ئەوەش مرۆڤ زۆرجار راڤەیەک بۆ ئەو دواکەوتنە دەدۆزێتەوە، تەنانەت ئەگەر دواکەوتنی روسیا وایدەخواست، جیاکاری "کەمایەتییەکی دەستەبژێر" لە کۆمەڵگەی دوای شۆڕشدا بەماوەیەکی کورت لەنێوناچێت، ئەوا دیسانەوە پاکتاوکردنە بە بەرنامەکان کە بەملیۆن قوربانی لێکەوتەوە (قوربانیەکان بە رێکەوت هەڵدەبژێردران)و جۆری ئەو حکومەتەی لەم پاکتاوکردنە دەکەوتەوە، لەو ئاراستەکردنەدا بێوەڵام دەمانەوە.

ئەو بیرۆکەیەی پێیوایە، دیاردە سەرەکییەکانی ستالینیزم لەو کاروبارانەدا کورتدەکرێتەوە کە هیچ پەیوەندییەکیان بەسیاسەتەوە نیە، کارێکی ناپەسەندە. ئایا توندڕەوییەکانی ستالینیزم وەک جیاکارێک‌و "سیستمێکی حکومەت" تەنها لە رشتەیەک پەیوەندی نێوان ئەو و شێوازی بەرهەمهێناندا سەرچاوە دەگرن؟ تەنانەت دوای ئەوەی هەمو تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ستالینیزمیش دەناسرێنەوە، ئەوا جەوهەرەکەی وەک هەر هێمایەک دەمێنێتەوە. لە راڤەکردنی تایبەتمەندییەکانی ستالینیزمدا شتێک فەرامۆشکراوە: قەڵەمڕەوی کاری وشیارانە، دادوەری، ئایدیۆلۆجیا، گوناە، رووداوە رێکەوتە پێشبینکراوو ناپێشبینیکراوەکان، بەکورتی، قەڵەمڕەوی سیاسەت بەتەواوەتی لەبەرچاو نەگیراوە. لەسەروی ئەوەشەوە، قەڵەمڕەوی زەرورەت، واتە ئابوری‌و کار، وەک قەڵەمڕەوی "یەکەم هەنباری سۆسیالیستی" وەسفکراوە. ئەزمونی ستالینیزم لە دوا دەرئەنجامیدا ئەزمونێکی پڕ بەسوێی بو، بەوەی ئەو جوتیارانەی بە ملیۆنانیان لەبرسان دەمرن، هیچ جیاوازییەکیان لە نێوان سۆسیالیزمی ستالینی‌و رژێمی سەرمایەداری پێشوی روسیا نەدەبینی.

ئەو جۆرە کارانە دەبێتە مایەی بەکارهێنانی توندوتیژی وەک پاساوێک بۆ سڕینەوەی ئاسەواری دواکەوتنی کۆمەڵگە، ئەو کارەی لەگەڵ بۆچونەکانی دویچەردا نایەتەوە، بەڵکو لەگەڵ نیمچە مارکسیستەکان‌و نەتەوەگەراکانی وەک بەعسیەکاندا دێتەوە، ئەوانەی هێندێک دروشمی وەک ئینتما بۆ جیهانی سێیەم، تەبەنی دەکەن. ئەگەر مەزنی‌و پڕهێزی یەکێتی سۆڤێتی دەرئەنجامی ستالینیزم بێت، ئەوا بەعسیزم پاساوێک

بو بۆ ئەوەی پەیڕەوی لە میتۆدەكەی بكات. بەمشـێوەیە دەبینین كە ئەزمونی روسـیا لەلایەن حیزبی بەعسەوە لەچوارچێوەی ئایدیۆلۆجیا (سەربازی) دانرا، تا لە دامەزراندنی رژێمێكی سەركوتكەری دیكتاتۆری بەهرەی لێوەربگرن.

## مێشك شۆردن:

لە ئێسـتادا پێویسـتە لە كاریگەری بیست ساڵی ئەو ئەفسـانانە بپرسین كە لە رێگەی دەزگاكانی راگەیاندنەوە ئاراسـتەی ئـەو خەڵكانە دەكران كە رۆژگارێك نەخوێنەواربـون؟ هەروەهـا چۆن وێنای كاریگـەری ئەو درۆو دەلەسـانە بكەین كە خەڵكی لەلانكەوە تا گۆڕ لەو دەزگایانەوە دەیبیسـتین؟ هیچ كەسـێك قەوارەی ئەو كاریگەرییانــە نازانێت. رەنگە كەسـێك لــە دەرەوەی كۆمەڵگــەی عێراقدا بتوانێت تۆێكڵی ئەو پرسـیارانە بروشـێنێت. بەڵام لە ناوەوەی كۆمەڵگەدا، جیهانێكی تاریكو نتوكەو داخوازی دركو تێگەیشتنی ئەم جیهانە بوێری دەوێت كە سەرئەنجام ئەویش هەر بێئاكام دەبێت. ئەمەش هەمان ئەو جیهانە سـاردو سـڕەی شێتەڵكارییە كە هەمو لێكۆڵینەوەو گفتوگۆیەك تێیدا قەدەغە دەكرێ.

كۆمەڵگەی عێراق گشت ئەو دەلاقانەی داخست كە دەشێت خەڵكی هەناسەی ئـازادیو واقعییەتبونی تێیدا هەڵمژن، بۆیە كۆمەڵگــەی عێراقی ئینتمای بۆ جیهانێك بـو كــە بەتەواوەتی جیاواز بــو لەو دونیایەی ئێمەی تێیدا دەژین. ئیدی كێشــەكە بو بــە كێشــەی ئەو فیكرە داخــراوەی كارلێك لەگــەڵ ئەو فیكرانــەی دی ناكات كە سـود بە خەڵكی دەگەیەننو شـێوازی گوزەرانو فێركردنەوەیان پێشـدەخەن، بەڵام ئەوانەی هاوشـانی ئەو هەلومەرجە نارۆنو هەوڵدەدەن لێیدەرچن، ئەوا چارەنوسـیان دوورخسـتنەوە یا كوشـتن دەبێ. لێرەدا كێشــەكە بەرووكەش كێشەی زەمانە، بەڵام مەبەسـتی من لە زمان، رێسـاو بونیادە میراتییەكانی شێوەی پەیوەندییەكانی كۆمەڵگە



نیە، بەڵكو بەواقیعی چەمكی بونیادیین كە گشــت فیكرو لێكۆڵینەوانەكانی دەرەوەی كاروباری ژیانی رۆژانە، بەهاوكاریان بەرجەستە دەبێ.

ئۆپۆزیسـیۆنی عێراقی لە دەرەوەی وڵات دەسـتیان كرد بەروونكردنەوەی هێندێك چەمكی سیاسـیو فەلسـەفی. مانای زانسـتی وشـەی "میلەت" بریتیە لە سەرجەم تاكەكانــی كۆمەڵگــە كــە بەخاتــری پێگــەی چینایەتیو رۆڵــی سیاسـیان دەتوانن لــە قۆناغێكی مێژوویدا گۆڕانو پێشـكەوتن بەدەسـت بهێنن. رەنگــە ئەم مانایەش جیاوازییەكــی ســەرەكی لەگەڵ ئەو مانایەدا نەبێت كە لــە كۆمەڵگە دواكەوتوەكاندا دەیبەخشـێت، بـەڵام بەگۆڕانی كۆمەڵگەی چینایەتی ئــەم كۆمەڵگەیەش دەبێتە دوو بەشــەوە، بەگوزارەیەكی دی هێندێك عێراقــی لە دەرەوەی وڵات دەكەونە دەرەوەی ئــەم چوارچێوەیــەوە، ئەم جیابونەوەیەش یا هێزێكی زاتــی كۆمەڵایەتی ـ ئابوری هەیە یــا هێزێكی زەینیو فیكری(43). لەكن بەعسـیەكان كولتــور بەرهەمی فیكری مرۆڤ نیــە، بەڵكو بەرهەمــی مادی كۆمەڵگەی پێشـكەوتوەكان، بناغــەی فیكری مرۆڤ پێكدەهێنێت، واتە دەرئەنجامی حەتمی چالاكیی كۆمەڵی كارایە(44).

كۆمەڵــەی قوتابیانــی عێــراق، كۆمەڵەیەكی خاوەن دەسـەڵات بــو، بۆیە بەهەمو توانایەكــی خۆیەوە هەوڵیــدەدا دژایەتی بەعــس بكات، بەڵام ئەویش توشــی داوی پەرتەوازەیی بو. سـاویلكەیی ئەو قوتابیانە لەوەدابو، كێشــەی دژایەتیكردنی بەعسیان لەم كتێب یا ئەو كتێبی ماركسدا دەبینییەوە تا بزانن كە سەد ساڵ پێش ئێستا لەسەر ئەم مەسـەلەیە یا ئەو مەسـەلەیە چی وتوە. لێكۆڵینەوە دەربارەی وشــەكان دەتوانێت بــەرەو ســەركەوتن یا شكسـتمان بەرێت، بەڵام ئەو مانا ئەسـڵییەی لــە هۆیەكانی سـوكایەتیكردنەوە هەڵدەگۆزرێ، هەمیشــە بەعس تێیدا لایەنی براوە بوە، بەمشێوەیە سەركەوتن لەو شەڕەدا دیار بو پێشئەوەی شەڕ دەست پێبكات.

سـەیرە ئەو چەمكانەی هەر لەبنەرەتەوە وەك ئامرازێك بۆ تێگەیشـتنێكی گشـتی لــە حەقیقــەت بەكاردەهێنــرا، كاریگــەری خۆیان لەدەسـتداو لەشـێوەی هۆكاری كــردەوەی جیهانێك دەردەكەوتن كە هەر لەسـەرەتاوە بڕیاری روونكردنەوەیان دابو.

بەمشێوەیە "ئیمپریالیزم" کە لە لینینەوە وەرگیرابو، تێکەڵ بە جیهانی بەعس کرا، زانا ئیسلامییەکان‌و ئۆپۆزیسیۆنە عێراقییەکانیش مەبەستی روونکردنەوەی جەنگی عێراق لەگەڵ ئێراندا سودیان لەم دەستەواژەیە وەردەگرت. هەمان شتیش لەسەر وشەگەلی وەك "سۆسیالیزم"، "ئازادی"، "چەپ"، "راست"، "کۆنەپارێز"، "لیبرالیزم"، "بۆرجوازییەت"و دەستەواژەی لەبابەت "بەرژەوەندی جەماوەر"و "سیستمی سەرمایەداری جیهانی"یش پیادە دەبو.

کاتێك خاچی سور لەجەنگی عێراق ـ ئێران دا بەیاننامەیەکی دەرکردو تێیدا هەر دوو لایەنە بەشەڕ هاتوەکەی بەهۆی خراپی مامەڵەیان لەگەڵ یەخسیرەکاندا سەرزەنشت دەکرد. پەرچەکرداری یەکێك لەو دوو وڵاتە بەشەڕ هاتوە بەمشێوەیە بو: "بۆچی لەئێستادا ئەو بەیاننامەیە دەردەکرێ؟ کام دەوڵەتی زلهێزی جیهان سود لەم بەیاننامەیە وەردەگرێت؟ چ پیلانێکی تازە لە پشتی پەردەوە دەگوزەرێت؟"، ئەو بەیاننامەیەی خاچی سور دەریکرد هەرگیز ئاوڕی لێنەدرایەوە، تەنانەت وەکئەوەی هەمو وڵاتەکان زۆر دڕندانە مامەڵە لەگەڵ یەخسیرەکانی خۆیاندا بکەن‌و بیانکوژن.

چ جیاوازییەك لە نێوان ئەم تێڕوانینەی کۆمەڵێك نەیاری بەعسی عێراقی‌و تاریق عەزیز، ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشدا هەیە، کاتێك کێشەی واتەرگێت بۆ لۆبی زایۆنیزم دەگێڕێتەوە، بۆ ئەوەی نیکسۆن لە حوکم دووربخرێتەوە لەبەر ئەوەی دۆستی عەرەب بو؟ لەراستیدا عێراقیەکی خاوەن بڕوانامەی نەیاری عێراقی دەناسم کە شیکردنەوەکەی تاریق عەزیز بە نالۆجیکی نازانێت‌و تەنها لەبەر ئەوەی بەعسییەك ئەو قسەیەی کردوە، ڕەتیدەکاتەوە.

فیکری پیلانگێڕی رەگوریشەیەکی قوڵی لە قەدەرییەتی پەرگیری‌و دوژمنایەتی تاکگەرادا هەیەو بەگشتی خەسڵەتێکی کولتوری ئیسلامیشە. بیرۆکەی چۆکدادان بۆ خودای بانیسەر نمونەیەکی نیگەتیڤی هەوڵدان‌و بەپیرەوەچونی شەهادەتە لەپێناوی خوداوەندا. لە هەر دوو بیرۆکەکەدا، ئەو بیرۆکە تازەیە دەروخا کە پێیوایە خەڵکی نوێنەرو دروستکاری مێژووی خۆیان‌و دەسەڵاتی تەواویان بەسەر سروشتدا هەیەو



لەدواجاریشدا تەنها لەبەرامبەر نەفسی خۆیاندا بەرپرسیارن. ئایدیای پانعەرەبیزم بە پارێزگاریکردنی لەم میراتە هەوڵدەدا درزێکی گەورە لەنێوان بەرژەوەندی دوائامانجەکان‌و راستیە باوەکاندا دروستبکات. ئەم درزو جیاوازییە بەتێپەربوونی کات گەورە دەبێت‌و کەشوهەوایەك دەخوڵقێنێت کە هەمو شتێك تژی بێت لە پیلانگێڕی. لە کۆتایی شەستەکاندا، بەعسیەکان مامۆستای خوڵقاندن‌و بەرهەمهێنانی ئەمجۆرە کەشوهەوایە بون.

فیکری پیلانگێڕی کە هەمو شتێك بە پیلان دەزانێت، ئەوەندە فیکری سیاسی لەئاستێکی تەجریدی نزیکدەکاتەوە کە پەیوەندی ئەو فیکرە لەگەڵ هەلومەرجو بارودۆخی دەوروبەری واقعییدا بەتەواوەتی بەڵێڵی‌و ئاڵۆزی دەهێڵێتەوە. ئەم کارەش ڕێگە بەگوتاری زلی بێناوەرۆك دەدا بە بەرزترین ئاست بگات، بێئەوەی هەڕەشە لە بەرژەوەندی راستەقینە یا بەهای هەر شتێك بکات. ئەمجۆرە رادیکالییەتە بەپێچەوانەی رۆژگاری رۆشنگەری سەدەی هەژدەهەمەوە بو. ئەوروپای ئەو سەردەمە بەهاوکاری بیری رۆشنگەرانە هەوڵیدەدا پەیوەندی خۆی لەگەڵ نەریتدا بپچڕێنێت. بەڵام زۆرێك لە بیرمەندانی عەرەب کاتێك خۆیان بەپارێزەری سۆسیالیزم، "بەرژەوەندی جەماوەر" یا فیکری مارکس لەقەڵەم دەدەن‌و لەتوێژە پیلانگێڕەکان‌و جیهانی یەکێتی عەرەب کۆمەك وەردەگرن، جیهانگیری ئەخلاقی ڤۆڵتیریان تیانیە. لەجیهانی عەرەبیدا فیکری سیاسی دوور لە ئیدارەی کاروباری دەوڵەت بەشێوەیەکی زۆر سوریالی خۆی دەنوێنێت.

ئەزمونی راستەقینەی سیاسی لە وڵاتێکی وەك عێراق‌و لەماوەی دوا چارەکە سەدەی بیستەمدا ئەوەندە زمانی گفتوگۆو هەڤپەیڤینی دابەزاندبو کە سەرجەم خەڵکی، بەئۆپۆزیسیۆنیشەوە، سەرەتاییترین ئامرازییان بۆ تێگەیشتن لە چەمك‌و وشەکان نەبو تا بتوانن بەهاوکاری ئەو ئامرازانە حەقیقەتی خۆیان بناسن، چجای ئەوەی ئەڵتەرناتیڤێکی باشتر فۆرمۆلە بکەن.

ڕەتکردنەوەی رژێمە پێشکەوتوخوزەکانی وەك ناسریزم‌و بەعسیزیم، لەدوای ساڵی

١٩٦٧وە، لەلایەن رادیکاڵەکانەوە، تا رادەیەك بەهۆی پەیوەندی ئەو رژێمانەوە بو لەگەڵ دیماگۆگییەتی حەسەنێن هەیکەل، سەرنوسەری رۆژنامەی ئەلئەهرامو قسەزلیی ئەحمەد شوقەیری رێبەری فەڵەستین کە ساڵی ١٩٦٧ بەشێوەیەکی ئابروبەرانە لابراو زمان لوسی میشیل عەفلەقەوە بو[45]. گۆڤاری "مەواقیف" کە کۆمەڵێك لە عەرەبە رادیکاڵەکان لە ساڵی ١٩٦٨دا دەریاندەکرد، هێندێك هەڵوێستو بەشداری بوێرانەیان نواند. نوسەرەکانی ئەو گۆڤارە لێکۆڵینەوەو پشکنینیان، تەنانەت لەسەر خودی میراتی زمانەوانیش دەکردو لەجیاتی فیکرێکی رەخنەگرانە، ئارەزویەکی سەرگەرمییان تێیدا دەبینی. نوسەری لوبنانی ئەدۆنیس زۆر بەتوندی رەخنەی لە نەریتی شیعری عەرەبی دەگرت، بەوەی لەسەر حیسابی ناوەرۆك، گرنگی بەگۆکردن دەدەنو بانگەوازی بۆ "داهێنانی نوسینێکی نوێ" دەکرد[46]. هێندێك کەسی دی کەوتنە رەخنەکردنی ئەو فیکرە ئاینیو نەریتە کۆمەڵایەتییە تەقلیدییانەی پەیوەندییان بە شکستی ساڵی ١٩٦٧ەوە هەبو [47]. بەڵام ئەو هەوڵە داهێنەرانەیە هەر زۆر زوو پوکایەوە، ئەمە لەپاڵ ئەوەی لە وڵاتێکی دووری وەك عێراق، دەنگدانەوەیەکی ناچیزی هەبو.

ئەو رەخنە توندەی لەدوای ساڵی ١٩٦٧دا بەدیارکەوتو گوتارە ئاگرینەکانی ناسریزمو بەعس، هەر چەندە زۆر گرنگ بون، بەڵام لە چوارچێوەی "ئەوان"و "ئێمە"و "چۆن توانییان بەو شێوە ئابروبەرانەیە شکستمان پێبهێنن" مایەوە. ئەمەش سیمایەکی زاڵی فیلمی "عصفور"ی یوسف شاهین بو. شاهین لەو فیلمەدا ئەوە رووندەکاتەوە کە چۆن عەرەب لەژێر کاریگەری هۆکارەکانی ناوەوەدا شەڕی ١٩٦٧یان دۆڕاند. رەنگە لەو رۆژگارەدا ئەوە تاکە شێوازی ستراکتۆری ئەو پرسیارە بێت، بەڵام ئەمرۆ تا رادەیەکی زۆر شێوازێکی گونجاو نیە. لەو دەمەدا جەخت لەسەر جیهانی دەرەوە دەکرایەوە، هەڵمەت لەدژی دواکەوتن بەرامبەر دەستدرێژییەکانی جیهانی دەرەوە، سەرەتا لەرێگەی پەیکەری یەکبوونەوە خۆی دەنواند. لەو رۆژگارەدا قارەمانەکانی وەك فرانتس فانون، ئەرنستۆ جیڤاراو رێجیە دۆبرێ هێمای دوو ئاراستەی یەکتربڕ بوون، بەڵام لەهەلومەرجی جیهانی عەرەبیدا بەشێوەیەکی سەرەکی هێمای تێکۆشان



بوون لەدژی دوژمنی دەرەکی، نەك دژایەتی کردنی گەندەڵی ناوخۆ. لە کۆتاییدا ـ هەروەکو لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا باوە ـ هیچ پەیامێکی مرۆیانەی نەبو، بەڵکو ئەوەی هەبو خەفەکردنی ئاسۆی بیرکردنەوە بو. کەواتە بەرەنگاربونەوەی زمانو توێژەکانی بەعس لە قەڵەمڕەوێکدا کە لەلایەن بەعسیو ئەوانی دی بەباشی فەراهەم کرابو، هیچ سودێکی نەبو.

لەسەرەتای شەڕی ناوخۆی لوبنانو دەرکەوتنی رادیکاڵە ئاینییەکانەوە، دەست نیشانکردنی ئەزمونی راستەقینەی داتەپین لە سیاسەتی عەرەبیو کولتورەکەی ئاسانتر بوە، ئەوەش گرفتێك بوە بەنزیکەیی هەمو رووناکبیرانی عەرەب ـ بەلانیکەمەوە بەنهێنی ـ دانپیادەنێنو رەگوریشەیەکی قوڵی هەیە. تەنانەت لەو وڵاتە عەرەبیانەی کە سانسۆری دەوڵەت زۆر بەهێز نیە (بۆ نمونە میسر)، جۆرێك لە خۆسانسۆر کردن دەرکەوتوە. نوسەری میسری "لویس عەوەز"، گوناهێکی گەورە دەکات کاتێك دەڵێت جەمالەدین ئەسەد ئابادی لە ئێران لەدایك بوە، بۆیە ماوەی ساڵێك هیچ خانەیەکی بڵاوکردنەوە، بەرهەمیان بۆ بڵاونەکردەوە. رەخنەگرەکان دەیانپرسی، ئایا مەسیحییەکی قیبتی مافی ئەوەی هەیە دیدوبۆچونی خۆی لەسەر کاروباری ئیسلامی دەرببڕێ؟[48].

بەگشتی ئەم سوکایەتی پێکردنە شێوەی روبەروبونەوەی دوو نەیاری دژ بەیەك لەخۆی ناگرێ، بەڵکو یەك سروشتیان هەیە.

لەجیاتی ململانێ کردنی ئەو بیروباوەرو بەها داهێنەرانەیە، مارکسیستەکان، ئەوانەی رۆژگارێك لە لوتکەدابوون، کەوتنە خۆپاککردنەوە لە گشت ئەو بەها بیانییانەی لە ساڵانی شەستەکاندا پەیڕەوانی بڕوایان پێی هەبو، هەروەها نیشتمانپەروەرە توندڕەوەکانو تەوژمە چەپەکانیش هەمان رێچکەیان گرتەبەر. ئەوانە هەمان شوێن پای نەوەی پێش خۆیان لە عەرەبە لیبراڵو سۆسیال دیموکراتەکانیان هەڵگرتو بەهەمان شێواز تەنازولیان بۆ نیشتمانپەروەرو توندڕەوەکان کرد. شۆڕشی ئیسلامی ئێران لەسەرەتاوە لەلایەن بیریارانی وەك ئەنوەر عەبدولمەلیك، ئەدۆنیس، کلۆڤس مەقسود،

محمود ئەمین عالمو ئیدوارد سەعید پێشوازیکرا. ئەمە سەرباری ئەوەی لە سەروتاری گۆڤاری "ئەلغەد"یشدا هاتوە، بەرجەستەترین کەسایەتی مارکسیستی عێراقیو نەیاری بەعس بەهەمان شێواز گۆڕانی بەسەردا هاتوە[49]. ئسوڵییەکانیش هێندێك دەستەواژەو گوزارەی چەپیان وەرگرت، بۆ نمونە ئیمپریالیزم، سۆسیالیزم، خەباتی جەماوەر لەدژی سەرمایەدارە چەوسێنەرەکان، ئەوانەی بوونی فیزیکیان هیچ پەیوەندیەکی بەتوانای خەیاڵی نائاساییانەوە نەبو. هەر یەکێك لەو دوو لایەنە دڵنیابوونی خۆی لەوی دی دەبینییەوە. یەکێتی ئەو دوو لایەنە بەو چۆنێتیە لە جێگۆڕکێی وەفاداریدا روونەدەبێتەوە، هەروەها لە زمانی موسڵمانو عەرەبە نەتەوەپەرستەکانو چەپەکانی جەنگی ناوخۆی لوبنانو تاوانبار کردنی لوبنانیە مەسیحییەکان بە بەکرێگیراوی ئیسرائیلو خۆرئاوا، دەردەکەوێت.

ئەم دیاردە قورسەی ئەو داتەپینە فیکرییە لە وڵاتێکی وەك عێراقدا بە بەراورد لەگەڵ وڵاتێکی وەك میسر یا هێندێك وڵاتی باکوری ئەفریقیا، بۆ ئەو کۆنترۆڵە ئایدیۆلۆجیایە دەگەڕێتەوە کە عەرەبە قەومییەکان بەدەستیان هێنابو، لەگەڵ قوتدانی شیوعییەت کە زمانی نارەزاییو ئۆپۆزیسۆنی ساڵانی رابردو بو. جیاوازی نێوان فۆڕمو دروشمە میلییە رەوانو نەرمەکانی ناسریزمو بەعسیزم بریتی بو لەوەی: بەعسیزم لەرووی رێکخستنەوە جدییەتێکی تەواوی هەبو. بۆیە لەگەڵ ئەزمونی سیاسی وڵاتانی عەرەبی، پێویستە مرۆڤ بیر لە کاریگەری رێوشوێنی رێکخستنەکانی بەعس بکاتەوە بۆ ئەوەی تێبگەین کە خەڵکی عێراق چۆن بیردەکاتەوە.

ساڵی ١٩٧٨ ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیارێکی بۆ هەمو هێزەکانی سوپا، هێزەکانی ناوخۆو سەرکردایەتی هەواڵگری گشتی دەرکرد، بۆ ئەوەی پەیوەندی بە کۆلێجو پەیمانگەو قوتابخانەکانەوە بکەن. لەو بڕیارەدا مەسەلەی تەمەنو لێهاتویی ئاکادیمیو ماوەی پەیوەندیکردنو دەوام بەتەواوەتی پشتگوێ خرابون. وەزارەتی بەرگریو ناوخۆو سەرۆکایەتی هەواڵگری گشتی لیستی پاڵێوراوەکانی خۆیان رێکدەخست تا لەکاتێکی گونجاودا بەمەبەستی خوێندن پێشکەش بەو دامەزراوانەی



بکەن"[50]. لە ماوەی حەوت مانگدا سێ هەزار کەس وەك خوێندکار پەیوەندییان بەو نێوەندانەوە کرد. ئەگەر ئەو هەزاران ئەندامەی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی کە لەو ساڵەدا لەسەر هەمان بنەما لە زانکۆکان وەرگیران، هەژمار بکەین، ئەوان پێنجیەکی گشت ئەو کەسانەی لە ساڵی خوێندنی ١٩٧٨-١٩٧٩دا لە زانکۆکان وەرگیرابون لەو هێزانە بوون[51]. ئەوەش هەمان رێژەی نێوان هێزە چەکدارەکانو کۆمەڵگە بو، بەڵام لایەنگرانو ئەندامانی حیزب بەشێوازی ئاسایی پەیوەندییان بە زانکۆکانەوە دەکرد.

ئایدیۆلۆجیا بەتەنها وەك ئەفسانە هێزو توانای نیە واقع بەوێنای خۆی دروستبکات، بەڵام کاتێك لەگەڵ رێکخستندا هاورا دەبێ، ئیدی ئەو هێزو توانایە بەدەست دەهێنێتو ئۆرگانیزمی کۆمەڵایەتی بەجۆرێك بهارێت کە لە نمونەی فیکری نائایدیۆلۆجیادا جگە لە ناماقوڵییەك هیچی دی لێنامێنێتەوە. تەنانەت لەو کاتەشدا کە کۆنترۆڵی بەعس بەسەر خەڵکیدا کامڵ نابێت، ئەم جادوە هەر کاری خۆی دەکاتو لەلایەکەوە لەنێوان ئەزمونو واقیع، لەلایەکی دی چەمكو گوتار پەیوەندی دروستدەکات. ئەمەش خەسڵەتێکی جیاکاری بەعسە کە لە حوکمدا هەنگاوی تا رادەیەك گەورە بۆ سوکایەتی کردن بە فیکری عەرەبی لە سیاسەتو کولتوردا دەنێت، هەروەکو لەپێشدا باسکراوە.

## بەرگری:

کاتێك ترسو توندوتیژیو ملدان دەبێتە سیمایەکی زاڵی وڵات، ئیدی تاکەکان پێویستیان بە بەرگری لەخۆکردنو بەرپەرچدانەوە دەبێ، بەڵام نەك بۆ نەهێشتنی ئەو چەوسانەوەو ستەمەی دەوری لێگرتون، بەڵکو پاراستنی جۆرە هاوسەنگییەکی سایکۆلۆجی بۆ ئەوەی درێژە بەژیانی رۆتینی خۆیان بدەن. بۆیە کاتێك هەمو بەشێکی ژیانی رۆژانە روبەروی هەڕەشە دەبێتەوەو شتێکی شەخسیو

تایبەت بە مرۆڤ نامێنێتەوە، ئیدی قەیرانی بوون لەدایك دەبێت.

یەکەم رەفتار بۆ بەرگری کردن لەتوندوتیژی، شاردنەوەی هەمو بیرو هەستو کارێکی وردە، ئەمە سەرەڕای شتەکان ریاکارانەو جیاواز لە حەقیقەتی خۆیان بانگەشەیان بۆ دەکرێ، لەعێراق بە بەراورد لەگەڵ سەرجەم وڵاتە دواکەوتو،و نۆرماڵەکانی دی، رووکەش زۆر گرنگتر دەردەکەوێت[52]. گەلێك روداوی نادروستی قێزەون هەیە کە سەرنجی عێراقیەکان رادەکێشێت، بەوەی مرۆڤی عێراقی لەژیانی گشتیدا دەرناکەوێت بە بەراورد لەگەڵ دیاردە کۆمەڵایەتیو وەکاربردنە رووکەشییەکان کە کۆمەڵگەی کەنداوی پێدەناسرێتەوە. لەعێراقدا شتەکان بەناوی خۆیانەوە ناونانرێن، بۆ نمونە هاوڵاتیانی عێراقی توندوتیژی بەئاستێکی "ئاساییو نۆرماڵ" دەزانن. گەر بشبینرێ یەکێك بەپێچەوانەی ئەو رەوشە رەفتار دەکاتو دژی توندوتیژی دەبێتەوە، ئەوا بەرامبەر ئەشکەنجە بۆ بەرگری لە خۆکردن، تووشی نائومێدی دەبیت. ئەم روپامایيو خۆنواندنو سودوەرگرتنە لە دەمامك لە کارخانە، شوێنی کار، ئیدارە، مامەڵەکردن لەگەڵ لێپرسراواندا، دراوسێو لەناو ئەندامانی خێزانیشدا بەرادەیەك بەربڵاوە کە جیاوازی نێوان ئەسڵو رووکەش زۆر بەڵێلی دەمێنێتەوە، ئەم دەمامکەش ئەوەندە کاملو تۆکمەو لکێنراوە کە چاولێپۆشینی کارێکی سانا نیە. بەمشێوەیە مرۆڤ لە عێراقدا سیس دەبێت، هەروەکو چۆن قاقلەجنۆکە لە لەپکە (صدف)کەیدا سیسو لاواز دەبێت.

لەنێو ئامرازەکانی بەرگری لەخۆکردن لەجیهانی بەعسیدا، دەبێ مرۆڤ بیرو کەسایەتی خۆی بەشێوەیەك تەبەنی بکات لەگەڵ دەسەڵاتدا بگونجێتو بەشداری لە چالاکییەکانی حیزبدا بکاتو ببێت بەعسیو هاوبەشی بکاتو باوەڕی بەراستیو دروست ئەو کارانە هەبێت کە ئەوان پێی هەڵدەسن، تەنانەت ئەگەر یەکەمین حاڵەتو ئاماژەش لەرووی فریودانو هەڵخەڵەتانەوە بێت، ئەوا بەشداریکردن لە تاواندا دەبێتە دوا بەشی وازهێنانو بەجێهێشتنی حیزب، ئیدی پاشەکشێو بانگەشەکردن بەوەی کە هیچ نازانێتو ناشزانێت چی روودەدا (هەروەکو ئەوەی لەساڵانی



حەفتاکاندا لە ئەرجەنتین روویدا کاتێك ترسو تۆقاندن تەشەنەی سەند) بەس نیە، بۆیە خەڵکی بەوشێوەیە حاڵەتی دەرونیان رادەهێنن کە کەسایەتیو خودی خۆیان دەکەنە بەشێك لە بەها ئەخلاقییەکانی ئەو گروپەی خەڵك دەچەوسێننەوە. دەکرێ پێگەی کۆمەڵایەتی بەعس لەسەر بناغەی قەوارەی حیزب بپێورێ کە ساڵی ١٩٨٤ نزیکەی ملیۆنو نیوێك ئەندامی هەبو. ئەو پێگەیە زوو دەروخێتو رەنگە لە شەوو رۆژێکدا لەبەرچاو نەمێنێت، هەروەکو ساڵی ١٩٤٥ لە ئەڵمانیای نازی روویدا، بەڵام بۆ لەنێوبردنی ئەو پێگەیە سەرەتا پێویستە رژێم روبەروی قەیرانێکی تەواو بکرێتەوەو هەمو لایەکیش پێشبینی شکستو نابوتی بکات، بەڵام جەنگی عێراق ـ ئێران ئەو قەیرانەی بۆ حیزبی بەعس نەخوڵقاند.

ئەمجۆرە پشتگیرییە پێگەیەکی پشتگیری ئەوتۆ دەستەبەر دەکات کە زۆر بەهێزتر بێت لەو خۆپەرستییەی ملکەچی دەرەکیو سڵەمینەوەیەکی ناوخۆیی شلۆق پێکەوەیان کۆدەکاتەوە. رژێمەکانی جیهانی سێیەم پشت بەجۆرێك لە روپامایی درۆزنانە دەبەستن. بێگومان رژێمی پاشایەتی ئێران نمونەیەکی راستەقینەی ئەو دیاردەیە بو. ئەو شێوازەی رژێمی شای پێ سەرنگوم کرا، ئەوە دەردەخات حوکمڕانییەکەی لەسەر توێژێکی بچوك لە مێروە مشەخۆرەکانی کۆمەڵگەی ئێران خۆی راگرتبو کە رەگوریشەیەکی قوڵی لەنێو میللەتی ئێراندا نەبو. یەکێك لە بەڵگەکانی سەرکەوتنی خومەینی بەتەواوەتی بوونی هەمان مەودای قەیرانی نێوان خەڵكو شا بو. مەودای ئەو قەیرانەش نەك هەر لەنێو سروشتی هەمو هاوڵاتیاندا هەبو، بەڵکو لەنێو سەرلەبەری کۆمەڵگەدا بوونی هەبو. لە کۆتاییدا ئەوە سەلمێنرا کە ئەو قسانەی لەسەر ساواکو دەوڵەتی پۆلیسی شا دەکرا زێدەڕەوییەکی زۆری پێوەکرابو. ئەو راستییەش زۆربەی ئێرانییە دوورخراوەکان دانیپیادەنێن، ئەوانەی ئازاری قامچی دەستی ساواکو کۆماری ئیسلامی ئێرانیان چەشتبو، بەراورد لەگەڵ ئەو پشتگیرییەی بەعس کە رەگوریشەیەکی قوڵی لەناوخۆدا هەیەو لەسەر ئاستێکی بەرزو بەشێوەیەکی نائاسایی پشتگیری لە توندوتیژی دەزگاکان دەکرد. بەدڵنیاییەوە ئەوەش سایکۆلۆجیای تاك دەشێوێنێت،

هەروەها دیاردەیەکیشە هیچ پەیوەندییەکی بەخۆپەرستی ئاساییەوە نیە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەنوکە لە عێراقدا ئامرازی دی بۆ بەرگری لەخۆکردن هەیە. سەرباری سەرکەوتنی بەعس لە وێرانکردنی کردنی رەقیبەکانی خۆی لەبواری گشتیدا ـ سیاسەت، شوێنی کار، کولتور ـ ئەوا زۆر بەزەحمەت دەتوانێت بواری تایبەتیو کۆمەڵایەتی خێزان، پەیوەندی خزمایەتیو شوێنکەوتوانی گروپە ئایینیەکان بەتەواوەتی کۆنترۆڵی بکات. ئەمەش لەسەر گشت کولتورو کۆمەڵگە مرۆییەکان پیادە دەبێ، مادامەکی هەمویان لەدەرەوەی چوارچێوە سیاسیەکەدا تۆڕی کۆمەڵایەتیان هەیە، ئیدی سنورەکانی تا چەند فراوان بێت. هێزی پەیوەندییە خێزانییەکانی نێو عەرەبو وابەستەیی توندی ئاینزا بەربەستێکی مەزنیان لەبەردەم دەسەڵاتی بەعسدا دروستدەکرد.

لەرووی مێژووییەوە لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا وشەی "کۆمەڵایەتی" پێناسەیەکی فراوانو هەمەلایەنەی وەرگرتوە، ئیدی چ ئایینی بێت یا رەگەزی. ئەم دیاردەیە لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا بەسیستمی میللەت ناوزەدە دەکرا. مانای میلیگەراو میلی کە لە میللەتەوە سەرچاوەی دەگرت لە کەشوهەوایەکی ئایینی ـ خێڵەکیەوە بو کە وێنەی لە ئەزمونی ئەوروپای رۆژئاوادا بەدیناکرێ. دامەزراندنی دەوڵەتی نوێ لەسەدەی بیستەمدا هەمو سنورەکانی پێشوی کۆمەڵگەی گەڕاندەوە دواوە، ئیدی چ داوەری بێت یا ئابوری یا کۆمەڵایەتی. بەڵام هیچ روبەروبونەوەیەکی سیاسی لەگەڵ رەگەزپەرستییەکی توندو کۆنترۆڵ کردنی تاکەکانی نێو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانو سیستمی ئەخلاقی نەریتی روویندا. بەواتایەکی دی، لەگەڵ ئەو هەمو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیو ئابورییە، هیچ شۆڕش یا "روشنگەری"یەك بەسەر بەهاکاندا نەهات. هێندێك جار ئەم پرۆسەیە دەبوە مایەی دروستبونی شتێکی سەیر لە سیاسەتی رادیکاڵانەی رۆژهەڵاتدا کە لەرووی تیورییەوە گۆڕانکاریی لە بەهاکاندا دەهێنایە گۆڕی، بەڵام بەدرێژایی کات لە رەخنەکردنی ئەو نەریتانە دوور دەکەتەوە کە ئەو پرسیارەی دەروژاند تا چەند لەلای جەماوەر پشتی پێدەبەسترێ. ئەم دوو جیهانیی



بوونە رەگداکوتاوە ناتوانێت ئاوا بەسادەییو لەچوارچێوەی کارێکی سیاسی لەسەرەوەرا ـ هەرچەندە زۆر پێداگریشی لەسەر بکرێ ـ ناچار بە تەسلیمو پاشەکشێ بکرێ.

ئەم دوو جیهانەی بەیەکتری نامۆ بون ـ گشتیو تایبەتی، سیاسەتو کۆمەڵگە ـ لەسایەی خۆمەنیگەراو بەناوی ئیسلامەوە یەکیانگرتو بزوتنەوەکەیان تا ئەو رادەیە بە بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێری گۆڕی. حەزو ئارەزویان بۆ فیکری ئیسلامی بەرەو ئەو پرۆژەیەی بردن، بەڵام گەمە پسپۆرانەکەیان لە خزمەتی ئامانجی سیاسەتی سەدەی بیستەمدا، میراتی خومەینی لەم بەشەی جیهاندا دەسەلمێنێ، لەبەرامبەر ئەوانەشدا بەعسیەکان خەڵکانی ئەماتۆر (هاوی) بون.

بەمشێوەیە دەبینین هێشتا لە عێراقی بەعسدا پەناگەیەکی شەخسی لە هێرشو قەتلوعامەکانی بەعس شکدەبرێ، ئەویش لەرێگەی گەڕانەوە بۆ ئامێزی گروپە کۆمەڵایەتیە ئەسڵییەکانی لەبابەت خێزان یا ئاینزا. لەم بوارەدا گەلێك سەرگوزشتەی پڕ لە روداوی ئەو کەسانە دەبینرێ کە لە وڵات رایانکردوە، ئەوانەی توانای داراییان هەبوە یا جۆرێك لە سەربەخۆیی زاتی، زۆر لەسەرخۆو بەپشو درێژییەوە پلانیان بۆ راکردن لە عێراق دادەرشت، پلانێك وەقتێکی زۆری گەرەك بو کە زۆرجار چەندین ساڵی دەخایاند بۆ ئەوەی خەونە پەمەییەکانیان بهێننەدی، بەهەزاران عێراقی بەمشێوەیە لە خاکی نیشتمانەوە بەرەو کوێت یا ئیماراتی عەرەبی رایانکرد، هەروەها هێندێك کەس بەرێگەیەکی سەیروسەمەرە کە مووی سەر سپی دەکات، خۆیان گەیاندە ئەوروپا، بەڵام پەناگەی ئەوانەی لە عێراق مانەوەو رێگەی چونە دەرەوەیان نەبو، هاوشێوەکەیان ئایینو خێزان بو، لەبەر ئەوەی تایفەگەرێتی و سەرقاڵی بە گفتوگۆکانی خێزانەوەو بێتامی کاروبارەکان لەو ساڵانەی دواییدا بەتەواوەتی تەشەنەی سەندو بڵاوبوەوە. ئەم کارە کەشوهەوایەکی لەباری بۆ دەرکەوتنی فیکری سیاسی رادیکاڵ خۆشکرد کە دەرکەوتنی لە عێراقی بەعسدا بە کارێکی گەورە دادەنرێ، گەر ستەمو ترسناکی وەحشتگەری لەبەرچاوبگیرێن.

ئەمجۆرە ئاراستانە بۆ هەر یەکێك لە کۆمەڵە عەرەبیە سونیو شیعەکانی عێراق

ئاسایی بوون، ئەمە سەرباری ئەوەی پەڕگیری ئیسلامی سیاسی لەنێو شیعەدا بەربڵاوتربو، لەبەرامبەر تایفەگەرای ئایینی کە بەزەرورەت سیاسی نیە، بەڵام پەڕگیری سونە پابەندبو بە پەیوەندییە نزیکەکانی نێوان پانعەرەبی بەعسو نەریتی ئیسلامی سونە، سەبارەت بە رادیکاڵیەتی شیعەش لە ئێرانی ئیسلامییەوە هاوردە نەکرابو، هەرچەندە دەسەڵاتی ئێران بوونی هەبو.

بەگشتی تایفەگەری ئایینی میکانیزمێکە کە تاکی ترساوو ئەتۆمی بە گروپی داخراو دەبەستێتەوەو تاکایەتیی بەتوندی لەم گروپەدا دەتوێتەوە، بەڵام پەیوەندی تاك لەگەڵ "کۆمەڵگەی نوێ"دا ناسنامەیەك وەردەگرێت، گەر ئەوە نەبێت هەست بەتەنهاییەکی مەرگهێنەر دەکات. دوورکەوتنەوە لە دەوڵەت ئیجباری نیە، جگە لەو کەسانەی پلان بۆ بەجێهێشتنی وڵات دادەنێن یا ئەوانەی مەبەستی سەرنگوم کردنی رژێمیان هەیە، یا ئەوانەی دەبن بە ئیسلامی رادیکاڵ. گەورەترین تایفەی ئایینی لە عێراقدا لە فۆرمی دوژمنایەتیکردنی سونە لەبەر سونی بونیان یا دوژمنایەتیکردنی شیعە لەبەر شیعە بونیان دەردەکەوێت. تایبەتیمەندێتی ئەم دوژمنایەتییە بریتیە لە هەمو بەیەکگەیشتنێکی نازەروری، گوشاری ئیماندارانی لەسەرگەنجان، کەللەڕەقی، تایفەگەرێتی کە لە ئەنجامی گفتوگۆی رووکەشیەوە گەشەدەکات، گاڵتەجاریو پروپاگەندە، هیچ کام لەوانەش لایەنێکی روونو ئاشکرای سیاسیان نیە.

"دەعوەی ئیسلامی" کە گەورەترین رێکخراوی سیاسی نهێنی شیعە بو، پێشئەوەی بەعس بێتەسەر حوکم دامەزرابو، ئەم رێکخراوە گەورەترین زیانی لێکەوت، لەبەر ئەوەی سەرکردە ناودارەکانیان بەخاوخێزانەوە لە سێدارەدران. لە ئایاری ١٩٨٣دا نەوەد کەس لە بنەماڵەی ئەلحەکیم کە تەمەنیان لەنێوان ٩ ـ ٧٦ ساڵ دەبو، دەستگیر کران، تەنها لەبەر ئەوەی یەکێك لەو بنەماڵەیە بەناویمحەمەد باقر ئەلحەکیم لە ئێرانەوە سەرکردایەتی بەرەیەکی ئۆپۆزیسۆنی عێراقی دەکرد. بەعس ئاگاداری کردەوە بەرنامەکانی رادیۆ رابگرێت، بەڵام ئەو کارەی نەکرد، بۆیە لە ٢٠ ئایاردا شەش کەس لە خێزانەکەی بەبەرچاوی کەسوکارەکانیانەوە لە سێدارەدرانو لەو هەشتاو چوار



کەسەش مابونەوە، تەنها پێنج کەسیان بەهۆی گەورەیی تەمەنیانەوە ئازاد کران[53]. گوندی دوجەیلی شیعەنشین کە بە پێگەی خەباتی سیاسیو نێوەندی هێزە رادیکاڵە ئیسلامیەکان ناسرابو، لەدوای ئەو هەوڵەی بۆ کوشتنی سەدام درا، تەختکرا، پاشان هەر لەلایەن بەعسەوە دووبارە دروستکرایەوە، هەر دوو رووداوەکەش بەتەختکردنو دروستکردنییەوە ئەوە دەردەخات کە چۆن بەعس کۆنترۆڵی کاروبارەکانی دەکرد.

ئەمجۆرە رەفتارە سیاسیانە لە بەرەنگاربونەوەو شۆڕش کردن، کردەوە گەلێکی ئاوارتەیی بوون نەك رێسا، ئەمەش لە میانەی بەیاننامە پشتگیرییەکانو لایەنگری کردن لە رژێمو جەنگەکەی لەلایەن زانایانی شیعەی وەك شێخ عەلی کاشف ئەلغیتاء عەلی ئەلئەسغەر، رەنگیدەدایەوە[54]. ئەمە سەرباری ئەوەی کە گرژییەکی مێژوویی لەنێوان زانا ئایینیەکانی شیعەی عەرەبو ئێرانیدا هەبو. لەنێو هەشت گەورە زانای ئایینی شیعە تەنها محەمەد باقر سەدر عەرەب بو. کاتێك بەعس ساڵی ١٩٨٠، محەمەد باقر سەدرو خێزانەکەی لەسێدارەدا شەهیدێکی پێشکەش بەشیعەی عەرەب کرد، بەڵام ئەو تەنها کەسایەتیەشیان لەدەستدا کە دەیتوانی مەشخەڵی خومەینی هەڵگرێت، ئیدی لەوەدەمەوە ئەم بزوتنەوە ئۆپۆزیسۆنە عێراقییە لە حاڵەتی پەرتەوازییدا دەژی. ئەم بزوتنەوە شیعەیە نەك تەنها خومەینی خۆی لەدەستدا، بەڵکو سەربەخۆیی رێکخراوییشی لەدەستدا کە تۆڕێکی رێکخراوەیی ئەوتۆی هەبێت، سوتەمەنی پێویست بە چالاکییەکانی ببەخشێت. پێش ساڵی ١٩٧٩ زیاد لە ١٨٠ هەزار رۆحانیو خوێندکاری زانستە ئایینیەکان لە ئێراندا هەبون، کە توێژی شۆڕشیان پێکدەهێنا، بە بەراورد لەگەڵ ئەوەدا ساڵی ١٩٥٨ کەمتر لە دوو هەزار خوێندکاری زانستە ئاینیەکان لە نەجەفدا هەبون، کە ئەوانیش زۆربەیان ئێرانی بوون[55]. بۆیە دەبینین کاتێك ئێران لە جەنگی عێراق ـ ئێراندا سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوەی بەدەست نەهێنا، ئیدی بزوتنەوە شیعییە نهێنیەکانیش بوونە هێزێکی ناچیزو بچوك. رەئی ئاینی تایفەگەراو بەعسی عێراق لە هێندێك گریمانەی گرنگدا هاوبەشن کە پێکەوەژیانێکی ئاشتەوایی لە عێراقی بەعسدا ئاسانتر دەکات. سونەو شیعە عەرەبەکانی عێراق سەبارەت بەوەی کامیان حوکمڕانی

بکەن هەستیارییەکی سیاسی رەگ داکوتاراوی قوڵیان هەیە (بڕوانە بەشی چوارەم). رادیکاڵەکانی هەر دوو لا هاوئاهەنگییان لەگەڵ ئایدیۆلۆجیای بەعسدا هەیە، چونکە هەر دوولا خۆیان بەرۆحی رەسەنی میللەتێکی شۆڕشگێڕ دەزانن و لە دژایەتی کردنی مادیگەرا، ئیمپریالیزم یا خەڵکانی رەوشت نزم و ئەخلاق نزم هاوئاوازن. عەرەبی سونەی عێراقی لەو باوەڕەدایە کە ئیسلام و ناسیونالیزمی عەرەبی لەگەڵ بەعسدا بەیەك دەگەن، تەنانەت شیعەی عێراقیش لەکاتێکدا خەبات لە پێناوی ناسنامەی میلی خۆی دەکات، ناتوانێت بڵێت بەعسییەکان موسڵمانێکی باش نین. تەنها ئەوەی بەدڵنیاییەوە دەتوانن جەختی لەسەر بکەنەوە ئەوەیە کە بەعسییەکان پشت بە سونەکان دەبەستن، سەرباری ئەوەش، هەمو جۆرەکانی "ئیسلامی خۆشەویست" کە بەم دواییانە دوبارە راڤەی بۆ کراوەتەوە، خۆی بەنوێنەری راستەقینەی نەریتێکی دیموکراسی دەزانێت، ئەوەش لەلایەن مارکسیستە عێراقییەکانەوە بو[56]، لێرەدا هاوتاکەیەکی مەقبولی ئەو کارەش لە بەعسدا بەدیدەکەین. هیچ کامیان (سونەو شیعە) بەرامبەر لەناوبردنی ئازادییە مەدەنیەکان نارەزایی دەرنابڕن، تەنها لەئاست ئەو ناعەدالەتییەی بەرامبەریان دەکرێ توڕە دەبن و نارەزایی دەردەبڕن، سەرئەنجام لەبەر ئەوەی شیعە قارەمانپەرستن، بۆیە ئەگەر قارەمانە شایستەکەی دوور بخرێتەوە یا بەکەسێکی دی بگۆڕێت، ئیدی پەیوەندییە ئایینیەکەی دەگوێزێتەوە بۆ ئەو کەسانەی دەسەڵاتیان بەدەستەو هەستی شۆڕشگێڕانەیان دەگۆڕێت بۆ هەستی وەلاکردن و ملکەچی. گاڵتەجاری قەدەر لەوەدایە کە ئەو مەسەلە هاوبەشانەی پرۆسەی پێکەوەژیانی ئاشتی لە سایەی حکومەتێکی دیکتاتۆری سانا دەکات، لە هێندی مەسەلەی دی شیعەو بەعس دەکاتە دوژمنی سەرسەختی یەکتری. لە جەنگی عێراق ـ ئێراندا هیچ شتێك بەئەندازەی هێندێك لە ناسنامەی ئەو قارەمانانە حەقیقەتی ئەم ناعەقڵانیە ئاشکرا ناکات.

بۆ ئەوەی کۆتایی بەم قسەیەمان بهێنین، بەعس لەبواری تایبەتی کۆمەڵایەتیدا درزی تایفەگەرای ئاینی گەورەتر دەکات بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی راستەوخۆ کۆنترۆڵی تەواوی بەسەر میللەتەوە هەبێت. بەعس دەتوانێ لەگەڵ ئەم حاڵەتەدا ژیان بگوزەرێنێ



بەهەمان ئەو شێوازەی لەگەڵ ئەو راپۆرتنوسانەی "خۆشەویستی برایانەیان لەدەستداوە" ژیان دەگوزەرێنێ. ئەو ترسەی کە چیمەنتۆی کۆشکی بەعس پێکەوە دەچەسپێنێ، هاوبیچمەکەی لە تایفەگەرایەکی هەڵکشاودا بەدیدەکرێ. هەڵبەتە ئەم کارەش تا هەنوکە پێکدادانی سەر شەقامەکان ـ ئیدی چ بەشێوەی تۆڵەسەندنەوەی شەخسی بێت یا بەشێوەی پێکدادانی خوێناوی بەکۆمەڵ بێت بەناوی ئاینەوە ـ لێنەکەوتۆتەوە، لەلایەکی دی ئەو رادیکاڵییەی خزمەت بە ئامانجگەلێکی سیاسی ئاشکرا دەکات قابڵی قبوڵ نیەو لەلایەن بەعسەوە بێبەزەییانە سەرکوتدەکرێ. بەهەر حاڵ خودی بەعسیزم ئایدیایەکی ئاینی یا تایفی نیە. خستنەرووی پرەنسیپەکان دەبێ لەپێناو لێکترازاندنی هەمو پەیوەندیو رایەڵە کۆمەڵایەتییەکان بێت کە بەعس دیاریاندەکات. ئایدیالی حکومەت بریتیە لەوەی کە هەمو هاوڵاتیان بکات بە راپۆرتنوس، بۆیە لە کۆتاییدا هیچ پەناگەیەك بۆ تایفەگەرای ئاینی بارگاوی بەرق و کینە نامێنێتەوە.

1 ـ جۆرج سـۆرێل، تیشك خستنه سـەر توندوتیژی، لەندەن: جۆرج ئالانو ئانون، ١٩٥٢. جۆرج سۆرێل ئیمانی بەتوندوتیژیو بیرۆکەی ململانێی چینایەتی هەبو، لەسەرەتای دەسپێکردنیدا پێیوابو کە میانەی لەگەڵ ئەفسانەدا هەیە. بیروباوەری لەگەڵ دیدوبۆچونی حیزبی بەعسدا یەکدەگرێتەوە.

2 ـ لە وتەکانی سـەدام حسێنەوە وەرگیراوە، حەسەن محەمەد تەوالبە، بیروت، دار ئەلتەلیعە، ساڵی ١٩٧٩، ل١٥١ ـ ١٦٠، پێشتریش میشیل عەفلەق هەمان بیرۆکەی تەبەنی کردوە (بڕوانە بەشی شەشەم).

3 ـ هەمان سەرچاوەی پێشو. ل١٤٨.

4 ـ هەڵبژاردەیەك لە وتەکانی سەدام حسێن، ساڵی ١٩٧٧، کە لەسەر چۆنێتیو مێژووی خوێندن بو، ئەمەش هـاوڕا بـو لەگەڵ دیدبۆچونی کۆمەڵێك ئوسـتادی زانکۆ کە هەمویان هەڵگـری بڕوانامەی دکتۆرا بون. ئەم وتارانە لەژێر ناوی "دەربارەی نوسـینەوەی مێژوو" بەچاپ گەیەنراوە، بەغدا، دار ئەلحورییە، سـاڵی ١٩٧٩، ل١٤، ٢٣، ٢٥.

5 ـ لە وتەکانی سـەدام حسـێن لە کۆنگرەی گشـتی لاوانی عێراقدا، ١٥/شـوبات/١٩٧٦. سەدام حسێن: "دەربارەی کاروبارە کۆمەڵایەتیو دەرەکییەکانی عێراق"، لەندەن، گرووم هیلم. ١٩٧٩، ل٥٦ ـ ٥٧.

6 ـ شۆڕشـی ١٩٦٨ی عێراق: ئەزمونو بەڵگەکانی سـەرکەوتن، لەندەن، چاپخانەی ئەتاکا، ساڵی ١٩٧٩، ل١٧٤، راپۆرتی سیاسی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی.

7 ـ سـەدام حسـێن: دیموکراسـی سـەرچاوەی هێزی تاكو کۆمەڵگەیە"، بەغدا، چاپەمەنییەکانی شۆڕش، ١٩٧٧، ل١٤، ١٥، ١٩، ٢١.

8 ـ هەمان سەرچاوەی پێشو، ل٨، ٩، ٢٢، ٢٨.

9 ـ هەمان سەرچاوە، ٢٩ ـ ٣٠.

10 ـ ئەم بیرۆکەیە لە وتارەکەی هانا ئارێنت: دەسەڵات چییە؟ "لەنێوان رابردوو ئێستادا"، لەندەن، پەنگوین، ساڵی ١٩٧٠، ل٩٨.

11 ـ  سەدام حسێن: دیموکراسی.

12 ـ هەمان سەرچاوە، ل١٣.

13 ـ بینیدیکت ئەندەرسۆن، "کۆمەڵگە خەیاڵییەکان: تیشك خستنە سەر گەشەکردنو بڵاوبونەوەی نەتەوە"، لەندەن، ئێن، ئێڵ، بی، ڤێرسـۆ، سـاڵی ١٩٨٣، بەشی چوارەم جەخت لەسەر ئەو رۆڵە تایبەتە دەکاتەوە کە رێکخسـتنی ئیداری لە گەشەسـەندنی کۆمارەکانی ئەمەریکای باشـور لە کۆتایی سەدەی هەژدەو سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا وازیکردوە، هێندێك لە کۆمەڵگەکانی ئیمپراتۆری ئیسپانیا لە کیشوەری ئەمەریکا خۆیان بە ناسیونالیزم دەزانی، کە خودی ئەوەش بوە مایەی شکستی دامەزراندنی بزوتنەوەی ناسیونالیزمی ئیسپانیا ـ ئەمەریکا. هەمان بارودۆخیش لەسەر جیهانی عەرەبی دوای سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی پیادە دەبێ.

14 ـ تەنانەت دوای سـەرکوتکردنی "هاوکاری" لە پۆڵۆنیا دیسـانەوە دژە کولتوری ژێرزەمینی لە ئاسـتێکی بەرفراواندا بەردەوام بو، دەسـەڵاتدارانی پۆڵۆنیا بەبێ سـەقامگیرکردنی رژێمێکی گشتگیرو ترس نەیاندەتوانی





بنبڕیـان بـکات. پۆڵۆنییەکان لەرێگەی چاپخانە، گۆڤاری هەواڵ، بڵاونامـەی زانکۆ، وتاری رەخنەگرانە لە کڵیسـەکانو ئەو هونەرمەندانەی لە ئاپارتمانەکانەوە بەرنامەیان ئامادە دەکرد، توانیان ژیانی گشـتی لەدوای سـەرکوتکردنی بزوتنەوە بەزیندوێتی بهێڵنەوە. سـەرباری سـەرکوتکردنو زیندانیکردنو ئەشکەنجەدانیش، دیسانەوە رژێم نەیدەتوانی سودیان لێوەربگرێ.

15 ـ بڕوانە نامیلکەی نیمچە رەسمی لەتیف نوسەیف جاسم "جەنگو راگەیاندن"، بەغدا، دار ئەلحورییە، ساڵی ١٩٨١، ل١٢ ـ ١٤.

16 ـ تەوالبە، هەڵبژاردە، ل٦.

17 ـ Hanna Batatu, The Old Social Classes and Revolutionary Movements of Iraq (Princeton, Princeton Univ. Press) 607.

18 ـ گشـت ژمـارەکان لە مولحەقـی "بەغداد ئۆبزێرڤـەر"ەوە وەرگیراوە، لاپەڕەکانـی ٣، ١٢، ١٣، ١٥، ژمارەی ١٩٦٩/٧/١٥، لەژێر ناوی "سـەرەتای چاپەمەنیو رۆژنامەوانی لە عێراقدا". وتارە ئەسـڵییەکە دکتۆر عەبدولوەهاب عەباس ئەلقەیسـی خوێندنەوەی بۆ کردوەو لەژێر ناوی "کاریگەری رێنیسـانس لەسەر عێراق لەسـەردەمی حکومەتی عوسـمانی" بڵاویکردۆتەوە، (نامەی دکتۆرا، زانکۆی میشـیگان، ١٩٥٨). زۆری ژمارەی رۆژنامەکان لەبەر ئەوە بوە کە تەمەنیان کورت بوە، هەر رۆژنامەیەك لەدوای راگرتنی بەناوێکی تازەوە بڵاوبۆتەوە. هەڵبەتە ژمارەیەك لەو رۆژنامانە کەسایەتی تایبەتی خۆیان هەبوە. بۆ نمونە "حبذبوذ" رۆژنامەیەکی گاڵتەئامێز بو لە ساڵانی ١٩٣١ تا ١٩٣٨ توانیوێتی ٣٠٠ ژمارەی لێدەربکات، پاشان راوەستا.

19 ـ راپۆرتی سیاسی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، ل١٧١ ـ ١٧٢ .

20 ـ بڕوانە عالیە سوسـە "قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری لە عێراقدا: عێراق دەوڵەتێکی هاوچەرخە، تەحریر، تیم نیبلۆك، لەندەن، گرووم هێلم. ژمارەکانی ساڵی هەشتاکان لەسەر ژمارەکانی ئەم وتارەو لەرووی هەستو لێکنزیکییەوە نوسـیومە. ژمارەی رەسـمی سـاڵی ١٩٧٧، ژمـارەی نەخوێندەواری بـە ٥٣٪ لەقەڵەم دەدا، هەرچەندە هەڵمەتی نەخوێندەواری سـەرەتایەکی باشـی هەبو، بەڵام هێشـتا کاریگەری دیار نیە. لە دەیەی ١٩٥٠و ١٩٦٠دا دانیشـتوان زۆر زیادیکرد، هەر چەندە رێژەی خوێندەوارانیش زیادیکردبو، بەڵام بەقسـەی سوسـە بەهای نەخوێندەواری ئەوەندە گۆڕانکاری بەسەرا نەهاتبو. ئەم نوسینەش پشتگیری لەوە دەکات کە بەعسیەکان لەم مەیدانەدا دەستکەوتیان هەبوە.

21 ـ بڕوانە قانونی ٩٢ ی ساڵی ١٩٧٨، ئەلوەقائیع ئەلعێراقیە ٤١، ١٠/تشرینی یەکەم/١٩٧٩، ل ٢ ـ ١٠.

22 ـ ئەو ژمارەیەی لە "ئەلعێراق" دەرکەوتبو ٢٢ هەزار بو (٢٧/تشرینی یەکەم ١٩٨١)، ئەوەش بڵاونامەیەکی هەفتانە بو باڵیۆزخانەی عێراق لە بریتانیا دەریدەکرد.

23 ـ بڕوانە عالیە سوسە "نەخوێندەواری" لە کتێبی نیبلاك، عێراق، ل ١٠٨ ـ ١١٠.

24 ـ لە ژمارە ٣٠/ ئاب/ ١٩٨٠دا رۆژنامەی حکومی "ئەلجومهوریە" بڵاویکردۆتەوە کە چل هەزار شیعەی بەسـرە پەیوەندییان بەناوەندەکانی نەهێشـتنی نەخوێندەوارییەوە کردوەو بەسەر ٧٦٢ قوتابخانەدا دابەشکراون

که ٣١٥ بۆ پیاوانو ٤١٦ بۆ ژنانو ٣١ کیشیان تێکەڵن.

25 ـ بڕوانە بڕگەی ژمارە ١١و ١٢ قانونی ژمارە ٢ ی هەڵمەتی دژی نەخوێندەواری کە لە کانونی دوەمی ١٩٧٩دا دەرچوە لە ئەلوەقائیع ژمارە ١٤ بڵاوبۆتەوە (٤/ نیسان/ ١٩٧٩).

26 ـ بڕوانە بڕگەی یەك لە قانونی ژمارە ٩٢ ساڵی ١٩٧٨، "ئەلوەقائیع" ژمارە ٤١، ١٠/تشرینی یەکەم/١٩٧٩، بۆ زانیاری زیاتر لەسەر هەڵمەتی دژی نەخوێندەواری بڕوانە میدڵ ئیست ئیکۆنۆمیست دیگست ٢٣، ژمارە ٣٨ (١٩٧٩/٩/٢١)، ل٨.

27 ـ ئەلجومهوریە، ٣٠/ئاب/١٩٨٠، لە تاریکیدا ئامانجی هەڵمەتەکەی راڤەکردبو.

28 ـ گشت ژمارەکان لە وتاری ئامال ئەلشەرقی وەرگیراوە: "رزگاری ژنانی عێراقی"، لە کتێبی نیبلاك، ئەلعێراق، ل٨٠ ـ ٨١.

29 ـ هەمان سەرچاوە، ل٨٣ ـ ٨٥. ئەگەر ژمارەکان گەورە دەرکەون، بەڵام ئاماژە بەئیشارەتێك دەکرێ کە هەر کەسێك سەردانی بالیۆخانەی عێراق بکات، ئەوە پشتراستدەکاتەوە.

30 ـ لە کتێبی کریستاین مۆس هیلمس وەرگیراوە، عێراق: دەروازەی ڕۆژهەڵاتی جیهانی عەرەبە. واشنتن، دەزگای برۆکنز، ١٩٨٤، ل٩٩.

31 ـ لە وتاری ئەمەل رەسام وەرگیراوە لەژێر ناوی "شۆڕش لەناو شۆڕشدا؟ ژنو دەوڵەت لە عێراقدا"، نیبلاك، ل٩٤.

32 ـ بڕوانە وتاری چوارەم "ڕۆڵی ئەنجومەنە میلییەکان"، ئەلوەقائیع، ١٩٧٨/١٠/٢٥.

33 ـ بڕوانە قانونی ژمارە ١٣١، خزمەتی ژنان لە سوپادا، ئەلوەقائیع ٥٢، ١٩٧٧/١٢/٢٨.

34 ـ هیلم، دەروازەی ڕۆژهەڵات، ل١٠٠.

35 ـ رەسام "ژن، نیبلاك، عێراقن ل٩٧.

36 ـ خویندنەوەیەکی وردو پێوەرێکی ئابوری دەربارەی ئاستی ژیان لە سایەی ڕژێمی بەعس تا دەسپێکردنی جەنگی عێراق لەگەڵ ئێران کاری لەسەر نەکراوە. گشت نوسەرو رەخنەگرانی دوایی لەم خاڵەدا شەرێكو هاوڕان بەبەراورد لەگەڵ دەیەی پێشوتردا، زیادبونێکی واقیعیو بنەرەتی لە ئاستی ژیاندا دروست بوە. بڕوانە:

Batatu, Social Classes. 1095: Joe Stork, "State Power and Economic Structure: Class Determination and State Formation in Contemporary Iraq. In Niblock, Iraq, 42.

37 ـ داهاتی ساڵانە میلی لە ڕێکخراوی ئاماری نێوەندی وەرگیراوە بە وتەی نیبلاکن عێراق، ٧٩.

38 ـ بە مەبەستی ئاگایی لەسەر خەزینەی ژێرخانو گەشەپێدان لە عێراقدا لە کۆتایی حەفتاکاندا بڕوانە:

Middle East Economic Digest, Vol.21, No,49 (Dec.9.1977); Vol.21, No.51 (Dec.22.1977); Vol.22. No 12 (March 24, 1978); Vol. 23, No. 44 (Now. 2. 1979); Vol. 24. No. 19 (May. 9 .1980); 24, No 35 (Aug. 29. 1980).





سەبارەت بە پەرەسەندنی پیشەسازی سەر دەوڵەتو ترازوی گۆڕانکاری لەلایەن بەعسەوە لە بونیادی ئابوریدا بڕوانە:

Makran Sader, Le development industriel de Irak (Beirut: Centre D'etudes et de Recherches sut le Moden – Orient Contemporain, 1983). Sect.2, 2: " La Periode 1970 – 80: Vers une industrialization acceleree et. Etatisee". 43 – 57.

39 ـ Leon Trotsky. Revolution Betrayed (New York. Merit, 1965). 55. 59

40 ـ لە وتارێکی ن ـ ریجوان وەرگیراوە لە ژێر ناوی "ناسیونالیزمی عەرەبی"، ڕۆژهەڵاتی ناوەراست لە دووڕیانێکدا. والتر لاکۆیر. نیویۆرك. ٤/شوبات/١٩٥٨، ل١٤٥ ـ ١٦٥.

41 ـ خەیرەدین حەسیب ئەندازیاری نەتەوەگەرا لە ساڵی ١٩٦٤دا دەڵێت: لەنێوان ساڵانی ١٩٦٤ ـ ١٩٦٨دا، هەشت وەزیری پیشەسازیو گەیاندنو حەوت وەزیری کارو شەش وەزیری کشتوکاڵو شەش وەزیری پلاندانانی بەخۆیەوە بینیوە. بڕوانە پینروز، "عێراق: پەیوەندییە جیهانییەکانو رابونی نەتەوایەتی"، لەندەن، ئێرنست بن، ١٩٧٨، ل٤٦٧.

٤٢ ـ ئیسحاق دویچەر، ئاراستە فیکرییەکانی ناو یەکێتی سۆڤێت لە "مارکسیزم لەم چەرخەدا". سان فرانسیسکۆ، چاپخانەی رامپارت، ١٩٧٣، ل٢١٠.

43 ـ یەکێتی قوتابیان، گۆڤارێکی قوتابیانی عێراقییە لە بریتانیا. ژمارە ١ ـ ٢ ، نیسانی ١٩٨٣، ل٣٣.

44 ـ هەمان سەرچاوە.

45 ـ بڕوانە فواد عەجمی، فیکری عەرەبی سیاسیو پیادەکردن، لە ساڵی ١٩٦٧ ەوە. گفتوگۆیەکی نایابی تیایە.

46 ـ ناونیشانی وتارێکی گرنگە لە "مەواقیف"، بیروت ـ ژمارە ١٦، ئاب/١٩٧١.

47 ـ بڕوانە نوسینەکەی سادق جەلال ئەلعەزم، لەسەر ڕژێمە فەرمانڕەواکانی عەرەب، لە ساڵی ١٩٦٧دا "رەخنە لەخۆگرتن لەدوای شکستدا". عەکا، دار ئەلجەلیل. ئەو کتێبە گرنگانەی کە لەم بوارەدا بەچاپ گەیاندوە بریتین لە:

* رەخنەکردنی فیکری ئاینی، بەیروت، دار ئەلتەلیعە.
* لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەگرانەی بەرگریخوازی فەلەستین. بەیروت، دار ئەلجەلیل، ١٩٧٣.

48 ـ لەمروەو روەکانی دی راپۆرتی جودیت میلەنر لەناوی:

"The Embattled Arab Intellectual" New York Times Magazine, June, 1985, 56, 61, 64, 67 – 8, 72 – 4 پڕ بەسودە.

49 ـ ئەلغەد چاپی لەندەن، زانیاری لەسەر چەپە عێراقییە دوورخراوەکان بڵاودەکاتەوە.

50 ـ بڕیاری ژمارە ٢٥، ئەلوەقائیع ١٣ (٢٩/مارس/١٩٧٨)، ل٥.

51 ـ لەم حساباتەدا پشت بەگوتارێکی کراوەی کۆمەڵەی قوتابیانی عێراق لەبریتانیا دەبەستم. ١٦/

شوبات/١٩٧٩.

52 ـ بگەڕێرەوە بۆ مستەفا حیجازی، دواکەوتنی کۆمەڵایەتی: سایکۆلۆجیای مرۆڤی سەرکوتکراو. بەیروت، پەیمانگـەی پەرەپێدانی عەرەبی، ١٩٧٠، ل١٣٦ ـ ١٤١. سـەبارەت بەهێنندێك لـەو بیروڕایانە لێرەدا هاتوە، خۆم بە قەرزارباری ئەم کتێبە دەزانم، بەتایبەتی بەشـی دوەم کە لەسـەر "میکانیزمی بەرگریکردن"و بەشـی شەشـەم کە لەسـەر "تەبابون لەگەڵ دەسـتدرێژیکاران"دا بو. تێبینیو شـارەزایی حیجازی لەسـەر شەڕی ناوخـۆی لوبنـان بو، بەڵام لەسـەر بەعس پیادەی ناکات، بۆیە بەراوردکاری نێـوان عێراقو زۆرێك لە وڵاتە دواکەوتوەکاندا، لەلایەن خۆمەوە ئەنجام دراوە.

53 ـ بڕوانە راپۆرتی لیز تۆرگود، گاردیان، ٢٨/حوزەیران/١٩٨٣. سەربوردەیەکی کەسی بنەماڵەی حەکیم، گاردیان، ٢١/ئایار/١٩٨٣.

54 ـ Hanna Batatu, "Iraq Underground Shia Movement: Characteristics, Causes, and prospects", The Middle East Journal 35 (Autumn 1981), 592.

55 ـ هەمان سەرچاوە. ٥٨٦.

56 ـ ئیسلام و دیموکراسی لەبڵاونامەی ئەلغەد١١(تەموزی ١٩٨١)، ٥ ـ ١٥و١٢مارس١٩٨٢، ل٥ ـ ٣١.

# بەشی چوارەم

# دەسەڵات

## نازناوەکانی ڕێبەر:

لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا وێنەی ڕێبەرەکان ئاماژە بۆ دەسەڵات دەکەن، بەڵام لەعێراقی بەعسدا وێنەکان بەشێوەیەکی تەواو جیاواز بەکاردەهێنرێ. لە دەروازەی هەر گوندێکدا وێنەیەکی گەورەی ڕەنگاو ڕەنگی سەدام حسێن هەڵواسراوەو زۆرجار ڕوناکییەکی گەورەی بۆ دادەنرێت تا بەشەویش بدرەوشێتەوە. هەروەها نمونەی لەوجۆرەش لەنێوەندی شاری بەغدا بە بەرزی سی پێ بەدیدەکرێ. وێنەی فۆتۆگرافی سەدام حسێن هەمو شوێنێك دەرازێنێتەوە، دوکان، قوتابخانە، بنکەی پۆلیس، سەربازگە، بینا گشتییەکان، نوسینگە شەخسییەکان، ژوری نوستنو ڕێگەوبانەکان. هیچ بەرپرسێك ناتوانێت لەبەردەم کامێرا دەرکەوێت، بێئەوەی وێنەیەکی سەرۆك لەپشت سەرییەوە نەبێت. ناوی پێش هەمو گوتارە گشتییەکان دەکەوێت.

سەدام حسێن سەر کۆماری عێراق، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکان، ئەمینداری گشتی فەرماندەی قوتری حیزبی عەرەبی ئیشتراکی، سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای پلاندانان، سەرۆکی لیژنەی ڕێکەوتننامەکان، سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای کشتوکاڵ، سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای نەهێشتنی نەخوێندەواری بو، ئەمە لەپاڵ کۆمەڵێك شتی دی. لەسەروی ئەو نازناوە حیزبیو حکومییانەشەوە تۆڕێك نازناوی شەرەفیو ڕێوڕەسمی هەبو کە لە کاتی موخاتەبەکردنیدا بەکاردەهێنرا:





ڕێبەر، سەرۆکی تێکۆشەر، سەرۆکی عەرەب، شاسواری نەتەوەی عەرەب، قارەمانی ڕزگاریخوازی نیشتمان، هەڵگری ئاڵا، باوکی سەرکردە (پێشتر بۆ ئەحمەد حەسەن بەکر بەکاردەهێنرا)و شاسواری بوێرو ئازا.

لە ڕادیۆو لەماوەی هەر گفتوگۆیەکی سیاسی ڕادیۆیدا بەلانیکەمەوە لەکاتژمێرێکدا ٣٠ ـ ٥٠ جار ناوی ڕێبەر دەهێنرێ، ئەمە سەرباری کۆمەڵێك نازناوی دی کە لەگەڵ بۆنەکەدا بگونجێت[1]. ڕۆژانە لە هەواڵەکانەوە دەیان بروسکەی پیرۆزباییو گوتەی پڕ لەروپامایی بڵاودەکرێنەوە. کاتێك سەرۆك کۆشکی سەرۆکایەتی بەجێدەهێڵێت، هەمو جوڵەیەك لە شەقامەکانی بەغدا دەوەستێت، شاوەکان دەست بەلێدان دەکەن، سەربازان بەدرێژایی ڕەوتی کاژاوەکە لەسەر جادەکان دەوەستن، خەڵکی بەمەبەستی بینینی سەرۆكو کەژاوەکەی دەرژێنە سەر جادەکان، منداڵانی خوێندنگاکان لەسەر شەرەفو سیفاتەکانی سەرۆك سرود دەچڕنو دروشمەکانی لە هەمو شوێنێکدا دەبینرێ. لەسەر بەرگی یەکەمی کتێبی خوێندن وێنەیەکی سەرۆكو لەپشتەوەشی دوا وتەی چاپدەکرێ، لاوانی عێراقی ت ـ شێرتی سەدام دەپۆشن، لایەنگرە ڕاستەقینەو بەپەرۆشەکانی ئەو کاتژمێرە ئاڵتونییە دەکڕن کە وێنەیەکی سەدام حسێنی تیایەو لە ڕێگەی خەپلە بازنەییەکەیەوە تەماشای کاتژمێرەکە دەکات[2].

لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا وێنەی ڕێبەرەکان لەدوای کودەتایەکی سەربازی یەکسەر وەك ئەو گۆڕانە واقعییەی لە دەسەڵاتدا ڕوودەدا، لەبەرچاو وندەبن، بەڵام ئەم هاوکێشەیە لەسەر عێراقی دوای ساڵانی حەفتاکان پیادە نابێت، لەبەر ئەوەی وێنەی ڕێبەر بەشێوەیەکی وردو حیساب بۆکراو دەردەکەوێت. ئێستا گرنگی بە بەیانکردنێکی تەواو جیاوازتر لەسەر دەسەڵات دەدرێ. کاتێك ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر ساڵی ١٩٧٩ کار کەنار کرا، هێدی هێدیو بەشێوەیەکی ورد دەست بەلابردنی وێنەکانی بەکرو دانانی وێنەکانی سەدام کرا. وێنەکانی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر لەساڵانی یەکەمی دوەم حوکمڕانی ڕژێمی بەعسدا بەکەمیو بەدیاریکراوی دادەنران، لەنیوەی دەیەی حەفتاکاندا لەپاڵ وێنەکانی سەدام حسێن، وێنەی بەکریش دادەنرا، لەهاوینی

ساڵی ١٩٨٢دا هەمو وێنەکانی بەکر بەتەواوەتی لابران، بەهیچ شێوەیەکی وێنەیەکی سی پایی بۆ بەکر دروست نەکرا، پەیکەری لە دەروازەی گوندەکاندا بۆ دادەنەنرا، کاتێك عێراقییەکان لەدوای ساڵی ١٩٧٩ەوە وێنەکانی بەکرییان دەبینیو دەیانبیست هێشتا هەر بە "باوکی سەدام" ئاماژەی پێدەدرێ، ئیدی تێدەگەیشتن هێشتا کورەکەی بەرامبەر بە وتەکانی ساڵی ١٩٧٧ی بەئەمەكو وەفادارە. لەو وتارەیدا فۆرمو وێنەیەکی بە باوکی داوەو ئەوپەری رێزو ستایش بەرامبەری بەجێدەهێنێت[3].

بەمشێوەیە کاتێك عێراقییەکان تەماشای وێنەی ئەحمەد حەسەن ئەلبەکریان دەکرد، زیاترو زیاتر لە سەدام حسێن دەترسانو ئاەو حەسرەتیان بۆ نەمانی دەسەڵاتیان بەسەر منداڵەکانیاندا هەڵدەکێشا. واقعییەتی سیاسی پشت بەرزکردنەوەو داگرتنی هەر وێنەیەك، دەسەڵاتو توانای ترس بو. زۆری پێنەچو هەر هەمان ئەو کەسانە کەوتنە هەڵواسینو بەرزکردنەوەی وێنەی سەدام حسین لەناو ماڵو نوسینگەکانی خۆیاندا، بەو هیوایەی لە شەڕی شەیتان دوور بکەونەوە. ئەمەش ئەوە روونەکاتەوە کە دەسەڵات بەرووکار چۆن بوە، بەڵام کاتێك مرۆڤ نەتوانێت قسە لەبەردەم منداڵەکانی بکات یا هانیان بدات رێبەرەکەیان خۆشبوێت، یا تەنانەت لەوپەڕی هەڵچوندا لە ناساندنی رێبەرە مەزنەکەیان ئاگاداریان بکاتەوە، ئیدی شتەکان بەروونی نامێنێتەوە. ئەو هێزە پوختەو رووتەی کۆنترۆڵی کۆمەڵگەی مەدەنی دەکات، بەدەسەڵاتێکی تازە گۆڕابو کە حوکمی ناخی هەمو تاکێکی دەکرد. ئەو دەسەڵاتە، هێندە رەهاو گشتگیر دەردەخرێ تا هەمو تاکێك سوكو ریسوا بکات. ئەمەش خەڵکی والێدەکات باوەڕ بەوە بهێنن کە هەمو ئەو شتانە واقیعینو جگە لە واقیع شتێکی دی نیە.

رێبەری تازە رقو کینەی خۆی بەسەر نزیکترین کەسی دەوروبەرەکەیدا دەبارێنێتو سوکایەتیان پێدەکات. لەو کۆنفراسو کۆنگرانەی سەدام حسێن تێیدا ئامادە دەبێت، بەتواناترین کەسی وڵات دەستەوەستان لەبەرامبەریدا دەوەستێتو تەماشای بەرپێی خۆی دەکات یا لەهەر کەسێکی دی زیاتر چەپڵەی بۆ لێدەدا، وەزیرەکان لەو شوێنەیدا سەدام ئامادەی بێت، پاشەوپاش دەگەرێنەوە دواوەو پشتی تێناکەن تا



شوێنەکە بەجێدەهێڵن، کاسێتێکی ڤیدیۆی سیاسی لەسەر حیزب هەیە کە لەسەرەتای دەستپێکردنی جەنگی عێراق ـ ئێراندا وێنەی گیراوە، تێیدا سەدام حسێن بەوپەری دڵرەقییەوە سوکایەتیو سەرزەنشتی کۆمەڵێك وەزیرو بەرپرسی حیزبی دەکات، لەبەر ئەوەی لەکاتی پێویستدا خۆبەخشانە بەپەرۆشەوە بەرەو سەنگەرەکانی جەنگ نەرۆیشتۆن، ئیدی سەرزەنشتکاران بەڵێن دەدەن بەزووترین کات چارەسەری ئەو کەموکورتیانەیان بکەن. کاسێتەکە بەمەبەستی کاراکردنی لایەنگرانی حیزب لەسەر یەکسانیبوونی بەعسیەکان لەکاتی جەنگدا، بەژمارەیەکی دیاریکراو دابەشکرا، بەڵام دوای ئەوەی کاسێتەکە لەناوچەی کەنداو بڵاوبووەوە، خێرا کەوتنە کۆکردنەوەی، چونکە تێگەیشتن کە هەڵەیەکی گەورەیان کردوە. ئەم هەڵەیەش، هەڵەیەکی کوشندەیە، لەبەر ئەوەی لە جیهانی خەیاڵی بەعسدا، ئەو ئیمپراتۆرەی جلوبەرگی نیە، رەنگە وەزعی خۆی بیرچێتەوە کاتێك لەدەرەوە سەرچڵی دەکات.

گشت وێنەو رەسمە گەورەو فیملە ڤیدیۆیەکان بۆ هۆیەك کار دەکەن، بۆیە کاتێك ئەو هۆیە دەرنەکەوێت، ئیدی گاڵتەجاری جێگەی جیهانی ترس دەگرێتەوە، کێشەکەش لەوەدایە لەو هۆیە تێبگەین. فیکری سیاسی "ئایدیۆلۆجیا" وەك دروستکردنی ئەفسانە لە کرۆکی بەعسدا بوونی هەیە، ئیدی چ وەك بزوتنەوە بێت یا وەك دەسەڵات. ئامانجە خەیاڵیو ئایدیالیستەکان لەسەر ئاینده لە ئێستادا لە بەڵگەنەویستەکانەو زاتی هەمو تێکۆشەرێکیش دیاریدەکات. زۆرجار ئەو خەیاڵو ئایدیایە لەرێگەی کۆمەڵێك سروتو رێورەسمی تایبەت بەئەندامگیری لەبێژنگ دەدرێ. پلەبەندی یا ئاستی دەربەستبوون بەحیزبو ئەو ئایدیانەوە جیاوازە، لایەنگرانی رێکخراوە جەماوەرییەکان لەڕووی دەربەستبوون بەو ئایدیانەوە لەدوای ئەندامانی حیزبەوە لەنگەر دەگرنو پاشان نۆرەی جەماوەری بێشکڵو فۆڕم دێت کە لە نێوانیاندا گوێڕایەڵی رووت بۆ حیزب تا بێلایەنیو نەیاری حیزبی بەعس بەدیدەکرێ. پیرۆزی دەرونی خەیاڵی گشتی لەمجۆرە ژینگەیەدا یا لە بارودۆخێکی ناوەندیو پلەبەندی کراودا، زۆر بەدەگمەن لە شێوەو فۆرمی خۆیدا لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێ، چونکە تێیە لە بەربەستو رێگری

ئەو توێژانەی پێگەیان لە زنجیرەی هەرەمیدا متمانەیەك لەكن توێژەكانی خوارەوە پەیدا دەكاتو پەنجەرەیەكی بچوكی واقیعەتییەش بەسەر توێژەكانی سەرەوە دەكاتەوە. حیزبی بەعس وەك بزوتنەوەیەكی ئۆپۆزیسۆن بەو شێوازە گەشەیكرد، بۆیە كاتێك دەسەڵاتی گرتەدەست بڕیاریدا كۆمەڵگە لەسەر هەمان هێڵ یا فۆڕم ڕێكبخات[4].

ڕێبەری بێقەوارەو گەورەتر لە ئاستی ئاسایی لەرێگەی كۆنترۆڵ یا چاودێری كردنی كۆمەڵایەتی هەمەلایەنو گشتگیرەوە سەرچاوە دەگرێ كە ڕێكخستنی حیزبێكی سیاسی پیادەی دەكات. وادەردەكەوێ حیزب لەسەر ڕۆڵی پێشەنگی تەنها بەرووكەش لەگەڵ ڕێبەردا ناكۆكی یا ململانێی هەبێ. هەر كاتێك حیزب لە مەیدانی پێشبڕكێ یا بواری سیاسیدا دوابكەوێت (لەبەر ئەوەی گشت نەیارەكانی پاكتاوكردوە كە ئەوەش دەرئەنجام یا بەرهەمی كونترۆڵی كۆمەڵایەتی گشتگیر دەردەخات)، ئەو دوو ئەركەی پێشتر تایبەت بو بەخۆی ـ بەرهەمهێنانی فیكری سیاسیو ڕێكخستنی ئەندام ـ لێیجیادەبنەوە. لەرووی پرەنسیپەوە سەرجەم كۆمەڵگە لەرێگەی حیزبەوە ڕێكدەخرێنو ئەوەش تێڕوانێك بو تاكی بەرەو حیزب دەبرد، واتە كاتێك نیگای جیهانی پێشبڕكێكاری دەوروبەری لەسەر ململانێ بونیات دەنرێت، بەڵام ئێستا ئەو قورساییەی خۆی لەدەستداوە، چونكە كاری تاقەت پروكێن، چاودێری ئێداریو بێتوانایی كەسەكان ئەو قورساییەیان لەنێوبرد.

دوو ئارەزوو لە حاڵەتی بەهاوتاكردنی یەكترین: یەكێكیان تێڕوانینی بەرابی بەشێوەی جەوهەریی سیاسەت دەكەوێتەروو، ئارەزووی دوەم، تێڕوانینی ناوبراو لە ئەندامانی حیزب وەردەگیرێتەوەو لەشێوەی كۆمەڵەی نهێنیئامێزو دەرەدەست وێنا دەكرێ. نیشانەكانی جیابونەوەیەكی زەق ئەوەیە كە تێڕوانینی بەرابی لەپاڵ ڕاڤەكردنی سیاسی، لەئێستادا مەیدان یا كێڵگەی كاركردنی پۆلیسی نهێنییە. ترسو تۆقاندنی سەرجەم دەزگاكانیش لە پەیوەندی كردنی لەگەڵ ئەم تێڕوانینەدا حوكمی هەمو كەسو شتێك دەكاتو لەكاتی نەبونی ئۆپۆزسیۆنی سیاسیشدا هەوڵدەدا چاودێری جەماوەر بكاتو لەگەڵ حیزبدا یەكرەنگی بكات. پەیوەندی نێوان پۆلیسی نهێنی



لەگەڵ كەسایەتی ڕێبەردا لە ڕژێمێكی وەك ڕژێمی بەعس، لەمەودایەكی دووردا پەیوەندییەكی یەكلاكەرەوەو ڕەهایە. ئەو دەزگایانە بەتەنهاو بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ سەر بەڕێبەر نین، بەڵكو باڵاكردنو گەیشتنی ڕێبەر بە لوتكە لەرێگەی ئەو دەزگایانەوە دەبێت.

لەم قۆناغەدا ڕێبەر كۆنترۆڵی ڕێكخستنی سیاسی حیزب دەگرێتە ئەستۆو دابەشكردنێكی تازەی كار دەردەكەوێت كە لە ڕاستیدا دوبارەبونەوەیەكی ساختە جیاوازی نێوان كۆمەڵگەی مەدەنیو دەوڵەت دوو هێندەتر دەكات. ئەو تێڕوانینە كە بەراییە بێگەردەكەی بە گەشەسەندنی ڕێكخستنی حیزبەوە دەبەسترێتەوە، ئێستا جێگەی خۆی بۆ ترس لە "بوونی" گشتگیری پۆلیسی نهێنی چۆڵكردوە. ئەم جیابونەوەیە بارستایی كۆمەڵایەتی حیزبو لێهاتویی بیرۆكراسییەت بەگشتی باڵا پێدەكاتو زیاتریش بەعەقڵانیتری دەكات. ئێستا ئیدی هەمو كێشكردنێكی سیاسی لە كەسێتی ڕێبەردا بەدیدەكرێ. دەكرێ ڕەخنە لە هاوكار یا سەركارێك بگیرێ لەبەر نادڵسۆزی بەرامبەر بەحیزب كاتێك درەنگ دەچێتە سەر كارەكەی، چونكە ئەم ڕەخنەكردنە وەك هەر فۆڕمێكی گشتی "ڕەخنە لەخۆگرتن" زیان بەهێڵی گشتی حیزبو وتە گوتراوو نەگوتراوەكانی ڕێبەر ناگەیەنێت، بەڵام پێش ئەو جیابونەوەیە، ئەوجۆرە ڕەخنەكردنانە بەو سانایییە نەبو، چونكە ئەو كارە خەنجەرێك بو لە كەسایەتی "سیاسی" و هەڕەشەی لە جەوهەری خەیاڵی حیزب دەكردو ڕێكخستنیشی ڕوبەڕوی مەترسی دەكردەوە.

گەر كەسێك بییەوێت ڕێبەرێكی لەوجۆرە بێت، پێویستە ڕۆڵی خۆی زۆر بەباشی وازیبكات. دەسەڵات فۆرمی سیحرێكی سەرنجڕاكێشی شەخسی "بێگەرد" نیە كە لە سیفەتی كەسێتی وەك قارەمانیەكی نائاسایی یا هێزێكی خوداوەندی ڕەگوریشەی داكوتابێت، بەڵكو دوبارەیە، قۆناغ بە قۆناغەو بەوردی ڕێكخراوە. شەیدا بوون بە تاك بەشێوەیەكی دانەبڕاو پەیوەندی بەرێكخستنی حێزبێكی بیرۆكراسییەوە هەیە. ئەو وێنایەی خەڵك لەسەر ڕێبەر هەیەتی، دەبێ بەلانیكەمەوە وەك پۆلیسی نهێنی گشتگیر

بێــتو لەهەمو شــوێنێکدا هەبێــت، بەڵام بەپێچەوانەی بوونی شــاراوەی ســیخورو هەواڵدەرەکانەوە، دەبێ ئامادەیی ڕێبەر دیارو بەشکۆو خۆڕاگر بێت.

ســەدام حسێن لە تشــرینی دووەمی ١٩٨٣دا کتوپڕ لە دەزگاکانی ڕاگەیاندا بزر بو. ســەرچاوەکانی نــاو خودی حکومەتی عێراق جەختیان لەســەر ئــەوە دەکردەوە کە بەرزان تکریتی زڕ برای ســەدام حسێن، سەرۆکی هەواڵگری عێراق هەوڵی کودەتای داوە. دوای ماوەیەك دیپلۆماتە عەرەبەکان ئەو بانگەشــانەیان بەدرۆ خســتەوەو وتیان دوو کەســی بنەماڵــە لەســەر هێنانــی کچەکەی ســەدام دەمەقاڵەیان بــوە. لەهەمان کاتیشدا سەدام دەرکەوتەوەو لەدیمانەیەکی تەلەفزیۆنیدا بەنزیکەیی هەمان دیدو ڕاڤەی پشتراستکردەوە، کاتێك وتی براکانی پیلانگێڕو خائین نین[5]، کەواتە چی ڕوویدا؟.

لەراســتیدا جگە لە ســەدام حسێن کەسی دی نازانێت ساڵی ١٩٨٣ چی ڕوویدا، لەوەش گرنگتر تەنانەت هیچ گیلەپیاوێکیش نەیدەتوانی شــتێك دەربارەی ئەو ڕوداوە بدۆزێتەوە یا شتێك هەڵگۆزێت. ئەم مەسەلەیە لەجیاتی ئەوەی پێگەی سەدام حسێن لەقبکات، دەســەڵاتی ڕەهای لەســەر سیاســەتی عێراق تۆکمەتر کــرد. هەر هەمان دیاردەی بزربوونی سەدام لە دەزگاکانی ڕاگەیاندندا نیشانەیەك بو بۆ جەماوەرو پێیانی دەوت شــتێك لــە ئارادایەو یا دەبوایە بیریــان لەوە بکردایەتەوە کە شــتێك ڕوویداوە یا ڕوودەدا. ئەوانەش هەموی بەڵگەن لەســەر ئەوەی گەر ســەدام حســێن بیویستایە حەکایەتی دروســتیدەکرد یا دەیهۆنییەوە. ڕەنگە خوێنەر لەیادی بێت کە لە ڕابردودا پیلانگێڕی پێویســتی بەزۆرێك لە بەڵگەهێنانــەوە هەبو تا کاریگەری زیاتری هەبێت، بەڵام عێراقییەکانی ســاڵی ١٩٨٣ زۆر ســاوێلکەتر بوونو بە بەراورد لەگەڵ ســاڵانی ١٩٦٩ ـ ١٩٧٠دا زیاتر ئامادەگی فریوخواردنیان هەبو ـ واتە زۆر گرنگیان بە سیاسەت نەدەدا. کارێکی نادروست دەکەین گەر ئەو ڕووداوە بە گوشاری ئەفسەرە پایەبڵندەکان بزانین[6]، تەنانەت ئەو لێکۆڵەرانەش کە خاوەنی سەرنجو تێبینی وردن ناتوانن شڵکی حکومەتی عێراق هەڵسەنگێنن.

دەرکەوتنی ڕۆژانەی ســەدام لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن بەدرێژایی چەندین کاتژمێرو



بەجلوبەرگــی جیاوازەوە، دەشــێت ئەو کارەی بە شــاکاری دوڕوویی لەقەڵەم بدرێ. ئەگــەر بمانەوێــت بەپێوەرێکی غەیرەعێراقی ئەم مەســەلەیە ڕاڤە بکەیــن، ناتوانین لە کاریگەری مەرگهێنەری ئەم کارەی سەدام تێبگەین. ئەم پروپاگەندە سیاسییە ئەوەندە بە "خراپی" بەکاردەهێنرا، تەنانەت هێندێك لە عێراقییەکانیش خۆشییان پێی نەدەهاتو ڕەتیاندەکردەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا منداڵەکانیان دەهێنا تا گۆرانی بەسەر ڕێبەردا بچڕن. وێنای دیمەنە ناکۆتاو بەردەوامە تەلەفزیۆنیەکان بکەن کە سەدامی نمایشدەکرد، ڕۆژێك بەجلوبەرگی تەقلیدی عەرەبیو ڕۆژێکی دی بەجلوبەرگی کوردییەوە، وێنەی ســەدام بەماندووبونێکــی زۆرەوە کە خۆی دادەنوێنێت تــا بچێتە ناو خەندەکێکەوە، جارێك بەیۆنیفۆرمی ســەربازی قیت ڕادەوەستێت، جارێکی دی لە فرۆکەخانە بەدوا داهێنانی جلوبەرگی "پیری کاردن" میوانە بیانییەکانی لە ئامێز دەگرێ، وێنەی سەدام بەچەکەوە، قورئان خوێندنەوە، چاوپێکەوتنی لەگەڵ کەســایەتییە ناودارەکانی شیعە، کردنەوەی بیناکان یا شــوێنە خزمەتگوزارییە تازەکان، وانەوتنەوە لەســەر بیناســازیو ژینگە، تەماشاکردن بەبێزاریو توڕەییەوە، لێوبەخەندەیی، سەرزەنشتکردنی بەرپرسان، کێشــانی ســیگاری کوبی، یاریکــردنو لاواندنــەوەی منداڵان، نانخــواردن لەگەڵ هاوڵاتیاندا وەك کەسێکی خێزانەکەیان، پیاچونەوەی ئامێرەکانی جەنگ، دابەشکردنی سەرجەلەی بنەماڵەکەی سەدام بەسەر جەماوەردا کە تێیدا سەرجەلەی خۆی بۆ ئیمام عەلی، چوارەم خەلیفەی موسڵمانان دەگێڕایەوە[7]. عەلی لەخزمە نزیکەکانی پێغەمبەر بو، بەڵام ســەدام بەناقەســت نەیدەویســت ســەرجەلەکەی بۆ پێغەمبەر بگێڕێتەوە تا جەخت لەسەر سەرجەم پرۆسە سیاسییەکە بکاتەوەو شتێکیش بۆ وێناکردن بهێڵێتەوە. ئەم ئاماژەیە لەرووی لاوازییەوە نەبو یا ئەوەی خۆی لە شیعە نزیك بکاتەوە، بەتایبەتی لەو کاتەی چالاکی هەرێمایەتییان هەبو، بەڵکو مەبەســتی ریســواکردنی خەڵکی بو، چونکە ســەدام دەیزانی زۆرێك لە دانیشتوان ئەو سەرجەلەیە قبوڵ دەکەن. لەلایەکی دی لەسەرتاسەری وڵاتیشدا کەسێك نەبو ئەو بانگەشانەی سەدام بەدرۆ بخاتەوە.

پروپاگەنــدەی سیاســی بەعــسو ڕێکخســتنەکەی لەماوەیەکــی دورودرێژدا بەچ

ئەندازەیەك جەماوەر فریودەدا، بەهەمان ئەندازەش بەدگومانی دەكات. سیاسەت لە وڵاتێكی وەك عێراقدا زۆر بەتوندی بەفڕوفێڵو درۆو دەلەسەوە بەستراوەتەوە. ئەو یەكێتییەی نێوان بەدگومانیو فریوخواردن لە هەمو ئاستەكانی نێو كۆمەڵدا دەبینرێ. هانا ئارێنت لە هەمو كەس باشتر گوزارشتی لەم حاڵەتە كردوە:

" لە جیهانی گۆڕاوو دەرەتێگەیشتندا، جەماوەر دەگاتە خاڵێك كە لە یەككاتدا باوەڕ بە هەمو شتێك بكاتو باوەڕ بەهیچ شتێكیش نەكات، پێیانوایە هەمو شتێك لە توانادایەو هیچ شتێكیش لەتوانادا نیە. ئەوانەی لەبواری پروپاگەندەی جەماوەریدا كار دەكەن، ئەوەیان ئاشكرا كردوە كە گوێگرەكانیان ئامادەییان تیایە باوەڕ بەخراپترین شت بكەن، ئەوەشیان بەلاوە گرنگ نیە تا چەند ئەو پروپاگەندەیە لەگەڵ عەقڵدا دێتەوەو نارەزاییش لەسەر هەڵخەڵەتاندنو فریودانیان دەرنابڕن، چونكە پێشتر ئەوەیان قبوڵ كردوە كە هەمو شتێك درۆیە. رێبەرە جەماوەرییە ستەمگەرەكان، پروپاگەندە سیاسییەكانیان لەسەر گریمانەیەكی دەرونی دروست بونیات دەنێن، بەوەی لە سایەی هەلومەرجێكی لەوجۆرەدا دەتوانرێ قەناعەت بەخەڵكی بهێنرێ ئەو شتەی ئەمرۆ راستو دروستەو دەبێ بەوپەری دڵنیاییەوە قبوڵبكرێ، بەڵام ئەگەر بۆ سبەینێ بە بەڵگەوە نادروستی ئەو شتە بسەڵمێنرێ كە خەڵكیی دوچاری بەدگومانی كردوە، ئەوا لەجیاتی ئەوەی سەرزەنشتی ئەو رێبەرو سەركردانە بكەن كە درۆیان لەگەڵدا كردون، كەچی هەر سوردەبن لەسەر ئەوەی هەر لەسەرەتاوە نادروستیو ناراستی ئەو شتانەیان زانیوەو ئیعجابی خۆشیان بە زیرەكی تاكتیكی رێبەرەكەیان دەردەبڕن"[8].

رێبەران نەك بەتەنها بێهەڵەنو ئەم بێهەڵەیەشیان چەندین كەڕەت لەرێگەی دوبارەكردنەوەی درۆكانەوە جەختی لەسەر دەكرێتەوە، بەڵكو توانای لە رادەبەدەری رێبەر بەشێوەیەكی درامی نمایشدەكرێ، هەروەكو ئەوەی لەسەر تەختەی شانۆ بێت. جیاكاریو چانسەكانیش بەشێوەیەك فەراهەمدەكرێ لەگەڵ سیستمو گەڵاڵەنامەكانی حكومەتدا ناكۆك بوەستێتەوە. رێبەر لە كاتی دیاریكراودا بەشێوەیەكی راستەوخۆ گوێ لە دەردە دڵی هاوڵاتیان دەگرێو لەگەڵیدا مێرد یا كوری یەكێكیان ئازاد



دەكات كە پێشتر پۆلیس دەستگیری كردوەو دادگاش بەزیندانی هەتاهەتایی حوكمی بەسەردا بڕیوەتەوە. هەر خۆی ئامێری تەلەفزیۆن دەبەخشێتەوەو هەر خۆیشی لەكاتی تێپەربوونی بە گوندێكی باشوردا سكاڵاكان وەردەگرێت. لەگەڵ هاوڵاتیە هەژارە بێوەیەكاندا ناندەخواتو گوێ لە سكاڵاكانیان دەگرێت. لەم هەنگاوە ئازادانەیەیدا تەنانەت رێسا تایبەتییەكانی دەوڵەتەكەی خۆیشی پێشێلدەكات، تا بەمەبەستو بەدەستی ناقەست نائازادی لایەنی بەرامبەر بسەلمێنێت، ئامانجی رێبەر نیشاندانی لاوازییو دواكەوتویی خەڵكی نیە، بەڵكو دەرخستنی ملكەچییە لە ئاست ئازادی لەرادەبەدەری خۆیدا.

ئاوێتەبوونی نێوان رێكخستنێكی گشتگیرو سیستمی ئایدیۆلۆجیایەكی داخراوی لەزگەیی كە هۆی هەمو شتەكان بەشێوەیەكی سیحراوی، ئاوییەو پەیوەندی بەجیهانی بابەتییەوە زۆر نامۆیە، نەك تەنها دەبێتەمایەی رژێمێكی جێگیر (كاتێك رێبەر لەژیاندا بێت)، بەڵكو جۆرە هاوڵاتییەك دەخولقێنێت كە تا ئەوپەری رادە هەست بەتێشكانی خۆی دەكات. هاوڵاتیان لەبەر ئەوەی بەردەوام هەستدەكەن لە قەراخ دۆزەخدا جۆلانێ دەكەن، بۆیە هەمیشە پێویستیان بەجۆرێك سەلامەتیو دەست گیرۆدەیی هەیە، لەبەر ئەوە قارەمانپەرستی كە خۆی لە رێبەری مەزن دەبینێتەوە وەك جۆرێك لەو خۆپاراستنە بەرجەستە دەبێت. ئەو قارەمانانەی لە واقیعدا بوونیان نیە، دەبێ لە خەیاڵدا بخولقێنرێن، چونكە لە ئێستادا نەك هەر دەكرێ، بەڵكو زەروریشە، لەبەر ئەوەی ئازادی تاك بەتەواوەتی لەنێو سەروەری نەتەوەییدا تواوەتەوەو بەهۆی ئازادی رەهای رێبەرەوە بوە بە حەقیقەتێك یا واقعێك، لەبەر ئەوەی سەروەری یەك بەشەو قابیلی پارچەپارچەبوونو دابەشكردن نیە. لەبەر ئەوەی ئازادی تاكەكەس پێویستەو دەبێ لەگەڵ ئەو سیفەتانەی نەتەوە تەبەنی دەكات، یەكبگرێتەوە. بیرۆكەی ئازادی وەك مەرجی سیاسی تەنها لەو كاتەدا بوونی هەیە كە مرۆڤەكان جیاوازنو داوا لە خەڵكیش ناكرێ لە فیكری ئازاددا یەكسان بن، ئەم فیكرەیەش لە عێراقدا بزر بو. كاتێك ئازادییەكی لەوجۆرە لەسەردەمی نوێی عێراقدا بەدیاركەوت، سەرەتا

لەژێر کاریگەری باڵادەستی ئایدیۆلۆجیای یەکێتی عەرەبیو پاشان لە ژێر کاریگەری ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی دوەم حوکمڕانی بەعسدا بەتەواوەتی کوژایەوەو لەنێوچو. نەك تەنها بزری ئازادی، بەڵکو بزری بیرۆکەی سەرەکی ئەمجۆرە ئازادییەش وای لە سەدام حسێن کرد ئەو رۆڵە کارایە وازییکات.

جودایی نێوان ڕێکخستنو بەرهەمهێنانی فیکری سیاسی "ئایدیۆلۆجیا" لەگەڵ دەرکەوتنی ڕێبەردا ڕووندەبێتەوە، ئەو دەرکەوتنەش هاوڕایە لەگەڵ دابەزینی کەسایەتی زۆرێك لە میللەت. ئەمرۆ لە عێراقدا جیاکاری سەرەکی لەنێوان جەماوەرو فەرمانڕەوایاندا هەم لە واقیعو هەم لەناساندندا بەتەواوەتی لەنێوچوە. ترسی بەربڵاوو نائارامی، داتەپینی بڕوا بەخۆبوونی لێکەوتەوە. تا ئەو جێگەیەی کۆمەڵگە بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە بەپێی ڕێنماییەکانی بەعس ڕێکدەخرێ (تەنها تا هەمان ئاست، نەك زیاتر)، سنورە سەرەکییەکانی نێوان فەرمانڕەواو فەرمانبەر لەنێودەچێتو میللەتی عێراقیش لەبەرامبەر دەسەڵاتی بێبەربەستی دەوڵەتدا، دڵنیاترین پشتو پەنای لەدەستدا. پێداویستی جەماوەر بەسەرکردە کاتێك هێزو تاوی سەند کە ئەم پێداویستییە لەگەڵ ئارەزوی شتێك کە پێشتر ڕازیبوون لێیان وەربگیرێت، هاوزەمانی پەیداکرد.

دەرئەنجامی هەمو ئەوانەش دەکرێ لە ڕووکاری مادییاتی زۆرێك لە عێراقییەکاندا بەدیبکرێ، وەك شێوەی بیرکردنەوەو ڕەفتاریان، جلوبەرگو هێشتنەوەی سمێڵیانو تەنانەت لەهێندێك خەسڵەت یا سیفاتی کەسێتی بەدەستهاتوشیاندا. تا خەرمانەی تایبەتی ڕێبەر گەورەترو بەربڵاوتر بێت، ترسو تۆقاندن گەورەتر دەبێو لەروانگەی سەرەکی حیزبیشەوە تەماشای ئەو خەرمانەیە دەکرێ، نەك وەکئەوەی بەگوێرەی بەرنامەی سیاسی حیزب خۆی بەرجەستە بکات، بەڵام چی ڕوانینێك لە خەونی تاکەکەسێکدا بەرجەستە دەبێ. ئێستا سەدام حسێن دەتوانێت هەمو شتێك بڵێت بێئەوەی کەس بتوانێت سەرزەنشتی بکات، دەتوانی ڕاسپاردەی فەزیلەتەکانی "عەلی" بکات، وەك شیعە نوێژ بکاتو لەهەمان کاتدا بڕوای بەنیشتمانپەروەری عێراقی تازەش هەبێت. خەڵکی عێراق لەم مەسەلەیەدا فریویان نەخواردو لەو باوەڕەشدا بوون



کە لەڕووی سیاسییەوە بونەوەرێکی بێبەهان. ئێستا ئەگەر دەکرێ بەسەر دواکەوتوییو پەرتەوازەیی وڵاتو کۆمەڵگەدا زاڵبین، دەبێ بوترێ کە دیاردەیەکی وەك سەدام حسێنیش "زەرورەتێکی ئاسنینە".

لەگەڵ هاتنو ڕۆیشتنی دەستورە بنەرەتییەکان، یاسا، فەرمانگە حکومییەکانو کارنامەی ڕۆتینی ڕۆژانە، ڕێژنەی ئەو فەرمانانەی بەردەوام لەلایەن فەرمانڕەوایانەوە بەرەو خوارەوە دەبارین، بەو هەمو ناوەرۆکە پێشبیننەکراوو دەرەتوانایانەی لەسەر کاروباری ڕۆژانەو شەخسییەکاندا هەیانبو، واقعییەتی بونیادی سیاسی هەمیشە لەدەست پێراگەیشتنی میللەت دوورتر دەکەوتەوە، تەنانەت لە لێکۆڵینەوەو ڕوبەڕوبونەوەی فەرمانگە حکومییەکان یا هاوپیشەکاندا، شتەکان وەکئەوەی هەیە، دەرناکەون، هێندێك کەڕەت کارمەندێکی ئاسایی لە سەرکارەکەی دەسەڵاتی زیاتری هەیە. هیچ ڕێنماییەکی تازە پێویستی بەوە نیە سۆنگەیەکی لە هزری میللەتدا هەبێت، تەنها لەبەر ئەوە قبوڵ دەکرێ کە فەرمانێکەو لە ویستی ڕێبەرەوە سەرچاوە دەگرێ: ئەوەش ڕاستییەکی جێگیرو تۆکمەیەو دەتوانێ خێرایی لابردنی هەمو پاشماوەیەکی خەیاڵ ڕێکبخات. لە هەمو ئەوانەشەوە یەکانەیی ناسنامەی میللەتو ڕێبەر بەرجەستە دەبێ، بەڵام ئەم یەکانەیی ناسنامەیە تەنها بەڕێکخستنێکی گشتگیر بەدەست دەهێنرێ، نەك لەڕێگەی شەعبییەت یا دیکتاتۆرییەتی سەربازییەوە، ئیدی ئاستی دڵڕەقی ئەو دیکتاتۆرەش گرنگ نیە.

تەنانەت میللیترین ڕێبەرانی جیهانی سێیەم وەك ڕێبەر نەیانتوانی پێگەو توانای سەدام بەدەست بهێنن، ناسر بەگوێرەی قەوارەی شکستی ساڵی ١٩٦٧ گەورەیی ڕێبەریی خۆی لە دەستدا، بەڵام میللەتی میسر بەدڵسۆزیو بەسەلامەتی خۆی مایەوەو ئەوەشی بە ئەو و سەرکەوتوانی ئەو جەنگەی نیشانداو لەگەڵ گەڕانەوەی تارمایی قارەمانەکەی سویس بۆ پێگەی جارانی، ئیدی جارێکی دی وەفاداری بۆ ناسر گەڕایەوە. ئەوەندەی پێنەچو کە هەمان ئەو میللەتەی بڕوای بەخۆی هەبو، کارێکی کرد ـ پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئیسرائیل ـ کە بەڕووکەش لەتوانادا نەبو، تەنانەت پێشوازی کردنی سەدان

هەزار کەس لە ئەنوەر سادات لەدوای گەڕانەوەی لە ئیسرائیل، نیشانی جۆش‌و خرۆش بو بۆ پەیمانی ئاشتی. زۆر بەسانایی هەرگیز وێنای ئەوە ناکرێ کە شکستی عێراق لە جەنگی عێراق ـ ئێراندا هەمان ئەو دەرئەنجامەی هەبێت کە ساڵی ١٩٦٧ لە میسردا هەیبو.

دیاردەی سەدام حسێن بەپێچەوانەی عەبدولناسر، لە دەستکەوتە شەخسییەکانییەوە هەڵنەقوڵابو، بەڵکو بۆ پەیوەندی بەحیزبەوە دەگەڕێتەوە. سەدام حسێن وەك ڕێبەرێك دەرکەوت، ئەگەر چی دیارترین سیفاتی ناسری تیانەبو: کێش‌و سیحری کەسێتی، توانای قسەکردنی بۆ جەماوەر، هەستی دیپلۆماسی، کاتنانەوەی سیاسی، لەوانەش گرنگتر مەسەلەی خۆماڵیکردنی کەناڵی سویس[9]. لەگەڵ ئەوەشدا سەدام حسێن ڕێبەرێکە تایبەتمەندێتی خۆی هەیە.

خۆماڵی کردنی کەناڵی سویس لەجیهانی عەرەبیدا کێشی ئەوەندە گەورە بو کە خودی سەدام حسێنی خوێندکاری بۆ لقی عێراقی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی کێشکرد. سەدام (کەسی پێکداداان یا ئەو کەسەی پێکدەدا) دوای ماوەیەکی کورت لە پەیوەندی کردنی بەحیزبەوە بەتیرۆرکردنی یەکێك لە لایەنگرە دەرکەوتوەکانی عەبدولکەریم قاسم لە تکریت، شوێن پەنجەی خۆی لەسەر روداوەکان بەجێهێشت. دوا بەدوای ئەوەش ساڵی ١٩٥٩ حیزب وەك ئەندامێك لە گروپی تیرۆرکردنی قاسمدا دەست نیشانیکرد. ئەفسانەی سەدام حسێن لەو روداوەوە بەدیارکەوت.

گەشتی ژیانی کە تەلەفزیۆنی عێراقی تا ئاستی قێزکردنەوەو هێڵنجدان نمایشی دەکرد، باسی لەوە دەکرد، سەدام هەر لەتەمەنی دە ساڵییەوە ئالودەی چەك بوە، لەکردەوەکەی ساڵی ١٩٥٩ەوە بوێری‌و دڵسۆزی بۆ حیزب پێشان داوەو لەکاتی تەقەلێکردندا بەزەبری چەك ئۆتۆمۆبیلی وەرگرتوەو ژیانی هاورێکانی رزگارکردوەو فیشەکێکیش بەر رانی کەوتوە کە دواتر بەرێنمایی خۆی لە رانیان دەرهێناوە، زەبتوڕەبتی ئاسنینی وایلێکردوە لولەی چەکەکەی ئاراستەی هاورێ بێورەو لاوازەکانی خۆی بکات، کاتێك ویستویانە یەکێك لە بریندارەکانی تیمی تیرۆر لە نەخۆشخانە



بەجێبهێڵن، هەر ژیری‌و زیرەکی خۆیشی بۆتە مایەی ئەوەی چەند خولەکێك پێش هەڵمەتی پۆلیس گیانی خۆی‌و هاورێ بریندارەکەی رزگار بکات، سەرئەنجام گەشتی پڕ زەحمەتی بە بریندارییەوە لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ، لەم شار بۆ ئەو شارو پەیکردنی بیاباندا دەستی پێکردو لە سوریا گیرسایەوەو بوە پەناهەندە[10].

سەدام حسێن نمونەیەکی سەربازی پیشەیی لە دەرەوەی حیزب نەبو، تەنانەت لە کاتی خوێندنیشدا هەر خەریکی چالاکی سیاسی بو. لەبەر ئەوەی مەشقی سەربازی نەبینیوەو لێهاتویی سەربازی نەبو، بۆیە لە زۆربەی هاورێ سەربازەکانی نەوەی خۆی دواکەوتوتربو، ئەمە ئەگەر چی وشەو وتەکانی لێوان لێو بو لە گوزارەی سەربازی. توندوتیژی چەپەکراو لە کەسایەتیدا بەردەوام بەسەریدا زاڵ بوەو لەرێگەی هەستی سیاسییەوە ئاراستەی شتەکانی دەکرد، نەریتەکانی بەعس ئەو کە تێیدا نوقوم ببو، لەسەر کێشە تازەکانی یەکێتی‌و پاکتاوکردنی پێشبڕکێکارو ڕێکخستنی سیستمی کۆمەڵایەتی عێراقی نوێ پیادە دەکرا. سەدام حسێن بەپێچەوانەی عیدی ئەمین‌و پاپا دۆك (دیکتاتۆرە قێزەون‌و سەرنگوم کراوەکانی ئۆگەندەو هایتی) لەو بەهرە حیساب بۆ کراوەو دیسپلینەی کە پێویستی بە هەوڵێکی زۆر نەدەکرد، سودی وەردەگرت بۆ ئەوەی بەئامانجە باڵاکانی بگات. زمانی رەنگدانەوەی کەسایەتی بو ـ کەسایەتییەك لەگەڵ ئاستی زانستی پیشەیی هاوتا نەبو، لەم کەسایەتییەدا توندوتیژی‌و دیدوبۆچونی لە ڕێگەی ڕێکخستنی حیزبەوە ئاوێتەیەکی ناهاوتاو ارای خوڵقاندبو.

ئەوجۆرە خەڵکانە لەجیاتی ئەوەی خۆشەویست بن، ترسناك دەبن، لەسەرووی ئەوەشەوە لەکن زۆرێك دەبنە مایەی ڕێزو ستایش لەبەر ئەوەی توانای ئازاردان‌و زیان پێگەیاندنی خەڵکی دیيان هەیە. ئەو شێتییەی دەبێتە مایەی ئەوەی توندوتیژی سارد تا ئەو ئەندازەیەی لە بارودۆخی خەڵکدا برەوی هەبێت، مەسەلەیەکە تەنها لەدیدی چاودێرانی سیاسییەوە بوونی هەیە، لەناووەشدا، ڕێزگرتن (بەدەر لەوەی کە بەچ شێوەیەك بەدەست هاتوە) ڕێگە بۆ ترسێکی ئاوێتە بەرێزگرتن خۆشدەکات. ئەوجۆرە ترس‌و تۆقاندن‌و ڕێزەی کە لە ڕێگەی ڕێکخراوێکی حیزبی گشتگیرو باڵادەستی

تـرس لە ژیانـی ڕۆژانەدا بەهێـزو زیاد دەکات، لەنێـو خەڵکیدا هەسـتی بێباوەڕیو بێبەهایی بەهێز دەکات. قەوارەی بۆشایی نێوان ترسو ڕێزگرتنو هەستی بێباوەڕبوون، لەدیدی پەیرەوانییەوە پێوەرێکە بۆ بێهەڵەیی‌و پاکی ڕێبەر، ئەو هەسـتەش کاتێك لەنێو پەیرەوانیدا چرۆ دەکات کە سـەرەتا ناسـنامەی خۆیان لەدەسـت بدەنو هەست بە بێیارو هاودەمی خۆیان بکەن، لەواقیعدا هەمو ئەو بەها ئەخلاقییانە لەدەست بدەن کە لە بەها ئەخلاقییەکانی بەعسـەوە سەرچاوەیان نەگرتبێتو لەو جۆرە حاڵەتەشدا دەبێ داوەری خەڵکی لەسەر ڕاستی‌و ناراستی کاروبارە واقیعی یا خەیاڵییەکانیان بەتەواوەتی لەنێوچوبێت.

باڵاکردنی دەسـەڵاتی سەدام حسـێن نیشانەی سەرکەوتنی جۆرە لۆجیکێك بو لە حیزبی بەعسدا، لۆجیکێك کە تا ئەو کاتە بەخاتری پەیوەندی خۆشەویستی ـ نەفرەتی حیزبی بەعس لە سـوپاو سـەربازانی سـەرکوتکرابو. لـەڕووی ئایدیۆلۆجیاوە بەعس دوژمنایەتییەکی سەرسـەختی لەگەڵ سوپادا هەیە، بەڵام دامەزرێنەرانی حیزبی بەعس بەمەبەستی گەیشتن بەدەسەڵات وەك بوکەڵەیەك سودیان لە سوپا وەردەگرت. لەبەر ڕۆشنایی حیزب کە ئاوێتەیەك لە نەتەوەگەراکانی عەرەب لە دەستەبژێرو سەربازە پایە بڵندەکان نوێنەرایەتیان دەکرد، زۆرجار ئەو ئاوێتەبوونە (باڵی سـوری حیزبی بەعس) هەڕەشـەی لە سـەرتاپای بوونی حیزب، لەشـکڵو ناوەرۆکی دەکرد. میراتی سەدام حسـێن بریتـی بو لەوەی کە توانی ئەو ناوەرۆکە بێگـەردەی حیزبی بەعس لەعێراقدا وەك خۆی بهێڵێتەوە، سوپای واڵیکرد هەمیشە خۆی لە هەڵوێستی بەرگریدا ببینێتەوە، پێگەی هێزو توانایان لێبسـەنێتەوە، تا سـەرئەنجام توانی سوپا بکاتە بونەوەرێکی سەر بەحیـزب کە خۆی گەشـەو پـەروەردەی بکات، ئەو کارەی بەدرێژایـی ژیانی تاکە کەڵکەڵەی بو.

ئەم باڵاکردنەی سـەدام حسـێن لەسەر حیسابی سـەرکردەکانی دی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش تەواو بو. هەڵمەتی پاکتاوکردنی ساڵی ١٩٧٩ لە گەردەلولێکی سـوتێنەر دەچو کە دەسـەڵاتی حیزبی بەعس بسـوتێنێت. ئـەو پاکتاوکردنە ئەرکی



تیوریسـتی، سیاسـەتدانانو جەمسـەرگەری لە شەخسـی خۆی کۆکردەوەو ئەرکی ڕێکخسـتنی حیزبیشی وەك خۆی هێشـتەوە. ئەم کارەش بوە مایەی ڕوونکردنەوەی ئەو لێڵییەی پەیوەسـت بو بەپێگەی ڕەسـمی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش، وەك بەرزترین دەسەڵاتی بڕیاردان لە عێراقدا، هەر چەندە سەدام لە پێش ئەوەشدا بەماوەیەك کۆنترۆڵی هەمو سەرە داوەکانی کردبو. ئەم ئاڵۆزییەش بوە مایەی بەدناوکردنی حیزبی بەعسو ڕێکخسـتنەکەی لەنێـو کۆمەڵدا، هەروەکو چۆن دوو کـەس ناتوانێت وەك کەسـێك درۆبکاتو نهێنی بپارێزێت، بەهەمان شـێوەش کۆمەڵێك خەڵکیش ناتوانن وەك یەك کەس بەرجەستەی جەوهەری خەیاڵ یا وەهم یا ویستی گشتی بکەن. کاتێك دوا بەربەسـت ـ واتە ئەو ئاڵوزییەی هەبو ـ لابرا، ئیدی شـانۆ لەبەرامبەر ئارەزوەکانی ڕێبەردا چۆڵ بو تا خۆی ببێتە ئارەزوی سـەرکردایەتی حیزب، ڕێکخسـتنی حیزبو سەرلەبەری کۆمەڵگە. ئیدی ئێستا ئازادی هەموان بەتەواوەتی لەگەڵ ئازادی بێقەیدو مەرجو ڕەهای سـەدام حسـێن جووتو تەبابو. لەم حاڵە شلۆقو هەستیارە بەدواوە، توندوتیژی بەعسی کە لە سنوری عێراقدا پیادە دەکرا، لەشێوەی جەنگێکی هەمەلایەنە لەگـەڵ ئێرانـدا خۆی دەنوێنێت، ئەمە لە حاڵێکدا سـەدام دڵنیابو کە بچوکترین درز ناکەوێتە نێو ڕیزەکانی حیزبەوەو دڵسۆزی‌و وەفاداری جەماوەریش لەدەست نادات.

سـەدام حسـێن وەك دیاردەیەك لە حیزبی بەعسو ڕێکخستنەکەی لە کۆمەڵگەی عێراقی زیاتر دەڕوات. سەدام بەرجەستەکاری ئەو شتەیە کە خەڵکی عێراق بە بەشێك لە کەسایەتی تایبەتی عێراقیبوونی خۆیانی دەزانن. نابێت وابزانین لەم کارەدا ناکۆکییەك هەیە: سەدام وەك ڕێبەرێك بەتەواوەتی لایەنگری لەیەکێتی عەرەب دەکات، سیفات گەلێکـی هەیە کـە وێنەو پێگەی لـە کۆمەڵگەی عێراقیدا بەهێـزو پڕکێش دەکات. پێویسـتە پارێزگاری لە جیاکاری یا جیاوازی نێوان "کەسـایەتی" نیشتمانی عێراقی‌و پانعەرەبی عێراقی بکات.

نەتەوەگەرای عێراقی بەمانای هەستی کەسێتی لەگەڵ سەرزەمینێك بەناوی عێراقەوە، لەواقیعـدا بوونـی نیە. پێکهاتەی ئەو نەتەوەو گـروپو ئاینزایانەی وڵاتی لێپێکهاتوە،

هیچ کاتێك ئامادەبی ئەوەیان تیانیە لە چوارچێوەیەکی فراوانتری کۆمەڵگەدا دەست لە جیاوازیو ململانێکانی خۆیان هەڵگرن، بۆ نمونە هەروەکو لە میسردا روویدا. ئەم حاڵەتەش بوە هۆکاری سەقامگیری حوکمی بەعسو شەرعییەتێك کە بەعس لەسەر پایەی ئەو شەرعییەتە حوکمڕانی بکات.

لەلایەکی دی، "کەسایەتی" نیشتمانی عێراقی ئاوێتەیەکی ئاڵۆزەو چەندین سەدەیە لە ئیدراكو هەستێك پێکهاتوە کە کاریگەری لەسەر دەیان هەزار لە دیاردەی کولتوریو کۆمەڵگە بەجێهێشتوە. لێرەدا دەربارەی ئیدارکی عێراقییەکان لەسەر "شێوازی حکومەت لە عێراقدا"، جەخت لەسەر بەشێکی بچوکی ئەو دیاردەیە دەکەمەوە. عەرەبی سونەو شیعەی عێراقی بەجۆرێك تەماشای خۆیان دەکەن وەکئەوەی بەشێوەیەکی تایبەت حوکم دەکرێن. ئەوانە زۆرجار لە گفتوگۆکانی نێوان خۆیاندا بەجیاوازی نێوان خۆیانو بۆ نمونە میسری یا هیندییەکان ئاماژە دەکەن. عێراقییەکان ئەمە بە "بەشێك لە سروشتی " خۆیان دەزانن. ئەمجۆرە بیرورا پێشوەختانە رەگوریشەیەکی قوڵو پتەوی لە رەفتاری تاکەکاندا هەیە، بەڵام دەکرێ چاودێری ئەو بیروباوەرە تۆکمانە لەسەر سیستمی حوکم بکرێو بگێردرێتەوە بۆ ئەو روداوانەی کە بوە مایەی داوەشانو لێکترازاندنی عێراقی کۆنو عێراقی عەرەبی ئیسلامی: داگیرکردنی عێراق لەلایەن موسڵمانەکانەوە، بەشیعەبوونی خاکی عێراق، شەهیدکردنی حسێن لە ساڵی ٦٨٠دا، رزگارکردنی ولایەتی عێراق لە کۆنترۆڵی ئێرانیەکان، کۆنترۆڵکردنی لەلایەن ئەمەوییەکان کە بارەگایان لە دیمەشق بو، لە کۆتاییدا روخانی خەلافەتی ئەمەوی عەرەبیو هاتنە سەر حوکمی عەباسی بەئەسل عەرەبو تێکەڵ بە فارس کە بارەگایان بەغدا بو، لەو روداوانەبون کە پەیوەندی عێراقی ئیسلامی ـ عەرەبی لەگەڵ رابردوی کۆنیدا دابڕی. مەزهەبی شیعەو سونەی عێراق ریشەیان لە ئەفسانەگەلێکی بارگاوی بەسۆزو عاتیفەوە هەیە کە لە دەوری ئەو روداوانە تەوەرە دەبەستێت (بڕوانە بەشی شەشەم).

حەجاج بن یوسف ئەلسەقەفی، پێش چەندین سەدە یەکێك بو لە کەسایەتییە



سەرەکییەکانی ئەو گۆڕانکارییە. حەجاج ساڵی ٦٩٤ بوە والی عێراق، دوای ئەوەی وەك سەرۆکی پۆلیسی خەلیفە عەبدولمەلیك کە بارەگاکەی لە دیمەشق بو، سەقامگیریو خۆشگوزەرانی ئابوری بۆ ئەو سەردەمەی عێراق گێڕایەوە. مێژوونوسان پێیانوایە حەجاج کۆڵەکەکانی گەشەسەندنی کولتوری لە سەردەمی عەباسیدا داناوە. سەدان ساڵ پێشئەوەی داهاتی نەوت ژیانی ستەمگەرەکان خۆشو ئاسان بکات، حەجاج توانی شار بونیات بنێت، یەکەم پارەی کانزایی عەرەبی لێدا، شۆڕشێکی لە بواری بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیدا کرد، بڕیاری قورسی دەرکرد بۆ ئەوەی کۆچ بۆ شارەکان رابگرێت (هەروەکو سەدام کردی)، رێگەی نەدا تازە موسڵمان بوەکان بگەرێنەوە بۆ سەر خاکی خۆیانو ناچاری کردن خەراج بدەن، هەر بەفەرمانی ئەو قورئان بەم فۆڕمەی ئێستای چاپکرا، تا رێگە لە مشتومڕو دەمەقاڵەی لاهوتەکان بگرێتو رایشیگەیاند ئەو چاپکراوە دەقێکی رەسمی متمانە پێکراوە، بۆ جێبەجێ کردنی بڕیارەکەشی دڵڕەقانەترین شێوازی حوکمی گرتەبەر[11].

لێکچون یا بەراوردکردن لەنێوان حەجاجو سەدام حسێندا مەسەلەیەکە شایانی ئەوەیە سەرنجی لێبدرێ. یەکەمین درزی نێوان سونەو شیعە کاتێك دروست بو کە ولایەتی عێراق ـ پێشتر ولایەتێك یا بەشێك بو لە ئیمپراتۆرییەتی ساسانی ـ کەوتە ژێر دەسەڵاتی عەرەبە دیمەشقییەکانەوە. بەعسی عێراق توانیان رەگوریشە قوڵە سۆزدارییەکانی مێژووی عێراق بەجۆرێك پێکەوەبنێن کە داواکاری سونیەکان لەمەڕ میراتی ئیسلامیو سیاسی بەرجەستە بکاتو توانای عێراق لەسەردەمی خەلافەتی عەباسییەکان گەورەتر پێشان بدەن. هەروەکو پێشتر دڵڕەقیو بێبەزەیی حەجاج دیاریکردبو.

بەمشێوەیە ئەو گرنگییەی سەدام حسێن لە هەشتاکاندا لەسەر عێراقیبوون جەختی لەسەر دەکردەوە (لەپاش هەڵایسانی جەنگی عێراق ـ ئێران)، پێویستی بە بونیادێکی ئایدیۆلۆجیای مەزن هەبو لەسەر گەورەیی میراتی سەردەمی عەباسی، بە بەراورد لەگەڵ سەردەمەکانی دی ئیسلامدا. لەپاش سەرکەوتنی شۆڕشی بەعس لە

عێراقدا، جەخت لەسـەر گواسـتنەوە بەرەو نەتەوەی عەرەبی ئیشـتراکی دەکرایەوە. سـەدام حسێن ساڵی ١٩٧٩ لە ناوچەیەکی شیعەنشینی باشوردا لە گوتەیەکیدا وتی: "شـکۆمەندی عەرەب لە شکۆمەندی عێراقەوە سـەرچاوە دەگرێ. بەدرێژایی مێژوو هەر کاتێك عێراق بەهێزو گەشـەکردو بوبێت، نەتەوەی عەرەبیش بەهێزو بەتوانا بوە، لەبەر ئەوە هەوڵدەدەین عێراق بکەینە عێراقێکی بەهێزو بەتواناو پڕشـکۆو گەشەکردو، بۆیە لەپێناو خۆشگوزەرانیو ڕۆشنایی شکۆمەندی عێراقییەکاندا هیچ دەرفەتێك بەفیرۆ نادەین"[12]. ئێستاش دەکرێ پشکی شێر بدەین بە گرنگی ئایدیۆلۆجیا لەسەر میلەتی عراقو دەوڵەتە تاك حیزبەکەیان کە بەشـێوەیەکی نارەحەت لە سـنورێکی سـاختەی بەناو عێراقدا لە قاوغەکەی خۆیاندا ماونەتەوە.

سـەدام حسـێن بانگەوازی بۆ عێراقییەکان نەدەکرد بەناوی ناسـنامەی سـنورەوە لـە دەوری دەوڵەتەکەیانـدا خڕبنـەوە، ڕەنگـە بیری لـەوەش کردبێتـەوە کە خاڵی هاوبەشی نێوانیان بێت. سەدام حسێن بە وشیارییەوە پێش هەمو کەسێك دەیزانی کە ناسیونالیزمی عێراقی لەسەردەمی هاوچەرخدا دەستکەوتی ڕژێمی لەناوچوی پاشایەتی ١٩٤١ ـ ١٩٥٨ بو. لە هەمان کاتدا سـەدام حسـێن لەلای خۆیەوە پەی بەو واقیعە برد بو کە دانانی یەکێتی عەرەبی لە پێشـەنگی کارنامەی حیزبی بەعسـدا، کارێکی گەلێـك پراکتیکـی نیـە. زۆرێك لە بەعسـیەکان پێیان باش بو "شۆڕشـی عەرەبی" وەك روداوێکی بەردەوام لە کارنامەی خۆیاندا وەلاوەبنێنو ئومێدیشـیان بە شۆڕشـی بەردەوام نەمابو. لەجیاتی ئەوەش لە کۆتایی حەفتاکاندا "سۆسیالیزم لە تاکە وڵاتێکدا" بوە دروشـمی بەعسـیەکان. ئەوجۆرە چەمکانە پێش سـاڵی ١٩٧٩ لەلایەن سـەدام حسـینەوە بەکاردەهێنرا، (یا ڕۆشنکردنەوەی زەینی سـوپایەك لە پیاوانی پروپاگەندە، هونەرمەندان، مێژوونوسـان، مامۆسـتایانو زانایانی شوێنەوارناسی، ئەوانەی بەدوای ناسنامەی ڕاستەقینەی ئیسلامەوە بون لە نێوان ناوچەی دوو ئاواندا)، خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەك بو لەسەر جۆرێك لە ناسیونالیزمی ڕەسەنی عێراقیو درۆی بەهرە وەرگرتن لە ئەزمونی وڵاتانی دی، بۆ نمونە ناسیونالیزمی روسیای مەزن لە کاتی جەنگی جیهانی



دوەمدا کە بە نمونەیەکی کلاسـیکی ئەو ناسـیونالیزمە دەژمێردرێت، چونکە ستالین داهێنەری ئەو چەمکە نەبو، بەڵکو بۆ مەبەستی سیاسی خۆی بەهرەی لێوەردەگرت. ئیدی بەبێ لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە سـەدام لەکاتی جەنگی عێراق ـ ئێراندا پشتی بەناسیونالیزمی عێراقی بەستوە یا نا، ئەوا بەراستی ڕژێمەکەی لە دژایەتیکردنی ئێراندا جەختی لەسەر ویژدانی عەرەبی دەکردەوە.

لێکچونی سـەدام حسـێنو حەجاج کارێکە ڕەگوریشەیەکی قوڵی هەیە، هەروەها کارێکی واقعیشـە، بەپێچەوانەی ناسیونالیزمی عێراقییەوە، دەکرێ ئەو لێکچونە وەك هەڕەشـەیەك لەدژی بەعس ڕاڤەبکرێ. سـاڵی ١٩٧٥ عەبدولسـەتار ناسر ڕۆمانێکی گاڵتەئامێزی بەناونیشـانی "گەورەم خەلیفە" بڵاوکردەوە کە تێیدا جۆری حوکمڕانی بەعـس ڕووندەکاتەوە. "خـەمو خەفەت بەتەواوەتی قەدەغەیـە، هەروەکو خەلیفە لە پەراوێزی فایلی ژمارە (١٠٥ ب)دا بڕیاری لەسـەر داوە، ئەمەش پاشـکۆی بڕیارێکە کە حەجاج بن یوسف دەریکردوەو تێیدا هاتوە: " زۆر پێبکەنە تا بتوانین بەجیهانت بناسـێنین". عەبدولسـەتار بەو کارەی کە گاڵتەی بەحیزبی بەعس کردوە، تاوانێکی گـەورەی کردوە، بۆیە لەپاش بڵاوبونەوەی ڕۆمانەکەی بە ماوەیەکی کورت بەتاوانی سیخوری بۆ دەوڵەتێکی بیانی بێئەوەی ناوی دەوڵەتەکە بهێنرێ دەستگیرو ئەشکەنجە درا[13].

لە کۆتاییدا ناسیونالیزمی عێراقی بە وتەی عەبدولسەتار ناسر لەسەر دەستی حیزبی بەعـس بو بە ئامێرێکی دروسـتکراو تـا عێراقییەکان ناچار بکـەن "زۆر پێبکەنن" بۆ ئەوەی بەهەمو جیهانیان پێشـان بدەنو لەوێشـەوە گاڵتە بەو شارەزاو پسپۆرانە بکەن کـە پێیانوایە بەعسـیەکان لە بەردەوامـی ئەو جەنگەی ئومێدی سـەرکەوتنی تیانیە، بەچ جۆرێك لەسـەر کورسی دەسەڵات دەمێننەوە[14]. ئەو پەیوەندییە بەهێزەی سوپاو کۆمەڵگـەی والێکرد لەکاتی جەنگـدا وەك جاران پێکەوە هەڵبکەن، زیاتر بۆ جۆری ئەو حکومەتە دەگەڕێتەوە کە بەعسـی عێراقی دایمەزراندبو تا ئەوەی بۆ ناسیونالیزمی عێراقی بگەڕێتەوە.

ئەو فیکری فەرمانڕەواییەی سەدام حسێن دەیویست بە بچوککراوی لە خەیاڵدانی گشتیدا بەرجەستەی بکات، پێش چەندین سەدە حەجاج بەشێوەیەکی زیندوو رایگەیاندبو. دەڵێن کاتێك حەجاج لە عێراق حوکمی گرتۆتەدەست، کۆمەڵێك لە نەیارەکانی کوشتوەو سەری کوژراوەکانی لە شوێنێکی گشتیدا نمایش کردوە، هەر کە خەڵکی بەمەبەستی بینینی لە دەوری خربونەتەوە، ئەو بۆنەیەی قۆزتۆتەوە تا وتەیەك پێشکەش بەخەڵکی بکات. هەروەکو زانراوە گوتارەکەی ئەم چەند دێڕە جاویدانەی لە خۆگرتوە کە هەمو خوێندکارێکی عێراقی ئەو وتانە دەیزانێتو خەڵکیش پێیانوایە حەقیقەتی پیادەکردنی حوکمو دەسەڵاتی سیاسی لە عێراقدا حوکمێکی لەوجۆرە دەخوازێت، حەجاج دەڵێ:

" لەپێشمدا کۆمەڵێك سەر دەبینم کە کاتی قرتاندنیان هاتوە، من ئامادەم بیانقرتێنم، خوێن دەبینم لەنێوان جبەو ریشدا دێتەخوارێ. بەخودا قەسەم ئەی خەڵکی عێراق، ئەی ئەهلی ساختەو دووروویی، ئەی سیفەت ئەهریمەنەکان، هیچ کەس ناتوانێت وەك هەنجیر پانمبکاتەوە یا وەك وشتر بمترسێنێت... ئەمیرولمومنین، خودا تەمەن درێژی بکات، هەمو تیرەکانی هاویشتوەو لەنێو هەمویاندا منی بەدژوارترینو تەلخترین کەس دەستنیشان کردوەو منی کردۆتە فەرمانڕەوای ئێوە، ماوەیەکی زۆرە ئێوە خەریکی ئاژاوەگێریو فتنەبازین، رێگەی گوناهتان هەڵبژاردوەو لەنێو تاریکیدا دێنو دەرۆن، بەخودا پێستان دەگوروم، وەك دەستەچیلکە چەپکتان دەکەمو وەك وشتر قامچیکاریتان دەکەم... سوێند بێ بەخودا ئەوەی دەیڵێم، کاری پێدەکەم، ئەوەی دەمەوێت ئەنجامی دەدەم، با ئیدی کۆبونەوەو واتەواتو قسەی پڕوپوچ بەس بێت.. سوێند بێت بەخودا هەموتان دەهێنمەوە سەر رێی راست یا یەك بەیەك بەسزاتان دەگەیەنم"[15].



## دەسەڵاتی بەعس:

هەڵبەتە لێکچونەکان لە هەمان شوێندا کۆتاییان دێت. زۆرجار دەربارەی سەدامو حەجاج لێکچون بەدیناکەین، بۆ نمونە گوتارەکەی حەجاج لە کوفە جگە لە راگەیاندنی شەڕ لەگەڵ ئەو خەڵکەی حوکمڕانیانی دەکردن، شتێکی دی نەبو، بەڵام کەس وێنای ئەوە ناکات کە سەدام حسێن لە کۆتایی حەفتاکاندا هەمان گوتار بەکاربهێنێ. گرفتی سەدام لەوەدانیە کە لە زەمینەی کولتورێکی درەوشاوەی ئەم چەرخەدا گوتاری لەوجۆرە لەگۆڕێ نیە، هەروەها ناتوانرێ ئەوەش بوترێ کە سەدام حسێن شێوازی لێدوانەکەی حەجاجی بەدڵ نەبوە، بەڵکو گرفتەکە لە شوێنێکی دییە: گرفتەکە لە قوڵی تێگەیشتنی جیاوازی سەدامو حەجاجە دەربارەی دەسەڵات لە خوارەوە بۆ سەرەوە.

هەمو دەسەڵاتەکان رەوایەتیان نیە، دەسەڵاتی سیاسی برتییە لەو دەسەڵاتەی کە لە رێگەی پرۆسەی شەرعییەتەوە رادەسپێردرێت. دەسەڵاتی حەجاج دەسەڵاتێکی راستەقینە نەبو، چونکە دانیشتوانی کوفە بەیعەتیان پێنەدابو، هەروەها دەربارەی فەرمانڕەوا بیروڕایەکی دییان هەبو. خەلیفەی شام حەجاجی بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەکە رەوانە کرد. لەمجۆرە هەلومەرجەدا لێکچون لە جەنگدا تا رادەیەك باڵادەست دەبێت. حەجاج بۆ ئەوە رەوانەکرابو تا ئەو دەسەڵاتە تێکبشکێنێ کە لەلای کوفیەکان شەرعییەتی هەبو، بەڵام نەك تا ئەو ئاستەی کە دوا نەفەری رەعیەتی ژێر فەرمانڕەواکەی لەنێوبەرێت.

لەلایەکی دی، سەدام حسێن دەسەڵاتێکی راستەقینەی پیادە دەکرد. هاوکاریو هاوبەشی لەنێوان رێکخستنی کۆمەڵایەتی لە رێگەی بیروکراسی حیزبی بەعسو نێوان سەرکردایەتی سیاسیدا، لە ئێستادا جەخت لەسەر کەسایەتیەکی ساختە دەکاتەوەو لەو هەلومەرجەی دەوری پیادەکردنی دەسەڵاتی سیاسی دەدا، بانگەشەی شەرعییەت

دەکات. بەگوزارەیەکی دی، دەرکەوتنی رێبەر لە هەلومەرجی عێراقی بەعسدا، لەناو دەوڵەتدا پێویستی بە دەرکەوتنی چەمکێکی هاوبەشی دەسەڵاتی شەرعی هەبو. ئەمەش چەمکێکی نوێی دەسەڵاتێکی تایبەت بو لە عێراقی هاوچەرخدا کە بەشێوەیەکی بێوێنە لەگەڵ ئەزمونی بەعسدا پێکەوە گرێدرابون.

ئەگەر دەسەڵات بەوجۆرە شەرعییەتە گوزەر نەکات، ناتوانێت بەشێوەیەکی رەها دەسەڵات بخاتە ژێر دەسەڵاتی رێبەرەوە، بەڵکو بۆ نمونە دەکەوێتە ژێر رکێفی حیزب یا دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی چەند سەرکردەیەکەوە. ئەو رژێمانەی تاك حیزب حوکمڕانیان دەکات، ئەم شێوازە ململانێیو جوداییو شتێکی بچوکیش لەژیانی راستەقینەی سیاسی پێکدەهێنێت، کە هێندێك لە ئێمە ساختەکاری لەمجۆرە سیاسەتەدا دەبینێو گۆڕانکاری لەئەسڵی مەسەلەکەدا بەدیناکات. ئەگەر رێبەری بەتوانا هەمو دەسەڵاتە سیاسییەکان لەخودی خۆیدا کۆنەکاتەوەو بیەوێت ئەو کارە بکات، بەزەرورەت لەگەڵ روبەروی حیزبەکەی دەبێتەوەو لەدیدی میللەتەکەی بە"گوناهکار" دەردەکەوێت، ئەمەش دەرئەنجامی ئەوجۆرە کێشمەکێشەیە کە مۆرکێکی گشتی هەیە. ئەگەر رێبەر لەو هەڵوێستەیدا سەرکەوتو بێت، جارێکی دی دەبێتە حوکمڕانێکی دەرەهەڵەو رەهاو سەرجەم دەسەڵاتەکان لە دەستی خۆی کۆدەکاتەوە.

مێژووی دوەم حوکمڕانی رژێمی بەعس لەنێوان ساڵانی ١٩٦٨و ناوەراستی حەفتاکاندا ئەمجۆرە کێشمەکێشو ململانێیەی بەخۆیەوە بینیوە، بەڵام بەڵگەیەك لەبەردەستدا نیە کە بڵێین لەپاش ئەم مێژووەوە ئەم کێشمەکێشە رۆڵێکی گرنگی لە کۆمەڵگەی عێراقدا وازیکردوە. سەرباری چەندین ساڵی جەنگێکی وێرانکار، زنجیرەیەك هەڵەی گەورەو گران، مۆبیلیزەکردنی نزیکەی یەك ملیۆن کەس، نزیکەی ٢٠٠ ـ ٣٠٠ کەس کوژراو، دوو هێندەی ئەو ژمارەیەش بریندار، چجای ئەو کاولکارییەی بەر ئابوریو ژێرخانی سەرەکی وڵات کەوت، کەچی رێبەرایەتی سەدام حسێن وەك خۆی بەبێبەرنگاری مایەوە. هەڵبەتە ململانێی رێبەر لەگەڵ حیزب یا لەگەڵ دەوڵەتدا هێشتا بەدیدەکرێ، ئیدی چ لەشێوەی رەفتاری سایکۆلۆجی



سەرەتایی بێت یا ئەوەی بەزەحمەت ئاشکرا دەکرێ (ستەمکاری رەهاو دەرەهەڵە نمونەی ئایدیالێکی دوورە دەستە کە رێبەر سەبارەت بەلێکۆڵینەوەی ئێمە سەودای ئەوان لە مێشکی خۆیدا تاوتوێ دەکات، بەڵام لە واقیعدا ژیانی رۆژانە زۆر لەوە دژوارترەو لەمەودایەکی دووردا ئەوجۆرە سەودایە قابیلی بەرگەگرتن نیە). ئەمەش لێرەدا جێگەی نابێتەوە. لە سیاسەتدا ململانێ تەنها بەشێوەیەکی ئاشکرا بوونی هەیە، ئەگینا دەبێتە ئەگەری ململانێو کێشمەکێکی رووت، ئەوەش شتێکە ناتوانین سوربین لەسەر ئەوەی کە بوونی هەیە یا رەنگە هەرگیز نەیەتەدی.

لێرەدا گریمانەیەك یا مەرجێکی پێشوەخت بۆ ئەمجۆرە سەرکردایەتیکردنە هەیە، بەوەی لەرێگەی "میللەتەوە" دەسەڵاتەکان بەرێکخستنی حیزب بسپێرێت. هەمان لۆجیك کە لەسەر کێشانەوەی کاری سیاسی لە کۆمەڵگە روویدا، بەسەر رێکخستنی حیزبیشدا جێبەجێ دەبێ. ئەگەر ئەم دەستبەسەراگرتنو کێشانەوەیە بەسەر هێندێك گرۆپی بچوکی پەرگیردا جێبەجێ نەبێت (بۆ نمونە حیزبی دەعوەو لایەنگرانی کە تا ئێستا لە دژی رژێم چالاکی دەکەن، ئەگەر چی چالاکی گەلێکی زۆر بچوكو بێبەهاشە)، ئەوا رێکخستنی حیزب بەسیاسی دەمێنێتەوەو دەسەڵاتی رێبەریش بەتەواوەتی بەرەهاو دەرەهەڵە لەقەڵەم نادرێ.

دەتوانرێ بوترێ سەدام حسێن بەسێ قۆناغ ئەو دەسەڵاتەی بەدەست هێناوە: یەکەم، دەسەڵاتێکی گریمانەیی لەرێگەی قانونی ئیدارەوە جێبەجێ دەکرا. حیزب داهینەرو سەرچاوەی هەمو ئەو هەنگاوانە بو کە داوای لەوانی دی دەکرد جێبەجێی بکەن. قۆناغی دوەم، بەهاوکاریو هاوئاهەنگی لەگەڵ هەنگاوە داهێنەرو یاسای سەرچاوەکان، هێدی هێدی لەرێگەی گەشەسەندنی ژمارەو جۆری ئەو کەسانەی دەچونە ریزی حیزبەوە، هەروەها لەرێگەی رێکخراوەکانی رووکار کە حیزب دروستی کردبون، بەدەست هێنرا. هێزی زۆری ژمارەی خەڵکی رێزو خاتری بە حیزب دەبەخشی. سەرئەنجام لەگەڵ گەشەسەندنی راستەوانەدا دەسەڵاتی حیزب لە دەسەڵاتێکی گریمانەییەوە بەرەو دەسەڵاتێکی راستەقینە هەنگاوی دەنا. رێکخراوی

حیـزب خۆی بە جێنشـینی کۆمەڵگەی مەدەنی دەزانی، ئـەو کۆمەڵگەی لەحاڵەتی پوکانـەوەدا بو. قۆناغی سـێیەم، داهێنانو خوڵقاندنی ئەندێشـەی سیاسـی کەوتبوە مەترسییەوە. خوڵقێنەر مەترسی نوقمبوونی لە زەلکاوێکدا لێدەکرا کە چواردەورەکەی دروسـتیان کردبو. ئیدی لێرەوە پۆسـتی رێبەر وەك ئەڵتەرناتیڤی هەمو سیاسـەتەکان هاتەئاراوە. حیزب دوای ئەوەی هەمو دەسـەڵاتە سیاسییەکانی بۆ رێبەر بەجێهێشت، ئیدی جێگەی کۆمەڵە مەدەنییەکان گرتەوەو بوە بنکەی تواناو دەسەڵاتە تازەکان.

لەڕووی لۆجیکەوە قۆناغی دوەمی ئەم گواستنەوەو گۆڕانکارییە قۆناغێکی زۆر شلۆق بو. چ شتێك خەڵکی هاندەدا پەیوەندی بەحیزبەوە بکەن؟ زۆر هۆکاری ئاڵۆز هەبون خەڵکـی والێکرد پەیوەندی بەحیزبەوە بکەن، کە من لـەو باوەڕەدام ترس لە عێراقی بەعسـزەدەدا بە یەکێك لە هۆکارە کۆمەڵایەتیە مەزنەکانی ئەم پرۆسەیە دەژمێردرێت. لەلایەکی دی رازییوونی خۆبەخۆ بۆ پەیوەندیکردن بەحیزبی بەعسەوە لەسەر ئیمانێکی کارا بونیات نرابو. زۆرجار واتەماشای ئەوی دی دەکرێ وەکئەوەی ئەنگیزەیەك بێت ئەو تاکانەی دەسـەڵاتێکی شەرعی راسـتەقینە زیندوو دەکەنەوە، پێکەوە بەبەستێتەوە. هەڵبژاردنی ساختە دەتوانێت شەرعییەتی دەسەڵات بخاتە ژێر پرسیارەوە، هەر ئەوەش بوە مایەی روخانی مارکۆسی سەر کۆماری فلیپین. ئەگەر بتوانرێ ئەوە دەربخرێ کە ترس لەناخدا دەسەڵات بەشەرعی دەکات، هەر چەندە ئەوەش زۆر نائاساییە، ئیدی دەتوانرێ بوترێت سەدام حسێن دەسەڵاتێکی شەرعیو ئەسڵی پێدراوە. تایبەتمەندێتی سەرەکی رژێمی بەعس لەعێراقدا لەم خاڵەدا چڕدەبێتەوە.

پێش چوار سەدەو لە گەرمەی شەڕی ناوخۆی ئینگلستاندا، کاتێك ژیان "خراپ، دڕندانەو کورت" بو، تۆماس هۆبز رەگەزی ترسـی خسـتە نێو ئەو شـێتەڵکارییانەوە کە لەسـەر دەسـەڵاتی شـەرعی ئەنجامی دەدا. رەنگە ئەو یەکەمین یـا گەورەترین بیریـاری سیاسـی بێت ئەوجۆرە شـیکردنەوانەی کردوە. ئەو جیهانەی شـیکردنەوە سیاسییەکانی تێیدا هەڵدەگۆزی لە تاکە یەکسانەکان پێکهاتبو، بەڵام لەیەك جودابونو بەکۆکردنەوەیەکـی بیرکاری "کۆمەڵگە"یان پێکدەهێنا. ئەم جیابونەوەشـیان بەهۆی



بزری دەربەسـت بونی نێوان تاکەکان بو یا بەهۆی هەسـتنەکردن بە بەرپرسـیارێتی نێوانیان بو. لەم "حاڵەتە سروشتییەدا" جەنگی هەمو لەدژی هەمو مەرجێکی پێویستی بوونو مانەوە بو.

هۆبـز دەڵێـت تاکـەکان بەهـاوکاری هرزو سـۆزی خۆیـان کاردەکـەن. عەقل کۆمـەك بە مرۆڤەکان دەکات تا پەی بەو واقیعە بەرن کە بەمەبەسـتی پێشـوەچونی بەرژەوەندییەکانیان، واز لە مافە سروشـتییەکانی خۆیان بهێنن "تەنانەت ئەو مافەناش کـە پێکـەوە هەیانـە"، بەڵام نەك ئـەوەی واز لـەو مافانەی خۆیان بهێنـن، چونکە کارێکـی لەوجۆرە زیاتر لە خەیاڵ دەچێت، بەڵام هـەر یەکێکیان بەجیا لەوی دی، واز لە دەسـەڵاتی خۆی دەهێنێت بۆ یەکەیەکی دەسـەڵات پێدراو تا سـەرجەم ئەو دەسەڵاتەی بەو شێوەیە فەراهەمکراوە، بۆ پاراستنی ئاشتیو ئاسایش بەکاربهێنێ. هۆبز دەڵێـت بوونی دەسـەڵاتی رەهای دەوڵەت، پەیماننامەیەکـی لەوجۆرە لەخۆ دەگرێ تـا تاکـەکان پێکەوە ببەسـتێتەوە[16]. ئەو پەیمانـە لەو رووەوە کاراو سـەرکەوتو بو کـە هیچ یەکێـك لەتاکەکانی کۆمەڵگە پشـت بەفەزیلەتی ئەوانی دی نەبەسـتێت، بەڵام ئەو کەسـانەی وازیان لە برێك لە دەسـەڵاتی خۆیان هێناوە بۆ لایەنی سـێیەم، ئەو متمانەیەشـیان پێبەخشـیوە لەکاتی گونجاودا دەسـتێوەردان بکات. لە "حاڵەتی سروشتیدا" بیرۆکەی لەبابەت عەدالەت، پەیماننامەو ئاکار چەمکگەلێکی بیمانابون، بەڵام لەگەڵ دروسـتبونی کۆمەڵگەی تازەدا کە لەسـەر پەیمان دامەزراوە، ویسـتو ئیـرادەی بیکۆتو بەندی فەرمانـڕەوا بۆ خۆی دەبێتە عەدالەتو سیسـتمی پەیمانی ئەخلاقـی کۆمەڵگەش بۆ ئـەو ئیجباری نیەو ئەوەش لەچییەتی ئـەو پەیمانەوە بو کە بەمەبەستی سەقامگیرکردنی ئەمنو ئاسایش لە نێو تاکەکاندا بەسترا. هیچ فەزیلەت یا پەرجویەك نەسـەپێنرا. عەقڵ وادەخوازێت کۆدەنگییەك لە کۆمەڵگەی سیاسیدا بوونی هەبێت. لەرووی پرەنسـیپەوە هیچ شتێك نەیدەتوانی لەئاست ویستی حاکمدا خۆی رابگرێت. گرنگترین بەش لە بیروڕای هۆبزدا بریتیە لە: تیورەی دەربەستبونی سیاسی لەجیهانێکدا هەڵدەگۆزێ کە سەرتاپای لە بێئەخلاقیدا نوقوم بوە.

ئەو سۆزەی تاکەکان بۆ کارکردن هانده‌دا زۆر لە عەقڵیان پڕتواناترە. "ترس لە مردن" لە پێشەنگی ئەو سۆزەیە کە خەڵکی بۆ ئاشتی هانده‌دا. ئەوەی کە دەسەڵاتی دەوڵەت لە بنەڕەتدا لە ڕەزامەندی جەماوەرەوە یا لەڕێگەی هێزەوە بەدەست هاتبێت، مەسەلەیەکی ئەوتۆ نیە، چونکە ئەو شەرعییەتەی لە ترسەوە سەرچاوەی دەگرێ، پێویستە لە ڕێگەی ئەوانیشەوە تێبینیو پشتیوانی بکرێ، "واتە ئەوانەی پابەندن بەو هەمو پەیمانانەی لەترس لە مردن یا توندوتیژییەوە سەرچاوەدەگرن"[17]. ئەو ئازادییەی دەوڵەتی نوێ هەیەتی لەگەڵ ترسدا هاوڕایەو لە ڕەتکردنەوەی بەکارهێنانی توندوتیژی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا سەرچاوە دەگرێ، بەڵام ئەو دەوڵەتەی فەرمانڕەوا یاسای تێیدا دانەڕێژێتو هاوڵاتیانی ئازادبن لەوەی چ جۆرە کارێك دەکەن، لەگرنگیدا پێگەی دوەمی هەیە.

دیدی سەرەکی هۆبز لە شیتەڵکاریدا بریتیە لە: دەسەڵاتی دەوڵەت هەمیشە ئامرازەکانی توندوتیژی قۆرغدەکات. ئەو جەخت لەسەر کۆدەنگییەك دەکاتەوە کە بەپێی ئەو کۆدەنگییە توندوتیژی لەڕێگەی لایەنی سێیەمەوە قۆرغدەکرێ. هۆبز سیستەمی دەربەستبوونو بەرپرسیارێتی پێشوەخت لەسەر بنەمای چەمکی نا سیاسی (بۆ نمونە ئاینی) بۆ سروشتی مرۆیی ناسەپاندووە، لەرووی سیاسییەوە لەگەڵ ئەمجۆرە دەسەڵاتەی دەوڵەتدا دروست دەبێ.

بۆ ئەوەی گوێرایەڵی گریمانەکانی هۆبز بین، دەبێ بیروڕاکانی قبوڵ بکەینو گفتوگۆیی لەسەر نەکەین. شتێکی روونو ئاشکرایە کە هۆبز شوێنێکی بۆ کۆمەڵگەیەك لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی سیاسەتدا نیە، بەڵام کۆمەڵگەی مەدەنی وەك واقعێك کە لە زۆر چینی تەقلیدی یا بەدەستهاتو پێکهاتووە، لەپاڵ چەندین بەشو گروپی مرۆییدا، خۆی دەسەپێنێت. ئەو گروپانە، ئیدی چ لە ئەنجامی لەدایکبوون یا بیروباوەر یا دابەشکردنی کار یا لە پەیوەندی ئامرازی کارەوە سەرچاوەیان گرتبێت، ئاڵوگۆڕی دەسەڵات زۆر لەوە ئاڵۆزتر دەکات کە هۆبز لە ڕۆبنسۆن کرۆزۆدا بەدیدەکات[18]. لەپاڵ ئەوەشدا شێوازەکەی هۆبز ئەوە دەسەپێنێت کە سەرچاوەی هەمو دەربەستییەك



لە کاروباری مرۆییدا دەبێ عەقڵانی بێت. بەپێچەوانەی لۆجیکی فەلسەفی هۆبزەوە کە جێگەی متمانە نیە، بۆرجوازی سەدەی بیستەمو دیموکراسی بۆرجوازی لە فۆڕمی دەوڵەتی لیبراڵیو لەسەر بنەمای هەڵبژاردنی دیموکراسی بەدیارکەوت کە مشتومڕێکی زۆری لەسەر کراوە، بەڵام دەوڵەتێکی واقعییە.

لەگەڵ ئەوەشدا "هەڵەکانی" هۆبز زۆر جیاواز دەردەکەوێ کاتێك لەڕێگەی رووکاری هەرەمی شوشەیی یا هاوێنەی بەعسی عێراقەوە تەماشادەکرێ. مرۆڤ پێیوایە بەعسی عێراق دەیەوێت جیهانێکی هۆبزی بونیات بنێت. ئامانجی بەعسیەکان لەناوبردنی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییە بو کە بەمیراتی بۆیان مابووە، لەجیاتی ئەوەش ڕەگەزی نوێ بخولقێنن کە کێشو هاوسەنگی یەکسانی هەبێت ـ ڕەگەزی ترساوی بێرەگوریشەو بێتاوان، لە کۆمەڵو گروپە تەقلییەکان دوور دەخرێتەوە (کەسوکار، خێڵ یا گروپو تایفە) ـ پاشان ئەو هەمو پارچانە لە تۆڕێك پەیوەندی نێوەندی نوێی سەر بەدەوڵەت کۆدەکاتەوە. جەماوەری دەوڵەتی دیکتاتۆری بەبێ جیاوازی لیڤیاتان ئاسا کە لەسەر شانۆی عێراقدا دەرکەوتن، لە بنەڕەتدا یا دژایەتی هەر بەشێکی نابەعسیان دەکرد یا لێی دوور دەکەوتنەوە.

ئەوەی دەبێتە مایەی ئەوەی دەوڵەتی بەعس بە دەوڵەتی بۆرجوازی لە قەڵەم بدەین، پێداگرتنیانە لەسەر خولقاندنی کۆمەڵگەیەکی جەماوەری کە تێیدا تاکەکان لە ڕەگوریشەو رابردویان دوور دەخرێنەوە. تاکگەرایی جەماوەریی پرۆژەیەکی رادیکاڵییەو جێبەجێ کردنی پرۆژەو پرۆسەیەکی لەوجۆرە لە کۆمەڵگەیەکی دواکەوتودا کارێکی زۆر دژوارو نەفرەتئەنگیزە. ئەو تاکەی لەو هەلومەرجەدا دروست دەبێ بەتەواوەتی جیاوازە، بۆ نمونە لەو تاکەی لەجیهاندا تێدەکۆشێت لەڕێگەی فراوانکردنی مەودای کەسایەتی خۆیو فەزایەك لەئازادیدا، "خۆی دروستبکات". بەعسییەکی ئایدیالی خەسڵەتی شارستانیانەی کۆمەڵگەی بۆرجوازی تیانیە، لەبەر ئەوە لە ناشوێندا دوور لە مرۆڤ وازیلێدەهێنرێ، هەروەها کەسێك هەم خەسڵەتو ئامانجی نوێی هەیە، هەم تا ئاستێکی ترسناك سەرەتاییو بەدەوییەو لەواقیعدا هەمان "حاڵەتی سروشتی" هۆبز

بەسەر دەبات.

بەعسیەکان بەهۆی ئەم بازدانە خەیاڵییە، دەبوایە هەمو ئەو شتانە لە نمونەی هۆبزدا بوونی نەبو، واتە کۆمەڵگەی مەدەنی، لەنێوبەرن. بۆیە تەنها لەرێگەی پیادەکردنی ئەو ترسەی هۆبز وێنای کردبو، دەیانتوانی ئەو کارە ئەنجام بدەن، لەبەر ئەوە پێویستیان بەو دەزگا توندوتیژانە هەبو کە لە بەشی یەکەمدا باسمان لێوەکردوە. بەدڵنیاییشەوە بایەخدانی هۆبز بەتەواوەتی پێچەوانەی بەعسیەکان بو: مەبەستی ئەوە بو تاکەکان لە "ترس لە مردن" دووربخاتەوە کە شەوو رۆژ لە دەوڵەتە ئازادە سروشتییەکەیاندا بیریان لێدەکردەوە. دامەزراندنو سەقامگیرکردنی سیستمێك لە رێگەی دەسەڵاتێکی رەهای حوکمڕانییەوە ئەو ترسەی زیاد دەکردو رێی لە ئازادی تاك دەگرت تا بەسەربەخۆیی کار بکات، بەڵام بەعس لەرێگەی خوڵقاندنی ترسێکەوە کە پێشتر بوونی نەبو هەمان شتی دەکرد.

لە کۆتاییدا بەعسو هۆبز (یەکەمیان لە واقیعی سیاسیدا کە بەمیرات بۆی مابووەو دوەمیان لە تیورەی ئەبستراکتی سیاسیدا)، بەخاتری حوکمڕانی کردنێك کە "مایەی رەزامەندی خەڵك بێت" دەسەڵاتیان پەیداکردو بەپێی ئەو دەسەڵاتە "هەر تاکێك خۆی بەدروستکارو سەرچاوەی هەمو کردەوەکانی دەسەڵاتدار دەزانی، بەجۆرێك کاتێك هەر تاکێك گلەییو گازندەیی لە دەسەڵاتدار دەکات بەوەی ئازارێکی پێگەیاندوە، لەواقیعدا گلەیی لە کردەوەیەك دەکات کە خۆی دروستکارو سەرچاوەی بوەو لەبەرامبەر ئەوەشدا مافی ئەوەی نیە جگە لە خۆی کەسێکی دی تاوانبار بکات"[19].



## دەسەڵاتو ئاکار:

حکومەتە ستەمگەرو دیکتاتۆرەکان کاتێك دەسەڵاتیان دەکەوێتە مەترسییەوە پەنا بۆ توندوتیژی دەبەن، بەڵام لەحاڵەتی بەعسدا توندوتیژی بەتەنها دوا سزادانێکی رووت نیە کە جارناجار دژی ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی بەکاربهێنرێ. بەعسییەکان خۆیان دوژمنی خۆیان هەڵدەبژێرن. هەروەها توندوتیژی، نەك هەڕەشەکردن بەتوندوتیژی، بەدەزگایی کراوەو بەردەوام کەشوهەوای تومەتبارکردن، ترسو بەشداریکردن لەتاواندا دەوروژێنرێو بوە بەگرنگترین خەسڵەتی کۆمەڵگەو دەوڵەتی عێراقی. توندوتیژی ترس بەرهەمدەهێنیو رێگە لەبەردەم بەشداریکردن لە تاواندا ئاواڵا دەکاتو ئەو رەگەزەش دەسەڵات پێکدەهێنی، کە سەرەتا بەحیزبو پاشان لەفۆڕمی دەسەڵاتی سیاسی بە سەدام حسێن سپێردرا. ترس کە لە هەمومەرجێکی دی دەبێتە مایەی لەبەریەکهەڵوەشانەوەی دەسەڵات (بۆ نمونە ئەو سەربازانەی رەتیدەکەنەوە شەڕ بکەن یا لەهێندێك کاتو ساتی شەڕی ناوخۆدا دەسەڵاتی نێوەندی سیاسی لەبەریەکهەڵدەوەشێننەوە)، لەعێراقی بەعسدا دەسەڵاتی لەناوەوە روخاندوەو خستۆیەتیە چاڵێکی رەشی بێبنی رێبەری رەهاوە.

هەر چەندە ژمارەی چەکدارەکانو پیاوانی هەواڵگری زیاتر بێت، هەر چەندە مەشقو رێکخراوەییان بە بەراورد لەگەڵ بەرەی ئۆپۆزیسیۆندا باشتر بێت، هێزی پشتیوانی دەسەڵاتی سیاسی زیاتر دەبێت. هێز فەردییە، بەڵام دەسەڵات لە کۆدایەو دەرئەنجامی کاری ئەو خەڵکانەیە کە بەجۆرێك لە هاوئاهەنگی کار دەکەن. ئەگەر دەسەڵات پێناسە بکەینو بەو چۆنییەتیەش دەست نیشانی بکەین، دەبینین جیاوازی لەگەڵ توندوتیژیدا هەیە، چونکە توندوتیژی ئامرازی بەردەستی مرۆڤەکانە بەمەبەستی گەیشتن بە ئامانجە ئاراستەکراوەکان پەنای بۆ دەبەن[20]. تەنانەت لە خودی عێراقی بەعسدا توندوتیژی خۆی لە خۆیدا گرفتێکی سەرەکی نەبوە. پێشتر ئەم گرفتە بۆ

ئاستەکانی دی گوێزراونەتەوە. بۆچی ملیۆنێك ئەندام لە حیزبدا هەیە، یا بۆچی لە ساڵی ١٩٨٠دا ٦٧٧٠٠٠ سەربازی چەکدار هەبو؟ چ شتێك ناچاریانی دەکرد پەیوەندی بەحیزبو سوپاوە بکەن؟ ئایا لەدوای ئەوەی چونە ریزی حیزبەوە بەشداریان لە تاواندا کردوە؟ ئایا هێشتا دەتوانن ئەوەی دەیانەوێت هەڵاوێردی بکەن؟ ئایا خێزانەکانیشیان بۆ ئەو کارە ناچارکرابون؟ ئایا دەربارەی هەواڵچنەکان، ئەوانەی لەژێر فەرماندا کار دەکەن، ئەوانەی بەدوای پلەو پایەدا رادەکەن، قوربانیانی بارودۆخەکە، ئەندامانی رێکخراوە کرێکارییەکان، قوتابیان، ژنان، منداڵانو ئەوانەی لە رێگەی حیزبەوە رێکدەخرێن، چ شتێك دەوترێ؟. بەدڵنیاییەوە ئەمە ئاوێکی لێڵە، ئێمەش تەنها دەتوانین بە ڕوانینەوە مەلە رووەو سیاسەتێك بکەین کە رەگوریشەی لە رەفتاری خەڵکیدا رەنگیداوەتەوە، نەك لە پەتای سایکۆلۆجیای مرۆڤایەتی کە لەسەرووی هەمو وەسفێکەوەیە.

پێشئەوەی بەعس بێتەسەر حوکم ئەزمونی فاشیزمو نازیزم ئەوەیان فێری خەڵکی کردبو کە دەسەڵاتی شەرعی لەگەڵ تەسلیم بوونو گوێڕایەڵیو رەزامەندی هاوڕایە، بەدەر لەوەی ئەو شتانە خۆبەخشانە بێت یا نا. ئۆردوگای کاری نازییەکانو کۆلاکو پرۆسەی پاکتاوکردنی ستالینی، کردەوەگەلی رژێمێکی یاسایی بو، هەروەکو چۆن پاساوی خۆی هەبو، شەرعییەتی خۆیشی هەبو. کاتێك لە کۆمەڵگەیەکدا جیاکاری گرنگی بۆرجوازی لەنێوان یاساو ئەخلاق لەنێوبچێت، ئیدی دەسەڵاتی سیاسی دەتوانێت بەناوی ئەخلاق یا یاسا یا بەناوی هەردوکیانەوە هەمو کارێك ئەنجام بدات.

جیاوازی نێوان ئەخلاقو یاسا لەوەدانیە کە شتگەلێکیان قەدەغەکردوە یا مۆڵەتیان پێداوە، بەڵکو لەوەدایە بەچ شێوازێك رەفتار دروست دەکەن. یاسا سیستمێکی ئیجبارییە کە قۆرغکردنی ئامرازەکانی توندوتیژی لەلایەن دەوڵەتەوە لەخۆدەگرێ، بەڵام سیستمی ئەخلاقی پێویستی بەقۆرغکردنی ئەوجۆرە ئامرازانە نیە. مەسەلەی سیاسی ئەڵمانیا لە سییەکاندا لە ئەخلاقیاتی میلەتی ئەڵمانیا نەبو، بەڵکو لەقبوڵکردنی



ئەو بیرۆکەیە بو کە دەیتوانی توندوتیژی دەوڵەت بۆ پاکژکردنەوەی رەگەزی ئەڵمانی بەکاربهێنێت، "وشیاری رەگەزی" زیندوبکاتەوە، یا "هەستی نیشتمانی دروست" گەشەپێبدات، ئەو هەمو شتانەو بەهەمو نامۆبوونێکیانەوە تەنها لەو ساتەوەختەدا تازەبوون کە دەوڵەت بۆ ریشەکێشکردنی هەمو شتێکی دی بەکاریبهێنێ. زۆرێك لە ئەڵمانیەکان لەو ساتەوەختەدا بەو دیدەوە لایەنگیریان لە نازییەکان دەکرد تا توانەوەی سیستمی یاسادانانو ئەخلاق جێبەجێ بکەن. بۆرجوازی ئەڵمانیا ئامرازی جێبەجێ کردنی ئەو ئامانجە ترسناکەی لەبەردەست بو، ئەو ئامرازەی هیچ دەوڵەتێك پێش چەرخی تازە لەبەردەستیدا نەبو. یاسای جێبەجێ کردن شوێنی خۆی بۆ فەرمانە ئیدارییەکان چۆڵکرد کە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە دەوڵەت ئاماژەی لێبوردنێکی تازەیەو دەتوانێ هەر لە ئێستاوە لەسەر کردەوەکانی بەردەوام بێت. ئەگەر درۆو حەماقاتەکانی هیتلەر کە داویەتی پاڵ میللەتی ئەڵمانیا لەبەرچاو نەگرین، دەبینین شەرعییەتی کوورەکانی گازی نازی رەگوریشەی لە قبوڵکردنی ئەم گۆڕانکارییە تایبەتەی کۆمەڵگەی ئەڵمانیدا هەیە، بەڵام پێمان خۆش بێت یا نا ئەزمونی ئەم گرفتو لوغزە ئەخلاقییانە ئەوەمان فێردەکات، دەست لەو بیرۆکە ساویلکانەیە هەڵگرین کە دەڵێت گشت ئەو فەرمانڕەوایانەی خەڵکی بە گوێڕایەڵی ناچاردەکەن، شەرعی نین.

بەپێوەرێکی بچوکتر، ئەزمونی بەعسی عێراق جارێکی دی جودایی رادیکاڵانەی نێوان مەسەلەی شەرعییەتو رەزامەندی خودێکی سەربەخۆی سەلماند. بەعسییەکان ترسیان کردە مەرجێکی پێشوەختی شەرعییەتی خۆیان. مرۆڤەکان لە گروپە جیاوازو لە هەڵوێستە مێژووییەکاندا پێیانوایە بەرپرسیار نین لەو کردەوانەی ناچارکراون ئەنجامی بدەن. ئەمرۆ لەسەرتاسەری جیهاندا ئەو دانپیانانەی لەرێگەی ئەشکەنجەوە بەدەست دەهێنرێ (لەڕووی پرەنسیپەوە، نەك وەك پراکتێك) بە بەڵگە وەرناگیرێت، بەڵام ئەو کارە هەمیشە بەوجۆرە نەبوە. یاسای رۆمانیاو دواتریش ئەو رێوشوێنانەی دادگای پشکنین پێی هەڵدەستا، ئەو حەقیقەتانەی بە زۆر لەرێگەی ئەشکەنجەوە لەتاك

وەردەگیرا لە هەر بەڵگەیەکی دی بەرزتر دەنرخاند. بەو گریمانە پێشوەختەی کە ئەشکەنجە مەسەلەیەکی نائەخلاقییە، نەوەکانی ئایندەی عێراق بەوپەڕی دڵنیاییەوە شەرعییەتی بەعس دەخەنە ژێر پرسیارەوە. لەهەمان کاتیشدا لەسەر خەڵکی عێراق پێویستە لەگەڵ ئاکامی کردەوەکانی خۆیاندا ژیان بگوزەرێنن، بەبێ لەبەرچاوگرتنی چاکەکانی دادوەریو مافە شەرعییەکان کە لەساتە وەختی ئێستادا لە کولتوری ئەم کۆمەڵگەیەدا پارەیەکی قەڵبە. جیهانی راستیە سیاسییەکان بەزەییو میهرەبانی لە جیهانی مافەکانی مرۆڤ کەمترە، چونکە تەنانەت ئەگەر ئەو دەسەڵاتەی کە تا بیناقاقای لە ترس نوقوم بوەو بەشدارە لەتاواندا، پێیوایە لەرووی چۆنێتییەوە جیاوازە لەو دەسەڵاتەی بۆ نمونە لەرێگەی هەڵبژاردنەوە لەدایك بوە، ئەوا عێراقییەکانیش دواتر ـ هەمان دڵەڕاوکێی ئەرجەنتینییەکانیان هەیە کە لەدوای روخانی حوکمی سەربازی وڵاتەکەیان هەیان بوـ دەبێ بزانن هەر چەندە هەلومەرجە تازەکە جیاوازە، دەرئەنجامی کارەکەش هەر چۆنێك بێت، هەر لەرێگەی دەسەڵاتگەراوە دەبێت[21].

## سەرچاوەی دەسەڵاتەکان:

ئەو فۆرمەی لەدواجاردا دەسەڵاتەکانی بەعس گرتیبەبەر، فۆرمی لیڤیاتانی یا نیشانگەی رێبەر بو، بەڵام ناوەرۆکەکەی لە پرەنسیپەکانی خودی بەعسەوە بو. پێویستە ئەو پرەنسیپانە لەسەر ئاستێکی بەرفراواندا قبوڵ بکرێ تا رێبەر بتوانێت بەبێ هیچ بەربەستێك گشت کردەوەکانی پیادەبکات، بەو ترسەشەوە کە رەگوریشەی لە دەسەڵاتەکەیدا هەیە. ئەم پرەنسیپانەی بەعس هاوشێوەی پەیمانی کۆمەڵایەتی هۆبز بو، هەروەها پشتگیری لە سیستمی دەربەستبونی ئەخلاقیو سیاسەتێك دەکرد کە هەر بنەڕەتەوە لە بونیادی هۆبزی بۆ دەسەڵاتەکان دەژمێردرێت. هەر یەك لە رەگەزی ئاری، سامیو دەوڵەتپەرستیو شتی دی لە نێوان هەر دوو جەنگی جیهانیدا هەمان



رۆڵیان لە ئەوروپادا وازیکردوە. بۆیە دەپرسین لە ئێستادا هاوتاکەی ئەوانە لە عێراقی بەعسدا چییە؟

"دەسەڵات لە پێناوی خودی خۆی یا بەخاتری خود لەلایەن مرۆڤو لەپێناوی مرۆڤدا پیادە ناکرێ. بەمشێوەیە پیادەکردنی دەسەڵات پێویستە بەرەزامەندی میللەت جێبەجێ بکرێو تەنها لەو حاڵەتەشدا شەرعییەتی دەبێ. بۆیە میللەت سەرچاوەی شەرعییەتی هەمو دەسەڵاتەکانە.

ئەگەر "میللەت سەرچاوەی شەرعییەتو دەسەڵاتەکان" بێت، هەروەکو لە دەستوری عێراقدا هاتوە (مادەی ٢)، ئەوا جۆری دیموکراسی پشت بە چەمکی پێناسەی میللەت دەبەستێو ئەمەش ... جۆر یا سروشتی رژێمی سیاسی دیاریدەکات، واتە شێوازی پیادەکردنی دەسەڵاتەکان لە کۆمەڵگەدا...

بە گوێرەی راڤەی شۆڕشو حیزبی رێبەر، واتە حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، میللەت بریتیە لە هەمو ئەندامانی کۆمەڵگە کە مافو ئەرکی یەکسانیان هەیە، بەڵام لەکاتی پیادەکردنی دیموکراسیدا بەدڵنیاییەوە هەمو ئەو کەسانەی ئاراستەیەکی فیکری یا سیاسی یا ئابوری دژ بەشۆڕشو بەرنامەکەیان هەیە، دوور دەخرێنەوەو کارکەنار دەکرێن، هەروەها پێویستە پێگەو حاڵەتی ئەو کەسانەش لە رێگەی یاساو ئەو رێوشوێنانەی دەسەڵاتی پەیوەندیدار دەیگرێتەبەر، دەست نیشان بکرێ. پێویستە وشیاری سیاسی شۆڕشگێرانە رۆڵی یەکلاکەرەوە لە پاراستنی رای گشتیدا وازیدەکات. ئەمەش حاڵەتێکی تایبەتە لە زەرورەتی گۆڕانی کۆمەڵگەوە سەرچاوەدەگرێ"[22].

پێوەری ئەندامێتی لە هەر دەوڵەتێکدا، خاڵی دەسپێکی سیاسەتە. یاسای ریفۆرمی دادوەری کە لە بەڵگەنامەیەکی سیو چوار لاپەرەیی پێکهاتبو، ساڵی ١٩٧٧، واتە دوای ئەو سەقامگیرییە سیاسییەی کە بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٥٨ەوە بەدیهاتبو، لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراقەوە دەرچوە، ئەویش بەمەبەستی دانانی هێڵە گشتیەکانی ریفۆرمی سیستمی دادوەری عێراقی دارێژرابو. لە دیباجەکەیدا هاتوە، یاسای تازە "لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆجیاو بیروباوەڕەکانی راپۆرتی سیاسی "کۆنگرەی

هەشتەمی" حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، پشت بە دیاریکردنی ئامانج، چەمك‌و ماناکانی ریفۆرمی دادوەری دەبەستێت. لەلایەکی دی، یاسا بەشێوازێکی جدی بۆ مەبەستی ناوخۆی حیزب‌و بەدواداچونی بەڵگەنامەیەك دارێژراوە کە خودی ئەو بەڵگەنامەیە بەرجەستەی نیشانەیەك دەکات لە هەڵسەنگاندنی ئەزمونی حیزبی دەسەڵاتدارەوە سروش وەردەگرێ. بۆیە ئێستا بەم پێوەرە خوێندنەوەی بەیاننامەیەکی راستەقینە بۆ چەمکی بەعسی عێراقی دەکەین.

ئەو بیرۆکەیەی دەمانەوێت لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین بریتیە لە زەرورەتی پێناسەکردنی "میللەت". لەبەر هەر هۆیەك بێت، حیزبی بەعس بەپێچەوانەی زۆرێك لە بزوتنەوەو شۆڕشەکان، ئەم توێژەی بەهەمان شێوە پێقبوڵ نیە. هەروەها ئەم وشەیە (میللەت) لەگەڵ پێوەرە "سروشتی"یەکانی لەبابەت لەدایکبوون، نیشتەجێ بوون‌و وەفاداری‌و گوێرایەڵی بە ئاینێکی تایبەت (وەك ئیسرائیل) پێناسە ناکات. لەگەڵ رێساو ئایدیۆلۆجیا رەگەزپەرستییەکەی نازییەکانیش یەکناگرێتەوەو بانگەشە نەژادپەرستیەکانی (باشوری ئەفریقیاو وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەپێش شەڕی ناوخۆدا) قبوڵ ناکات. لەبەر ئەوەی میللەت سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە، بۆیە پێناسەکردنی کارێکی زۆر جدیی‌و گرنگە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە پێواری (غیاب) هەمو شتێکە بەپێوەری ئامانجە درۆکانیشەوە. بەعس گرنگی بەشوێنی لەدایك بوون، رەنگی پێست‌و باوباپیران نادات. تەنانەت زمانی عەرەبی‌و ئیسلامیش کە زمان‌و ئاینی رەسمی دەوڵەتە بەپێی دەستوری ١٩٦٨ لە ئاست یاسای ئەسڵی ئیمان بە پرەنسیپەکانی شۆڕش‌و حیزبی رێبەر کارێکی لاوەکییە.

سەدام حسێن ساڵی ١٩٧٣ لە گوتارێکیدا دەربارەی مەسەلەی کورد لە عێراقدا ئاماژە بەهەمان خاڵ دەکات‌و دەڵێت: "حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بەتەنها خۆی بەدەسەڵاتی عەرەب نازانێت، بەڵکو لە واقیعدا بەبێ جیاوازی خۆی بەنوێنەری عەرەب‌و کورد دەزانێت، واتە نوێنەری ویستی هەمو عێراقییەکان بە عەرەب‌و کوردو



سەرجەم کەمە نەتەوایەتییەکانی دی. لەسەر ئەم بنەمایەش، ئەو چەمکەی کە دەسەڵاتی نەتەوە لایەنێکی ململانێکە بێت‌و میللەتی کوردیش لایەنێکی دی، بۆ ئێمە قابلی قبوڵ نیە"[23]. پێویستە ئەوەمان لەیادبێت کاتێك شەڕی ناوخۆ دەست پێدەکات، یەکێك لە خەسڵەتە تایبەتەکانی ئەوەیە کوردەکانی عێراق بەشێوازێکی بێوێنە لە دەوری سەرکردەی خۆیان خڕببنەوە، بەڵام ئەو پەرۆش‌و لۆجیکەی سەدام رەتیدەکردەوە، روبەروبونەوەی دەسەڵاتی نەتەوە لەگەڵ بەشێك لە میللەتەکەی خۆی کارێك بو شایانی گرنگی‌و بایەخ پێدان بو. هەر لەم دەسپێکەوە گشت نەتەوەی کورد لەماوەی شەڕی ١٩٧٤ ـ ١٩٧٥دا ئەگەر شانبەشانی هێزەکانی حکومەت شەڕیان نەکردایە، بە سیخورو کرێگرتە لە قەڵەم دەدران. ئەمەش لە ئەدەبیاتی بەعسی عێراقدا تاکە رێگە بو کوردەکانی بێ وەسفدەکرد. ئیدی بەوپەڕی سادەییەوە کاتێك لەچوار دەوری رێبەرێکی دی خڕدەبنەوە، ئەوا ناچنە نێو پێناسەی "میللەت"ەوە، ئەو پێناسەیەی کە حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی دایڕشتبو. لەبەر ئەوەی نیشتەجێی خاکی عێراق بوون، بەجۆرێك لە بیانی‌و خائین لە قەڵەم دەدران، بەڵام ئەو رایەی سەدام کە دەڵێت میللەتی دابەشکراو ناتوانێت درێژە بە ژیانی خۆی بدات، رایەکی کۆنەو رەگوریشەی قوڵی لە بیروباوەری بەعسدا هەیە، لە بەشی شەشەمدا دەگەڕێمەوە سەر ئەم باسە.

پرسیارێکی لەوجۆرە بەتەواوەتی لەگەڵ ئەو بانگەشەیە جیاوازی هەیە کە بوترێ لەئێستادا بەشێك لە میللەت لە بەرژەوەندییە باڵاکانی خۆی تێناگات، یا لەلایەن سەرکردە فێڵبازەکانیانەوە فریودەدرێن. رەزا شاو ئەتاتورك لە سەر پێدانواندنی میللەتە هەڵگەراوەکانی ئێران‌و تورکیادا دەیانوت، ئەو سەدان هەزار کەسەی لەلایەن دەوڵەتەوە کوژراون خەڵکانی ئێرانی‌و تورك بوون، چونکە ئەگەر بەپێچەوانەی ئەوەوە قسەیان بکردایە، شەرعییەتی ئەو جەنگەی نەتەوەکەیانی لەسەر بونیان نرا، دەخستە ژێر پرسیارەوە. تەنانەت تا ئەمرۆش لە تورکیا بە کوردەکان دەوترێت "تورکی شاخاوی". لەلایەکی دی، کاتێك "تورکانی گەنج" ساڵی ١٩١٥، ویستیان بە کوشتنی یەك

ملیۆن‌و نیو ئەرمەنی کێشــەی ئەرمەن چارەسەر بکەن، لەبەر ئەوە بو کە تورکە نەژاد پەرستەکان، تورکبوونی ئەرمەنیەکانیان پێ قبوڵ نەبو. ئەمەش هەمان ئەو شتە نیە کە سەدام حسێن ساڵی ١٩٧٣ لەمەڕ کوردەکانی عێراقەوە وتویەتی.

لــەرووی پرەنســیپەوە بەعس پێیوایە پیادەکردنی دەســەڵات پەیوەندی بەئەندامێتی گروپێکی نەژادی یا ئاینییەوە نیە. ئەو ئەگەرە ـ هەر چەندە زۆر دووریش بێت ـ بوونی هەیە کە کورد لە چوارچێوەی حیزبی بەعسدا وەك عەرەب جێگەی خۆیان بکەنەوەو لەو حاڵەتەدا بەعس ناتوانێت بەبیانوی کوردبوونیان لە خۆی دووریانبخاتەوە. وەفاداری بــۆ حیزب زیاتر مەســەلەیەکی ئایدیۆلۆجیایە تا ئەوەی مەســەلەیەکی نەتەوەیی بێت، ئایدیۆلۆجیا تەوەرەی تۆکمەکردنی حیزبە:

"پێکهاتــەی حیزبی بەعس، ئەندامێتی بۆ بنەمای نەژادی کورتناکاتەوە. هەمو ئەو کەســانەی ئیمانیان بەئایندەی عەرەب هەیەو لەپێناوی نەتەوەی عەرەبدا تێدەکوشن، بۆیــان هەیــە پەیوەندی بەریزەکانی حیزبی عەرەبی ئیشــتراکییەوە بکەن‌و لە ئەنجامی پێشــەنگی بەرپرســیارێتیان لە دەوڵەت خۆیان بەسەرکردەو رێبەری نەك تەنها عەرەب بزانــن، بەڵکــو خۆیان بەرێبەری دەوڵەت بزانن کە بەرپرســیارە لــە هەمو هاوڵاتیانی عەرەب‌و کوردو کەمە نەتەوایەتییەکان"[24].

دەشــێت بەشــێوازی جۆراوجۆر خەڵکی کارکەنار بکرێن‌و دوور بخرێنەوە. سنگ فراوانی ســەدام حســێن لە خودی رادیکاڵییەتی خۆیەوە ســەرچاوە دەگرێ، کاتێك پێوەری بۆ ئەندامێتی حیزب‌و بیرۆکەی بەعس دادەنا لەسەر ئەوەی وتەزای "عەرەب" چ دەگەیەنێــت. واتای ئەوەی کە مرۆڤ عەرەب بێــت، بەتەواوەتی کارێکی زاتیەو پشــت بەبڕوابــوون بە پەیامی پانعەرەبیزم دەبەســتێت. لەو ســاتەوەختەی کە مرۆڤ "ئیمــان بە ئایندەی عــەرەب دەهێنێت‌و لەپێناوی نەتەوەی عەرەبدا تێدەکۆشــێت"، پرۆســەی بە عەرەببوون دەســت پێدەکات. لەراســتیدا بەرپرســیارێتی نکۆڵیکردن لە کوردبوون، دەکەوێتە ئەستۆی خودی کورد!.

یاسای ریفۆرمی دادوەری بەجۆرێك مامەڵە لەگەڵ ئەو کەسانە دەکات کە "دژایەتی



شــۆڕش‌و بەرنامەکەی دەکەن" وەکئەوەی مامەڵــە لەگەڵ درمێك بکرێ‌و دەبێ رای گشــتیان لێبپارێزرێت. کاتێك لە بەشێکی دی یاســای ریفۆرمی دادوەری دەنوارین‌و رێنماییەکانــی دەربارەی تاوانبــاران دەبینین، ئنجا تێدەگەین کە نەیارانی شــۆڕش لە جوغزی هاوڵاتیان وەدەردەنرێن، بەڵام تاوانبارانی تاوانی ئاسایی مامەڵەیەکی باشتریان لەگەڵدا دەکرێ. کاتێك هاوڵاتییەك لەسەر تاوانێکی ناسیاسی سزا دەدرێت، "پێویستە کەســی زیندانی لە ســزای توند بپارێزرێت... دەبێ ئامادە بکرێتەوە تا دووبارە وەك ئەندامێکــی کارا بــۆ کۆمەڵگە بگەڕێتــەوە. رێنمایی بۆلایەنــی دادوەریش دەرچوە تا نەرمــی بنوێنــن‌و هەلومەرجی کۆمەڵایەتی‌و تایبەتی لەبەرچــاو بگرن تا ئەو حوکمەی دەریدەکــەن، حوکمێکــی دادپەروەرانە بێــت، بەڵام تاوانەکان بەگوێــرەی مەودای ناکۆکیان لەگەڵ بەرژەوەندی کۆمەڵگە رێکدەخرێ. پاشــان ئەوانەی تاوان دەرهەق بەئاسایشــی دەوڵەت یــا مافی نەتەوە یا شــەرەفی وەفاداری بەنیشــتمان دەکەن لەو سەرنجو تێبینییە مرۆیانەیە دووردەخرێنەوە. سزادانی کەسی "دوژمن" لەگەڵ سزادانی هاوڵاتیان کە پێگەیەکی باشیان هەیە لەڕووی پرەنسیپەوە جیاوازی هەیە[25].

وادەردەکەوێت بەعس زۆر نیگەرانی ئەوەبوە کە چ کەسێك لەناوەوەو چ کەسێك لە دەرەوەی دەوڵەتەکەیان بون. ساڵانی ١٩٦٨، ١٩٧٥و ١٩٧٦ ئەو یاساو بڕیارانەی لەشــێوەی رێورەسمی لە ســێدارەدانی دوژمنانی توێژە نادیارەکانی لە بابەت زایۆنیزم‌و فراماســۆنەرەکانەوە (ماسۆنەکان) دەردەچون، یا وەکخۆی دووبارەدەبونەوە یا هەموار دەکرانەوە[26]. لێبوردنیش بەردەوام بۆ هەڵوەشانەوەی ئەو بڕیارانە دەردەچون، ئەوەش خەســڵەتێکی رێکخــراوی حیزبی بەعس بو، بێگومان ئــەو لێبوردنانە ئەو خەڵکانەی نەدەگرتەوە کە بەتاوانی "تێکدەر یا فراماسۆنەری، بەهائی یا سیخوری" حوکمدرابون بون[27]. یاسای جیاواز سەبارەت بەو شتانەش دەردەچون کە پەیوەندی بە "رەگەزی دوژمنکارانەوە" هەبو. لە هەر دوو جۆری یاساکەشدا جەخت لەسەر خێرایی رێوشوێنی هەمو قۆناغەکانی یاساو نێوەندێتی وەك پێوەرێك بۆ هەمو شتەکان دەکرایەوە.

هزر لە لێکۆڵینەوەدا هەنگاوی زۆری هاویشــتوە تا گەیشــتۆتە ئــەوەی لێکۆڵینەوە

لەسەر قوڵایی شتە سەیرەکاندا بکات. با بیر لە مەسەلەی راگواستنی دوو سەد هەزار کەس بکەینەوە کە لە کۆتایی حەفتاکاندا بەناوی ستونی پێنجەمی ئێرانەوە راگوێزران. لەم دواییەدا هەمو عێراقییەك بەڵگەنامەیەکی بەناوی "رەگەزنامەوە" بۆ دەرکرا کە ئەسڵو فەسڵی تاکەکانی تیا یاداشت کرابو: هاوڵاتی عوسمانی یا هاوڵاتی ئێرانیە. هەر شیعەیەکی عێراقی دەردەکرا، ئەوانەی رەگەزنامەی عێراقییان هەبو، بە هاوڵاتی ئێرانی ناو زەدە دەکران. ئەم گوزارەیە چەندین کەڕەت لە کتێبەکەی بەڕاك ـ سەرۆکی دەزگای هەواڵگری ـ دووبارەبۆتەوەو پێیان دەڵێت "ئەوانە لەڕووی مێژوویی، دەرونی، کۆمەڵایەتی، سیاسیو ئابورییەوە پەیوەندییان بە ئێرانەوە هەیە"[28]. شتێکی روونو ئاشکرایە کە ئەم توێژە روبەروی مەترسی گەورە دەبونەوە، بۆیە زۆرێك لەو عەرەبانەی پاسپۆرتی عێراقییان هەبو لە وڵات هەڵهاتن لەترسی ئەوەی نەوەك بەناوی هاوڵاتیبونی ئێرانییەوە رابگوێزرێن. ئەم جیاوازییە چۆن بەدیارکەوت؟

خەڵکە بەتەمەنەکان، ئەوانەی هێشتا شتیان لەیاد نەچۆتەوە، دەڵێن: لە یەکەمین ئامارگیری دوای روخاندنی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا، ئەودەمەی عێراق ماندێتی بریتانیا بو، داوایان لێدەکرا ئەسڵی خۆیان بەیان بکەن، ئیدی زۆرێك لە شیعەکانی باشوری عێراق خۆیان بە هاوڵاتی ئێرانی ناونوسکرد، چونکە پێیانوابو لە سەربازگیریو دەربەستبونی دی دەوڵەت رزگاریان دەبێت. ئەم پۆلبەندییەش نەوە لەدوای نەوە دەگوێزرایەوە بێئەوەی هیچ شتێك رووبدا تا حیزبی بەعس حوکمی گرتەدەست.

بەوتەی فەرمانبەرێکی کۆنی یەکێك لە وەزارەتەکان، بەپێی ئاماری حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، ژمارەی ئەو عێراقیانەی ئەم رێوشوێنە ئیدارییە دەیانیگرتەوە، دەگەیشتە دوو ملیۆن کەس. ئەگەر ئەو هەڵسەنگاندنە بەهایەکی هەبێت، ئیدی لەتوانادا دەبێت هۆی راگرتنی ئاستی راگواستن روون بکرێتەوە. رەنگە ئەوەش بگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە وڵاتێك دانیشتواکەی چواردە ملیۆن کەس بێت، نەتوانێت بۆ نمونە وەك ئەڵمانیا دەستبەرداری "دانیشتوانی زیادە" بێت. بەڕاك بەمەبەستی پێشاندانی ئاسانکاری یاساکانی رەگەزنامەی عێراق تا ساڵی ١٩٦٣، واتە یەکەم



حوکمڕانی حیزبی بەعس، کە مەرجی تازەی هاوڵاتیبوون "خزمەتگوزاری مەزنی بەوڵات" پێشکەش کرد، دەڵێت بەلانیکەمەوە هێشتا بیستو پێنج هەزار کەسی بەئەسڵ ئێرانی لە عێراقدا نیشتەجێن[29]. شتێکی روونو ئاشکرایە ئەو عێراقیانەی لە رەگەزنامەکانیاندا هاوڵاتیبونی ئێرانی تێیدا یاداشت کراوە، هەمیشە جێگەی گومانن. کەچی تاکو ئێستا رژێم بڕیارێکی دەرنەکردوە کە هەمو هاوڵاتییە ئێرانییەکان بە ستونی پێنجەم بزانێت. چونکە ئەگەر لە راستیدا دوو ملیۆن کەس لەوجۆرە خەڵکانە هەبێت، بەعسیەکان هەرگیز یاسایەکی لەوجۆرە دەرناکەن، بەڵام ئەو خەڵکانە کێین؟ هەر کەسێك لە رەگەزنامەکەی هاوڵاتی ئێرانی تیا یاداشت کرابێت، دەبێ خۆی لەم پرسیارە بەدوور بگرێت تا رۆژێك دێت، ئیدی چ زوو بێت یا درەنگ خۆیان بیلێن.

بەداخەوە ئەو کتێبانەی لەدوای راگواستنی شیعە لەسەر عێراق نوسراوەو لە دەرەوەی وڵات بڵاوبونەتەوە، تەنها ئاماژە بە "ئێرانی" یا گروپە "بەئەسڵ ئێرانییەکان" دەکەن، هەروەها زۆرجار ئەم راگواستنە بۆ "دادپەروەرییەکی زبر" لە هەلومەرجی جەنگ دەگێڕنەوە، هەر چەندە دەیانزانی ئەو راگواستنەوە ماوەیەکی زۆر پێش جەنگیش دەستی پێکردبو. هەر چۆنێك بێت تەنانەت ئەمریکاش سوکایەتی بەئەمریکاییە بەئەسڵ ژاپۆنییەکان دەکردو لەماوەی جەنگی جیهانی دوەمدا لە ئۆردوگای زۆرەملێدا گلیدابونەوەو حیزبی بەعسیش بانگەشەی پابەندبوونی بە "مافەکانی مرۆڤەوە" نەکرد. خومەینی گەڕانەوەی ئەو خەڵکانەی بەیەکێك لە مەرجەکانی ئاگربڕ دادەنا. بەمشێوەیە خەڵکانێکی بێ نیشتمان لەئێستادا مەسەلەیەکنو لە ئایندەشدا خەڵکانێکی زۆر بە کێشەکەی خۆیانەوە سەرقاڵ دەکەن.

سەیرو سەمەرەیی تاوانکاری بەعس لەوەدایە، هەمو کەس بەتاوانەکانیەوە دەگلێنێت، بەوانەشەوە کە رەخنەی دەکەن. بۆ ئەوەی شتێك لەسەر "تەبەعیەی ئێرانی" بنوسم، دەبێ مانایەك بۆ ئەم چەمکە بدۆزمەوە. دواتر هەم بیرم دەکردەوە نەوەك لانیکەم هێندێك لە راگوێزراوەکان وەلاو وەفاداری دوولایەنەیان بۆ عێراقو ئێران هەبێت

یا ڕۆژگارێك سـیخوریان بۆ ئێران کردبێتو بەوەش پاسـاوێك بۆ بەعس دادەتاشـم. پاشـان لە خۆم دەپرسی شێوازێکی سـەربەخۆ هەیە کە پشت بەتۆمارگەکانی پۆلیس ببەستێتو بانگەشەکانی بەڕاك بەدرۆ بخاتەوە، هەر چەندە دەشزانم ڕێگەیەك بۆ ئەو سـەلماندە نیە. نوسەرەکانی پێشو خۆیان بەمجۆرە کارەوە سەرقاڵ نەکردووەو لەوەش گرنگتر ئەگەر بمانەوێت راسـتی بڵێین، ئەوا پێیانوانەبو ئەو جۆرە کارکردنە زەروریی بێت. راگواستن پشت بەهیچ پێشینەیەك نابەستێت کە پەیوەندی بەبوونی ئێرانییەکانی عێراقەوە هەبێت. تێگەیشتنێکی گشتی وشیاری کردمەوە کە مامەڵە لەگەڵ درۆیەکی گەورەی شـەڕەنگیزانە دەکەم، بەڵام بەکردەوە دوو سـەد هەزار کەس راگوێزرابون. سـەرۆکی دەزگای هەواڵگری تاکە کەس بو بە بەکارهێنانی ئەو زانیارییانەی پێشـتر کەس بە بوونیانی نەزانیبو، کتێبێکی لەسەر ئەمە مەسەلەیە نوسیوە. بەڕاك بانگەشەی ئەوە دەکات کە بەدرێژایی دەیان سـاڵی رابردوو هەمو جۆرە تاوانێك کراوە بێئەوەی رەوانـەی دادگاکان کرابێـت، بەڵام ئـەو عێراقییانەی رەنگە شـتێکی پێچەوانە لەم بارەیەوە بزانن ئامادەنین لەبارەیەوە قسـە بکەن. هێندێك زرنگو رەخنەگر، هێندێك لایەنـی حەکایەتە رەسـمییەکەیان پێقبوڵ بـو، چونکە هۆیەکیان بـۆ قبوڵ نەکردنی شـك نەدەبرد. لە کۆتاییدا لەنێو ئەو پاشماوانەدا لە لێکۆڵینەوە بەردەوام بوم تا شتێك لە "پشـت" ئەم کێشـەیە بدۆزمەوە، بەڵام بۆچی بیر لەو فیکرانە دەکەمەوە؟ مرۆڤی لۆجیکی لەگەڵ راستییەکدا کە سەرلەبەری داهێنانێکی رووتە، زۆر زەحمەتە بتوانێت ژیان بگوزەرێنێ. لە کۆتاییدا ئەو توانایەی هەمومان تێوەدەگلێنێ، پێوەرێکە بۆ تاوانی زۆر گەورتر.

بێدەوڵەتی تەنها ئاسـتێکی دەرەکیی چۆنێتی رۆژانـەی هەمو هاوڵاتییەکی عێراقی بەعسـزدەیە. لەدنیای پڕ لە دەوڵەتی نەتەوەییـدا، تەنانەت ئەو کەمایەتییە جیاکارەش کـە سـەفەری دەرەوە دەکەن، بە بەردەوامـی بیر لەوە دەکەنەوە لە هەمو سـاتێکدا دەتوانرێ بیانگێرنەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان. هەمو عێراقییەك بارمتەی دەوڵەتە، چونکە پاسپۆرت بەشێوەیەك وەردەگیرێت کە لە هیچ وڵاتێکی دی دنیادا وێنەی نیە. دەشێت



بەڵگەنامەی باوەڕپێکراو لە هەر تاکێك وەربگیرێتەوە بێئەوەی پێشتر ئاگادار بکرێتەوە. کۆتوبەندێکی زۆر لەسەر سەفەری هاوڵاتیاندا هەیە، هەروەها بەشێوەیەکی هەڕەمەکی رێکدەخـرێ. رەنگە سـەفەرکردن بۆ هێندێك توێژ ماوەی چەنـد مانگێك یا رەنگە چەند سـاڵێك قەدەغە بکرێ. هێندێك لەوانەی داوای پاسپۆرت پێشکەش دەکەن، بێئـەوەی بەخۆیان بزانن ماوەیەك لە ئیدارەی پاسـپۆرت بەسـەرگەردانی دەمێننەوە، یـا بەناچارییەوە جارناجارێك داوا پێشـکەش دەکەنەوە. رێگـە نادرێ خوێندکارانی ئامادەیی لە دوو ساڵی کۆتاییدا سەفەر بکەن، دەوڵەت نەك تەنها پاسپۆرتیان پێنادات، بەڵکـو بروانامەشـیان پێنادات، بەوەی ئەو بروانامەیە کاتێـك دەگاتە دەرەوە گرنگی پەیـدا دەکات. بەهـەر حاڵ تەنها بەدەسـتهێنانی پاسـپۆرت بۆ سـەفەر کردن بەس نیە، لەبەر ئەوەی دەبێ عێراقییەکان ڤیزاش وەربگرن. کاتێك ئەوەی سـەفەر دەکات نیازێکی پشـتگیری نەکراوی هەبێت، بۆ نمونە سـەفەرکردن بەمەبەستی کارکردن یا خوێندن، ئیدی گرفتی راسـتەقینە دەسـت پێدەکات. لێرەوە پاسپۆرت بەشێوەیەکی ساختە تازەدەکرێتەوە، پاسپۆرتی شوێنە دوورەکان دەکڕنو هاوسەرگیری بەشێوازێکی ناتەقلیـدی دەکـەن. تەنانەت ئەو گەشـتیارانەش کە دەیانەوێـت بگەڕێنەوە یا دەبێ بگەڕێنەوە، پاسـپۆرتەکەیان وەك گیانی شـیرینی خۆیان دەپارێزن، یا بەجەسـتەیانەوە دەیبەسـتنەوە یا چاویـان دەبڕنە جانتاکـەی دەسـتیان. عێراقییەك نابینیـت بروانامە رەسـمییەکانی لە ئوتێل بەجـێ بهێڵێت، چونکە لە کاتی ونبوونیـدا دەرنایەتەوە. بە بەراورد لەگەڵ ئەو هەڵوێسـتەدا، دوورخراوەو پەنابەرە سیاسییەکان، ئەوانەی لەترسی رژێمـە دیکتاتۆرەکانی وەك کۆماری ئیسـلامیو ئێرانی شـا رایانکـردوە، بەڵگەنامە رەسـمییەکانیان وەك کارێکی بەڵگەنەویسـت لەگەڵ خۆیاندا دەبەن، ئەگەر هۆیەك بۆ قەدەغەکردنیان نەبێت. لە هیچ وڵاتێکی دی عەرەبیدا خەڵکی بەئەندازەی عێراق بەخسیری وەرگرتنی پاسپۆرت نیە، کاتێکیش بەدەستی دەهێننو دەرۆنە دەرەوە وەك بەردی دەستاڕ دەچێتە گەردنیانەوە.

ئەو هەمو ئومێدو ترسەی لە پێوەری بەدەستهێنانی ئەندامێتی لە دەوڵەتی عێراقییەوە

سەرچاوەی دەگرت، بەخاتری ئەوە بو کە چ فەرمانبەرو چ فەرمانڕەوا ئەو پێوەرانەیان بەجیدی وەرنەگرتبو. هەر چەندە رقو کینەمان لە ئاست ستەمو ناعەدالەتی فەرمانڕەواکان بەهێز بێتو هەر چەندە پێمان خۆش بێت لە ژیانی رۆژانەماندا لە سیاسەت دوور بکەوینەوە، دیسانەوە پەیوەست بوونمان بە دەوڵەتەوە لە مەسەلە سەرەکییەکانی پێوەری شارستانیبوون دەژمێردرێت. هەر دەوڵەتێك، تەنانەت ئەگەر دەوڵەتی عێراقی بەعسیش بێت، لە بێدەوڵەتی باشترە. هەمان هەستو ترسیش لە بێدەوڵەتی ئەو چەکەی داوەتە دەستی بەعسی عێراق تا بتوانێت لەگەڵ هاوڵاتیاندا بەو شێوەیە مامەڵە بکات.

## ئاینده وەك سەرچاوەیەکی دەسەڵات:

ئەو ئەندێشەو فیکرەی پێیوایە پێویستە دەسەڵاتی سیاسی لە رێکخراوێکدا چڕبکرێتەوە تا بەباشترین شێوە "ویستی نەتەوایەتی" بەرجەستە بکات، پەیوەندی لەگەڵ چەمکێکی دی لە یاسای ریفۆڕمی مافەکاندا هەیە، ئەویش: دەسەڵات هەمیشە یەکەیەکی کامڵەو بەهیچ شێوەیەك دابەش ناکرێو ملکەچی مەرجو میانگیری نابێت. "لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت یەك دەسەڵاتە، ئەوەش مانای رەتکردنەوەی "فرە دەسەڵاتی"، (دەسەڵاتی یاسادانان، جێبەجێ کردنو دادوەری) دەگەیەنێت"[30]، ئیدی گەورەیی‌و بچوکی قەوارەی ئەو رێکخراوەی جێگەی "ویستی نەتەوە" دەگرێتەوە، هێندە گرنگ نیە. بەپێی ئەم پێناسەیە ئەو رێکخراوە پێشتر ئەوەی سەلماندوە کە ئامانجی خەڵکی لەگەڵ ئامانجەکانی رێکخراوەکەدا یەکانگیرە، بەڵام ئەو ئەنجامگیرییەی شەرعییەت بە حوکم دەبەخشێت زۆر سەرسورهێنەرە:

"هەمو حیزبێك بە حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکیشەوە لە چاو هەمو دانیشتواندا جگە لە کەمایەتییەك شتێکی دی نیە... بەڵام کاتێك لەرێگەی ویستو رەفتاری



رۆژانەیەوە نوێنەرایەتی ویستی نەتەوە دەکات، کاتێك لە حیساباتی هەنوکەیی‌و ئایندەدا رەفتاری لەگەڵ ئامانجەکانی میللەت یەکانگیرو هاوئاهەنگ دەبێت، ئیدی زۆرینە پێکدەهێنێت"[31].

کاتێك "ویستی نەتەوە" وەك "بەرژەوەندییەکانی جەماوەر" ئاماژەی پێدەدرێ، ئەو حیساباتانەش لەخۆدەگرێ کە پەیوەندی بەگەشەسەندنی ئایندەوە هەیە. نابێت حیزب لەسەر ئەو کارە هەنوکەییانەی ئەنجامیدەدا حوکمی بەسەرا بدرێت، هەروەها سەبارەت بە بارودۆخو هەلومەرجی ئێستای خەڵکیش، دیسانەوە دادوەری دەربارەی حیزب کارێکی دروست نیە، لە هەر جۆرە هەڵسەنگاندنو دادوەرییەکدا، دەبێ کردەوەکانی داهاتو،و کاریگەرە سیاسیەکانی ئێستاو ئایندەی حیزب لەسەر خۆشنودیو ئاسایشی خەڵکی لە ئایندەدا لەبەر چاو بگیرێت. بەکورتی دەسەڵاتی سیاسی هەرگیز لە بابەتیبوونی خەڵکی کە لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا ژیان دەگوزەرێنن، سەرچاوە ناگرێ، تەنانەت ئەگەر ئەو خەڵکە بەعسیشی پێقبوڵ بێت.

"دەسەڵات لەپێناوی خودی دەسەڵاتدا پیادە ناکرێت، بەڵکو بەخاتری هێنانەدی ئامانجگەلێکی دیاریکراودا پیادە دەکرێ... شێوازی پیادەکردنی دەسەڵات وەکئەوەی دەستور دیاریکردوە، لە خودی خۆیدا کارتێکراوە بە واقعییەتی ئابوری، کۆمەڵایەتیو سیاسی ئەو وڵاتەی دەسەڵاتەکەی تیا پیادە دەکرێ. بەخاتری گرنگی ئەو دەزگایانە، پێویستە جەختی لەسەر بکرێتەوەو دەبێ لەیاسای سەرەکیدا دەستنیشان بکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بنەما سیاسی، کۆمەڵایەتیو ئابورییە، نابێت لەشێوەی داتاو زانیاری هەندەکیدا بێت، بەڵکو پێویستە بەشێوەی ئامانجێکی بەدیهێنراو یادبکرێتەوە. لەمرووەشەوە دەستور، رێنماییەکە کاری رێبەری سیاسیو بەرنامەی سیاسی ئایندە روونەدەکاتەوە کە رێبەری سیاسی لە رێگەی پیادەکردنی دەسەڵاتەوە بەدیدەهێنێت"[32].

بەو شێوەیە تەماشای دەستور ناکرێ کە کۆمەڵێك یاسای نەگۆڕەو حوکمی پەیوەندی نێوان دەزگاکان دەکات، یا واتەماشا بکرێ کە چاودێری یا کۆتێکە لەسەر

پیادەکردنی دەسەڵاتدا. دەستور وەك چەمك جیاوازی لەگەڵ بەرنامەی سیاسی حیزبدا نیە. گەڵاڵەنامەیەکە بۆ ئایندەو هێڵی بەیانیە لەپێناوی ئەوەی بەوێ بگات. هەروەها هیچ پەیوەندییەکی بەو شێوازەشەوە نیە کە ئیدارەی سیاسەتی پێدەکرێ. کاتێك دەوترێت "شۆڕش ناتوانێت پەیامەکەی لە بونیاتنانو هێنانەدی کۆمەڵگەیەکی هاوچەرخدا بەبێ تازەگەری لە بەهاکانی تاکو چەمكو رەفتاریان" بگەیەنێت، ئیدی پێوەری سەقامگیری حکومەت بێمانا دەبێت[33].

## بەرەو تاکێکی عەرەبی مۆدێرن:

لەکاتی داڕشتنی ریفۆڕمی مافەکاندا کە پێشتر هێندێك دەستەواژەیمان باسکردوە، دەپرسین بۆچی بەعسی عێراق وەك زۆرێك لە نیشتمانپەروەرانی شۆڕشی فەرنسا بەدوا رستە دەستیان پێنەکرد، ئەو رستەیەی دەڵێت "میللەت سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە؟"، چونکە بەعسییەکان دەیانتوانی "میللەت" بەو شێوازە ئامادەبکەن کە ئێستا کاری پێدەکەن.

هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێشینەیەی لەسەر یەکەم رستە لە زەینیاندا هەیە: "دەسەڵاتەکان... لە پێناوی مرۆڤدا پیادە ناکرێن". لێرەشدا فیکرە پراکتییەکە ئەوەیە کە "مرۆڤ" سەربەخۆیە لەو ئامانجانەی هەڵگرێتی یا هەڵیدەبژێرێت. بەعس ئەو بیرۆکە زاتییە جیاکارەی بۆرجوازییەت کە خاوەنی "مافی سروشتی"یە رەتدەکاتەوە، ئەو مافانەی لە هێندێك لایەنی ئەخلاقیدا لە واقیعی کۆمەڵو وەفاداری سیاسی بەرزترن[34]. ئەم دەسکەوتە نێوەندییەی سەردەمی نوێ هاوڕێ لەگەڵ بیرۆکەی ئەو دەسەڵاتەی لە ئەسڵدا لێڵو نادیارە، تەنها لەرێگەی ئەو کەسانەوە دوورخرانەوە کە بەناوی خوداوەندەوە قسە دەکەن. لە تێگەیشتنی بەعسیەکان لەسەر "مرۆڤ"، تاکەکان ناتوانن بوونێکی ئەخلاقی مانادایان هەبێت، مەگەر ئەوەی ببن بە



بەشێك لە کۆنکرێتی کۆمەڵگەیەك کە لەڕووی ئەخلاقیو خود ئاگاییەوە، بەخود وابەستە بێت. بیروباوەر جۆرێکە لە جۆرەکانی هاوشێوەبوون (تماثل)، هەروەها لەو وەسوەسەیەش دەچێت کە خاوەنی خودە (بەڵام رێگەیەکی دی، بیرۆکەی هەڵبژاردنی نێوان بیروباوەرە ئاڵوگۆڕەکان دەوروژێنێت). حکومەت یا دەوڵەت لەپێش تاکەکانەوە دێت نەك بەپێچەوانەوە، لەبەر ئەوەی ئەخلاقییەتیان دادەرێژێت، ئەم رایەش لە ئەنجامی خوێندنەوەی هۆبزەوە پێشنیازم نەکردوە، بەڵکو لە ئاکامی ئەزمونی عەرەبی ـ ئیسلامیەوە پێیگەیشتوم.

بەعس لەروبەروبونەوەی تاکگەراییدا جەخت لەسەر بەهای کۆمەڵایەتیو هەستی هاوکاری دەکاتەوە: یاسای ریفۆڕمی مافەکان دەڵێت: "بنەمای هەمو یاسایەك لە بواری مافەکانی کەسیتیدا، ئەفزەلییەت بە کۆمەڵگە دەدا، نەك بە بەرژەوەندی تاکەکان، چونکە دەوڵەت نوێنەرایەتی بەرژەوەندی کۆمەڵگە دەکاتو تاکەکانیش لەڕێگەی پرەنسیپی حوکمی ئیرادەوە نوێنەرایەتی دەکرێن... سەرئەنجام هەمو ئەو جیاوازیانەی نێوان پەیوەندییەکانی یاسای گشتیو یاسای تایبەتی ناهێڵێت کە رەگوریشەو بنەمای لەفیکری ئازادو سەرمایەدارییەوە چەکەرەی کردوە"[35].

راپۆرتی سیاسی ساڵی ١٩٧٤ حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی جەخت لەسەر پاکژکردنەوەی کۆمەڵگە لە ئاراستە وێرانکارەکان دەکات کە لە هەمو حکومەتەکانی پێشوتردا هەبوە، وەك نەبوونی هەستی نیشتمانپەروەرێتی، کەمتەرخەمی، نابەرپرسیارێتی بەرامبەر بە کۆمەڵو شتی دی. بۆیە پێویستە رۆحی نیشتمانپەروەرێتیو ئەرکی بەپەرۆشی وڵاتپارێزی بە مەبەستی بەرەنگاربونەوەی ئەو مەترسیانەی روبەروی نەتەوەی عەرەب دەبێتەوە، جێگەی ئاراستە وێرانکارەکان بگرێتەوە. ئەوەش چەمکێکە ناکرێ لە پێناوی بونیاتنانی کۆمەڵگەی هاوچەرخدا دەستبەرداری بین کە رێزو ستایش بۆ کاری بە کۆمەڵ بەپەرۆشو خۆبەخشییەوە تێیدا ئەنجام دەدرێ. وشەگەلێکی دی کە دەدرێتە پاڵ هاوڵاتیان بریتین لە هەستکردنو بەجیدی گرتنی پانعەرەبیزمو ئازایەتیو قوربانیدانو گیانی لەخۆبوردەیی. "ئەوەش ئەو کاراکتەرانە بون کە کۆڵەکەی ئەخلاقی

رەفتاری حیزبیان بە درێژایی ماوەی تێکۆشانی پێکیدەهێنا"[36]. ئاراستە دوژنکارو وێرانکارەکان کاتێك بوونیان دەبێت کە حکومەت گەندەڵ دەبێت یا کاتێك تاك لە بواری فیکرو جەستەدا بە کۆمەڵ نامۆ بێت یا لە ڕێگەی جیابونەوەی بۆ ماوەیەکی دورودرێژ.

سەدام حسێن ئەو رەگەزە گرنگە بەمشێوەیە دیاریدەکات:

"بەدەر لەو قسانەی ئێمە لەسەر ئەو هێزە دەرەکیانەی کە دژی شۆڕشەکەمانو بەشێوەیەکی گشتیش دژی میللەتی عەرەبو خەڵکی ناوچەکە پیلاندەگێڕن، بەڵام خۆپاراستنی سەرەکیمان، پاراستنی بەرگری کەسێتییە"[37].

لەسایەی حۆکمڕانی بەعسدا هەمو شتێك لەسەر سەرچاوەی دەسەڵاتەکان بەڕەئی ئەوان کێشەیەکی "ئاوارتەیەو زەرورەتی کۆمەڵگەیەك خولٌقاندویەتی کە لە حاڵەتی گۆڕاندایە". بەمشێوەیە ساڵانێکی دوورودرێژ لە ئاوارتەیی تێپەرین، بێئەوەی لەهیچ شوێنێکەوە ئامانج دیاربکەوێت. لەبەر ئەوەی ئەگەری دەرکەوتنی ئۆپۆزیسیۆن بەدیدەکرێ، ئەوا خۆپاراستن پێویستی بە پێشبینی هەیە تا پێشئەوەی درمەکە بتەنێتەوە، شێوازی لەتوانا بیگیرێتەبەر، بۆ ئەوەی بتوانرێت ڕێوشوێنی خۆپاراستنی گونجاو وەربگیرێت. ئیدی بەرپرسی جێبەجێکردنی دەسەڵاتی سیاسی، واتە پۆلیسی نهێنی دەتوانێت بەردەوام دەبێت لەسەر ئەو بەڵێنەی داویەتی بۆ دۆزینەوەو دەستگیرکردنی ستونی پێنجەمو سیخورە بیانیو تێکدەرەکان. لەگەڵ ئەوەی ناتوانن نەخۆشییە راستەقینەکە دەست نیشانبکەنو نەشتەرگەرییەکی تەواوی بۆ بکەن، بۆیە کردەوە پێشبینی کراوەکانیان هەرگیز کۆتایی نایەت. لەڕووی سیاسیشەوە ئەرکە تازەکەیان بریتیە لە پاراستنی پەیکەری حکومەت بە"شکڵی شەخسی"، بەڵام ئایا پاراستنی کەسێتی لە کۆمەڵگەیەکی هاوچەرخدا لەڕێگەی هاوپەیمانی بەردەوام لەگەڵ بیروڕای زۆرینە باڵادەست دەبێت؟ تازە بەعسییەك پێیوایە پرسیارێکی لەوجۆرە کارێکی ئاوەژۆیە، چونکە ئامانجی بەرنامەکەیان کێشکردنی جەماوەر نیە، بەڵکو گۆڕینی جەماوەرە.



گۆڕان بەپێی ئەو دیدەی کە "ناتوانێت ببینێت" بەگوتەی سەدام حسێن، یەکێکە لە خەسڵەتەکانی سروشتی مرۆڤ. "قەناعەتی تاکەکان تەنها لەبەر ئەوە نیە کە ئینتمایان بۆ خاكو زەوی هەیەو دەتوانن شتەکانی سەر زەوی وەربگرن"، بەڵکو مرۆڤەکان بەدرێژایی مێژوو منەی رۆحی ئەو شتانە دەکەن کە لەبەردەستیانە. مرۆڤەکان لەدێر زەمانەوە بەردیان داتاشیوەو رۆحیان خستۆتەبەر ئەو پەیکەرانەی کە خۆیان دروستیان کردوە. پێویستی زاتی بەو رۆحی منەکردنە، ئەو هێزە بوە کە پاڵیپێوەناون بەرەو مەزنتر بگۆڕێن.

"هەر چەندە باڵادەستیو زانستی مرۆڤ بۆ بینین زیاتر بێت، چێژی بەدەستهێنراویش زیاتر دەبێت، ئەو چێژەی لەسەرووی ئەو خاڵانەوەیە کە تێیدا گشت پێداویستییە مادییەکان تێر دەکرێن، ئیدی خەفەکردنی زیاتری رەگەزی مرۆڤ دەست پێدەکاتو خەڵکیش لە ئەنجامی ئەو هەمو دەسکەوتە ماددیانەدا هەست بە بۆشایی دەکەن... بەمشێوەیە دەبینین مرۆڤ هەمیشە تەماشای ئاسۆدەکات، بەڵکو زۆر لە ئاسۆ دوورتریش دەڕوات، تا دەگاتە بەرزترین لوتکە"[38].

ئەو نوسەرەی رۆژژمێری ژیانی سەدام حسینی نوسیوەتەوە، پێیوایە شۆڕشی بەعس "خەونێکی دوور مەودایەو بەردەوامیش دەگۆڕێت... کاتێك ئەم خەونە دێتەدیو بەرجەستە دەبێتو دەبێتە حەقیقەت، ئیدی پێویستە بەخەونی نوێو تێکۆشانی نوێ بەسەر ئەم حەقیقەتدا زاڵ بین"[39]. سەدام حسێن دەیەوێت ئیمان بۆ سیاسەت وەربگێڕێت، چونکە پێیوایە حەقیقەت لەبەر توانای مرۆڤ بۆ گۆڕان شتێکی جێگیرو نەگۆڕ نیە. سیاسەت تێکۆشانە، چونکە بەردەوام لەدژی حەقیقەتی وێرانکار لەنەبەردایە. دەبینین چۆن ئەو بیروباوەڕانە حەقیقەتی خەڵکی رەتدەکەنەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو خەڵکانەش بەپێی پێوەرەکانی بەعس دروست بوبن. ئێستاش چۆنێتی دەرونی تاك کە لە رۆحدا تواوەتەوەو نەتەوە ئاشکرای کردوە، هەمو شتێك لە جۆڵەیەکی بەردەوامدا بەجێدەهێڵێت. بەمشێوەیە دەوڵەتێکی یەکانگیر یا "ئاوارتەی کەسێتی" کامڵ بەهۆی سروشتی مرۆڤەوە، نەك بەهۆی دژایەتیکردنی دەرەکییەوە،

هەرگیــز نایەتــەدی. ئەم ئەنگیزەو حــەزو ئارەزووە، ئاوارتەکان کــە ئەمرۆ لە عێراقدا بەربڵاوە، دەکاتە شتێکی ئاسایی.

سەدام حسێن دەربارەی خۆی و عێراقی هاوچەرخ قسەیدەکرد. پێویستە ئەوەشمان لەیاد بێت کاتێك ئەو قســانەی دەکرد هەمو خەڵکی لەناو لەپیدابو، رێك وەکئەوەی بتێك لەبەردەست دروســتکارەکەیدا بێت. رەنگە ئەو رۆحەی حەزیدەکرد بیبینێت، ئەو بتە دروســتکراوەی لێبەرهەم بێت کە هەرگیز نەتوانێت چیاکان لە شــوێنی خۆیدا بجوڵێنێــت. لەگەڵ ئەوەشــدا ئەوەندە هێزی خەیاڵی بەلاوە گرنگ بو کە لە پشــت هەمــو کارێکی هونــەری مەزن یا بیرۆکەیەك یــا داهێنانێکەوە بوونــی هەیە. واقیعی پێشــبینی نەکراوی ئەو خەڵکە دەبێتە مایەی بێزاری بەعســیەکان کە هەرگیز خەڵکی بەو شــێوەیەی هەیە، پێیان پێقبوڵ نەبێت. بەعســییەکان لە جیاتی ئەوەی وەك هەر مرۆڤێك کە رقی لە مرۆڤ دەبێتەوە پاشەکشێ بکەن، سیاسیانە مامەڵە لەگەڵ میللەتدا دەکەنو ئەوانەشی لەگەڵ ئایدیا باڵاکانیان یەکناگرنەوە، کارکەنار دەکرێن. لە هەمان کاتیــدا هێزی پڕ خەیاڵیان کە لێوان لێوە لە نەفرەتکردن لە مرۆڤ، پەیوەندی لەگەڵ مرۆڤە ئاساییەکاندا ئەنجامدەدا.

## چاوخشاندنەوە بە حیزبو دەوڵەت:

دەوڵەتی بەعس بەوپەڕی سادەییەوە ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگەیەکی هاوچەرخو ئەفراندنی کەســی عەرەبی کە بەهاو تێگەیشــتنو رەفتــاری دیاریکراوی تایبــەت بەخــۆی هەبێت. ئەو ئایدیا باڵا دوور دەســتەی چەمکــە قوڵەکانی حیزب لەســەر خــۆی رووندەکاتەوە، وەك مۆتۆرێك دەگاتە شــتێکی باڵاتر لــە پیادەکردنی دەســەڵات "لــە پێناوی خــۆیو بۆ خودی خۆی بێــت". هەروەکــو تێبینی دەکرێ ئامانجەکانی حیزب لە دەوڵەت جودایە، ئەمەش پێچەوانەی رژێمی فاشیســتی ئیتاڵیا



بو سەبارەت بە دەسەڵات، چونکە فاشییەکان بەهایەکی رەهاو هێزێکی رۆحی زاڵیان بەدەوڵەت بەخشــیبو. مۆســۆلۆنی پێیوابو کە تاکەکانو گروپەکان تەنها لەبەر ئەوەی لەناو دەوڵەتن "بیریان" لێدەکرێتەوە[40]. بۆیە ئایدیای فاشیســتی لەگەڵ ئامانجەکانی بەعســدا هاوئاهەنگ نیەو بەرنەفرەت دەکەوێت، بەڵام لە بیرکردنەویاندا لە ئامانجی نازییەکانەوە نزیکترن، بەوەی کە دەسەڵاتی سیاسی ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە نەژادێکی بێگەردو تەنها جیاوازییان لەگەڵ نازییەکاندا ئەوەیە کە بینای میللەت لەسەر بیروباوەر دەبێــت نەك نــەژاد. بیروباوەر "پەیامێکــی هەتاهەتایی" نەتــەوەی عەرەبە کە ئیمان بەحیــزب دەهێنێتو هەمان بیروباوەڕیش کلیلێکە بۆ هێنانەدی نەتەوەی عەرەبی پاکو بێگەردو دوور لە گەندەڵی.

یاسای ریفۆڕمی مافەکان دەیەوێت "دیدێکی دی بۆ دەزگای دەوڵەت هەبێت... تابتوانێــت بەتەواوەتی فرمانەکانــی رێبەری حیزب جێبەجێ بــکات"[41]. کاتێك لە بەڵگەنامــەکان وردەبینــەوە، دەبینین کە دەوڵەتی بەعس ئارەزوی ئــەوەی هەیە ببێتە ئۆرگانی تەکنۆکراتی ئیداریو ناسیاسی کۆمەڵگەو نیازێك جێبەجێ دەکات کە پێشتر لەلایەن دەســەڵاتی سیاسییەوە دارێژراوە. دەسەڵاتی سەرۆکایەتی لە گشت دەوڵەتەوە ســەرچاوە ناگرێ، بەڵکو لە بەشــێکییەوە ســەرچاوە دەگرێ، ئەوەش پۆلیسی نهێنیە کــە تۆڕێك لە هەواڵگــری حیزب کۆنترۆڵی دەکات. هەواڵگری لە هەمو دەزگاکانی دی زیاتر تێکەڵاوی سیاســەت دەبێتو سیاســەتە دوور مەوداکانی حیزب جێبەجێ دەکات، بەڵام کاروبارەکانی دی لەبابەت کۆکردنەوەی خاشاكو ئیدارەی پرۆژەکانی بیناســازی بۆ فەرمانبەرانی دەوڵەت بەجێدەهێڵرێتو بەوپەڕی وریاییشــەوە چاودێرێ دەکرێن.

جیاکردنــەوەی تیوری نێــوان حیزبو دەوڵەت لە دەســەڵاتی ســتراتیجی توانای دەوڵەت بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی حیزبی بەعس کەمناکاتەوە، بەڵام رێگەدەدرێ بۆ نمونە وەزیرە کورد یا شــیوعییەکان کار لەو کابینەیەش بکەن (هەروەکو لە ســاڵانی یەکەمــی حوکمڕانی حیزبی بەعســدا ئــەو کارە رویدا)، چونکە ئــەو وەزیرانە تەنها

بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش جێبەجێ دەکەن، ئەو ئەنجومەنەی سەد دەر سەد بەعسی بوون. ئێستا لەتوانادا دەبێت جۆرێك "رەخنە لەخۆگرتن" ئاراستەی ئیدارە یا کەموکورتییەکانی حکومەت بکرێ. ئەمجۆرە رەخنە لەخۆگرتنە ناسیاسیترین فۆرمـی رەخنەگرتنەو تایبەتە بەو رژێمانەی هەڕەشـە لە سیاسـەت، حیزبەکانی دی، کەمایەتـی، گروپە هەمەڕەنگە سروشـتییە مرۆییەکانو تاکـەکان، دەیبینێ. دەوڵەت جگە لە ئامرازێك کە لە خزمەت گۆڕانێکی بەردەوامو هەمیشـەییە شـتێکی دی نیە. رەنگە ئەزمون کاریگەری هەبێت لەسـەر دەسـتور، هەرێمە جوگرافی ـ ئیدارییەکانی عێراق، ژمارە، ناوەکان، ئەرکی وەزارەتەکانو رێکخراوە حکومییەکان. هیچ دەزگا یا رۆتینێك پیرۆزو موقەدەس نیە. هەمان جۆشو خرۆشو مەستبوون بە گۆڕانی بەردەوام بەشێوەی رێژنە فەرمانو رێنماییەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق لەسەر هەمـو شـتێك دەردەکەوێت: بڕیارەکانی کار، سیسـتمی نەختینـە، کۆتو بەندی سـەفەرکردن، دامەزراندنی دەوڵەتی لەسەر ئاستی پلیکانەی دەسەڵات، رێکەوتنە نێو دەوڵەتییەکان، راگەیاندنی سزای لەسێدارەدان بەهۆی نوسینی دروشمێکی سەر دیوار، گۆڕانی رێوشـوێنی موچەی خانەنشـینی فەرمانبەرانی دەوڵەت، ئامادەکردنی لیستی ناوی ئەو کەسـانەی ئامادەیی تەواو دەکەنو لە زانکۆکان وەردەگیرێنو دیاریکردنی ئەو ئەفسەرانەی لە هێزی سوپا وەردەگیرێنو هتد.

کاریگەری سـەرەکی ئـەو هەمو بڕیارانەی لە سـەرۆکەوە دەردەچـون، بەمانای ناسـەقامگیری دەسـەڵاتی دەوڵەتو داروخانی ئەو بیروباوەڕەشـە کە پێیوایە گشت پلەبەندی وەزیفی دەزگاکان بەشێوەی یاساییو لەسەر لێهاتویی بونیات نراوە. هەمان ئەو کارەی کە رۆژگارێك بەسـەر سـوپادا هاتبو (بڕوانە بەشی یەکەم)، ئێستا بەسەر بەهەمـو شـتێکدا دێت، بـەکارە ناچیزو بێبەهاکانەوەو سیاسـەتیش لە هەمو شـتێك دادەماڵێت. دەرئەنجام ئەو دیدە سروشـتییەی کە دەوڵەت پێگەی دەسـەڵاتی تاكو توێژەکانە، دیدێکی هەڵەو نادروسـتە. رێبەر لەڕێگەی حیزبەوە کۆنترۆڵی هەمو شتێك دەکاتو تارادەیەکی باشیش خۆی دوور رادەگرێت.



جیاکردنـەوەی نێـوان حیـزبو دەوڵەت رێگە بـە هاوڵاتی ئاوارتە دەدا سـود لە جۆرێکی تازەی دیموکراسـی وەربگرێت کە یەکێکە لـە داخوازییەکانی کۆمەڵگەی شۆڕشـگێڕ. هەڵبەتە پێویسـتیمان بەوەش نیە باس لەوە بکەین کە ئەم "دیموکراسـی میللییـە" جیاوازی گەورەی لەگەڵ دیموکراسـی لیبراڵدا هەیـە کە چینی بۆرجوازی کۆنترۆڵـی دەکات"[42]. بەعسـیەکان مافـی ئەوەیـان هەبـو لەرێگـەی رێکخراوە جەماوەرییەکانو ئەنجومەنە میللیەکانەوە کە یەکەمجار بەپێی راپۆرتی سیاسـی ساڵی ١٩٧٤ دامەزرا، رای خۆیان دەربڕن. هەر چەندە یاسای ریفۆرم هەوڵیدەدا پەیکەرێکی رەسـمی پێببەخشـێت، کەچی ئەو ئەنجومەنانە تا ئێستاش جێبەجێ نەکراون، بەڵام ئەو فیکرەی لە پشـتەوەیەتی بەجیدی ئەوە روندەکاتەوە کە حیزبی بەعس لەباشـترین حاڵەتی راستگۆیدا ئومێدەوارە لە عێراقدا بیهێنێتەدی.

ئەنجومەنـەکان "پەیوەندی نێوان دەزگاکانی دەوڵەتو جەماوەر بەهێز دەکەن... لەرێگـەی کێشـکردنی زۆرێك لە خەڵکی بە مەبەسـتی بەشـداریکردن لە ئیدارەی دەوڵەتو بەستنەوەو گرێدانی نێوان پێداویستیە خۆماڵییەکانو ئەرکی گشتی دەوڵەت، ئەو کارە ئەنجام دەدرێ". بەمشـێوەیە "ئەنجومەنە میللییەکان هەڵدەستن بەجێبەجێ کردنـی ئەرکە ئابـوری، کۆمەڵایەتیو کولتورییەکان یا ئـەو چالاکییانەی مۆرکێکی خۆماڵییان هەیەو بەشداری لە جێبەجێکردنی پلانی ئابوریو بودجەی یەکە ئیدارییەکانی نێو چوارچێوەی پلانی ئابوری نەتەوەییو بودجەی دەوڵەت دەکەن"[43].

ئەنجومەنەکان کاری هەڵبژاردنی نەتەوەیی ناکەن (لە شوێنێکی دی باس لەوەکراوە کە زۆنێکی سـەربەخۆو جودای رێبەری سیاسـییە)، بەندەکانی دی یاسـای ریفۆرم دەسەڵاتی چاودێریو ئیداری هەڵبژاردنی ئەنجومەنەکانو کاری رۆژانەیان بە دەسەڵاتی سیاسی دەسپێرێتو رێنماییشیان بۆ دەردەکات تا جێبەجێی بکەن. ئەو دەسەڵاتانەش بریتیـن لە پوچەڵکردنەوەی بڕیاری ئەنجومەنەکان، کار کەنارکردنی سـەرۆك یا هەر ئەندامێکـی دی ئەنجومـەن "بەهۆی سـەرپێچییان لە هێڵە گشـتییەکان". بەکورتی ئەنجومەنە میللییەکان رێکخراوی جەماوەرینو حیزب بەریوەیدەبات. ئەم ئەنجومەنانە

لەپاڵ ڕێکخراوە جەماوەرییەکانی دی (یەکێتی کرێکاران، ژنانو گەنجان)، ئەرکێکی تایبەتیو دیاریکراویان هەیە، ئەویش مۆبیلیزەکردنی هەمو میللەتە لە چالاکییەکانی دەوڵەتدا، ئەم ئەرکەش تا هەنوکە لەعێراقی بەعسدا بەئەنجام نەگەیشتوە.

ئەستەمە بەشێوەیەکی پراکتیکی حیزب لە دەوڵەت جیابکرێتەوە. ئارەزویەکی زۆر بۆ تێکەڵکردنی بەردەوامی تاکو دەزگا دەوڵەتیو حیزبیەکان هەیە. ئەم لێکدانو تێکەڵکردنە لەدوای ڕێکخستنەوەی دەزگای پۆلیسی نهێنی لە ساڵی ١٩٧٣دا هاتەدیو دەزگای هەواڵگری تێکەڵ بەسیستمی ئەمنی دەوڵەت ـ حیزب بو. هەروەها کاتێك سوپا بە بەعسیکرا، ئیدی دەیتوانی لەگەڵ پۆلیسی نهێنیدا کار دابەش بکاتو هەمو ئەو سنورانەش لابران کە دەبونە مایەی کێبەرکێی نێوان ئەو دوو دەزگایە. کاتێك سەدام حسێن ساڵی ١٩٧٩ پرۆسەی پاکتاوکردنی لە سەرکردایەتی قوتری ئەنجامداو خۆی بو بە سەرۆکی، ئیدی لێکدانو تێکەڵکردنی حیزبو دەوڵەت فۆڕمی پرۆسەی پاکتاوکردنی وەرگرت. پێشتر قسەمان لەسەر ئەو ڕێبەرە کردوە کە لە ئانوساتی گونجاودا دەردەکەوێت، هەروەها ئەوەمان باسکردوە کە دەبێ ئەوە پەیوەست بێت بەجیاکردنەوەی نێوان ئەرکی ئەفراندنی ئایدیۆلۆجیای حیزب (بریتیە لەکاری سیاسی) کە ئێستا لەژێر کۆنترۆڵی ڕێبەری دەرە هەڵەیەو ئەرکی کۆمەڵایەتیش لەژێر دەستی ڕێکخستنی حیزبدا بمێنێتەوە. ئێستا ژمارەی ئەندامانی حیزب دەگاتە دە دەر سەدی دانیشتوان، ئەمەش کەمێك لەنیوەی دانیشتوان کەمترە (هەر یەکێکیان نزیکەی ٤ ـ ٥ کەس بەخێودەکات). لەمڕووەوە ناسنامەی خەڵكو حیزب (پێشتر تەنها بیرۆکەیەکی نامۆ بو)، بە بەراورد لەگەڵ ئەو واقیعەی سەرەوە، بوە بەنیمچە ڕاستییەك. لە ڕاستیدا دەسەڵاتەکانی ڕژێم کە لە "میللەتەوە سەرچاوە دەگرێ"، لەلایەن حیزبەوە ڕێکدەخرێ. ناسنامەی کۆمەڵگەی مەدەنی بەفلتەری حیزبەوە تێدەپەڕێت. ئەم دەسەڵاتە لەڕێگەی ڕێکخراوە جەماوەرییەکانەوە بۆ حیزبو ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش دەگوێزرێتەوەو دواتریش بەشێوەیەکی شەرعی لە کەسایەتی خودی ڕێبەر بەرجەستە دەبێت. سەرۆکایەتی کۆماری سەدام حسێن لە واقیعدا وەرگرتنی دەوڵەت



بو لەڕێگەی حیزبەوە. لە کۆتاییدا کودەتاکەی ساڵی ١٩٦٨، لەڕێگەی زۆرینەی خەڵکەوە شەرعییەتی بەدەستهێنا. هێشتا دەزگای دەوڵەت وەرنەگیرابو (ساڵی ١٩٦٨ ڕویدا)، بەڵام شەرعییەتی دەوڵەتی عێراق پێش ساڵی ١٩٦٨ فیشەکی بەزەبیان پێوەناو لەگەڵیدا گیانی سپارد، پێشئەوەی برینەکەی ئازاری بدات، وەك ئەو حاڵەتەی بەسەر وڵاخێکی قاچ شکاودا دێت. هەڵوەشانەوەی ئەوەش ئاماژە بەوە دەکات کە یاسای ریفۆڕمی ساڵی ١٩٧٧ لەواقیعدا لەگەڵ پاکتاوکردنەکانی ساڵی ١٩٧٩دا چۆە بواری جێبەجێ کردنەوە. لەهێندێك وڵاتی دی دەکرێ ئەمجۆرە کارانە لەڕێگەی هەڵبژاردن یا شۆڕشەوە بێتەدی.

## کۆبەندی:

بۆچی ئەنجومەنی سەرکردایەتی گرنگی بە دەرکردنی یاسای ١٩٧٧ دەدا، ئەمە لەکاتێکدا دەیتوانی یاسای نهێنی دەربکات؟[44]. چونکە بەعسیەکان خۆیان بەخەڵکی جیدی دەزانی، بەدەگمەن کاتی خۆیان بە بیروباوەری میانڕەوە بەفیرۆ دەدا، کە مایەی گاڵتەجاریو ڕوپامایەیەکی درۆزنانە بێتو کردەوە ئەخلاقییەکانیان لەپەڕگیریدا قەتیس دەبو: لەلایەکەوە ئەوپەڕی باش، وەك عروبەو سۆسیالیزمو تێکۆشان، لەلایەکی دی زۆر خراپ، بۆ نمونە ئیمپریالیزم، بەکرێگیراوی دەرەکی، زایۆنیزمو کۆنەپارێز. جیاوازی بەعسیزم لەگەڵ ئاینە ئاسمانییەکاندا لەوەدایە کە ڕۆحانییەتی دەسەڵاتی لە ئاسمانەوە وەرناگرێت، بەڵکو لە نەتەوەدا بوونی هەیە". ئەوانە پێویستیان بەڕوونکردنەوەی ئەو داواکارییە هەیە، لەبەر ئەوەی ئەو مەسەلەیەی ئەوان مەبەستیانە، بریتیە لە نمایشکردنی بیروباوەری ناوخۆیی حیزب، واتە بەپیرەوەچونی قێزەونانەی دەرەبەرگری بەعس لەپێناوی ئەوەی پاساو بۆ کردەوەکانیان بهێنەوەو لەگەڵ حکومەتەکەی خۆیانو نەریتی سیاسیان هاوئاهەنگ بن.

بەداخەوە هەلومەرجی دەسەڵات لە ئەمڕۆی عێراقدا لەسەر ئەو گریمانەیەیە کە عەقڵانیەتی بەعس لەکن زۆرینەی عێراقییەکان جێگەی مشتومڕ نیە. حیزب تا ئەو رادەیەی خۆی بەجیدی وەردەگرێت، لەلایەن ئەوانەشەوە کە بونەتە جێگەی گرنگی پێدانی بەجیدی وەردەگیرێت. زۆرینەی خوێندەوارانو روناکبیران زۆربەی ئەو فیکرانەی بەعس ـ ئەگەر نەڵێین هەموی ـ کە لەسەر نەتەوەیە وەك بەڵگەنەویست وەردەگرن. زۆر زەحمەتە جەخت لەسەر ئەوجۆرە گریمانەیە بکرێ، ئەگەر مرۆڤ لەژیانی رۆژانەیدا بەشداری تیا نەکاتو تێیدا نەژی، بەڵام نەبونی لێکۆڵینەوەو رەخنە بو بە مایەی ئەوەی مۆری قبوڵکردن لەسەر پرەنسیپەکانی یاسای ریفۆرم بدرێ. دەتوانرێ ئەوەش بوترێ کە خودی لێکۆڵینەوەو رەخنەگرتن قبوڵکردنی ئەو پرەنسیپانە دەخەنە ژێر پرسیارەوە، بەڵام لێکۆڵینەوەو رەخنەگرتن ناتوانن ئەو گۆڕانە دروستبکەن، تەنانەت بەرەی ئۆپۆزیسیۆنی دەوڵەتی عێراقیش ئازایەتی ئەوەیان نیە نکۆڵی لە گرنگی ئەو پرەنسیپانە بکەن، هەر چەندە نەفرەتی خۆیان لە حیزبی بەعس ناشارنەوە.

کەواتە ئەم پرەنسیپانە لە چ نەریتێکەوە سەرچاوەیان گرتوە؟ بۆچی ئەو هەمو خەڵکە زۆرە قبوڵیان کردوە؟ چۆن بون بە سەرچاوەی شەرعییەتی بەعس لە عێراقدا؟ ئەوانە پرسیاری مێژوویین کە بەتەواوەتی لە لێکۆڵینەوەی چییەتی پرەنسیپەکاندا جیاوازە، هەروەها مەبەست لەم لێکۆڵینەوەیە چارەسەرێکی یەکلاکەرەوە نیە، بەڵکو تەنها دەمەوێت هێندێك رووی لێکچو باسبکەمو ئاماژە بەهێندێك توخم بکەم کە دەشێت لایەنێکی بەشدار بێت لەم بابەتەدا.

## پێرست

1 ـ ئەم هەڵسەنگاندنە لەم بەرهەمەی خوارەوە وەرگیراوە:
A. Hottinger. "personality Cult and Party in Iraq", Swiss Review of World Affairs (June), 12.

2 ـ سەبارەت بە بلوزی قۆڵ کورت (تی ـ شێرت)، بڕوانە رۆژنامەی کریسچن ساینس مۆنیتۆر، ژمارەی ٢٠ / تەموز / ١٩٨٤. وێنەی سەدام لەسەر رووی کاتژمێر، لەم سەرچاوەی خوارەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوەو وێنەکەی چاپکراوە:
National Geographic 167, no. 1. January, 1985

ناونیشانەکەیشی بەمشێوەیەیە: "روخساری نوێی بەغدا".

3 ـ سەدام حسێن دەیوت: ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر لەجێی باوکێتی. تەها یاسین رەمەزان، ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتیش لە هاوینی ١٩٨١دا سەدام حسێن بە کوڕی بەکر ناو زەدە دەکات. بڕوانە چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ کریستین موس هەڵمز لە:
Iraq: Eastern Flank of The World (Washinton. D. C . Brookings Institution. 1984), 95.

4 ـ هانا ئارێنت ئەم دیاردەیەی لە بەرهەمە پڕبەهاکەی خۆی "سەرچاوەکانی تۆتالیتاریزم" شیکردۆتەوە:
Hannah Arendt, The Origins of Totalitarianism (New York, Harcourt Brace and Jovanovich, 1973), 364 – 88.

5 ـ یەکەمین راڤەکردن بۆ سەرکوتکردنی زەمینەخۆشکردنی کودەتا لە نیویۆرك تایمز بەچاپگەیەنراوە، ژمارە ٢٧/ ئوکتۆبەر/ ١٩٨٣. لەدوای ساڵێك راڤەکردنێکی نوێ لە کریسچن ساینس مۆنیتۆر چاپکراوە. ٢٠ / تەموز/ ١٩٨٤.

6 ـ ئەم لێکدانەوەیەی هاتینگەر لە فاکتەوەیە (Personality Cult).

7 ـ ئەم سەرجەلەیە لە بیوگرافی نیمچە رەسمیشدا هاتوە: ئەمیر ئەسکەندەر، سەدام حسێن: تێکۆشەر، بیرمەندو مرۆڤ (پاریس هاشت ١٩٨١، ٢١).

8 ـ ئارێنت، سەرچاوەکانی، ٣٨٢.

9 ـ سەدام حسین دەیزانی کە پەیوەندی لەگەڵ حیزبدا، بنەمای جیاوازی نێوان خۆی و جەمال عەبدولناسرە. ساڵی ١٩٧٨ ئەم گفتوگۆیەی خۆارەوەی لەگەڵ کاسترۆدا کردوە:
کاسترۆ: رۆژگار لە بەرژەوەندی عێراق دەچەرخێ، چونکە ئێوە هەمو وڵاتان گۆڕیوە. ئێوە خەڵکیتان مۆبۆلیزەکردوە. ئەم کارەش لەمیسر ئەنجام نەدرا.
سەدام: هیچ حیزبێکی شۆڕشگێڕ لەمیسردا نەبو. تەنها ناسر هەبو. ئەو خۆی شۆڕشگێر بو، بەڵام بارودۆخی ئەو لەگەڵ بارودۆخی ئێوە لە کوبا جیاوازی هەیە، ئێمە پێشەوەی بەدەسەڵات بگەین، شۆڕشێکمان لە عێراقدا ئەفراند، ئەوەی شۆڕشەی ناسر نەیتوانی بیکات. حیزبمان قوربانیو شەهیدی داو ژمارەیەکیشمان زیندانی کرانو ئەشکەنجەیان چێژت. ئەوانەش بۆ فەراهەمکردنی شۆڕشگەلێك کە شێوازی پاراستنی شۆڕش بزانێت کارێکی زەروری بو. لە ئەسکەندەر، سەدام حسێن: ٢١٤، وەرگیراوە.

10 ـ هەمان بەشەکانی ٣ ـ ٧.

11 ـ مارشاڵ هاجسۆن حکومەتەکەی حەجاج یوسف بە (ترسی بێپەردە) وەسفدەکات، بڕوانە:

The Venture of Islam (Chicago University Press; 1974), 223.

دائیرەی مەعاریفی ئیسلام وشیارانەتر کاریکردووەو دەنوسێت ئەو ئەفسانانەی لە حکومەتەکەی دایە پەیوەندی بەترسەوە هەیە، لەم بوارەدا زیادەڕەویی تێیدا کراوە. هەڵبەتە ئەگەر هەر یەکێك لەو دوو حەکایەتەی بە نمونە هێناومانەتەوە قبوڵ بکەین، جیاوازییەکی ئەوتۆ ناکات.

12 ـ ئەم وشــانە لە وتاری ئەی. بارام دا هاتوە: "نەتەوایەتیو نیشــتمانپەروەرێتی لە عێراقی بەعســدا: گەڕان بەدوای هاوسەنگییەکی تازەدا، لێکۆڵینەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ١٩، ژمارە٢، (ئەپریل ١٩٨٣)، ١٩٤.

13 ـ یەکەمجار ئەم حەکایەتە لە "مەواقیفی ئەدەبی"، بەیروت ژمارە ٩ (کانونی دووەم ١٩٧٥) ئاشــکرا کرا. پاشــان لە "کوردســتانی ئازاد" لەندەن ژمارە ٦، کانونی یەکەم ١٩٧٥، چاپکرایەوە. ســاڵی ١٩٧٥ گۆڤاری "ئەلمەواقیف" لە (ژمارەکانی ٣٠ ـ ٣١)دا لەگەڵ ڕاڤەکردنێکدا واقیعی دەستگیرکردنەکەی بڵاوکردەوە.

14 ـ کریســتین موس هێلمز، پســپۆڕێکی لێهاتــوە. بڵاوبونەوەی کتێبەکەی هــاوکات بو لەگەڵ کردنەوەی بالوێزخانــەی عێراق لە واشــنتۆن کە لە ســاڵی ١٩٦٧ەوە داخرابــو. ئەم کتێبە لەلای بەعســییەکان ئەوەندە مایەی دڵگەرمی بو کە ژمارەیەکی زۆریان ســەندو بە خۆڕایی دابەشــیان دەکرد. خانم هێڵمز دەڵێت ســەدام حســێن کەســێکی بەرژەوەندگەرایەو عێراقییەکی واقعییەو "زۆر بەراشــکاوی ئایدیایــی دەوڵەتی یەکگرتویی عەرەبی وەلاوەخستۆە". لەپاڵ ئەوەشدا هەڵویستی توندی عێراق سەبارەت بە ئیسرائیل لە "چەمکی ئایدیالی یەکبونەوە" بەرجەســتە دەبێت، بەمشــێوەیە بەعســی دوو هەڵویســتی ناکۆکو دژ بەیەکــی هەیە: یەکەمیان هەڵوێستی ئایدیالی کە هێڵمز داوا لە خوێنەرانی دەکات ئەو هەڵویستە بەجیدی وەرنەگرن، دوەمیان هەڵوێستی بەرژەوەندگەرای ســەدام حســێنە کە دەبێ ئیدارەی ئەمریکی بەجیدی وەریبگرێت. بڕوانە باڵی ڕۆهەڵات، ١١٠ ـ ١١٤.

15 - Bernard Lewis, Islam: From the Prophet Muhammad to the Capture of Constantinople. Vol. 1: politics and war (New York, Harper and Row, 1874), 23 – 24.

16 ـ کاتێك خەڵکێکی زۆر لە تاکە کەسێکدا یەکدەگرێت پێی دەڵێن کۆمۆنوڵس.

17 ـ هەمان سەرچاوە لە ١٨٨ تا ٢٥٢ بەریز.

18 ـ ســی. بی. ماکفرسۆن ئەم کەموکورتییەی لە شــیکردنەوەی هۆبز ڕوونکردۆتەوە. بڕوانە پێشەکییەکەی لە چاپی پەنگوین. ل٥٥ ـ ٥٦.

19 ـ هۆبز لیفیاتان.

20 ـ هانا ئارینت لە وتاری توندوتیژیدا، لەنێوان دەســەڵاتو ترســدا هێڵێکی یەکلاکەرەوە دەکێشــێت، ئەم جیاوازییە بەشێوەیەکی نادیار لە هۆبزیشیدا دەردەکەوێت. بڕوانە

Crisis of Republic (New York, Harcourt Brace and Jovanovich, 1972).





21 ـ ژیانی سیاســی لە ئەرجەنتیندا لەدوای هەڵبژاردنەکەی ســاڵی ١٩٨٣ بریتی بو لە ئاوێتەیەك لە یادەوەری چەند ساڵەی ترسو تۆقاندن لە سایەی حوکمی سەربازەکاندا. تا ئێستاش ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێبو فیلمەکان زۆر شت دەربارەی کردەوە دڕندانەکانی سوپا ئاشکرا دەکەنو لەڕوانگەی یادەوەری قوربانییەکانەوە دەپرسن، چۆن ئەم هەمو شــتە ڕوویاندا؟ بۆچی زۆرینەی ئەرجەنتییەکان لەســەر ئەو کردەوانە بێدەنگ بون؟ ئەســتەمە مرۆڤ لە کاریگەری مەســەلەی بەرپرســیارێتی ئەرجەنتییەکان، بەتایبەتی لەکاتی دادگاییکردنی سەرانی سوپا کە ماوەی هەشــت مانگی خایاند، زێدەڕەوی بکات. ئەو هەشــت بڕیارەی دوای دادگاییکردنەکەش نەبوە هۆی ڕاگرتنی ئەو شــۆکە ئەخلاقییەی کە لەدوای دەرکردنی هەر دوو فیلمی "حەکایەتی ڕەســمی"و "ماچی ژنە جاڵجاڵۆکە" توشــی خەڵکی بو. حەکایەتێکی تازە لە کەشــوهەوای ئەرجەنتینێکی نوێ لەلایەن جاکۆبۆ تیمیرمــان بڵاوکرایەوە، کە یەکێك بو لە ئەشــکەنجەدراوەکانی حوکمی میلیتــاری. بڕوانە وتاری "گەڕانەوە بۆ ئەرجەنتین، نیویۆرك تایمز ماگەزین، ١١ مارسی ١٩٨٤ لە ٣٦ ـ ٩٩.

22 ـ یاســای ژمارە ٣٥ ی ســاڵی ١٩٧٧: یاســای ریفۆرمی مافەکان ـ وەقائیعی عێراقی ـ ٢٠ ـ ژمارە ٣٧، ١٤ئەیلول/ ١٩٧٧، ٢١.

23 ـ سەدام حسێن دەربارەی کاروباری هاوچەرخ، بەغدا ، لەبڵاوکراوەکانی ئەلسەورە (١٩٧٤)، ١٢.

24 ـ سەدام حسێن: دەربارەی ڕووداوە هاوچەرخەکانی عێراق (لەندەن، لونگمان ١٩٧٧)، ٣٥ ـ ٣٦.

25 ـ یاسای ریفۆرمی مافەکان ژمارە ٣٥، ئەلوەقائیع ٢٠، ژمارە ٣٧ (١٤ / ئەیلول / ١٩٧٧)، ٢٩ ـ ٣٠.

26 ـ ســەرئەنجام یاساکە بەمشــێوەیە دەخوێنرێتەوە: "هەر کەســێك پروپاگەندە یا بانگەشەی پرەنسیپەکانی زایۆنیــزم بــکات، ئیدی چ فرامانســۆری بێت یا لەیەکێــك لە دەزگاکانیان ئەندام بێت یــا یارمەتی مادی یا ئەدەبی بدات یا بەهەر شــێوەیەك کار بۆ هێنانەدی ئامانجەکانی بکات، لەســێدارە دەدرێ". ن. سەفوەت ـ فرامانسۆری لە وڵاتانی عەرەبیدا ـ (لەندەن سەنتەری لێکۆڵینەوەی عەرەبی ١٩٨٥).

27 ـ بڕوانە بڕیاری ژمارە ٩٥٨ ئەلوەقائیع ـ ٢٤ ـ ١٨ / تشرینی یەکەم/ ١٩٨٧: ٧. هەروەها بڕوانە ئەو بڕیارەی لە وەقائیعی ٢٦دا هاتوە (١٥ / تشرینی دوەم / ١٩٨٧).

٢٨ ـ فازیل بەڕاك: خویندنگە یەهودیو ئێرانیەکان لە عێراقدا، بەغدا ١٩٨٤، ١٤٥.

29 ـ هەمان سەرچاوەی پێشو، ١٤٢.

30 ـ یاسای ریفۆرمی مافەکان، ئەلوەقائیع ٢٠، ژمارە ٣٥ (١٤ / ئەیلول / ١٩٧٧)، ٢٠.

31 ـ سەدام حسێن، دەربارەی کاروبارە هاوچەرخەکان. ٤٧ ـ ٤٨.

32 ـ یاسای ریفۆرمی مافەکان، ئەلوەقائیع ٢٠، ژمارە ٣٧ (١٤ / ئەیلول / ١٩٧٧)، ٢٨.

33 ـ هەمان سەرچاوە، ٤٣.

34 ـ نوسینە سەرەتاییەکانی عەفلەق ئەم ڕاڤەکردنە بۆ "مرۆڤ" لە خۆی دەگرێ، ئەوەش لەبەشی شەشەمدا ڕووندەکەمەوە.

35 ـ یاسای ریفۆرمی مافەکان، ئەلوەقائیع ٢٠، ژمارە ٣٧ (١٤ / ئەیلول / ١٩٧٧)، ١٥.

36 ـ بەهاو ئاراستە تازەکانی کۆمەڵگەی شۆڕشگێڕی لە شۆڕشی ساڵی ١٩٦٨ی عێراقدا. راپۆرتی کۆنگرەی هەشتەم (لەندەن ـ چاپخانە ئیتاکا، ١٩٧٩)، ١٨ ـ ٢٠.
37 ـ سەدام حسێن: سەنگەرێك یا دوو سەنگەری ناکۆك؟ (بەغدا، لەبڵاوکراوەکانی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، ١٩٧٧).
38 ـ لە گوتاری نێوان سەدام حسێنو نوسەری رۆژنامێرەکەی دەربارەی "گرفتەکانی قەتلوعامو دوورخستنەوە". ئەم کتێبە بەناوی "سەدام وەهای وت" چاپکرایەوە. ئەسکەندەر، سەدام حسێن، ٣٣٢٠.
39 ـ هەمان سەرچاوە، ٢٢٠.
40 ـ بیتۆ مۆسـۆلینی: "رێبازەکانی فاشیزم"، لە "پرەنسیپە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکانی ئەوروپای هاوچەرخ"، کۆکردنەوەی ئۆکیشۆت. چاپخانەی زانکۆی کامبریدج، ١٩٤١، ١٧٦.
41 ـ یاسای ریفۆرمی مافەکان، ئەلوەقائیع ٢٠، ژمارە ٣٧ (١٤ / ئەیلول / ١٩٧٧)، ٢٢.
42 ـ هەمان سەرچاوە، ٢١.
43 ـ هەمان سەرچاوە، ٢٦.
44 ـ بڕوانـە یاسـای ریفۆرمی مافەکان، ئەلوەقائیع ٢٧ (٦ / تەمـوز / ١٩٧٩)، ١٤. ئەمەش ئەو ژمارەیە نیە کە خەڵکی بتوانێت بەدەستی بهێنێت، بەڵکو زۆرێك لە بڕیارەکانیان نهێنی بو تا بتوانن لێی رابکەن، ئەوەش بیرۆکەی پشـت یاسـا نهێنییەکان بو، ئەمجۆرە بیرکردنەوانە تەنها لەو کەسـانەوە دەردەچێت کە عەقڵییەتی بەعسییان هەیە.

# بەشی پێنجەم

# پانعەرەبیزمو عێراق

پانعەرەبیزم بیرۆکەی سـەرەکی حیزبی بەعسـە، ئەم پرەنسیپەش بانگەوازی بوونی یـەك نەتەوەیی عەرەبو دامەزراندنی یەك دەوڵەتـی عەرەبی دەکات. هەمو ئەوانەی بانگەوازی عروبە دەکەن لەسەر ئەم پرەنسیپە هاوڕان، هەرچەندە دەربارەی دیاریکردنی ناسنامەی عەرەبیو سنوری سەرزەمینی ئەو دەوڵەتەو ئەو شێوازانەی بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجانـە دەیگرنەبەر، بۆچونی قوڵو جیاوازیشـیان هەبێت. ئەم پرەنسـیپە لەدوای جەنگـی جیهانی دوەمەوە لایەنگرێکی زۆری پەیداکرد، بەڵام لەدوای سـەرکەوتنی ئیسرائیل لە جەنگی ١٩٦٧دا توشی شکست هاتو لایەنگری لێکردنی زۆر رووی لە کزی کرد. پێشتر زۆرێك لەحیزبو دەوڵەتمەدارانو رێکخراوو بزوتنەوەکان هەڵگری ئەم پرەنسـیپەبوون، بەڵام لەئێسـتادا تەنها حیزبی بەعس بانگەشـە بۆ ئەم پرەنسـیپە دەکات، هەر چەندە ئەم حیزبەش لەدوای شکسـتی شـەش رۆژەی ساڵی ١٩٦٧ەوە حوکمی گرتەدەسـتو لەدوو وڵاتدا دوو رژێمی تۆکمەو سەقامگیری دامەزراند، ئەو دوو وڵاتـەی لە زۆربەی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەراسـتدا زیاتـر ئامادەیی بۆ کودەتای سەربازی تیایە. دیدوبۆچونی هەر دوو میللەتی عێراقو سوریا سەبارەت بەو حەقیقەتە سـەرەکییانە لەسـەر قۆناغی بەر لـە ١٩٦٧و دوای ئەو قۆناغـە بەتەواوەتی جیاوازەو لەمێـژووی هاوچەرخیاندا بەخاڵی وەرچەرخاند دەژمێردرێت. حیزبی بەعسـی عێراق پایەداریو سەقامگیری بە نیشانەی شەرعییەتی خۆی دەزانی. بنەمای ئەم شەرعییەتیش





هەم لە بیروباوەڕی بەعسـەوە سـەرچاوە دەگرێو هەم لە نەریتی عروبەوە کە پێشـتر لەمێژووی هاوچەرخی عێراقدا دووجار ئەزمونکراوە، یەکەمیان لەنێوان ١٩١٨-١٩٤١، دوەمیان لە ١٩٥٨- ١٩٦٨.

حوکمـی ئیمپراتۆرییەتی عوسـمانی لـە ٣/ئۆکتۆبـەر/١٩١٨ بەتەواوەتی کۆتایی پێهاتو لەو کاتەشدا سوپای سارانشین (بدوی) کە فەیسەڵی کوڕی شەریف حسێن، میـری حیجازو رێبەری شۆڕشـی عەرەبی لەنێو ئاپورای پڕجۆشو خروشـی بێوێنەی خەڵکییـەوە چوە ناو دیمەشـقەوە. بەدرێژایی چوار سـاڵی جەنگـی جیهانی یەکەم، نزیکەی چواریەکی دانیشـتوانی سـوریاو لوبنان گیانیان سـپارد، واتە لە کۆی چوار ملیـۆن کەس نزیکەی یەك ملیۆنیان مردن[1]. زۆرینەی ئەو خەڵکە بەهۆی برسـێتیو نەخۆشـییەوە گیانیان لەدەسـتداو لەو ماوەیەشدا حوکمی عوسـمانییەکان زۆر توندو بێبەزەییانە بو، هەروەها بەشـێوەیەکی زۆر دڕندانە بزوتنەوە رزگاریخوازەکانی سوریای سـەرکوتدەکرد. فەیسـەڵ بەهۆی پێواری خەڵکانـی دی وەك قارەمانی رزگارکەری عروبـەو سـومبولی هیواو ئاواتی نەتـەوە بەدیارکەوت، کە بەرجەسـتەی ئایندەیەکی باشتری دەکرد، بەدیارکەوت. لەراستیدا سوپای بریتانیا پشکی شێری لە رزگارکردنی وڵاتـدا هـەبـو، بەڵام جەنەراڵ ئالنبی Allenby هاوئاهەنگ لەگەڵ سیاسـەتی بریتانیا خۆی لەچونە ژورەوەی شارەکانی سوریا دەپاراست کە یەك لەدوای دەروخان. پاشان ئیدارەیەکی عەرەبی لەوڵاتدا دامەزرا کە پایتەختەکەی لە دیمەشق بو.

نەخشەو تەماحی فرەنسا لە سوریا لەگەڵ نەخشەو پلانەکانی بریتانیا جیاواز بو، هێزی بەدیسـپلینی فرەنسا لەجەنگی ١٩٢٠دا بەسەر سـوپای پەرپوتی سارانشینی فەیسەڵدا سـەرکەوتو فەیسەڵو سوپاکەیان لە سـوریا دەرکرد. ئیدی بریتانییەکان فەیسەڵیان کردە شـای عێراقو دەیانویست جۆرێك لە سـەربەخۆیی بدەن بەو سەرزەمینەی کە پێشتر بەشێك بوە لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی تا بەرژەوەندییەکانی بریتانیا بەشێوەیەکی باشتر بپارێزرێت.

ئەو بارودۆخە جیاوازەی لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا لە عێراقو سوریا دەبینرا، تا

رادەیەکی زۆر پەیوەست بو بەو سیاسەتە کۆلۆنیالّیە جیاوازەی لە دوو وڵاتە ماندێتەکەدا پیادەیان دەکرد. کوانوی هیواو ئاواتی عەرەبی کە لە کەسایەتی فەیسەڵو دەستەو پێوەندەکانی بەرجەستە ببو، ئەمە سەرباری ئەو ریسواییەی لەلایەن فەرەنسییەکانەوە بەسەریدا هاتبو، لە حیجازەوە کە سەرهەڵدانی شۆڕشی عەرەبی تیا راگەیەنرا، بەرەو دیمەشق گوێزرایەوە، چونکە عروبەگەراییو یەکێتی عەرەبی بەدرێژایی ئەو رۆژگارە لەو سەرزەمینەدا لە هەڵچونو برەودا بو، پاشان لە دیمەشقەوە بەرەو بەغدا گوێزرایەوە، لەبەر ئەوەی لەماوەی دوو دەیەدا کوانوی رابونی یەکێتی عەرەبی بو. لە کولتورێکدا کە نوێنەرایەتی شتەکان رێك وەکئەوەی شتەکان بەهای خۆیان هەڵدەسەنگێنن، هەڵدەسەنگێنرێ، لێکچۆنی خەلافەت لە سەردەمە کلاسیکییەکاندا ئەوەندە بێمانا نیە.

فەیسەڵ هەرگیز وازی لە بیروباوەری پانعەرەبیزم نەهێنا، بەڵام ئەزمونە سەرەتاییەکانی وایلێکرد ئەمجارە وریانەتر هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پێشەوە بڕوات[2]. لە کۆتاییدا ئەوەی فەیسەڵ لەماوەی دوازدە ساڵ حوکمڕانی لەعێراقدا بەدستیهێنا، لە سیاسەتی دەرەوەی سەرچاوەی نەگرتبو، بەڵکو رۆڵی کەسێتی خۆی بو لە بەهێزکردنی دەزگا تازەکانی دەوڵەتدا، لەدەرەوەی راگرتنی کێشمەکێشی خێڵایەتی، گروپبەندی مەزهەبیو نەتەوەگەرایی. گرنگترین دەستکەوتو ئەوەی لە ماوەی حوکمڕانیدا هەمو مێشکی جەنجاڵ کردبو، بریتی بو لەوەی کۆتایی بەئینتدابی بریتانیا بهێنێتو کۆمەڵەی نەتەوەکان ساڵی ١٩٣٢ دان بەدەوڵەتی سەربەخۆی عێراقدا بنێت[3]. بە بەراورد لەگەڵ عێراقدا، سوریاو فەڵەستین لەژێر حوکمڕانی راستەوخۆی فەرەنساو بریتانیا بونو فەرەنساش بیری لەوە نەدەکردەوە لەو ماوەیەدا سەربەخۆیی بەسوریا ببەخشێت، بۆیە بزوتنەوەی رزگاریخوازی سوریا لەگەڵ فەرەنسا تا چلەکانی سەدەی بیستەم روبەروی ململانێیەکی تاڵ بویەوە.

عێراق لەدوای سەربەخۆبونی روبەروی زۆر مەسەلەی تازەبوەوە. سوپا وەك نوێنەرێکی سیاسی لەسەر شانۆی سیاسەت بەدیارکەوت، هەروەها لەگەڵ دەرکەوتنی



چینێکی موڵکدار گوشار بۆ ریفۆڕمی ریشەیی زیادیدەکرد. حیزبی شیوعی عێراقی دامەزراو بزوتنەوەی عروبە کراسی حیزبی سیاسی پۆشیو چەندین ئەفسەری سوپای تازەش پەیوەندی پێوەکردن، ساڵی ١٩٣٦ جیهانی عەرەبی هاوچەرخ یەکەمین کودەتای بەخۆیەوە بینی. ئەم فیکرە لە رێگەی زۆرێك لە هەڵسورێنەرە سوریو فەڵەستینیە کاراکانی نیشتەجێی عێراق لە وڵاتە عەرەبیەکان بڵاوبویەوە. حاج ئەمین ئەلحوسەینی، موفتی قودس بەهۆی چالاکی ناسیونالیستیەوە لەلایەن بریتانییەکانەوە دوورخرایەوە، هەروەها سەرکردەی ناسیونالیزمی سوری شوکری قوەتلیو جەمیل مەردام، لەنێو دوورخراوەکان بون کە لە جیهانی عەرەبیدا برەویان بە بیرۆکەی ناسیونالیستی عەرەبی دەدا. زۆرێك لەو کەسایەتییە بەرجەستانەی بانگەوازی عروبەیان دەکرد لەو سالانەدا بونە ئەندامی پارلەمانی عێراق، لەنێویشیاندا رەشید عالی گەیلانی کە بەناوی شۆڕشی عەرەبییەوە دژی بریتانییەکان جەنگی هەڵایساندو بزوتنەوە کورت مەوداکەشی وەك "یەکەمین شۆڕشی رزگاریخوازی عەرەبی" چوە مێژووی بەعسەوە[4]. لەو ماوەیەدا لیژنەیەك لە دیمەشق بەمەبەستی کۆمەكو هاوکاری عێراقیەکان لەلایەن میشیل عەفلەقو سەلاحەدین ئەلبەیتارەوە دروست بو، کە دواتر ئەو لیژنەیە بوە موژدەبەخشی حیزبی بەعس[5]. سەرئەنجام، رەنگە لەهەموی گرنگتر ئەوەیە کە فەیسەڵ بەمەبەستی خزمەتکردنی عێراقی هاوچەرخ، هێندێك لە سەرکردە ناسیونالیزمەکانی لەبابەت هاوڵاتی سوری ساتع ئەلحوسەری دامەزراند. ساتع ئەلحوسەری ساڵی ١٩٢١ بەیاوەری فەیسەڵ گەیشتە عێراقو وەك راوێژکارێك دەست بەکار بو، پاشان بو بە بەرێوەبەری گشتی پەروەردە، دواتر بوە راگری کۆلێجی یاسا کە زۆرێك لە نەوەی پێشوی عێراق دەرچوی ئەو کۆلێجە بون. حوسەری مامۆستایەکی زۆری لە سوریاو فەڵەستینەوە هێناو بنەمای سیستەمی پەروەردەیی بۆ قۆناغێکی مێژوویی دارشت، بەڵام حوسەری ساڵی ١٩٤١، دوای داڕوخانی بزوتنەوەکەی گەیلانی لە عێراق دوورخرایەوەو رەگەزنامەی عێراقی لێسەنرایەوە.

عێراق لە مێژووی بزوتنەوەی عەرەبیی ساڵانی بیستو سییەکانی سەدەی بیستەمدا،

پێگەیەکــی گرنگی هەبو. وڵات ئەزمونی بزوتنەوەی عەرەبی بەرجەســتە دەکردو بۆ یەکەمین جار روبەروی ئەو فاکتە کۆمەڵایەتیانە دەبووە کە دیدێکی جێگیریان هەبو. نوێنەرانــی هەمو دەزگاکانی دەوڵەت، حیزبە سیاســییەکانو هێــزە کۆمەڵایەتییەکان کــە لە دوای جەنگــی جیهانی دوەمەوە لەبزوتنــەوە میللیگەراکانــدا رۆڵی گرنگیان هەبــو، لــە کاتی ئاژاوەی روداوە خۆماڵییەکانو گرژییــە ناوخۆییەکاندا فۆڕمی خۆیان وەرگــرتو بەلانیکەمەوە لەعێراقدا هێزی بیانیان لە پشــتەوە نەبو. روداوەکانی عێراق ئەوە رووندەکەنەوە کە بزوتنەوەی پانعەرەبیزم توانای رەگ داکوتینی لە ناو کۆمەڵگەدا هەیەو رووکەشەکەیشــی لەگەڵ ئاوێتــە نەتەوەیی‌و مەزهەبییــە ناهاوئاهەنگەکەیدا لە توانایدا نیە ئەوجۆرە بەرنامەیەی ئەنجام بدات. ئەو قۆناغە کاریگەری یەکلاکەرەوەی لەســەر هەمو جۆرە چارەسەرو خەسڵەتە سیاسییەکاندا هەبو، کە لە دوەم حوکمڕانی بەعســدا بەدیارکەوتو قۆناغی نێوان ١٩٢٠ - ١٩٤١ تێکۆشانی میللەتێك دەخاتەڕوو کە کێشە کۆمەڵایەتییەکان تێیدا بزربوون، هەروەکو چۆن چینە کۆمەڵایەتییە تازەکان بەهیچ شــێوەیەك بوونی نەبو، پرســیارە سەرەکیەکەش بریتی بو لەوەی "ئێمە کێین"، نەك "چ کەسێك دەبێ حوکم بکات؟".

## حوسەری‌و بەها ئەخلاقییە هاوچەرخەکان:

مــاوەی نێــوان هەر دوو جەنگــی جیهانی، مــاوەی کارلێکردنێکی کارای فیکــری سیاســەتی عەرەبی بــو، لەو ماوەیەشــدا چەمکی نەتەوەیــی عەرەبی فۆرمی خۆی وەرگرتو ســیماو مۆرکی ئاشکرای پەیداکرد، هەروەها هەستکردنو وشیاری بەکەســایەتی عەرەبی‌و خەســڵەتەکانی بوە مەسەلەیەکی ئایدیۆلۆجی‌و ستایش دەکرا، بەڵام مەسەلە واقعییەکان هەرگیز ئەزمونو لێکۆڵینەوەیان لەسەر نەکرا. لە ئێستادا کە دوا رایەڵەی دەوڵەتی ئیســلامی لەبەریەهەڵوەشــاوەتەوە، خەڵکی موســڵمانی عەرەبی



زمان، بەلانیکەمەوە دەکرێ بە بەشــێك لە لۆجیك روبەروی مەســەلەی بوون ببنەوە (عەرەبگەرای نائاینی سەدەی نۆزدەهەم کە کەمایەتییەکی مەسیحی لوبنانی رێبەرایەتی دەکرد، هەرگیز گرنگییان پێنەدەدا).

ســاتع ئەلحوسەری، دامەزرێنەری تیورەی پانعەرەبیزمی هاوچەرخ، لەماوەی سی‌و چلەکانی ســەدەی بیستەمدا، جێبەجێکردنی بەرنامەی پڕبەرخوازی بونیاتنانەوەی ئەم تیورەیەی گرتە ئەستۆی خۆی. ساتع کاریگەری نیچەو ئەڵمانیە رۆمانسییەکانی لەسەر بو، بۆیە پێیوابو نەتەوەکان بریتین لە دابەشبونێکی سروشتی رەگەزی مرۆڤایەتی‌و وەك یەکەیەکی سەربەخۆ بوونیان لە هەستی ئەندامەکانیدا هەیە، ئەمە سەرباری ئەوەی لەو باوەڕەدابو کە نەتەوە لەپێش دەوڵەتو جوگرافیاو تەنانەت دەرکەوتنی ئایینەکانیشــەوە هەبوە. هەر چەندە ئیســلام لەگەڵ عروبەدا ناکۆك نیە، بەڵام بۆ ئاســتێکی لاوەکی دابەزی بو.

بەڵام حوسەری هەم وەك کەسێکی تیوریست، هەم وەك کەسێکی پایەبڵند گرنگی خۆی هەبو. لە راستیدا هەمو نوسراوە تیورییە رووتوشکراوەکانی کە لە دوای ١٩٤١ەوە بەدیارکەوت، پشت بەو وتارو وانەو نامەو ئەزمونانە دەبەستن کە لە عێراقدا بەسەری بردبــو. هەمو ئەوانەش لە رۆژژمێری ژیانیدا نوســراوەتەوە. ئەو نوســراوە پوختەیەکی چڕوپــڕی بنەمــا تیورییە مەزنەکان نەبو، بەڵکو تۆمارگەی شــتە واقیعەکان بو لەســەر سیاســەتی بیستو سییەکانی سەدەی بیستەمدا لە فۆڕمی حەکایەتگەلێکی بێشوماردا دارێژرابون. لێرەدا حوســەری لە باشترین حاڵەتی خۆیدا دەردەکەوێت، لەگێڕانەوەی روداوو بیروباوەڕەکانی حەکایەتخوانێکی بێوێنەو لە گواســتنەوەی بیروباوەڕی ئەوانەی لەگەڵیدا نەدەگونجان ئەمین‌و راستگۆبو، لە نوێکردنەوەی ئامانجەکانیشیدا دەستێکی باڵای هەبو ئــەو ئامانجانەی کۆنترۆڵی هەنگاوەکانی مرۆڤ دەکاتو لەخزمەتی پایە بڵندەکان کاردەکات. ئەو خەسڵەتانەش لە سیاسەتی خێڵەکی‌و وەلای ئەو سەردەمەی عێراقدا بەدیاردەکەوتن.

حوســەری روداوێکی خۆی دەگێڕێتەوە کە چۆن لە بیســتەکاندا لەگەڵ شاعیری

شیعە محەمەد مەهدی جەواهیری رووبەرووبۆتەوە، جەواهیری یەکێك بو لە شاعیرە گەورەکانی سەدەی بیستەم. جەواهیری تا ناوەراستی حەفتاکانیش لایەنگرێکی بەهێزی حیزبی شیوعی عێراق بو، کە لە نیوەی حەفتاکاندا لەگەڵ حیزبی بەعسدا رێکەوتنامەی ئاشتیو لێکتێگەیشتنیان مۆر کرد.

حوسەری لەلایەن وەزیری پەروەردەوە نامەیەکی پێدەگات تا جەواهیری وەك مامۆستای زمانی عەرەبی لە یەکێك لە قوتابخانە سەرەتاییەکانی بەغدا دامەزرێنێت. حوسەری دوای ئەوەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئەو شاعیرە گەنجەدا کرد، رازی نەبو دایمەزرێنێتو ئەمەی خوارەوەش دەنوسێت:

سەرەتا داوام لێکرد رەگەزی بزانم،

بەبێ دوودڵی وەڵامیدامەوە: "ئێرانیم"

پێموت: کەواتە ناتوانین داتبمەزرێنین.

پێی وتم: بۆچی؟ ئایا مامۆستای سوریو لوبنانیمان نیە؟[6].

گفتوگۆی نێوانیان درێژە دەکێشێت، چونکە جەواهیری زۆر بەوردی دەیویست بزانێت ئەگەر ببێتە عێراقی چ سودێکی مادی دەکات. بۆیە کاتێك حوسەری لەو چاوپێکەوتنە دەرچوە دەرەوە، پێداگری دەکرد کە نابێت راسپاردەکەی جێبەجێ بکرێ، لەبەر ئەوەی لەو باوەرەدابو جەواهیری وەك پێویست رێز لە رەگەز ناگرێت، بەڵام راسپاردەکەی جێبەجێ نەکراو رەگەزنامەی عێراقی بە جواهیری دراو وەزیفەیشی دەسکەوت. جەواهیری دوای چەند رۆژێك لە یەکێك رۆژنامە عێراقییەکاندا، ئەو دەمەی ئازادی رادەربرین لە عێراقدا هەبو، شیعرێکی گاڵتەئامێزی بڵاوکردەوە. لەو شیعرەیدا باس لەجوانی ئێران دەکاتو لەبەیتێکیدا هاتوە: "لە عێراقدا لەگەڵ کۆمەڵێکم کە بەبێ ئەوان عێراق لەلای من خۆشەویست نیە".

حوسەری لە تورەییدا گری لێدەبووەوە، دواتریش نوسراوگەلێکی دوورودرێژو تاڵی پربەسوێ لەنێوان خۆیو وەزیرەکەیدا ئاڵوگۆر کرا، کە تێیدا گشت بەیتەکانی ئەو قەسیدەیەی شیکردۆتەوە. گەورە شاعیری سونی، مەعروف رەسافی لەو شیکردنەوانەدا



پشتگیری لە حوسەری کردوە. بەپێی وتەکانی حوسەری سەرلەبەری قەسیدەکە ئامانجی وروژاندنی "شعوبییەت" بوە[7].

یەکێکیان دەڵێت هێندێك وشە هەیە راڤەکردن هەڵناگرێت، ئەگەر راڤەش بکرێ نهێنییەکی قوڵی چەپەکراو ریسوا دەکات. یەکێك لەوانەش وشەی "شعوبیە ـ نارۆدیزم" ئەگەر بە شێوەیەکی راستەوخۆ دابنرێ، بەمانای ئەوە دێت کە ئەو کەسە دژی عروبەیە، یا بەشێوازێکی روونتر بەمانای ئەوەیە کەسێك عروبەی خۆی رەتبکاتەوە. لەم حاڵەتەدا لەو مانایە نزیك دەبێتەوە کە "یەهودییەك رقی لەخۆی دەبێتەوە"، هەروەکو ئایدیۆلۆجیستە زایۆنیستەکان دەیبینن، بەڵام وتەزای شعوبییەت مانای "وازهێنان لە هەمو عەرەب" دەگەیەنێت. یەهودییەك هەر چەندە نەفرەت لە یەهودیبوونی خۆی بکات، ئەوا دیسانەوە لەدیدی کۆمەڵگەکەیەوە ناتوانێت یەهودیبوون لەخۆی بکاتەوە، چونکە ئەم حاڵەتە لەوە دەچێت مرۆڤ بیەوێت لەپێستەکەی بێتە دەرەوە.

شعوبییەت بۆ سەردەمی عەباسی دەگەرێتەوە، واتە کاتێك بزاوتێکی ئەدەبی بەناوی شعوبییەتەوە لە عێراق دامەزرا، ئەو بزاوتەی بەرگری لە فەزیلەتی کولتوری میللەتە موسڵمانە ناعەرەبەکان دەکرد، ئەوەش لەسەر حیسابی مێژووی ئەدەبی عەرەبی بو. ئەو رەخنەگرانە پێیانوابو ئەدەبی عەرەبی، ئەدەبێکی ناشارستانیو بێسەلیقەیە. ئەوەی سەیرو مایەی گاڵتەجارییە ئەو وشانە بەزمانی عەرەبی دەنوسرانو لەسەر خاکێك بو کە دواتر بەوڵاتی عەرەبی ژمێردرا. ئەوانە لە کاتێکدا برەویان بە بزاوتەکەی خۆیان دەدا کە ئۆرۆستۆکراسی جەنگی عەرەبی پێگەی خۆی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا لەدەست دابو. ئەم رایەڵەیە ئەو هێزو توانایەی بەو وتەزایە بەخشیو ئەو مانا ئینفیعالییەشی لە کولتوری عەرەبیدا پەیداکرد.

ئەمرۆ لەوە خراپتر نیە بەعەرەبێك بڵێیت "شعوبی"، چونکە ئەم چەمکە رەگەزپەرستیو تاوانی خیانەت پێکەوە گرێدەدا، ئەگەر ئەو وشەیە بەعەرەبێك بوترێ، واتە ئەو کەسە یا بەکرێگیراوە یا شیعەیە، هەروەها ئەو وشەیە لەدژی شیوعییەکانیش بەکاردەهێنرا. ئەم وشەیە لە چلەکانەوە لەلایەن بەعسییەکانەوە بەو مانایە بەکاردەهێنرا. رەنگە

کاتێك حوسەری‌و مەعروف رەسافی گفتوگۆیان لەسەر قەسیدەکەی جەواهیری کردبێت، وشەی شعوبیان بەمەبەستی رەگەزپەرستی بەکارنەهێنابێت. حوسەری زمانی بەکلیلی ناسنامەی عەرەبی دەزانی (هەرچەندە حوسەری لەمنداڵییەوە زمانی تورکی، زمانی یەکەمی بوە، بۆیە هەوڵێکی زۆری دا تا نوسین‌و قسەکردن بەزمانی عەرەبی فێربێت).

لەگەڵ ئەوەشدا ناونیشانی ئەو بەشەی حەکایەتەکەی تێیدا هاتوە بریتیە لە "ئەو مامۆستا ئێرانیانەی دەردەسەری گەورەیان بۆ دروستکردوین"، بۆیە وادەردەکەوێت لێڵییەکی گەورە بۆ ئەو مانایە دزەی کردبێت کە حوسەری پێشنیازی کردبو. لەبەر ئەوە دەپرسین، ئایا بەراستی جەواهیری ئێرانی بوە یا عەرەبێکی شعوبی بوە؟ بەهەر حاڵ کاتێك ئەم پێوەرە زمانەوانییە بابەتییەی تایبەتە بەناسنامە، بوار بۆ هێزی باوەڕی نەتەوایەتی عەرەب دەرەخسێنێت، ئیدی چەمکی شعوبییەت ناوەرۆکێکی نەژادی پەیدا دەکات. بەم بۆنەیەوە پێوەری حوسەری ئەوەندە بابەتی بو کە دەکرا خودی خۆی نەك جەواهیری بە عەرەب دانەنرێ، بەڵام جیاکاری تیوریستان لەوەدایە کە تێبینی ئەوجۆرە ناکۆکییە ناکەن.

بەدڵنیاییەوە حوسەری پێیوابو شەڕی دەسەڵاتی بیانی نێو عەرەبەکان دەکات‌و خەبات لەدژی ئەو هێزە میانڕەوانە دەکات کە خۆیان بەعەرەب دەزانن. هەروەها لەو باوەڕەشدابو پێشینەی وەفاداری لەژیانی تاکەکاندا خەسڵەتێکی خێڵایەتی‌و تایفەگەرایە. لە روانگەی حوسەرییەوە دڵسۆزی جەواهیری ئاماژە بۆ تێڕوانێکی خۆپەرستانەی سوك‌و ریسوا دەکات کە ئامانجێکی باڵای لە چەمکی مێژوو بۆ بەرژەوەندی نەتەوایەتی نیە. بەم واتا وردەش جەواهیری وەك زۆرینەی عەرەب کەسێکی دواکەوتوەو کەسێکە بەرجەستەی چەندین سەدە لە داتەپینی نەتەوایەتی دەکات.

پانعەرەبیزم لە هەمو شتێکدا جدییە، هەروەها ئامادە نیە گاڵتەو قەشمەری قبوڵ بکات، تەنانەت ئەگەر ئەو قەشمەرییە لە رۆڵەکانی خۆیشییەوە بێت، چونکە لەوە دەترسێت بەشێوەیەك ئاماژەی بۆ بکرێ کە ئەو شتانە نازانێت. بۆیە لەو حاڵەتەدا



ئەو کەسانە بەعەرەب حیساب ناکرێن، ئیدی گرنگ نیە کەسێکی وەك جەواهیری زمانزانێکی مەزنی عەرەبە، ئەو بەگاڵتەجارییەکەی لەوە دەچێت نەتەوەی عەرەب رەتبکاتەوە، بۆیە بەدڵنیاییەوە بەکەڵکی ئەوە نایەت ببێتە مامۆستای ئەو منداڵانەی کە ویژدانیان پاکەو کاریگەری هەمو شتێکیان لەسەر دەبێت. دەکرێ مرۆڤ بەپێی دیاردەی فاکتی مرۆڤایەتی بۆ کردنەوەی لوغزەکان، هەست بە لۆجیکی دیدی جیهانگیری بکات. مرۆڤ لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چ گاڵتەجارییەك دەبینێ کە عەرەبێکی سوری، تورك پەروەردە، تیورەی ناسنامە لەسەر بنەمای زمان دادەهێنێت، پاشان ئەو مافەش بەخۆی دەدا کە تازە فێری زمانی عەرەبی بوە، یەکێك لە مەزنترین زمانەوانی عەرەبی سەدەی بیستەم لە وانەوتنەوەی زمان بێبەش بکات.

لێرەدا حەکایەتێکی دی هەیە کە قوڵی فرەیی رەگوریشەی کۆمەڵگەی عێراقی لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا ئاشکرا دەکات، لەگەڵ ئەو سنورەی دەشێت عەرەبگەرای تێیدا نمایش بکرێ. حوسەری باسی هەڵمەتێکمان بۆ دەکات کە دژی قوتابخانەی ناوچەیەکی شیعەنشین ئەنجامی داوە. بەرێوەبەری قوتابخانەکە کە پێشتر ئەفسەرێکی عوسمانی بوە، "بەنەفرەت‌و رق‌و کینەی لەعەرەب خزمەتی دەوڵەتی ئێرانی دەکرد". یەکێك لەو شێوازانەی گرتییەبەر کڵاوی پەهلەوی کردە یۆنیفۆرمی خوێندکارانی قوتابخانەکەی. بۆیە حوسەریش دەیویست دەرسێکی ئەو قوتابخانەیە دابدات‌و بەو توانایەی لەبەردەستیدا بو دەسەڵاتی بەرێوەبەری قوتابخانەکە کەمبکاتەوە، بەوەی هەمو ئامرازەکانی روونکردنەوە هەر لە نەخشەوە تا تەختەڕەش، مێز، کورسی‌و وێنە، بۆ قوتابخانەیەکی دی لە هەمان ناوچەدا دەستەبەر بکات، کە شیعەیەك ئیدارەی دەداو دوای چەند مانگێك توانی دڵی خوێندکارەکان رازیبکات. بەرێوەبەری قوتابخانەکەی دی لەسەر ئەو هەڵویستەی بێدەنگ نەبو، دەیویست شتێکی نوێ دابهێنێت، بەوەی دەوامی ئێواران بۆ خەڵکی بەتەمەن بخاتە بەرنامەوە، بەڵام بۆ ئەنجامدانی کارەکەی پێویستی بە رەزامەندی حوسەری هەبو، بەهەر حاڵ لەبەر هۆی ئیداری داواکەی رەتکرایەوە. بەرێوەبەرەکە پێواری (غیاب) حوسەری لەبەر

هەر هۆیەك بێت، بەهەل زانیو داواکەی بەرزکردەوەو رەزامەندی لە یاریدەدەرەکەی حوسەری وەرگرت، بۆیە کاتێك حوسەری بەو کارەی زانی توشی خەمۆکی بو، بەڵام دۆڕانەکەی قبوڵ کردو ویستی ئەو دۆڕانە بکات بەسەرکەوتن بۆ خۆی، لەبەر ئەوەی لە جێبەجێ کردنی بەرنامەی گەورە ساڵاندا پەلەی کردو بەوەش لە فێرکردنی گەورە ساڵاندا پێش خەڵکانی دی کەوت [8].

حوسەری لەو باوەڕەدابو پەروەردە ئامرازێکە بۆ گەیاندنی مرۆڤ بە مۆراڵی (أخلاق) نوێ، ئەو ئەخلاقەی کە خێزانو نەریتەکان ناتوانن لەناخی تاکەکاندا بیچێنن. مامۆستا توخمێکی ئاکارییەو منداڵ دەیبینێو هەست بەبوونی دەکات، هەر لەرێگەی ئەویشەوە بۆ یەکەمجار هەست بەناسنامەی عەرەبی خۆی دەکات. بۆیە لە ساڵی ١٩٢٢ەوە میتۆدێکی پەروەردەیی بەناوی "زانیاری لەسەر ئاکارو ئەرکی نیشتمانی" خستە بەرنامەی خوێندنەوە. ئەم زانستەش لەئاینو ئاکار سەربەخۆ بو. بەکۆمەڵ سرودخوێندن، یەکێك بو لە بەرنامەیەکی دی بو کە لە رێگەی بڵاوکردنەوەی رۆحی نیشتمانی لەنێو خوێندکاراندا، خزمەتی ئامانجەکانی دەکرد. لەساڵانی یەکەمی خوێندندا وتنەوەی وانە لەنێو منداڵاندا بۆ رابردوی نەتەوەی عەرەبو چاندنی رۆحی نیشتمانپەروەری تەرخانکرابو، بەڵام خوێندنی مێژووی یەکگرتنەوەی ئیتاڵیاو ئەڵمانیا خرایە پرۆگرامی شەشەمی سەرەتاییەوە[9].

عێراقییەکان لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا هەمو دەسەڵاتە ئەخلاقییەکانیان لە ئاینزاو خێڵو خێزانەکانیان دەبینییەوە. تاکەکان هیچ پشکێکیان لە ئاراستەکردنی خودی خۆیان نەبو، هیچیان لەسەر سەربەخۆیی خۆیان نەدەزانی، بەڵکو بەپێی دابو نەریتی گروپ کارلێكو هەڵسوکەوتیان دەکرد، بەڵام دەوڵەت دوور لە تاکەکان لەنگەری گرتبو، بەپێچەوانەی گروپەکانەوە کاریدەکرد، بۆیە لێرەدا دەبینین دەسەڵات لەو گروپە نەریتانەوە سەرچاوەی دەگرت کە تاك تێیدا هاتۆتە دنیاوەو بەمەبەستی دەرخستنی کەسایەتی خۆی هەوڵیدەدا لەگەڵ ئەندامانی گروپەکەیدا هاودەمو هاوئاهەنگ بێت، بەڵام ئەگەر لەگەڵ گروپ هاوئاهەنگ نەبێت، ئەوا



لەگروپ دەردەکرێ، یا هێندێك کەرەت دەگاتە ئاستی کوشتن (بۆ نمونە تاوانی شەرەف کە زیان بەخۆنازینی گروپ دەگەیەنێت)، کەچی ئەو ترسە گەورەیەی سەرلەبەری مرۆڤ دەگرێتەوە، مردن نیە، بەڵکو ترسی ئەوەی لەنێو بیابانی پڕمەترسی گروپو تایفەدا بێشوناس بمێنێتەوە.

لەو سەردەمەدا شتێك نەبو وەکئەوەی ئەمڕۆ پێی دەوترێ "خۆراگرتن"، واتە ئەوەی تاك بەرێنوێنی رێسای ئاکاری دیاریکراو، بەئاگاییو ویژدانی خۆیەوە دەست بەتێکۆشان بکات، چونکە ئەو ئاکارە بۆرجوازییە چەندین سەدەی خایاندوە تا بەو شێوەیە دەرکەوتوە. حوسەری ئەمەی زۆر باش دەزانی، لەبەر ئەوەی لەو نەوە میللیگەرایانە نەبو کە ستایشی کولتورێکی دواکەوتو بکاتو لەوانەش نەبو کۆمەڵێك خەسڵەتی ژیانی هاوچەرخ پێکەوە گرێبدات کە تێیە بەدەستەواژەی لەبابەت "سیخوری بیانی"و "بەکرێگیراوی رۆژئاوا".

لەنێوان هەر دوو جەنگی جیهانیدا بیروباوەری نوێ چوە پێگەیەکەوە کە هیچ دەسەڵاتێکی گروپە مەزهەبیو تایفییەکانی تێیدا نەبو، هەر چەندە تا ئەو کاتەش وەك هێز لەنێو گروپە جیاوازەکاندا دەرنەکەوتبو. بۆ یەکەمجار لە عێراقدا جۆرێك لە ئازادی بەدیارکەوت کە دەوڵەت پشتگیری لێدەکرد. ئەو دەوڵەتە تازەیەی لە دوای خەلافەتی عوسمانییەوە لەعێراق دروستبو زۆر توڕە بو لەو پشێوییە کەڵەکەبوەی کە رێڕەوی ژیانی راگرتبو، بەدوای رێگەیەکدا دەگەڕا تا گروپەکان لەو سنورەی هەبو، وەك خۆیان قبوڵ بکات. دەوڵەت بوە مەیدانێك بۆ تاكو کەمایەتییە فەرامۆشکراوەکان، کە تاکگەراو ئازادی سیاسی بۆ هەمو گروپو توێژێك دابیندەکرد. لە بیستو سییەکانی سەدەی بیستەمدا گفتوگۆکانی ناو عێراق زۆر بەتوندیو چڕوپڕی لەسەر مەسەلەی روناکبیرانو دەرچوانی کۆلیجەکان تەوەرەی دەبەست. خەڵکی دەیانپرسی بۆچی ئەو دەرچوانە لە فەرمانگە حکومییەکان دادەمەزرێنو بۆچی کاری ئازاد ناکەن؟ هەروەها دەشیانپرسی ئایا کاری حکومی لەو رۆژگارەدا پەیوەندی بەو داهێنانە تازەیەوە هەبو کە ناوی ئازادی بو؟ زۆرێك لە جوتیارەکان لەبەر هەمان سۆنگە (لە پاڵ چەندین

هـۆی دی) بـەرەو شـارەکان کۆچیان کرد، بۆیـە بەهۆی ئەو هێزەوە کـە دەیتوانی لەدەرەوەی گروپە ئاینیەکان لەسـەر قاچ خۆی رابگرێ، چ شـتێك رێگە لە چەشەی تاکەکان دەگرت لە جوغزی گروپو تایفەکان بچنە دەرەوە؟

ئامانجە پەروەردەییەکان لەلای حوسـەری چ شـتێك بون؟ بەهەمـو دڵنیاییەکەوە مەبەسـتی ئەوە نەبـو پەروەردە بکاتـە ئامرازێك بـۆ لێکترازانو هەڵوەشـانەوەی ئەو پەیوەندییانەی کۆمەڵگە. نوسـینەکانی حوسـەری لەسـەر تاکو کۆمەڵگە ئاماژە بەوە دەکـەن کە بونیادی دەسـەڵاتی ئەخلاقی هـەر گروپێك (لـەڕووی تیورییەوە) وەك ئایدیالیـك گەنـدەڵ بوە، چونکە بەپێی دیدوبۆچونی ئەو، عـەرەب تا ئەوپەڕی رادە "تاکگەرا" بوون. گرفتی تازەی پەروەردەی دەوڵەت لەو شـێوازەدا بو، ئەو دڵسۆزییە پارچـە پارچەو لێکتـرازاوە لە پلەبەندییەکـی وەزیفی تازە دارێـژراوەدا رێکبخات کە لوتکەی ئەو پلەبەندییە چینێکی تازەبو، بەناوی نەتەوەی عەرەبەوە. ئەوەش پرۆسەیەك بـو رێنمایی هەمو میللەتی عەرەبی دەکرد هێـدی هێدی بەرەو ئایدیاڵێکی بەکۆمەڵی تازە برۆن کە سیستمی ئەخلاقی وەك جاری جاران بمێنێتەوە، جگە لەو دەسەڵاتو توانایەی کە تاکگەرای تێیدا دەتوێتەوە، سـەرەتا میللەت، پاشان گروپو خێزان بو. تاکگەرایی بەچەمکە تازەکەی لەلای حوسەری مەسەلەیەك نەبو، هەروەها مەبەستیشی نەبو تاکگەرایی وەك مەسەلەیەك کە شایانی روبەروبونەوە بێت، گەڵاڵە بکات.

رەنگـە مـرۆڤ لەنێو روناکبیرانو هێندێك لە سیاسـییەکان جۆرێك لە تاکگەرایی نـوێ بەدیبـکات کـە ململانێ لە پێنـاوی دۆزینـەوەی دەروازەیـەك دەکات تا لەو نەریتانـەی بەشـێوازی جۆراو جۆر خۆیان سـەپاندوە، رزگاری بێت. کەشـوهەوای ئازادی نێو دەسـتەو گروپی بیسـتەکانی سەدەی بیستەم ئەو ململانێیەی ساناتر کرد، ئەو کەشـوهەوایەی کە ئازادی دەربڕینی بۆ زۆرێك لە بیروڕا جیاوازەکان دەسـتەبەر دەکـرد، بەڵام کاتێك حوسـەری پەژارەیی خـۆی دەربڕی لەسـەر "رۆحی بەهێزی تاکگەرایی... بە بەراورد لەگەڵ ئەو رۆحە کۆمەڵایەتییەی کە تا ئێستاش لەناخماندا سسـتو لاوازە"[10]، ئاماژەی بەوە نەدەکردو مەبەستیشی ئەوە نەبو، بەڵکو مەبەستی



دڵسـۆزیو وەفاداری تاکو پەیوەندییە تایفییەکان بو کە هێشـتا پێشـینەی لە عەقلی خەڵکیـدا هەیـە، ئـەوەش رێگەی لە هەوڵو کۆششـەکانی دەوڵـەت دەگرت تا لە رێگەی سیستمی نوێی عەرەبییەوە پەروەردەی ئەخلاقی تازە بچێنن. سەیرو سەمەرەش لەوەدابو بەئەندازەی هەوڵەکانی حوسەری بۆ شەقکردنی رێگەی ناوخۆی کۆمەڵگەی عێراق بەمەبەستی بەسیاسیکردنی ئەو بوارو قەڵەمڕەوانەی کەس دەسەڵاتی بەسەریاندا ناشـکێت، بـوارو قەڵەمـڕەوی زۆر ئازادتر هەبو لـەو بوارەی کە هیـواو ئومێدەکانی عەرەبگەرا پێویستی پێی هەبو.

حوسەری زۆر بە توندی دژایەتی ئەو فیکرەی دەکرد کە پێیوابو دەبێ پەروەردە ببێتە مایەی خولْقاندنی تاکێك کە توانای خۆبژێوی هەبێتو خۆی دادوەری لەسەر رەفتاری خـۆی بکات، بێئەوەی پلانی ئەوانی دی لە ئاینـدەدا لەبەرچاو بگرێ[11]. لەهەمان کاتدا رەتیدەکردەوە پەروەردەو فێرکردن بۆ پاراستنی سیستمی باو بەکاربهێنێت. هەر دوو روانینەکەش بە بۆچونی خۆی پەیوەندی بە لۆجیکەوە هەبو. هەروەها دەیزانی ئەو دەسـەڵاتە ئەخلاقییە تازەیەی کە دەیویست لەنەوەی نوێدا بیچێنێت، کۆمەڵگەیەکی دەسـت ناکەوێت یارمەتی چاندنی بدات. هێشـتا نەتەوەی عـەرەب یەکگرتو نیە، لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەتێك بەناوی عێراقەوە بوونی هەیەو دامودەزگاکانی هێدی هێدی بەرەو سەقامگیری هەنگاو دەهاوێت. لەراستیدا دڵسۆزیو وەفاداری بۆ عێراق هێدی هێدی هەسـتی پێدەکرا. رۆژژمێری حوسـەری پڕە لە حەکایەتی پڕ لەکێشمەکێشـی نێوان خۆیو "عێراقگەراکان" کە بەزۆری لە کەمایەتییە ناموسڵمانەکانو کوردو شیعە پێکهاتبوون.

دواجـار حوسـەری لەوە تێگەیشـت کە ئەو ئاکارەی بانگەشـەی بـۆ دەکات، تەنانەت لەسەر ئاستی توێژە دەوڵەمەندو ناودارەکانی وڵاتیش بزرەو هەستی پێناکرێ. هەروەها چینێك لە نەجیبزادە یا ئۆرۆستۆکراتەکانیش نەبو کە بەرخوازییەکی (طموح) دوورمەودای هەبێت. حوسەری تێگەیشتنی خۆی دەربارەی ئامانجە پەروەردەییەکان یاداشـتکردوەو باس لەوە دەکات کە باڵاترین ئەرکی سیسـتمی پەروەردە لەلایەکەوە

خۆی لە رۆشـنبیرکردنی چینی رۆشـنگەرانو فەرمانڕەوایان دەبینێتەوە، لەلایەکی دی هـەوڵ بدرێ لەنێو باقی چینەکانـی دی نەتەوەدا بڵاوبکرێتەوە، لەگەڵ زانینی ئەوەی دوەم پێش یەکەم دەکەوێت. بۆیە بابەتی نەهێشـتنی نەخوێندەواری لەلای حوسەری مەسـەلەیەکی لاوەکیو بێسـود بو، ئەگەر پاڵپشـتێکی نەبێت لە دەسـتەبەر کردنی بڵاونامـەو چاپەمەنـیو بابەتی خوێندنەوە بـۆ ئەوەی بکەوێتە بەردەسـتی خوێنەرانو بخوێنرێتەوە[12].

کاتێـك چەپگەرا ناسیونایسـتەکان بانگەشـەی ئەوەیان دەکرد کە حوسـەری بۆ خزمەتـی بەرژەوەندییە سیاسـییەکانی چینێکـی دیاریکراو، چینـی ناوداروماقوڵان، بەکارهێنـراوە، فاکتـە کۆمەڵایەتییەکانیان فەرامۆش دەکردو وێنـای بوونی چینێکیان دەکرد کە دەتوانێت خۆی حوکمڕانی خۆی بکات[13]. ئەوەش کارێکی نالۆجیکییە، چونکـە بوونی هەژارییەکی زۆرو جیاوازی لە دەوڵەمەندیدا (هەر چەندە جیاوازییەکە تـا ئەو رادەیەش گـەورە نەبو)، نابێتە مایـەی دەرکەوتنی خود وشـیاری چینەکان. بێگومان حوسـەری دانەرو سەرچاوەی تیورییەکانی فەیسەڵ بو، بەڵام نابێت ئەوەش فەرامۆش بکرێ کە فەیسەڵو دەوروبەرە نەجیبزادەو مولکدارەکان (بەهۆی سیاسەتی خاوەندارێتی بریتانیاوە پەیدابوون)، هێشتا چینێکی یەکانگیریان پێکنەدەهێنا بۆ ئەوەی حوکمڕانی بکەن، بەڵکو تەنانەت بەمانا سیاسییە باوەکەش کۆنترۆڵی تەواویان نەبو.

سەرباری ئەوەی دیدوبۆچونی فەیسەڵ ـ حوسەری تێگەیشتنو مامەڵەکردنی فاکتە کۆمەڵایەتییـەکان بو، بـەڵام ئەوەی پێی قبوڵ نەبو، تەنها دەیویسـت لەچوارچێوەی ئەو فاکتە باوەدا بەرەو ئامانجە بانمیللەکان بڕوات. لەسـەر ئاستی فیکرێکی پوختدا، تێگەیشـتنی ئـەو دوو گرفتـە راسـتەقینەیەو شـێوازی چارەسـەرکردنی سیاسـییان، بەرزرادەگیرێ.

ئەو دوو کەسـە پەروەردەیەکی عوسـمانیان هەبو، بەڵام ئەو ماوەیەی فەیسـەڵ لە پارلەمانی عوسمانیدا بەرگری لە مەسەلەی عەرەبو ئامانجەکانی دەکرد، دڵسۆزییەکی بێوینەی بۆ دۆزینەوەی چارەسەری سیاسی کێشمەکێشەکان تێیدا چاند، بەجۆرێك کە



نەتەوەی عەرەب رێبەرێکی لەو بابەتەی بەخۆیەوە نەدیبو. نەوەکانی ئاینده بەدیدێکی جیاوازەوە تەماشای ئەو کارانە دەکەن، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە بەرژەوەندییە راسـتەقینەکانی کۆمەڵگەو رقوکینـەی چینە چەوسـاوەکانو قارەمانێتی جەماوەری تێکۆشـەرەوە هەبـو، بەڵام لە باشـترین حاڵەتـدا تێکەڵبونی روناکبیـران بە نێوەندی بیرمەنـدە رادیکاڵەکانەوە زۆر رووکەشـی بوە، چونکە لەسـەر ئەو مەسـەلە تیورییانە خۆیراگرتبو کە زیاتر شـتی دەشاردەوە تا ئاشکرایان بکات: شۆڕشی دژە ئیمپریالیزم، سۆسیالیزمی عەرەبی، بۆرجوازی بچوكو ئازادی ئابوری. سیاسەتی عێراقی هاوچەرخ مەسـەلەیەك بو شـایانی ئەوەبو لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ، ئەویش بەهۆی باڵاکردنی بەردەوامی بۆشـایی فیکریو توندوتیژی. هەر یەك لە فەیسـەڵو حوسـەری بەهۆی ئامرازە لاوازەکانی دەوڵەتەوە خۆیان بۆ بونیاتنانی کۆمەڵگەی مەدەنی تەرخان کردبو، بەڵام هەرگیز بیریان لەوە نەکردبووە کە هەر چۆنێك بوە دژایەتی ئەو سیستمە بکەن. سـەرباری گشـت دواکەوتنەکانی کۆمەڵگە، کەچی دەبوایە هەر ستایش بکرێو بە ئامـۆژگاریو نزیکبوونـەوە هانبدرێ، تەنانەت تا دەگاتە ئاسـتی بەفریودانیش، بەڵام نابێت هەرگیز توندوتیژی بەکاربهێنرێ، بەڵام کاتێك بەعس هاتە سـەر حوکم ئیدی بارودۆخەکە بەشێوازێکی زۆر جیاواز گۆڕانکاری بەسەردا هات.

لیۆنێـل سـمیس-ی بریتانی، راوێـژکاری وەزارەتی پەروەردەو فێرکـردن لەماوەی ١٩٢٠ ـ ١٩٣١دا، دوای جێهێشـتنی عێراق یادەوەرییەکی دانسـقەی نوسـیوەتەوە. بەدڵتەنگییەوە سیاسـەتی فەرمانو تەحریمکردنـی بریتانیای رەخنەکردوە کە لەماوەی ساڵانی ماندێتدا، بەوپەری سانابیو بەهەرزانترین نرخ کارەکانی بەرێوەدەبرد. دەبوایە بریتانیا هەر لەسەرەتاوە خۆی لەو کاروبارانە هەڵنەقورتانایە، یا هەمو شتێکی بەشێوازێکی کۆڵۆنیاڵی گونجاو چارەسەر بکردایە. یاداشتەکەی تێڕوانینی گرنگی لەسەر ئەو گرفتانە تیایە کە ئەزمونی بریتانیای لە عێراقدا روبەروی کارەسات کردۆتەوەو دەڵێت:

١. بچوکـی چینی فەرمانـڕەوا. "پێموایە لە مێـژووی هاوچەرخـدا دەوڵەتێك پەیدا ناکەین خاوەنی پارلەمانی مودێرن بێتو دوو سـەد تا سـێ سـەد کەس حوکمی

وڵات بکەن".

٢. "هەرگیز رۆحێکی راستەقینەی وڵاتپارێزی بەدینەدەکرا".

٣. سستیو لاوازی تەنانەت لە ئەخلاقی ئاینیشدا (لەوەش سسترو لاوازتر بەها مەدەنی یا میللیەکان)، بەتایبەت لەنێو موسڵمانە خوێندەوارەکاندا بەدیدەکرا. ئەو سستیو لاوازی ئەخلاقییە خیانەتی لە عەقڵیش دەکرد، رەنگە ئەو سستییە تەنها لە قۆناغێکی کورتو راگوزەردا بوونی هەبێت، بەڵام ئەگەر بەردەوام بێت، ناتوانم ئەوە بەدیبکەم کە چۆن شکست بە دامەزراندنی دەوڵەت دەهێنێت، وەکئەوەی ئەفلاتون بە "درۆیەکی رۆحی" وەسفکردوەو دڵسۆزیو راستگۆییش لە مامەڵەکردندا دەکاتە کارێکی زۆر زەحمەت"[14].

هەر چەندە حوسەریو سمیس دەربارەی سەربەخۆیی بیروڕای جیاوازیان هەبو، بەڵام پێکەوە دژی زۆرینەی سەرۆکەکانی خۆیان کاریان کردوە، هەروەها لەڕووی پیشەییەوە هەر دووکیان رێزی تایبەتیان بۆ یەکتری هەبو. بۆ نمونە سمیس بە جۆرێك ئاماژە بەحوسەری دەکات کە "تاکە کەسە لە وڵاتدا پسپۆری ئیداری لەگەڵ زانستو جۆشو خرۆشی بۆ زانستو پەروەردە پێکەوە گرێداوەو لەپێناوی لێهاتویی لە کاردا هەوڵی زۆری داوە، بەڵام پێموایە سەبارەت بە سیاسەت زۆرێك لە بیروڕاکانی هەڵە بوە"[15].

جیاوازی نێوان ئەو دوو کەسە هەر جۆرێك بێت، ئەوا حوسەریو سمیس تێگەیشتنێکی فیکری هاوبەشیان بۆ پەیوەندییەکانی نێوان بونیادە کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئەخلاقییەکانی عێراق هەبوە، لەو باوەرەشدابوون کە پەروەردەی گشتی دەتوانێت لەنێو دەستەبژێری روناکبیری ئایندەدا جۆرێك لە ئاکاری نمونەیی بچێنێت، ئەمە لەپاڵ فرەیی کۆمەڵایەتی کە هیچ تۆڕێکی یەکگرتو لە بەهاکان ناتوانێت جێگەیان بگرێتەوە، تەنها لە رێگەی چاندنی ئەخلاقی بە کۆمەڵی نوێو بەتازەگەرییەوە، دەتوانرێ بەسەریدا زاڵ بێت. ئەو ئازادییەی لە کۆمەڵگەی عێراقیدا بەدیارکەوت سودی بۆ هیچ یەکێك لەو دوو کەسە نەبو: هەر یەکەیان لەناخی خۆیدا وایدەبینی



کە ئەو ئازادییە کۆنترۆڵ ناکرێ، بەرپرسیارێتی تیانیەو بە ئامانجە دوور مەوداکانەوە پەیوەست نیە، بەپێی ئەو ئامانجانەش رەفتاری تاکەکان بەدیسپلینتر دەبێتو پێشبینی ئاراستەکانی دەکرێو لەواقیعدا لە رەفتاری حوسەریو سمیس دەچو، بەڵام عێراقییەکانی بیستو سییەکانی سەدەی بیستەم لە هیچ شتێکدا لەو دوانە نەدەچون. رەفتاری ناپێشبینی کراویان ئەو دوو کەسەی لە کوورە دوور دەخستەوە.

سمیس لەناوەراستی بیستەکانەوە دانی بەشکستی خۆیدا نا، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەشێوازێکی پڕ لە رقو کینەو نائومێدییەوە درێژەی بەکارەکانی خۆی دەدا. فەیسەڵ بە هۆی مەزنی نائومیدییەکانیەوە کۆچی دوایی کرد، لەلایەکەوە بەهۆی کارەساتی ساڵی ١٩٣٣ ئاشورییەکانەوە، لەلایەکی دی بەهۆی نەهاتنەدی ئەو هیواو ئاواتەی کە لە ناخیدا هەڵیگرتبو. فەیسەڵ پێش مردنی یاداشتێکی نهێنی نوسیوەو تێیدا هاتوە: "بەوپەری داخو پەژارەیەکی زۆرەوە کە ئازاری دڵم دەدا، دەڵێم تا ئێستا شتێك بەناوی میللەتی عێراقەوە بوونی نیە، بەڵام ئێمە سەروکارمان لەگەڵ جەماوەرێکی زۆرو زەوەندەوە هەیە کە بەشێوەیەك مرۆڤ وێنای ناکات، فیکری وڵاتپارێزیان تێیدا نیە، دڵو دەرونیان پڕە لە دابونەریتی ئاینیو خورافاتو هیچ خاڵێکی هاوبەش لەنێوانیاندا نیە، ناخیان پڕ لەشەڕ، حەز بەئاژاوەو پشێوی دەکەنو دژی هەمو جۆرە حکومەتێکن، ئێمەش دەمانەوێت لە رێگەی مەشق پێکردنو فێرکردنو پەروەردە کردنەوە، میلەتێك لەو جەماوەرە دروست بکەین. بە ئاوڕدانەوەیەك لە پێگەی ئەو جەماوەرە، مەزنی ئەو هەوڵو کۆششەمان بۆ بەدەردەکەوێت کە بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە دەیدەین"[16].

## ڕێگەی بەدیسپلینکردن:

حوسەری بەپێچەوانەی فەیسەڵو سمیسەوە لەگەڵ قەیرانە هاوچەرخەکاندا کامـڵ ببو، ڕەنگــە درکی بەو حەقیقەتــەش کردبێت کە تەنها پــەروەردەو فێرکردن ناتوانــن سیســتمێکی ئەخلاقی بەرهەمبهێنن، یــا ڕەنگە بەو ئاکامە گەیشــتبێت کە تازەگەرێتی جۆرێکە لە دیسپلینو دەسەڵاتی دەزگاکان دروستی دەکاتو بەشێوازێکی نوێ خۆیان بەسەر تاکەکاندا دەسەپێنن. سەرکردە تیوریستە ئەوروپاییەکان لەم بوارەدا دەیاننوسیو حوسەریش بە پەرۆشەوە تامەزرۆ بو بزانێت چ لەبواری زانستو پەروەردەدا ڕوودەدا[17]. هەرگیز ئامانجی پەیوەندی بەستن لەگەڵ دەسەڵاتی دیسپلیندا ئەوە نەبو لەڕێگەی هەڕەشــەی ســزادانەوە، پیادەی کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆ بکەن، بەڵام هەمیشە باجی کۆنترۆڵکردنی دوورمەودا یا چاودێریکردنی خود کە چاندنی ئامانجە تیورییەکان هانیدەدا، بەمانایەکی ورد لە خزمەتی مەبەستە زاتیەکاندا نەبو. لە واقیعدا پیادەکردنی دیســپلین بەمانــای ئەفراندنی "مرۆڤی نوێ" بو، نــەك یەکێك جێگەی یەکێکی دی بگرێتەوە. دیســپلین بەمانــای بۆ نمونە داهێنانی نەریت، سیســتم، گوێڕایەڵی نوێ، ئاگایــی لە وردەکاری هەمو فیکرو جەســتەیەك، بەشــێك لە دەســتگرتن بەکاتەوەو ڕێکخستنی کەشێکی ئەوتۆ بو کە لە کۆمەڵگەی تەقلیدیدا وێنەی نەبێت.

ئەم سیســتمو دیســپلینە لە قوتابخانە تازەکانی دەوڵەتدا کاری پێدەکراو لەڕێگەی خەڵکانــی وەك حوســەریو جێگرەکــەیو ســامی شــەوکەت-ەوە لــە قوتابخانــە ئینگلیزییەکانــەوە وەرگیرابو. سیســتمی فەســڵو تاقیکردنەوەو خوێندنی زانســتەکان بەتەواوەتی لەگەڵ ســەردەمی عوســمانیدا جیاواز بو. لەڕووی پراکتیکەوە سیســتمی دیســپلین بێکەموکورتی نەبو، بەتایبەتی کاتێك بەرپرســێکی بواری پەروەردەی وەك حوسەری ناچار دەبو پشت بە مامۆستایەکی وەك جەواهیری ببەستێت یا قوتابخانەکان لەلایەن کەســێکی "پەهلەوی زەدەوە" ئیدارە بدرێن. ســەرئەنجام حوسەری گەیشتە



ئــەو ڕایەی لە بزری کۆمەڵگەیەکی عەرەبی ڕاســتەقینەدا، یەکێتی عەرەبی پێویســتی بەشتی زیاتر لە قوتابخانە هەیە تا ئەو یەکێتییە لەناخدا بچێنرێ.

تا ئەم دواییەش عێراق زانیاری لەسەر دیسپلینی دەزگا دێرینەکانی ئەوروپا نەبو: بۆ نمونە ئەو ڕەبەنگانەی (دیر) ئەخلاقی تازەی کارکردنیان لە سیستمی فیودالی ئەوروپا دەچانــدو ســەروکاریان لەگەڵ خــودی مرۆڤەکاندا هەبو، یا کارگــەکان یا تەنانەت ئەو فێرگانەی مەشــقیان بە مرۆڤەکان دەکرد بۆ ئەوەی ببنە هاوڵاتییەکی نوێ[18]. لە چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا کەمبونەوەی ژمارەی دانیشتوانی عێراق ڕاگیرا. سێیەکی دانیشتوانی عێراق لەماوەی زۆربەی ساڵەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا کۆچەری بون. تۆڕەکانی تەندروســتی، قوتابخانە، نەخۆشخانەو شێتخانە کە زۆر دەمێك بو لە ئەوروپا بەربڵاوبون، تەنها لەنیوەی یەکەمی ســەدەی بیستەمدا لە عێراق بەشێوەیەکی نمونەیی بەدیارکەوتن. پێشئەوەی کۆمەڵگەی مەدەنی دەرفەتی ئەوەی هەبێت لەگەڵ ئەو ڕووە شارشــتانیەو ڕووەکانی دی هەڵبکات، لەپڕ سیســتمی مەدەنی لە شــێوەی پارلەمانو سوپا لە ئاسۆوە دەرکەوتن.

لە ڕۆژئاوا پارلەمان دوای چەندین سەدە لە گەشەکردن، ئنجا بەشێوەیەی ئێستای خۆیگــرت. هزری میلیگەرای دروســت ئەوەی پێقبوڵە کــە پارلەمانی عێراق بۆ ئەوە دروســتکرا تا لە سایەی ماندێتدا بەرژەوەندییەکانی بریتانیا بەباشترین شێوە بپارێزێت. بەڵگەی ئەو تاوانبارکردنەش، دەستەوەســتانو بێتوانایــی پارلەمان بو لەوەی خزمەتی ئامانجــە دیموکراســیەکانی وڵاتێکی وەك عێراق بکات. بۆیە دەبینین ســاڵی ١٩٥٨ پارلەمان بەبێ هیچ گرفتێك یا تەنانەت بەبێ هیچ نوزەیەکی ناڕەزایی هەڵوەشێنرایەوە، بەڵام لەسایەی حوکمی بەعسییەکاندا دیموکراسییەت دوبارە پێناسەکرایەوەو لەڕێگەی ئەنجومەنــە میلیەکانەوە زیاتر بەشــداریان پێیدەکرد. ســەرئەنجام ڕاســتیو خورافەی میلیگــەرا لــە مێژوویەکدا تێکەڵ بەیەکبــون کە ڕەگەزەکانی لــە ئەزمونی پارلەمانی عێراقدا بەشێوەیەکی نادروست شیتەڵدەکرا.

هەر ڕژێمێکی پارلەمانی بە بەراورد لەگەڵ ڕژێمی بەشــداریکردن سەرەتا پێویستی

به یاسا هەیە، پاشان پێویستی بە خۆدیسپلینکردن هەیە بۆ ئەوەی پێوەی پابەندبیت. گرنگترین یاسا دەست نیشانکردنی ناسنامەی ئەو گروپانەیە کە نوێنەرایەتی دەکرێن. ئەو ناسنامانەی لەسەر دەسەڵاتی باڵا بونیاتنراوە (هەروەکو هێندێك شار، مەڵبەندو چینەکانی ئەوروپا)، یا لەڕێگەی بەرژەوەندی خودی خۆبەخش (وەك چین، لوبی‌و گروپە بەرژەوەندییەدارەکان)، یا لەڕێگەی حیزبەکانەوە، بەپێی ویست‌و خواستی مرۆیی، وەك میکانیزمێك بۆ دیسپلینکردن یا پاکتاوکردن، کاردەکەن.

بریتانییەکان لە عێراقدا پارلەمانێکیان دروستکرد نوێنەرایەتی "هەرێمێکی" دەکرد، ئەو هەرێمەی پێشتر بەو سنورە جوگرافییەی پێناسەنەکرابو، هەروەها یەکێکی لە دەرەوەی ئەو هەرێمەشەوە کردە پاشای کە هەرگیز دانی بە رەوایەتی سنورەکەی نەدەنا. لێرەدا گرفتێك روبەروی میلەتانی عێراق دەبوە کە زۆربەیان موسڵمان بون، ئەو گرفتەی لە فۆرمی گروپەکان خۆی لە بیرۆکەی نوێنەرایەتی کردنی رەسمی دەنواند. ئیسلام هەر لەسەرەتاوە خۆی لە مەسیحییەت جیاکردەوە بەوەی بانگەوازی بەشداریکردنی لە حوکم دەکرد، بەڵام قسەی لەسەر سیستمی نوێنەرایەتی نەدەکرد. هەروەها شەریعەتی ئیسلامیش هەرگیز بیرۆکەی ئەفراندنی کەسایەتی یاسایی هاوبەشی نەدەوروژاند، چونکە لە ئیسلامدا بوار بۆ ئەوجۆرە بەشداریکردنە نادرێ یەکێك خۆی بخاتە نێوان موسڵمان‌و خوداکەیەوە. لەپاڵ ئەوەشدا ئیسلام شەریعەت بۆ رەفتاری گشت کۆمەڵی ئیسلام دادەنێت کە لەبان کاروباری شەخسی‌و تایبەتییەکانیەوەیە. لە ئیسلامدا رەتکردنەوەی خود بە رێورەسمی هاوبەشی سروتە ئاینیەکانەوە بەستراوەتەوە، بۆ نمونە خۆی لە حەج یا جیهاد دەبینێتەوە. بۆیە کاتێك ئەم جیاوازییە کولتورییە گەورەیەی سیستمی نوێنەرایەتی لەگەڵ چینە کۆمەڵایەتیە ناوشیارەکان یا ئەوەی هەر لەبنەڕەتەوە بوونی نیە، لێکدەدرێ کە لەلایەن مەسیحییەکی بیانییەوە بەپێی یاسایەکی دیاریکراو سەپێنرابو، ئنجا کارتۆنی سیستمی پارلەمانی لە عێراقدا دەردەکەوێت.

سەرباری هەموو ئەوانەش پارلەمان پێش ساڵی ١٩٤١ توانی بەشێوەیەکی سەرسورهێنەر میکانیزمێك بۆ دەرکردنی تاك لە کۆمەڵ بدۆزێتەوە. ئیدی لێرە بەدواوە



پارلەمانی عێراق بوە ئەو دەزگایەی تا ئاستێکی بەرفراوان بەرپرسیارێتی دابینکردنی ئازادییە کۆمەڵایەتییەکانی لە ئەستۆ دەگرت، ئەو ئازادییە بەرفراوانەش لە ئازادی چاپەمەنییەکاندا بەرجەستە دەبو. شەبەنگێکی مەزن لە فیکرو بیروباوەر، تەنانەت لە بیروباوەری کۆن‌و نامۆکانیش لە چاپەمەنیدا ئازادانە رەنگیدەدایەوە[19]، بەهۆی بەو ئازادییەوە ئەوەی لە ساڵانی دوای کودەتاکەی ١٩٥٨ەوە روویدەدا، درەوشانەوەو رەنگدانەوەی روداوەکانی ماوەی نێوان هەر دوو جەنگی جیهانی بو. لەواقیعدا ئازادی دەیەی ١٩٢٠و ١٩٣٠دا، هەمان رایەڵەی بەدەوڵەت‌و کۆمەڵگەوە هەبو کە نەبونی رەهای ئازادی لە دەیەی ١٩٧٠دا بەو شێوەیە لە عێراقدا رەگوریشەی داکوتا. هەر دوو حاڵەتەکە ئازادی‌و نەبوونی ئازادی هەرەشەی لە کۆمەڵگەی نەریتی دەکردو وەك ئامرازێکی توندڕەوانەو ریشەیی لەدژی دواکەوتن بەکاردەهێنران.

نەوەکانی داهاتوی عێراق بەچاوی بێزاری‌و توڕەییەوە تەماشای روداوەکانی ئەو چەند ساڵەیان دەکرد:

"لەماوەی ماندێتدا بایەخدان بە مەسەلە سیاسییەکان هەمو سنورە لۆجیك‌و پەسەندکراوەکانی تێپەراندو ئەو بایەخدانەش هەمو ئەو لایەنە کۆمەڵاتیانەی داپۆشیبو کە پەیوەست بون بە مەسەلەی نەتەوایەتییەوە، بەڵام خەڵکانێك هەبون کە بەداخەوە کەمایەتی بوون، سەرقاڵبوونی خەڵکی بە مەسەلە سیاسییەکان، توشی دڵەڕاوکێی کردبون. عەلی شەوکەتی شاعیر، یەکێك بو لەو کەسانەی کە پێیوابو سەرلەبەری میللەت بوە بە کۆمەڵێك سیاسی. مزگەوت، ژووری نوستن، قاوەخانە، دوکان، جادە، قوتابخانە، نوسینگەی پارێزەران‌و سەربازخانەکان، هەر هەمویان بەبێ ئاوارتەیی لەبەرامبەر کێشی سیاسی بەرگری خۆیان لەدەست دابو"[20].

عیزەدین، گوناهی ئەو هەمو ئازادییەی عێراقییەکانی بارگاوی کردبو، دەخستە سەر "کۆت‌و بەندی بیانی". پارلەمان لە دیدی عەرەبە نەتەوەگەراکانەوە بەرجەستەی هەمو شتێکی خراپی دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جۆرە ئازادییە لەلای عیزەدینەوە شتێکی ناپەسەند بو.

لەدیدی زۆرینەی خەڵکی عێراقەوە شکستی پارلەمان بەخاتری ئەو پارلەمانتارانەوە بـو کە خەسـڵەتی پارلەمانتاریان تیانەبـو. لەو رۆژگارەدا زۆرێك لە بەرجەسـتەبوونی پەرگیری سیاسـەت دەگەڕایەوە بۆ لێڵی دونیای سـایکۆلۆجیای سیاسـەت کە تێیدا جل پۆشـین، نەریت، دەربڕینی خراپو رەفتاری گشـتی لەگەڵ ناسنامەی خەڵکیو تێڕوانینیـان بۆ شـتەکان لە جوڵەو جێگۆڕکێدا بو. میلەت بەرەو هەڵوێسـتی خورافی پەلکێـش کرا، کە بەبۆچونی ئەوان، وەك سـەرچاوەی مەزنـی ئیمپراتۆرییەتی بریتانیا تەماشـا دەکران کە خۆی لە کەسێکی بریتانی خوێنساردو بەدیسپلینو دوور لە سۆزو عاتیفە بەرجەسـتە دەکرد. عێراقییەکان لە بیستەکانی سـەدەی بیستەمدا واتەماشای بریتانییەکانیان دەکرد کە رەنگە بەهۆی دیسـپلینەوە ئەو ئازادییەیان بەدەستهێنابێت، بەڵام هـاوەڵە عێراقییەکـانیان کـاتێك لـەپارلـەمـاندا گفتوگۆیـان لەسـەر کـاروبـاری وڵات دەکرد، زیـاد لـە پێویسـت خوێن گـەرمو میزاجی بـون. بۆیە خـەڵکی لـەبەر ئەوەی باوەریان بەو شـتانە هەبو نوکتەیان لەسـەر خۆیان دادەهێناو سـەرچاوەی ئەو نوکتانەشـیان بەهاوکاری دەوڵەتی ماندێت دەزانی، بەڵام ئـەو نوکتەو گاڵتەجارییانە زۆرێك لە حەقیقەتی پەردەپۆش دەکرد کە پەیوەندی بەسەردەمی هاوچەرخەوە هەبو. نارەزاییو دژایەتیکردنی ماندێتی بریتانیا لەلایەن خەڵکی عێراقەوە هەر چەندێك بێت، ئەوا دیسـانەوە عێراقییەکان جۆرێك لە سەرسـامیو شـەیداییان بۆی هەبو. ئەو دژە ئیمپریالیزمییەش کە سـاڵانی دواتر بەدیارکەوت پەیوەندی بەو سەرسامیو شەیدابییەوە هەبو، بۆیە ئەو دوو هەسـتە لەیـەك کاتدا لە تاکەکەسـێکدا بەدیدەکرا. ئەم جیهانە تیرئاسا بەنێو شاراوەکانی سەدەکاندا تێدەپەڕیو دەرئەنجامی سەیریشی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبو. شـەیدایی بەوجۆرە دیاردانە مەسـەلەیەکی زۆر نامۆ بو، بەڵام رێگەیەکی پەسـەندبو بۆ گەیشـتن بەوجۆرە مەسـەلانە. بـۆ یەکەمین جار تاکـەکان لە عێراقدا خرانەسـەر شانۆی سیاسەتو کاروبارەکانیش وەك شـانۆیەك دەبینرا، ئەمە سەرباری ئەوەی رەگەزێکی سیاسی راستەقینەی بەرجەستە دەکرد.

بەدەرکەوتنـی پانعەرەبیـزم هەمو شـتێك گۆڕانکاری بەسـەردا هات. لەسـاڵانی



سـییەکان بەدواوە هەمو رەگەزێکی هونەری سـاکار لە رەفتاری سیاسیدا بو بەهەڵم، هەروەهـا هەمو رۆحییەتێکـی قۆشـمەچی عێراقییەکانیش بەرەو نەمان دەرۆیشـت. بزوتنەوەی نەتەوەگەرای عەرەبی هەمو بیرۆکەکانی دەوروبەری خۆی بەهەڵە دەزانی. "رووکەش" بوە سەرپۆشـێكو ئەو هێزە کاریگەرە شاراوانەی دەشاردەوە کە گەمەیان بە بەرژەوەندی نەتەوایەتییەوە دەکرد. ئەم رووکەشە جگە لە گوزارەیەك کە گوزارشتی لە ئیمپریالیزمی گەندەڵو دەسـەڵاتی رۆژئاوا دەکرد هیچی دی نەبو. هێشتا هێندێك لەوانەی لە سـییەکانەوە پرەنسـیپی پانعەرەبیزمیـان هەڵگرتوە، زۆریـك لە گوزارەی گاڵتەئامێزی ئەدەبیو قۆشمەچێتیان تێیدا دەبینرێ، بەپێچەوانەی نەیارە بەعسییەکانەوە کە لەو بوارەدا بەشدارییان ناکەن[21].

سـوپا تاکە دامەزراوەی نوێ بو کە لـە هەمو عێراقی هاوچەرخدا نامۆ نەبو، بەڵام رەگوریشـەیەکی قوڵی لە نەریتدا هەبو، هەر چەندە لەسـەردەمی دوای ئیمپراتۆرێتی عوسمانیشـدا دامەزرابو. سوپا بنەمای هەمو سیاسەتێك بو، هەروەها شارەکان بەپێی ئەو دادەمەزراو گەورە دەبون، موڵکدارێتیش درێژکراوەیەکی لەرزۆکی هێزی ناوەندی سـوپا بو. تازەگەرێتی لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا لە رێگەی رێکخراوە سەربازییەکانەوە بەبێ بەرگری رێچکەی خۆی گرتەبەر. فەیسەڵ ساڵی ١٩١٦ لە رێگەی ئەو ئەفسەرە سـەربازییانەوە شۆڕشی هەڵایساند کە لە سوپا عوسمانی دەرکرابون، نەك لە رێگەی پروپاگەندەچیو سیستمی پەروەردەییەوە.

گرنگـی تەبەنیکردنـی سـوپا وەك پێشـەنگی تازەگەرێتـی لـە عێراقـدا لەسـەر گۆشـەگیرکردنی تـەواوی ئەم دەسـکەلایە وەك ئامـرازی تازەگەرێتـی بونیات نرابو (بەپێچەوانەی ئەزمونی ئەوروپا، یا تەنانەت ئەزمونی میسر لە سەردەمی محەمەد عەلی پاشـادا). لە عێراقی سـاڵی ١٩٢١دا ئەفسـەران، بەتایبەتی دەوراندیدەکانی شۆڕشی عەرەبی تا رادەیەکی زۆر شارەزاو بەئەزمونو لێهاتو بونو زانیاری زۆریان لەسەر دونیا هەبـو. بۆیـە دەبینین لە مـاوەی ١٩٢٢ تا ١٩٣٢دا لە نێو چواردە سـەرەك وەزیر، نۆ کەسیان لە سوپای عوسمانی ئەفسەر بونو جلوبەرگی سەربازییان داکەنو سیاسەتو

دەسکەوتی شەخسیان پۆشی[22].

لە ناوەراستی بیستەکاندا، واتە ماوەیەکی زۆر پێش سەربەخۆیی عێراق گفتوگۆ دەربارەی سەربازگیری لە ئارادا بو. کورد، شیعەو بریتانیا دژی سەربازگیری بون. گەورەیی نارەزایی کوردو شیعە، فەیسەڵی والیکرد واز لەو بیرۆکەیە بهێنێت، چونکە نەیدەتوانی لەبەرچاویان نەگرێ، بەڵام حوسەری لە سەربازگیریدا پەروەدەی بەخورتی دەبینیو بەتەواوکەری پەروەردەی گشتی دەزانی. سەربازگیری بە کارخانەیەك دادەنا بۆ بەرهەمهێنانی مرۆڤی نوێو زاڵبون بەسەر تایفەگەریداو لەنێوبردنی جیاوازی نێوان توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگە. لە نوسینەکانیدا ئەوە بەدیدەکرێ کە قوتابخانەو سەربازخانەکان ئەرکێکی ئەخلاقیو کۆمەڵایەتی وەکیەك پێکدەهێنن، تەنها جیاوازی نێوانیان لە تەمەنو ئاستی ئەو دیسپلینەیە کە هەر یەك لەو دوو سیستمە هەڵیدەگرێت.

سەرباز لەکاتی خزمەتی سەربازیدا لە دەرەوەی بواری کارەکەیو دوور لەو ژیانەی کە حەزی لێی هەیەو دوور لە خێزانو کەسوکارەکەی ژیان دەگوزەرێنێ. سەرباز هەمو شتێکی خۆیو خێزانەکەی بەجێدەهێڵێتو لەنێو سەربازخانەکاندا لەگەڵ هاوڵاتیانی خۆی ژیان بەسەر دەبات، هەروەها تێکەڵ بەو خەڵکانەش دەبێت کە لە خێزانو چینە جیاوازەکانەوە هاتونو هەڵگری بیروباوەری جیاوازو پیشەی جۆراوجۆرن. لەوێدا سەرباز لە سایەی زەبتوبەرتێکی هەمەگیردا لەگەڵ ئەو هەمو خەڵکە جیاوازەدا دەژی. لەپێناوی ئامانجێکدا کاردەکات کە هیچ پەیوەندی بەخۆیو خێزانەکەیو تەنانەت بەناوچەکەیشییەوە نیە، بەڵکو کار بۆ ئامانجێکی بەرزترو باڵاتر دەکات. سەربازخانەکان لە قوتابخانە کۆمەڵایەتیەکان دەچن کە تێیدا مرۆڤ لە خۆویستیو خۆپەرستی رزگاری دەبێتو هەست بەبوونی ئەوانی دیو نیشتمانو نەتەوە دەکاتو فێری هەمو جۆرە قوربانیدانێکی راستەقینە دەبێت.

"بەهەمو دڵنیاییەکەوە مرۆڤ بەسروشت نیشتمانگەرایە... ناتوانێت دوور لە خەڵکانی دی هەڵکات، بەڵکو پێویستە لەسەری هەمیشە تێکەڵی گروپەکانی



هاورەگەزەی خۆی ببێت. هەڵبەتە ئاستی کۆمەڵایەتیبون لەنێو تاکەکاندا یەکسان نیەو جیاوازی هەیە. رەنگە لە یەکێکدا بەرزو بەهێز بێت، لەیەکێکی دی سستو لاواز. پەروەردەو فێرکردنی کۆمەڵایەتی ئامانجی بەهێزکردنی رۆحو کاری کۆمەڵایەتییە، بۆیە هەر لەم دەسپێکەوە دەتوانین بڵێین ژیانی سەربازێتی کە گەنجان لە رێگەی سەربازگیرییەوە بۆ خزمەتی ئاڵا کۆدەکاتەوە، گرنگترین ئامرازی بڵاوکردنەوەی پەروەردەو یەکخستنی ئاراستەیەکی لەوجۆرەیە"[23].

بەبێ چینێکی فەرمانڕەوا کە بەشێوەیەکی لۆجیکی پێکەوە بەستراببێتەوەو بەبێ پەروەردەیەك بۆ ئەفراندنی ئەم چینەو تۆکمەکردنی پایەکانی، سوپا دەبێتە ئامرازێك بۆ دەربازبون لەو جۆرە گێژاوە. لەدیدی ئەو جەماوەرەی بەرەو دەرکەوتن دەچو، سوپا سومبولی ئەو کەسە بو کە دەیویست بە کەسێکی نوێخواز لە قەڵەم بدرێ. بەمشێوەیە تازەگەرێتیو رێکخستنی پیاوانو بەستنەوەیان لە هونەری پیاو کوشتنو هاورەگەز قڕکردن، لە عێراقدا یەك مەسەلە بو. عێراق بە پێچەوانەی وڵاتانی جیهانی سێیەمەوە، سەدەیەك یا نزیکەی سەدەیەك لە فۆڕمی دەوڵەت مایەوەو لە سنورێکدا کە بەنزیکەیی لە سنوری سەدەی بیستەم دەچو (بۆ نمونە میسرو زۆربەی وڵاتانی ئەمەریکای لاتین)، هەمو شتێك زۆر تازە بو، کاتی پێویستی بۆ گەشەسەندن نەبو. سوپا بەلانیکەمەوە لەسەر نەریتی پێکەوە گرێدانی ئەفسەرو سەردەمی هاوچەرخ دامەزرا، ئەمە سەرباری ئەوەی تاکە دەزگا بو لە کارەکانیدا سەرکەوتو بو. ئەم حاڵەتەش، لە حاڵەتی ئەو دەزگایانە نەدەچو کە لە نێو خۆیاندا کێبەرکێیان دەکرد (بۆ نمونە بیروکراسییەت، حیزبو یەکێتییەکان)، یا تەنانەت مەسەلەی هەوڵدانی سوپا بۆ دەسەڵات گرتنەدەستو کۆنترۆڵکردنی ئامرازەکانی توندوتیژی لە ئارادا نەبو، ئەگەر چی بریتانییەکان کۆنترۆڵی ئەو ئامرازانەیان کردبو. هێشتا سوپا کەسایەتی "رزگارکەری وڵاتی" بەرجەستە نەکردبو. یا ئامرازێکی سەروەری نەبو، بەڵکو ئامرازێك بو کە کۆمەڵگەی عێراقی لە رێگەیەوە هەنگاوی بەرەو سەردەمێکی هاوچەرخی راستەقینە دەنا، ئەمەش لەسەر هەمان مانای ئەو تازەگەرییە پیادە دەبێ کە حوسەری لێی

تێگەیشتبو.

کاتێك سیستمی پەروەردەو فێرکردن ڕێگەی خۆی دەبڕی، فیکری تازەش لەنێو خەڵکیدا شوێن خۆی قایمدەکرد، لە پارلەمانیش گفتوگۆکان زیاتر لە شێوەی ململانێو دەمەقاڵێ دەردەکەوتنو بەرژەوەندییە کەسایەتییەکان سێبەری بۆ گەندەڵی خۆشدەکرد، بەڵام شانبەشانی ئەوەش نەوەیەکی نوێ لە ئەفسەران بەداهێنانو لەژێر چاودێری بریتانییەکان گەشەیدەکرد، تا ئەو ئەفسەرانە کۆڵێجی سەربازییان تەواو دەکرد، ئەفسەرانی سوپای عوسمانیش جێگەیان بۆ چۆڵدەکردن. وشەکانی حوسەری مانادار بون. بەمشێوەیە ئەوانە بەپێی نەریتی هاوڕێکانیان، ئەوانەی لەخۆیان بەتەمەنتر بونو بەسروشی حوسەری مەشخەڵی پێشکەوتنیان لە وڵاتدا هەڵکرد.

هەستو پەرچەکرداری خەڵکی بەرامبەر بە مەسەلەی سوپا جیاواز بو. شیعە لەوە دەترسا سوننە کۆنترۆڵی سوپا بکاتو لەوەشدا هەقیان بو. هەروەها سوننەکانی لەبابەت حوسەریش هەستیان دەکرد نارەزایی کۆنەپەرستانەی خێڵەکی شیعەکان لەدژی رابون بەرەو سەردەمێکی هاوچەرخ، لەبەرگری سەربازگیریدا دەردەکەوێت. سەرئەنجام نارەزایی شیعە لەبەرامبەر سەربازگیریدا خۆی رانەگرتو داڕوخا، لەبەر ئەوەی گەشەکردنیان لە بواری دی دەویست، بۆ نمونە لە بواری پەروەردەدا. ئەگەر چی ئەو نارەزاییانە داروخا، لەگەڵ ئەوەشدا دەبوایە کارێك بکرێو پێویست بو جگە لە سەربازگیری، مەسەلەیەکی پارێزراوتر هەبێت، کە نیشانەی ڕۆڵی پێشەنگی سەربازی بێت لە تازەگەریدا، ئەم دەرفەتەش لە هاوینی ١٩٣٣دا هاتەپێشەوە، کە لە وڵاتدا بەمەسەلەی ئاشورییەکان دەناسرێتەوە.



## سوپاو ئاشورییەکان:

ئاشورییەکان، خەڵکانێکی چیانشینی رەگەز سامیینو لە باکوری عێراقدا دەژین. ئاشورییەکان خۆیان بە نەوەی ئیمپراتۆرییەتی ئاشور دەزانن کە پایتەختەکەی نەینەوا بو (٣٠٠٠ ـ ٦٠٠ پ. ز)و هێشتا شوێنەوارەکەی لەنزیك موسڵ ماوەتەوە. ئاشورییەکان بەزمانی سیراکی دەدوێن کە لقێکە لە زمانی ئارامیو تا ئێستاش لە سروتەکانیان بەکاریدەهێننو لە پێش پەیدابوونی زمانی عەرەبیدا لە تەواوی ناوچەی هیلالی خەسیبدا بەکاردەهێنرا. ئاشورییەکان ئاینی نەستوری مەسیحییان وەرگرتو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیش ساڵی ١٨٤٥ وەك میلەتێك لە میلەتەکانی دەوڵەتی عوسمانی دانپیانان. تورکەکان ساڵی ١٩١٥ دەستیان کرد بە قەتلوعام کردنیانو ترسو دڵەڕاوکێیان خستە نێویانەوەو وڵات بەدەریان کردنو نزیکەی ٥٠ هەزار کەسیان بۆ باشور راگواستو لە عێراق نیشتەجێ بونو لەو ئۆردوگایانە دەژیان کە بریتانیا خەزینەکەی لە ئەستۆ گرتبو. ساڵی ١٩٢٠ ئاشورییەکان بە شێوەیەکی کاریگەر بۆ کپکردنی راپەرینی دژ بە بریتانییەکان بەکارهێنران. ئاشورییەکان لەناو سوپادا بۆ لێدانی راپەرین کاریان دەکرد. ساڵی ١٩٢٢ لەشکرێکیان بۆ کردنەوە کە ئەفسەرە ئینگلیزەکان بەرێوەیان دەبردو موچەیان پێدەدانو پێیان دەوتن "خۆبەخشەکانی عێراق". ئەوانە بەجۆرێك رێکخرابون تا تێچوی بریتانییەکان لە ئیدارەدانی میزۆپۆتامیا کەمبکەنەوە. بەشێك لەو ئاشوریانەی عوسمانییەکان دەریانکردبون بەدوای نیشتمانێکدا دەگەڕانو ئەوانیش وەك کورد خۆیان بەعەرەب نەدەزانیو هەستێکی ئاشورییانەی بەهێزیان هەبو. رێبەری رۆحیان مارشەمعون، کێشەو داواو ستەمی ئاشورییەکانی تەبەنی دەکردو راستەوخۆ لەگەڵ کۆمیسەری باڵای بریتانیا مامەڵەی دەکرد، ئەمەش ئەوە رووندەکاتەوە کە پێیان خۆش نەبو لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عێراقدا مامەڵە بکەن. سەرئەنجام ساڵی ١٩٣٢ رەگەزنامەی عێراقیان وەرگرتو بوون بە هاوڵاتی عێراقی.

مەسەلەی ئاشورییەکان ساڵی ١٩٣٣ دەستی پێکرد، ئەویش دوای ئەوەی کە ئاشورییەکان هەستیان کرد ئینگلیزەکان خیانەتیان لە کێشەکەیان کردووەو بە کۆتایی هاتنی ماوەی ماندێتی بریتانیا پاشەرۆژیان زامن ناکرێ. ساڵی ١٩٣١ مارشەمعون داوایەکی پێشکەش بە کۆمەڵەی نەتەوەکان کرد کە تێیدا پێشنیازی کردبو نیشتمانێکی سەربەخۆ لە چوارچێوەی عێراقدا بۆ ئاشورییەکان دیاریبکرێ، ئنجا داوایەکی دی پێشنیاز کرد تا هەمو ئاشورییەکان لەئەوروپا نیشتەجێ بکرێن، ئەگەر نا لە سوریا نیشتەجێ بکرێن. هەر چەندە گشت ئەو هەوڵانە شکستیان هێنا، بەڵام دیسانەوە هەر گوشاری زۆریان دەخستە سەر حکومەتی عێراق. سەرئەنجام وەرگرتنی عێراق لە کۆمەڵەی نەتەوەکان بەو مەرجە بو کە گرەنتی رەسمی بدات پاریزگاری لە کەمایەتییە زۆرەکانی وڵات بکات.

مارشەمعون لە تەموزی ١٩٣٣دا پێشنیازی کرد لە چوار چێوەی عێراقدا وەك میلەتێك، نەك وەك گروپێکی ئاینی دان بە ئاشورییەکاندا بنرێو نیشتمانەکەیان لە عێراق، ئامێدی، زاخۆو دهۆك بگرێتەوە (ئەو ناوچانە نێوەندی نیشتەجێی کوردەو دوژمنی تەقلیدی ئاشورییەکانن)و دەرگاشی لەسەر ئاشورییەکانی هەمو جیهان ئاواڵە بێتو ئەو یەکە سەربازییە ئاشوریانەی پێشتر هەڵوەشابونەوە، سەرلەنوێ دروست بکرێنەوەو وەك لەشکرێك لە سوپای عێراقدا بمێننەوە. ئەو سەرزەمینانەی ساڵی ١٩٢٥ درابو بە تورکیا لە رێگەی حکومەتی عێراقەوە بخرێتەوە سەر نیشتمانی ئاشورییەکان. لە کۆتاییدا لەسەر کۆمەڵەی نەتەوەکان پێویستە بەرەسمی مارشەمعون بە پاتریاریکی ئاشورییەکان بناسێنێتو ساڵانە بودجەی تایبەتی بۆ ببرێتەوە، ئیدی گرنگ نەبو کێ ئەو بودجەیە دابین دەکات. فەیسەڵ گفتوگۆیەکی ناکۆتای دەربارەی ئەو داواکاریانە گرتەبەرو زۆر لەگەڵیاندا پشو درێژ بو، بەڵام سێ داواکاری یەکەمی بەتەواوەتی رەتکردەوە.

ئەم مەسەلەیە بەئامادەکردنی بەرنامەیەك کۆتایی هات کە لە پێواری (غیابی) فەیسەڵدا، لەرێگەی سوپاوە جێبەجێ بکرێ. ئەوەش بەهۆی پیلانێکی نێوان



حیکمەت سلێمان (وەزیری ناوخۆو ئەندامی باڵی چەپی گروپی ئەلئەهالی)و رەشید عالی (سەرەك وەزیرانو یەکێك لە قەومەچییە پایەبڵندەکانی عەرەب کە ساڵی ١٩٤١ بوە رێبەری شۆڕشی عێراق لەدژی بریتانیا) بو. جەنەڕاڵ بەکر سدقی سروشبەخشو بەرێوەبەری ئەم بیرۆکە ترسناکە بو، هەر خۆیشی پێشەنگی کودەتا سەربازییەکانی جیهانی عەرەبی هاوچەرخ بو، بەوەی ساڵی ١٩٣٦ یەکەم کودەتای سەربازی عەرەبی ئەنجامدا، هەروەکو پێشتر باسمان لێوەکردوە.

کۆمۆنەیەکی بچوکی وەك ئاشورییەکان رۆژێك لەرۆژان هەڕەشەیەکی راستەقینەیان لەسەر دەوڵەتی عێراق دروست نەکردوە. گروپێکی چەند کەسی کە وێڵی نیشتمان بوون لە سنوری عێراقەوە بۆ سوریا پەرینەوە، بەڵام لەڕێگەی فەرەنسییەکانەوە سنورداش کرانەوە. ئەو روداوەش بوە هۆی کوشتنی دەیان کەس لەسنوری هەر دوو وڵاتەکە. هەر خێرا سوپاو حکومەتو مێژوونوسی ناسیونالیستی عەرەبی، خەلدون حوسەری (کوری ساتع حوسەری) ئەو روداوەیان وەك شۆڕش لەقەڵەمدا، بەڵام تەنانەت خەلدون حوسەریش کە هەوڵی بێتاوانی سوپای دەدا، باس لە گەڵاڵەنامەیەکی بەرفراوان دەکات کە دژی ئاشورییەکان جێبەجی کرا. خێڵە کوردەکانیش پڕچەك کرانو لەلایەن سوپاوە هاندەدران.

ئاشورییەکان لەهەمو لایەکەوە گەمارۆدرانو لە هەر لایەکەوە دەرکەوتنایە تەقەیان لێدەکرا، گوندەکانیان لەلایەن کورد، عەرەبو خێڵە ئیزیدییەکانەوە تاڵانکرا، هەر کارمەندێکی دەوڵەتیش نارەزایی دەربڕیایە لەلایەن پیاوانی سوپاوە هەڕەشەی لێدەکرا. بەکورتی هاوینی ساڵی ١٩٣٣ وەرزێکی کراوە بو بۆ ئاشورییەکانی عێراق، بەپێی خەملاندنەکانی خەلدون ژمارەی کوژراوەکان خۆی لە ٦٠٠ کەس دەدا، بەڵام ئاشورییەکان دەڵێن نزیکی ٣٠٠٠ کەسیان لێ قەتلوعام کراوە.

زۆرێك لە ئاوارەکان روویانکردە شاری موسڵو گوندە ئارامەکانی دەوروبەری. لە ١١/ئابدا تیمێکی پڕچەکی سوپای عێراق بەفەرمانی جەنەڕاڵ سدقی خۆیان کرد بەناو شارۆچکەی سومێڵەوەو دانیشتوانەکەیشی بێئەوەی بەرگری بکەن چەکەکانیان

دانا.

"لەناکاو بەبێ هیچ ئاگادارییەکی پێشـوەخت سـەربازەکان لولـەی چەکەکانیان کردە ئاشورییە بێچەکەکان. ژمارەیەك لە ژن‌و منداڵ کوژران، ئەوەشی مایەوە خۆیان کرد بەناو ماڵەکاندا بۆ ئەوەی گیانی خۆیان رزگار بکەن...

ئەم کارە ماوەیەکی خایاند. سوپا هیچ پەلەی نەبو، رۆژێکی دوورودرێژیان لەبەردەم بـو. نەیارەکانیان بـێ چەك بون، هیچ دەرفەتێکیش بۆ هـاوکاری‌و کۆمەك کردنیان لەئارادا نەبو. رەشـاش بەدەستەکان رووی چەکەکانیان کردە پەنجەرەی ئەو ماڵانەی کە ئاشـورییەکان پەنایان بۆ بردبون، دەسـتیان کرد بەتەقەکردن‌و دروێنەکردنی هەمو ئەوانـەی لـە ماڵەکاندا خۆیان شـاردبووە. هێندێك جار ئەو سـەربازانەی چێژیان لە خوێن رشتن وەردەگرت، پیاوەکانیان دەهێنایە دەرەوەی خانوەکەو تیربارانیان دەکردن یا تا مردن لێیان دەدان، پاشـان لاشـەکانیان خستەوە سەر لاشە کەڵەکە کراوەکانی دی"[25].

گرنگـی مێژوویی روداوەکەی هاوینی ١٩٣٣ی عێراق لە خودی روداوەکەدا نەبو، بەڵکو لە چۆنێتی راڤەکردنی بو لەلایەن خەڵکییەوە. هەمو حەکایەتەکان بەکۆیدەنگ کۆکن لەسـەر ئەوەی کە خەڵکی جۆش‌و خرۆشـێکی بێوینەی بۆ کردەوەکانی سوپا هەبو. لە شاری موسڵ تاقی سەرکەوتن دروستکرا کە "بەکاڵەکی لەخوێن هەڵکێشراو رازابـوەوو خەنجەرێك لـە کاڵەکەکە چەقێنرا بو. ئەوەش لەرووی هونەرییەوە سـەری ئاشـورییە سەربڕاوەکانی دەنواندو لەهەمان کاتدا گوزارشتی لە هەستو سۆزی باوی ئەو رۆژگارە دەکرد"[26]. خەلدون حوسەری کە لەو رۆژگارەدا نەوجەوان بو، لەدوای روداوەکان بەچاوی خۆی پێشوازی سوپای لە بەغدا بینیوە:

"لـە ٢٦/ ئابدا یەکپارچە شـاری بەغدا بەمەبەسـتی پێشـوازیکردن لە یەکەکانی سـوپا رژانە سـەر جادەکان، ئەو یەکانەی لەدوای پرۆسـەی کوشـتنی ئاشورییەکان گەڕابونەوە. بەهەزاران کەس لە ژن‌و منداڵ‌و پیاو، سـەر جادەو گۆڕەپان‌و سـەربانی ماڵەکانیـان تەنیبو، هەمو شـتێك بۆ ماوەی چەندین کاتژمێر لەکارو جوڵە وەسـتان.



کاتێك سـەربازەکان بەشـەقامەکانی پایتەختدا تێدەپەڕین، جەماوەرێکی زۆرو زەوەند بـە جۆش‌و خرۆشـەوە هۆرایان دەکێشـاو هەلهەلەیان بۆ لێـدەدان. ژن‌و منداڵ‌و پیاو لە سـەربانەکانەوە گوڵبارانی سـەربازەکانیان دەکردو گوڵاویان بەسـەردا دەپرژاندن. هێشـتا نوسەر ئەوەی لەیاد ماوە کە چۆن لەو رۆژەدا رێگەیان بەخۆی‌و خوشکەکەی داوە گوڵی باخچەکەی ماڵی خۆیان لێبکەنەوەو لەباڵەکۆنی کلینکێکی سـەر جادەی رەشـید، سـەربازەکانیان پێ گوڵ بارانکـردوە. فڕۆکەکانی هێزی ئاسـمانی عێراق بەئاسـمانی پایتەختدا دەسـوڕانەوەو بڵاونامەی رەنگاو رەنگیـان پەخش دەکرد. ئەو بڵاونامانە لیژنەی پێشـوازیکردن لە سـەربازەکان ئامادەیان کردبو، تێیدا هاتبو "سڵاو لـە پارێزەرانی خاکی باوباپیـران ... لە بەرامبەر دوژمنانی لەیوکی کۆڵۆنیالیزمدا هەر پایەداربن".

سـوپاو غازی شانشین شادو کامەران بون، بەتایبەتی غازی کە لایەنگری لە سوپا دەکـرد بۆ ئەوەی ئاشـورییەکان تەمێ بکات. ئەمیر غازی بە پشـتیوانی کردنی ئەو هەڵمەتـە بوە خۆشەویسـتی میلەت‌و جەماوەر، بەڵام فەیسـەڵ پێشـوازییەکی زۆری لێنەکرا. هەمان شـتیش رویدا کاتێك دوای پێنج رۆژ سـەرتاپای بەغدا بۆ پێشـوازی لێکردنی غازی‌و بەکر سـدقی‌و رەشـید عالی رژانە سەر جادەکان، کە لە فیستیڤاڵی سوپا لە موسڵەوە گەڕانەوە بۆ بەغدا، بەڵام کاتێك فەیسەڵ لە دووی ئەیلولدا بەغدای بەجێهێشـت تەنها نزیکەی ٥٠ کەس لە فرۆخانە خوا حافیزییان لێکرد، کەچی پێش دوو رۆژ جەماوەرێکی زۆر لە سـنوری ٥٠ هەزار کەس لە فرۆکەخانە پێشـوازیان لە غازی کرد کە لە موسڵەوە بۆ بەغدا گەڕایەوە.

بەکر سـدقی چەند رۆژێك دوای گەڕانەوەی لە موسڵ نوسەری ئەم چەند دێڕەی بینیوەو دەسـتی خستۆتە سەرشانی‌و لێیپرسیوە، پاشـئەوەی خوێندن تەواو دەکەیت، حەز دەکەیت ببیت بەچی، ئەویش یەکسەر لە وەڵامدا دەڵێت: "دەمەوێت لە سوپادا ببمە ئەفسەر"[27].

لە سەردەمی ماندێتدا عێراق سێ لەشکری هەبو، هێزی ئاسمانی‌و زەمینی بریتانیاش

هەبو، ساڵی ١٩٢١ سوپای عێراق دروست بو، پاشان هێزی خۆبەخشی عێراقی وەك هێزێکی گشـتی عەرەبی بەدیارکـەوتو لە خەڵکی ناوچە شیعەنیشـینەکانی فوراتی خواروو بەسـیج کرابون. لـە راپەرینی ١٩٢٠دا، هەر چەندە لـە چوارچێوەی هێزی عەرەبیدا بون، بەڵام "خزمەتگوزاری نایابیان پێشـکەش کرد"و "وەفاداری خۆیان بۆ ئەفسـەرە بریتانێکان سەلماند"[28]. ساڵی ١٩٢٢ کاتێك ئاشـورییەکان مۆبێلیزەکران بـۆ ئەوەی پەیوەندی بەو هێزەوە بکەن، سـەرەتا نارەزاییـان دەربری، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە سەرەتای ١٩٢٨دا هەمو هێزەکە بو بە هێزی ئاشوری. ئەم هێزە دەگەیشتە چوار هەزار کەس، بەڵام ساڵی ١٩٣٣ تەنها هەشت سەد کەسیان لێ مابووەوە.

پێداگرتنی فەیسـەڵ لە دروستکردنی سوپایەکی بەهێز، بریتانییەکانی ناچارکرد مل بۆ داواکەی بدەن، ئەوەش بو بە مایەی دەرکەوتنی گروپێك لەو ئەفسەرانەی پێگەی تایبەتی خۆیان هەبو، بەڵام لەگەڵ سـەربەخۆیی وڵاتدا ئەو هێزە هەسـتی بە تورەبون دەکرد، لەبەر ئەوەی کەلەبچە کرابو، چونکە سـەرباری ئەوەی یۆنیفۆرمی رەسـمی دەپۆشـی، کەچی بەهۆی بوونی هێزی ئینگلیـزەوە نەیدەتوانی جموجوڵ بکات[29]. فەیسەڵ دەیویست سوپایەکی ١٥ ـ ٢٠ هەزار سەربازی دروست بکات. لە راستیدا ساڵی ١٩٢٢ ژمارەی سوپا ٣٥٠٠ سەرباز بو، ساڵی ١٩٢٧ گەیشتە ٧٠٠٠ سەرباز، ساڵی ١٩٣٢یش ژمارەی سوپا گەیشتە ١١٥٠٠ سەرباز، بەڵام ساڵی ١٩٣٦ ژمارەی سوپا بوە دوو بەرابەر، ئەو زیادبونەش لەدوای قەتلوعامی ئاشورییەکان تا رادەیەکی زۆر بەهۆی ئەوەوە بو کە سـوپا پێداویستی زیاتری بە ئەفسەر هەبو. ئەفسەرە عێراقییەکان بەرامبەر بە بریتانییەکان خۆیان بەکەمدەزانیو هەستیان بە بچوکی خۆیان دەکردو ترسی سوپاش لە ئاشورییەکان لە ناکامی سوپای عێراق لەبەرامبەر سەرکوتکردنی کوردەکانو شۆرشگێرانی دی سەرچاوەی گرتبو. زۆرجار سوپای بریتانیا سوپای عێراقی لە قەیران رزگار دەکـرد، بەتایبەتی لە ململانێی لەگەڵ ئاشـورییەکاندا. ئاشـورییەکانیش وەك کوردەکان، بەپێچەوانەی عەرەبەکانەوە کە نیشتەجێی پێدەشتەکان بون، پارتیزانێکی بەتوانابونو شـارەزاییەکی تەواویان لە دۆڵو چیاکاندا هەبو. ئەو هەستی بێزاریو ترسە



بەهۆی ئەو بیرۆکەوە کە عێراقی بە پروسیای عەرەب لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا دەزانێ دوو هێنـدە کرد (ئەم بیرۆکەیە تا رادەیەکی زۆر لە زمانی حوسـەرییەوە داکەوت کە عێراقی بە نێوەندی پانعەرەبیزم دەزانی)[30].

قەتلوعامی ئاشـورییەکان یەکەمین گوزارشـتی راستەقینەی سەربەخۆیی نیشتمانیی وڵاتێـك بو کە پێشـتر ویلایەتێکی ئیمپراتۆرییەتی عوسـمانی بو. پەرۆشـیو جۆشو خرۆش بەشـێوەیەکی روونو ئاشکرا بەلای سـوپادا لاسەنگ بو، فەیسەڵیش بەهۆی شـێوازی چارەسەرکردنو یەکلاکردنەوەی کێشـەکە جۆشو خرۆشی جەماوەری لە دەسـتدا. بێگومان جەماوەری عێراقی بە پشتگیریکردنی لە سوپاو پشتکردنە فەیسەڵ سـەبارەت وتەکانیان لەمـەڕ "تازەگەری ئاینده" گوزارشـتیان لە بەیانێکی سیاسـی پۆزەتیف دەکرد.

لە هەمان کاتدا ئەسـتەمە هەستی دژایەتی کردنی ئەمجارەی ئاشورییەکان لە دڵو دەرونـی عەرەبو کوردەکان (بە بـەراورد لەگەڵ دژایەتی کردنی تەقلیدی خێڵەکیو ئاینیو رەگەزپەرسـتی)، لـە کردەوەی ئاشـورییەکان جیابکرێتـەوە، کاتێك لەچوار چێوەی هێزەکانی عێراقدا خزمەتیان دەکرد. لەو رۆژگارەدا عێراقییەکان قەدردانیان لە تاکە دەزگایەکی نوێ، واتە سـوپا دەکرد، هەروەها گرنگییان بە تاکە رێگەیەك دەدا لە چارەسـەرکردنی کێشەکاندا، ئەویش هێز بو، کە لە سەرووی هەمو شتەکانی دی بو، ئەو رێگە چارەسـەرەیان بە چارەسەرێکی نیشتمانی دەزانی، ئەوەش لە گوزارەی بریتانییـەکان جیـاواز بو کە بۆ ئەوجـۆرە رووداوانە بەکاریاندەهێنـا، چونکە بە وتەی ئـەوان خۆی لە "کێشـەی کەمایەتییەکان" دەنواند. لەکاتـی ئەو قەیرانەدا زۆرێك لە خەڵکی عێراق بە جۆرێك لەو گوزارەیەیان دەڕوانی وەکئەوەی داهێنانێکی بیانی بێت بـۆ لەنێوبردنی یەکپارچەیـەی نەتەوەیی دارێژرابێت[31]. لەم مەسـەلەیەدا عێراقییەکان خەڵکانێکی تەقلیدی یا کۆنەخواز نەبون لەبەر ئەوەی هەڵوێسـتیان لەگەڵ هەڵوێستی سوپا تەبا بو، چونکە ئەو ئەزمونە بۆ ئەوان ئەزمونێکی تازە بو. بەحوکمی روداوەکان پرۆژەی سوپا بۆ سەربەخۆیی نەتەوەیی، رێوشوێنێکی پێشکەوتوخوازانە بو.

بەکر سـدقی لە گوتارەکەی موسڵیدا پێشـبینی کودەتاکەی ساڵی ١٩٣٦ کردبو، ئەوەش لەسەر بنەمای ئەو دەسکەوتانەی لە قەتلوعامی ئاشورییەکاندا بەدەستی هێنابو. بەکـر ئەوەی بـە "نمونەی ئـەو هەنگاوانە دەزانی کە سـوپا لە ئایـندەدا جێبەجێی دەکات، ئەو ئەرکە قورسو ترسـناکەی سوپا هەسـتی پێکردوەو هەستی پێدەکاتو دەبـێ ئامادەکاری پێویسـت بۆ جێبەجـێ کردنی بکرێ. بۆیە دەبێ سـوپاو میلەت چاوەڕوانی ئەو رۆژە بین، ئەو رۆژەی هەمو شتێکی تێیدا روودەدا"[32]. ئەو گوتارەی سـدقی بەجۆشو خرۆشـێکی زۆرەوە پێشـوازی لێکرا. هەر چەندە هیچ هەڕەشـەو گوڕەشـەیەکی تیانەبـو، بەڵام وەك کردەوەیەك تەماشـای قەتلوعامی ئاشـورییەکان دەکرا کە پێگـەی یەکێتی عێراق بەرز رابگرێت. هەوڵدان بۆ هێنانەدی تازەگەرێتیو ژیان لەسـەردەمی هاوچەرخدا وەك تاڵی جاڵجاڵۆکە دەردەکەوت کە هەستی ئاینیو خێڵەکیو رەگەزپەرستیو نەتەوەییو شەرەنگیزی دەبزوێنێت. مەسەلەی ئاشورییەکان ئەم هەسـتە نەریتیو هاوچەرخەی لە فۆڕمی هیسـتیریای تازەو سیاسـەتی دانپیانان‌دا، لەژێر ناوی "دژایەتیکردنی ئیمپریالیزم" بەرجەستە دەکرد. سەربەخۆیی لەو ئینگلیزانەی بەرگرییـان لە ئاشـورییەکان دەکرد، بەشـێوەیەك روونکرایەوە کـە زۆر کاریگەرانەتر بو لە هەمو راگەیاندنە تۆکمەو رێورەسـمە رەسـمییەکانی سـاڵی پێشـو، ئەو رۆژەی سەربەخۆیی دەوڵەتی عێراقی تیا راگەیەنرا.

بۆ سـاتێك لە ساتەکان سەرکەوتن لەسەر حیسـابی ئاشورییەکان بەدەست هێنرا، ئەو ساتەش بە خەبات لەدژی بریتانییەکان رووپۆش کرا، چونکە عێراقییەکان لە هەمو کاتێکی دی نەفرەتیان لە بریتانییەکان دەکرد، هەر چەندە لەم مەسەلەیەدا هەڵوێستی رەسمی بریتانیا هەمان هەڵویستی حکومەتی عێراق بو. لەپاڵ ئەوەشدا بەپێی وتەکانی خەلـدون حوسـەری، خودی بریتانیا بـە حکومەتی عێراقی راگەیاندبو مارشـەمعون بانگهێشـتی بەغـدا بکاو ئەگەر پێویسـتیی کرد دەستبەسـەری بـکات، حکومەتی عێراقیش هەمان شـتی کرد، ئەوەش بە پێچەوانەی ئارەزوی فەیسـەڵ بو، کە لەکاتی سەرمەرگدا لە جنێفەوە بروسکەی بۆ دەکرد. بریتانییەکان رایانسپاردبو سەرەتا چەند



یەکەیەك لە سوپای عێراق هێندێك شوێن لە باکور داگیر بکەن تا وەك گوشار بۆ سەر ئاشـورییەکان بەکاریبهێنن. هەر چەندە ئەوە وەك کارێکی نامۆ دەردەکەوێت، بەڵام رقو کینـەی عێراقییەکان لە دژی بریتانییەکان، تەنانەت زۆر لەسـەردەمی شۆڕشـی ١٩٢٠ زیاتر بو، ئەو دەمەی سـوپای بریتانیا بەوپەڕی هێزییەوە لە عێراقییەکانی دەدا. لە نێو ئەو دروشـمانەی زۆر دەوترایەوە، ئەو دروشمە بو کە دەیوت: "غازی لەندەنی هەژاندو خسـتییە گریـان"[33]. راگەیاندنـەکان ئاماژەیان بە پیلانگێـڕی بریتانیاکان دەکرد کە بەکرێگیراوە مەسـیحییەکان بەسیج (مۆبیلیزە) دەکەن تا ئەو عێراقەی تازە سـەربەخۆیی وەرگرتبو، دوبارە کۆلۆنیالیزە بکەنەوە. لـەو کاتەدا دەنگۆی ئەوە هەبو کە تی. ئەی. لۆرانس، کۆنە هاورێی فەیسـەڵ بۆدانانی نەخشەو پیلان هاتوەو ئێستا لە سەرتاسـەری عێراقدا سەرگەرمی کاری سـیخوری کردنە. زۆرێك لە عێراقییەکان بەگومانی سـیخوریکردن بۆ بریتانییەکان کوژران، هەروەها خودی بەکر سدقی هەمو ئەو هاوڵاتییە عێراقیانەی بەتومەتی سـیخوریکردن بۆ بریتانییەکان گیرابون، بەئاشـکرا هەڵدەواسی[34].

لە هاوینی ساڵی ١٩٣٣دا فۆڕمێکی سیاسی تازە لە عێراق داهێنراو بۆ یەکەمجاریش ئـەو فۆڕمە لە رۆژهەڵاتی عەرەبیدا بەشـێوەیەکی بەرفراوان سـودی لێوەردەگیرا. ئەو فۆڕمە پەیوەندییەکی تۆکمەی بە "سـەربەخۆیی نیشـتمانی" ئەم سەدەیەوە هەبو. ئەو فۆڕمە تا ئێستاش لە دوەم حوکمڕانی بەعسدا هەر کاری پێدەکرێ، بەتایبەتی لەکاتی پرۆسـەی لە سـێدارەدانی کانونی دوەمی ١٩٦٩دا، چونکە ئـەو فۆڕمە پەیوەندی بە سەربەخۆیی نیشتمانییەوە هەیە. بۆیە پێدەچێت حەکایەتی یەهودییەکانی عێراق جگە لە دوبارەکردنەوەی حەکایەتی ئاشـورییەکان شـتێکی دی نەبێت. هەروەها شۆڕشی ئێرانو کێشەی بارمتە ئەمریکییەکان ئەوە دەردەخەن کە ئەم مەسەلەیە تەنها پەیوەندی بەعێراقەوە نیە یا ئەم فۆڕمە هێشتا هێزو توانای کەمنەبۆتەوە. لە دوای جەنگی جیهانی دوەمو کۆتایـی سـەردەمی کۆلۆنیالیزمدا، نەتەوەگەراو چەپگـەراکان ئەو روداوانەیان بـە "دژە ئیمپریالیزم" وەسـفدەکرد، هەروەها ئەم گوزارەیە بۆ وەسـفکردنی شـەڕی

دوژمنكارانەی ڤیتنامو جەزائیریش بەكاردەهێنرا. بەكارهێنانی ئەمجۆرە دەستەواژەیە لە ساڵی ١٩٣٣ەوە لە زەینی عێراقییەكاندا ئامادەگی هەیە، بەڵام لە حاڵەتی عێراقدا، بەپێچەوانەی روداوەكانی ڤیتنامو جەزائیر، لە دژایەتی كردنی بریتانییەكاندا بە وتە، نەك بەكردەوە سود لەم فۆرمە وەردەگیرا. ئەم دەستەواژەیە بۆ وەسفكردنی راپەرینی ساڵی ١٩٢٠ بەكارنەهێنراوە، بۆیە ئەم دەستەواژەیە گوزارشت لە هەمو هەستی نەفرەتكردن لە بریتانییەكان ناكات.

هەستی دژایەتیكردنی ئیمپریالیزم لە عێراقدا هەروەكو روداوی ئاشورییەكان روونیدەكاتەوە، پێویستە وەك خوازە (ئیستعارە) یا نواندن یا پەیوەندییەكی ئاینی لەزمانی هێماكاندا وەربگیرێ. میانەی بابەتی نەفرەتكردن بریتانیاو رۆڵی لە عێراقداو هەستی دژە ئیمپریالیزم لەلای جەماوەر، پەیوەندییەكی ساكاری نێوان سۆنگەو كاریگەری نیە. لەجیاتی پەیوەندییەكی هۆكاری بێت، پەیوەندییەكی رووكەشو لێكچون بو. بۆ نمونە ئەو كەسەی تەماشای كەسێك دەكات كە لە حاڵەتی هیستیریادایە، وەك حاڵەتێكی پەركەم دەیبینێت. لە راستیدا حاڵەتی دوەم هەڵگری پەیوەندییەكی ئۆرگانی دیاریكراوی جەستەیە، بەڵام حاڵەتی یەكەم هەڵگری پەیامێكە گوزارشت لە حاڵەتێكی شێواوی مرۆڤدەكات. بەڵام ناراستەوخۆ هەڵچونو هیستیریا جۆرێكی راستەوخۆیە لە پەیوەندییەكانو نیشانەیەكە لە نیشانە شێواوەكانی جەستە، بەڵام بەشێوەیەكی سروشتی هەمیشە رەسەنە، ئیدی چ لەحاڵەتی هیستیریا بێت یا لە حاڵەتی هەستی دژە ئیمپریالیزم بێت، بەڵام ئەو رۆڵەی وەك هێمای وشیاری دەیگێرن، پێویستە تێكەڵ بەیەكتری نەكرێن، هەروەها نابێت لەگەڵ ئەو بابەتەی نوێنەرایەتی دەكەن، بەتایبەتی ئەركو واقعییەتی ئەم بابەتە، تێكەڵ بكرێن[35].

بەڵام ئەم هەستی دژە ئیمپریالییە ئاماژە بۆ چ شتێك دەكات؟ ئنجا دەپرسین لە هاوینی ١٩٣٣دا هەستی دژایەتیكردنی كۆلۆنیالیزم لە عێراقدا چۆن بو؟ ئایا دەشێت ئەم هەستە لەدوای تێپەربونی نزیكەی دەیەیەك لە تازەگەرێتی كتوپڕ، نیشایەك بێت لەسەر هەستی دانیشتوان چەسپ بوبێت؟ رۆڵی سوپای عێراق لە بەرجەستەكردنی



ئەو هەستەو كۆبونەوەی دانیشتوانی پەڕاگەندە بەدەوریدا، دەبێ بەمشێوەیە بێت، لەبەر ئەوەی لەسەر ئەو رایە كۆك بون كە سوپا ئاگری هەڵبژاردوە. خەڵكی تەنها ئەوەیان دەزانی، دەبێ وڵات "پێشبكەوێت"، بەڵام هەستیان بەوە نەدەكرد كەپێویستە خۆشیان بگۆڕێنو هۆكاری دەرەكیش فاكتەری گۆڕانكاری نێوانیان بو. ئینگلیزەكان بیانیو مەسیحی بون. ئەو ئازادییە زیاد لەپێویست بەرەو پێشەوە دەرۆیشتو هەڕەشەیەكی زۆری لە رابردویان دەكرد.

یەكڕەنگی لەگەڵ نەریت، شەرمو ئایدیالە ئەخلاقییە ئاینییەكاندا، هێشتا ژیانی رۆژانەی مرۆڤەكانی دیاریدەكات، هەر چەندە كاریگەری هێندێك فاكتەری تازەگەریشیان لەسەر بێت. هەستی دژە ئیمپریالیزم لە كاتی تازەگەریدا سنورێكی ئەوتۆی دیاریكرد كە ئۆخژنێكی بەدڵو دەرون دەبەخشی، هەروەها ئەو سنورەش بەشێوازێك دەست نیشانكرابو لەگەڵ ئاینو نەریتدا ناتەبا نەدەكەوتەوەو لەبەرامبەر هێرشی دەرەكیش دەیپاراست.

میلیگەراكان گرنگییەكی زۆر بەو بیرۆكەیە دەدەن كە پێیوایە ئەو هەستەی وەك هەستی دژە ئیمپریالیزم دەردەكەوێ، پەیوەندییەكی هەڕەمەكی بەواقیعی سەركوتگەرانەی ئەو بابەتانەوە هەیە كە بەرووكەش وادركی پێدەكرێ لە چواردەورێتی. لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێیەمدا توێژی چەپگەراو عەلمانییەكان پەیرەویان لە هەمان بیرۆكە دەكرد. ئەو كارە بو بە مایەی ئەوەی بەتەواوەتی دەست لە بیری رەخنەگرانەی رەفتاری ئەو جەماوەرە هەڵگیرێت كە لە هەلومەرجی زۆر دواكەوتووەوە سەر دەردەهێنن.

ماندێتی بریتانیاو ئەو دەزگایانەی لە عێراق دایمەزراندبون، لەنێو فاكتەرەكانی تازەگەرێتی بون، ئەوانەی هێدی هێدیو بەشێوەیەكی ئۆرگانی وەك دەرئەنجامی سەرچاوەی دانیشتوانو سەرقاڵییان بەجیهانەوە بەدیارنەكەوتبون. بریتانییەكان لە عێراقدا زیاتر فاكتەری تازەگەرێتی بون تا كۆلۆنیالیزم، هەر چەندە سروشتی كاركردنیان لە بەرژەوەندییە تایبەتیەكانی خۆیانەوە وەردەگرت. لەلایەكی دی سوپای عێراق، وەك هێزە خۆبەخشەكان، دەستكردی بریتانیا بو، بەڵام هەم پەیوەندی بە رابردوە

هەبو، هەم سـەروکاری لەگەڵ تازەگەرێتیشـدا هەبو. ئەمە سەرباری ئەوەی هەستی بەئامانجەکانی دەکرد. سـاتع حوسـەری گرنگی بەم مەسەلەیە دەدا. ئەو نەیدەتوانی وێنای کۆمەڵگەیەکی یەکگرتوی عەرەبی بکات، بەڵام هۆکاری دیسـپلینی لە سـوپا دەبینی، ئەگەرچی لەسەر حیسابی ئاشورییەکان بو.

خەلدون حوسەری بەهاوکاری سـاتعی باوکی نوسینەوەی مێژووی گرتە ئەستۆی خۆی. خەلدون بەو سـەرنجە دەسـتی پێکرد کە مێژوو زۆرجار پروپاگەندەی لایەنی سەرکەوتوە بوە، بەڵام بەداخەوە لە عێراقدا سەبارەت بەمەسەلەی ئاشورییەکان، "مێژوو بەهەمو دڵنیاییەکەوە پروپاگەندەی قوربانییەکان بو"[36]. هەمو هەوڵی خەلدون بۆ ئەوە بو کە بیسەلمێنێت ئاشورییەکان هەڕەشەیان لەسەر دەوڵەتی عێراق دروستدەکرد، هەر ئەوانیش "یەکەمجار" هێرش‌و پەلامارەکانیان دەسـت پێکرد. بەکر سدقی‌و فەرماندە باڵاکانی سـوپا تەنها بەرپەرچی هەڕەشـە راسـتەقینەکانی ئاشـورییەکانیان داوەتەوەو بەرنامـەو پلانیان بۆ رەشـەکوژی دانەڕشـتبو، بەدرێژایی کاتیش فەیسـەڵ خێڵەکانی هاندەدا. خەلدون پێیوابو بەیانی رەسمی عێراق لەسەر روداوەکان "درۆیەکی شاخدار بو"، خەمی سەرەکی خەلدون ئەوە نەبو نکۆڵی لە راستییەکان بکات، بەڵام دەیویست رووی سـوپا سـپی بکات‌و گلەییەکانیش بخاتە ئەسـتۆی فەیسـەڵ‌و ئەو سیاسەتەی هەوڵی بۆ هێنانەدی دەدا.

حەکایەتەکەی ستافۆرد لەسەر قەیرانەکە هەمان ئامانجی هەبو کە خەلدون لەسەر نوسـینەوەی مێـژوو بەدواداچونـی بۆ دەکرد. سـتافۆرد بە پێچەوانەی حوسـەرییەوە پشکێنەری ئیداری بو لەشاری موسڵ، هەروەها راسپێردرابو گفتوگۆ لەگەڵ هەر دوو لایەنە نەیارەکەدا بکات. ئەو گلەییەکانی بەسەر هەمواندا دابەشکردبو، هەمو لایەکی بەکەمتەرخەم دەزانی بێئەوەی سیاسـەتی بریتانیاشی لێئاوارتە بکات (هەر چەندە زۆر رەق نەبـو لەگـەڵ بریتانیاندا کە بەرپرسـیاربون لە قەتلوعام کردنی ئاشـورییەکان). سـتافۆرد دژی داواکاری ئاشـورییەکانو لەگـەڵ یەکپارچەیی خاکـی عێراق بو. لە واقیعدا خەلدون تا رادەیەکی زۆر هاوڕای ئەفسەرە پایەبڵندەکانی ئینگلیز بو، ئەوانەی



هەمـان دیدی دەوڵەتی بریتانییان نەبو. خەمی سـەرەکی ئەو کەسـانە لەوەدابو وەك راوێژکاری سوپا جەخت لەسەر رۆڵیان بکرێ‌و دەیانویست وەك هێزێکی پرۆفیشناڵ تەماشا بکرێن. جەنەڕاڵ (هودلام)، فەرماندەی دەستەی راوێژکاری سەربازی بریتانیا لە بەغدا، بەکر سدقی بە سەرکردەیەکی "بڕیاردەر، پڕ وزەو دووربین" وەسفدەکات‌و دەنوسێت "حکومەت‌و میلەت ئەوەندە هۆیان هەبو کە سوپاسگوزاری بەکر سدقی‌و هێزەکەی بکەن"[37]. لەگەڵ ئەوەشدا، بە وتەی خەلدون حوسەری، ئەو راوێژکارانە "لەلایەن عێراقییەکانەوە بایکۆت کرابون"[38].

بەڵام بەداخەوە خەلدون حوسەری دەربارەی مێژووی قەیرانی ئاشورییەکان بەهەڵەدا چـوە کە پێیوایە پروپاگەنـدەی قوربانییەکان بوە. عێراقییـەکان ماوەیەکە بەهاوکاری روناکبیرانـی لەبابەت حوسـەری وازیان لە خوێندنەوەی سـەرچاوە "ئیمپریالییەکان" هێنـاوە. تەنانـەت کتێبێکی گرنگ‌و تـازەی وەك لێکۆڵینەوەکەی (تەربوش) لەسـەر سوپای عێراق، دیدوبۆچونەکانی خەلدونی بەبێ بژار کردن تەبەنی کردوە[39].

کاتێـك مرۆڤ پێدەخاتـە "دائیرەی ئینسـکلۆپیدیای عێراقـی هاوچەرخەوە" کە لـە رێگەی بەعسـییەکانەوە چـاوی بەدنیا هەڵهێنا، دەبینێ حوسـەری لەدوای هەمو روداوەکانەوە لەنگەر دەگرێ‌و بەتەواوەتی دوورخراوەتەوە. لەو ئینسـکلۆپیایەدا بەهیچ جۆرێك باس لە رەشـەکوژی ئاشوریەکان یا دەسـتێوەردانی دەوڵەت نەکراوە، بەڵکو تەنها باس لەمێژووی شۆڕشێکی بەدیسپلینی یەکە بێشومارەکانی ئاشورییەکان دەکرێ کە هێرش‌و پەلاماری لەناکاو دەکەنە سەر سوپای عێراق، ئەو سوپایەی هیچ ئاگایەکی لە نیازی ئەو هێرشانە نەبو.

لێـرەدا وتەکان بە کورتەیەك کۆتایی پێدەهێنیـن کە جیاوازی لەگەڵ چەمکەکانی ئێمەدا هەیە. مارشـەمعون پێش چەندین دەیە بۆ وڵاتە یەکگرتوەکان رۆیشـتبو، رێك دوو هەفتـە بـەر لەواژوکردنی رێکەوتننامە مێژووییەکـەی نێوان حکومەت‌و کورد کە مافی ئۆتۆنۆمی بە کورد دەبەخشـی، واتە لە ٢٤/نیسـان/ ١٩٧٠ بۆ بەغدا گەڕایەوە. دائیـرەی ئینسـکلۆپیدیا پێمـان دەڵێت بەپێی بڕیـاری کۆماری تایبەت بـە لێبوردنی

گشتی مارشەمعون بۆ عێراق گەڕاوەوەتەوەو رەگەزنامەی عێراقی پێدراوەتەوە. هەر کە گەیشتەوە: "سوپاسگوزاری خۆی بۆ سەرکردایەتی شۆڕش بەیانکردو هیوای بۆ سەقامگیری ئاسایشی جیهانیش خواست". کاتێك بینی ئاشوریەکان چێژ لە مافی وەکیەکیو خۆشگوزەرانیو ئاسایش وەردەگرن، وتی: "عەرەب خزمەتی بە مرۆڤایەتی کردوەو کاتێك ئەوروپا لە چەرخە تاریکەکاندا ژیانی دەگوزەراند، تیشکی مەدەنییەتو شارستانییەت لەبەغداوە تەواوی جیهانی روناك دەکردەوە"[40].

## کۆتایی نمایش ١٩٣٦ـ ١٩٤١

بەکر سدقی بەپێچەوانەی فەیسەڵەوە پێشەنگی جیهانی سیاسی تازەبو. کودەتاکەی ١٩٣٦ دوای رەشەکوژییەك بو کە بەرنامەدانەرەکەی گەیاندە ئاستی قارەمانێکی نیشتمانی. لە رۆژی کودەتاکەدا خۆپێشاندانێکی پشتگیری کردن شەقامەکانی بەغدای گرتەوە، رێك هەروەکو ئەوەی لە ١٤/تەموزی ١٩٥٨، خەڵکی بەمەبەستی پشتگیریکردن لە عەبدولکەریم قاسم رژانە سەر جادەکان. ئەمەش تا رادەیەکی زۆر دەرئەنجامی هەوڵەکانی حیزبی چەپڕەوی ریفۆڕمخوازی ئەهالی بو کە لە بواری سیاسیدا پێگەیەکی مەزنی هەبو، ئەو پێگەیەشی لە پێگەی ساڵانی چلەکانی حیزبی شیوعی عێراق دەچو.

هێندێك کەسایەتی ناو ریزەکانی ئەهاڵی بون بەئەندامی سەرکردایەتی حیزبی شیوعی عێراقی. ئەهالی بەپێچەوانەی حیزبی شیوعی عێراقەوە، لە رێگەی حیکمەت سلێمان، کە لە قەیرانی ئاشورییەکاندا وەزیری ناوخۆ بو، بەشداریان لەکودەتاکە کرد. حیکمەت سلێمان لەلایەن بەکر سدقییەوە بۆ پێکهێنانی کابینە راسپێردرا.

حیزبی ئەهالی ساڵی ١٩٣١ لەلایەن گروپێك لە لاوانی لیبرال دیموکراتەوە دامەزرا، کە هەڵگری ئامانجە باڵاکانی شۆڕشی فەرەنسا بون. ئەم گروپە وەك حیزب تەماشای



خۆیان نەدەکرد، بەڵام رۆژنامەکەیان دەسەڵاتێکی بەرچاوی هەبو. ساڵی ١٩٣٤ سۆسیالیزمی بەناوی "ئەلشەعبیە"وە قبوڵ کرد. لە ناوەراستی سییەکاندا سەرۆکی ئەم گروپە کەسێك بو بەناوی جەعفەر ئەبو تمەن ـەوە، کە هاوڵاتییەکی بەساڵاچوی شیعەی عێراق بو، بەڵام لەبەر ئەوەی لە سیاسییەکان نائومێد ببو، لایەنگیری لە چەپ دەکرد. مانیڤێستی ئەهالی بانگەوازی بۆ نیشتمانپەروەری دەکرد، نەك ناسیونالیستی، چونکە مێژووی ناسیونالیستی "تژی بو لە خوێنڕشتنو ستەمگەریو رووپامایی"[41]. دوای ماوەیەکی زۆر لە نەمانی ئەهالی ئەندامە بەرجەستەکانی بون بەرەگەزێکی سەرەکی کارا لە حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم. ساڵی ١٩٣٦ ئەهالی لە رێگەی سلێمانەوە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر بەکر سدقی هەبو. سەرکردەکانی ئەهالیو ئەفسەرەکانی سوپا پشکی شێریان لە حکومەتەکەی بەکر سدقیدا هەبو، هەروەها لەپشت بەڵێنی ریفۆڕمە ئابوریو کۆمەڵایەتیە دوور مەوداکانەوە بون بەهێزێکی کولتوری چالاك. زۆرێك لە نوسەرو پەیامنێرانی عەرەب روویانکردە بەغداو لەنوسینو وتارەکانیاندا زۆر ستایشی رژێمە تازەکەیان دەکرد.

حیکمەت سلێمان داوای لە سوپا دەکرد رژێمێکی لەبابەت رژێمی ئەتاتورك لە عێراق دامەزرێنێت. حیکمەت تا ساڵی ١٩٣٥ ئەندامی حیزبی "الاخاء الوطني" بو کە رەشید عالی ١٩٣٠ بۆ دژایەتی کردنی پەیماننامەی ئینگلیز عێراق دروستی کردبو. ئەم حیزبە سروشبەخشی زۆرێك لە لایەنگرانی ناسیونالیستە مەدەنییەکانی عەرەب بو. یەکەمین هێرش بۆ سەر وەزارەتەکەی سلێمان لەلایەن هاوپەیمانێتی موڵکدارو هاورێ ناسیونالیستەکانی پێشوی خۆیەوە بو کە زیاتر جەختیان لەسەر ئەمە دەکردەوە، ئایا ریفۆڕمی حکومەتی نوێ ریفۆڕمێکی "کۆمۆنیست"ی یا "ناسیونالیستی"یە. سەرئەنجام لەلایەن بەکر سدقییەوە سنور بۆ سلێمان دیاریکراو ناچار کرا واز لە ریفۆڕمو پیاوانی ریفۆڕم بهێنێ.

کاتێك ئەهالی لە حکومەت دەرچو، حکومەتیکی ناسیونالیستی عەرەبی جێگەی گرتەوە، ئەم حکومەتە تازەیەش زۆر گوێرایەڵی سدقی بو، بۆیە تا کوشتنی سدقی لە

حوکم مایەوە. ماوەی "بەرەی میلی ـ الجبهة الشعبیة" نۆ مانگی خایاند. ئەهالی لە ئەنجامـی حوکم کردندا زۆر لاواز ببو، چونکە هاوکاری لەگەڵ سـدقی دەکرد کە رۆژ بـەرۆژ شـەعبیەتی دادەبەزی، هەروەها بەهۆی جێبەجـێ نەکردنی ئەو بەڵێنانەی دەربارەی ریفۆرم دابوی. لەو کاتەدا حیزبی شیوعی تازە دروستبو سودێکی زۆری لەو دەرفەتە وەرگرت.

لەنێو ریزەکانی سـوپادا، دوو باڵ لەسـەر دەسەڵات ململانێیان دەکرد، یەکێکیان بانگەوازی بۆ ناسیونالیسـتی عەرەبی دەکرد، ئەوی دیـان بۆ نەتەوەگەرای عێراقی. بەکر سدقیی کورد دەیویست دەوڵەتێکی عێراقی بەهێز لە شێوازی تورکیای ئەتاتورک یا ئێرانی رەزا شا دروست بکات. هەر دوو دەوڵەتەکە ئەفسەر بەرێوەیدەبرد. رۆڵی بەکر سدقی لە کێشەی ئاشـورییەکانو بەهۆی قەتلوعامکردنی دڕندانەی خێڵە شیعەکان، لایەنگرێکی زۆری لەنێو ریزەکانی سـوپا پەیدا کرد. ئەو سەرسامییەی دەگەڕایەوە بۆ ئەو ناوبانگە باشـەی کە وەک شایسـتەترین ئەفسـەری عێراقی لەسوپادا هەیبو، بەڵام هێندێک ئەفسـەری ناسیونالیسـتی عەرەبی تیرۆریان کرد، ئەوانـەی لەو دەمەدا تای تەرازو بەلای ئەواندا لاسەنگ بو. عەبدولکەریم قاسم (دایکی کورد بو)، سدقی ئاسا عێراقیگەرا بو، بۆیە ئەویش پێش نزیکەی چارەکە سـەدەیەک لەلایەن بەعسـییەکانەوە روبەروی هەمان چارەنوس بویەوە.

ناسیونالیستە مەدەنییەکانی عەرەب، بەدیاریکراویش لە هاوێنی ١٩٣٣دا حوکمیان گرتەدەسـت. رێوشـوێنی سـرکوتگەرانەی ئەم کابینەیەو دوورخستنەوەی سەرکردە توندڕەوەکانی لەبابەت رەشـید عالی، بەشـداریان لە روخاندنی کرد، بەڵام گروپێک لـە ناسیونالیسـتە عەرەبـەکان، ئەوانـەی رۆحێکی شـەڕەنگیزیان هەبـو، خەریک بـو دەردەکەوتـن، هەر چەندە هەڕەشـەیەکی گەورەیان لەسـەر نـەوەی قەومەچییە عەرەبەکانی دوای فەیسەڵ نەدەکرد، بەڵام ئاماژەیەک بو لەسەر ئەوەی کە بەم نزیکانە شتێک روودەدا.

سـامی شەوکەت بەرێوەبەری گشـتی پەروەردە هەمان رێچکەی ساتع حوسەری



گرتەبـەرو بیرۆکـەی قەومـی عەرەبـی بەسـەریدا زاڵ بو، ئـەوەش لـە گوتارێکیدا بەدیارکەوت کە سـاڵی ١٩٣٣ بەناوی" مەرگسـازییەوە" خوێندییەوەو پاشان بەسەر هەمو قوتابخانە حکومییەکانی عێراقدا دابەشـکرا. گوتارەکەی جەختی لەسـەر ئەوە دەکردەوە کە کۆمەڵگەیەکی وەک کۆمەڵگەی عێراق لە پێناوی بەدیهێنانی پانعەرەبیزم بەرجەسـتەکردنی "رۆحی هارونە رەشـید"، توانای ئەوەی هەیە "بەباشـی مەرگساز بێت"، ئەوەش داوا لە عێراق دەکات دەمودەسـت سـوپایەکی نیو ملیۆنیو سـەدان فرۆکەی شـەڕکەر دروستبکات. شەوکەت دەپرسـی ئایا هیچ ترسنۆکێک هەیە ئەم بانگەوازە قبوڵ نەکات؟ بەڕای شەوکەت دەسەڵاتشکاندن بەسەر مەرگدا زۆر گرنگترە لە سـامانو زانست، چونکە ئەو دەسەڵاتە "شـەرەفـو کەرامەتی نەتەوە دەپارێزێتو رێگە لە کوێلایەتیش دەگرێ". رەنگە میسرو هیند دوو دەوڵەتی دەوڵەمەندو خاوەنی کولتوری بەرزبن، بەڵام هێشـتا لەژێر دەسـەڵاتی کۆلۆنیالیزمدا دەناڵێننو هێزو توانای ئەوەیان نیە "کۆتو بەندی سوکایەتیکردن بشکێنن". کەچی ئەفغانستان کە "هێشتا لەسەدەی چواردەهەمدا دەژیو شانشینی سعودی کە "دانیشتوانەکەی لەسەر شیری وشـتر دەژین" دوو دەوڵەتی سـەربەخۆن. ئەو دوو دەوڵەتە لەوە گەیشتبون: "هێز لەو خاکەدایـە کە تۆی هەقیقەت تێیدا سـەوز دەبێت، ئـەو "نەتەوەیەی هێزی نەبێ، لە ریسواییو کۆیلایەتیدا دەژی". هەروەها شەوکەت درێژەی پێدەداو دەڵێت:

ئەگەر مۆسـۆلینی دەیان هەزار کراس رەشـی ئامادەی نەبوایـە، نەیدەتوانی تاجی ئیمپراتۆری رۆمان بکاتە سەر فیکتۆر ئەمانوێل"[42].

سامی شەوکەت داوای لە نەوجەوانان دەکرد پێرەوی لە ژیانی "زبرو پڕ زەحمەتی" بکەنو شـێوازی ژیانی ئەو عەرەبانە بگرنەبەر کە لەسـەرەتای سـەردەمی ئیسـلامدا ژیانیان بەسەر بردوە. سامی لەوە زیاتر دەڕواتو دەڵێت، پێویستە ئەو کتێبە مێژوویانەی لـە شانوشـەوکەتی عەرەب کەمدەکاتەوە بسـوتێنرێن، بەکتێبە فەلسـەفییەکانی ئیبن خەلدونیشەوە[43].

سـامی شەوکەت سـاڵی ١٩٣٥ یانەی موسەنای دامەزراندو وەک ئەندامی فەخری

هەڵبژێردرا. ئەم یانەیە بەناوی موسەنای کوڕی حارس، سەرکردەی عەرەبەوە ناونرا کە لە سەدەی حەوتەمی زاینیدا بەفەرمانی عومەری کوڕی خەتاب، عێراقی داگیرکرد. لەم یانەیەدا ژمارەیەك موحازەرە بەمەبەستی بەرەو پێشبردنی عروبە سازکرا. هەروەها حکومەتی عەرەبە قەومییەکان، ڕێکخراوی لاوانی (فتوە)یان لەسەر شێوازی لاوانی هیتلەری دروستکرد. ناوو ناوبانگی شەوکەت وەك ڕێبەری ئەم بزوتنەوەیە لە دواجاردا ڕێگەی لەبەردەمدا ئاواڵەکرد بۆ ئەوەی کار لە حکومەتدا بکات. وەکئەوەی شەوکەت پێشوەخت لە ڕێگەی فتوەوە هەستی بەمیلیشیا بەعسیەکانو گاردی نیشتمانی کردبێتو لەڕێگەی فتوەشەوە دەیویست هەمو خوێندکارو مامۆستایان یۆنیفۆڕمی سەربازی بپۆشنو مەشق لەسەر بەکارهێنانی چەك بکەنو سەربازئاسا فێری دیسپلین بن. شەوکەت بەشێوازێك پێناسەی نیشتمانپەروەرێتی بۆ کۆمەڵێك لە گوێگرەکانی دەکرد، وەکئەوەی بیەوێت شادی بخاتە دڵو دەرونی ئەو بەعسییانەی دوای نیو سەدە بەدیارکەوتن.

"بیانی بەپێی بەهاکانی فتوەی عێراقی ئەو کەسە نیە کە ڕەگەزنامەی عێراقی هەڵنەگرتبێت: نەخێر، بەڵکو بیانی لەدابونەریتی ئێمەدا کەسێکە هەمان هەستی ئێمەی نەبێت، تەنانەت ئەگەر نەوەد ڕەگەزنامەی لەو جۆرەی هەڵگرتبێتو هەزاران ساڵ پێش ئێستاش ئێسكو پروسکی باپیرانی گۆڕستانەکانی ئێمەیان پڕ کردبێت. لە ڕوانگەی ئێمەوە بیانی کەسێکە پیلان لەدژی یەکێتی عەرەب بگێڕێت، بۆیە کەسێکی لەوجۆرە بەتەنها لە بیروباوەڕو ئیمانو ڕۆحدا بیانی نیە، بەڵکو بە دوژمنێکی سەرختی ئێمە دەژمێردرێت.

موسەیلەمە کەزاب عەرەبێکی یەمەنی بو، بەڵام خائین بو، بۆیە عەرەب نەفرەتی لێکردو بەسزای خۆی گەیاند. بەدیویشدا سلێمان فارسی خودا لێی ڕازی بێت، فارس بو، کەچی بو بە ئیسلامو تەعەریب کراو دڵسۆزو وەفاداری بیروباوەڕەکەیشی بو، بۆیە عەرەب بەرزیکردۆتەوەو ڕێزی لە پلەو پایەکەشی گرتوە. فتوەی عێراقی سلێمان بەعەرەبێکی ڕاستەقینە دەزانێو وەك بەشێك لە خۆی خزمەتی نەتەوەی



عەرەبی کردوە، بەڵام موسەیلەمەو هاوبیچمەکانی ڕەتدەکاتەوە"[44].

کودەتاکەی ١٩٣٦ کۆتایی بەتەمەنی ئەو دەستە سیاسییە میلیگەرایانە هێنا کە لە سایەی کەشوهەوای فەیسەڵدا پەروەردە بونو دەیانویست تێکەڵەیەك لە پانعەرەبیزمو جۆرێك لە وەفاداری بۆ دەوڵەتی عێراق دروست بکەن. دەوڵەتمەدارەکان زۆر بەئاسایی دەچونە ریزی حیزبە عێراقییە جیاوازەکانەوەو وازیشیان لێیان دەهێنا، بۆ نمونە حیزبی قەومییە عەرەبەکان، حیزبی عێراقی، حیزبی ڕیفۆڕمی کۆمەڵایەتی. خەڵکی لە کاروباری ڕەسمی دەزگاو تاكو گروپەکان بەئاگابون کە هەر هەمویان نەرمو بۆ گۆڕانکاری کراوەبونو سیاسەتو چالاکی گشتی بەدەزگایی کرابونو خەڵکێکی زۆر بەشداریان تێیدا دەکرد. لە پاڵ ئەوەشدا لەدوای ساڵی ١٩٣٣ەوە هەمو کەسێك دەستی "ئالودە" بو، لەبەر ئەوەی بەکر سدقی قارەمانی هەموان بو، بەتایبەتی چەپەکان. ساڵی ١٩٣٦ بیروباوەری عێراقچییەتی چرۆی کردو هەر بەهۆی ئەوەشەوە پاکتاوکرا، نەك بەهۆی شکستهێنانی لە ڕیفۆڕمی کۆمەڵایەتیدا. ئیدی لەو دەمەوە پانعەرەبیزم لە نیشتمانپەروەرێتی عێراق دوورکەوتەوەو دژ بەیەك وەستانەوە، ئەمەش لە ململانێی نێوان ڕەشید عالیو نوری سەعیددا خۆی دەنواند. لە ساڵانی ١٩٢٠ ـ ١٩٣٠ سوپا هێزێکی گرنگ بو لە سیاسەتی وڵاتداو لە ماوەی ١٩٣٦-١٩٤١دا ئەو هێزەی لە شەش کودەتادا پیادە کردوە.

پانعەرەبیزم لە دوای تیرۆرکردنی سدقی، بەهەنگاوی گەورە بەرەو پێشەوە دەرۆیشت. لە بەغدا عەرەبە دوورخراوەکان ڕۆڵێکی زۆر گرنگیان لە گشتاندنی پانعەرەبیزم لەدەرەوەی سنوری عێراقدا بینیو درزو دەستەگەرێتی لەنێو جەستەی سیاسی عێراق گەورەتر کرد. موفتی ئەعزەمی قودس لەگەڵ ڕەشید عالی "لیژنەیەکی عەرەبی" یان دامەزراند تا شێوازێك بۆ هاوکاری عەرەبی ـ نازی بدۆزنەوە. نیشتمانپەروەرە عێراقییەکان وەك پەرچەکردارێك لە بریتانیاو هاوپەیمانەکان نزیکبونەوە. یانەی موسەنا لەگەڵ شەریکەکانی لە هاوبەندی بەرگریکردن لە فەلەستینیەکانو ڕێکخراوی لاوان (فتوە) لەگەڵ لیژنەی عەرەبیو پانعەرەبیزم یەکیانگرتو زۆرێك لەو ئەفسەرانەی

لایەنگری پانعەرەبیزم بون پەیوەندییان پێوەکردن. ناجی شەوکەت، ئەندامی نهێنی لیژنەی عەرەبی، سامی برای بەکارێکی نهێنی ڕەوانەی دەرەوە کرد تا لەگەڵ (فۆن پاپن) گفتوگۆ لەسەر پرەنسیپەکانی هاوکاریکردن بکات[45]. لە هەمان کاتیشدا نوری سەعید، کە لە ئەنجومەنی وەزیراندا، هاوکاری ناجی بو، هەمان شتی لەگەڵ بریتانییەکاندا دەکرد.

ئەو پیلانە لە ١/نیسان/١٩٤١دا لە ڕێگەی چوار جەنەراڵی پانعەرەبیزم کە سێ کەسیان ئەندامی لیژنەی عەرەبی بون، بەراگەیاندنی حاڵەتی نائاسایی کۆتایی پێهات. ئەو لیژنەیە سیاسەتی وڵاتی لە سایەی ڕژێمی تازەدا دادەڕشت.

میر عوبەیدوڵڵای شانشینو نوری سەعیدو دەوڵەتمەدارانی دی، ئەوانەی لایەنگرییان لە بریتانیا دەکرد بە کەشتییەکی بریتانی لە عێراق هەڵهاتن. حکومەتی "بەرگری نیشتمانی" بەسەرۆکایەتی ڕەشید عالیو چوار جەنەراڵەکە پێکهاتو هەر زۆر بەخێراییش دەوڵەتانی میحوەرو یەکێتی سۆڤیێت، پێش داگیرکردنی لەلایەن یەکێتی سۆڤیێتەوە پشتگیریان لێیکرد. دوای چەند مانگێك هێزەکانی بریتانیا لە بەسرە پیادە بون، لە ٢/ ئایاردا شەڕ دەستی پێکرد. موفتی لە گوتارێکی ئاگرینی دژ بە بریتانیا، بانگەوازی جیهادی لە دژی "گەورەترین دوژمنی ئیسلام" ڕاگەیاند[46].

لە ١٢/ئایاردا، پۆلێك فڕۆکەی ئەڵمانیا کە بنکەیان لە سوریا بو، بۆردومانی بنکەیەکی ئاسمانی بریتانییان لە عێراق کردو بریتانیاش بە بۆردومان کردنی هێندێك ڕێگەی سوریا وەڵامی بۆردومانەکەی ئەڵمانیای دایەوە. سەرباری ئەو پاڵپشتییە ئاسمانییەی ئەڵمانیاش، کەچی هێزەکانی عێراق لە ١٩/ ئایاردا لە فەلوجە لە بەرامبەر هێزێکی بچوکی بریتانیا شکستیان هێنا، چونکە سەربازە عێراقییەکان لەڕووی دەرونییەوە ئامادەگی شەڕیان تیانەبو. بەهۆی ئەدای ئەو جەنگەو سەرکوتکردنەکانی دواتر سوپای عێراق بۆ ماوەی حەقدە ساڵ وەك هێزێکی سیاسی لە گۆڕەپانەکەی دوورکەوتەوە، تەنانەت ئینگلیزەکانیش سەریان سوڕما لەو سەرکەوتنەی بەدەستیان هێنا[47]، ئیدی ڕێگەی بەغدا ئاواڵە بو. لە ٢٩/ئایاردا، ڕەشید عالیو موفتیو هەمو



جەنەراڵەکان بۆ ئێران ڕایانکرد. ئەم بەشەی مێژووی عێراق هەروەکو چۆن بەقەتلوعام دەستی پێکرد، بە قەتلوعامیش کۆتایی پێهات.

مێژووی یەهودی عێراق بۆ سەدەی شەشەمی پێش زایین دەگەڕێتەوە، لەو ماوەیەشدا گۆڕانکاری گەورە لە ئاینەکاندا ڕوویداوەو کۆچکردنێکی گەورە لە گوندەکانەوە بەرەو شارەکان دەستی پێکردو لە ماوەی ئەو چەند سەدەیەدا یەهودو موسڵمانەکان تێکەڵبون، کە دواجار ئەم تێکەڵبونە بو بە مایەی چڕبونەوەیەکی گەورە لە بەغداو یەهودییەکان لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا سێیەکی دانیشتوانی بەغدایان پێکدەهێنا. لە کۆتایی چلەکاندا ژمارەی ئەو یەهودییانەی بەعەرەبی قسەیان دەکرد خۆی لە ١٢٠ هەزار یەهودی دەداو گەورەترین کۆمەڵەی یەهودییان لە ڕۆژهەڵاتی عەرەبیدا پێکدەهێنا[48].

لە کۆتایی سییەکاندا لەگەڵ گەشەکردنی فیکری پانعەرەبیزم دژە سامییەتیش زیادی کرد. لە ئابی ١٩٣٨دا خۆپێشاندان لە دژی یەهودو نارنجۆك هەڵدانە ناو نوسینگەو مەحەلی یەهودییەکان دەستی پێکرد، هەروەها ئەو ئاگرە گەورەیەی ساڵی ١٩٣٩ لە بازاری عەتارییە کەوتەوە، گوناهەکەی خرایە ئەستۆی یەهودییەکان. نوسینە عەرەبیو ئەڵمانیەکان پڕبون لە بڕگەی دژە سامییەت، ئەوەش ڕەنگدانەوەی ئەو کەشوهەوا باوەی نێو ڕێکخراوە جیاوازەکانی، لەبابەت ڕێکخراوی فتوەو یانەی موسەنا بو. بە دەرکەوتنی ڕەشید عالی بارودۆخەکە خراپتر بو. حیزبی شیوعی عێراق لە نامەیەکیدا بۆ سەرەك وەزیران کە دەیویست پشتگیری بێقەیدو مەرجی پێشوی بۆ ڕەشید عالی دیارییکات، ئاماژە بە "پێشێلکردنی ئازادییەکان، هەڵکوتانە سەر ماڵان، بەتاڵانبردنی موڵكو ماڵو لێدانی خەڵکیو تەنانەت کوشتنیشیان"[49] دەکات. دوای ڕاکردنی ڕەشید عالی بەدوو ڕۆژ کارەساتی گەورە دەستی پێکرد. ئەفسەرە پایەنزمەکانو ڕێکخراوی فتوە ئاژاوەو تاڵانو بڕۆیەکیان ڕێکخست بەخەیاڵی ئەوەی ڕێگە لە گەڕانەوەی عوبەیدوڵاو بریتانییەکان بگرن. بۆ ڕۆژی دواتر بەدەوییەکان هاتنە ناو بەغداوەو پۆلیسیش لایەنگری لە خۆپێشاندەران دەکرد، سەرئەنجام بەسەدان یەهودی

گیانیان لەدەستدا.

لە شۆڕشــی رەشــید عالییەوە دوو مەسەلەی نوێ سەریانهەڵدا: یەکەم، پانعەرەبیزم جەنگی دژە ئیمپریالیزمی بریتانی هەڵایساند. دووەم، شۆڕش شکستی هێنا لەبەر ئەوەی پێشەواکەی، واتە"ئۆپۆزیسۆنی سەربازی... لەدژایەتی کردنی ئیمپریالیزمدا، بڕوای بە گرنگی رۆڵی جەماوەر نەبو"[50]. دکتۆر بەڕاك، ساڵی ١٩٨٢ بو بە سەرۆکی هەواڵگری بەعس، لە نامەی دکتۆراکەیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە: "پێویستە جارێکی دی مێـژوو بەگوێـرەی بەرنامەی تازە بنوسـرێتەوە". بەڕاك تێزەکەی لەســەر "حکومەتی بەرگری نیشـتمانی سـاڵی ١٩٤١ کۆتایی پێدەهێنێتو لەگـەڵ حکومەتی کۆمۆنەی پاریـس بەراوردی دەکات کە لە ١٨/ ئازارەوە تا ٢٦/مایس/١٨٧١ حوکمڕانی کرد. بەپێی نوسـینەکەی بەڕاك حکومەتەکەی رەشید عالی بەراستی نوێنەرایەتی جەماوەری نەتەوەی عەرەبو شۆڕشــی سۆسیالیستی ســەردەمی هاوچەرخی"[51] دەکرد. لێرەدا نامەوێت بە خوێندنەوەی بەڕاك ســوکایەتی بە ژیری خوێنەر بکەم، بەڵکو هەوڵدەدەم گفتوگۆی لەسەر پاساوەکان بکەم. هەمو درۆکان لەیەکناچن: هێندێکیان دەتوانن لە بۆتەی ئەزمونی روداوەکاندا راستی خۆیان "بسەلمێنن". ئەگەر لە نوسینەکەی بەڕاك بۆ مێژوو وردبینەوە، دەبینین نوسینەکەی بریتیە لەو تیورەی کە نەوەیەك لە عێراقییەکانی لەسەر گۆشکراوە. ئەمە لەپاڵ ئەوەی ئەم تیورەیە پێشتر لە عەقلییەتی نەوەیەك چەسپی بو کە بەرپرســە لە ســەقامگیربونی کۆڵەکەکانی دووەم رژێمی بەعســدا. بۆیە ئەگەر بــەدوای حەکایەتی جیاوازدا بگەڕیین، دەبێ پەنا بۆ ســەرچاوە ئیمپریالییەکان بەرین یا ئەو نوســەرە عەرەبە ســەربەخۆیانەی پشتیان بەو سەرچاوە بیانیانە بەستوە، ئەوانەی زۆرجار بەزمانی عەرەبی شت بڵاوناکەنەوە.

حیزبــی بەعس درۆکانی بۆ جۆرە راســتییەکی تازە قڵپدەکــردەوە. حیزبی بەعس پێــش بــەڕاك ســاڵانی ١٩٣٣و ١٩٣٦ - ١٩٤١ی بــە پرۆڤەیەك دەزانی تا لەســاڵانی ١٩٥٨و ١٩٦٨ لەســەر شــانۆ دەربکەوێت. قاســم لە جێگەی سدقی هات، حیزبی شــیوعی لە جێگەی ئەلئەهالی، بەعســیەکانیش جێگەی رەشــید عالی یان گرتەوە،



بەڵام ئەوەی ئاســتی گفتوگۆ رەســمیەکان پەیوەندی بە نوێنەرو رەوتی روداوەکانەوە هەبێت، مەسەلەیەکی ئەوەندە گرنگ نەبو، ئەو گفتوگۆیانە چ مانایەکیان هەبو؟ ئایا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بابەتە چارەســەرنەکراوەی تایبەت بو بەو شوناسەی لە سییەکانەوە ببو بە مۆتەکە؟ بۆچی هەمیشــە ســەروەری لەعێراقدا لەرێگەی قەتلوعام (١٩٣٣)، یا کردەوەی لە سێدارەدانی بەکۆمەڵ (١٩٦٩) جەختی لەسەر دەکرێتەوە؟

سروشــتی ئــەو پرســیارانە بوار بــۆ وەڵامدانــەوەی روون ناهێڵێتــەوە. بەهەر حاڵ لێکچوەکان تا مەودایەکی دوور لەوە زیاتر هەنگاونانێن. بەلانیکەمەوە ســێ جیاوازی ســەرەکی هەیە کــە ئەو ماوانــە لەیەکتــری جیادەکاتــەوە. یەکەم، لەدوای ســاڵی ١٩٥٨ەوە خەڵکێکی زۆر بەشدارییان لە کاروباری سیاسیدا دەکرد. دووەم، لەسەروی ئەوەشــەوە سیاســەت لەدوای ١٩٥٨ەوە مانای تازەی پەیدا کــردو پارلەمانو رژێمی پاشــایەتی هەڵوەشــانەوە، وەکئەوەی سیاســەت لەم قۆناغەدا بەڵگەی سیاسەتی پێش قۆناغی کودەتا بێت. سیاسەت لەم قۆناغە تازەیەدا لە دەوری بەشداری جەماوەرێکی پڕجوڵــەو بزێو، دڵســۆزی پڕ لە هەڵبــەزو دابەزیان بۆ حیزبە تونــدەکانو نەوەی نوێی کودەتاچییەکان تەوەرەی دەبەســت. بەپێچەوانەوە، سیستمی پارلەمانی ساڵی ١٩٣٦ توانی یەکانگیر بێت، هەر چەندە روبەروی رووشــانیش دەبوەوە، بەڵام هەر دەیتوانی پاریــزگاری لە قــەوارەی خۆی بکات. ســێیەم، دەرئەنجام وەك یــەك نەبو، ئەوەش مەحەك بو. بەعس ئەو بەشــەی لە دەستنوســەکان دوبارە کردۆتــەوە. بەعس بڕوای بەکاری رێکخراوەییو جەماوەری دژە ئیمپریالیزمو زایۆنیزم هەبو. هەر لەســەر هەمان بنەما دەسەڵاتیان گرتەدەست. هەر ئەو بیروباوەڕەش وایلێیان کرد "بەپێی بەرنامەیەکی تازە، مێژوو دارێژنەوە". بەو شێوازە بەعس درۆکانی بەراستی گۆڕیو هەموشمان لەو کارە بەرپرسیار بوین.

1 ـ George Antonius, The Arab Awakening (New York, Capricorn Books, 1965). 241
2 ـ A. Shikara, "Faisal's Ambitions of Leadership in the Fertile Crescent: Aspirations and Constraints", in The Integration of Modern Iraq. A. Kelidar (London, Croom Helm, 1979).
3 ـ پەیمانی بریتانیا ـ عێراق، ساڵی ١٩٣٢ چوە بواری جێبەجێ کردنەوە. بەپێی ئەم پەیمانە بەرژەوەندییەکانی بریتانیا لە عێراق دەپارێزرێت‌و بنکە سەربازییەکانی حەبانییەو شوعەیبەشی کۆنترۆڵ دەکرد. ئەم پەیمانە سەرچاوەی توندوتیژی نێوان میلیگەراکان بو کە بەئەنقەست رەزامەندییان لەسەر دەربڕی‌و لایەنگرانی پانعەرەبیزمیش ئەو پەیمانەیان رەتدەکردەوە.
٤ ـ نیزالی بەعس (بەیروت، داروتەلیعە، ١٩٧٦)، ئەم کۆمەڵە ١١ بەرگییە بەیان‌و بەڵگەنامەکانی حیزبی بەعس بو. وەرگێراوەکان هەمو هی نوسەرە.
5 ـ لە راپۆرتی سێیەمین کۆنگرەی نەتەوەییدا وەرگیراوە، تشرینی یەکەمی ١٩٥٩، ل ٤٨.
6 ـ ساتع حوسەری، رۆژژمێرەکانی لە عێراق: ١٩٢١ ـ ١٩٤١ (بەیروت، داروتەڵیعە، ١٩٦٧)، ٨٩ ـ ١:٥٨٨.
7 ـ هەمان سەرچاوە، ١:٥٩٠، نامەکانی حوسەری لەگەڵ وەزیرەکەی لەلاپەڕەکانی ٥٩١ ـ ٦٠٢دا هاتوە.
8 ـ هەمان سەرچاوە، ٤ ـ ١:٤٠١
9 ـ هەمان سەرچاوە، ١٩ ـ ١:٢١١.
10 ـ هەمان سەرچاوە، ٢:٣١٣.
11 ـ هەمان سەرچاوە، ٨٠ ـ ٢:٢٧٧.
دەربارەی پەروەردەو گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی دەڵێت: "ئەوەی عەرەب دەیەوێت پێش هەر شتێك هەمان ئەو رۆحە کۆمەڵایەتییەیە کە تێیدا رۆحێکی پێکەوەیی‌و گوێرایەڵی‌و بەختکردن لەنێوانیاندا بەهێز بکات". هەمان سەرچاوە/ ٢:٢٨٠.
12 ـ هەمان سەرچاوە، ٤١ ـ ٢:٣٤٠
13 ـ بگەرێڕەوە بۆ وەلید کازا، خوێندنەوەیەکی دی بۆ چەمکی حوسەری لەسەر ناسیونالیزمی عەرەب، ژیانی فیکری لە رۆژهەڵاتی عەرەبیدا: ١٨٩٠ ـ ١٩٣٩ ـ مەروان بوحەیری. سەنتەری بەیروت بۆ لێکۆڵینەوەی عەرەبی‌و رۆژهەڵاتی ناوەراست، زانکۆی ئەمەریکی لە بەیروت، ١٩٨١. ١٥٩.
14 ـ ئەم یاداشتە لە "لێکۆڵینەوەی رۆژهەڵاتی ناوەراست" بڵاوکراوەتەوە، ١٩، ژمارە ٢ (نیسان ١٩٨٣)، ل٢٥٤ ـ ٢٥٥. لەم یاداشتەدا سمیس بەمشێوەیە هەستی رەگەزپەرستی رووندەکاتەوە: "ئەم وڵاتە لەماوەی چەند ساڵێکدا بە رووکەش مەدەنییەتی قبوڵ کردوە، بەڵام لە واقیعدا هەرگیز مەدەنی نەبوە. ئەو کەسانەی پێیانوایە کەسێکی نامەدەنی بەپۆشینی جلوبەرگی مەدەنی دەبێتە کەسێکی مەدەنی، هەر هەمان ئەو کەسانەش بەجادەوبانی تازە حوکم لەسەر مەدەنیبونی عێراق دەدەن... بەهەمو دڵنیاییەوە ئەو پێشکەوتنە خێرایە لە میکانیزمی مەدەنییەتدا لەگەڵ لایەنی ئەخلاقی ناکۆك‌و ناتەبا دەکەوێتەوە، بەتایبەتی لەسەر لاوان کاریگەری





جارسکەری هەیە". لە واقیعدا بەگۆڕینی وەحشی بەعەرەب‌و مەدەنیەت بە سەردەمی هاوچەرخ، مرۆڤ لە پێگەیەکدا دادەنێت کە هەمان پێگەی ساتع حوسەری سەردەمی ماندێتی هەبێت.
15 ـ هەمان سەرچاوە، ٢٥٩، سمیس گلەیی دەرچونی حوسەری لە وەزارەت دەکرد (١٩٢٧) کە "چۆن لێهاتویی‌و وزەیمان لەدەستداوە، بەڵام بیروڕاکانی، بەتایبەتی بیروڕا هەڵەکانی لە هەمو کاتێکی دی زیاتر شوێنی خۆیان گرتوە".
16 ـ ئەم دەقە لە حەنا بەتاتۆ وەرگیڕاوە، "چینە کلاسیکەکانی سۆسیالیزم‌و بزوتنەوە شۆڕشگێڕەکانی عێراق (چاپخانەی زانکۆی پرینسیتۆن، ١٩٧٨)، ٢٥ ـ ٢٦.
17 ـ بۆ نمونە ئەمیل دۆرکایم لە ١٩٠٢/٣ لەگوتاریکێدا کە ئایندەی ئوستازێگی دانشگە لە کۆمەڵگەیەکی عەلمانیدا ئەلتەرناتیڤەکەی کۆمەڵگەیەکی ئایینییە: "زاڵنەبون بەسەر نەفسدا لە سنورێکی دیاریکراودا نیشانەی نەخۆشییە، دیسپلینیش خۆی لە خۆیدا هۆکارێکە لە هۆکارەکانی توێژی پەروەردەیی. لێرەدا رەگەزی گرنگ هەیە کە خەسڵەتی ئەخلاقی هەڵگرتوە، دەشێت تەنها بۆ دیسپلین بگەڕێتەوە. تەنها لەرێگەی هاوکاری ئەو رەگەزانەوە دەتوانرێ منداڵ فێربکرێ کە چۆن دەسەڵاتی بەسەر ئارەزوەکانیدا بشکێت‌و سنورێك بۆ هەوەسە جۆراو جۆرەکانی دابنێت، لەڕێگەی ئەو سنور دیاریکردنەوە ئامانجی چالاکییەکانی دەست نیشاندەکات. هەر ئەو سنور دیاریکردنەش مەرجی خۆشبەختی‌و سەلامەتی ئەخلاقێتی". ئەو گوتارە لە بیستەکاندا بڵاوکرایەوە. ئەم دەقە لە دەقە ئینگلیزییەکەی "پەروەردەی ئەخلاقی" وەرگیراوە، چاپخانەی ئازادی، ١٩٧٠، نیویۆرك، ٣٨، ٤٢، ٤٣.
18 ـ مایکڵ فۆکۆ بەهەڵگرتنی شوێن پێی دۆرکایم‌و ماکس فیبەر، ئەو بیروباوەرەی لە ئەوروپا گەشە پێدا، کتێبی "دیسپلین‌و سزادان"، (بەشی سێیەم، نیۆیۆرك، رادندۆم هاوس، ١٩٧٩).
19 ـ بڕوانە کاری مەعروف رەسافی، نوێنەری پارلەمان، رەخنەگری سەرسەختی پارلەمان‌و تەبێژێکی زبر دەست بو. عەرەبگەرایی‌و نەفرەت لەئینگلیزکردنی رەهەندێکی مەزهەبی هەبو. ئەمرۆ هەمو عێراقییەك زانیاری لەسەر شیعرەکانی هەیە، ئەو جگە لە سوپا گشت دەزگاکانی دی لە عێراق رەخنە کردوە.
20 ـ یوسف عیزەدین: شیعری هاوچەرخی عێراقی: کاریگەرە کۆمەڵایەتی‌و سیاسییەکان، (قاهیرە، چاپخانەی داروسەقافە، ١٩٧١)، ١٩٧.
21 ـ موسا شابەندەر رۆژنامەنوسێکی ئەنتی ئینگلیز بو، لە حکومەتەکەی رەشید عالیدا وەزیری دەرەوە بو. وتارە گاڵتەجاڕەکانی ساڵی ١٩٦٧ لە بەغدا بە ناونیشانی "شەرارات" بڵاوکرایەوە.
22 ـ بڕوانە وتارەکەی پی. جی. هیمفێڵ، بەناونیشانی "دامەزراندنی سوپای عێراق ١٩٢١ ـ ١٩٣٣، لە کلدار، (عێراقی هاوچەرخ. ٩١).
23 ـ حوسەری، رۆژژمێری ٣١٠ ـ ٢:٣٠٩، سەرجەم گفتوگۆکانی لە لاپەڕەکانی ٣٠٦ ـ ٣١٣دا هاتوە.
24 ـ زانیاری لەسەر ئاشورییەکان‌و سوپای عێراق‌و رودواوەکانی هاوینی ١٩٣٣ لە ر. س. ستافۆرد وەرگیراوە، "تیراجیدی ئاشورییەکان"، لەندەن، ئەڵین‌و ئۆین لیتد ١٩٣٥. خەلدون ساتع حوسەری "مەسەلەی

ئاشــورییەکان" گۆڤــاری نێودەوڵەتــی بۆلێکۆڵینەوەی رۆژهەڵاتــی ناوەراســت، ٥ ـ (١٩٧٤): ٣٤٤ ـ ٦٠.
هیمفێڵ، دامەزراندنی سوپای عێراق، ١٩٢١ ـ ١٩٣٣.

25 ـ ستافۆرد، هەمان کتێب، ١٧٤ ـ ١٧٥.

26 ـ هەمان سەرچاوە، ٢٠١

27 ـ خەلدون حوسەری، مەسەلەی ئاشورییەکان، ٣٥٢

28 ـ ستافۆرد، هەمان سەرچاوە، ٦٣ ـ ٦٥.

29 ـ دۆبس کۆمسیەری باڵای بریتانیا باس لەو کۆت بەندە دەکات کە پێویستە بەسەر گەشەکردنی سوپای عێراقدا بســەپێنرێ تا بریتانیا دەکشــێتەوە. دۆبس ســاڵی ١٩٢٥ رایگەیاند کە ٩٠٠٠ هەزار سەرباز بۆ عێراق بەسە بۆ ئەوەی ئۆقرەیی ناوخۆی عێراق بپارێزێت. بڕوانە هیمفێڵ "دامەزراندنی سوپای عێراق" ٩٥ ـ ٩٧.

30 ـ رۆحمان تژییە لە مەزنی مێژوو و سەرکەوتنەکانی، ئەوەش هانماندەدا پەرجوی زیاتر لە نیشتمان بەدەست بهێنین. ئێمە کە خەونمان بەیەکێتی عەرەبییەوە دەبینی، چاومان کردەوە سوپای عێراق، پروسیای عەرەبمان بینــی، ئــەو هێزەی خەونەکانمان لە ئەفراندنــی دەوڵەتێکی عەرەبی یەکگرتو دەهێنێتەدی کە شــکۆمەندیو شارســتانی رابردوو بۆ نەتەوەی عەرەب دەگێڕێتەوە". لە وتەکانی مەحمود دورە ـ ی ئەفســەری عێراقی کە ساڵی ١٩٣٠ بێتاوانی سەربازی بەدەست هێنا، لە "دامەزراندنی سوپای عێراق" وەرگیراوە. ل١٠١.

31 ـ خەلدون حوسەری ئەمەی کردە مەسەلەیەك، لە یەکێك گفتوگانی پارلەماندا سیر سیمۆئیل هۆر باسی لە گرنگی کەمایەتییەکانی عێراق کرد. کوردەکان رۆحییەتی ئۆسکۆتلەندییە چیانیشینەکانیان هەیە، ئاشورییەکان نوێنەرایەتی کۆنترینو پاکترین جۆری مەســیحییەت دەکەن، لەناوبردنی ژمارەیەك وەك ئێزیدیەکان نەك تەنها زیان بە عێراق، بەڵکو بە هەمو جیهان دەگەیەنێت. ئەم بایەخدانە رۆمانسییەی ئینگلیز بەم کەمایەتیانە لەکن عێراقییەکان مایەی گومان بو، نەیاندەتوانی لەوە تێبگەن، چۆن دەکرێ بریتانییەکان خۆشەویستیان بۆ کوردو ئاشــورییەکان هەبێتو هەمان خۆشەویستیشــیان بــۆ عەرەب هەبێت. بەهەر حاڵ خــودی عەرەبیش لەلای عێراقیەکان بە چاوی گۆمانەوە تەماشا دەکرا.

32 ـ ستافۆرد، تیراجیدی ئاشورییەکان، ٢٠٤.

33 ـ خەلدون حوسەری، مەسەلەی ئاشورییەکان، ٣٥٣.

34 ـ هەمان سەرچاوە، ٣٥٧.

35 ـ ساڵی ١٩٢٥ هێندێك لە خۆبەخشە ئاشورییەکان نزیکەی ٥٠ کەسیان لە بازارێکی کەرکودا کوشت، رەنگە ئەمەش لەهەمان هەســتەوە سەرچاوەی گرتبێت. بڕوانە ســتافۆرد "تراجیدیا ئاشورییەکان (٧٠)، ئەوە روونەدەکاتەوە چۆن کە رەگەزپەرســتی هێندێك ئەفســەری ئینگلیز کاریگەریان لەســەر ئاشورییەکان هەبوە، بەڵام بەهۆی لەدەستدانی پەیوەندی ئاشورییەکان بە راستییە مێژووەکانەوە، بەراشکاوی "عەقلییەتی ئاوارەیی"و وەفادرییان بۆ مارشــەمعون روونەدەبێتەوە، ئەمە لە حاڵێکدا مارشــەمعون لەوە تێنەدەگەیشــت کە هەلومەرجی دوای جەنگی یەکەم گۆڕانکاری بەسەردا هاتوە.





36 ـ خەلدون حوسەری، مەسەلەی ئاشورییەکان، ل١٦١.

37 ـ هێمفێڵ، دامەزراندنی سوپای عێراق، ١٠٧.

38 ـ خەلدون حوسەری، مەسەلەی ئاشورییەکان.

39 ـ محەمەد تەربوش، رۆڵی ســوپا لە سیاســەتدا: لێکۆڵینەوە لەعێراق تا ســاڵی ١٩٤١، لەندەن . کیگان پۆڵ ١٩٨٢.

40 ـ دائیــرەی ئینســکلۆپیدیای عێراقــی هاوچــەرخ، ئامادەکردنــی خالید عانــی، بەغــدا، دار ئەلعەرەبیە لیلمەوسوعات (١٩٧٧) ٢ : ٩٩٥.

41 ـ Magid Khadduri, Independent Iraq: Astudy in Iraqi Politics from 1932 to 1958 (London, Oxford Universty Press, 1960), 71, 69 - 74

42 ـ هەمو ئەو هەڵبژاردانە لەنوسینەکانی شەوکەتەوە وەرگیراوە بەناوی "ئەمە ئامانجمانە"، بەغدا، وەزارەتی مەعاریف، ١٩٣٩، بەڵام ناونیشــانی تەواوی بریتیە لە: "ئەمە ئامانجمانە، ئەوەی لەگەڵماندا بێت، یەکێکە لەئێمە".

43 ـ ماجد خەدوری "عێراقی ســەربەخۆ": لێکۆڵینەوە لە سیاســەتی عێراقدا لە ١٩٣٢ تا ١٩٥٨، چاپخانەی ئۆکسفۆرد (١٩٦٠) ـ ١٦٧.

44 ـ سامی شەوکەت، ئەمە ئامانجمانە، ٥ ـ ٦.

45 ـ شەوکەت نامەیەکی موفتی بۆ فۆن پاپن پێبو کە تێیدا موبارەك بایی لەهیتلەر دەکاتو ئاماژە بەململانێی دژە "دیموکراسیو یەهودیەتی نێودەوڵەتی" دەکات. لەکۆتایی نامەیەکدا هاتوە کە "عەرەب بەهەمو متمانەیەکەوە پێشــبینی دەکات کە ئەنجامی دوا سەرکەوتن، ســەربەخۆییو رزگاربونیان بێت، ئەمە سەرباری یەکبونیان، ئیدی لەودەمەدا پەیوەندیان بە وڵاتەکەیانەوە لەرێگەی پەیماننامەی دۆستایەتیو هاوکارییەوە دەبێت".

46 ـ بڕوانە خەدوری: عێراقی سەربەخۆ، ١٧٩.

47 ـ ئیس. ئێڵ. لۆنگریگ، مێژوونوسی ئینگلیزی دەنوسێت، لەحاڵەتێکدا بزوتنەوەی رەشید عالی کەمترین هاوئاهەنگی لەگەڵ ئەڵمان هەبوایە زۆر بەزەحمەت شکستی دەهێنا:
S. L. Longrigg, Iraq: 1900 – 1950. A. Political, Social, and Economic History (London, Oxford University Press, 1953), 297.

48 ـ بڕوانە ئار. ئەی. لۆلس، شێوازەکانی گۆڕینی دانیشتوانی عێراق.

49 ـ بڕوانە، بەتاتو، چینە کۆمەڵایەتیەکان.

50 ـ د. فازیل بەڕاك، رۆڵی ســوپای عێراق لە حکومەتی بەرگری نیشــتمانیو شــەڕی دژە ئینگلیز لەســاڵی ١٩٤١دا. (بەغدا ـ دار ئەلعەرەبی ١٩٧٩) ٢٤٢، بەڕاکیش نمونەی نەوەی روناکبیرە عێراقییەکانە کە هەمان بیروباوەری ساڵی ١٩٤١یان هەبو، بۆ زانیاری زیاتر لەسەر وتەکانی بەڕاك بڕوانە بەشی یەکەم.

51 ـ هەمان سەرچاوە، ٢٦١.

# بەشی شەشەم

# شکڵگیری بەعس

## دروستبونی بەعس:

ئەزمونی پانعەرەبیزمی عێراق کە لەگەڵ فەیسەڵدا دەرکەوت، ساڵی ١٩٤١ پوکایەوەو کۆتایی پێهات، چونکە ئەو نەوەیەی لە سییەکاندا لە پێناوی پانعەرەبیزمدا رێبەرایەتی خەباتی دەکرد، لەسەر شانۆی روداوەکان دوورکەوتەوە. ئەو دوورکەوتنەوە یا پاشەکشێیە لایەنێکی دەگەڕێتەوە بۆ سەرکوتکردنی سیاسیو ئەو دەرئەنجامانەی لە جەنگی جیهانی دوەمدا کەوتنەوە، بەڵام لایەنی هەرە گەورەی دەگەڕێتەوە بۆ دەرکەوتنی حیزبی شیوعی عێراق. پانعەرەبیزم لە کۆتایی چلەکاندا جارێکی دی لەشێوەی شانەی بچوکی خوێندکاران کە بەعسیەکانی سوریا دروستیان کردبو، لە چەند کۆلیجێکدا سەریانهەڵدایەوە. ئەو شانانە لە گەڕەکە سونەنشینەکانی بەغدا کە زۆربەیان خوێندکاربون، زۆر لەسەرخۆ گەشەیان دەکرد. حیزبی بەعسی عێراق ساڵی ١٩٥٢ بەڕەسمی وەك لقێکی حیزبی بەعسی سوریا دروست بو. لەو سەردەمەدا حیزب نزیکەی سەد ئەندامی هەبو کە زۆربەیان لەو سونانەبون پێش دروست بون یا راگەیاندنی حیزب، پەیوەندییان بە بەعسەوە کردبو.

ساڵی ١٩٥٥ لە ١٠٪ ئەندامانی حیزب لە عەرەبی غەیرە عێراقی بون. لە ساتەوەختی کودەتاکەی ١٩٥٨ بەسەر رژێمی پاشایەتیدا، ژمارەی ئەندامانی حیزب





بۆ نزیکەی ٣٠٠ ئەندام زیادی کردبو [1]. لەبەر ئەوەی پانعەرەبیزمی رێکخراو لە ساڵانی ١٩٤١و١٩٥٨دا تارادەیەکی زۆر بزر بو، بۆیە دەبێ گرنگی بە سەرچاوەی ساڵانی چلەکانی بەعسی سوریا بدرێ کە نێوەندێکی سروشتی نەتەوەگەرای عەرەب بو لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا.

## ئەو کەسایەتیو روداوانەی حیزبیان دروستکرد:

میشیل عەفلەقو سەلاحەدین بەیتار کە دوو دامەزرێنەری دانپیانراوی حیزب بون، لە گەرەکی مەیدانی دیمەشق لەدایك ببون[2]، ئەو گەرەکەی بەخاتری خەباتی چەکدارانەی لەدژی فەرەنسیەکان لە کاتی راپەرینی ١٩٢٥ ـ ١٩٢٦دا ناوبانگی دەرکردبو. میشیل عەفلەق لە ژینگەیەکی مەسیحی ئەرتەدۆکسییەوە چاوی هەڵهێنابو، بەڵام سەلاحەدین بەیتار موسڵمانێکی سونەو لە خێزانێکی ئاینی ناودار گەورە ببو. هەر دووکیان پەروەردەیەکی ئاینیان هەبو، بەمەبەستی تەواوکردنی خوێندنی زانکۆش بەرەو پاریس رۆیشتنو ساڵی ١٩٢٩ بۆ یەکەمجار لە پاریس ئاشنایەتیان پەیداکرد. لەماوەی چوار ساڵی خوێندندا پەیوەندییەکی سیاسی پتەویان دروستکردو یەکێتی خوێندکارانی عەرەبییان دامەزراند. ئەوەش کاریگەرییەکی گەورەی هەبو تا لەرێگەیەوە پەیوەندی بە خوێندکارانی دی وڵاتانی عەرەبییەوە بکەن. ئەو کەشوهەوا رادیکاڵە ئازادە فیکرییەی لە ماوەی رابونی سەردەمی قەیرانەکاندا سەرتاپای ئەوروپای گرتبووەوە ئەوانیشی بەرەو ئەو رابونە کێشکرد. بەرهەمەکانی مارکس، نیچە، لینین، مازنی، ئەندرێە جید، دیستۆفسکیو رۆبین رۆڵاندیان، بە پەرۆشو جۆشو خرۆشەوە دەخوێندەوە. رەنگە میشیل عەفلەق فەلسەفەی زیندەگەری (حيوية) بیرگسۆن ـ ی پێقبوڵ بوبێتو ستایشکردنی جۆرج سۆرێلّ لە کردەوەی داهێنەرانەی توندوتیژی بەکۆمەڵ سروش بەخشی بوە، بەڵام نە باکگراوندێکی کەسێتی ئەو لەبەردەستەو نە

کەسیش ئەو راستیە دەزانێت کە بونیادی فیکری میشێل عەفلەق چۆن دروست بوە. عەفلەق بە پێچەوانەی ناسیونالیستە عەرەبەکانی نەوەی یەکەم، هەرگیز دانیپیانەناوە کە کاریگەری چ بیریارێکی رۆژئاوای لەسەر بوە، بەڵکو لە چاوپێکەوتنێکی ئەریك رۆکۆدا بانگەشەی ئەوە دەکات کە لەگەڵ هەڵایسانی جەنگی جیهانی دوەمدا، وازی لە خوێندنەوەی ئاراستە فیکریە رۆژئاواییەکان هێناوە[3].

کاتێك گەڕانەوە بۆ دیمەشق، هەر دووکیان بە شێوەیەکی رێکوپێك لە گۆڤاری "تەلیعەی" هەفتانەی حیزبی شیوعی دەستیان بەنوسین کرد[4]. بەیتار بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە خۆیان ئەو گۆڤارەیان دەرکردوە، ئیدی ئەوەی کە میشێل عەفلەقو بەیتار ئەندامی حیزبی شیوعی بون یا نا بەتەواوەتی روون نیە، بەڵام ئاماژەکان وادەکەونەوە کە ئەندامی حیزبی شیوعی نەبون[5]. عەفلەق بەتوندی ئەو بانگەشانەی رەتدەکردەوە[6]، بەڵام هەرگیز شەیدایی خۆی بە رێکخستنو دیسپلینی حیزبی شیوعی نەدەشاردەوە. سەرەتای خۆداماڵینی لە سیاسەتی حیزبی شیوعی لەساڵی ١٩٣٦داو لە گەڵ هەڵبژاردنی حکومەتی بەرەی نیشتمانی دەستی پێکردو حیزبی شیوعی سوریاش وازی لە خەباتی ژێرزەمینی هێناو بەئاشکرا دەستی بەکاری سیاسی کرد.

هێشتا روون نەبۆتەوە کە چ شتێك گەورەترین کاریگەری لەسەر ئەو دوو کەسە هەبوە، روداوەکانی فرەنسا یا هەڵوێستی فرەنسا دەربارەی پاریزگای ئەسکەندەرۆنە. بەهەر حاڵ ئەو دوو کەسە لە حیزبی شیوعی سوری هەڵگەڕانەوەو حیزبیان بەکرێگرتەی حیزبی شیوعی فرەنسیو حکومەتی فرەنسا تاوانبار دەکرد. دوای بەدوای ئەوەش قۆناغی منەکردنو تێڕامانی هاندەرو بیروباوەڕی کەسایەتییەکان دەست پێدەکات. لەسەرەوەختی جەنگی جیهانی دوەمدا خوێندکاران لە دەوریان کۆبونەوە. "هەمو کەسێك هەستی بە بۆشایی دەکردو پێیانوابو رێبەرایەتی کۆن شکستی هێناوەو دەبێ بزوتنەوەیەکی نوێ دەربکەوێت"[7].

ناوکی حیزبی بەعس تەنها لەدوای شکستی فرەنسا لە ئەیلولی ١٩٤٠دا شکڵی



خۆی گرت. یەکەمین بڵاوکراوە لە شوباتی ١٩٤١دا لەدژی فرەنسیەکان بڵاوکرایەوە. بەعسیش وەك ناسیونالیستە عەرەبە عێراقییەکانی ساڵانی بیستو سییەکانی سەدەی بیستەم کە دوای سەربەخۆیی سوریا لە هێندێك وێنەی ریفۆڕم بەدیارکەوت، بوە رابردویەکی لەیادکراو، کەچی بەعسییەکان پێیانوایە حیزب لە ساڵانی چلەکانو لە ئاکامی "خەبات" لەدژی فرەنسیەکان شکڵی خۆی وەرگرتوە. عەفلەق ساڵی ١٩٣٦ جارێك گیرا، لەدوای سەربەخۆییشەوە بەلانیکەمەوە چوار جار لەلایەن رژێمی سوریاوە گیرا. عەفلەق تەنها دوای تەواوکردنی ماوەی زیندانییەکەی لەساڵی ١٩٥٤دا بوە سومبلی نیشتمانپەروەرێتی، بەڵام وەك سیاسییەکی کارا شتێکی ئەوتۆی لەگەڵ فرەنسیەکاندا نەکرد، چونکە ئەوانیش سەرگەرمی شەڕبون لەگەڵ نازییەکاندا، بەڵام بەدڵنیاییەوە هەر دووکیان بەهۆی نارەزاییان لەسەر بەرنامەی پەروەردەو فێرکردن، بەوەی "لەلایەن ئیمپریالییەکانەوە دارێژراوە"[8]، لەلایەن وەزیری پەروەردەوە سزادران. بەهۆی ئەو روداوەشەوە لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٢دا وازیانهێناو ژیانی خۆیان بۆ سیاسەت تەرخانکرد. لەو ماوەیەدا، واتە لەکاتی قەیرانی رەشید عالی دا، عەفلەقو بەیتار لیژنەیەکی سورییان بۆ هاوکاریکردنی عێراق دروستکرد، ئەو لیژنەیەش رێگەی بۆ رێکخستنی حیزب بەعس خۆشکرد.

بەپێی یەکێك لە حەکایەتە نیمچە رەسمیەکانی حیزب، بەعس وەك پەرچەکردارێك لە بەرامبەر "سێ وەرچەرخانی سەرەکی"دا پایگرت، کە لە ماوەی سییەکاندا روبەروی ئۆپۆزیسۆن دەبونەوە، ئەوانەی بەپێچەوانەی بەعسەوە نوقمی تێکۆشان بون لەدژی فرەنسیەکان[9]. رەنگە گرنگترین وەرچەرخانیش حیزبی شیوعی سوریا بێت، دوەم حیزبی قەومی سوریا کە لایەنگری لە سوریای مەزن دەکردو سێیەمیش ئیخوان موسلمین بو. بەڵام ئەو بیرۆکە سەرەکییەی بەعسی لەسەر دروست بو، لە دەرەوەی ئەو سێ وەرچەرخانە تەوەرەی دەبەست، ئەویش پانعەرەبیزم بو.

هەر دووکیان لە سێ ماوەی جیاوازدا، ١٩٤٣، ١٩٤٧، ١٩٤٩، نەیانتوانی ئەندامێتی پارلەمانی سوریا بەدەستبهێنن، ئیدی عەفلەق سوێندی خوارد هەرگیز

ئەو هەوڵە دووبارە نەکاتەوە. بەڵام بەیتار ساڵی ١٩٥٤ بەنوێنەری دیمەشق هەڵبژێردرا، پاشان چەندین پۆستی وەزاری وەرگرت. بەیتار لە ساڵانی چڵو پەنجاکاندا دینەمۆی سەرەکی حیزبو ڕێکخەری نهێنی بو.

میشێل عەفلەق تەنها یەك کەڕەتو بۆ ماوەی سێ مانگ پۆستی وەزاری وەرگرت، بەڵام ڕۆڵی حیزبی لە بەیتار گرنگتر بو. عەفلەقی فەیلەسوفو تیوریستی سیاسی حیزب لەسەرروی هەمو گومانو ململانێیەکەوە بو، پۆستی ئیداری بەلاوە گرنگ نەبو، بەڵام کاریگەرییەکی زۆری لەسەر ئەندامانی حیزب هەبو. عەفلەق کەسێکی کۆشاو جیدیو خۆی بۆ ئامانجەکانی تەرخان کردبو، تەنانەت نەیارەکانشی دانیانپیادەنا. ژیانێکی سادە دەژیاو گرنگی بە دەسکەوتی مادی نەدەدا، کاریگەری لەسەر ئەو کەسانە هەبو کە گرنگیان بە بیروباوەرەکەی دەدا. ئەو خوێندکارانەی عەفلەقو بەیتار لە دە ساڵی پێشودا لە دیمەشق وانەیان پێدەوتنەوە (١٩٣٣ ـ ١٩٤٢) ڕێگەی زانکۆو ژیانی پراکتیکیان گرتەبەر (هەمیشە فێرکار). بۆیە کاریگەری حیزب لە ساڵانی یەکەمیدا بە پاڵپشتی نوسینەکانی عەفلەق لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی سوریا زیادیکرد. بەعس لە سەرەتای دروستبونیدا هەروەکو حەنا بەتاتو بە دروستی دەڵێت، حیزبی عەفلەق بو[10].

سەرباری ڕوداوەکانی عێراق (١٩٣٦ ـ ١٩٤١) دەربەستبونی فەرنسا بەرامبەر بە تورکیا سەبارەت بە ئەسکەندەرونە بە دانیشتوانە عەلەوی، ئەرمەنی سونەو تورکەکەیەوە، گرنگییەکی یەکلاکەرەوەی لە دروستبونی بەعسدا هەبو. فەرنسا ساڵی ١٩٣٩ ئەسکەندەرونەی وەك بەشێك لە گرێبەستێك بە تورکیا بەخشی بۆ ئەوەی لە جەنگدا تورکیا لایەنگری لە هاوپەیمانان بکات. لە ساڵی ١٩٣٦ەوە دنەدانی هەستی گشتیو وروژاندنی ئەم بابەتە فێرکارێکی دی کە دەرچوی سۆربۆن بو بەرێوەیدەبرد، ئەویش زەکی ئارسۆزی بو. زەکی لە تەمەنی سی ساڵیدا هەڵمەتێکی توندڕەوانەی ڕەگەزپەرستی دەست پێکرد کە جەختی لەسەر ناسنامەی عەرەبی دەکردەوە. تورکەکانی سوریا بونە ئامانجی هەڵمەتەکەی ئارسۆزی، لەگەڵ ئەوەشدا ئەرمەنو



سونییەکانیش کە پێی دەوتن "عەرەبە تورکەکان" لە هەڵمەتەکەیدا بە سەلامەتی دەرنەچون. ئارسۆزی لە ڕاڤەکردنی مامەڵەی فەرنسیەکان لەگەڵ عەرەب لە بەرامبەر بە کەمە نەتەوایەتیەکاندا دەڵێت: "بیانیەکان بەخاتری بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە عەرەب دەترسان، بۆیە بۆ دوورخستنەوەی ئەو هەڕەشانە یەهودیان بەکاردەهێنا، ئیدی شتێکی ئاسایی بو بێبەهاترینو پۆخڵترین کەسانی سەرزەمین، بەسەر ئێمەی سەروەرانی جیهان لە ڕابردودا پەسەند بکەن"[11]. ئەم ئەندێشە مەزهەبییە کاتێك چوە خزمەتی پانعەرەبیزمەوە، لەفۆڕمی ئاینزای عەلەویدا بەدیارکەوتو ئارسۆزیش گشت ئەو فۆرمۆڵانەی لەپێکهاتەی نەتەوەی عەرەبیدا خستەروو[12].

لەدوای دەرکردنی ئارسۆزی لە ناوچەکە (ساڵی ١٩٣٩) گروپێکی دروستکرد کە مەرجی سەرەکی بۆ بوون بە ئەندام: نوسین یا وەرگێڕانی کتێبێك بو کە پشکی لە "زیندوکردنەوە ـ بەعس" ی کەلەپوری عەرەبیدا هەبێت. بەشی کولتوری ئەو گروپە ناوی بەعسی عەرەبی بو، ئەوەش یەکەم بەکارهێنانی وشەی بەعس بو لە گروپێکی سیاسی ڕێکخراودا.

ساڵی ١٩٤٤ ئەم گروپە لەگەڵ شانەیەکی بچوکی عەفلەقو بەیتاردا کە بارەگەکەیان لە دیمەشق بو یەکیانگرت، بەڵام ئارسۆزی لەبەر ئەوەی دوژمنایەتی لەگەڵ عەفلەق هەبو، نەچوە ریزی ئەو ڕێکخراوە تازەیەوە. هێندێك کەڕەت ئارسۆزی خۆی بە "پەیامبەر"و "چارەنوسی" نەتەوەی عەرەب دەزانی[13]. بەڵام عەفلەق هەرگیز مەسەلەکانی بەوجۆرە بە شەخسی نەدەکرد، هەرچەندە نوسینەکانی کێشو شەیدایی تیانەبو، بەڵام زیاتر پێکەوە پەیوەستو گونجاوبون. سەیر ئەوە بو هەر دووکیان وەکیەك قەناعەتیان بەناسیونالیزمی عەرەبی هەبو. بەعسییە عێراقییە سونەکان زیاتر ستایشی عەفلەقیان دەکردو بە باوکی ڕۆحی خۆیانیان دەزانی، بەڵام عەلەوییە سورییەکان عەفلەقیان بە زەوتکار دەزانیو ئەو سیفاتانەیان دەدایە پاڵ ئارسۆزی.

پابەپای گەشەکردنی حیزبی بەعس لایەنگرانی ئارسۆزی ئەزمونی سیاسەتی جەماوەرییو سەربازی ڕادیکاڵانەیان خزاندە نێو گفتوگۆکانی عەفلەقو بەیتارەوەو

ئارسۆزییان لە بندەستی وەهیب غانم ـ ی ڕێبەر بەجێهێشتو براکەیو عەلەوییەکانی دیی ئەسکەندەرونە سـاڵی ١٩٤٩ یەکەمین ناوکی بەعسـیان لە بەغدا دروستکرد. ئەسکەندەرۆنییەکان هیچ "تیورەیەکی" تازەیان بۆ بەعس نەهێنا، تەنها وزەی ڕێکخستنو جۆرێك لەهەسـتی ئینتمای سیاسیان بۆ گروپی "خەبات لەدژی ئیمپریالیزم" تیابو کە پێشتر لە مەسەلەی ئاشورییەکاندا (ساڵی ١٩٣٣) نمایشکرا بو.

بەعس لە چلەکانی سەدەی بیستەمدا لە خوێندکار، مامۆستا، پاریزگا، پزیشکانو توێژە روناکبیرەکەی چینەکانی دی پێکهاتبو. تەموزی ساڵی ١٩٤٣ کاتێك گروپێکی کەمتـر لە ١٠ کەسـی بەیانـی بەرنامەی کاری حیزبیـان بڵاوکـردەوە[14]، زۆربەی نوسـەران پێیانوابو ئەو بەرنامەیە مێژوویی سـەرەتای دەسـتپێکردنی کارەکانی حیزب بو. لە نیسـانی ١٩٤٧دا کاتێك یەکەم کۆنگرە بەسـترا، ژمـارەی ئەندامانی حیزب دوای ئەوەی گروپی ئەسکەندەرۆنییەکان پەیوەندییان بەحیزبەوە کرد، هەر چەند سەد کەسـێك دەبون، دەسـتەیەکی جێبەجێکردن لە پێنج کەس دامـەزرا کە عـەفلـەق سەرۆکایەتی دەکرد.

سونەکان لەساڵانی چلەکاندا سەرکردایەتی حیزبیان بەدەستەوە بو، بەڵام سونەکان لەڕووی ژمارەی ئەندامێتییەوە زۆرینەنەبون، بەتایبەتی دوای ئەوەی ئەسکەندەرۆنیەکان سـاڵی ١٩٤٥ هاتنە ریزەوە. سـەرباری زۆری عەلەوییەکـان، بـەڵام تەنها یەکێکیان لەئاسـتی سـەرکردایەتیدا بو. دوای هاتنەریزی ئەکرەم حۆرانیو دوای ئەوەش، ساڵی ١٩٥٢ زۆرێـك لـە جوتیارانو ئەفسـەران بوون بە بەعسـی، دابەشـبونی چینایەتی حیزب لەگەڵ هاوشـێوە سـورییەکەی هاوتابو. لە کۆتایی شەستەکاندا عەلەوییەکان سـەرکردایەتی لقی سوریای حیزبیان گرتەدەسـت، ئەویش بە دزەکردنی ئەفسەرانی سـوریا بۆ ناو حیزبو بـەوەش بـاڵی مەدەنی حیزب لاواز بـو. بەڵام نەریتی مەدەنی حیـزب لە عێراق بەردەوام بو، ئەوەش بـە هەڵبژاردنی عـەفلـەق وەك باوکی ڕۆحی حیزب زیاتر ئاشکرا دەبێت.

گروپـی حۆرانی، سـەرباری زۆری ژمارەیان هەرگیـز بەتەواوەتی تێکەڵ بەحیزب



نەبون. حۆرانی دوای ئەوەی ساڵی ١٩٤١ پاڵپشتی لە رەشید عالی گەیلانی کردو ساڵی ١٩٤٨ یش فەرماندەیی هێزێکی ناسەربازی لە فەڵەستین دەکرد، وەك ناسیونالیستێکی عەرەب ناوبانگێکی باشـی پەیداکرد. ساڵی ١٩٤٣ حۆرانی بە نوێنەری شاری حەما هەڵبژێـردراو تا سـاڵی ١٩٥٨ وەك پارلەمانتار مایەوە. حۆرانی سـاڵی ١٩٥٠ حیزبی ئیشـتراکی عەرەبی لەسـەر هەمان بەرنامەی بەعس دروسـتکرد کە ساڵی ١٩٤٧ لە یەکـەم کۆنگرەی خۆیاندا پەسـەندیان کردبـو. " ئەم حیزبە ژمـارەی ئەندامەکانی گەیشـتە (١٠) هەزار ئەندام، هەروەها توانی زیاتر لە ٤٠ هەزار جوتیار راکێشـێت، کاتێـك بانگەوازی بەسـتنی یەکەم کۆنگرەی گشـتی جوتیارانی لـە حەلەب کرد، ئەوەش یەکەم کۆنگرەی گشتی جوتیاران بو لە مێژووی سوریادا"[15].

بەعس لەو دەمەی حۆرانی پەیوەندی پێوەکرد، نزیکەی ٤٥٠٠ ئەندامی چالاك لە ڕێکخستنەکانیدا چالاکییان دەکرد، ئەمە سەرەڕای ئەوەی لقیان لە عێراق، ئوردونو لوبنانیشـدا هەبو. هەر چەندە حیزب چالاکیو کاریگەری لە ژیانی سـوریادا هەبو، بەڵام بنکەیەکی جەماوەری نەبو. سـاڵی ١٩٥٢ لەگەڵ یەکبوندا ناوی بو بە حیزبی بەعسـی عەرەبی ئیشـتراکیو دوا شـکڵی خۆی وەرگرت. لەماوەی ساڵانی پەنجاو سـەرەتای شەسـتەکاندا لە سـوریا بوە هێزێکی جەماوەریو سـاڵی ١٩٥٨ دینەمۆی دروست بونی کۆماری عەرەبی یەکگرتو بو، ساڵی ١٩٦٣یش بۆ یەکەمجار لە عیراقدا دەسەڵاتی گرتەدەست.

بەکورتی، کەسـایەتیو روداوەکانی دەیەی یەکەم، ئەزمونی جۆراوجۆری بەدیاری بۆ بەعس هێنا: سەرکردەی شارەزاو مەدەنی چینی مامناوەندیو خوارەوەی کۆمەڵگە، فرەیی مەزهەبیو گەشـەکردنی هەرێمایەتی لەو دەسـکەوتانە بون. حیزب لە ڕێگەی حۆرانیـەوە بنکەیەکی بەرفراوانی لەنێو گوندنشـینەکان پەیداکردو شـوێن پێی خۆی لەناو سـوپای سـوریادا قایم کردو ئامادەگییەکی تەواوی لـە نێوچینە نیوەنجییەکانی دیمەشـقدا، زادەگای عـەفلـەقو بەیتار هەبو. بەهاتنی مەسـیحییەك (عـەفلـەق)، دوو موسـڵمانی سونە مەزهەب (بەیتارو حۆرانی)و لایەنگرە عەلەوییەکانی ئارسۆزی،

حیزب وەك جۆرە ڕێکخستنێکی نوێ بەشێوازێکی ڕوونو ئاشکرا خۆی بۆ جەماوەری سوریا نمایش دەکرد کە توانای تێپەراندنی لەمپەرە تەقلیدییەکانی هەیە.

تا ئەو دەمە تەنها حیزبی کۆمۆنیستی سوریا توانیبوی لە ئاستی یەکلاکەرەوەی گروپە مەزهەبیەکاندا، دەسەڵاتو کێشو سەنگی هەبێت، بەڵام ئەویش بەخاتری پەیوەندی لەگەڵ شۆڕشـی روسـیادا کـە هەرگیز نەیدەتوانی ئـەو پەیوەندییـە بپچڕێت، ببو بە حیزبێکی بیانی. بەعسییەکان بە خولْقاندنی جۆرێك ئاگایی لەسەر ناسنامەی عەرەبی کە رەگوریشەی لە ئەزمونی مێژووی عەرەبیدا هەبو، توانیان لە نێوان گروپە مەزهەبی ـ سیاسییەکانی سوریادا پردێك دروستبکەن. هیچ کەسێك بەعسیەکانی بەهەڕەشەیەك لەسـەر نەریت نەدەزانی، چونکە بەعسیەکان بەزمانی نەریتو چەمکەکانی دەدوان. مەسەلەی ئەسکەندەرونەش ئەو خاڵەی بەتەواوەتی خستۆتەڕوو. بەعس بەسود وەرگرتن لەو پێگەیەی، توانی بچێتە ناو ریزی کۆمەڵانی ئاوارەو ستەمدیدەو لە دژی کەمایەتی تورکـی ئەسـکەندەرونە ڕێبەرایەتی هەڵمەتێکی نەژادپەرسـتانە بکات. بەعس لەرێی بوونی ئەو نەریتگەراییەوە، نوێنەرایەتی شتێکی نوێی لە سیاسەتی عەرەبیدا دەکرد. ئەم تێکەڵە جیهانگیرییو تایفەگەرایە لە واقیعدا لەلای بەعسیەکان خەسڵەتێکی جیاکاری پانعەرەبیزم بو.

## پانعەرەبیزم لەلای بەعس:

پانعەرەبیـزم لەلای بەعـس لەچوارچێوەی فیکری ناسیونالیسـتی عەرەبیدا، وەك پەرچەکردارێـك بـۆ تەوژمەکانی دی بەدیارکەوت، هـەر چەندە رۆژئاواییەکان خودی بەعس بەنمونەی ناسـیونالیزم دەزانن. روناکبیرانی لە بابەت ساتع حوسەریو قوسـتەنتین زریـق دودڵ نەبـون لەوەی ئاماژە بەو بەربەسـتانە بکەن کـە دەبنە رێگر لەبـەردەم رابونی وشـیاری نەتەوەییدا، بەڵام نابێت ئەو دیـدو بۆچونەیان بە دیدێکی



تەکنێکی رووت یا ئابوریگەرانە سەبارەت بە تازەگەرێتی لە قەڵەم بدرێ، کە لە دوای جەنگدا برەوێکی گەورەی هەبو.

زریق لە کتێبێکیدا کە سـاڵی ١٩٣٩ بڵاوکرایەوەو تۆی گەشەسـەندنی لە ئایندەدا هەڵگرتبو "هۆکاری لاوازی لە کەسایەتی مرۆڤی عەرەبی هاوچەرخدا" پێناسەدەکات. لێـرەدا زریـق بەتەنها دەسـکەوتە تەکنۆلۆجیەکانی رۆژئاوا سـتایش نـاکات، بەڵکو "شێوازی بیرکردنەوەو جۆری شیکردنەوە... هەوڵدانی بەردەوام بەدوای حەقیقەتداو گومانکردن لە هەر شتێك کە لەگەڵ عەقڵدا نەیەتەوە" ستایش دەکات. "بە بۆچونی مـن لەنێـوان ئێمەی عەرەبو ئەو سـیفاتە زانسـتیە راسـتەقینەیەدا، هەنگاوی زۆرو مەودای دوور هەیە کە پێویستە پڕبکرێتەوە. بۆیە باشترە بە پەرۆشو رۆحێکی تیوینیوە ئەو زانسـتانەی رۆژئاوا تەبەنی بکەین"[16]. حوسـەری هەرگیز تا ئەو ئەندازەیە شوڵی لێهەڵنەماڵیوە، بەڵام هەمیشە نمونەی رۆژئاوای دەهێنایەوەو جەختی لەسەر "تیورەیەك " دەکردەوە کە پشـت بە گریمانەی روون دەبەسـتێت، تیورەیەك لەسـەر زانسـتی بابەتگەرایی بوونی نەتەوەیی رێنمایی دەکرد.

عـەفلـەق ساڵی ١٩٤٠ لە رەخنەکردنی ئەم نەوەیەی بیریارانی عەرەبدا دەنوسێت: "دەترسم ناسیونالیزممان دابەزێت بۆ مەعریفەیەکی هزریو لێکۆڵینەوەی سەرزارەکیو لەگەڵیدا هێزی دەماری پیاوەتیو گەرمی سۆز لەدەست بدەین. وەکئەوەی (بیریاران) ئیمانی ناسـیونالیزمییان جەخت لەسەر ئاستی دیسـپلینو هێزی پێناسەیان دەکاتەوە، ئەمـە لـە کاتێکدا ئیمان پێش مەعریفە دەکەوێتو گاڵتەی بە پێناسـە دێت. چونکە ئیمـان رێگـەی مەعریفە روناکدەکاتـەوە. ئەو ناسـیونالیزمەی ئێمـە بانگەوازی بۆ دەکەین، پێش هەمو شـتێك بریتیە لە خۆشەویسـتی... ئەو کەسـەی عاشـق بێت بەدوای بەڵگەو سۆنگەدا ناگەرێت. ئەگەر منەیشی بکات، پەیدای ناکات. ئەوەی نەتوانێت لەبەر هۆیەکی روونو ئاشـکرا خۆشەویسـتی بکات، عیشق لەناخیدا لاواز دەبێـتو دەمرێت. چۆن هێندێك گەنج دەتوانن پرسـیار لەو هۆیانە بکەن بۆ ئەوەی قەناعەتیان پێبهێنێت خۆشەویستیان بۆ نیشتمانی عەرەبی، دەبێ بەسەر خۆشەویستیان

بۆ نمونە بۆ روسیا زاڵبێت (ئاماژەیە بۆ کۆمۆنیستەکانی عەرەب) جێگەی هەر حەزو مەیلێك بە تایفە یا خێڵ یا ناوچە بگرێتەوە؟ چۆن دەتوانن پرسیار بکەن کە ئایا عەرەب ئەو خەسڵەتەی تیایە شایانی خۆشەویستی بێت؟. سەرەتا خۆشەویستی دێت، پاشان پێناسەی (نەتەوەی) بەدوادا دێت"[17].

عەفلەق لە ساڵی ١٩٤١دا دەڵێت: "ناسیونالیزم زانست نیە... یادەوەرییەکی هەنوکەییە". هەر هەوڵو کۆششێك بۆ نابوتکردنی ئەو هەستەو پاشان لە رێگەی پرۆسەیەکی عەقڵانی "نێو کتێبو بیروباوەرە ئەبستراکتەکانو وەك میلەتانی بیانی بونیات بنرێتەوە"، پێویستە رەتبکرێتەوە. بە بۆچونی ئەو مەزنترین مەترسی بریتیە لە رۆژئاواگەرایی بۆ بەدواداچونی ئەو تەوژمەی واقیع لەگەڵیدا هەستی پێناکرێ، پاشان شیتەڵکاریش چییەتی خۆی لەدەست دەدا. هەمو ئەوانەی ناسیونالیزمیان لە ئەوروپاوە وەرگرتوە دوچاری "فیکری ئەبستراکت" بون کە "شتەکان لە گۆشتو خوێنو رەنگو تامی خۆیان دادەماڵن"[18].

فیکری سەرەتایی هەڤپەڤین کە پیرۆزییەکانی وەك سەرەکیبونی زمانو مێژوو لەبەر ئەوە بەلاوەدەنێت کە شێوازی ئاراستەکردنی پرسیاری شیکاری خۆی لە خۆیدا بەدحاڵی بونێکی گەورەی لەدوو توێیدا هەڵگرتوە. گفتوگۆکردن بەهۆی ئەو پێداگرتنەی کە رەنگە کێشەیەك هەبێت، بێمانا دەبێت. عەفلەق پشت بە بینینێکی تازەی دەرونی گرنگ دەبەستێت: گریمانەیەکی پێشوەخت بنەمایەکی قوڵی سۆزداری ئەزمونی راستەقینەی ناسیونالیزمە. لە روانگەی ناسیونالیزمەوە ئەگەر ناسیونالیزم هەمان گشتگیریی خۆشەویستی هەبێت، ئەوا عەفلەق ئاراستەیەکی دەبێت: عەقڵانیەت تەنها کارێك دەکات کە سۆزداری لە ژیانو چالاکی بەتاڵ دەکاتەوەو دەشێت گریمانەی ئەوەش بکرێ، ئەگەر بیریاران لەبەر هەر هۆیەك بێت، خۆیان بەشیکردنەوەیەوە سەرقاڵ بکەن، تەنها لەبەر ئەوەیە لە پێگەی بەرگرییەوە ئەوجۆرە کارە دەکەن.

بڕوانە داهێنانی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە فیکری عەفلەقدا: ناسیونالیزم پێش



هەمو شتێك خۆشەویستییە. زۆر بەسادەیی ئەوە بابەتی ماناکانی مەسیحییەت نیە، وەك سەردەمی نوێ کە بەرەنگاری کۆندەبێتەوەو داوا لە یاسای یەهود دەکرێ لەگەڵ هەمو گلەییەکانیدا دەست لە رێسای وشك هەڵگرێتو رێگە بۆ "خۆشەویستی خوداوەند" کە خەسڵەتێکی سەرەکی ئاینی مەسیحییە، خۆشبکات.

سەبارەت بە عەفلەق هەڵوێست وەرگرتن لە ئیمانو قوڵی ئەزمونی دەرونیی تاك گرنگیەکی زۆریان هەبو. خۆگونجاندنو قبوڵکردن تەنها بەس نەبون تا عەرەب هەست بە بوونی تایبەتی خۆی بکات، تەنانەت گەر جەماوەری عەرەبی هێشتا نەیتوانیبێت بە ناسیونالیستی عەرەبی بگات، لەسەرووی ئەوەشەوە هەستکردن بە شوناس پێویستی بە ئەزمونی پێکهێنان یا گۆڕانکاری دەرونی هەیە: وشەی "خۆشەویستی" یەکەم هەڵبژاردەی نادروستی عەفلەق بو. وشەکان بەخێرایی گۆڕانیان بەسەردا دەهات، بەڵام بیرۆکە سەرەکییەکە هەرگیز گۆڕانی بەسەردا نەدەهات.

بۆ ئەوەی بە گوێرەی ئەزمونی ئایدیۆلۆجیا لە ناسیونالیزم تێبگەین، دەبینین زۆر بەروونی لە رێنماییەکانی مەسیحییەت جودایەو تەنها بۆ مەبەستی ئارگیومێنتی بەکاریدەهێنا. نازانرێ عەفلەق مەیل یا ئارەزوی بۆ چ ئاینێکی دیاریکراو هەبوە. بڕوابوونی بە نەتەوەگەرای عەرەبی، لە پێش هەر شتێکدا وەڵامێك بو ئەو پرسیارەی لە سیستمی نێونەتەوەییدا بەدیارکەوت، کە لەماوەی ساڵانی جەنگدا بەوپەڕی هێزەوە خۆی سەپاندبو. عەفلەق ئەو وەڵامەی لە پۆلینە مەزهەبییەکانەوە تەبەنی دەکرد، ئەوەش کارێك بو کە هیچ بیرمەندێکی عەرەبی عەلمانی نەیکردبو.

## بەیانی تەموزی ١٩٤٣:

بزوتنەوەی بەعسی عەرەبی لە ٢٤ / تەموز / ١٩٤٣دا یەکەم بەیانی ڕێکخراوی خۆی دەرکرد. عەفلەق ئەم بەڵگەنامەیەی بە بۆنەی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٤٣ی سوریاوە نوسی بو، ئەم هەڵبژاردنەش لە سایەی دەسەڵاتی ماندێتدا سازکرا، بۆ ئەوەی فەرنسا بتوانێت لەڕێگەی دامەزراندنی ئەنجومەنی نیشتمانی سوریاو حکومەتەوە دەربارەی سەربەخۆیی وڵات گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات. عەفلەقی تەمەن ٣٣ ساڵە پاڵێوراوی ئەرسۆزکسی دیمەشق بو. بەگوێرەی ئەو ڕیزبەندییەی لە بەیاننامەکەدا هاتوە، چاوێك بە پێنج ناونیشانیدا دەخشێنینەوە[19]:

١. "ئێمە لەدژی کۆمۆنیستی مادیگەرادا، نوێنەرایەتی ڕۆحی عەرەبی دەکەین".
عەفلەق گوزارەی "ڕۆحی عەرەبی" لە بری "خۆشەویستی" بەکاردەهێنا، کە پێویستە لە دەلالاتە نێگەتیڤەکانیەوە بێتەدی. خۆشەویستی فرە بۆ نیشتمان بەمانا مەسیحییەکەی زۆر بەرتەسكو دیاریکراوە، چونکە بۆ نمونە زۆر بەروونی باسی ڕقو نەفرەتی لە دوژمنانی نەتەوە نەکردوە. هێز یا ئەنگیزەی دەرونی زاتی لە پشت ئەو ڕۆحەوەیە کە پێشتر بەهۆی خۆشەویستییەوە گوێزراوەتەوەو ئێستاش بوە بە ئیمان، ئەو ئیمانە بێگەردەی کە بەتەواوەتی لە هەر سۆزێکی دیاریکراو داماڵراوە. عەفلەق ساڵی ١٩٤١ یا ساڵی ١٩٤٣ لە وتارێکیدا کە بۆ ئیمان تەرخانکرابو، جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە "ئیمان بنەمای هەتاهەتایی کارەکانمانە، ئەو بنەمایەی کە ناگۆڕێتو [20] ناشبێت هەرگیز بگۆڕێت". لەسەروی ئەوەشەوە "ڕاستی پڕتوانای سەردەمی ئێمە، بریتیە لەو ئیمانەی کە پێش مەعریفە دەکەوێت"[21]. دوژمنایەتی سەرسەختی نێوان بەعسو بەها ڕۆژئاواییەکان لە دوای بزوتنەوەی فەلسەفی ڕۆشنگەرییەوە لێرەوە دەست پێدەکات. عەفلەق زیاتر لەسەری دەڕواتو هەوڵدەدا بیسەلمێنێت کە: "ئەگەر ئیمپریالیزم خاکمان



پێبدات یا دەوڵەتێکی عەرەبیمان بداتی کە ئامانجەکانی بەعسی ـ یەکێتی، ئازادیو سۆسیالیزم ـ تێیدا بێتەدی، بەڵام پێمان بڵێن لەم دەوڵەتە ئایدیالەدا ئیمان لە ژیانی تاکەکاندا بزرە، پێیان دەڵێین پێمان باشە وەك میلەتێکی دابەشکراو، کۆڵۆنیالی، ستەمدیدەو چەوساوە بمێنینەوە تا بتوانین لە ڕێگەی ئێشوئازارو خەباتی نێوان ئێمەو چارەنوسمان، ئێمەو خودی خۆمان، مرۆڤایەتی ڕاستەقینەمان بدۆزینەوە"[22].

ئەو "ڕۆحە"ی لێرەدا وەك هێزێکی مێژوویی بابەتی لێی تێدەگەین، بونیادێکی هیگلی ئاڵۆزی هەیە. بەڵام هیگل ئەو هێزە لە دەوڵەتدا دەبینێتەوەو عەفلەقیش لە میلەت (ڕەنگە لەوەشدا شوێن پێی هێردەری هەڵگرتبێت). بۆیە ڕۆح سەربەخۆیە لە هەڵبەزو دابەز یا گۆڕانکارییە سیاسییەکان، ئەوەی کە هەرگیز لەلای هیگل قبوڵ نەدەکرا. ئەو ڕۆحە پەیامێکی هەتاهەتاییو دەوڵەتێکی هەمیشەیی نەتەوەیەکی نەمرە. عەفلەق دەنوسێت: "عەرەب بە هەڵگرتنی بیرۆکەی ناسیونالیستی نابنە ناسیونالیست، لەبەر ئەوەی ناسیونالیزم بیرۆکە نیە". ئەگەر ناسیونالیزم وەك بیرۆکە وێنابکەین "تایەفەیەکی دی بۆ تایەفەی عەرەب زیادبکەینو چینێکی دی بۆ خودی عەرەبی زیادبکەین کە پێشتر هەبوە... ئیدی عەرەب بۆ ئەوەی ببنە ناسیونالیزم پێویستیان بەوە نیە شتی تازە فێربن، بەڵکو پێویستیان بەوە هەیە ئەو شتانە لەبیربکەن کە فێری بون، تا دەرفەتیان بۆ بڕەخسێت پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ سروشتی بێگەردی ڕەسەنی خۆیان ببەستن"[23]. ڕۆحی عەرەبی بیرۆکەیەك نیە لە ڕۆژئاواوە هاوردە کرابێت، بەڵام ئەو جەوهەرە یا ڕۆحەیە کە وشك ناکاتو تاکەکانی نەتەوە لە ڕێگەی ئیمانەوە دەتوانن پێی بگەن.

٢. "ئێمە لەدژی پەرچەکرداری مردو یا پێشکەوتوخوازێکی دەستکردو ساختە، نوێنەرایەتی مێژووی هاوچەرخی عەرەبی دەکەین". حاڵەتی نێگەتیڤی نەبونی "ڕۆحی عەرەبی" یا بوونی بەشێوەیەکی لاوازو شێوێنراو، کارێکە یەکسەرو هەر ئێستا خۆی دەخاتەروو. عەفلەق ساڵی ١٩٤٣ دەنوسێت گومبونی ڕۆح دەبێتە مایەی کەسایەتیو بونێکی "شێواو"و "ئەبستراکت". بۆ نمونە بیریارانی عەرەب

له بزوتنەوەی کۆمۆنیستی‌و بەگشتی ئەو عەرەبانەی بە کولتوری رۆژئاوا تینوێتیان شکاوە، دەرئەنجامی ئەو "پێشکەوتوخوازە دەستکردو ساختەیەن"، ئەوانەی بە جەستە لە نێوماندا دەژین، بەڵام رۆحو فیکریان لەگەڵ ئەوروپییەکانە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مافە بەخۆیان دەدەن دیدوبۆچون لەمەڕ کێشەکانمان بخەنەڕوو و داوەری لەسەر رابردومان بکەن، یا تەنانەت کاریگەرییان لەسەر کارەکانمان هەبێت‌و کردەوەکانمان ئاراستە بکەن"[24].

"ئەو فەلسەفەو پەروەردەیەی لە رۆژئاواوە دێن، پێشئەوەی زەوی‌و ئاسمانی عەرەب داگیربکەن، عەقڵی داگیر دەکەنو دڵسۆزیی بە تاڵاندەبەن. ئێمە پێویستیمان بە بەرنامەیەکی پەروەردەی یەکگرتو هەیە کە رەگوریشەی لە خەسڵەتەکانی نەتەوەی عەرەبەوە سەرچاوەی گرتبێت، رۆحی رابردوی تێیدا بێت‌و پێداویستیەکانی ئایندەش لەبەرچاو بگرێت. پێویستە بۆ خاکو کێشەی عەرەب دڵسۆزو وەفادار بێت، بێئەوەی هیچ خاکێك یا کێشەیەکی دی لەم کارەدا بەشداریی پێبکات"[25].

ئەگەر "پێشکەوتوخوازی ساختە" حاڵەتێك بێت لە گومبونی رۆحی عەرەبییەوە سەرچاوە بگرێ، کەواتە "مێژووی عەرەبی هاوچەرخ" ئەو هێزەیە کە ژیان دەبەخشێتەوەو دەبێ تەنها لە رێگەی "رۆحی عەرەبییەوە" لەمێژوو تێبگەین کە لە رابردودا بەشێوەیەکی زۆر روونو ئاشکرا گوزارشتی لە خۆی کردوەو دەکرێ لە ئێستاشدا بەردەوام بێت.

رۆژئاوا نەك لەبەرخاتری سوپا داگیرکەرەکەی یا دابەشکردنە ناوچەییەکان، بەڵکو بەخاتری مەبەستە کولتورییەکانی وردو درشتی رەتدەکرێتەوە، چونکە جەخت لەسەر سەروەری سیاسی یا ئابوری ناکاتەوە، بەڵکو جەخت لەسەر کۆنترۆڵی کۆلتوری دەکاتەوە کە فەلسەفەو پەروەردەکەی هەڕەشە لە مرۆڤی عەرەب دەکات. پانعەرەبیزمی بەعسی دواکەوتنی جیهانی عەرەبی بەناوی جەخت کردن لەسەر زاتی نەتەوایەتی تا حاڵەتی پرەنسیپی باڵادەست بەرزدەکاتەوەو بەرجەستەی دەکات. هیچ بایەخ یا دەربەستبونێکی بە پێشکەوتنی ئەخلاقی شارستانی عەرەبییەوە نیە، هەر



چەندە بە بەراورد بۆ نمونە بە نەتەوەی هیندیی چلەکانی سەدەی بیستەمەوە تاڵییەکی کەمتری چەشتوە. دەمارگیری بۆ پەروەردەو مێژوو شۆڕدەبێتەوەو پێویستە دوور لە هەر پۆخڵییەکی دەرەکی بپارێزرێت. پێشکەوتنو ئەو فیکرانەی دەبێتە مایەی پێشکەوتن لە روانگەی بەعسەوە بۆ رەگەزی ئاسایی‌و گشتی مرۆڤ ناگەڕێتەوە. بەشێوەیەکی گشتی لێکچونێکی بەرچاو لەنێوان رەتکردنەوەی رۆژئاوا لەلایەن عەفلەق‌و نێوان خومەینی ئێران دەبینرێ. هەر چەندە فیکر یا جیهانبینی هەر دوو رژێمەکە جیاوازییان هەیە. خومەینیزم هەمو کاریگەرییەکی گەندەڵ لە دەرەوەی ئیسلام‌و هەمو شێوەکانی نەتەوەگەرا رەتدەکاتەوە، بەڵام عەفلەق لەسەر بنەمای یەکانەیی نەتەوەکان کاردەکات‌و میلەتە جیاوازەکانی سەر شانۆی نێونەتەوەیی بە جەنگەڵێك دەشوبهێنێت کە هیچ رێساو پرەنسیپێکی گشتی حوکمی ناکات[26].

٣. ئێمە نوێنەرایەتی هەمو ناسیونالیستییەك دەکەین کە گوزارشت لە کەسایەتی دەکات، نەك ناسیونالیزمی سەرزارەکی کە لەگەڵ یەکێتی یا کۆی رەفتاردا ناکۆك دەوەستێتەوە. "هەموو ناسیونالیزمێک" گوزارشتێکی تێرە بەرۆحی عەرەبی‌و لە رێگەی یەکێتی رەفتارەوە بەرجەستە دەبێت. "یەکێتی رەفتار" پێوەرێکە بۆ مەودای ئاستی ئیمان بە رۆحی عەرەبی‌و تاکە پێوەرە یا پرەنسیپێکی رێگە پێدراوە بۆ داوەری کردن لەسەر جۆری عەرەبگەرای تاك. رەفتاری تاکیش لە ناسیونالیزمەکەی دەچێت، ناکرێ لە رێگەی لێکهەڵوەشانەوەی کردەوە دامەزراوەییەکەی حوکمی بەسەردا بدرێ. رەفتارو کرداری هەر تاکێك بەدرێژایی زەمەنو لە روانگەی نیازەوە حوکمی لەسەر دەدرێ‌و بەپێی ئیمانیش گوزارشتی لێدەکرێ، ئیدی رەنگە هاندەری تاك بێت یا هاندەری نەبێت. تاریق عەزیز، ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لە وتەیەکیدا هەمان خاڵی بەیانکردوەو دەڵێت بۆچی هەمو ئەندامانی حیزب لەیەکناچن (بڕوانە بەشی دوەم ـ پێرستی ژمارە ١٤).

٤. "ئێمە نوێنەرایەتی پەیامی عروبە دەکەین لە دژی لادانی سیاسی". بەعسیەکان خۆیان بە "تێکۆشەر"و مژدەبەخشی شێوازێکی تازە لە تێکۆشان دەزانن. "ئەرکی

ئێمە کورتکردنەوەی ڕێگەیە، نەك هەموارکردنی.. چاندنی تۆی نەمرییە، نەك چنینەوەی بەروبوم، بۆیە زۆر بەخێرایی ناچینە ناو حکومەتەوە، بەڵکو ماوەیەکی زۆر لە بەرەی ئۆپۆزیسیۆندا دەمێنینەوە"[27]. سیاسەت دەبێتە چەمکێکی سوکئامێزی کەمبەها، کاتێك مانا ڕاستەقینەکەی لە دەرونی سیاسییەکاندا ڕۆنەچێت. شانۆی نەبەرد، مەیدانی گشتی ژیانە. بەعسیەکان لەو بەیانە سەرەتاییانەی سیاسەتی گشتی دیاریدەکرد، ڕوبەڕوی ئەو کەسانە نەدەبونەوە کە لە سەنگەردابون، وەکئەوەی سەرقاڵیی هەمویان ئاگادارییەك بێت بۆ هێزە تایبەتەکانی خۆیان.

عەفلەق لە بەیانە سەرەتاییەکانیدا دەڵێت: "ئەم چەرخە، چەرخی قارەمانێتییە"، "پێویستە قسە لەسەر پاکێتی بکەین، چونکە ئەو نەوەیەی کە بەوپەری ئەمانەتو نەرمیو پاکی مندالانەوە خۆی بۆ شەڕ ئامادەدەکاتو ئەوەی ئەوانی دی بە سیاسەت ناوی دەبەن، ئەو لێیتێناگات". قارەمانەکانی ئێمە خەڵکی دڵشاد یا ڕازی ناکەن، بەڵکو "خەڵکانی گەندەڵو هەڵەکار، جاڕس دەکەن"[28].

دیدوبۆچونی ئەڵتەرناتیڤی بەعس، هەمیشە لە ئۆقیانوسی داوەشانو گەندەڵیدا دادەروخێت. تەنانەت فروفێڵی سیاسییە نەیارە (درەوشاوەو ژیرەکانیش)، نابێتە مایەی سوککردن یا سڕکردنی شوێنەواری ئەو نەخۆشیانەی کە چەشنی خۆرکە ناخی نەتەوە دەخواتو بە ئێشوئازارەکەی جەستەی تێکدەشکێنێ"[29]. عەفلەق شەیدای خوازەی (مجاز ـ metaphor) جەستەیی بو. نەخۆشی لەلای عەفلەق حاڵەتێك یا بارودۆخێك بو کە لە نێو نەتەوەی عەرەبدا ڕەگیداکوتابو، درکی بەوەش کردبو کە "ئۆرگانێکی زیندوە"و "ڕۆحی" لەدەستداوە. "لادانی سیاسی" هەروەکو ئەوەی عەرەب پیادەی دەکرد، بەشداری لەو بارودۆخە نالەبارە دەکرد. تیورەی کۆمەڵگەیەکی گەندەڵی دارزیو کە بەعسی بۆ دەرکردنی ڕۆحە شەڕەنگیزەکان هێنایە مەیدان، کارێکی بەڵگەنەویستو هۆیەکی سەرەکی شۆڕشی بەعس بو[30].

٥. "ئێمە نوێنەرایەتی نەوەی نوێی عەرەب دەکەین". "نەوەی نوێ" هەڵگری "پەیامی عروبە"و بەرجەستەی ڕۆحی زیندویی عەرەبی دەکات، چونکە ڕەفتاریی



ئاراستەی بیروباوەڕێکی دروستی کۆمەڵگەیەکی ئایدیاڵ دەکات. نەوەی نوێ "لەنێو جۆرێکی تازەی گەنجان"دا پێدەگات کە بەزەروورەت پێویستە "چەمکێکی دیاریکراو لە پەروەردەو فیکر لەناخیاندا هەبێت". ڕەنگە ڕۆژگارێك بێت ئەو گەنجانە ببنە دوژمنی سەرسەختی ئەم نەوە نوێیە.

"کۆمەڵگەی واقیعی بەمەترسی گەورە هەڕەشە لە گەنجان دەکات، چونکە لەلایەکەوە وەك پاڵێوراوی ئەرکە قارەمانییەکان دەیانکات بە پێشەنگ، لەلایەکی دی، لانیکەمی کارو دەستکەوتەکانیان لێقبوڵ دەکات. بۆیە هیچ ئەڵتەرناتیڤێك نیە جگە لەوەی لەخۆبوردەو باڵاکردوبینو لە پێوەرە واقعییەکان بەرزتربینو لە ئەرکە مێژووییەکانەوە پێوەرە نەمرو هەتاهەتاییەکان هەڵگۆزین. سەرمەدییەتو نەمری تێپەربون نیە لە ئێستاوە بۆ ئاینده، بەڵکو چاندنی ئایندەیە لە ئێستادا"[31].

"هەتاهەتایی" گوزارشتێکی سەرەکی دییە کە بە"مێژووی هاوچەرخ"ەوە گرێدراوە. لە نوسینەکانی عەفلەقدا فیکری بوونی هەتاهەتایی هەیە، نەك زەمەنی هەتاهەتایی. شتێك بوونی هەیەو دەشبێ هەبێت. بەڵام عەفلەق شەیدای ئەوە بو ئەم حاڵەتە نێگەتیڤە بۆ حاڵەتێکی چالاك بگۆڕێت، ئەویش لە ڕێگەی ئاوەژوکردنەوەی ماناکانەوە: ئەو شتەی دەبێت، هەمیشە "زیندوە". بۆیە تەنها کاتێك میلەت دەژی کە نەوەی نوێ دەرکەوێت. بەپێی هەمو پۆلێنەکانی عەفلەقو پەیوەندیی مانایەك لەگەڵ مانایەکی دی، تاکە ڕێگەیە بۆ ئەوەی یەکانگیری بهێنیتەدی یا میلەتی پێ پێناسەبکرێ:

"میلەت کۆکردنەوەی ژمارە نیە، بەڵکو فیکرێکە (ڕۆح بخوێنەرەوە) بەرجەستەکاری گشت یا بەشێکێتی. میلەت بە کەمبونەوەی تاکەکانی نابوت نابێت، بەڵکو بە دیاریکردنی سنوری "فیکر" لەنێو ئەندامەکانیدا نابوتدەبێت. کۆی ژمارە بەرووکەشو لەرووی زاتییەوە شتێکی پیرۆز نییە، بەڵام تەنها لەو کاتەی بەرجەستەی فیکری "میلەت" دەکات یا بتوانێت لە ئایندەدا بەرجەستەی بکات، پیرۆز دەبێت. ڕێبەر لە کاتی سنوردار بونی "فیکر"و دابەزینی بۆ نزمترین ئاستی پەنا بۆ زۆرینەو ژمارە نابات،

بەڵکو روو لەبەرەی ئۆپۆزیسۆنو نەیاران دەکات، ئەو کەسێك نیە ژمارە بەفیکر بگۆڕێت، بەڵکو ژمارە بۆ فیکر وەردەگێڕێت. ئەو کۆمکار نیە، بەڵکو یەکێتی هێنەرە. بەوشەیەکی دی، ئەو سەروەری "فیکر"ێکی تاکە کە هەمو ئەو کەسانەی دژایەتی دەکەن دەریاندەکات یا کارکەناریان دەکات"[32].

ئەو وشە ساردو سڕانە بەبێ پەردە لەسەر خۆیان دەدوێن. خودی "نەوەی نوێ" میلەتە، هەلومەرجە باڵاکردۆکانی لە بابەت "پەیامی عروبە"، "ناسیونالیزم"، "مێژوویی هاوچەرخی عەرەبی"، "رۆحی عەرەبی"و "ئیمانی" بێگەرد، بەزمانی ژمارەی ماتماتیکی بەیان دەکرێن. میلەت دەرئەنجام یا کۆی ئەو کەسانەیە کە ئیمانێکی دروستیان هەیە. بابەتیبونی نەتەوە بەتەواوەتی، ئەگەر لە "هەستی" تاکەکەسێکیش بێت - رێبەر - دروست دەبێت.

چەمکی نەتەوە وەك چین یا پۆلینکردنی کۆمەڵایەتی بۆ نمونە کە لە تێگەیشتنی ساتع حوسەری بۆ ناسیونالیزمی عەرەبی دەردەکەوێت، بەتەواوەتی لەگەڵ تێگەیشتنی عەفلەق جیاواز بو. لەڕووی تیورییەوە پێویست بو لەسەر ساتع حوسەری لەوە تێبگات یا فێربێت کە چۆن لەگەڵ بیرۆکەی رقلێبونەوە لە خودی عەرەبی یا ئەو عەرەبەی رقی لە خۆیەتی (عەرەبێکی وەك جەواهیری هەرگیز بڕوای بە نەتەوەی عەرەب نەبو) هەڵدەکات، بەڵام عەفلەق ئەو بیرۆکەیەی روونکردۆتەوە کاتێك "خۆشەویستی"، "رۆح" یا فیکر نەبێت، خودی کۆمەڵگەش دروست نابێت. بوونی سیستمی کۆمەڵایەتی بەتەواوەتی لە رەهاگەرێتی سیستمە نەریتیو ئەخلاقییەکەی جیاوازە. حوسەری قەناعەتی بە پەروەردەو فێرکردن هەبو، دواتریش بە سوپا وەك پێکهاتەی ئەو هێزە مەزهەبییە ئەخلاقییەی کە بانگەشەی بۆ دەکرد. بەعس تینوێتی بەو هێزانە نەدەشکا، بۆیە ئیمانی بە مەرجی پێشوەخت دەزانی، نەك وەك ئامانج. ئەوەش مەبدەئیترینو جیاکارترین پەروەردەی بەعس بو.

لە کۆتایی سییەکاندا عەفلەق لە عێراقدا مژدەبەخشی دی هەبو. ئەو سامی شەوکەتی ناسی کە یەکێك بو لە شوێنکەوتوانی حوسەری (دواتر نکۆڵی لەو



ناسینەکرد)و بەشێوەیەکی تیوری میلەتی وەك عەفلەق پێناسە دەکرد (بڕوانە بەشی پێنجەم)، بەڵام جەختی لەسەر کارێکی دی دەکردەوەو دەیویست خەڵکی لە کۆمەڵگەی عەرەبی دووربخاتەوە:

"میلەتی ئێمەش، وەك هەر میلەتێکی دی، دوژمنی خۆی هەیە. دوژمنی میلەت چەشنی دوژمنی خێزان، دوو جۆری هەیە: ناوخۆییو دەرەکی. زۆرجار دوژمنی ناوخۆیی لە دوژمنی دەرەکی روخێنەرترە. هیچ میلەتێك رێنیسانسی راستەقینە بەخۆیەوە نابینێ، گەر ئەو دوژمنە ناوخۆیە لە رەگوریشەوە لە دامودەزگاکانی هەڵنەکێشێت. دوژمنی ناوخۆیی کێیە؟ دوژمنی ناوخۆ کۆمەڵێك خەڵکن لە خوێندنگەو کۆمەڵگە بەهایان وەرگرتوە، ئەوانەی خۆیان لە بەرامبەر دەسەڵاتو شکۆمەندی دەوڵەت بە غەوارە دەزانو واتەماشای دەوڵەت دەکەن کە زیان بە بەرژەوەندییەکانیان دەگەیەنێتو پێگەیان لاواز دەکات. بەڵام ئەوانە هێندە هێزیان نیە تا بەرامبەر دەوڵەت بوەستنو بەشێوەیەکی روونو ئاشکرا دژایەتی خۆیان دەربڕن، بۆیە بەهەمو هێزو توانای خۆیانەوە کاری نهێنی دەکەنو لە تاریکیدا دەست بۆ دوژمنی دەرەکی درێژ دەکەنو سیخورییان بۆ دەکەنو دڵو دەرونیان لێوانلێوە لە ئیرەییو توڕەبونو تۆڵەسەندنەوە. ئیدی لێرەوە کاریگەری یا کارلێکی نێوان ئەو دوو جۆرە دوژمنە دەردەکەوێت"[33].

جەختکردنی سامی شەوکەت لەسەر لایەنە پراکتیکیو رۆشنەکانی پێناسەی میلەت بو، ئەو شتەی کە لە پێناسەی عەفلەقدا بزر بو، چونکە عەفلەق جەخت لەسەر فەزیلەتی لەرادە بەدەری رۆحی پڕ لە هەڵبەزودابەزی عەرەبی دەکاتەوە. شەوکەتیش ناسیونالیزم پێش هەمو شتێکی دی بە خۆشەویستی دەزانێت. لە سیاسەتەدا تاك ناتوانێت بەو شێوە تایبەتە گوزارشت لە خۆشەویستی خۆی بکات. لەلایەکی دی، هەڵگۆزین یا پاساوە مەبدەئییەکانی عەفلەق، بنەما خاوەکانی شەوکەتی بۆ مەبدەئی کامڵ گۆڕی کە شایانی رێزو ستایشکردن بو، ئەمەش مەزنترین میراتی عەفلەق بو لە سیاسەتی عەرەبیدا.

حیزبی بەعس بەڕەسمی ئەم چەمکەی بە ناسنامەی عەرەبی ناسیو بڕیاری لەسەردا. ئەو دەستورەی حیزبی بەعس ساڵی ١٩٤٧ لە کۆنگرەی دامەزراندنیدا تەبەنی کرد، جەخت لەسەر ئەو ڕەنسیپە سەرەکییە دەکاتەوە کە پێیوایە "هەمو جیاوازییەکانی نێوان تاکەکانی میلەت، جیاوازی دروستکراوو ساختەنو بە رابونی رۆح یا خودی عەرەبی لەنێو دەچن". عەرەب ئەو کەسەیە "ئیمانی بەوەیە کە ئینتمای بە میلەتی عەرەبەوە هەیە" (مادەی ١٠). "هەر کەسێك بانگەشە یا پەیوەندی بە کۆمەڵەیەکی ئەنتی عەرەبەوە بکات، ئەوانەی بەمەبەستی کۆلۆنیالی کۆچیان بۆ نیشتمانی عەرەبی کردوە لە میلەتی عەرەب نین" (مادەی ١١). مافی سیاسی تەنها بۆ ئەو کەسانەیە کە "دڵسۆزی نیشتمانی عەرەبینو خۆیان لە تێکەڵبونی هەر کۆمەڵەیەکی جوداخوزای بەدوور دەگرن" (مادەی ٢٠). سەرئەنجام دەوڵەت بەرپرسیارە لە هەر کارێکی فیکریو هەمو ئازادییەکان (مادەی ٤١). هەمو چالاکیو شکڵێکی ڕێکخراوەیی دەبێ "لەناو سنوری فیکریی نەتەوەی عەرەبی"دا قەتیس بکرێ. بۆیە ئەم بەڵگەنامەیە بەشێوەیەکی روونو ئاشکرا، جەخت لەسەر فیکری سەرەکی عەفلەق دەکاتەوە، بەوەی ناسیونالیزم پێش هەمو شتێك بریتیە لە ئیمان[34].

## ناسنامەی نەتەوەییو ئیسلام:

"جیاوازی مەزهەبی بەشێکی گرنگی لە عەرەب لە رۆحو نەریتی تایبەت بە وڵاتەکەیان تەریك کرد... ئارەزومەندین رابونی تەواوی عەرەبە ناسیونالیستە مەسیحییەکان ئەوەندە بێت کە بتوانن لە ئیسلامدا پەروەردەی ناسیونالیزمی بۆ خودی خۆیان بدۆزنەوەو پێویستە لە زەینیاندا بچەسپێتو دڵو دەرونیانی پێ تێر بکەن، چونکە ئیسلام بەشێکە لە سروشتو مێژوویانو مەیدانێکیش بو کە عەرەب توانای بیرکردنەوەو هێزی مەعنەویو هەژمونو دەسەڵاتی رۆحیان تێیدا سەلماند"[35].



لەو بانگەشە هەڵبژاردنییە ناسیونالیستەی عەفلەق بەناوی ئیسلامو لەدژی جیاوازی مەزهەبی ئاراستەی کۆمەڵگەی مەسیحییەکانی دەکرد، هەوڵی نەدەدا رووپامایانە بەعس گەشە پێبداتو هەوڵیدەدا بنەمایەکی پوختی بێگەرد بۆ بەعس پێکبهێنێت، پێشئەوەی بەعس ببێت بە حیزبێکی جەماوەری بەماوەیەکی زۆر شانبەشانی نەتەوەگەرای عەرەبی حیزب لە گەشەدا بو. زۆرێك لە بڕگەکانی بەیاننامەی ١٩٤٣ (لەیادی پێغەمبەری عەرەبدا) تێڕوانینی بەعسی بەرامبەر بە ئیسلام دیاریدەکرد:

"بیرۆکەی ئەبستراکتی ناسیونالیزمی رۆژئاوا لەو رووەوە لۆجیکیە کە ئاین لە ناسیونالیزم جیادەکاتەوە. ئاین یا بیروباوەڕ لە رێگەی خۆرهەڵاتی ناوڕاستەوە گەیشتە ئەوروپا، بۆیە بە سروشتو مێژووی ئەوروپا نامۆ دەژمێردرێت... بەڵام ئیسلام لەلای عەرەب تەنها ئیمان یا بڕوابون بەرۆژی زیندوبونەوەو ئەخلاقێکی ئایدیالی نیە، بەڵکو گوزارشتێکی باڵایە بۆ هەستی جیهانگەراییو تێڕوانینیان بۆ ژیان. بەهێزترین گوزارشت لە کامڵترین یەکێتیی کەسایەتی عەرەب دەکات، گوزارشتێکە هەستو بیرکردنەوە، سەرنجدانو کاری جەستەیی، خودو چارەنوس ئاوێتەی یەکتری دەکات. ئیسلام درەخشانترین وێنەی زمانو ئەدەبی عەرەبە، گەورەترین بەشی مێژوویی نەتەوایەتیانە... پەیوەندی نێوان عروبەو ئیسلام لە پەیوەندی هیچ بیروباوەڕێکی دی لەگەڵ هیچ رەگەزێکی دی ناچێت"[36].

عروبە جەستەیەکەو ئیسلام رۆحی پێکدەهێنێت. عەفلەق هەمیشە سەرنجی بۆ ئاوارتەییو تاکگەرایی عەرەب رادەکێشاو جەختی لەسەر دەکردەوە. ئەو تاکگەرایەش لەو حەقیقەتەوە سەرچاوە دەگرێ کە "رابونی نەتەوایەتیان پەیوەندی بە پەیامی بیروباوەڕ یا ئاینەوە هەیە". عەرەب هەرگیز بەمەبەستی یا ئامانجی هەرێمایەتی یا رەگەزپەرستی یا ئابوری خاکیان داگیر یا فەتح نەکردوە، بەڵکو بەخاتری دەربەستبونی ئاینی ئەو کارەیان ئەنجامداوە. ئیسلام بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێرانەی عەرەبی بو کە مانای نوێبونەوەی عروبەی لە خۆگرتبو. رۆژئاواش لەوە هەراسان بو کە دەیزانی "هێزی ئیسلام" لە فۆڕمێکی تازەدا خۆی دەنوێنێت، ئەویش ناسیونالیزمی عەرەبییە.

عــەفلـــەق رەخنەی لەو بیرۆکەیە دەگرت کە وەك ئامانج یا ســتایش‌و پەرســتن لــە محەمــەد بڕوانرێت، بەڵکو دەیوت پێویســتە هەمو عەرەبێك ببێــت بە محەممەدو هەوڵبدات مانای ژیانی زیندوبکاتەوە. ئەو دەیویســت هەمو عەرەبێك ببێتە محەممەد، چونکە "ئەو ئینتمای بۆ میلەتێك هەیە کە محەممەدی لە ئامێز گرتوە، یا لەبەر ئەوەی تاکــی عەرەبی ئەندامی کۆمەڵگەیەکە کە محەممەد گشــت هەوڵەکانی بۆ ئەفراندنی تەرخانکردبو، "محەممەد بۆ هەمو عەرەبێك بو، ئێستاش پێویستە هەمو عەرەبێك ببێت بە محەممەد". محەممەد ئەو ســەرکردە یا ئەو رێبەرە بو کە لە رێگەی بەرگریکردنێکی سەرسەختانەی لە دژی عەرەب بەدیارکەوت، نەك لە رێگەی ململانێی لەگەڵ هێزی دی لــە دەرەوەی جیهانــی عەرەبی. عەرەب لەلایــەن خوداوەندەوە بۆ گەیاندنی ئەو پەیامــە هەڵبژێردرا کە محەمــەد ئاڵا هەڵگریبو، تەنانەت ئــەو هەڵانەش کە محەممەد بــۆ لە ریشــە دەرهێنانــی هاتبو، هەڵەی عــەرەب بونو رێگەی نەمانیــان گرتبوەبەر. موســڵمانەکانی ئەو رۆژگارە جگە لە عەرەب شــتێکی دی نەبون، بەڵام نەوەی نوێی عەرەب، نەوەیەکە بەتەواوەتی کامڵ‌و گەشەکردوە"[37].

هەر عەرەبێکی موسڵمان لە کەسایەتی محەممەددا، ئەندامی گروپی رەگەزەکەی خۆی دەبینێت‌و پەیامبەرو شەرعدانەری ئاینی ئەو لە رۆڵی رێبەری سیاسیدا دیاردەکەوێت. ویستی خوداوەندو قەیسەر لە کەسایەتی راستەقینەی ئەودا دەردەکەوێت‌و هەر خۆیشی شەرعدانەرو سەرۆکی یەکەم دەوڵەتی ئیسلامی بو. لە هەمو حاڵەتێکدا مەسیح لەسەر خاچ گیانی سپاردو هێزی سیاسی لە جیهانی مەسیحییەتدا لە ئەخلاقی ئاینی جیابووەوە. بەڵام ئەو گرنگیە سەرەکییەی عەرەبە کۆنەکان لە یادەوەریدا بەجێیانهێشتوە، ناتوانرێ هەروا بەئاسانی لە سیاسەت جیابکرێتەوە.

شارســتانی ئیســلامی کۆمەڵە مرۆییە ناچوونیەکەکانی بەجۆرێك پێکەوە گرێدا کە هەرگیز ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی یا مەســیحییەتی ســەدەکانی ناوەراست نەیانتوانیوە ئەو کارە بکات. هەر چەندە گروپە نەتەوایەتییەکان دەســەڵاتی سیاسییان لە بوارگەلێکی ئیسلامیدا پیادەکرد (هەڵبەتە نەك بەشێوەی رۆمان کە بەتەواوەتی دەسەڵاتیان کۆنترۆڵ



کردبو)، بەڵام لە ســاتەوەختی شارســتانی جیــاوازدا، بەتایبەتی لە ئاســتی کولتوری باڵادا ئیســلام لە بەرخوردی چەند کولتورو شارستانییەکدا سەریهەڵدا کە تا ئەودەمە کاروباری مرۆڤایەتی پێی ئاشــنا نەبو. داهێنانی پانعەرەبیزم هەروەکو لەســاڵانی نێوان هەر دوو جەنگی جیهانیدا بەدیارکەوت، لەرێگەی لێکۆڵینەوەی دوبارە خوڵقاندنەوەی خودێکی کامڵ لەو فرەفۆڕمو رەگەزەی جیهانێکەوە بو کە یەکەمجار بەهۆی بەئیسلامەوە بەدیهات، بەڵام لەسەر بنەمای سۆزی رەگەزی پڕجۆش‌و خرۆش کە بەسروشتی نرخو بایەخی خۆی لەدەســتدا. بەپێچەوانەی ئەوروپای "رۆژهەڵات"ی سەدەی نۆزدەهەم کــە بەردەوام لــە رێگەی ئەو نمونانەی لــە ئەوروپای رۆژئــاواوە وەریگرتبو، بەدوای پێناســەکردن یا خود ناســیندا دەگەڕا، نمونە یا چوارچێوەی سەرەکی عروبە تەنها لە رابردوی تایبەتی خۆیەوە بەرجەستە دەبێت.

خود وشیاربی یا وشیاری بە ناسنامەی عەرەبی کە فۆڕمێکی ئایدیۆلۆجی یا تیوری بە پانعەرەبیزم بەخشــی، بەشــێوەیەکی گشــتی لەو واقیعەوە ســەرچاوەی گرتبو کە خەڵکــی عەرەبی زمــان لە رۆژگارێکدا لــەڕووی مێژووییەوە یەکگرتوبــون، ئەوانەی هێشــتا ئەو یەکگرتنە لە یادەوەرییاندا ماوەتەوە، ئەمە سەرباری تێپەربونی هەزار ساڵ، یا نزیکەی هەزار ساڵ لە مێژوو، کەچی ناتوانن بانگەوازی بۆ بکەن، چونکە زانیاریان لەسەر یەکگرتنی ئەو سەردەمەدا نیە.

ئــەو ماوەیەی عەرەب تێیدا گەشــەی کــرد، ماوەیەکی زۆر کــورت بو. چونکە باڵادەستی رەگەزی عەرەب لە سایەی حوکمی عەباسییەکاندا کۆتایی پێهات‌و ئیدی کولتوری عەرەبی گۆڕانی بەسەردا هات‌و زۆر بەخێرایی بۆ شارستانییەتێکی بەرفراوانی ئیسلام گۆڕا کە خەڵکی هیلالی خەسیبی لە فارس‌و تورك‌و بەربەرو ئیسپانی‌و یەهودو مەســیحی لەخۆدەگرت‌و هەر یەکەیان پشکی خۆی لەو کولتورەدا هەبو، سەرئەنجام ئەو بازنەیەش پسا کە عەرەب‌و ئیسلامی پێکەوە گرێدەدا، بەڵام پرۆسەی کێشکردن یــا لەخۆگرتنی ئەو عەرەبانەی لە نیمچە دورگــەی عەرەبییەوە هاتبون، لەگەڵ گروپە نەژادییەکانــی دی لــە نمونــەی یا دینەمــۆی کولتوری تــازەدا لە خەیاڵــی عەرەبدا

بەشـێوەیەك وێنادەكرێ كە بیانییەكان بەسـەر عەرەبدا باڵادەست بون. ئیسلام وەك مەزنتریـن داهێنانی عروبەیەكی نەمر بەدیاركـەوت، بەڵام لە یەك دیدگادا بەتەواوەتی پێچەوانەكەی راسـت بو: ناوچەكانی هیلالی خەسـیبو باكوری ئەفریقیای عەرەبی زمان، خۆیان لە داهێنانی شارسـتانی ئیسلامیبون. وەكئەوەی بەنوكە قەڵەمێك عروبە نەریتێكی مێژوویی رەسـەنی بەدەسـتهێنا بێت كە لە سـاڵانی دواتردا بوە سەرچاوەی بەشێكی گەورەی هێزە پڕكێشەكەی.

ناسیونالیستە عەرەبەكان هەمیشە بەشێوازێك لە شێوازەكان دانیان بە پەیوەندی نێوان خۆیانو ئیسلامدا ناوە. زوریق ـ یش وەك عـەفلـەق، یەكێك بو لە ناسیونالیستە عەرەبە عەلمانییەكانـی نەوەی خۆی كە لە "یادی پەیامبـەری عەرەبیدا" وتەی هەبو، بەڵام ئیمانو تێروانینی عـەفلـەقی نەبو[38]. رەنگە ئەوجۆرە وتانە سەبارەت بە ناسیونالیستە عەرەبە مەسیحییەكان رێورەسم یا سروتێكی پێویست بێت. لە راڤەكردنەكانی حوسەری دا دەربـارەی بابەتـی ئیسـلامو عروبە، مـرۆڤ دەروازەیەكی پراگماتیكـیو تازەترو نەرمتـری تیا بەدیدەكات"[39]. هەر دووكیان كاتێك پردی پەیوەندیان دروسـتدەكردو باڵەكانی خۆیانیان تیا دەپاراست، ئاگاداری ئەوەشبون كە دەبێ عروبە دان بە ئاین یا فەزیلەتی ئیسلامدا بنێت، ئەو كارەی كە هیچ ناسیونالیستێكی دی بەرامبەر ئاینەكەی نەیكردوە. بەڵام عـەفلـەق سـوربو لەسـەر پێكهێنان یا بونیاتنانی شێوازێكی تازە لە پانعەرەبیزم كە لە تێروانینی ناوخۆیدا پەڕگیرو پشـت بە خوێندنەوەیەكی سـۆفیگەرای فێڵبازانـەی ئەزمونی ئیسـلام ببەسـتێت. عـەفلـەق تاكەكەس بـو لەنێو بیرمەندانو تیوریستەكانی نەتەوەگەرای عەرەب لە نەوەی خۆی، لە تیورە یا بیرۆكەی كۆمەڵگەی نوێ تێگەیشت كە بوونی بەتەنها لە باوباپیران، زمانو پێگەیەوە نەبو، بەڵكو ئەزمونی ئیسلام كە پشتی بەئیمان دەبەست، پێشەكییەكی سەرەكی پێكدەهێنا.

حەنـا بەتاتو پێیوایە دەربارەی خود یا شوناسـی نەتەوەییو ئاینی، ناكۆكی لەنێوان فیكـرو تیورەكانـی عـەفلـەقدا هەیـە. هێندێك كـەرەت وادەردەكەوێت كە عروبە پێش ئیسـلام دەكەوێتو هێنـدێ كەرەتی دی پێچەوانەكـەی دەردەكەوێت، بەڵام



ئەو تێبینییەی لەلای بەتاتو گرنگ بێت "سـوكایەتی عـەفلـەق نیە بەلۆجیك، بەڵكو ئامانجی پراكتیكی پشت زمانە رۆمانسییەكەی بو: جڵەوكردنی هەستو بەكارهێنانی سـۆزو عاتیفەی ئیسلام بەمەبەسـتی خزمەتكردنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی عەرەب، یا راستترە بڵێین بۆ خزمەتی حیزبی بەعس بو"[40].

كاتێـك لەگـەڵ بەتاتو هاوڕا دەبین لەسـەر ئـەوەی كە چ گرنگە، مـن بابەتێك وەردەگرم كە لەم دیالۆگو مشـتومڕەدا ناوەرۆكێكـی هەبێت، ئەگەر ناكۆكییەكیش هەبێت، ئەوا لە شـێوازی ئایدیۆلۆجی بیركردنەوە یا هەڵگۆزینی عـەفلـەقدایە. لێرەدا پێویسـتە سـەرلەبەری بابەتەكە لەسـەر چەمكەكانی خودی عـەفلـەق بوروژێنرێ یا گەڵاڵـە بكرێ، بەتایبەتی ئەوەی كە دەڵێت ئاین یـا بیروباوەر هەڵكەوتوییو بلیمەتی عەرەب بەرجەستە دەكاتو "لەگەڵ سروشتی ئەو بلیمەتییە تەباو كۆك دەكەوێتەوە". پانعەرەبیـزم لەگەڵ ئاینـدا بەریەكناكەون، یا لەهیچ ئانوسـاتێكدا ناتوانرێ لەیەكتری جیابكرێنـەوە، چونكە لە بنەرەتـدا هەر دووكیان "لەدڵەوە هەڵدەقوڵێنو بەخواسـتی خوداوەند بڵاودەبنەوە"[41].

ئاڵۆزیـی دەركەوتنی هەر یەك لە ئاینو پانعەرەبیزم، هیچ ئەفزەلییەتێك لە پەیوەندی نێـوان شـتە نادیـارەكان لەخۆناگرێت، چونكـە ناتوانرێ یەكێكیان پێشـئەوی دی نەناسراوبێت. رەنگە عـەفلـەق لە وەڵامدانەوەی بەتاتودا هەمان شێوازی بەكارهێنابێت كە لەگەڵ حوسەریو زریق ـ ی نەوەی خۆیدا گرتبویەبەر: ناسیونالیزم لە پێش هەمو شـتێكدا ئیمانە، ئەمەش تەنها شـتێكە كە گرنگی هەبێتو بێهودە بەدوای شتی دی نەگەڕێیـت. عـەفلـەق بەو كارەی بەتەواوەتی لەگەڵ خۆیدا لۆجیكیو بەدیسـپلین دەردەكەوێـتو زۆربـەی ئـەو عەرەبانەی سـۆزیان بەلای ئەو شـێوازەدا هەبو، لەوە تێدەگەیشـتن كە عـەفلـەق بەدڵسۆزییەوە قسەیان بۆ دەكات، بەڵام سەریان لەقسە سەیرو نامۆكانی بەتاتو دەرنەدەكردو لێی تێنەدەگەیشتن.

## یەکانگیری بەعس:

عەفلەق حەزی بەقسەی زلی بێناوەرۆکو پەخشاننامە دەکرد. بەوتەی فواد عەجمی: "بە خوێندنەوەی نوسینەکانی عەفلەق کە دوای ساڵی ١٩٦٧ەوە بەشداری لە مشتومڕ دەکرد... مرۆڤ لە پۆچیو نایەکانگیری سیاسەتی بەعس تێدەگات. لە واقیعدا بە خوێندنەوەی نزیکەی ٣٠٠ لاپەرەی تاکە دەقێك هیچ دیدوبۆچونێکی روونت چنگ ناکەوێت، خوێنەر تێناگات چ شتێکی دروستو چ هەڵە بوەو پێویستە چ کارێك بکرێ، لەو وشە زەردو سورە تەنها ئەوە روونەبێتەوە کە عەفلەق داوا لە حیزب دەکات واز لەدەسەڵات بهێنێو بگەڕێتەوە بۆ "جەوهەرە پاكو بێگەردەکەی"[42].

هەروەکو دەبینین عەفلەق هەرگیز بەشێوەیەکی بابەتیانە گرنگی بەشیکردنەوەی رابردو نەداوە، یا بەشێوەیەکی واقعیانە لەئایندە وردنەبۆتەوە. ئەو بەدەرخستنی دیدێکی جیهانی واتەماشای خۆی دەکرد کە ئەو رۆڵە شەخسییەی پێیهەڵدەستێت، رۆڵێکی ئاگادارییە یا هانی کارکردن دەدا. لەلای عەفلەق واقعییەت بۆ دونیای ناوخۆی حیزب کورتدەبێتەوە. لەمەشدا عەفلەق لۆجیکیو بەدیسپلین بو، وشە پەخشانئامێزەکانیشی بۆ ئەم مەبەستە گونجاوبون. رەنگە بیرکردنەوەی بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەگەڵ واقعییەتی سیاسییدا تەباو گونجاو بێت یا نەبێت، هەروەکو ئنجیل لەسەردەمی خۆیدا ئەوەی کرد، یا بەشێوەیەکی گونجاوتر، فرەیی گروپو بزوتنەوە مەسیحییەکان کە لە سەدەکانی ناوەراستدا لە ئەوروپای رۆژئاوا گەشەیانکرد، پشتیان بە بیروباوەری زیندوبونەوەو رۆژی دوایی دەبەست، هەروەکو لە ئینجیلدا هاتوە. ئەم بابەتەش لە ساڵانی چلەکاندا بەشێوەیەکی ئەبستراکت بەتەنها پەیوەندی بەتاکەوە هەبو، ئیدی چ بەعسی بوایە یا نا، یا بۆچی خەڵکی لەسەر هۆیەکانی جەنگی ١٩٦٧ قەناعەتیان بە شیکردنەوەکەی هەبو (هەروەکو لە کاتی پرۆسەی هەڵواسینەکانی



١٩٦٩دا لە پەرچەکرداری عێراقییەکاندا روونده‌بێتەوە).

زۆرجار شیکردنەوەی ورد بۆ کردەوە پێشنیازکراوەکان تەنها لەفۆڕمی واقعییەتی دوای روداوەکان دەبینرێ. لێرەدا پرسیاری گرنگ ئەوەیە: لەڕوانگەی ئەو عەرەبانەی لەدوای سەربەخۆیی بون بەرەو تازەگەرێتی دەچون تا چ ئەندازەیەك ئەو دیدە لۆجیکیو یەکانگیر بو؟ ئەو پێداویستیو بەرخوازییانە چی بون کە ئەفسانەو خورافەو دروشمەکانیان ئاراستە دەکرد؟ رێکەوتنی نێوان سیما سەرەکییەکانی رەفتاری بەعسو ئایدیۆلۆجیگەرا، بەرامبەر بە خەیاڵپڵاویو ملکەچکردن بۆ دەسەڵاتی شەیتان لە چیدا بو؟

ئەگەر ئەو گرفتە جیاوازەی عەجمی ئاماژەی بۆ دەکات بەلاوەبنێینو تەماشای ئەم پرسیارە بکەینو لەبەرچاوی بگرین: ئایا چەمك یا بیرۆکەی ناسنامەی نەتەوایەتی لەلای بەعس چەمکێکی عاقڵانەو لۆجیکی بو؟ ئەگەر وەڵام پۆزەتیف نەبێت، کەواتە سەرچاوەی یەکانگیری بەعس چیە؟ رەنگە کۆمەڵگەیەك تەنها لەبەر ئەوەی بیردەکاتەوە بوونی هەبێت، یا پێیوایە بوونی هەیە. یەکێك لە دێرنترین تێڕوانینی زاتی بۆ فەلسەفەی سیاسی ئەوەیە نزمترین ئاستی کۆدەنگی کە لەهەمان کاتدا کۆدەنگییەکی ئەخلاقیشە، خاڵی دەسپێکی کۆمەڵگەی سیاسییە: بەڵام عەفلەق لە کۆدەنگی یا رێکەوتن، یا لەئەنگیزەی "سروشتی"یەوە دەست پێناکات، تا بەشێوەیەکی یەکانگیر بەئامانج بگات، لەراستیدا ئەو گریمانەی کۆمەڵگەیەکی پەرتەوازەی ناوشیارو گەندەڵ دەکات، ئەوەی دەربارەی ئەم کۆمەڵگەیە دەیزانین ئەوەیە کە هیچ ئەخلاقێکی هاوبەشیان نیە، لەبەر رۆشنایی ئەوەش هیچ دەرفەتێکی نیە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی یەکانگیر بەئامانجی خۆی بگات، ئیدی چ لەرێگەی پرۆسەی "لۆجیکی" بێت کە پشت بە بەرژەوەندی خود دەبەستێت (هۆبز)، یا چ بەرژەوەندی کۆمەڵ (لۆکو رۆسۆ) یا لەئەنجامی کاری ئابورییەوە (مارکس) بێت. لەدیدی عەفلەقەوە خۆشنودی مادیو رەخسیینی (تکامل) ئابوری ـ کۆمەڵایەتی هیچ ئەنگیزەیەکیان نیە.

بەدەر لە بانگەوازی ئیمان، عەفلەق سەرچاوەی بیرۆکەی جیهانێکە کە بەشێوەیەکی بەرچاو جیاوازی لۆجیکی نێوان ئەو شتەی هەیەو ئەوەی پێویستە ببێت، ڕەتدەکاتەوە. شێوازی بیرکردنەوەی ئەو درزە بەجۆرێك ناهێڵێت کە جیهان شتێك بێت بەفیعلی دروست کرابێت، لەبەر ئەو هۆیەش فیکریی ئایدیۆلۆجی بو، بۆیە ئیمانی بەپانعەرەبیزم بەڵگەی ئایدیۆلۆجی بوونی فیکری عەفلەق نیە. ئەو میلەتەی پێویستەو دەبێ یەکگرتو بێت، میلەتێکی گەندەڵ نیەو تێرە بە ڕۆحی عەرەبی، بەراستی ئەو میلەتە لەسەر هەقە، هەر چەندە تەنها ژمارەیەك لە تاکەکانی میلەت ئیمانیان هەیە بەوەی کە دەبێ لە ئایندەدا رووبدات. "پەیامی نەمری" عروبە تێپەڕاندنی ئێستا نیە (واتە ئەوەی کە هەیە)، بەرەو ئایندە (ئەوەی کە دەبێ ببێت)، بەڵکو چاندنی ئایندەیە لە ئێستادا (واتە هاوئاهەنگی ئایندەو ئێستا). بیرۆکەی "مێژووی هاوچەرخی عەرەبی" کە لە نەوەی نوێدا بەرجەستە دەبێ، تەنها بەئیمان بەرەو ئایندە هەنگاو دەنێت‌و ئەوەش جەوهەری ئەندێشەی عەفلەقە: سێ زەمان ئاوێتەی یەکتری دەبن‌و لەیەك کاتدا روودەدەن. هیچ رایەڵەیەکی هۆکاریی نیە کە خەڵکی چ لە ئێستاداو چ بەتێپەڕبونی کات پێکەوە گرێبدات. شەڕەنگێزی لە کۆمەڵگەدا تەنها بەشێوەی رۆحە شەڕەنگێزە ئاشکراکانی دەردەکەوێت (ئیمپریالیزم، کۆمۆنیست، شعوبییەت، نێونەتەوەیی‌و چەند گروپێکی گەندەڵی دی). عەدالەتی رەها بۆ رزگاربون لەو دژانە لێرەدایە، لەحیزب‌و تێروانینی نادیاری کە لە ئایندەدا بەتوانا دەبێت[43].

وەڵامی پرسیاری یەکەم بریتیە لەوەی کە بەعس بەتەواوەتی بەسەر دونیای دەرەوەی خۆیدا داخراوە، بەڵام ئەگەر لەدەرەوەی دیدێکی رەخنەگرانە تەماشای بکرێ، ئەوا ناعەقڵانیەتی دەردەکەوێت. رەنگە خودی عەفلەقیش دان بەو رەخنەیەدا بنێت. بەشێوەیەکی روونتر، ئەو رەخنانە دڵگرانی نەدەکرد، لەبەر ئەوەی لەناوخۆی حیزبدا، ئەگەر ئیمان بەکاراییی‌و هێزی پێویست بەدواداچونی بۆ بکرێ، ئەوا هەڵوەستەی گشتی ئەوەندە لۆجیکی‌و عەقڵانییەکی بەدیهێنراوی نادروست بەدەستدەهێنێت، کە راستەوخۆ لەگەڵ ژمارەی لایەنگر یا دۆستانی حیزب‌و ئاستی پەرۆشیان دەگونجێت.



کەواتە سەرچاوەی یەکانگیری حیزب چیە؟

تێکۆشانو تەبایی عەفلەق‌و هاوەڵانی لەساڵانی چلەکاندا رێگەی پێنەدەدان لە پێش چاوی زۆرێك لەسوریەکان بەریسوایی دەربکەون. بەعس سەرەتا لەتوێژە روناکبیرە هەژارەکانی شار دەستی بەبانگەوازەکانی خۆی کرد، پاشان لەنێو گروپە نارێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، بەتایبەتی لەکاتی هەڵچونی هەستی گشتی‌و تایفیدا خەڵکی بۆ ناو ریزەکانی خۆی رادەکێشا. بەعس رووی نەکردە گروپە بەرژەوەندیدارەکانی وەك (کرێکاران، جوتیاران‌و موڵکدارەکان)، بەڵکو جەختیان لەسەر خەڵکە پەرش‌و بڵاوەکان دەکردەوە یا ئەوانەی هەستیان بە مەترسی گەشەی دانیشتوان‌و شارستانیەت‌و تازەگەرێتی دەکرد، ئەوانەی گۆڕانکاری گەورەی دیمۆگرافی هەرەشەی لەسەر ژیانی نەریتییان دەکرد. لەو گروپانەدا مەحرومیەت پەیوەستی بە ئامانجی تایبەتی‌و دیاریکراوەوە نەبو، بەڵکو بەشێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندی بەنەزانی‌و تێنەگەیشتنی بەهاکانەوە هەبو، ئەو بەهایانەی کە بابەتی "پەیامی" حیزب بون. بەڵام چ شتێك بە پلەی یەکەم خەڵکی بۆ چەمکی پانعەرەبیزم بەعس رادەکێشا؟

لە کۆتاییدا دەبێ بوترێ کە هەر چەندە بەعس ناعەقڵانی‌و نالۆجیکییە، بەڵام هێندە بە یەکانگیری پێوانەیی دەگوێزرێتەوە یا گەڵاڵە دەکرێ، وەکئەوەی لە سیستمی ئەخلاقە مەزنەکانی خۆرهەڵاتی ناوەراستدا دەبینرێ. لە ناوجەرگەی نەتەوەگەرای عەرەبی عەفلەقیدا حەتمییەتێکی ئەخلاقی بێپەردەو ئاسایی خۆی متکردوە. عەفلەق دەڵێت: "ئەگەر هەمو خاکمان بدەنێ، بەڵام ئیمانی لێئاوارتە بکەن، پێمان باشە وەك میلەتێکی پەڕاگەندەو پەرتەوازە بمێنینەوە". ئەم حاڵەتی فیداکاریی‌و گیان لەخۆبوردەییە، ورە بەرزدەکاتەوەو دەیگۆڕێت بەو دینەمۆیەی کە بەعس لەساڵانی یەکەمدا بەهرەی لێوەردەگرت. عەفلەق ساڵی ١٩٥٠ لە وتارێکیدا دەنوسێت:

"ژیانێکی ئاسایی سەرفراز بەهۆی گەندەڵییەوە لە زۆرینەی خەڵك یاساغکراوە، بۆیە ئەوانەی باوەریان بە دادپەروەری هەیە، بەشداری لە ژیانێکدا ناکەن کە لەئێستادا

بەناشـەرعیو سـتەمگەرانەی دەزانن‌و لە جێگەیدا ژیانێکـی مەبدەئیانە هەڵدەبژێرن. تێکۆشـانو یاسـای ژیان کە ناتوانرێ نکۆڵی لێبکرێ، بەبێ بەها رێگە بە هێنانەدی ئەو ئامانجە مەزنو پێشـکەوتنە گەورەیەو شۆڕشـێکی سەرەکی نادەن، ئەو بەهایەش قوربانیدانە"[44].

عـەفلـەق سیاسەتی پـانعەرەبیزمی دوور لـە سازش‌و چـارەسەری مـامناوەندی ئـاراسـتەدەکرد (هـەروەکـو فـەیسـەڵ لێیتێگەیشـتبو)، هـەروەهـا لـە رۆچونو وێرانکاری بیرۆکەی کۆمەڵگەی راسـتەقینەی عەرەبی، یا مەسەلەی سیاسەتی واقیعی دووری دەخستەوە. عـەفلـەق پانعەرەبیزمی بە پێوەرێکی ئایدیالی دەزانی کە لەگەڵ ئەخلاقدا ئاوێزان دەبێت. بۆیە لەلای ئەو هەمو شـتێك لەسەر کۆمەڵگەی راستەقینە، لەسـاڵانی چلەکاندا گەندەڵو لادەرانەبو. کامڵبونی عەرەبی راسـتەقینە (لە محەمەد بەرجەستە دەبو) والیدەکرد بێز لە هەمو عەرەبێکی واقیعی چواردەوری بکاتەوە. ئەوانە خەڵکی ئاسـایی بوون، وەك ئێمە خاڵی لاوازو سەوداو ئارەزوو پێداویستی ساکاریان هەبو. ئەوەش دڵو دەرونی عـەفلـەقی پڕکردبو لە سـوکایەتی‌و بێزکردنەوە کە زیاتر لەحاڵەتی رقلێبونەوە دەچو.

زۆرێك لە خەڵکی ژیانی رۆژانەیان بە سوکایەتیکردن بە خەڵکانی دی دەگوزەرێنن، لـەروانگەی عـەفلـەقەوە ئەم سـوکایەتی پێکردنە پەیوەندی بە ململانێی دژە بەهاوە هەیە. بەڵام هێمای تایبەت بە بەعس بریتییە لەو شێوازەی کە ئەو سوکایەتی پێکردنەی بۆ سیاسـەت وەرگێرا. هەر لەسەرەتاوە ئەو سـوکایەتیەی عـەفلـەق لەگەڵ تێڕوانینە دەرونییەکەی مرۆڤی عەرەبیزمان شـکڵ گۆڕاو یا خـوازە ئاوێتە بوە، ئەو ئاوێتەبونەش زۆر بەهێز بو.

جێگـەی داخە کە راڤـەکاران لە نێوان جەختکردنەوەی عـەفلـەق لەسـەر تاكو ناسیونالیسـتییەکەی ناکۆکی‌و دژایەتی دەبینین. دەشێت ئەوجۆرە کارانە بە گەڕانەوە بـۆ وتەکانی عـەفلـەق چارەسـەر بکرێن، یا بەشـێوەیەکی روونتـر تا چ رادەیەك لە وتـارە گریمانەکانیدا دڵسـۆز بوە. عـەفلـەق سـاڵی ١٩٥٠ لە وتارێکیـدا ئاماژە بە



جیاکارییەکی سەرەکی دەکات:

"هەمیشـە لەو باوەڕەدابوم کە نابێت فەلسـەفەکەمان مرۆڤ تا ئاسـتی خوداوەند پیـرۆز بـکات. جیاوازی لەنێـوان تاكو مرۆڤدا هەیە. پێویسـتە باڵاتریـن بەها بەتاك بدەین، نەك بە مرۆڤ. چونکە بەخوداوەند کردنی مرۆڤ دەبێتە مایەی بتپەرسـتی‌و شـەریك بۆ خودا پەیدا کردن، بەمانایەکی دی، دەبێتە مایەی لەدەسـتدانی ئیمان. ناکـرێ مرۆڤ ئیمانـی بەمرۆڤێکی دی هەبێت، لەبەر ئـەوەی دەرئەنجام داروخانو داتەپینـی ئەخلاقی‌و ئایدیاڵە باڵاکانی لێدەکەوێتـەوە. بەڵام بایەخی تاك لەگەڵ ئەو فەلسـەفە رۆحییەدا دێتەوە کە لەسـەر ویژدانو هۆی ئەخلاقی بونیاتنراوە، نەك لەگەڵ ئاپورە یا خربونەوەی جەماوەری. رۆحی مەعنەوی لە تاکێکدا هەیە کە بەشـێوەیەکی سەربەخۆ دروستبوەو بەفەرمانی ویژدان کار دەکات. ئێمە داوای لێناکەین مەرجەکانی نەتەوەکـەی بهێنێتـەدی‌و وەك مـرۆڤ قوربانی بدات، بەڵکو وەك تـاك ئەو داوایەی لێدەکەیـن. ئێمە پێـی ناڵێین خۆی ئامانجی ژیانی خۆیەتی، بەڵکـو ئەو ـ واتە تاك ـ ئامرازە پیرۆزەکەیەتی"[45].

گوتـەزای لـە بابەت "ناسـیونالیزمی تـەواو"و "گشـتگیری رەفتار" لـە یەکەمین بەیاننامـەی بەعـس، لە سـاڵی ١٩٤٣دا، هێرشـێك بو لەسـەر ئـەو بیرۆکەیەی کە ئیمانێکـی دیاریکراو یا کاری تاك، دەکرێ لە گۆشـەگیریدا بەشـێوەیەکی کەسـی ئەنجـام بـدرێ. ئەوجـۆرە فیکرانە ئاماژە بـەوە دەکەن کە "تاکـەکان" لە هێندێك هەسـتی ئەخلاقیدا حورمەتیان هەتك ناکرێ، گەرچـی رەنگە پێوەرەکانی فەزیلەت جیاوازبـن، ئەمجۆرە جیاوازییەش بە شـێوازێك لە شـێوازەکان لە ژیانو هەلومەرجی مرۆڤـدا بیناکراوە. عـەفلـەق ئەوەی پێقبوڵ نەبو، ئەویش لە رێگەی دروسـتکردنی جیـاکاری نێوان "تاکـەکان"، ئەوانەی دەکـرێ پێوەری فەزیلەتی تاکیان بەسـەردا پیادە بکرێ‌و ئـەو "مرۆڤە"ی بوونی ئەو لەتوانابونەی رەتدەکردەوە. ئەو جیاکارییەش بەتەواوەتی لە سیستمی ئایدیۆلۆجیا کامڵەکەی رووندەبێتەوەو گەڵاڵەکردنیشی مانای بلیمەتی عـەفلـەق دەگەیەنێت[46].

عــەفلــەق تــوانی هەر بەڵگەیەکی مێژوویی ئــاڵۆز کە پەیــوەندی بــە وشیارییەوە هــەبێت‌و پــانعــەرەبیزم گوزارشــتی لێبکات، شۆکی تازەگەرێتی‌و ناڕەسەنایەتییەکەی کــە گەندەڵی هەڕەشــەی لێدەکات، پێکــەوە گرێبدات. ڕێگە چارەســەریش بریتی بــو لەوەی پێــوەری ئایدیاڵــی فەزیلەت لــە فۆڕمی ئیمانــی ڕەها بە عروبەو ســامانە ئەخلاقییەکەی تەبەنی بکرێ. ئەو پێوەرەش وەك پرەنســیپ یا ریســایەکی سەرەکی یا پرەنســیپێکی ڕێکوپێك کار دەکات کە سەرجەم ئەو ڕێسایانەی حوکمی ڕەفتاری بەعســدەکەن، لەوەوە داتاشراون یا پێوەی پەیوەستن. سەرچاوەی بانگەوازەکەیان لە هەلومەرجی بابەتی ناوچەییدا بوونی نەبو، یا لەدوا مەودادا سودی بۆ پرۆژەکەیان نەبو، لــە کۆتاییدا زیندەگی بەعس لــە جەختکردنە ســەر ئــەم کۆمەڵە بەهایە ســەرچاوە دەگرێ کە زۆرجار کولتوری سیاســی عەرەبی ـ ئیســلامی سروشــی پێدەبەخشــێ. عــەفلـــەق بەپێچەوانەی بیرمەندە نەیارەکانی خۆی، نەك تەنها پوختەی وشــەکان، بەڵکو ئەو ڕێسایانەشــی ئاراســتە دەکرد کە تایبەتبون بە بەڵگەو ســەڵماندنە ئەخلاقە پێڕەوکراوەکانەوە.

تەنانــەت لایەنگرێکی پانعەرەبیزمیش، ئیدی بــەدەر لەوەی بیروباوەری دی هەیەو پێــوەی پابەندە یا بــەدەر لە هەر کارێکی دی کە دەیکات، دەبێ بەرامبەر بە ڕەهایی پرەنســیپی ســەرەکی سیســتمی ئەخلاقی بەعس ئازمایش بکرێ. ئەوجۆرە ئازمایشە بەتەنها بۆ دیاریکردنی لێهاتویی‌و شایســتەیی تاك نیە بۆ ئەوەی بچێتە حیزبەوە، بەڵکو ئازمایشێکی "بابەتییە" کە لێهاتویی تایبەت بەئەندامێتی لەسەر ئاستی گشت کۆمەڵگەو نەتەوەی عەرەبی وەك حەتمییەتێکی ئاکاری، دیاریدەکات.

یەکێك لە بەڵگەنەویســتو ئەو پرەنسیپەی بەعس پێیوایە ئەو کۆمەڵگەیەی بوونی راســتەقینەی پشت بە بونیادو سروشــتنەبەزێنی ئەخلاقی دەبەستێت، پەیامێکی هەیە: هەر جۆرە لادانێك لەو بونیادە بێ چەندو چونو بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بە خیانەتێکی مەزن دەژمێردرێت. بۆیە پێویســتە سیســتمی نوێی عەرەبی ببێتــە چنینێکی ئەخلاقی بێــدرزو کەلەبەر. ئەمەش ســەرچاوەی بونیــادی یەکانگیری‌و مۆڵەتــی بەکارهێنانی



توندوتیژیی حیزبە. توندوتیژی وەك حەتمییەتێك پێش دامەزراندنی نەزمی کۆمەڵایەتی دەکەوێت‌و لە کەمالیەتی بەعســییەکانەوە ســەرهەڵدەداو حیزبیــش ئەم توندوتیژییە لە چەمکی شۆڕشــەوە وەردەگرێت. "خەبــات خۆی لە خۆیدا ئامانجــە، گۆڕانکاری ریشــەیی لەمانای توندوتیژیدا خۆی حەشارداوە"[47]. نابێ توندوتیژی وەك مەسەلەی بەرگــری لەخۆکردن تەماشــابکرێ. عــەفلــەق زۆر بەراشــکاوی دەڵێت، ئەخلاق بەتەنها لەئیشــوئازارو قوربانیدانی حیزبی تێکۆشەردا نیە، بەڵکو لە توندوتیژییەکەیشیدا بەدیدەکرێ:

"ئیمــانو بیروباوەڕمــان پێمان دەڵێت دابەشــکردنی میلــەت رابگەیەنین، چونکە میلەت... هێشــتا ئەو یەکێتییە ئایدیالەی نەهاتۆتەدی کە ئەمرۆ بوە بە مەســەلەیەکی مەبدەئی‌و تا گەیشتن بە یەکێتییەش بەهەمان دابەشکراوی دەمێنێتەوە.

بەڵام ئێمە لەم تێکۆشانەدا عیشق‌و خۆشەویستیمان بۆ هەمو لایەك هەیە، بۆیە کاتێك بەرامبــەر بەوانی دی دڵڕەق دەبین بەتەنها بەو مەبەســتەیە تا بۆ خودی راســتەقینەی خۆیان بیانگێڕینەوە، ئەوانەی ئاگایان لە خودی خۆیان نیەو ویســتو توانایان هێشــتا رۆشــن نیە، لەگەڵ ئێمەن، هەر چەندە بەرواڵەت شمشێرەکانیشــیان ئاراستەی ئێمە دەکەن"[48].

تــا خۆشەویســتی تاك بۆ میلەت گەورەتر بێت (بەواتایەکــی دی تا ئەخلاقگەرای تاك گەورەتر بێت، هەروەکو لەچڕی ئەو لێکۆڵینەوانە رووندەبێتەوە کە لەسەر باڵابون یا جیاکاری بەعس ئەنجام دەدرێن)، دڵڕەقیش دەبێتە پێویست کاتێك بارودۆخ لەبار دەبێت. ڕەفتاری تاکی بەعســی "پێویســتە ترس لەبەرامبەر ئەو کەسانەی نوێنەرایەتی فیکری چەواشــە دەکەن، تا ئاستی مەرگ بەرهەمبهێنێت. نابێت ئەندامانی بزوتنەوە قەناعــەت بهێنــن بەوەی کە نەیاران بیرۆکەی دژ بەوانیــان هەیەو بڵێن: ئێمە کارمان بەســەر ئەوانــەوە نیەو بۆچی تەنگیــان پێهەڵچنین". بۆچی هیــچ بەهایەك نیە؟ لەبەر ئەوەی فیکری دوژمنکارانە لە بۆشــاییدا بوونی نیە؟ بەڵکو لەو خەڵکانەدا بەرجەســتە دەبێ کە پێویستە لە نێوببرێن تا بیروباوەرەکەشیان لەگەڵ خۆیاندا لەنێوبچێت"[49].

مۆڵەتی بەعس بۆ پەنابردنەبەر توندوتیژی، لە ئەخلاقی راستەقینەی بەعس لەسەر تێگەیشتنیان لەپانعەرەبیزم سەرچاوە دەگرێ. بەواتایەکی دی، پێش هەر جۆرە قسەکردنێك لەسەر ئازادی، دەردەکەوێتو مەیدانی راستەقینەشیان هەمان ئەو مەیدانە بو کە حیزب دیاریدەکرد. بەگوزارەیەکی دی، توندوتیژی پێش ئاسایی بوونی هەر جۆرە دیاردەیەکی ئابوری ـ کۆمەڵایەتی پەیوەندی بە پێداویستیەکانی گەشەکردنی دەوڵەتێکی دواکەوتووە هەبێت، دەردەکەوێتو کۆتوبەندی سەر رێگەی ئازادیش دەست نیشان دەکات.

کاتێك بەتاتو ئەم دوا بڕگە ترسناکە دەنوسێت، لەدرێژەی قسەکانیدا دەڵێت: "ئەوە تەنها نمونەیە لەجۆری خۆیەتیو ناتوانێت هیچ پەیوەندییەك لەنێوان خۆیو درندایەتیو جەبەروتی بەعس لەدەسەڵاتدا پەیدا بکات"[50]. بەڵام کامیل ئەبوجابر ئەو بڕگانە پشتگوێ دەخاتو دەڵێت: "عەفلەق مەسەلەی توندوتیژیو شۆڕش لەیەکتری جیادەکاتەوە"[51]. کەچی نۆرما سالم ـــ بابکیان بۆچونی خۆیو ئەریك رۆلۆ هاوسەنگ دەکاتو بەئازایەتییەوە سروش بۆ ئەوە دەکات کە عەفلەق "رۆحی فاشیگەرای تیابوە"، ئەمە لەکاتێکدا خودی رۆلۆ نەیتوانی سۆسیالیستی راستەقینە لەبەعسدا روونبکاتەوە[52].

فواد عەجمی لە شەستەکاندا بەدیدێکی جیاوازەوە تەماشای وشیاری بیریارانی بەعسی کردووە بەئەنجامگیرییەکی نابەجێ گەیشتوە. چۆن دەکرێ کەسێك ئەوە روونبکاتەوە کە رژێمی حوکمڕان لە عێراقو سوریا لەسەر بنەما یا رۆشنایی "ئامانجگەرای گەنجان" لەدایك بوە، پاشان بەوپەڕی سادەییەوە "رادەستی فروفێڵو درندایەتی سەرباز بوە؟"[53]. بەهەر حاڵ ئەو راڤەکردنە پەیوەندی بەو حاڵەتەوە هەیە کە رژێمی حوکمی بەعس لە عێراقو سوریادا بەتەواوەتی سەقامگیرو شوێن پێی خۆیان قایم کردبو. لۆجیکی سەرەکی حیزب، کامڵکردنی خود بو. قەتیسکردنی حیزبی بەعس لە کۆمەڵێك کودەتاچی سەربازی خەسڵەتێکی سەرەکی بەعس، بەتایبەتی لە وڵاتێکی وەك عێراق، لەدەستدەدا. لەدەستدانی چەند بیریارێك مانای "نابودی"



سیاسەتی بەعس ناگەیەنێت، چجای ئەوەی بگات بە خولی جێگیربونی ساڵانی حەفتاکانی بەعس (رژێمی بەعس لەعێراقو سوریا لە لوتکەی دەسەڵاتدا بون).

نوسەری ئەم کتێبە دوچاری ئەوجۆرە وەهمە ببو. گرفتەکە ئەوەیە کە دوودڵین لەسەر ئەوەی دەربارەی یەکانگیری بەعس بگەین بە چەمکێك. ئەو گرفتەش یەکێکە لە کۆی سیاسەتە هاوچەرخەکانی عەرەب. دوودڵی ئێمە لە جدی گرتنی عەفلەق لە کۆتاییدا لەو وشیارییەوە سەرچاوە دەگرێ: گەر فیکری عەفلەق لە هەر روویەکەوە پەیوەندی بەو رێوشوێنانەوە هەبێت کە بەعس لە دەسەڵاتدا بوە، تەنها لەبەر دوو روداو و دوو مەرجی دی بوە کە روویانداوە: یەکەم، پێویستە فیکرە سەرەتاییەکانی عەفلەق لەلایەن سەرکردەکانی ئێستای بەعسەوە پێڕەوبکرێو بەپێی ئەو فیکرەش کاربکەن. دووەم، پاساوی بەعس بۆ پەنابردن بە توندوتیژی زیاد لە روانینی فەیلەسوفی سەر کورسییەکی نەرمە کە دەنگدانەوەی لەنێو جەماوەری عێراقو سوریادا هەبێت. ئەوانە لەسەرەتادا خەڵکانێك بون هیچ شتێکیان نەبو لەگەڵ بەعسدا بیکەن، بەڵام لەڕووی مەبدەئییەوە بۆ ئەوەی لانیکەمی "پەیوەندی" دەستەبەر بکرێ، دەبوایە قەناعەت بەگرنگیو بایەخی جۆرێك لە توندوتیژی بهێنن. سەرئەنجام ئەم دوو مەرجە لە دووەم حوکمڕانی بەعسدا هاتەدیو دەسەڵاتدارانی بەعسی عێراق لە بەرامبەریاندا دڵسۆزو بەوەفابون.

## کۆبەندی:

کاتێك کەسایەتی سیاسی وەك بیروباوەڕێکی رەهای ئەخلاقی قبوڵ دەکرێو کاتێك خودی ئەخلاق وەك هەوڵێك بۆ گەیشتن بەکەماڵ یا ئامانجێکی دەرەپێگەیشتن تەماشا دەکرێ، ئیدی لەڕووی پرەنسیپەوە هیچ لایەنێك لەلایەنەکانی رەفتار لە دەرەوەی سنوری دەسەڵاتی رێکخستنی سیاسی یا دەوڵەت نامێنێتەوە، پاشان

هیچ رێگەیەك نامێنێتەوە جگە لە قبوڵو ئاراستەكردنی دەستێوەردانی هەمەلایەنەی دەوڵەت لە كاروبارەكاندا. دادپەروەری وەك گرفتی داوەریكردن لە نێوان داواكانی كۆمەڵگەدا (مافەكان) هەرگیز سەرهەڵنادات‌و پێشبینی ئەوەش ناكرێ سەرهەڵبدات. ئەمجۆرە دادپەروەرییە جەختكردنێكی گریمانەیی یا بەڵگەنەویستی پیرۆزی ئەخلاقی "مرۆڤە" كە بەعس رەتیدەكاتەوە. سەرباری ئەوەش، تەنانەت لە پێواری گشت چەمكەكانی مافی مرۆڤدا، دەبێ توندوتیژی ئەنقەست لە دوور مەودادا لەچاوی ئەوانەی دەبن بەئامانجی توندوتیژی پاساوی بۆ بهێنرێتەوە (بەتەنها بەعەقڵانیكردنی بەس نییە)، چونكە زۆر بەسادەیی توندوتیژی بەبێ ئەو پاساوهێنانەوەیە لە مەودایەكی دووردا لەكار دەكەوێت‌و سودی نامێنێت. رێسای ئەخلاقی بەعس‌و بەعسگەرایی، هەروەكو چۆن بەئیسلامەوە گرێدراوە، ئێستاش تاكە سەرچاوەی ئەو پاساوهێنانەوەیە. هەروەكو چۆن لە هەمو ئاینەكاندا ئەخلاق‌و ئاین لە یەكتری جیاناكرێنەوە، لە گشت مێژووی عەرەبی ـ ئیسلامدا هەر بەوجۆرە بووە لە بەعسیشدا جیانابێتەوە.

## عەلمانیەت‌و تایفەگەرایی:

زۆرێك لەنوسەران ناوەرۆكێكی عەلمانی (جودایی ئایین لەدەوڵەت) لە ناسیونالیزمی بەعسدا بەدیدەكەن[54]. حیزب هێندێك هەنگاو یا رێوشوێنی گرتەبەر كە وەك رێوشوێنی عەلمانی تەماشای دەكرێ (بۆنمونە كەمكردنەوەی جیاكاری ئاینی‌و كنیسەیی). پانعەرەبیزم لەسەرووی هەمو پرەنسیپە باڵادەست‌و هەژمونگەراكانەوەبو،و حیزبی بەعسیش هەرگیز باوەڕهێنانی بەئاینی ئیسلام نەكردبو بەمەرجێكی پێشوەخت بۆ پەیوەندیكردن‌و بوون بەئەندام لەحیزبی بەعسدا. عەفلەق ساڵی ١٩٤٣ داوای لە دانیشتوانی ئۆرتۆدوكسی دیمەشق كردوە "تەماشای پەروەردەی ئیسلام بكەن بۆئەوەی لەپەروەردەكردنی خۆیاندا لێی بەهرەمەندبن"، بەڵام لەلێكۆڵینەوە لەسەر ناوەرۆكی‌و كاریگەری لەسەر مەسیحییەت بونیان سەرپشكی كردن. بەپێچەوانەی



ئەوەشەوە حیزبوڵڵای لوبنانی لەشوباتی ١٩٨٥دا لەبەیاننامەیەكیدا داوا لەمەسیحیەكانی لوبنان دەكات واز لەمەسیحیەتی خۆیان بهێنن‌و بین بەئیسلام‌و كۆماری ئیسلامی شیعە دامەزرێنن.

شتێكی روون‌و ئاشكرایە كە بەعسی‌و ئیسلامی ئوسوڵی روبەروی یەكترنابنەوەو لەسەر هێندێك مەسەلەی سەرەكیش هەرگیز رێكناكەون. هەروەها بەعسیەكان پشت بەهەمان بنەمای ئەخلاقی رەها دەبەستن كە لە هەمو ئاینەكاندا باوە. بەعسییەكان لە هەمو پانعەرەبیزمەكانی دی زیاتر پشت بەئیسلام دەبەستن، ئەویش نەك لەبەر ئەوەی لەگەڵیدا دەگونجێن، بەڵكو لەبەر ئەوەی ئیسلام رەگوریشەیەكی قوڵی ئایدیۆلۆجی لە نێو عەرەبدا هەیە. بەڵام چۆن دەكرێ لەنێو ئەو هەمو شتەدا سەركەوتو بێت؟

ئەوانەی بەعس بە عەلمانی دەزانن، لەو باوەڕەدان كە ناسیونالیزمی هاوچەرخ، تەنانەت ئەگەر ئایدیۆلۆجیش بێت لە حەقیقەت‌و جەوهەریدا عەلمانیە، ئیدی بەدەر لە دەربەستبونی راستەوخۆی كە وایلێدەكات كار بەهێندێك بیروباوەری ئاینی بكات. گریمانەی ئەوەش دەكرێ  زەمەن‌و پێداویستی سنوری دەوڵەتی نەتەوە لە دواجاردا كار بۆ نوێكردنەوەی هەستی ئاینی دەكات، بۆ ئەوەی لە رێگەی پەراوێزخستن‌و دوورخستنەوەی رۆڵی لاوەكی‌و شیاوی خۆی وازیبكات. بۆیە جەخت لەسەر هێندێ فۆرمۆلەی تازە یا هۆكاری دی دەكرێتەوە بۆ ئەوەی ئەوانی دی دوور بخرێنەوە یا جەخت لەسەر چەندین رێوشوێنی دی دەكرێتەوە كە بە عەلمانی ناوزەدە دەكرێن.

## جیاكردنەوەی ئاین لە سیاسەت

لەسیاسەتدا گرفتەكە لەمانای عەلمانی یا عەلمانیەت (Secular – Secularism)ەوە دەست پێدەكات. ئەگەر عەلمانیەت بۆ جیاكردنەوەی دەزگاكانی ئاینێكی دیاریكراو لە كاروباری دەوڵەتدا كورت بكرێتەوە، واتە جیاكردنەوەی ئاین لە دەوڵەت، ئیدی بەعس دەبێتە حیزبێكی عەلمانی، چونكە لە

سیاسەتدا بەشداری بە پیاوانی ئاینی ناکات. ڕەنگە لە ڕژێمێکی عەلمانیدا کۆمەڵەکان پاریزگاری لە سیمای ئاینی خۆیاندا بکەن. لە پێناسە ڕەسمییەکەی ئەم چەمکەدا پەیوەندی لەنێوان ناوەرۆکی سیاسیو کۆمەڵایەتی عەلمانیەت بوونی نیە، یا ئەگەر پەیوەندییەکیش هەبێت، زۆر سنورداره. بەهای ئەم کارەش، تێکەڵکردنو بەدحاڵی بوونە دەربارەی سەرچاوەی دەربەستبونی سیاسی لەسایەی تێڕوانینی پانعەرەبیزمدا.

لە وڵاتە مەسیحییە ناوسراوەکانی ڕۆژئاوادا کە بە عەلمانی ناویان دەرکردوە، عەلمانیەت قەڵەمڕەوێك نیە پشت بە هیچ ئەخلاقێکی لێڵو ئاڵۆز ببەستێت. لەماوەی پرۆسەی عەلمانییەتدا سیاسەت هۆیەکی ریشەیی تازەی بۆ بوونی خۆی بەدەستهێناوە. خەڵکی هەر چەندێك ئاینی بن، تەنها لەوە تێبگەن کە بیرۆکەی ئەخلاقی نوێی لێبوردن لە کۆمەڵگەیەکی فرە ئەخلاقی جیاواز قبوڵ بکەن، ئەو کۆمەڵگەیەی لە بەها ڕێژەییو بیروباوەری جۆراوجۆر پێکهاتوە، ئیدی پێناسەی پێشوی عەلمانیەت، هەر چەند بە رووکەش وەك خۆی بمێنێتەوە، بەتەواوەتی مانای جیاواز وەردەگرێت. دەتوانرێ بۆ نمونە بوترێ کە بیروباوەرو قەناعەتی ئەخلاقی بەلانیکەمەوە لە دوو ئاستی جیاوازدا، تایبەتیو کەسێتی، گشتیو کۆمەڵایەتی روودەدات. ئەم جیابونەوەیەش لە کرۆکی چەمکی ڕۆژئاوا خۆی لەجودایی ئایین لە سیاسەت دەبینێتەوە، ئەمەش لەدوای شەڕە ئاینییەکانی سەدەی شازدەو حەڤدەهەمەوە لە گەشەکردنی لێبوردنی ئاینییەوە سەرچاوەی گرتو چەسپا.

لێبوردنی ئاینی، هەر چەندە بەبەراورد لەگەڵ سەرجەم فۆڕمە ئەخلاقیە ڕەهاکان پەسەندتر بێت، بەڵام بەتەنها بەس نیە. تەنانەت ئەو ساتەوەختەی کە بۆ مشتێك کەسی بێباوەڕ بەشەرعی دەزانرێو لە کاروباری ویژداندا پێڕەوی لەبڕیارو تێڕوانینی تایبەت بەخۆیان دەکەن، کۆمەڵگە روبەروی گرفتی تازە دەبێتەوە: چۆن دەتوانرێ بەبێ پەنابردن بۆ دەسەڵاتی ڕۆحی ئەو فیکرە ئەخلاقیانەی پەیوەستن بە جەبرو پاساوهێناوەی دەوڵەتەوە بێنەدی؟ عەلمانییەت کە فۆڕمی جۆراوجۆر وەردەگرێت، وەڵامێکی شارستانی ڕۆژئاوابو بۆ ئەم گرفتە کە لە ماوەی جیاکردنەوەی دەزگاکانی



حکومەت لە ئاین لە ژینگەیەکی مەسیحییەوە سەریهەڵدا.

کاتێك ئاینێك جێگەی ئاینێکی دی دەگرێتەوە یا بەتەنها لەگەڵ لێبوردنی نێوان ئاینەکاندا سەروکارمان هەبێت، گرفتەکە بەهەمان شێوەی پێشوی سەرهەڵنادات (بەگریمانەی ئەوەی ئاینە سەرەکییەکان خاڵی هاوبەشی زۆریان لەسەر ئەسڵی سەرهەڵدانی ئەخلاقی ئاڵۆز هەیە، تا کۆڵەکەی ئەخلاقی ڕژێمێك دروست بکەن کە لەسەر زۆرەملێ بونیاتنرابێت). ئەگەر ئەم مەرجەش قبوڵ بکەین، ئەوا ڕژێمێکی بەراستی عەلمانیو لەڕووی ئەخلاقییەوە ڕەوایەتی هەبێت، لەلایەن هەمو گروپو تایفەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەراستەوە قبوڵ ناکرێ. ئاینو تایفەیەکی دیاریکراو تا چ ئەندازەیەك نارەزایی لەسەر دەسەڵاتو هەژمونی تایفەیەکی دی دەربڕێت، بەڵام هەمو لەو بیرۆکەیەدا هاوبەشن کە لە کاروباری مرۆڤایەتیدا ئەو ڕژێمانەی باوەڕیان بەڕێژەیی بەها ئەخلاقییەکان هەیە، یا ئەو ڕژێمانەی کە زۆر بەسانایی جەختی لەسەر دەکەنەوە یا وێنای دەکەن (لەڕێگەی کەسایەتی ڕێبەر یا بۆ نمونە جارنامەی مافەکانی مرۆڤ) هەمویان نائەخلاقین. لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراستدا هێشتا گروپپەندی ئاینی بەشێوەیەك لە شێوەکان کەرەستەیەکی خاوی سیاسەتن. پێناسەکردن لەگەڵ دەوڵەتی نەتەوەیی یا چینی کۆمەڵایەتی بەبێ سود دەمێنێتەوە. ئەگەر لەم حوکمەدا کەمێکیش دوو دڵی هەبوبێت، ئەوا شەڕی ناوخۆی لوبنانو شۆڕشی ئێران لەگەڵ خۆیدا رایماڵی.

لەرابردودا کۆمەڵگەی ئاینی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراستدا پاریزگاری لە خۆییو قەوارەکەی دەکرد، چونکە یەکەیەکی کۆمەڵایەتی داخراو بو. ئەو وشیارییەی لە ڕژێمی میلەتی عوسمانییەوە سەرچاوەی گرتبو (میلەت لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا چەمکێك بو مانای نەتەوەو کۆمەڵگەی ئاینی پێکەوە دەبەستەوە) لە سەدەی نۆزدەهەمدا چڕ بویەوە، چونکە هێزە جیاوازەکان دەستیان کرد بە شێوازی پاریزگاریکردن لە کۆمەڵگەو گروپەکانو بەمەبەستی دەسکەوتی دەسەڵاتی زیاتر بەکاریاندەهێنا. لە قۆناغی دواتردا ڕۆڵی نەریتی زۆرێك لە تەکەتولە کۆمەڵایەتییەکان کە لەسەر بنەمای ئاینی دامەزرابون، لەماوەی بونیاتنانەوەی دەوڵەتو تازەگەریتیدا هەڵوەشانەوە کە لە

راستیدا رەنگە هەر ئەوەش کاریگەری ئەخلاقی لەسەر ژیانی عەرەبە هاوچەرخەکانی دی هەبوبێت. زۆرێك لە وڵاتانی جیهانی سێیەم لە ژێر ناوی سەربەخۆیی‌و خەبات لەدژی ئیمپریالیزم بە سۆزی رابردوە تەماشای ئەم نەریتە دەکەن.

پرەنسیپی بەعس زۆر بەوردی لەم نەریتەی رۆژهەڵاتی ناوەراستەوە چەسپاو و جێگیر بوە، چونکە لەو بڕوایەدایە کە لە ئیسلامدا پەیوەندییەکی راستەوخۆ لەنێوان کاری سیاسی‌و ئەخلاقیدا هەیە. رەهاگەرای ئەخلاقی بەعس لە هەمو حاڵەتێکدا ئاراستەی ئامانجێکی نائاینی دەکرێ: جیاکاری ناسنامەی نەتەوەیی لە جیهانێکدا کە پێ لەسەر سنور دادەگرێ.

سەبارەت بە عەرەبیش دەکرێ لە رێگەی دیالیکتیکی پێشەنگی عەرەب لە ئیسلامدا بەو ئامانجە بگەن. عەفلەق زۆر باش ئەوەی دانابو کاتێك دەیوت: "ئیسلام هێزە". هەمان ئەو هێزەی کە کاریگەری لەسەر سەرلەنوێ دەرکەوتنەوەی "نەتەوەی عەرەب" هەبو. لەو روانگەیەشەوە بەعسیەکان هەمو شتێك بون جگە لە عەلمانی. حیزب دوا پاساوی خۆی لە نەریتی عەرەبی ـ ئیسلامی دۆزییەوە. ئیدی لێرەدا پەیوەندی نێوان سیاسەت‌و کۆمەڵگە سەبارەت بە تێگەیشتنی سیاسەتی بەعس، دەبێتە مایەی بێمانا کردنی چەمکی عەلمانیەت (سکولاریزم).

بەڵام نابێت ئەوەمان لە یادبچێت بەعس لە بنەمایەکی ئەخلاقی بەرفراوانتر بەهرەمەند بو کە لە ئیسلام زیاتر دەرۆیشت، تا هەمو خاڵە هاوبەشەکانی تیمە مەزهەبیەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراست لەخۆبگرێ. ئێمە حەزدەکەین لەوە تێبگەین کە چۆن حیزب دەتوانێ لەڕێگەی بەربەستە تایفییەکانەوە بانگەواز بکات. بیناکردنی ناسنامەی سیاسی بە گەڕانەوە بۆ حەتمییەتی ئەخلاقێکی رەهای نەناسراو لەگەڵ هەمو تایفەکانی خۆرهەڵاتی ناوەراستدا دەکەوێتە ململانێوە، کاتێکیش لەجێگەی بڕوابوون بە خودا جەخت لەسەر میلەت دەکرێتەوە، ئیدی لەگەڵ هەمو مەزهەبەکان روبەرودەبێتەوە. سەرباری ئەوەش سەرئەنجام بەعسیەکان سەرکەوتن. هیچ روناکبیرێکی کۆمۆنیستی عەرەب، چەند رادیکاڵ‌و مێشك وشك بێت، ئنجا ناتوانێت



کێبەرکێ لەگەڵ بەعسیەکاندا بکات. هیچ عەرەبێکی رۆژئاوا زەدەش ناتوانێت عەفلەق رەخنە بکات، بێئەوەی پەنجە بۆ ئەم پەیکەرە یا پێکهاتە ئیمانییە ئوسوڵییە درێژ نەکات، کە ئەوەش جەماوەری عەرەبیی لێدوور دەخاتەوە. بلیمەتی عەفلەق لەوەدا بو، ژینگەکەی زۆر باش دەناسی‌و مەزهەبی بەشێوەیەکی قووڵ کێش دەکردو ئایدیۆلۆجیای بەعسی لە جیهانێکدا دەخستەڕوو کە بەناو مەزهەبی نەبو. عەفلەق وشیاری پانعەرەبیزمی بەجۆرێك لە ئایدیۆلۆجیاکەی دارشتبو، وەکئەوەی هیچ شتێکی لە کۆی بەهاکانی بزوتنەوەی رۆشنگەری ئەوروپا وەرنەگرتبێت. شێوازی بیرکردنەوەی عەفلەق بوە مایەی ئەوەی زۆرێك عەرەب کێشبکات، چونکە لەسەر پێگەی عەرەب لە مێژوودا لەگەڵیاندا هاوئاهەنگ بو، هەروەها هیچ بەرخوردێکیشی لەگەڵ دابونەریتیاندا نەبو.

ئەگەر عەفلەق لە رۆژگارێکی دی بژیایە، ئەوا دەبوە فاڵچی یا ئەستیرەناسێکی نەفرەت لێکراوی خێڵەکەی یا پەیامبەر، ئەو کارەی کە پێشینەیەکی چەند هەزار ساڵەی هەیە. ئەوجۆرە خەڵکانە لە یەك ئاینەوە سەریان دەرهێنابو، بەڵام لە دەرەوەی مەزهەبەکەیان درێژەیان بە بانگەوازەکەی خۆیان دەدا. ئەوانە لەنێو فیکرێکی ئاینی ـ ئەخلاقی کاریان دەکرد کە چوارچێوەی مەرجەعێکی گشتگیری پێکدەهێناو هەمو تیمەو تایفەکانیش ئەو چوارچێوەیەیان پێقبوڵ بو. جگە لە عەفلەق‌و بەعسیەکان، هەر کەسێکی دی بەهەڵە پەیوەندی پرۆژەی تازەگەری‌و بیروباوەڕیانی بەراورد دەکرد: هیچ کەسێك ئەوەندەی عەفلەق بەکاراییی‌و دڵسۆزی‌و ورەوە لێی قووڵ نەبۆتەوە.

لەدیدی سەرنگومکردنی رژێمەکانی دوای عوسمانییەوە، بەدوور دەزانرێ کە پایە ئەخلاقییەکانی سیاسەتی عەرەبی روبەروی هیچ بەرەنگاربونەوەیەکی جیدی بوبێتەوە. لەسەروی ئەوەشەوە رژێمە ریسواکان لەلایەن فرەنساو بریتانیاوە لەسەر بنەمای پرەنسیپی رێژەیی بەها ئەخلاقییەکانی تیمە جۆراوجۆرە ئاینیەکان دانرابون. رەنگە ئەوەش یەکێك لەو بەڵگە زۆرانە بێت کە ئەو رژێمانە هەرگیز رەوایەتیان پەیدا نەکرد، عەفلەق توانی بەدوورکەوتنەوەی لە پرەنسیپی ئیسلامی‌و بیناکردنی

بەعس لەسەر بنەمای پێوانەیی ئوسوڵی، پاساوێکی نوێ، بەڵام بەرەگوریشەی نەریتی پانعەرەبیــزم پێشــکەش بکات، کە هیــچ یەکێك لە رژێمە ناشــەرعییەکان نەتوانێت رکبەرایەتی بکات، لەبەر ئەوەی عەلمانییەکی رەسەن بو.

## تایفەگەرایی:

پانعەرەبیزم تەنها لە ئیسلامدا رەگوریشەی نیە، بەڵکو رەگوریشەی لە تایفەی سونیشــدا هەیە کە زۆرینەی موســڵمانی عەرەبزمان دەگرێتــەوە. ئەو ئایدیۆڵۆجیایەی لەسەر پێشرەوی عەرەب لە ئیسلامدا بونیاتنراوە، بەشێوەیەکی لۆجیکی بۆ ئەو زۆرینەیە دەگەرێتەوە. عــەفلــەق جەختی لەســەر محەمەدو بیســت ساڵی یەکەمی بزوتنەوەی ئیســلام دەکردەوە. گشــت دیاردەکانــی دی، هەر لە فەتحکردنەوە تــا پەیدابوونی شارســتانی ئیســلام بە بەرهەمی ئەو بیست ســاڵەی لەقەڵەم دەدا[55]. ئیدی لەو رۆژە بەدواوە ئیسلام روبەروی گرفتو کێشە بویەوەو لەنێو میلەتە ناعەرەبەکاندا سەرکەوتنی راستەقینەی بەدەستهێنا. بەڵام شیعە، بەپێچەوانەوە، عەلیو وەچەکانیو رۆڵی لەماوەی چوار ساڵی حوکمرانیدا دەکاتە ئایدیالی خۆیو نەفرەت لە خەلافەتی ئەمەوی لە شام دەکات. ئەو حکومەتەی بەتەواوەتی لە عەرەب پێکهاتبو. لەنێو ئیسلامدا شیعە وەك رکبەرێکی ســەرەکی ســونە مایەوە. بەڵام بەهۆی بیروباوەرێکی یەکانگیر لەناوخۆیی عێراقــدا، ئەمە لەپاڵ کەنارگیری دەســەڵاتی عەرەبی لە خەلافەتدا، شــیعەی عێراق لەچوار چێوەی عەرەبیدا روبەروی هێندێك کۆسپو تەگەرەی بویەوە.

شیعەگەرایی وەك بزوتنەوەی پشتگیریکردن لە هێندێك سەرکردەی کاندیدکراوی عــەرەب بۆ خەلافەت دەســتپێکرد، بۆ ئــەوەی روبەروی باڵادەســتی خێڵە عەرەبە حوکمڕانەکانی شــام بێتەوەو کۆتایی بەدەســەڵاتیان بهێنێت. خێڵەکانی خۆراسان لە چیاکانی باکوری رۆژهەڵاتی ئێران لە ئەمەوییەکان یاخی بوون، ئەمە لەپاڵ شیعەکانی عێراق (بزوتنەوەیەك بو پشتگیری لە وەچەکانی عەلی دەکردو ئومێدی ئەوەی لێدەکرا لە کوفەی عێراقەوە حوکمڕانی بکات)و بزوتنەوەی نهێنی عەباسیەکان (کە لە بنەماڵەی



هاشــمیو گەورەتریــن بنەماڵەی خێڵی محەمەد بون) بانگەشــەی حوکمیان دەکرد. عەباسییەکان لەدوای سەرنگومکردنی ئەمەوییەکان خۆیان لە هاوپەیمانەکانیان رزگار کردو هەر زۆر بەخێرایی بەســەر بنکە رۆحانیە پانوپۆڕەکەی ئیسلامدا سەرکەوتن. بە ســڕینەوەو هەڵگرتنی جیاوازی نێوان خێڵە عەرەبە ئەســڵییەکان، واتە داگیرکەرەکانو موســڵمانە تازەکانی ناوچەی هیلالی خەسیب، دەســەڵاتی خێڵە عەرەبەکانی سوریا کۆتایــی پێهات، بەوەش خەســڵەتی خەلافەتی عەرەبی گۆڕانکاری بەســەردا هات. دوەم خەلیفەی عەباسی (مەنسور) بەغدای کردە پایتەختی خۆی.

دابەشبونو دووکەرت بونی مێژوویی نێوان شیعەو سونەی عێراق دەگەرێتەوە بۆ ئەو هەڵوێستەی کە موسڵمانەکان سەبارەت بە خەلافەتی عەباسی وەریانگرت. لە عێراقدا ســونیگەرایی لە رێگەی قبوڵکردنی رەوایەتی خەلافەتی عەباسیەکانەوە بەدیارکەوت، بەڵام شــیعەی عێراق لە ســەرەتادا لە رێگەی بزوتنەوەیەکی شیعەدا بەدیارکەوت کە جوداخوازترین هەڵوێســتی هەبو (رەتکردنەوەی هەمو دەسەڵاتێك کە سەرچاوەکەی عەلــی یا یەکێــك لە وەچەکانی نەبێت). بەهەر حاڵ هــەر دوو بیروباوەڕەکە پێکەوە لەگەڵ باڵاکردنی عێراق لە جیهانی ئیسلامدا قاڵبیان گرتو بەشێوەیەکی سەرەکیش لەسەر حیسابی سوریا بو.

ئەم مێژووە هاوبەشــە، ســونەو شیعەی عێراق لە چارەنوســێکی هاوبەشدا پێکەوە دەبەســتێتەوە. عروبەی عێراقی لەگەڵ مەســەلەی مێژووی ئەم سەرزەمینە تێکەڵ بو، واتــە دەرکەوتنــی عروبەی عێراقی لەگەڵ ئاوابونی دەســەڵاتی پێشــڕەویی عەرەبی لە جیهانی ئیســلامدا هاوزەمان بو. عروبەی بێ چەنــدو چۆنی ئەمڕۆی عێراق هەرگیز نەبۆتە مایەی ئەوەی نزیکیی لە ئێرانو گرنگی رۆڵی کولتوری ساسانی لە ساتەوەختی فەتحی ئیســلامدا لەبەرچاو نەگیرێ. هەروەها گەشەکردنی عروبەی عێراق لە فۆڕمی دەســتکەوتی روونو ئاشکرای شارستانی عەباســی، رێك لەو کاتەدا بو کە فارس لە سیاسەتو دەوڵەتداری ئیسلامیدا جێگەی عەرەبی گرتەوە.

شــیعەی تایفەگەرا کە هەر لەســەرەتاوە مەســەلەیەکی عەرەبی بو، نەیدەتوانی لە

دەرەوەی سـەرزەمینی عێراق ( بۆ سـوریا) جێگەی خۆی بکاتـەوە یا فەرمانڕەوایانی عەباسـی کە وەزعێکی پێچەوانەی شیعەیان هەبو، ببنە مایەی قبوڵکردنی ئەم گروپە، بۆیـە لەنێـو شـیعەکانی عێراقدا جۆرێك لە قەیرانی ناسـنامە پەیدا بو. هەڵکشـان یا دەرکەوتنی ستەمگەری عەباسی لە بەغدا جەختی لەسەر ئەم قەیرانەی شیعەی عێراق دەکردەوە، ئەم کارەش لەگەڵ باڵاکردنی عێراق لە جیهانی ئیسلامو لەنێوعەرەبەکاندا هاوزەمان بو. لەلایەکی دی، سـونەکانی عێراق کە زۆرترین سـودیان لەو باڵاکردنە وەرگـرت، چوارچێوەیەکـی مەرجەعی سروشـتیان هەبو کە لە دەوریدا ناسـنامەی تایبەتیان فۆرمی خۆی وەردەگرت، ئەوەش هەمان ئەو چوارچێوەیە بو کە کەم تا زۆر لەگەڵ ناسنامەی عەرەبی سوریادا یەکسانو هاوزەمان بو.

شیعەکان بەدرێژایی کات بەیادهێنانەوەی حەکایەتی یەکەم (حەقانییەتی خەلافەتی ئیمام)، حوکمڕانی سـەردەمەکەیان رەتدەکەنەوە. لەڕووی مەبدەئییشەوە ئەو نەرمییە (دونیاییە) تەقلیدییەی لە سونەکاندا هەیە لە شیعەدا بوونی نیە. شیعە لە بری سیستمی خەلافەت هەروەکو لە تایفەی سـونیدا دەبینرێ، سیستمی ئیمامیزمی میراتیان تەبەنی کـرد، ئەوەش ئیمامی پیرۆزی بێهەڵەیە کە رەچەڵەکی دەچێتەوە سـەر عەلی. گروپە جۆراوجۆرەکانی شـیعە چاوەڕوانی گەڕانەوەی دوا ئیمـام دەکەن ـ وەك گەڕانەوەی مەسـیح ـ تا جیهان پڕ لە دادپەروەری بکات. شیعە لە پاڵ ئەوەی هیچ بەرنامەیەکی پراکتیکیان بـۆ حوکمڕانی نەبو، کەوتنە بژارکردنو پاککردنەوەی ژمارەیەك چەمکی ئایینیو ئامۆژگاری ئەخلاقی کە پەیوەندی بەسیاسەتەوە هەبو، هەروەها رکەبەرایەتیو نکۆڵیـان لـە پرەنسـیپە ئەخلاقییەکان دەکرد، بـەوەی بنەمایەکـی بابەتیان هەبێتو دەستیان بە یاخیبون کرد (پرسەی موحەڕەم، زنجیرلێدانو شەهادەت).

ئەو نزیکبونەوە یا دڵخوازیەی عەرەبی شـیعە بەرامبـەر بە ئێران هەیەتی (لە ئێراندا هێندێك شوێنی پیرۆز هەیە)، پێچەوانەی نەریتی سونەیە کە دوژمنایەتی لەگەڵ ئێراندا رەگوریشـەیەکی قوڵی هەیە، خۆی لە خۆیدا نیشـانەی ئەوەیە کە شیعەو پانعەرەبیزم دانویان پێکەوە ناکوڵێت.



هەڵبەتە شـیعەو سـونەکانی عێراق هیچ هۆو پاسـاوێك بۆ ئەو جیاوازییەی نێوانیان نابینن. هەر دوو ئایینزاکە هەمیشـە لە چوارچێوەیەکی سیاسـی کە رەگوریشەیەکی پڕ لە نامتمانەیی هەیە، خۆیان قەتیس کردووەو سـەرچاوەی ئەم پرسیارەشـە: من کێم؟ سەبارەت بەشیعەی عێراق، پانعەرەبیزمو سونە دوو شتن پێکەوە گرێدراونو لەیەکتری جیانابنەوە، رێك وەکئەوەی مەسیحییەکی عەرەبیزمان، پانعەرەبیزمو ئیسلام وەك دوو شـتی لێك جیانەکراوە دەبینێ. لەلایەکی دی، عەلەوییەکی سـوری شیعە مەزهەب کە ئێسـتا لە پاریزگای لازقییە ژیان بەسـەر دەبات، کاتێك روبەڕوی تورکێکی سونە دەبێتەوە، عروبەیی خۆی بۆ ئیسلام دەگێڕێتەوە، نەك بۆ ئاینزای سونە.

یەکەمیـن ئەزمونی پانعەرەبیزم لە عێراقـدا خاڵی گۆڕانو دووبەرەکی بو. عێراق لە مەسەلەی پانعەرەبیزمدا پێشـەنگ نەبووەو لەماوەی سەدەی نۆزدەهەمدا بەشدارییەکی ئەوتۆیشـی لە سەرهەڵدانی پانعەرەبیزمدا نەبوە. یاداشـتەکانی حوسەری شایەتی ئەو راستییەن کە لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستدا خەڵکی عێراق بە فیکری پانعەرەبیزم نامۆبون. لەو ماوەیەشـدا بەرجەسـتەترین پێشـەنگی پانعەرەبیزم لە عێراقدا کەسێکی سـوری بو. کاتێك فەیسـەڵ لە بیستەکاندا لە دیمەشق دەرکراو بوە پاشای عێراق لە دەرفەتێکی مێژوویی (سودوەرگرتن لە ناسیونالیزمی سوری) بێبەش بو. عێراق بەتەنها لە سوریا دواکەوتوتر نەبو، بەڵکو پێکهاتەی رەگەزیو ئایینی لەگەڵ پرۆژەی پانعەرەبیزم دژو ناکـۆك بـو. هەر چەندە گروپـی هەمەرەنگ لە هـەر دوو وڵاتەکـەدا دەژیان، بەڵام ئاوێتەیەکی جوداو جیاواز بون. عێراق سـاڵی ١٩٣٢ لەدوای سـەربەخۆیی لە ٢١٪ عەرەبی سـونەو ١٤٪ کوردو ٥٣٪ عەرەبی شـیعەو ٥٪ کەمایەتی ناموسڵمانی عەرەبیزمانو ٦٪ گروپە زمانییەکانی دی پێکهاتبو. بەڵام سـوریا لە چلەکانی سەدەی بیسـتەمدا لە ٥٧٪ عەرەبی سونەو ٨٪ کوردو ٢٪ عەرەبی شیعەو ئیسماعیلیو ١٢٪ عەرەبی عەلەویو ٣٪ دروزو ٩٪ کەمایەتی ناموسـڵمانی عەرەبیزمانو ٩٪ کەمایەتی زمـانو رەگەزیـی پێکهاتبو[56]. ئەم دابەشـکردنە جەختی هەرێمایەتی یا پیشـەیی یا شارسـتانیمان بۆ ئاشـکرا ناکات کە بتوانێت کاریگەری لەسـەر دەسەڵاتی سیاسیدا

هەبێــت. هەروەها ئامــاژە بەکاریگەری پارچــە پارچەبونی شارســتانیش ناکات، بۆ نمونە کۆچکردنی گوندنشــینەکان بۆ شارەکانو نیشتەجێ کردنی خێڵەکان (ساڵی ١٨٦٧ بــە ٣٥.٪ی کۆی دانیشــتوان دەخەملێنراو ســاڵی ١٩٤٧ بــۆ ٥.٪ کەمبویەوە) [57]. کاریگەری ئەمجۆرە گۆڕانکارییە لە بیرەگوریشەیی دانیشتوانو کێشی سیاسەت مژدەبەخشــێکی زۆر زیادە. بەڵام بەهەر حاڵ ئەو دەر سەدانە نیشانەی بارودۆخێکی قوڵــی ناتەبایی کۆمەڵگەی عێــراق بو بە بەراورد لەگەڵ ســوریادا بۆ ئەوەی ببێت بە سەرقافڵەی نپانعەرەبیزم.

زۆرێــك لــە توندوتیژییــە سیاســیەکانی عێراقی هاوچــەرخ، بۆ ناکۆکــی ئامانجە سیاســییەکانو دابەشــبونی مەزهەبــی کۆمەڵگەی عێراق دەگەڕێتەوە. ســاڵی ١٩٣٢ لەتوانادا بو راڤەی ئەوە بکرێ کە پێنج یەکی دانیشتوانی عێراق بەکەڵکی پێگەیەکی کۆمەڵایەتــی پانعەرەبیزم دێن، چونکە عروبە هاوماناى کۆنترۆڵو هەژمونی کەمایەتی سونە بو بەسەر کوردو شیعەو ناموسڵمانەکانو هەوڵو کۆششی ئەو کەمایەتییە بو، تا دواجار زۆرینەیەکی باش بۆ خۆی دابین بکات.

لێبوردەیی‌و هەستیاری فەیسەڵ بەرامبەر بەم مەسەلە دژوارە دەیخاتە خانەی توێژێکی پانعەرەبیزمــەوە کە لەگەڵ هەمو توێژە پانعەرەبیزمەکانی ســوریاو عێراق جیاواز بێت. سیاســەتو شکســتی فەیســەڵ (لە پاڵ ماوەی ١٩٣٦ ـ ١٩٤١) دەکرێ بدرێتە پاڵ نەگونجاوی هاوســەنگی مەزهەبی هەر پرۆژەیەکــی نەتەوەیی عەرەبی، ئیدی گرنگ نیــە چەند نەرم (هەروەکو حاڵەتی فەیســەڵ)، یا چەند زبــر بێت (هەروەکو حاڵەتی کۆتایی سییەکان).

یەکەمیــن ئەزمونــی پانعەرەبیــزم لــە عێراقــدا (١٩٣٦ ـ ١٩٤١) جەخت لەســەر پەیوەنــدی مێژوویی نێوان پانعەرەبیزمو مەزهەبی ســونە دەکاتەوە. هەمو دەوڵەتمەدارە ناودارو ئەفســەرەکان ســونە مەزهەب بون[58]. سەرکردەی شیعە تەنها لە کابینەکەی فەیســەڵو گروپی ئەهلی‌و حیزبی شــیوعی عێراق ئامادەگیان هەبو. خودی رەشــید عالــی لــە بنەماڵەی گەیلانی لە ســاداتەکان بــو، بەرەچەڵەك بۆ پێغەمبەری ئیســلام



دەگەرێتەوەو یەکێکە لە بنەماڵە نێودارەکانی ســونەی عێراق. کابینەی رەشــید عالی نمونەیەکــی بەرچاوی لایەنگری پانعەرەبیزم بو کە لە رووداوەکانی نیســان ـ مایســی ١٩٤١دا حوکمی عێراقی کرد. رەشید عالی‌و موفتی ئەعزەم حاج ئەمین ئەلحوسەینی کــە نزیکتریــن یاریدەری بــو، لەگەڵ هەر چــوار جەنەراڵەکەی کابینەکەی ســونی مەزهەبون. لە راستیدا چ شتێك لەمە باشتر پەیوەندی ئەهلی سونە لەگەڵ پانعەرەبیزم دەردەخات؟

بەعس لە ئەزمونی پانعەرەبیزمدا ســەبارەت بە شکســتی فەیســەڵ، رۆڵی ســوپاو ســودوەرگرتن لە دژایەتی کردنی ئیمپریالیزم، هەروەکو لە مەســەلەی ئاشــورییەکاندا روویدا، وانەی پراکتیکی فێربو. عــەفلــەق بە مەبەســتی چارەسەرکردنی ئەو کێشانە گەڕایەوە بۆ پرەنســیپێکی گشــتی کە مۆڵەتی بە توندوتیــژی دەدا، ئەو توندوتیژییەی بەعس بانگەوازی بۆ دەکرد لە ئەخلاقی راستەقینەیانەوە سەرچاوەی دەگرت، هەروەها سیاســەتی تایفی بەعس لە نەتەوەگەرای عەرەبییانەوە چەکەرەی دەکردو کاریگەری لەســەر کەمایەتییە ناموسڵمانەکانی ســوریاو عێراقو بەتایبەتیش موسڵمانەکانی عێراق هەبو. لە ســاڵانی چلەکاندا حیزبی بەعس زۆر بەراشــکاوی قسەی لەسەر تایفییەتی خۆی دەکردو نەیدەشــاردەوە. کاتێك حیزبی بەعس بەدەســەڵات گەیشت لەجیاتی ئــەوەی رێبەرایەتی بەرفراوانــی عەرەبی لە توێژە جۆراوجۆرەکانــی کۆمەڵگە بکات، تەنها تایفەیەك یا گروپی تایفەیەك دەســەڵاتی گرتەدەســت (دەســتەیەکی تکریتی لە عێراقو توێژێك ئەفسەری عەلەوی لە سوریا). زۆربەی نوسینەکانی عــەفلــەق لەسەر پەیوەندی گشــتی پانعەرەبیزمو ئیســلام چڕدەبووەوە بەدەگمــەنو لەماوەی جیاوازدا بــەرەو تایفییەت دەرۆیشــت، ئەویش لەژێر ناوی ســتەمگەری رەهــای ئەخلاقی کە لەســەرجەم ئاینو مەزهەبەکاندا خاڵی هاوبەشیان هەبو. لێرەدا بەکەسایەتی دوو فاقی عــەفلــەق ئاشنا دەبین: ئەو توانی بۆ عەرەبی روونبکاتەوە کە چۆن دەکرێ حیزبێك بــە هەڵگرتنی ئاینی جەماوەری وەك خاڵێکی ســەرەکی یا خاڵی دەســپێکی خۆی، بانگەشەی دژە تایفی بکاتو لە هەمان کاتدا هەڵگری سیاسەتی تایفیش بێت.

## شعوبیەت:

سیاسەتی مەزهەبی بەعسیەکان لە بەکارهێنانی چەمکی بێوێنەی عەرەبی بەرجەستە دەبێ کە ئەستەمە وەربگێردرێت، ئەویش شعوبییە. زۆرێك لە پانعەرەبیزمکان، بەساتع حوسەریشەوە، ئەم وشە نەگونجاوەیان بەکارهێناوە[59]. بیرۆکەی شعوبییەت رەگوریشەی لە مێژووی عەرەبی ـ ئیسلامی دا هەیە: رقو کینەی رەگەزیو ئاڵۆزییەکی نهێنیئامێزو نادیار نیشاندەدا. بەتەنها ناوهێنانی هەمو قەومەچییەکی عەرەبی والێدەکات کە بەگومانو دردونگیی دەورەدراوە. ئەگەر نەتەوەگەرای عەرەبی شەوکەتو عەفلەق بەراورد بکەین، ئەوا دەکرێ لەخانەی "رقو کینە"وە، نەك "عیشقو خۆشەویستی" زۆر بەباشی گوزارشت لە سیاسەتی مەزهەبی بەعس بکرێ.

هەر یەك لە عەفلەقو ئارسۆزی شعوبییەتیان بە دەسەڵاتی بیانی دەزانی لە نێو جەستەی عروبەدا[60]. بەعسیەکان ئەم دەستەواژەیان لە ساڵانی چلەکاندا زۆر بەچڕی لەدژی شیوعییەکان بەکاردەهێنا. نوسینگەی حیزبی بەعس لە یەکی ئایاری ١٩٤٥دا بەیانێکی دەرکرد بەناوی "حیزبی شیوعی مەتەرێزی شعوبییەتو زۆرنا ژەنی بیانی" کە تێیدا هاتوە:

"سەرکەوتنەکانی روسیا جارێکی دی رقو کینە لە چاڵنراوەکانی پاشماوەی شعوبییەتی زیندوکردەوە، بۆ ئەوەی لە دیمەشق بەرەنگاری هەستی عەرەبی ببنەوە (ئاماژەیە بەو فیستیڤاڵەی کەلەلایەن حیزبی شیوعی سوریاوە سازکرابو). ئەوانە لە کۆڕو کۆبونەوەو چاوپێکەوتنەکانیاندا ئاهەنگ بۆ سەرکەوتنی بیانی دەگێڕنو بەچڕینی گۆرانی ئەرمەنی کۆتایی پێدەهێنن.. حیزبی شیوعی تاکە حیزب بو کە ئازایەتی ئەوەی نواند بەڕاشکاوی داوای دۆستایەتی لەگەڵ ئیمپریالیزمدا بکاتو ئامادە بو لە پێناوی خۆشەویستیاندا قوربانی بداتو لە خزمەتیاندا بێتو ستایشی



قارەمانەکانیان بکاتو دان بەپرەنسیپو سەرکەوتنەکانیاندا بنێتو هەمو ئەوانەشی بە پاساوی یەکسانی نێوان نەتەوەکان ئەنجام دەدا. شیوعییەکان جیاوازی وەهمی لەنێوان دەوڵەتە ئیمپریالیو هاوڵاتییەکانیان دەخولقێننو هاوڵاتییەکانیان لە هەمو تاوانی دەوڵەتە ئیمپریالییەکانیان پاك دەکەنەوەو بەبێ گوناح لە قەڵەمیان دەدەن، بەو شێوەیە شیوعییەکان کارێك دەکەن تەنانەت کۆنەپەرستە بێرەوشتو خائینەکانیش، ئەوانەی نۆکەری بیانی بون، ئازایەتیو بوێری ئەوەیان تیانەبو ئەنجامی بدەن. ئەوانە لەسەر خاکی سوریای عەرەبی ئاهەنگ بۆ رۆژی نیشتمانی فەرەنسا (١٤ تەموز) دەگێڕن، ئەو خاکەی هێشتا ئەو خوێنەی سەری وشك نەبۆتەوە کە ستەمکارو چەوسێنەرەکانی فەرەنسا رشتویانە. حیزبی شیوعی نوێترین ئامرازە بۆ ئەوەی کەمایەتیە رەگەزیو مەزهەبییەکان لە بەرەیەکی گشتیدا کۆبکاتەوە تا شانبەشانی ئیمپریالیزمی ئەوروپی لەدژی ناسیونالیزمی عەرەبیدا بوەستنەوە"[61].

بەڵام ناسیونالیستە عەرەبە عێراقییەکان لە هەمو بەعسیەکانی دی، دڵخۆشو شەیدای بەکارهێنانی ئەم وشەیە بون. عەبدولعەزیز ئەلدوری، سەرۆکی زانکۆی بەغداو بەناوبانگترینو شایستەترین مێژوونوسی عێراقی، ساڵی ١٩٦٢ کتێبێکی بەناوی "رەگوریشە مێژووییەکانی شعوبییەت" نوسیوە کە بەسەرچاوەیەکی ئایدیۆلۆجی دادەنرێت. هەر چەندە بەرووکەش ئەو کتێبە هەوڵێکی ئەکادیمی تایبەت بە روداوەکانی رۆژگارە سەرەتاییەکانی مێژووی عەرەب ـ ئیسلام بو، بەڵام ئەلدوری لە پێشەکی کتێبەکەیدا ئەوە روونەدەکاتەوە کە هۆی ئەنگیزەی نوسینەکەی: "لەم رۆژانەدا دەنگۆیەك پەلاماری وشیاری عەرەبیو چەمکی نەتەوەی عەرەب دەداو لەژێر ناوی رەگەزپەرستیو هەرێمایەتیدا ئاژاوەو پشێوی دەنێتەوە"[62]. ئەو ئەنگیزەیەش لەسەر هەمان جیهانبینی مەزهەبی سونە بونیاتنرابو کە پێشتر باسمان لێوەکردوە. پوختەی نەفرەت لە کولتوری پانعەرەبیزمی سونە بەشێوەیەکی راستەوخۆ ئاراستەی سیاسەتی مەزهەبی دەکرێ. ئاشکرایە شعوبییەت سود یا قازانجێکی کەمی لەو بەشە عەرەبیانە هەیە کە هەڕەشە بۆ سەر ئەو ئاوێتە مەزهەبییەی سونە تێیدا باڵادەستە

دروست ناکات، بۆیە عێراقییەکان شەیدایيەکی بێوێنەیان بەو چەمکە هەیەو لەلایەن ئەلدورییشەوە دانپیانراوە.

شعوبیەت چیەو شعوبییەکان کێ بون؟ ئەلدوری دەڵێت، "بزوتنەوە"یەکی سیاسی بو لە گروپی رەگەزی جوداجوداو لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیدا بوونی هەبو، نەفرەت کردنیان لە عەرەب خاڵی هاوبەشی نێوانیان بو[63]. ئەم بزوتنەوەیە لەجیهانی فیکرەوە دەستی پێکردو بەجلوبەرگی ئیسلامەوە خۆی نمایشدەکرد، ئیسلامی سەرەتای لەدژی عەرەب بەکاردەهێناو پشتیان بەقورعانو یەکسانی نێوان هەمو موسڵمانان دەبەست. دواتر ئەم بزوتنەوەیە سروشی غەیرە عەرەبیو تەنانەت نائیسلامییەکانی (بەنزیکەیی هەمیشە فارسی بو) ئاشکرا کرد. لێکچونی نێوان "بەکارهێنانی" بیرۆکەی یەکسانی نێوان مۆسڵمانان وەك چەکێك لەدژی عەرەبو بانگەوازی دوای سیازدە سەدە بۆ "دۆستایەتی لەگەڵ هاوڵاتیانی وڵاتە ئیمپریالیستەکان بەبیانوی یەکسانی نەتەوەکان، هەرگیز لەلایەن ناسیونالیستی عەرەبییەوە ملی بۆ نەدرا. بەهەر حاڵ کێشەکە هەروەکو ئەلدوری بەشێوەیەکی نادیار دانپیادەنێت، ئەو بزوتنەوەیە لەسەردەمی ئەمەویدا لەلایەن عەرەبەوە بەتوندی پشتیوانی لێدەکرا[64].

تا بزوتنەوەی پانعەرەبیزم پەرگیرتر بێت، روخساری ئیمانی شعوبیەت بە ئیسلام "رۆشنتر" دەردەکەوێت، تا عەرەب لەگەڵ بنەمای دیاردەکە کەمتر کاربکەن، رەگوریشەی بزوتنەوە لەزەیندا قوڵتر دەبێتەوە. ئەلدوری نمونەی ماقوڵییەتو لۆجیکە گەر لەگەڵ نوسەری بەعسی عێراقی عەبدولهادی ئەلفوکەیکی بەراورد بکرێ، چونکە ئەلفوکەیکی لەو بڕوایەدا بو کە تۆی شعوبییەت لەمێژووی پێش ئیسلامدا بۆ "ململانێی نێوان عەرەب ـ فارس" دەگەڕێتەوە (ئەگەر خوێنەر لەیادی بێت فازیل بەراك مێژووی ئەم بزوتنەوەیە بۆ ساڵی ٥٣٩ پێش زاینی دەگێڕێتەوە "داگیرکردنی بابل لەلایەن کۆرشی شای ئێران"، بڕوانە بەشی یەکەم). لە یەکەمین دەوڵەتی ئیسلامیدا ئەم تۆیە بوە "ماری نەفرەتو رقوکینەی شعوبییەتو ژەهری دەڕشت. بەڵام لە ژێرەوە بە ئاینی باوباپیرانیانەوە نوسابو". زەردەشتی (ئاگرپەرست)، مەزدایی،



مانۆیی (لە ئاینە ئێرانییەکانی پێش ئیسلام بون)، سەرەتاو پێشینەی هەمو شکڵەکانی زەندیقی بون (بیرکردنەوەی یا ئەوەی لەسەردەمی ئیسلامی کۆندا پێی دەوترا تەوژمی بێبڕواکان ـ ملحد). ئەوانە عێراق وەك بنکەیەك هەڵدەبژێرن تا بتوانن بەفروفێڵی رێکخستن لە سوریاو ناوچەکانی دی بڵاوببنەوە. لەسەردەمی ئەمەویدا شعوبییەکان "کۆمەڵەی نهێنیان" دروستکرد، پاشان جەنگێکی نیمچە شاراوە لەنێوان عروبەو شعوبیەت دەستی پێکرد. یەکێك لەلایەنە سەرنج راکێشەکانی ئەلفوکەیکی ئەوەیە کە ناوەرۆکی ئەو جەنگو تێکۆشانە "بیرۆکەی پانعەرەبیزمی روونترکردو قوڵایی بە وشیاری عەرەبی بەخشیو رێگەی دا تیورەی عروبە بەرجەستە بێت"[65]. لەو دەمەوە تا هەنوکە شعوبییەت تەنها لە رێگەی حیزبە شیوعییەکانەوە بە لوتکەی دەسکەوتەکانی خۆی گەیشت.

پانعەرەبیزمەکان دژی ئەو بۆچونە نین کە پێیوایە عروبە لەدوای فەتحەکانی ئیسلامەوە، لەسەر بنەمای رەگەزی پێناسە ناکرێ یا ئەوەی ئاماژە بە نەژادی بێگەردی عەرەب بکرێ. ئەمەش لەبەر رۆشنایی "مێژووی" ئەلدوریو ئەلفوکەیکی، دەرگای ئەگەرەکان دەخاتە سەر پشت. ئایا شعوبییەکانی سەرەتا ئیسلام کە بەزمانی عەرەبی دەدوانو ئیسلامیان کردبو بەئاینی خۆیان، عەرەب بون یا نا؟ ئایا ئیمانەکەیان ساختە بو؟ چۆن دەکرێ "تایفەیەك" یا "بزوتنەوەیەك" دروست بێت کە لە گروپگەلێکی جیاواز پێکهاتبێتو لەسەرتاسەری جیهانی ئیسلامدا بڵاوبێتەوە، تەنها نەفرەتکردنیان لە عەرەب خاڵی هاوبەشی نێوانیان بێت؟ لەرووی ئایدیۆلۆجییەوە دەشێت شعوبییەت وەك فیکرەیەك لێی تێبگەین کە لە هەر شوێنێك عەرەبو عروبە هەبێت ئەویش دادەهێنرێت، ئەوەش بیرۆکەی دوژمنێکی ناوخۆ بو لە لەناخی بەکرێگیراوێکی فێڵبازی دوژمنکار، دوژمنێك کە هەمیشە سازو ئامادەیەو بەهۆکاری دوژمنکاری دەرەکی دەژمێردرێت، بۆ ئەوەی ئیمانداران لەراستی بیروباوەرەکەیان دڵنیابن، بوونی پێویست بو. لە ئاینەکاندا هەمیشە خوداوەند شانبەشانی ئەهریمەن ئامادەگی هەیە. هیچ ئاینێك ئامراز یا شێوازێکی دی نەدۆزیوەتەوە.

هەروەکو چۆن شعوبییە کۆنەکان بەتەنها فارس نەبون، ئەوا ئەمڕۆش شعوبیەکانی عێراق لە کۆمۆنیستو کەمایەتیو شیعەکان پێکهاتون. بەڵام بەپێی پێناسە هیچ یەکێکیان بەتەنها شعوبی نینو هەر یەکەشیان دەتوانێت شعوبی بێت. بەگشتی فیکری پانعەرەبیزم پێویستیان بەپرەنسیپی شەیتانی نیە کە وەك بیروباوەری رەهای ئەوان لە خەرمانەی ئاڵۆزیو تەمتوماندا بمێنێتەوە، لەجیاتی ئەوە پشت بە ئاماژەو شانازی دەبەستن.

نمونەیەکی دیاری ئەو خاڵەش وتارێکی عەفلەقە بەناوی "ئێمەو دوژمنان"، کە تێیدا ستایشی "ئێمە" دەکاتو نەفرەتو دژایەتی "دوژمنان" دەکات، بەڵام عەفلەق ئەوە بەزمانی تایبەتو دوو فاقی خۆی راڤە دەکات[66]. هیچ یەکێك لەو دوو دژەی بەوردی دیارینەکردوە، وەکئەوەی عەفلەق بڕیاری دابێت هەستو سۆزی لەتلەت بێت، بەڵام بەو مەرجەی ئاڵۆزی گوزارەکانی کە دەیئاخنییە وتارەکانییەوە، لە ویژدانی نادیاردا بمێنێتەوە. خوێنەر واهەستدەکات عەفلەق وردەکاری زمان دەکاتە قوربانی نادیاری ئەو بابەتەی باسی دەکات، تا هەستو سۆزی ئەنگیزەکراو بەرەو سیاسەت پەلکێش بکات. لە دوەم حوکمڕانی بەعسدا هەمان زمانی عەفلەق لە دەزگاکانی راگەیاندنی عێراقدا بە شێوەیەکی سیستماتیکی بەکاردەهێنرا.

## رێکخستن

"لەم هەلومەرجەی ئێستای نەتەوەی عەرەبیدا پێویستیمان بەحیزبو بزوتنەوەیەك هەیە کە پێش هەمو شتێك نوێنەرایەتی رەگەزی رۆح بکات... حیزبی راستەقینە، ئەو حیزبە هاوچەرخەیە کە پەیامەکەی لەبەرژەوەندی ئەمرۆی نەتەوەی عەرەبدا بێت، ئەو حیزبە ئامانجی دەکاتە لەدایك بونی میلەتەکەی، بەمەرجێك ئەو وەسفە لەپێشدا لەناخی خۆیدا بێتەدی. بەوتەیەکی دی، پێویستە حیزب



کۆپییەکی بچوککراوی شەفادیدەی (معافاه) نەتەوەیەکی باڵا بێت کە دەیەوێت زیندوییکاتەوە"[67].

میلەت لە حاڵەتی شەکڵگرتندا لە رۆحی رابونی عەرەبییەوە سەرچاوە دەگرێو لەڕێگەی "نەوەی نوێ"یەوە رێبەری دەکرێ، تا لە چوارچێوەی مەزنی سیاسی سەدەی بیستەمەوە، واتە رێکخستنی حیزب، بە تەواوەتی فۆرمی خۆی وەربگرێت. لەسەرووی ئەوەشەوە، ئەو نەتەوە یەکگرتوەی پێویستە دروست بکرێ، لە ئێستادا بەتەنها لە جەستەی حیزبدا پێکدێت. بۆیە بەعس لەوە تێدەگەیشت ئەگەر بیەوێت توندوتیژی کارا بێت، پێویستی بەرێکخستنێکی کۆمەڵایەتی هەیە. ئەو بیرۆکە بەڵگەنەویستو سەرەکییەی بەعس بەئەنجامی ترسناکی دەگەیەنێت، هەروەکو ئەمرۆی بەعس پێی جیادەکرێتەوە. نەك ئایدیۆلۆجیا بەتەنها، بەڵکو رێکخستن لە خزمەت ئایدیۆلۆجیادا، تاکە شێوازێکی زیندوە بۆ ئەفراندنی هاوڵاتی نوێ. درزو کەلەبەر رێکخستنی حیزب لە کۆمەڵگەی دەوروبەری جیادەکاتەوە. حیزب بەگوێرەی گۆشەگیریی لە باقی کۆمەڵگەو لەقوڵایی سەرچاوەی زاتی خۆیەوەو بەپشت پێبەستنی، دەبێ "نیشتمان ببێتە شۆڕش، پێشئەوەی شۆڕشی نیشتمان بێتەدی"[68].

بیرۆکەی یەکگرتو لەم چەمکە حیزبیەدا، بریتیە لە فیکری داتەپینو بۆگەنی ئەو ژینگەیەی حیزب چالاکی تێیدا دەنوێنێت. عەفلەق لە نمایشکردنی تیورەی بەعس، لەسەر رێکخستن، ئەو پرەنسیپە ئەخلاقیانەی پێویستی پێی هەبو تا لەنێو ئەندامانی حیزبدا بیچەسپێنێت، لەبەرامبەر زۆلکاوی ریسوایی جیهانی "نەخۆشی" دەرەوە، پێشێل کرد. عەفلەق دەڵێت حیزب لەکاتی شۆڕشدا لە "رێگەی بنەماو خاڵی لاوازو دەسەڵاتو قەڵای نێو واقعێکی پڕ لە گەندەڵیو کەمتەرخەمیو دواکەوتنو نەزانیو ناجێگیرەوە پەیوەندی بە کۆمەڵگەوە بەستوە. بۆیە ناوی قەڵای لێدەنێت تا جەخت بکاتەوە لەسەر ئەوەی پێویستە حیزب بەهێز بێتو گەندەڵیو دوژمنانی دەرەکی نابوت بکات"[69]، بەوتەیەکی دی، دورگەکانی بەعس کە بەخەباتێکی راستەوخۆی بێوچان دەناسرێتەوە، خەڵکی لەو شێواندنە سەیرەی تێیکەوتون، دەپارێزێت.

دەوڵەت لەدیدی بەعسدا تەنها ئامرازێکی یاریدەدەرەو هیچی دی، "جەستەیەکی بێرۆحە"[70]، لەسەرووی ئەوەشەوە، "لە بزوتنەوەی شۆڕشگێریدا خێرایی رۆڵی دڵ وازیدەکات"[71]. بۆیە هیچ پەیوەندییەك لەنێوان قەوارەی حیزبو ئامانجی شۆڕشگێرێتیدا نیە، هەروەکو لە چەمکی شۆڕشگێڕێتی مارکسیزمدا هاتوە. عەفلەق ساڵی ١٩٥٥ دەنوسێت، خەسڵەتی قۆناغی شۆڕشگێری لە ژیانی نەتەوەدا بریتیە لەوەی کە رێبەرایەتی بەدەستی کەمایەتییەکی روناکبیرەوە بێت، "کەمایەتییەك نوێنەرایەتی خەڵکی دەکات، تەنانەت پێشئەوەی خەڵکی بە ئاشکرا بەنوێنەری خۆیانیان بزانن"[72]. لەسەرەتای سالآنی چلەکانداو تەنانەت پێشئەوەی حیزبیش دروست بێت، عەفلەق وتویەتی دەشێت میلەت بۆ تاکە کەسێك بچوك بکرێتەوە کە ئەویش کەسایەتی رێبەرە. لەسەرجەم نوسینەکانی عەفلەقدا دەربارەی حیزب، پرەنسیپی چالاکی رێکخراو ـ پرەنسیپێکە بە مەبەستی هاتنەدی ئامانجی سیاسی بانگەشەی بەکارهێنانی هێز دەکات ـ بە بنەمای شوناسی تاكو نەتەوە دادەنێت. بۆیە ناروونی "پەیامی" نەتەوایەتی عەرەب بەشێوەیەکی ساویلکانە دارێژرا.

"چۆن دەتوانین تاکەکانی نەتەوەیەك یەکبخەینەوە کە بەهۆی خۆپەرستی، بەرژەوەندی تاکەکەسی، تەسلیم بون بەفروفێڵو جیاوازی پروپوچ، نەفرەت لەیەکتر کردنو بێمانای ژیانی مادی، لەیەکتری جیابونەتەوە؟ ئەگەر لە رێگەی رێبازی تێکۆشانی پڕ لە هەورازو نشێودا هەمو تاکێك ناچار نەکرێ بگەرێتەوە بۆ خودی خۆیو بەقوڵایی ناخی خۆیدا رۆنەچێتو لەدوای ئەزمونێکی پڕ لە ئێشوئازارو کوێرەوەری ناخی خۆی ئاشکرا نەکات.. چۆن دەتوانین جارێکی دی نەتەوەیەکی یەکگرتو بەدیبهێنین؟ تەنها لەو کاتەشدا یەکێتییەکی راستەقینە بەدیدەهێنین، ئەمەش شێوازێکی تازەی یەکێتییە کە جیاوازی لەگەڵ یەکێتی سیاسیدا هەیە، چونکە یەکێتی رۆح لەنێو تاکەکانی نەتەوەدا دەخولقێنێت"[73].

گرنگ نیە چۆن لێڵی ئایدیالی لە واقیعدا یا لەکاتی پیادەکردنیدا دەبێتە یەکێتی یا چۆن بە قوڵی لێی دەڕوانرێ، کەچی لەناکاوو لە چوارچێوەی رێکخستنی حیزبدا



هەمان ئایدیال دەبێتە واقیعو لە شێوەی کارێکی جیدیدا دەردەکەوێت. ئەندامی حیزب کەلەپچەو ناچاردەکرێ، خۆی بۆ ئامانجی عروبە تەرخان بکات[74]. هەروەکو لە وتارێکی دیدا وەسفی دەکات کە چۆن هەستی لادەرانەی شوناسی تاك لەنێو رێکخستنی سیاسیدا شکڵی خۆی وەردەگرێتەوە. سودوەرگرتنی عەفلەق لە جیاکاری نێوان "تاك"و "مرۆڤ" لە ئێستادا روونەدەبێتەوە. حیزب لەسەر تاك کار دەکات، نەك لەسەر بیرۆکەی تێگەیشتن لە مرۆڤایەتیو تەنها سەرچاوەی حیزب لە "قوڵایی" تاکە چالاکە رۆح گومبوەکانەوە هەڵدەهێنجرێتو بۆ هێزێکی مەزنی خۆیی دەیگۆڕێت.

کاتێك حیزب، نەك کۆمەڵگە دەبێتە چوارچێوە یا کوانوی دروست بونی نەتەوە، پیرۆزیی یەکێتی عەرەبی گرنگی خۆی لە دەستدەداو چیدی حەقیقەت ناتوانێت بەربەست دروست بکات. یەکێتی عەرەبی هەر لە بنەرەتەوە لە شکڵی واقع یا حەقیقەتی حیزبدا بوونی هەیەو تەنها شتێك کە دەبێ بکرێ ئەوەیە بۆ گشت کۆمەڵگەی دابەزێت تا لەوێشەوە بە سەرلەبەری نەتەوە بگات. ناعەقڵانییەت لەشێوەی عەقڵانیەتی گەشەکردنی چەندایەتی حیزب گۆڕانی بەسەردا هاتوە، ئەم حیزبەش شتێك بۆ کۆمەڵگە بەدەست دەهێنێت کە خودی کۆمەڵگە ناتوانێت بەدەستی بهێنێت.

پرۆسەی باوەڕکردنو ئیمان هاوڕایە لەگەڵ بڕیاری لەبیرچونەوەی بڕیاردان لەسەر ئیمانداری. رێکخستنی حیزب ئەم لۆجیکە قۆناغێکی یەکلاکەرەوەی دی دەباتە پێشەوە، واتە ئیمانو باوەڕ لە دابو نەریتدا چارەسەر دەکات. لە دەستدانی دەسەڵاتو توانای رەخنەگرتن، زۆر بەسادەیی لە ئاکامی ئیمانەوە نیە، بەڵکو حاڵەتێکی پێویستە بۆ ئەوەی ئیمان بەجیدی وەربگیرێت، سەرەتا بەشێوەیەکی رۆتینی لە حیزب، پاشان لە هەمو کۆمەڵگە، تا ئەو ئاستەی کۆمەڵگە لەسەر هەمان بنەما رێکدەخرێ. دواجار ئەم رۆتینەش لەلای خۆیەوە پێویستیی ئیمانی پڕجۆشو خرۆش لەنێو دەباتو چیدی پێویست بەوە ناکات تاك ئیمانی بەوەبێت کە حیزبو یەکێتی عەرەبی یەك شتن.

دەرئەنجامی ئەوەش جەماوەرێکی ساویلکەو رەشبین دەبێت.

پەیوەندی وەهمیی گومڕای نێوان خەیاڵو واقیع لە فیکری بێوینەی تاکی بەعسدا "بوون لەرێگەی رێکخستنەوە" بنچو رەگی داکوتاوە. ئەم سیفەتە بۆقلەمونییەی کە هەمیشە لە گۆڕاندایە، بەنزیکەیی لەگەڵ هەمو گوتەو کردەوەکانی حیزبدایە، ئیدی چ لەدەسەڵاتدا بێت یا نا. رەنگە ئەمەش گرنگترینو گونجاوترین بەرگری بزوتنەوە بێت لەدژی جیهانی دەرەوە کە حیزب پڕ لە نەفرەتی دەکات. ئەگەر حیزبی بەعس روبەروی واقعێکی لە خۆی بەتواناتر بێتەوە، بۆ نمونە سەرکوتکردنی درندانەی ئۆپۆزیسیۆن یا شەڕی عێراق ـ ئێران، ئیدی لەو کاتەداو تەنها لەو کاتەدا حیزبی بەعس لە حاڵەتی داوەشانی ناوەکیدا خۆی دەبینێتەوە، بەڵام بەدەر لەوە لە هەر پێگەیەکی دەگمەنی دی حەقیقەتێك کە جێگەی هەرسکردن نەبێ لە فۆڕمی خەیاڵو وەهمدا لەلایەن خەڵکییەوە هەرس دەکرێ.

## پرەنسیپی رێبەرو رێکخستنی حیزب:

ئەو بیرۆکەیەی پێیوایە بەعسی عەفلەقو بەیتار بەنزیکەیی هەمیشە لەگەڵ رێبەری بە کۆمەڵ بوە، بیرۆکەیەکی هەڵەو نادروستە(75)، بەڵام ئەم بیرۆکەیە بنەما یا رەگوریشەیەکی ئەوتۆی هەیە کە شایانی تێڕوانینو لێوردبونەوەبێت. چاپی ١٩٧٤ لە پێناوی بەعسدا لەگەڵ چاپی ١٩٥٩دا جیاوازی هەیەو وتارو لاپەرەو پەرەگرافو رستەو گوزارەکانی بەشێوەیەکی سیستماتیکی لابراوە یا گۆڕانکاری تیاکراوە. پێشەکییەکەی نوسەر ئاماژەیەکی دروست بە بەشێکی کۆن بوی دەقی کتێبەکە دەکات "گوزارشتی نادروستی وەك بەکارهێنانی زاراوەی مارکسیزمو کۆمۆنیزم، ئەمە لە کاتێکدا مەبەست پیادەکردنی ستالینیزم یا بزوتنەوەی ناوچەیەکی کۆمۆنیزم بو"(76). لە راستیدا ئەوەی پێش هەمو شتێك بوە مایەی ئەو گۆڕانکاریانە حەزو



ئارەزوی بەعسیەکان بو لە نوسینەوەی مێژووی خۆیان، هەروەها جۆری پەیوەندیان بو لەگەڵ کۆمۆنیزمدا بەگشتیو حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهانی عەرەبی بەتایبەتی، بەڵام ئامانجی دوەمی پرۆسەی پیادەکردنی خودچاودێری کردن، شاردنەوەی حەزو ئارەزوی بایەخی سەرەتای عەفلەق بو سەبارەت بە فیکری فاشی ئەوروپی لەسەر رێبەرایەتی کردن:

"خەڵکی لە هەر کوێیەك بن ناتوانن بەخێرایی لە هیچ فیکرێکی راستەقینە تێبگەن. هەر لەبەر هەمان سۆنگەش چاودێری تاکی چالاكو زیندو دەکەن کە درك بەو فیکرە بکات. تەنها بەئاوڕدانەوە لەو تاکانەو لە مەودای شایستەبوونی ئەخلاقیو پەرۆشیان، پێوەری بەهای فیکرێك دەستنیشان دەکرێ. بۆیە ئەگەر گروپێك لە گەنجی خوێندەواری چالاكو بەڕەوشت لەسەر بنەمای میتۆدێکی توندوتیژو بە لەبەرچاو گرتنی زنجیرەی پلەبەندی، یەکێتییەك پێکبهێنن، خۆی لە خۆیدا بەسە بۆ ئەوەی دەسەڵاتیان بەسەر خەڵکیدا فەراهەم بێت. ئەو قودسییەتو پیرۆزییەی ئەو خەڵکانە بە رێبەرەکەیانی دەبەخشن، لەراستیدا پیرۆزی ئەو فیکرەیەیە کە خۆیان پاڵپشتی لێدەکەنو بڵاویدەکەنەوە. تا ئاستی کەسایەتی یا سیفاتی کەسایەتی شوێنکەوتوان بەهێز بێتو بەهای ئەخلاقیان هەبێت، دەرفەتی سەرکەوتنی ئەو فیکرەیەش گەورەتر دەبێت"(77).

گەر لە پاڵ ئەو جۆرە قەناعەتەدا، لە گەڵاڵەنامەی ناوخۆی ساڵی ١٩٤٧ی حیزب بڕوانین، پەیکەرێکی پێنج قۆناغی هەیە کە "عەمید"ی حیزب ـ هەڵبەتە خودی جەنابی عەفلەق بو ـ لە لوتکەدا لەنگەر دەگرێ. عەمید دەسەڵاتی دامەزراندنی هەمو پۆستە سەرکردایەتییەکانی هەیە، هەر خۆیشی سەرچاوە یا دەسەڵاتی باڵای هەمو ئەو مەسەلانە بو کە پەیوەندییان بە سیاسەتەوە هەبو. هەرەمی رێکخستنی حیزب (چ لەڕووی ناوچە یا ئەرکو شوێنی کارەوە بێت)، سیمبولێکی ئاڵۆزەو ئەسڵناسی ئەندامان لەو هەرەمەدا باشتر لە هەمو شوێنێکی دی درکی پێدەکرێ. لە پاڵ ئەندامە "سروشتییەکان" کە بەدڵنیاییەوە عەمید یەکێکیان بو، ئەندامی

"هەڵبژێردراو"و ئەندامی "سەرەکی"و ئەندامی ئاسایی هەبونو تەنها بەرەزامەندی عەمید بۆ ئاستە باڵاکان بەرزدەکرانەوە[78]. ئەم گەڵاڵەنامەیە هەرگیز لەلایەن ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت لیبرالیزم یا سوسیالیزمی بەعس لەسەر بنەمای کارنامەی ساڵی ١٩٤٧ حیزب بسەلمێنن، ئاماژەی پێنادرێ.

ئەو نوسەرانە بەناقەست جەختیان لەسەر پێڕەوی ناوخۆی ١٩٥٤ حیزب دەکردەوە کە کۆپییەکی دەسکاریکراوی پێڕەوی ١٩٤٧ەو تا ئەمڕۆش بایەخو کاریگەری خۆی لەدەست نەداوە. پێویستە ڕێکخستنی حیزب لەسەر شانەی بچوکی ئەستونی لە ٣ ـ ٧ کەسی دامەزرێت (واتە لە شانەکانی حیزبی کۆمۆنیست بچوکتر بێت). لە عێراق شانەی حەوت کەسی جێگەی شانەی پێنج کەسی پێشوی گرتەوەو هەمو جۆرە پەیوەندییەکی ئاسۆیش قەدەغەکرا. پرەنسیپی سەرەکی ڕێکخستن بوە دیموکراسی ناوەندیو عەمید بوە ئەمینداری گشتیو تاراەدیەکی زۆریش دەسەڵاتی خۆی لەدەستدا. عەفلەق وەك ئەمینداری گشتی هیچ دەسەڵاتێکی دامەزراندنی نەبو، دەنگی لە سەرکردایەتی نەتەوەییدا کە باڵاترین دەسەڵاتی بڕیار وەرگرتن بو، وەك هەمو دەنگەکانی دی بو بە دەنگێك.

دامەزراندنی پرەنسیپی هەڵبژاردنی ئەندام هاوزەمان بنەمای ئەندامێتی ئاڵۆزتر کرد. لە جێگەی جیاکاری نێوان ئەندامی "سروشتی"و "سەرەکی"، ئەندامی "چالاك" هاتەئاراوە کە بەرهەمی بژار کردنێکی وردی پلەکانی ئەندامێتی بو یا پێنج ئاستەکەی بو: لایەنگری ڕێکخستن، لایەنگری پلە دوو، لایەنگری پلە یەك، پاڵێوراو، ئەندامی مەشقدیدە. ئەندامی چالاك دەیتوانی سەرکردە هەڵبژێرێت یا پیشبکەوێت یا لە دەزگا حیزبیەکاندا پۆستی بەرپرسیارێتی وەربگرێت. پاڵێوراو یا ئەندامی مەشقدیدە تەنها دەیتوانی لەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە حیزبەوە هەیە، دەنگ بدات. بەڵام باقی ئەندامانی دی هیچ مافێکی حیزبییان نەبو. دوو لەو پلانە لە داهێنانی حیزبی بەعس بون، ئەوەش بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی هوروژمی ئەندامانی تازە بو کە لە سەرەتای شەستەکاندا دەهاتنە ناو ریزەکانی حیزبەوە. لقی عێراق جەختی لەسەر



مەسەلە ڕێکخراوەییو ئەمنییەکان دەکردەوە (لەم بوارەدا حیزبی شیوعی عێراق لەگەڵ سەرجەم حیزبە کۆمۆنیستەکانی دی جیهانی عەرەبی جیاوازی هەبو). لە شوباتی ١٩٦٣دا ژمارەی ئەندامە چالاکەکانی عێراق ٨٣٠ ئەندامو ١٥٠٠٠ ئەندامی پلە نزمتر، بەڵام لە کۆتایی ساڵدا ژمارەی ئەندامە چالاکەکان وەکخۆی مایەوە، کەچی ژمارەی ئەندامە پلە نزمەکان (٣) بەرابەر زیادیکرد[79]. ئەوانەی ئەندامەتی تەواویان هەبو ڕێژەیان تەنها لە ٢٪ ئەندامەکانی حیزب بو.

ئایا ئەگەر کارنامەی ساڵی ١٩٤٧ ڕەچاوبکرایە، دەرئەنجامەکەی دادپەروەرانەتر نەدەبو؟ هێندێك جار ڕوونیو ڕاشکاوی ئەو کاریگەرییەی دەبێت. هاوزەمان لەگەڵ گۆڕینی ناوی بەعس لە ساڵی ١٩٥٤دا بۆ حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، زمانی بەعسییەکانیش گۆڕانی بەسەردا هات. بەڵام بۆچی کارنامەی حیزب گۆڕانی بەسەردا هات؟ زۆرێك لە نوسەران لەوەدا هاوڕابون کە کارنامەی ١٩٥٤ لە چالاکی حیزبە شیوعییەکانەوە سروشی وەرگرتوە کە ڕۆژانە لە عێراقو سوریا گەشەیان دەکردو گەورە دەبون. پێگەی شیوعییەکان ئەنگیزەی گۆڕانی زمانو چەمکەکان بو، چەمکی تازەی ڕێکخستنیش لەوانەوە وەرگیرا، هەر چەندە ئاستی هەرەمی ڕێکخستنو پۆلبەندی ئەندامەکانی جیاوازی هەبو. بەعسیەکان ئەو دەمە دوودڵو دردونگ بون، بەڵام پاشان ئاراستەیەکی جەماوەرییان بۆ سیاسەتی حیزب فەراهەم کردو پێویست بو ویستی حیزب لەناو هەمو ئەندامانداـ کە بەیەك چاو تەماشا دەکران ـ بەرجەستە بێت. بیرۆکەی ئەندامی "سروشتی" یا "عەمید" بەهەمان ڕۆحی پێشوی نەبو. جودایی ئەو ئامرازەی بۆ بەئەندامبوون پێڕەو دەکرا هیچ شتێکی لەو ڕاستییە نەدەگۆڕی کە پرەنسیپی شەرعییەت گۆڕانکاری بەسەردا هاتوە. بەڵام گۆڕان لە کارنامەدا مانای ئەوەی دەگەیاند کە پێگەی عەفلەق هاتۆتەخوارێ. دەبێ مەسەلەیەك بوبێتە مایەی ئەوەی پیاچونەوە لە کارنامەی حیزبدا بکرێت. ئەو مەسەلەیەش چ بو؟

ساڵی ١٩٤٩ عەفلەق بە بڕیاری حوسنی زەعیم، یەکەم فەرماندەی کودەتا سەربازییەکەی سوریا زیندانی کرا. هێندێك دەڵێن عەفلەق ئەشکەنجە دراوە،

هێندێکی دی دەڵێن هەڕەشـــەی لێکراوەو هێندێکی دی دەڵێن نە ئەشـکەنجە دراوەو نە هەڕەشەیشـی لێکراوە. لەدوای ئازادکردنی وتارێکی بەواژۆی خۆی بڵاوکردەوە. وتارەکەی بەزمانێکی خەماوی داوای لێبوردنی دەکردو ئەوەشی ڕاگەیاندبو کە دەیەوێت خانەنشـین بێتو لە سیاسـەت دوور بکەوێتەوە، چونکە " لەو باوەڕەدام ئەرکەکەم بە کۆتایی گەیشـتوەو شـێوازی کارکردنم لەگەڵ سـەردەمی نوێدا ناگونجێت"[80]. بەعسیەکان بەم نامەیە توشی شۆك بونو حیزبیش زیانێکی گەورەی لێکەوت. ئیدی لەو دەمەوە عـەفلـەق بێدەنگی لەو مەسـەلەیە کرد. بەڵام شـتێکی روونو ئاشکرایە کـە بەو نامەیەی کارنامەکەی خۆی خسـتە ژێر پێوە. ئەوەیشـی بۆ ئاشـکرا بو کە مرۆڤـەو شـایانی هەڵەکردنـە، نەك ئەو بەعسـییەی کە لە نێو ئاگرو ئاسـندا لەدایك دەبێتو لەلایەن خۆیەوە شـاباش دەکرا. ئەو شـتێکی کرد کە هیچ سـەرکردەیەکی دی لە پێگەی ئەودا ئەو کارەی نەکردبو. ئەو قوربانی پێوەرێکی دڕندانە بو کە خۆی داهێنەری بو.

عـەفلـەق لە ساڵانی پەنجاکاندا لە نێو بەعسیەکانی سوریا بەتەواوەتی دەسەڵاتی رووی لـە کـزی کردو حیزبی بەعس بوە گەنجینەیەك بـۆ جیاکردنەوەی فیکری تازە کە بە نزیکەیی هەموی لە نەریتی کۆمۆنیسـتییەوە سەرچاوەی گرتبو. بەڵام لەعێراقدا هێشـتا دەسـەڵاتی هەر مابو، چونکە بەعسییە ئوسـوڵییەکانو عـەفلـەق لە یەکتری جودا نەدەبونەوە. سـەدام حسێن شکڵی خۆی بە نوسینەکانی عـەفلـەق وەرگرتو باڵاکردنی بۆ سـەرکردایەتی عێراق لە دوای یەکەمین رژێمی بەعسی عێراق لە ساڵی ١٩٦٣دا، هەروەکو دەوترێ بە بڕیاری ئەو بوە.

هەنوکـە بیر لـەوە بکەرەوە کـە عەمێدێکی بەسـاڵاچوی حیـزب (عـەفلـەق) دەسەڵاتی رێکخستنی لە دەستداوەو لەرێگەی نەوەیەکی نوێی ئەفسەرە بەعسییەکانی سـوریاوە لەبەردەم پاکتاوێکی هەمیشەییە لە حیزبو سیاسەتدا. ئەو رێك پێچەوانەی ئەو کەسـەیە (سـەدام حسـێن) کە هەڵگری چەندین نازناوە: لەڕووی جەستەییەوە باریکەلەو کەسێکی رۆمانسییە، نوسەری پرۆپاگەندەی سیاسییەو لەڕووی رێکخستنەوە



کەسێکی شیاو نیە، فەیلەسوفە، لەوەش گرنگتر هەڕەشەلێکراوترین کەسە کە روبەڕوی زیندان بۆتەوەو ئەشـکەنجەدراوە. سـەدام حسـینی گەنج بەپێچەوانـەی رێیەرەوە، وەك خوێنرێژێکی دڕندەی نەترس شـوێن پەنجەی لەنێو حیزبدا بەجێهێشـت، هەمو ئـەو خەسـڵەتانەی تیابو کە عـەفلـەق پێویسـتی پێی هەبو ـ بەڵام سـەرکەوتو نەبو ـ بێبەزەیی، سیاسـەتی مشـتی ئاسـنین، فروفێڵ، دڵسـۆزی لە هەمو بارودۆخێکداو خۆراگری. بۆیە سـەدام حسێن لەو کارنامەیە سەرکەوت کە عـەفلـەق خستییە ژێر پێیەوە، بنەمای شەرعییەت هەر چەند گرنگ بێت، دیسانەوە لە کۆتاییدا بەگرنگترین شت ناژمێردرێت.

## بەعسو کۆمۆنیزم:

هەستی بەعس بەرامبەر بەحیزبە کۆمۆنیستە عەرەبییەکان جێگەی گومان نیە، لێرەدا لە جیاتی "هەڵوێسـتی سیاسـی" جەخت لەسەر وشەی "هەست" دەکەمەوە، چونکـە تەنهـا لە بـواری سـۆزداریدا دەتوانرێ یەکەمین خولی بەعسـی بەرۆشـنی بناسـرێتەوە. بۆ نمونە بەیانی ١٩٤٥ وەك بەرنامەی بەعس هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ حیزبی شیوعی سوریدا نیە. بەدڵنیاییەوە حیزبە کۆمۆنیستەکان پشتگیرییان لە بزوتنەوەی نەتەوەگـەرای عەرەبی نەدەکرد. لەلایەکی دی، زۆربەی تەوژمە سیاسـییەکانی دی لایەنگیریان لە ئاراستەی پانعەرەبیزم نەدەکرد، هەروەها حیزبە شیوعییە عەرەبییەکانیش زۆر بەراشـکاوی دژایەتی یەکێتی عەرەبیان نەدەکرد. لە ساڵانی شەستەکاندا زۆرێك لە شـیوعییەکان لە هەڵویسـتی خۆیان لەمەڕ یەکێتی عەرەبی پاشگەزبونەوە. هەروەها وادیـارە زۆر دژوار بێـت وێنای کۆمەڵێك هەلومەرج بکرێ کە بەعسـی والێکرد ئەو ئاراستە وەربگرێ، بەوەی پانعەرەبیزم پرەنسیپێکی سەرەکی دیاریکراوی بەعس بێت. بۆیە لە سـەرەتادا بەعسییەکان دوژمنی سەرسـەختی شیوعییە عەرەبەکان بون. بەڵام

دەپرســین بۆچی لەڕووی ئایدیۆلۆجیاوە شــیوعییەکان ئەوەنــدە مایەی تورەیی بەعس بون؟.

لەم بارەیەوە عــەفلــەق هیچ گومانێکی نەهێشتۆتەوەو بەراشکاوی چەندین کەرەت بەشــێوازی جۆراوجۆر دوبــارەی کردۆتەوە کە: "شــیوعییەت داهێنانێکی رۆژئاوایەو بەهەمو شــتێکی عــەرەب نامۆیە". رەنگە مارکســیش "هێندێك لــە رۆحی بوغزیی یەهودییەتــی تێئاخنیبێت، بەڵام ســەرباری ئەوەش شــیوعییەت لوتکەی تروســکەی "مرۆڤایەتی" شارستانی ئەوروپا بوە، کە لە سەردەمی رێنیسانسی سەدەی شازدەهەمدا دەرکەوت. بەپێی وتەکانی عــەفلــەق ئەم تازەگەرایەتییەی شارستانی یۆنانی ـ رۆمانییە لەگەڵ "عەقڵانیەتی پۆخت"ی سەدەی هەژدەهەم‌و پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیای سەدەی نۆزدەهەمدا، ئاوێزان بوەو شــیوعییەتی بەرهەمهێنــاوە. "هەر ئەوروپییەك، رەگەزی یا تایفــەی یا پێگەی کۆمەڵایەتی یا سیاســی هــەر چییەك بێت، هەرگیــز بەئەندازەی عەرەب نەفرەت لە شــیوعییەت ناکات، چونکە هەمو ئەو گۆڕانکارییە شارســتانیانە، هیچ پەیوەندییەکی بەمێژووی عەرەب‌و نەریتی فیکری‌و شێوازی ژیانیانەوە نیە، ئیدی لە ئێستادا بێت یا رابردوو"[81].

شیوعییەت بەشێوەیەکی بۆماوەیی پەیوەستە بە "هەر شتێکەوە کە لە دەرەوە هاتۆتە ناو مێژووی عەرەبەوەو فیکری عەرەبی شێواندوە"، بە "بزوتنەوەی شعوبییەتیشەوە کە لە ســەردەمی عەباسیدا دەرکەوت‌و داوای یەکســانی لە ژن‌و سامان دەکردو ئاژاوەو وێرانــکاری دەکــردو رایەڵەی خێزانی‌و ئاینی لێکهەڵدەوەشــانەوەو لە پێگەی مێژووی عــەرەب‌و قارەمانەکانی‌و خەســڵەتی نەتەوەیــی دادەگرت کە دەرفەتــی دەرکەوتنی پێدا"[82].

ســەرباری ئەو هەمو دوژمنایەتییەش کەچی عفلەق لە هێزو توانای کۆمۆنیستەکانی کەمنەکــردەوە[83]. تیــورەی کۆمۆنیســتی لــە میانــەی ئەزمونــی پراکتیکــی حیزبە کۆمۆنیستەکانی عەرەب، دەکرێ گۆڕانی بەسەردا بێت‌و لەگەڵیدا ناکۆك بکەوێتەوە. ئــەم کارەش دەیەیــەك پێش حیزبی بەعــس ئەنجامدراوەو حیزبە کۆمۆنیســتەکانیش



یەکەمین حیزبی سیاسی هاوچەرخ بون، لەدوای روخانی حوکمی عوسمانی روویان لە چینە چەوســاوەکان کرد. ئەو حیزبانە لەســەر پرەنســیپی جەمسەرگەری بابەتی‌و بەرنامەو شــێوازی نوێی سیاســەت دامەزرابون. شــەیدایی عــەفلــەق بەرێکخستنی شــیوعی بەشــێوەیەکی تایبەت بۆ ئەو رۆژگارە دەگەڕێتەوە کــە لە پاریس دەیخوێند. هەڵبەتــە لــە رووی فیکرییەوە بەتوندی لە ژێر کاریگەری فاشــیزم بــو، بەڵام زانیاری لەســەر نوسینەکانی رێکخستن‌و تۆکمەیی ئەزمونی خۆی لە حیزبی شیوعی سوریا لە ســییەکانی ســەدەی بیســتەمدا قەناعەتیان پێهێنابو کە حیزبە کۆمۆنیستەکان لەڕووی رێکخستنەوە لێهاتوییەکی زۆریان هەیە.

بەعس‌و شــیوعییەکان لەدوای روخانی رژێمی پاشــایەتیەوە لە تەموزی ١٩٥٨، لە سیاسەتی جەماوەرییاندا بوون بە دوو جەمسەری دژ بەیەك‌و ناکۆك. گەشەکردنی یەکەم لەسەر حیسابی دوەم بو. لە ماوەی ١٩٤١ ـ ١٩٥٨دا دەسەڵاتی حیزبی شیوعی عێراق بەشێوەیەکی بەرچاو گەورە دەبو، ساڵی ١٩٥٩ گەیشتە لوتکە، کاتێك تەنها ژمارەی ئەندامە چالاکەکانی گەیشتە نزیکەی ٢٥ هەزار ئەندام‌و ژمارەی لایەنگرەکانیشی بە لانیکەمەوە دەگەیشتە نزیکەی نیو ملیۆن کەس. بەپێچەوانەی ئەوەشەوە لقی عێراقی حیزبی بەعس ســاڵی ١٩٥٦ ژمارەی ئەندامەکانی بەحاڵ دەگەیشتە ٣٠٠ ئەندام، لە ســاڵی یەکەمی تەمەنی کۆماریشــدا ژمارەی ئەندامەکانی بــۆ ١٢٠٠ ئەندام‌و ٢٠٠٠ لایەنگــری رێکخراوو ١٠٠٠٠ ئەندامی نارێکخراو زیادیکــرد[84]. ئەگەر ئەم ژمارەیە لەگەڵ حیزبی شیوعیدا بەراورد بکەین، ئەوا حیزبی شیوعی زیاد لە ملیۆنێك ئەندام‌و لایەنگری رێکخراوو نارێکخراوی هەبو.

بەکورتــی حیزبی شــیوعی عێراق بەتەواوەتی شــەقامی عێراقی کۆنتــرۆڵ کردبو، ئەوەش لەدوای ١٩٥٨ەوە خەســڵەتێکی نوێی سیاســەتی عێراق بو. حیزبی شــیوعی لەســاڵانی یەکەمی یەکلاکەرەوەو چارەنوســازدا، بەتەواوەتی هێزی بەرگریی میلی (میلیشیا مەدەنی)و ســەرجەم سەندیکا گرنگ‌و رێکخراوەکانی لاوان‌و خوێندکارانی کۆنترۆڵ کردبو. ئەو هەمو هێزانە لەیەکی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٨دا بە لەخۆبایی بونی

سەرکەوتنەوە لەخۆپیشاندانێکدا نماشکران‌و خۆپیشاندانەکەش لەلایەن لیژنەی ناوەندی حیزبەوە رێبەرایەتی دەکرا کە زۆربەیان لە پێش یا لەساڵی ١٩٦٨دا کۆچیان کردبو.

ژمارەی ئەندامانی حیزبی بەعس لەدوای یەکەم هەوڵ‌و کۆششی گەشەکردنی ساڵی ١٩٥٦دا هەروەك خۆی مایەوە. رەنگە لەماوەی نیوەی یەکەمی حوکمی قاسمیشدا ژمارەی ئەندامەکانی کەمتر بوبێتەوە. خۆپیشاندانی شۆفێری تاکسییەکانی بەغدا لە ساڵی ١٩٦١دا کە لایەنگرانی بەعس رێبەرایەتیان دەکرد، یەکەم ئاماژە بو بەوەی کە حیزب بوە بە هێزێکی بەرچاوی شەقامی عێراقی. لە ساڵی ١٩٦١ەوە تا کەوتنی رژێمی قاسم لە ساڵی ١٩٦٣دا، حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی زۆر بەخێرایی گەشەیدەکردو دەسەڵاتی بەسەر هێندێك سەندیاو رێکخراوی جەماوەریدا پەیداکردو رێبەرایەتی ئەو خۆپیشاندانەی دەکرد کە مۆرکی ئابوریيان هەبو، بەڵام لەدژی حوکمی قاسم دەیقۆستەوە. بەپێچەوانەی ئەوەشەوە کاتێك قاسم ساڵی ١٩٦٠ کۆمەڵێك رێوشوێنی لەدژی شیوعییەکان گرتەبەر، توشی شڵەژان‌و پشێوی بون.

لە ساتەوەختی کودەتاکەی ١٩٦٣دا حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی سەرجەم کۆڵانەکانی شاری بەغدای کۆنترۆڵ کردبو، هەروەها شارەکانی ناوەراستی عێراقیش کە زۆربەی دانیشتوانەکەی سونەبون‌و لایەنگیریان لە فیکری پانعەرەبیزم دەکرد، هاوڕای بەعسییەکان بون. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەعس لە سەرەتای شوباتی ١٩٦٣دا تەنها ٨٣٠ ئەندامی چالاك‌و نزیکەی ١٥٠٠٠ لایەنگری رێکخراوی هەبو. بەدرێژایی ئەو ماوەیەی بەعس لەبەرەی ئۆپۆزیسۆندا بو، هەرگیز بەئەندازەی حیزبی شیوعی عێراق لە رۆژانی شکۆمەندیدا لەلایەن جەماوەرەوە پشتگیری لێنەکراوە.

سەرباری ئەوەش، هەڵبەزو دابەزی وەفاو دڵسۆزی جەماوەری عێراق کە بو بەدیاردەیەکی رووت، لە عێراقدا رێچکەی خۆی وەرگرت. ئەگەر خۆپیشاندانەکانی یەکی ئایاری ١٩٥٩ سیمبولێکی دیاری سەرەتای ئەو دەیەیە هێزی شیوعی عێراق بێت، ئەوا حیزبی بەعس لە کۆتایی ئەو دەیەدا، واتە لە کانونی دوەمی ١٩٦٩دا



دەسەڵاتی بەسەر شەقامدا بەنزیکەیی هەمان دەسەڵات بو کە حیزبی شیوعی عێراقی لە دە ساڵی پێشودا پیادەی دەکرد. ئێستا کێشەکە لەو تێگەیشتنەیە، چۆن پانعەرەبیزم توانی لە فۆرمی دوەم رژێمی بەعسدا، بەشێوەیەکی تۆکمەتر بگەڕێتەوە بۆسەر شانۆ.

1 ـ Hanna Batatu, The Old Social Classes and the Revolutionary Movements in Iraq (Princeton University Press, 1978), table 38 – 2, p, 743

2 ـ ئەو زانیارانەی لەسەر عەفلەق، بەیتار، ئارسۆزیو ئەکرەم خۆرانی ـ ە لە سەرچاوەی ژمارە ١ بەشی ٣٨ وەرگیراوە، مەگەر ئەوەی لە سەرچاوەی دی هاتبێت:

- Majid Khadduri, Arab Contemporaries, The Role of Personalities in politics (Baltimore; John Hopkins Press, 1973), Chap. 12

- John Devlin, The Ba`th party; A History From its Origins to 1966 (Stanford: Hoover Institution Press, 1976), Ch. 2.

3ـ Eric Rouleau, "The Syrian Enigma: What is the Ba`th?" New Left Review 45 (sep–oct):56.

4 ـ بڕوانە چاوپێکەوتنی بەیتار لەگەڵ ماری سی ئۆلاس لە ١٩٨٠دا کە لە مریپ ریپۆرت ـی ژمارە ١١٠ (تشرینی دوەم / ١٩٨٢) دوبارە چاپ بۆتەوە.

5 ـ لاکۆرو هالپرن هەر دوکیان بانگەشەی ئەوە دەکەن. بڕوانە:

- W. Z. Laquer, Communism and Nationalism in the Middle East (London: Routledge and Kegan Paul. 1956). 330, n, 15;

- M. Halpren, The Politics of Social Change in the Middle East and North Africa (Princeton University Press. 1963), 240.

ئەو بەروارەی کە ئەم دوو مێژوونوسە بۆ جیابونەوەی عەفلەق لە حیزبی شیوعی سوریا دیارییان کردوە، بەروارێکی دروست نیە.

6 ـ بڕوانە چاپێکەوتنی ئەو لەگەڵ کەمال ئەبو جابر، نوسەری :

- kamal S. abu Jaer, The Arab Ba`th Socialist Party: History, Ideology and Organization (Syracuse University Press, 1966), 187.

7 ـ عەفلەق: چاوپێکەوتنی لەگەڵ بەتاتو لە Social Classes ، لاپەرە ٧٢٦.

8 ـ عەفلەق لە ئەبو جابر وەرگیراوە، لەسەرچاوەی پێرستی ژمارە ٦.

9 ـ بڕوانە پێشەکی چاپی چوارەمی نیزالی بەعس (بەیروت، دار ئەلتەلیعە ١٩٧٦)، ١٤:١

10 ـ بەتاتو، هەمان سەرچاوە. ل ٧٣٠.

11 ـ بەپێی هەڵسانگاندنی ئارسۆزی لەسەر روداوەکانی ١٩٣٦ ـ ١٩٣٩ ئەسکەندەرونە بڕوانە: مشاكلنا القوميةو موقف الاحزاب منها (دیمەشق ـ دار ئەلیەقەزە ١٩٥٨)، ٩٦.

ئەم هەڵسەنگاندنە لەو روەوە سەیرە کە جەخت لەسەر هەمان تایبەتمەندی عەفلەق (فیداکاری، کۆشا،





ئاینی رێبەری، ئامانجگەرای) دەکاتەوە. ئەم تایبەتمەندییانە لەو داستانو روخسارانە دەردەکەوێت کە ئارسوزی لەسەر خۆیو ئەوانی دی نەخشەی دەکێشێت.

12 ـ عەلەوییەکان لەو گروپە بیرتاریکانەی شیعەن کە خەڵکانی بتپەرست، رێورەسمی وەرگرتنی ئەندامی تازەو کردەوەی سنورداری توندو دواکەوتوانە لەسەر ژنان قبوڵ دەکەن. ئەوانە عەلی لە پێغەمبەر بە بەرزتر دەزانن‌و خۆیان لە هەمو موسڵمانانی دی بە باشتر دەزانن، چونکە لەو باوەڕەدان کە مانای شاراوەی سروش تەنها بۆ ئەوان ئاشکرا کراوە. ئارسۆزی لە هەمان زەمینەوە مانای داهێنەرانە بەمیلەت دەبەخشێ. لەمڕووەوە ئارسۆزی بەقوڵی لەژێر کاریگەری هانری بیرگسۆن بوە. ئەو ئەزمونێکی میتافیزیکی خۆی یاددەکاتەوە کە ساڵی ١٩٢٨ ئەزمونی کردوە: "لە دەروازەی سۆربۆن نوقمی بیرکردنەوە بوم... ناگەهان شتێکم بۆ هات. رۆحم گۆڕانی بەسەردا هاتو شێوەی تێڕوانیم بۆ جیهان بەتەواوەتی گۆڕا." بەمشێوەیە بیروباوەری نەتەوەگەرای عەرەبی قبوڵکرد. لە ئەریك رۆلۆ وەرگیراوە، پێرست ژمارە ٣.

13 ـ ئارسوزی، مشاكلنا... ١٠٢، ١٠٣.

14 ـ عەفلەق ئەم ژمارەیە لە سەرەتای قسەکانیدا لە یەکەمین کۆنگرەی میلی بەعس لە ساڵی ١٩٧٤دا راگەیاندوە: نضال: ١:٢١.

15 ـ بەتاتو، هەمان سەرچاوە، ٧٢٩.

16 ـ کۆنستاتین زۆریق، وشیاری نەتەوەیی (بەیروت، دار ئەلمەکشوف، ١٩٤٠)، ٤٣، ٩ ـ ٤٨.

17 ـ میشیل عەفلەق، في سبيل البعث (بەیروت، دار ئەلتەلیعە، ١٩٥٩)، ٢٩ ـ ٣٠. ناونیشانی وتارەکە "ناسیونالیزم پێش هەمو شتێك مانای عیشق"ە. ئەم کتێبە وەك کتێبی پیرۆزی بەعسیەکانە. کۆمەڵێك نوسینی عەفلەقە لە ماوەی ١٩٣٥ ـ ١٩٥٠. وتەکانی من لە چاپی ١٩٥٩ی ئەم کتێبەوە وەرگیراوە.

18 ـ هەمان سەرچاوە، ٢٨، ٢٩.

19 ـ لە نضال وەرگیراوە ١:٢٧.

20 ـ عەفلەق، في سبيل... ٣٩.

21 ـ لە وتاری "دەربارەی پەیامی عەرەب" وەرگیراوە، ١٩٤٦ کە لە وتاری "ناسیونالیزم بەمانای عیشق"، ١٩٤٠ دەچێت. هەمان سەرچاوە، ٧٦.

22 ـ هەمان سەرچاوە، ٣٩.

23 ـ هەمان سەرچاوە، ٢٩.

24 ـ هەمان سەرچاوە. ٦٦.

25 ـ نضال، ١:٢٨ بەیاننامەی تەموزی ١٩٤٣.

26 ـ عەفلەق لە وتارخوێندنەوەیەکی ساڵی ١٩٦٧دا دەربارەی تێروانینی سەرەتایی حیزبی بەعس

وتاردەخوێنێتەوە، تێروانینێك كە "هەرگیز لێی پاشگەزنەبۆتەوەو نەتەوەی عەرەبی لە حاڵەتی جەنگدا دەبینی. واتە حیزب ئەو واقیعە ترسناكەی دەوری نەتەوەی داوە فەرامۆش نەكردوەو قورسی ئەو نەخۆشییەی میلەتی ئیفلیج كردوە دەست نیشانكردوە"، ئەو تا ئەو رادەیە دەڕوات كە فێركردنی هەموان بەو رۆحییەتە بە پێویست دەزانێت. عەفلەق دەڵێت دەكرێ جەنگ لە دوژمنی دەرەكی یا پۆخڵەواتی ناوەكی هەڵگیرسێت: میشیل عەفلەق خاڵی سەرەتا (بیروت، المؤسسة العربیة ١٩٧١)، ٦٠ ـ ٦٢.

27 ـ نضال، ١:٢٨.

28 ـ عەفلەق في سبيل البعث، ١٨. عەفلەق لە ساڵی ١٩٥٥دا هەڤپەیڤینی سیاسی بە ئامرازێك بۆ گەیشتن بە ئامانجی بەعسو مەحەكی ئەزمونی بەسود بۆ ئامانجگەرایی بەعسی لەقەڵەم دەدا، هەمان سەرچاوە، ٤٢، چاپی ١٩٧٤.

29 ـ نضال، ١:٢٨.

30 ـ هەلومەرجی داتەپیو لە مادەی شەشەمی كارنامەی حیزبدا وەك تاكە بەڵگەیەكی پێویست بۆ شۆڕشی دەرونی هەمەلایەنە لەقەڵەم دراوە (خەبات لە دژی ئیمپریالیزمو یەكێتی وەك بەڵگەی خەسڵەتی شۆڕشگێڕێتی حیزب باسكراوە)، هەمان سەرچاوە، ٤:٢٦. لێكۆڵینەوەی نیوەی یەكەمی في سبيل البعث، چاپی ١٩٧٤ ئەوە نیشان دەدا كە لە چەندین لاپەرەدا باس لە داتەپین كراوە: ١٣، ٢٩، ٣٥، ٥٧ ـ ٦٠، ٣ ـ ٦٢، ٦٨، ٧٣، ٧٩، ٨١، ٩٠ ـ ٩١، ٩٤، ١٣٤، ٦ ـ ١٥٤، ١٦١، ٤ ـ ١٦٣، ١٦٦.

31 ـ لە وتارێكی ساڵی ١٩٤٤دا بە ناونیشانی "نەوەی نوێی عەرەب" وەرگیراوە، لە في سبيل البعث، ل٦١و ٦٣. دوای چەندین ساڵ "پێشەنگ" لە جیاتی "نەوەی نوێ" بەكارهێنراوە كە هەمان مانای هەیە. بەڵام سود وەرگرتن لە وشەكانی كۆمۆنیست گرنگی خۆی هەیە.

32 ـ هەمان سەرچاوە، ٦٤. عەفلەق لە بەكارهێنانی پەیڤەكاندا ورد نیە، "رۆح" بە "فیكر" دەگۆڕێتەوە، ئەمە لە حاڵێكدا لە ١٩٤٠دا ئەم پەیڤە رەتكرابۆوە. بەڵام لە دەقەكەوە دەردەكەوێت كە ئەو دەربارەی چی قسە دەكات. هەڵبەتە ئەم نا وردییە لە یەكانگیری كەمناكاتەوە.

33 ـ سامی شەوكەت ئەمە ئامانجەكانمانە (بەغدا وەزارەتی مەعاریف، ١٩٣٩)، ٣٦.

34 ـ نضال ٣٠ ـ ٣٤: بەداخەوە هێندێك نوسەر دەربارەی بەعس سودیان لەم بەڵگەنامانە وەرگرتوەو وتارگەلێكیان هەڵبژاردوە كە جەخت لەسەر دیموكراسی، ئازادی رادەبڕینو پێویستی هاوكاری وەكیەكی میلەتەكان دەكەنەوەو ئەوە فەرامۆش دەكەن كە هەلومەرجو دەرئەنجام گرنگیان هەیە، نەك وشەی بێكەڵكو سواو.

35 ـ بەیاننامەی تەموزی ١٩٤٣، هەمان سەرچاوە، ١:٢٨.

36 ـ عەفلەق، في سبيل البعث ٤٩.





37 ـ هەمان سەرچاوە، لە لاپەرەكانی ٤٧، ٤٩، ٤٥، ٤٦ وەرگیراوە.

38 ـ زوریق، ئەلوەعی ئەلوەتەنی، ٣٣ ـ ١٢٣.

39 ـ بڕوانە بەوتارەكەی ١٩٣٩یی كە ئیسلامی لە بەرامبەر یەكێتی عەرەبی دانتوە: ساتع ئەلحوسەری، آراء الاحاديث في الوطنية القومية (بەیروت، ١٩٨٤)، ٦٧ ـ ٥٦.

40 ـ بەتاتو، هەمان سەرچاوە، ٧٣٣.

41 ـ عەفلەق، في سبيل البعث، ٣٠.

42 ـ Fouad Ajami, The Arab Predicament: Arab Political thought and practice Since 1967 (Cambridge University Press, 1982), 27.

43 ـ "ئێمە بە عەرەب ناڵێین لە ئایندەو بەجێگیر بوونی بەعسی عەرەبی ئێوە دەچنە قەڵەمڕەوی ئازاد، یەكگرتوو سۆسیالیستییەوە ـ بە وتەی بەعس ـ بەڵام پێیان دەڵێین هەر لەمەوە ئێستا دورنوێنی راستەقینەی ئایندەیە.. ئایندە بەپیرمانەوە دێت، لەناخماندا گەشەدەكات، چیدی بەشتێكی جودا لە ئێمە حیساب ناكرێ"، في سبيل البعث، ١٥٨، عەفلەق لەو باوەڕەدا بو "چارەنوس" وای بڕیار داوە كە بەعس بەمەبەستی ئەنجامدانی ئەركی گرنگی میلی "هەڵبژێردراوە"، بەمەرجێك بەعسیەكان هەرگیز لەو رێگەیە لانەدەن كە چارەنوس بۆیانی دیاریكردوە، ئەم بەڵگە هێنانەوەیەش پێكەنیناوی دەردەكەوێت، بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی رۆحییەتی قەدەرگەرای حوكمفەرما بەسەر ئەم بەشەی جیهاندا لە شێوەی فێركارێكی چالاكو پڕ وزە دەردەكەوێت. هەر وەها بڕوانە لاپەرەی ٤٣ چاپی ١٩٧٤ وتاری ساڵی ١٩٥٥ بە ناونیشانی "برداشت زندە ما از حزب ـ (Our living conception of the party)". بڕوانە بەرپەرچدانەوەی پەیوەندی نێوان چارەنوسگەرای نەریتی لەگەڵ چەمكی عەفلەق لەسەر ئازادی لە وتارێكی ساڵی ١٩٥٠ بە ناونیشانی "دەربارەی شوڕش، چارەنوسو ئازادی" ٥٥ ـ ١٥١ (چاپ ١٩٥٩).

44 ـ عەفلەق، في سبيل البعث، ١١٤.

45 ـ هەمان سەرچاوە، ١٥٤. لە چاپەكانی دواتر ئەم بەندە لابراوە.

46 ـ عەفلەق رەخنەی لەو عەرەبانە دەگرت كە بیریان لە "مرۆڤدۆستی" دەكردەوەو ئەنگیزە زەبونەكانیانی رەخنە دەكرد. هەمان سەرچاوە، ٦٧ ـ ٦٩. ئەنجامگیری دەكات كە "گەورەترین هەوڵو تێكۆشانی عەرەب لە رێگەی مرۆڤایەتیدا، بەرزكردنەوەی ئاستی ناسیونالیزمەكەی خۆیانە... بەفەرامۆشكردنی بیركردنەوەی مرۆڤدۆستانە... هەم پێكەنیناوییەو هەم شەرمهێنەریشە كە عەرەبی هەژار خاكەكەیان لەلایەن خەڵكانی دییەوە داگیر كرابێتو بیر لە مرۆڤایەتی بكەنەوەو پارێزەری میلەتانی دی بن. مرۆڤدۆستی داوامان لێدەكات ئەوانە لە بیربكەین تا ئەو كاتەی بەئاستی ئەوان دەگەین. هەر چەندە مرۆڤدۆستی رۆژئاواییو روناكبیرەكانیان بە مەترسی مرۆڤدۆستی عەرەب نیە، بەڵام ئاسمانەو رووكاری ناسیونالیزمە "نابێت فریوی بخوێن"، هەمان

سەرچاوە، ٧٠.

47 ـ هەمان سەرچاوە، ١٢٩.

48 ـ هەمان سەرچاوە، ١٠٣.

49 ـ هەمان سەرچاوە، ٤٠ ـ ٤١.

50 ـ بەتاتو، هەمان سەرچاوە، ٤٠ ـ ٧٣٩. بەتاتو ئایدیۆلۆجیای عـەفلـەق بە"وەرگری نارێکخراو" ناودەبات‌و خودی عـەفلـەق بە ناسیونالیسـتی مرۆڤگەرایی سەرسـام بە دەسـەڵاتی تاکگەرایی سەردەمی رۆشنگەری ئەوروپا، دیموکراسی ژاکبونی، ئامانگەرای مازینی، دیدەگای چینایەتی مارکس‌و دەستبژێری لینینی لە قەڵەم دەدا (ل٧٣١). بەڵام خـودی عـەفلـەق لـەگەڵ تاکگەایی سـەردەمی رۆشـنگەری‌و مرۆڤگەرادا ناکۆکە، ئەمەش خاڵێکی بەڵگەنەویستە. سەرئەنجام دەسەڵاتی فیکری رۆژئاوایی لەسەر ئەو زۆر بوە، بەڵام هەر چەندە فیکری عـەفلـەق وەرگر بێت، شـتێك لە فیکریدا کاردەکات دەپرسێت کام شت؟ بەتاتو وەڵامێکی بۆ ئەو پرسیارە تەوەرییە ناداتەوە.

51 ـ ئەبـو جابـر، بعث عرب، ١٣١، ١٣٩. هیچ کەس بەئەنـدازەی جابر هەوڵی نەداوە بەعس وابخاتەروو کە قابلی رێزو ئیحترامە. جابر دوای ئەوەی سـاڵی ١٩٦٣ لە عێراق حەمامێکی خوێن بەرپاکرا، دەنوسـێت: بەعس بیروباوەرێکی ئاشتیخوازانەی هەیەو عاشقی ئازادییەو پەیوەندی بە پایەداربونی دەوڵەتی تاك حیزبییەوە نیە، بەڵام لە هەمان حاڵدا دەیەوێت بەشـداری لە شارسـتانی جیهانی‌و کاروباری مرۆڤایەتیدا بکات (٣٣ ـ ١٣٠). جابر دەڵێت عـەفلـەق "شـتێکی تازەو عەرەبی لە زەیندا هەبو، ئەوەش کاری لێکۆڵەرانی رۆژئاوای زەحمـەت دەکرد، چونکە ئەوانە بە خوێندنەوەیەکی رووکەشـی نوسـینەکانی بیرمەندانی رۆژهەڵات‌و بەبێ تێگەیشتنی قوڵ لە ناوەرۆکی عاتیفی وشە بەکارهاتوەکان، ئەنجامگیری دەکەن" (ل٩).

52 ـ N. Salem Babikain, "Michel Aflaq: A Biographic Outline", in Arab Studies Quarterly, Institute of Arab Studies & A. A. U. G, Vol. 2. (Spring 1980), 170.

ئەریـك رۆلـۆ ئەنگیزەی دروسـت دەداتە پاڵ باڵی چەپی بەعسـی ئەنتـی عـەفلـەقی کە لە دەیەی سـاڵی ١٩٦٠دا دروست بو. بەڵام ئەوە لەبیردەکات کە ئەم باڵە سەرباری نارەزایەتی کردنی عـەفلـەق، بەرپرسیار بو لەبەرپاکردنی حەمامێکی خوێن لە عێراقدا (١٩٦٣). س. جی. هێم لە پێشـەکی ناسـیونالیزمی عەرەبیدا یەکەم کەس بو کە باس لە توندوتیژی زاتی لە پەروەردەی بەعسی دەکات. (لەندەن، ١٩٦٢).

53 ـ Ajami, The Arab Predicament, 43.

54 ـ جی. ئێچز تاری دەنوسێت: "عـەفلـەقی مەسیحی ناچاربو ناسیونالیزمی خۆی لەسەر پایەی نامەزهەبی بونیات بنێت"

55 ـ عـەفلـەق، في سبيل البعث، ٤٤.





56 ـ Gabriel baer, Population and Society in the Middle East (New York, Praeder, 1966), 105, 109.

57 ـ M. S. Hasan, "Growth and Structure of Iraq's Populcetion. !867 – 1947", in The Economic History of the Middle East: 1800 – 1914, ed Issawi (University of Chicogo press, 1966), 157.

58 ـ تاربوش تەنها یەك شیعەو دوو مەسیحی لە ٦١ گەورە ئەفسەری عێراقی لە ساڵی ١٩٦٣دا دەناسێتەوە.

59 ـ تەنانەت کونتستانتین زۆریق ئەم وشانەی پێ قبوڵە: الوعی القومی، ١٣٠.

60 ـ بڕوانە نوسینی ئارسۆزی بە ناونیشانی "جریان شعوبی در پوشش کمونیسم" لە مشاكلنا، وتاری ١٩٤٤ عـەفلـەق لەژێـر ناوی "موضع در قبال نظريۀ کمونیسـم" لە في سـبيل البعـث، ل ٧٢، هەروەها وتاری "نبرد بر سـر وحدت در عێراق " في سـبيل البعث، ٢٤٩ بەراوردێکی ئاڵۆزی شـعوبیەت لەگەڵ کۆمۆنیزم دەکات.

61 ـ نضال، ٦٢ ـ ١:٦١.

62 ـ عەبدولعەزیز ئەلدوری الجذور التأريخية للشعوبية (بەیروت، دار ئەلتەلیعە، ١٩٦٢)، ٧.

63 ـ هەمان سـەرچاوە، ٩ ـ ١٣، ٢٧ ـ ١٢٠، دایرە المعارف اسـلام، چاپی یەکەم (لیدن، برێل، ١٩٢٧)، ٣٩٥، شعوبیەت بە "گروپێك پیناسە دەکات کە عەرەب بەخوار دەزانن‌و سوکایەتیان پێدەکەن". قەڵەمڕەوی چالاکی شـعوبیەت لە ئسـپانیاوە تا ئێران لەخۆدەگرێ. لەپڕ بەبێ هیچ رونکردنەوەیەك دەکەوێتە مشـتوماڵی "ئارەزوی پەیوەندی نێوان شیعەو سەرجەم تیمەکانی دی". بەڵام لەهیچ شوێنێکدا ناوترێ کە نێوان "ئارەزو"و "تیم" جیاوازی سەرەکی هەیە.

64 ـ ئەلدوری، الجذور ١٤ ـ ١٥، ٢١.

65 ـ عەبدولهادی ئەلفوکەیکی، الشعوبية القومية العربية (بەیروت، دار ئاداب، ١٩٦١). ٣٧، ٣٩، ٤٢.

66 ـ عـەفلـەق، في سبيل البعث

67 ـ هەمان سەرچاوە، ٩٢.

68 ـ هەمان، ٩٤.

69 ـ هەمان، ١١٩.

70 ـ هەمان، ٩٢.

71 ـ هەمان، ١٢٩.

72 ـ هەمان، ١٧ ـ ١١٦.

73 ـ هەمان، ٣ ـ ١٠٢.

74 ـ هەمـــان، ١٥٤. ڕەنگــە فۆرموڵە ئەوەش لە کتێبی پەیمانی کۆمەڵایەتی ڕۆســۆوە وەرگیرابێت. خاڵێکی دی کە عــەفلــەق لە ڕۆســۆی وەرگرتوە پەیوەســتە بە بەمەدەنی بونەوە (تازەگەرێتی)، ئەوەش بە کەوتن لە شکۆمەندییەوە بەرەو داروخان دەزانێت.

75 ـ سالم بابەکیان، میشیل عــەفلــەق، ١٧٠. ئەبوجابرو مەجید خەدوری یش هەمان دیدیان هەیە.

76 ـ عــەفلــەق، في سبيل البعث، ٣ (چاپی ١٩٧٤).

77 ـ لە وتارەکەی ١٩٤١ وەرگیراوە کە لە چاپی ١٩٥٩ لابراوە.

78 ـ سەبارەت بە پخشنامەی ناوخۆی ساڵی ١٩٧٤ سود لە چینە کۆمەڵایەتییەکانی بەتاتو وەرگیراوە.

79 ـ هەمان ســەرچاوە، ١٠١٠، ئەبو جابر ئەندامانی حیزبی بەعس لە ســاڵی ١٩٦٢ بەدوو هەزار پێنجو سەد کەسو لایەنگرانیش بەلانی زۆرەوە بە ٣٠ هەزار کەس دادەنێت، البعث العربي، ١٤٠، ١٤٤.

80 ـ بەتاتو، چینە کۆمەڵایەتییەکان، ٧٢٧.

81 ـ عــەفلــەق، في سبيل البعث، ٧١ ـ ٧٢.

82 ـ هەمان سەرچاوە، ٧٢.

83 ـ بڕوانە في سبيل البعث، ٧١ ـ ٢٥٢.

84 ـ ژمارەکان لە سەرچاوەی خوارەوە وەرگیراوە:

- Hanna batatu. "Some Refletions on the Decline of the Arab Left and of Iraq's Communists " CCAS Reports (Georgetown University. Washington, D.C.1983), 2.

- Social Classes, 816.

# بەشی حەوتەم

# ڕەوایەتی بەعسی عێراق:

## دانپیانان

"کاتێـك سـاڵی ١٩٦٩ بۆ یەکەمجـار هەڵە زەقە سیاسـیو کولتورییەکانی سـەرکردایەتی ناوەندی (لقێکی جیاوەبوی حیزبی شیوعی عێراق بو) حیزبی شیوعی عێراقیم ئاشـکرا کرد، خەڵکانێکی زۆر هێرشـیان کردە سەرمو سوکایەتییان پێکردم. تەنانەت هێندێك کەس پێیانوابو ناچارکراوم قسەیەك بکەم کە لە ڕاستیدا باوەڕم پێی نیە، بەڵام لە ڕاسـتیدا من لە ڕێگەی شـارەزاییو ئەزمونو گفتوگۆو بیرکردنەوەیەکی زۆرەوە درکم بەو هەڵانە کردبو. من پێموابو گەشەسەندنە پێشکەوتوخوازە مەزنەکانی ئەو دەمەی عێراقو ئەو پەرەسەندنانەی لە مەیدانی عەرەبیو جیهانیدا رویاندا، ڕاستی قسەکانی ئەو کاتەم دەسەلمێنێت، تەنانەت نەیارەکانیشم لەنێو سەرکردایەتی ناوەندیدا (باڵێکی دی حیزبی شیوعی عێراق بو) ناچاربون دانبنێن بەرۆڵی ئایدیالی شۆڕشگێرانەی حیزبی عەرەبی ئیشتراکیو ئەو سەرکەوتنە مەزنانەی بۆ جەماوەری بەدیهێنابو. ئەوانە لەگەڵ حیزبی بەعسـی عەرەبی ئیشـتراکی چونە بەرەیەکی پێشـکەوتوخوازە، بەڵام بەداخەوە نەیانتوانی بە بەڵێنەکانی خۆیانەوە پابەندبن"[1].

عەزیز ئەلحاج سـاڵی ١٩٧٩ ئەو کاتەی لە پاریس نوێنەری ڕەسـمی عێراق بو لە کۆمەڵەی یۆنسـکۆ، یادەوەرییەکانی خۆی نوسـیوە. لەم بڕگەیەدا بـاس لە دانپیانانە ئاشکراکەی ساڵی ١٩٦٩ی دەکات. ئەو دانپیانانەی بوە مایەی ئەوەی دەیان هاورێی





پێشویی بەدەستی حیزبی بەعس بکوژرێت.

ناوی عەزیز حاج تا سـاڵی ١٩٦٩ لە ڕیزی چەپترین کەسـی کۆمۆنیسـتی عێراقی بو. عەزیز سـاڵی ١٩٢٦ لە خێزانێکی کوردی شـیعەمەزهەبی هەژار لە دایك بوە. لە سەرەتای چلەکاندا پەیوەندی بە حیزبی شیوعی عێراقییەوە کردوەو بوە بە تێکۆشەرێکی پیشەیی. لە ماوەیەکی کورتدا وەك ڕوناکبیرێکی مارکسی بوە بەدەنگێکی نیشتمانی. نوسـەرێکی بەتوانای بڵاوکراوەی قاعیدەی حیزب بو. سـاڵی ١٩٤٨ دەستگیر کراو ماوەی ١٠ سـاڵ لە زیندان مایەوە. بەوپەڕی شـانازییەوە گەواهینامەکەی بەرامبەر بە دادوەری لێکۆڵینەوە، لە ڕێگەی حیزبەوە بڵاوکرایەوە کە تێیدا ڕەفتاری وەحشـیانەی پۆلیسـی شەرمەزار دەکردو دەڵێت ئەو ڕەفتارە دڕندانەیەی پۆلیس ناتوانێت ڕێگە لەوە بگرێت خەڵکی عێراق پەیوەندی بەحیزبی شیوعییەوە بکەن[2].

ئەلحاج دوای سـاڵی ١٩٥٨ بوە ئەندامـی لیژنەی ناوەندی، دوای تێپەربونی پێنج سـاڵ بەسـەر ئەو بەروارە لە تاراوگـە هێزی بەرگری لەدژی بەعس ڕێکدەخسـت، لەدوای گەڕانەوەشـی بۆ نیشـتمان بوە چەقی نارەزایی سەرکردەکانی حیزبی شیوعی عێراقو لە جەنگی شـەش ڕۆژەی ١٩٦٧دا ئەو ناکۆکییە گەیشـتە چلەپۆپە، عەزیز لە هەوڵێکی شکست خواردودا بۆ ئەوەی ڕێگە لە جیابونەوە بگرێت، گشت ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی دەستبەسەر کرد. لە ئەیلولی ساڵی ١٩٦٧دا حیزبی شیوعی بوە دوو باڵ: سەرکردایەتی ناوەندی عەزیز ئەلحاجو ئەوی دی کۆمیتەی ناوەندی لایەنگری سـۆڤێت، هەر دوو لیژنەکـەش خۆیان بە میراتگەری نەریتی شۆڕشـگێڕانەی حیزبی شیوعی عێراقی دەزانی.

سـەرکردایەتی ناوەنـدی داوای "پرچـەك کردنی جەماوەری" دەکـرد تا خەباتی میلی چەکدارانە لە شـارو گوندەکانەوە دەسـت پێبکاتو "ڕژێمێکی دیموکراسـی میلی شورشـگێر بە ڕێبەرایەتی چینی کرێـکار" دامەزرێنێت. لیژنەی ناوەندی حیزبی جیابوەوەو پیلانەکانی لە حیزبی دایك شەرمەزار دەکردو خەباتی میلیشی ڕەتدەکردەوەو بانگـەوازی ئەوەی دەکرد حکومەتێکی هاوپەیمانی لەسـەر بنەمای دیموکراسـی لە

هێزە شۆڕشگێڕەکان دامەزرێت بۆ ئەوەی دژایەتی ئیمپریالیزمو زایۆنیزمو کۆنەپارێزی عەرەبی بکات[3].

لە دوای کودەتاکەی ١٩٦٨، حیزبی بەعس پێشنیازی وەزارەتی بۆ هەر دوو باڵەکەی حیزبی شیوعی کرد، بەڵام سەرکردایەتی ناوەندی ئەو پێشنیازەی ڕەتکردەوە. لەدوای چەند مانگێك شەڕێکی نهێنی لەگەڵ بەعس هەڵایسا، دوا بەدوای ئەوەش جەستەی ساردوسڕی زۆرێك لە شیوعییەکان لە کوچەو کۆڵانەکانو بەسەر ڕوباری دیجلەدا بەدیدەکرا[4]. حیزبی بەعس نەك هەر ئەستۆ پاکی خۆی لەو ڕوداوانە دەربری، بەڵکو گوناهەکەیشی خستە ئەستۆی حیزبی شیوعی بەوەی لە ڕێگەی کوشتنەوە بون بە بەشێك لەو پیلانە ڕێکوپێکەی کە دەیەوێت پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانی لە هێزە پێشکەوتوخوازەکان لەناوبەرێت. سەرکردایەتی ناوەندی بە "دەستبەسەراگرتن"، "نەبەردی شۆڕشگێری"و "تەقاندنەوە" وەڵامیان دایەوەو تەنانەت ماڵەکەی سەدام حسێنیشیان تەقاندنەوە.

باڵاکردنی توندوتیژی بەدەستگیرکردنی ئەلحاجو سەرجەم ئەندامانی مەکتەبی سیاسیو ژمارەیەکی بەرچاو لە ئەندامانی حیزب کۆتایی هاتو هەمویان لەسەر دەستی هێزە ئەمینییەکانی نازم گزار ڕوبەڕوی دزێوترین چارەنوس بونەوە، دوو کەس لەو پێنج ئەندامەی مەکتەبی سیاسی لە ژێر دڕندەیی ئەشکەنجەدا گیانیان سپارد، بەڵام ئەوانی دی بەرگەی ئەشکەنجەیان نەگرتو ڕوخان، بۆیە هێنرانە سەر شاشەی تەلەفزیون بۆ ئەوەی دان بەو تاوانانەدا بنێن کە دژی "شۆڕش" ئەنجامیان دابو، دەڵێن ئەلحاج بەدەستگیرکردنی وتویەتی توانای ئەشکەنجەدانم نیەو هاوکارییان دەکەم"، لەکاتی ئاخاوتنیشدا لەسەر شاشەی تەلەفزیۆندا خۆی بە گایەك چواندوە کە ویستویەتی سەری بە دیوارێکی چیمەنتۆدا بکێشێت[5].

لە کۆتاییدا جگە لە ترسنۆکیو خیانەت یا لەوەش خراپتر پەردەلادان لەسەر "بانگەشەی بۆ ڕۆحی گەشەکردن"، لەگەڵ نوقسانیو کورتبینی لە کەسایەتیدا شتێکی دی لە ئەلحاج بەدیناکرێ[6]. پێشینەی ژیانی ئەو پیاوە بەدەر لەو پێگەیەی



لە سیاسەتی پەرگیری عێراقدا هەیبو، بەرەو مەسەلەگەلێکی قوڵترمان دەبات. ژیانی ئەلحاج بەدرێژایی چارەکە سەدەیەك، ئیدی چ لە ترۆپکی باڵاکردنی حیزبی شیوعی عێراق بێت لەسالانی چلەکانداو چ لە تۆکمەبونو جێگیربونی شوێن پێی بێت لە بەرامبەر ناعەدالەتیو چەوسانەوە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٤٨ - ١٩٥٨دا، پاشان لەساڵی ١٩٥٨ەوە بوە ساڵی مەحەك، دەرکەوت زۆر بەسانایی دەشکێت. گەنجێتی ئەم پیاوە خەباتێکی بێوچان بو لە دژی دوژمنانێك کە بەهۆی لەدایك بونێکی خاکییەوە لەبەرچاوییەوە پێشدەکەوتن، دواتر لە هەرەتی لاوێتیدا توشی گرتنو زیندان بویەوە، دوابەدوای ئەوەش چالاکییەکی چڕوپڕی لە هەڵوێستێکی شلوشێواودا وەك ڕێبەری حیزبێك دەستپێکرد کە خەریك بو دەگەیشتە دەسەڵات، بەڵام شەمەندەفەرەکە بەجێیهێشت، ئنجا نەك جارێك، بەڵکو دووجار حیزبە گەورەکەی دەبینی کە دادەروخێت (ساڵانی ١٩٦٣و ١٩٦٨). ڕوخانی دەرونی خۆیو سەرجەم ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لە چوارچێوەیەکدا دارێژرابو، کە نەتوانرێ لەو فیکرو بیروباوەڕانەی لە کۆمەڵگەیدا ژیانیان بۆ گۆڕانی تەرخانکردبو، لەیەکتری جیابکرێنەوە. ژیانی ئەلحاجو کۆتاییەکەی پرۆسەی دڵۆپاندنو بژارکردنی ڕاستەقینەی ڕۆحی سەردەمەکەی بو، بریتی بو لە پرۆسەی گواستنەوەی مەزهەبی تا گەیشتن بەحیزبی بەعس کە بازنەیەکی ماندووبونو ڕەسەنایەتی هەبو. کێ دەزانێ ڕەنگە ئەلحاج لەبەر ئەوەی پەیوەندی بەنوسینەوە هەبو، ئەوەی ئەو لە نوسینێکی سەر دیوارێك دەیبینیو دەیزانی چی ڕوودەدا، زۆربەی عێراقییەکان لێی تێنەدەگەیشتن.

## ڕێکەوتننامەی کاری نەتەوەیی:

لەو کاتەی سەرکردایەتی ناوەندی ڕاو دەکران، لیژنەی ناوەندی ئاگربەستێکی ژێربەژێری لەگەڵ حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکیدا هەبو. بەڵام کاتێك پەیوەندی ڕژێم لەگەڵ یەکێتی سۆڤێتو بلۆکی ڕۆژهەڵاتدا باش بو، ئیدی میانەی حیزبی

شیوعیش لەگەڵ ڕژێمدا باشتر بو. لە ١٠/تەموزی/١٩٧٠دا حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی زنجیرەیەك مەرجی ڕاگەیاند، ئەگەر حیزبی شیوعی عێراقی پێی قایل بێت، ئەوا بەئەندامی "بەرەی پێشکەوتوخوازی میلی" وەردەگیرێت، لەنێو ئەو مەرجانەشدا: حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بە حیزبێکی شۆڕشگێڕو یەکێتیگەراو سۆسیالیستو دیموکراسی بزانێت، دان بە بەیاننامەی ١٧/ تەموزی/١٩٦٨دا بنێت کە حیزب سروشتێکی مێژوویی پێشکەوتوخوازی شۆڕشگێرانەی هەیە، دانبنێت بە ڕۆڵی سەرکردایەتیو پێشڕەوی حیزبی بەعسدا لە حکومەتو ڕێکخراوە جەماوەرییەکانو بەرەی پێشکەوتوخوازی میلیدا، حیزبی شیوعی عێراق لەسەرجەم وڵاتانی دی هاوکاری نێودەوڵەتی حیزبی بەعس بکات، دەوڵەتی ئیسرائیل بەرەهای ڕەتبکاتەوەو چالاکی سیاسی لەنێو هێزە چەکدارەکاندا بۆ حیزبی بەعس مۆنۆپۆڵبکرێو بەمەبەستی ڕزگارکردنی فەڵەستین بیرۆکەی خەباتی میلی چەکداری لەدژی ئیمپریالیزم تەبەنی بکرێو لایەنگیری لە یەکێتی عەرەبی بکات، وەك گرنگترینو سەرەکیترین ئامانج کە گشت ئامانجەکانی دی لەدەوریدا تەوەرە دەبەستنو جەخت لەسەر هەنگاوانانی عێراق بەرەو سۆسیالیزم بکاتەوە.

لیژنەی ناوەندی پەژارەیی خۆی لەسەرسوربونی "پێشڕەوایەتی" حیزبی بەعس دەربڕی، چونکە بەکردەوە ئەوەیان دیاریکردوە کە ئەو ڕژێمەی لە شۆڕشی ١٩٦٨ەوە سەریهەڵداوە، ڕژێمێکی نیشتمانپەروەرە، بەڵام سەبارەت بە یەکێتی عەرەبی هیچ جیاوازییەك لەنێوانیاندا نەبو. کەچی بەتوندی نارەزاییان لەسەر فۆڕمەکەی بەعس دەربارەی هەنگاونان بەرەو سۆسیالیزم دەربڕیو بەپێشنیازێکی نازانستیان لەقەڵەمدا، چونکە هێشتا عێراق "شۆڕشی نیشتمانی ـ دیموکراتی" نەبڕیوە، هەروەها لیژنەی ناوەندی باوەڕیان بە "بازدان بەسەر قۆناغەکاندا" نەبو[7].

ساڵی ١٩٧٠ ڕژێم هەڵمەتێکی بەرفراوانی بۆ دەستگیرکردنی شیوعییەکان دەست پێکرد، دوا بەدوای ئەوەش عەلی بەرزنجی، ئەندامی لیژنەی ناوەندی لەژێر ئەشکەنجەدا گیانی سپاردو کۆمەڵێك بەرپرسی ناوچەکانیش خۆیان ڕادەستی بەعس



کرد، بەوەش گفتوگۆکان کۆتاییان پێهات. لە نیسانی ١٩٧٢دا پەیمانی دۆستایەتی عێراق ـ یەکێتی سۆڤێت بۆ ماوەی (١٥) ساڵ ڕاگەیەنراو لیژنەی ناوەندی وەك هاتنەدی یەکێك لە گەورەترین ئامانجەکانی شۆڕش پێشوازی لەو پەیمانە کرد. لەماوەی دوو مانگدا بۆ یەکەمین جار دوو ئەندامی لیژنەی ناوەندی بەشداریان لە حکومەتدا کرد. ئەحمەد حەسەن بەکر، وەك ئەمینداری گشتی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکیو عەزیز ئەلحاج وەك سکرتێری لیژنەی ناوەندی حیزبی شیوعی لە تەموزی ١٩٧٣دا واژۆیان لەسەر ڕێکەوتننامەی کاری نەتەوەیی کرد، بەوەش لیژنەی ناوەندی سەرجەم مەرجەکانی حیزبی بەعسی قبوڵ کردو بوە بەشێك لە حکومەتی "بەرەی پێشکەوتوخوازی میلی" کە هەمو فرمانەکانی لە ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی حیزبی بەعسەوە وەردەگرت. بۆ ماوەیەك فیکری بەعس لەمەڕ ئازادی پەیوەندیی سیاسی ئەم فۆرمە دوولایەنەی بەخۆیەوە گرتبو:

"بەبڕوای ئێمە دەبێ هەمو عێراقییەك هەست بەوە بکات کە هیچ ناکۆکییەك نیە لەنێوان ئینتمایان بۆ حیزبە سیاسییەکانی دیو حیزبی بەعس کە بەحیزبی خۆیانی دەزانن، لەبەر ئەوەی حیزبی بەعس ڕێبەرایەتی کۆمەڵگەو شۆڕش دەکاتو بەکردەوەش بۆی سەلماندون کە شایستەی ئەوەیە ببێت بەتاکە حیزبیان"[8].

بەدامەزراندنی بەرەی میلیو بەپاڵپشتی لیژنەی ناوەندی، ڕژێم ساڵی ١٩٧٤ شەڕی لەدژی کورد هەڵایساند، بەشکستی شۆڕشی کوردیش لە ساڵی ١٩٧٥دا ڕێگە لەبەردەم هەنگاوی دوەم ئاواڵەبو کە لادان لێی کارێکی ئەستەم بو، بۆیە سەدام حسێن ساڵی ١٩٧٦ لەبەردەم ئاپورەیەکی گەورەی بەرەی میلیدا لە گوتارێکی پیلاناویدا بەمشێوەیە بۆ شیوعییە شەریکەکانی دەدوا:

"بەپێی ئەو زانیاریانەی پێمان گەیشتوە، هێندێك لە برایانی حیزبی شیوعی هێشتا تەنگەتاو دەبن کاتێك پرسیاری ئەوەیان لێدەکرێ، ئایا ئێوە لەگەڵ ڕژێمن یا نا؟ ئایا شتێك هەیە تا ببێتە مایەی شەرمەزاری لەوەی مرۆڤ لەپاڵ شۆڕشێکی مەزنو ڕژێمەکەیدا بێت؟ شۆڕش لەلایەن هەمو نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزەوە قبوڵ دەکرێ،

ئەمە سەرباری ئەوەی سەرکەوتنی مەزنی ئاشکرای بەدەستهێناوە، ئەگەر گومان هەبێت لەوەی کەسێك دژ یا لەگەڵ شۆڕش بێت، پێویستە لە چوارچێوەی ئامانجەکاندا بێت (حیزبی شـیوعی لەکاتی واژوکردنی دوکیۆمێنتەکەدا دەسـت بەرداری بو)، ئەوەش نابێت لەو وردەکارییەدا بێت کە پێویسـتە بەشـێوازێکی دیموکراسـیو بابەتی رەخنە بکرێ.

پێویسـتە لەسەر هەمومان وردەکارییە هەڵەکان رەخنە بکەین، بەڵام نابێت هەڵەی وردەکاری بەرەو ئۆپۆزیسـیۆنی سـایکۆلۆجیمان بەرێت دژی شـۆڕشو رژێمەکەی، لەهەمـان کاتیشـدا نابێت هەڵەی ئیـداری ببێتە ئامرازێك یا پاسـاوێك بۆ ئەوەی بە بەرژەوەندی حیزب بگەین.

گریمـان ئێمەی بەعسـی مەسـەلەکە ئاوەژوو بکەینـەوەو لە گوتـارو دەزگاکانی راگەیاندنەوە پەلاماری شیوعییەکان بدەین (هەروەکو خەریك بۆ ئەو کارە بکەین)... ئـەوا حیزبی شـیوعی عێراقی وەك بەکارهێنانێکی نادروسـتی ئیداری تەماشـای ئەم هەنگاوە دەکاتو هەوڵدەدا بۆ بەرژەوەندی خۆی بیقۆزێتەوە، لەو حاڵەتەدا وێنای چ دەکرێ؟ ئایا لە حاڵەتێکی لەوجۆرەدا مەسـەلەکە قابیلی قبوڵە؟ ئەگەر وەڵام پۆزەتیڤ بێت، ئایا ئێوەی شیوعی وێنای ئەو زیانانە دەکەن کە دوچاری دەبنەوە؟... ئێمە ئەم قسـانە لەخۆبایی بونەوە ناکەین، بەڵکو لەو قەناعەتـەوە دەیکەین کە پەیوەندی ئێمە بەجەماوەرەوە لەسەر بنەمای هاوکاری پۆزەتیڤو متمانەی هەر دوولا بونیاتنراوە، بۆیە خەڵکی گوێبیستی قسەکانمان دەبن"[9].

لە راسـتیدا سـەدام حسێن رووبەڕووی لەو شـیوعیانە بو کە لەبەردەمیدا دانیشتبون تـا پێیان بڵێت لـە چەند مانگی داهاتودا تەورەکە بەر کوێ دەکەوێت، ئەو سـەرەتا لۆمەی لێکردن لەسـەر ئەو هەڵوێسـتە سـایکۆلۆجیا دوژمنکارانەیەی بەرامبەر بە بەرە هەیان بو. ئامانجی سـەدام حسـێن چاندنی ترسو گومانێك بو کە هەر لەبنەرەتەوە بوونی هەبو، لە دڵو دەرونی قوربانیەکانی کە بڕیاری لەسـەردابون چ کردەوەیەکیان دەرهەق بکات. تاوانبارکردنی شیوعییەکان لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٦ەوە دەستی پێکرد.



چالاکی کردن لەنێو ریزەکانی سـوپادا ئەو تومەتە بو کە ئاراسـتەیان دەکرا، ئەوەش پێشـێلکردنێکی ئاشـکرای مەرجەکانی رێکەوتننامەی بەرەی میلی بـو، دوابەدوای ئەوەش دەستگیرکردن دەستی پێکردو هێندێکیشیان لەسێدارەدران، بۆیە ساڵی ١٩٧٩ سەرلەبەری ئەندامانی لیژنەی ناوەندی یا لە زیندان یا لە تاراوگەبون.

سـەرکەوتنی حیزبی بەعس بەفەراهەم کردنی واژوی حیزبی شیوعی عێراق لەسەر رێکەوتننامەی بەرەی میلی ئەوەی روونکردەوە کە ئەو "شۆڕش"ەی حیزبی شیوعی لە ساڵی ١٩٣٢ەوە خەباتی بۆ بەدیهێنانی دەکرد، لەواقیعدا لەلایەن بەعسەوە رێبەرایەتی دەکرێ. حیزبی شـیوعی دانی بەوەنا کە "شۆڕشی" ١٧ی تەموز/١٩٦٨ بەردەوامیی شەرعییەتی روخاندنی رژێمی پاشایەتی ١٤/تەموزی ساڵی ١٩٥٨ بو، دوا چاککردنەوەی ئەو "هەڵەو لادانانە"ش بو کە دوچاری ئەو ئەزمونە ببو. ئەم دیدو فیکرەیەش لەلایەن سەرجەم نوێنەرە سیاسییە سەرەکییەکانی عێراقەوە دانپیانرا. کاریگەری ئەو هەڵەیەی حیزبی شـیوعی بەخێرایی بەسەر نەچو. رێکەوتننامەی بەرەی میلی، لوتکەی ساڵانی دردۆنگیو گفتوگۆکردن، بەراستی بەسەرەتای ئاوابونی دەستکەوتو مێژووی حیزبی شیوعی عێراقی دەژمێردرێت. بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ رێبەرانی حیزبی شیوعی قسە لەسەر گرنگییو بایەخی دەکەن، هیچ گۆڕانێك لەم بابەتەدا ناکات[10].

بۆچی ئەوەندە سـادەو ساوێلکە بون؟ تەنها ئەو پرسـیارە جدییە بۆ تێگەیشتن لەم مەسـەلەیەدا، پێنج سـاڵ درێژەی کێشا تا حیزبی شـیوعی بێ بخاتە سەر رێگەیەکی بێگەڕانەوەو واژو لەسـەر رێکەوتننامەکـە بکات، هەر چۆنێك بێت ئەندامانی لیژنەی ناوەنـدی لە هاوتاکەیان لە سـەرکردایەتی ناوەندی جیاوازتـر نەبون، عەزیز محەمەد کوردێکی سـونەو لـە هەرزەییدا کرێکاری سـپیکردنەوە بوەو لەتەمەنی ١٥ سـاڵیدا پەیوەنـدی بەحیزبەوە کـردوەو دەیەیەکی تەمەنی لەنێـوان ١٩٤٨ - ١٩٥٨ لە زیندان بەسـەر بردوە. ئەوانـە خەڵکانێکی سیاسـی پڕئەزمون بونو تەمەنێکیـان لە خەباتی سیاسیو پیلانگێریدا بەسەر بردبو، ساڵی ١٩٦٣ نزیکترین هاورێیان بەدەستی بەتالیۆنە بەکرێگیراوەکانـی بەعـس کوژرابـون. ئەگەر ئـەو ئەزمونە، تاریکیی باڵی بەسـەردا

کێشابێت، ئەوا دەربارەی سەرکردەکانی حیزبی شیوعی لە بابەت محەمەد ئەلخەزریو کازم ئەلجاسمو عەزیز حامدو سابت حەبیبو عەلی بەرزنجی چی دەوترێ کە هەمویان لەنێوان ساڵانی ١٩٧٠ - ١٩٧١ لەژێر ئەشکەنجەدا گیانیان سپارد؟

وادیاربو جۆرێك لە لۆجیکی سیاسی حوکمی سەرکردەکانی حیزبی شیوعی دەکرد کە لە نەزانی ئایدیۆلۆجییانەوە زیاتر دەرۆیشت. ئەم لۆجیکە هەروەکو چۆن ئەندامانی سەرکردایەتی ناوەندی قوتدابو، ئەندامانی لیژنەی ناوەندیشی قوتداو بەتەوژمێکی سپارد کە ئاکامەکەی جگە لە خۆکوژی شتێکی دی نەبو. واژوکردنی رێکەوتننامەی بەرەی میلی، واژوکردن بو لەسەر مردنی حیزب، حیزب تەنها لەڕووی فیزیکییەوە نەمرد، بەڵکو هەروەکو روداوەکان لە ئایندەدا سەلماندیان، حیزب لەڕووی سیاسیشەوە نابوت بو، بەڵام بۆچی ئەو کەسانە ئەو هەنگاوەیان نا؟ چونکە ئەو هەنگاوەیان بە پێویست دەزانی. بەو کردەوەیەشیان تەنها راستیو دروستی سەرکردایەتی حیزبی بەعسیان نەسەلماند، بەڵکو مۆری رەزامەندی هەتاهەتاییان بۆ ئەو رژێمە کرد.

حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بەپێچەوانەی نەیارەکانییەوە، بەردەوام بەرەو پرسیاری جدی دەرۆیشتو مەسەلەی سیاسی وەك مەسەلەیەکی راگوزەرو رەفتەنی وەرنەدەگرت. بۆیە کاتێك ساڵی ١٩٦٨ دەسەڵاتی گرتەدەست دەیزانی کە دەبێ "بەرەیەکی راستەقینەی پێشکەوتوخواز نەك رووکەشی" دامەزرێنێت. حیزب نەیدەتوانی "رێزی بیروباوەری خۆی زامنبکات یا رەزامەندی خەڵکی بەدەست بهێنێ تا لەڕووی ئەخلاقیو مادییەوە سەرکردە سیاسییەکانی وڵات زامننەکات"[11]. پێکهێنانی بەرەیەکی ستراتیجی پێویستی بەگرەنتی ئەخلاقی هەبو. ئەوەش هەنگاوێکی مەبدەئی بو تا حیزبە رکەبەرەکان لەسەر شانۆی سیاسەت فت بکات. لە واقیعدا ئەو هەمو بەرە ستراتیجییە بوە مایەی ئەوەی سنوری حیزبەکان لە بەرژەوەندی رێبەردا بتوێنێتەوە. بەعسیەکان زۆر باش دەیانزانی کاتێك سنور نەمێنێت، سیاسەتیش نامێنێت. بۆیە هەمان ئەو کارەی بەتوندوتیژی بەرامبەر سەرکردایەتی ناوەندی ئەنجامیاندا، بەناوی ئازادییەوە بەرامبەر بە لیژنەی ناوەندیش جێبەجێیان کرد.



## کۆتایی سیاسەت:

دانپیانانەکانی عەزیز ئەلحاجو رێکەوتننامەی کاری نەتەوەیی، سیمبولی پرۆسەی مەشروعییەت بەخشین بۆ بە ساڵانی یەکەمی رژێمی تازەی بەعس. حیزبی بەعس لە زەمینەی پەیداکردنی کەسایەتییە سیاسییە گشتییەکاندا روبەروی هیچ کەموکورتیو پەرچەکردارێك نەبووەوە، ئەوانەی زۆربەیان ئیعترافیانکرد کە سیخوری ئیمپریالیزم یا زایۆنیزم بون، یا ئەندامی گروپە نهێنییەکان بون، یا فاکتەری وێرانکردنی ئابوری بون، لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی هەبو لە نێوان توندوتیژی ئەو حەکایەتانەی پەیوەندی بەرێکخراوێکی بۆ نمونە وەك حیزبی شیوعییەوە هەبو، لەگەڵ ئەوانەی لەسەر سیناریۆی پێشوەخت ئامادەکراو دەخرانەڕوو. حیزبی شیوعی عێراقی مافی خۆی لەمەڕ گەیشتن بەدەسەڵات لەسەر شانۆی سیاسەتدا، دایەدەست رکبەرە راستەقینەکەی، بەڵام عەزیز ئەلحاج، کە رێبەری رێکخراوێکی سیاسی بو، لە کاتی دەستگیرکردنیدا، فەرماندەیی خەباتی چەکداری لەدژی رژێم دەکرد. بەپێچەوانەشەوە، دانپیانانە ساختەییەکەی قوربانیانی کانونی دوەمی ١٩٦٩ بۆ نمونە، وەك مافێکی بەڵگەنەویستی رژێم ناسراو ئامانج لە بڵاوکردنەوەی ئەو دانپیانانو هەڵواسینەش بۆ ئەوە بو تا بەڵگەی زیاتر لەسەر پەیوەندی ئۆرگانی نێوان بەعسو جەماوەرەکەی پێشکەش بکرێ.

گشت ئەو رێوشوێنانەی تایبەت بون بەمەشروعییەتەوە، داخوازی پێشوەختی رژێمێك بو کە پێرەوی لەترسو تۆقاندن دەکرد. ئیدی لێرە بەدواوە گفتوگۆی سیاسی لە دەرەوەی سنوری رێگەپێدراو بەرێوەدەچو، ئەوەش بە رەزامەندی ئەو حیزبانە بو کە زۆرترین ئازاریان بەدەستییەوە چەشتبو. بۆیە کاتێك گەیشتینە ئەو پێگەیە، ئیدی سیاسەت وەك سیاسەت بەکۆتایی خۆی گەیشتبو. بەڵام لەجیاتی بۆشایی، توندوتیژی دەزگایی جێگەی پڕ کردەوە، ئەو توندوتیژییەی دوای کۆتایی هاتنی سیاسەت باڵی بەسەر هەمو شتێکدا کێشابو. بۆ نمونە نێشتەجێ کردنەوەی کورد

لەدوای شکستە گەورەکەیانەوە ئەنجامدرا. هەروەها دەرکردنی دوو سەد هەزار شیعە بۆ ئێران لە سەردەمێکدا ئەنجامدرا کە هیچ هەڕەشەیەکی راستەقینەیان لەسەر رژێم دروست نەکرد، گەورە بونی قەوارەی ئامرازی چەوسانەوەو باڵادەستی پۆلیس بەسەر سوپادا لەدوای کۆتایی هاتنی سیاسەت رویدا، کە بەشێوەیەکی نزیکەیی مێژوویی بۆ ساڵی ١٩٧٥ دەگەڕێتەوە.

رووی نامۆی دووەم رژێمی بەعس بریتی بو لەوەی کە نیشانەی وردو دروستی بۆ بنکە واقیعە کۆمەڵایەتیەکەی دانا: گەشەکردنی حیزبو پشتگیری جەماوەر لە سەدام حسێنو زیادبونی هێزی چەکدارو قەناعەت، لەو نیشانانە بونو ئەوەش لە کاتێکدا بو کە هەمو سیاسەتێك کۆتایی پێهاتبو، سەرباری کەشوهەوایەکی پڕ توندوتیژی کە نەك تەنها ئاراستەی دوژمنی راستەقینەی دەکرا، بەڵکو دژی هەمو کەسێك ئاراستە دەکرا.

## لە چینەکانەوە بۆ جەماوەر ١٩٥٨ ـ ١٩٦٨:

سەرکەوتنی حیزبی بەعس بەسەر حیزبی شیوعی عێراقیدا لە رێگەی رێکەوتننامەی کاری نەتەوەییو دانپیانانەکانی لە بابەت دانپیانانی عەزیز ئەلحاج هاتەدی. بەڵام رەگوریشەی بۆ کەمێك پێشتر دەگەڕێتەوە. خۆکوژیو قوربانیدانی حیزبی شیوعی عێراق بەرامبەر بە حیزبی بەعس خاڵێکی دی ئاشکرا دەکات، کە بریتی بو، لە دوای ساڵی ١٩٦٨ەوە بیرۆکەی فرە حیزبی بەتەواوەتی دوورخرایەوە. ئەوەش یەکێك بو لە دەرئەنجامەکانی روبەروبونەوەی مێژوویی نێوان بەعسو حیزبی شیوعی عێراقی کە لە دوای روخانی رژێمی پاشایەتی هاشمی، لە ١٤/ تەموز/ ١٩٥٨ سەریهەڵدا.

بەعسییەکان وایاندەبینیو لەوەشدا لەسەر هەق بون، بەوەی ئەسڵی رژێمەکەیان



کە ساڵی ١٩٦٨ حوکمی گرتەدەست، بۆ روداوەکانی ساڵی ١٩٥٨ دەگەڕێتەوەو دەیەی ١٩٥٨ ـ ١٩٦٨یش لەبەر خوڵقاندنی ئەو هەلومەرجە گرنگ بو کە دواجار حیزبی بەعس بەهۆیەوە دەسەڵاتی گرتەدەستو کودەتای ١٩٦٨، بەپێچەوانەی روداوەکانی ١٩٥٨ روبەروی کەشێکی ناهەموارو ساردوسڕ بوەوە کە تارادەیەك حەماسەتو پەرۆشی تیانەبو،و تەنها حیزبە رێکخراوەکان بەرگریان لەبەرامبەریدا هەبو. رژێمی بەعس لەلایەن جەماوەرەوە بەگەرمی پێشوازی نەکرا، بۆیە دەبو ئەم رژێمە تازەیە کار بۆ دۆزینەوەی شێوازێکی سەرکەوتو بکات تا ئەو ساردیو وەپیرنەچونەوەیە چارەسەر بکاتو حەماسەت لەناخی خەڵکیدا بوروژێنێت، بەڵام پێواری (غیاب) پاڵپشتیو حەماسەتی خەڵکی بەهۆی ئەو فیکرە بەعسیانەی لە نێو کۆمەڵگەی عێراقیدا ئامادەگی هەبو، هیچ شوێنەوارێکی لەسەر شوڕشگێڕێتی رژێم نەبو. زەمینەی کۆمەڵایەتیو سیاسی رژێم لەماوەی دەیەی پێشوتردا ئامادەگی بۆ کرابو. رۆحییەتی ماندوی جەماوەر ئەم کودەتایەی بە خولێك لە خولەکانی چالاکی سوپا دەبینیو لەوەشدا ناتوانرێ گلەیی لە کورتبینی ئەو دەمەی جەماوەر بکرێ. دڵسۆزیو وەفاداری بۆ بەعس خەڵکی والێکرد نەتوانن گوزارشت لەوە بکەن کە چ شتێك لە ئایندەدا چاوەروانیان دەکات. گرفتەکە لەوێدا نەبو کە رژێمێکی توندوتیژ لەدوای ساڵی ١٩٧٥ جێگیرو تۆکمە ببو، بەڵکو لەوەدابو کە بەتەنها توندوتیژی نەیدەتوانی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ یەکانگیری بەعس بپارێزێت. جەماوەری شەقامو سەرجەم میلەتی عێراق، رێك هەروەکو حیزبی شیوعی عێراق، دەبو بەزۆر قەناعەت بەخۆیان بهێنن کە جگە لە تێکەڵبون بە کۆماری ترس، هیچ چارەیەکی دییان نیە.

پێنج ساڵی یەکەمی دوای ١٩٥٨ لەو رووەوە گرنگ بو کە خەڵکی پشتیان لە حیزبی شیوعی عێراق کردو روویانکردە حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی. ساڵی ١٩٦٨ جگە لە گەڕانەوە بۆ شەرعیەتی ساڵی ١٩٦٣ شتێکی دی نەبو. سەرلەبەری ئەو دەیەش پڕ لەروداوی ئەوتۆ بو کە لەلایەن خەڵکانی دییەوە بەجدی لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە. لێرەدا مەبەستی من تەنها تێگەیشتنە لەوەی کە چ شتێك لەو ماوەیەدا

بەسەر هەستو ئیدارکی خەڵکیدا هاتبو. بۆ روونکردنەوەی ئەوەش سێ روداوی پێش روخاندنی قاسم هەیە کە شایانی یادکردنەوەن: ئەو قەتلوعامەی لە بەهارو هاوینی ساڵی ١٩٥٩ لە شاری کەرکوکو موسڵ رویاندا. ئەو دوو روداوەش کاریگەری خراپیان لەسەر جێ متمانەیی حیزبی شیوعی عێراق هەبو، هەروەها دادگاییکردنە ئاشکراکانی بەعسیو قەومییە عەرەبەکان لە دوای ساڵی ١٩٦٠دا رێزو پێگەی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی زۆر بەرزکردەوە.

روداوەکانی موسڵ بەهۆی کودەتایەکی شکستخواردوی سەربازی تەقییەوە کە عەرەبە قەومییەکان بەپاڵپشتی خۆپیشاندانەکانی حیزبی عەرەبی ئیشتراکی پێی هەستان. حیزبی شیوعی عێراق بەرەزامەندی قاسمو بەخرکردنەوەی لایەنگرانی لەسەرتاسەری عێراقدا خۆپیشاندانێکی دوو سەدو پەنجا هەزار کەسیان ئەنجامدا (لەو دەمەدا ژمارەی دانیشتوانی موسڵ ١٨٠ هەزار کەس دەبو). بۆ رۆژی دواتر زۆرینەی خۆپیشاندەران کە لە دەرەوەی موسڵەوە هاتبون شاریان بەجێهێشتو فەرماندەیی سەربازی شاری موسڵیش شۆڕشیان بەمۆرکی پانعەرەبی راگەیاندو ئەو بەعسیانەی رێبەرایەتی جەماوەری شارەکەیان دەکرد نوسینگەی چەپەکانو بارەگای حیزبی شیوعی عێراقیان ئاگر تێبەردا. بەڵام لەکاتی دامرکاندنەوەی راپەرینەکە، لایەنگرانی حیزبی شیوعی قەسابخانەیەکی بێبەزەییان ئەنجامداو بەئاشکرا جەستەی کوژراوەکانیان شێواند، ئیدی بارودۆخی شارەکە لە ژێر کۆنترۆڵ دەرچو.

"بەدرێژایی چوار رۆژو چوار شەو کوردو ئیزیدییەکان لە دژی عەرەب وەستانەوە، ئاشوریو مەسیحییە ئارامییەکان روبەروی عەرەبە موسڵمانەکان بونەوە، خێڵی ئەلبومتیات کە خێڵێکی عەرەبی شەمەرە دژی خێڵی کوردە گورگەییەکان بونەوە، جوتیارانی گوندەکانی موسڵ لەدژی موڵکدارەکان راپەرینو بەتالیۆنی پێنجەم لە ئەفسەرەکانیان هەڵگەڕانەوە، دانیشتوانی دەوروبەری شاری موسڵ دژی دانیشتوانی ناو شار وەستانەوە، گەڕەکە هەژارنشینە عەرەبەکانی مەکاویو وادی حەجەر پەلاماری ئۆرۆستۆکراتە عەرەبەکانی دەواشیاندا، لەنێو گەڕەکی باب ئەلبید بنەماڵەی ئەلرەجبو



دژی بنەماڵەی ئاغاکان کە دوژمنێکی تەقلیدییان بو شەڕیان هەڵگیرساند، وەکئەوەی هەمو جۆرە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی پچرابێتو هیچ دەسەڵاتێکی سیاسیش لە ئارادا نەبێت. ململانێی نێوان ناسیونالیستو شیوعییەکان جڵەوی بۆ هەمو هەستە دێرینەکانی شل کردو هەر یەکەیان ئەوەندە وزەی تەقینەوەی تیابو کە تا بەردەم جەنگی ناوخۆ بەرەوپێش بڕوات"[14].

روداوەکانی موسڵ لە شاری کەرکوکیش دوبارەبویەوە. هێندێك کوردی سەر بەناوچەی کەرکوکی حیزبی شیوعی عێراق دژی تورکمانەکانی رکبەری تەقلیدییان وەستانەوە.

لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٥٩دا تیمێك لە بەعسییەکان بەرۆژی نێوەرۆ ئۆتۆمۆبیلەکەی قاسمیان دایە بەر رێژنەی گوللەی چەکەکانیان. دوا بەدوای ئەوەش سەرکوتکردنی بەعسیەکان تا ساڵی ١٩٦١ بەردەوام بو، کە بوە مایەی شێواندنی رێکخستنەکانی حیزبی بەعس. لە ساڵی ١٩٦١ یشەوە رێبەرایەتییەکی تازەی چەپگەرای توندڕەو رێکخستنی گرتەدەست، هەر چەندە ئەو سەرکردایەتییەی پەلامارەکەی رێکخستبو لەسەر شانۆی روداوەکان بزربو، بەڵام دواجار ئەو تیمەی بەشداری لە پەلامارەکە کرد، پێگەی گرنگیان لە حیزب وەرگرتو سەدام حسێن دیاریترین کەسیان بو. حیزب سەرباری کێشە ناوخۆییەکان، کەچی بەهۆی دادگاییکردنی دەیان بەعسی، بەخاتری بەشداری کردنیان لە روداوی تیرۆرکردنی قاسم، پێگەی جەماوەرییان بەرزبوەوە. بۆیە کاتێك قاسم هەوڵیدەدا لەتاوانبارن خۆش بێت، روویەکی نوێی لەخۆبوردەییو رەگەزپەرستیو خەباتی سەرسەختانەی بێوێنەی بەعسییە شۆڕشگێرەکان بەدیارکەوت. ئەم هەڵوێستە تەنها بەوە کۆتایی نەهات کە حیزب بەروویەکی پڕشنگدارەوە لەو قەیرانە دەرچو، بەڵکو چەندین قارەمانی تازەیشی بەرهەمهێنا.

سیاسەتی گۆڕان لە وەفاو دڵسۆزی جەماوەر دوای چەند رۆژێك لە کودەتاکەی ١٩٥٨وە رویدا. بەعس داوای یەکێتی بێقەیدو مەرجی دەکرد لەگەڵ کۆماری عەرەبی

یەکگرتودا کە تازە لەنێوان میسرو سوریا دامەزرابو. عەفلەق ٢٤/ تەموز/١٩٥٨ گەیشتە بەغدا بۆ ئەوەی دەست بە هەڵمەتی یەکگرتن بکاتو جەختی لەسەر رۆڵی عێراق، وەك هەڵگری تۆیی یەکێتی عەرەبی دەکردەوە. حیزبی شیوعی عێراق پێداگری لەسەر سەربەخۆیی عێراق دەکردەوەو عەبدولکەریم قاسمی وەك رزگارکەری نەتەوەو تاکە رێبەر ناوزەدە دەکرد. لەکاتی خۆپێشاندانەکانی شاری بەغداشدا هوتافی شیوعییەکان لەدژی بەعسییەکان بریتی بو لە "ماکو زعیم، إلا کریم". لەو بەیاننامەی حیزبی شیوعی کە لە ٣/ ئەیلولی/١٩٥٨دا لە سەرتاسەری بەغدا بڵاوبویەوە، ئەم وشانەی تێیدا هاتوە:

" ئەمڕۆ، کاتێك جەماوەری عێراق گوێبیستی پێشنیازی یەکگرتن دەبێت هەست بە نارەحەتی دەکات، چونکە لە کۆماری عەرەبی یەکگرتودا باس لە ئازادی رادەبڕینو رێکخستنی کۆمەڵایەتیو حیزبی نەکراوە.

هەروەها میلەتی کوردیش لەسەر چارەنوسی مافە نەتەوایەتییەکانی دوودڵو نیگەرانە.

بەڵام سوپای عێراقو ئەفسەرە دلێرەکانی رەخنە لە شێوازی یەکگرتنی سوپای میسرو سوریا دەگرن.

بێگومان دەکرێ هاوکاری ئابوری نێوان عێراقو کۆماری یەکگرتو تا ئەوپەڕی رادە بێتەدی، بەڵام یەکگرتن دەرفەتی بەرەو پێشەوەبردنی ئابوریی داتەپیوی عێراق بەرتەسك دەکاتەوە.

هەڵەیەکی گەورەیە کە دەوترێ بەرامبەر بە ئامانجێکی مەزنی وەك یەکگرتن، ئاکامە نێگەتیڤەکان، مەترسی هەر چەندێك بێت گرنگی خۆی لەدەستدەدا، یا بوترێ دەکرێ لە پێناوی بەرژەوەندی کۆمەڵدا قوربانی بە بەرژەوەندی تاك بدرێ، چونکە ئەگەر یەکگرتن کاریگەری خراپی لەسەر عێراق هەبێتو خزمەت بەدیموکراسی نەکات لە کۆماری یەکگرتوی عەرەبیدا، ئەوا ناتوانێت هەستی وڵاتانی عەرەبی دی بەلای خۆیدا رابکێشێت، کەواتە چ بەرژەوەندییەکی باڵا بۆ ئەم یەکگرتنە



هانماندەدا"[15].

عەبدولکەریم قاسم خۆشەویست بو، بەڵام پانعەرەبیزم لەگەڵ هەمو کێشو مەزنایەتی خۆی لە عێراق سستو لاواز بو. حیزبی شیوعی عێراق بەجۆرێك رەگوریشەیەکی تۆکمەی لەناو عێراقدا هەبو کە دەیتوانی خەڵکانێك پەیدا بکات لە پێناوی بەرژەوەندی گشتیدا قوربانی بدەن. ئەو شتانەو شتگەلێکی دی یارمەتیدی روونکردنەوەی پاساوەکانی حیزبی شیوعی عێراقی دەدەن لەسەر ئەو هەڵویستەی لەلای ئەو لێکۆڵەرانەی سیاسەتی رابردوی عێراق راڤەدەکەن گێلانە دەردەکەوێت. سەرباری ئەوەش حیزبی شیوعی عێراقی زانیاریو شارەزاییەکی تایبەتی لەسەر عێراق هەبو کە لە ماوەی چارەکە سەدەیەك لە چالاکیو خەباتی سیاسیدا بەدەستی هێنابو، هەروەها ئاشنایەتی لەسەر گرفتەکانی ناو عێراق لەمەر یەکگرتن هەبو: بەهەر حاڵ ئەو زانیارییانەی حیزبی شیوعی لەدوای ١٩٥٩ەوە کارایی خۆیان لەدەستدا.

## حیزبی شیوعی عێراقی:

حیزبی شیوعی عێراقی وەك "ئەلئەهالی" پێش خۆیو دیموکراتە میللییەکانی سەردەمی حکومەتی قاسم لە نایەکسانی کۆمەڵایەتیو چەوسانەوە ناوخۆییەکانی دەڕوانی. بۆیە حیزب پەلاماری چینێکی کۆمەڵایەتی تایبەتی لە بۆرجوازی نوێو موڵکدارە گەورەکان دەدا. ئەم ئامانجە لەگەڵ ئامانجی دەوڵەتمەداران، یا ئەوانەی بەوپەڕی لێهاتوییەوە دەسەڵاتیان لە حکومەت بەکاردەهێنا، تەباو جووت نەدەهاتنەوە. حیزب لەدوای کودەتای ١٩٥٨ توانی قاسم لە ئامێز بگرێ، چونکە حیزب پێیوابو قاسم دژی دوژمنی راستەقینەی کۆمەڵگە کار دەکات.

لەسەردەمی پاشایەتیدا جیاوازی نێوان دەوڵەتو چینی حوکمڕان زۆر روونو ئاشکرابو، بەڵام ئەو جیاوازییە گرنگییەکی پراکتیکی نەبو. لە واقیعدا دەوڵەت

لەلایەن موڵکدارە گەورەکانو بۆرجوازی تازە پێگەیشتووەوە ڕێبەرایەتی دەکرا، بەڵام لە ساڵی ١٩٥٩ ـ ١٩٦٨ لەلایەن سەربازو لە ساڵی ١٩٦٨ یشەوە لەلایەن تاك حیزبەوە بەڕێوەدەبرێ. ئەو دامەزراوەیەی بواری ئەوەی دەدا چینێکی کۆمەڵایەتی بەمانای تەواوی سیاسەت حوکمی وڵات بکات، بریتی بو لە پارلەمان کە دروستکراوی بریتانیا بو. سەرباری ئەوەی جار ناجار لە کار دەخرا، بەڵام سیستمی پارلەمانی لەدوای ١٩٤١ەوە سەکۆیەکی تایبەتی بۆ دەستەبژێری نایابو دەوڵەمەندی وڵات دەستەبەر دەکرد. بەداروخانی ڕژێمی پاشایەتی ئەو دوو کۆڵەکەیەش داروخان کە پاڵپشیان لە حوکمەکەی دەکرد، بۆیە لێرەدا دەبینین چینی فەرمانڕەوا بۆ چەند بەشێك دابەش بو، هەروەها دەست بەسەر ماڵو موڵکیاندا گیراو پەرتەوازەش بون، بەڵام سیستمی پارلەمان ـ وەك سیستمی گشتی حکومەت ـ بەتەواوەتی داروخا.

بەڵام جەختکردنی حیزبی شیوعی عێراق لەسەر تیورەی چینایەتی، پشتگیری لێدەکرا، چونکە حیزب خۆی بە حیزبی پرۆلیتاریاو هاوپەیمانەکانی دی لە چینە چەوساوەکان دەزانی. ئەندامێتی حیزب بۆ کەسێك بو کە ئینتمای بۆ بەرژەوەندی چینە چەوساوەکان هەبێت یا سەر بەچینە چەوساوەکان بێت. هەر چەندە چینی پرولیتاریا لە پرۆسەی سیاسیدا کار کەنار کرابو، کەچی سەرباری ئەوەش پەیوەندی دیاریکراوی لەگەڵ گروپەکانی دی هەبو کە لە رووی سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتییەوە حوکمڕانیان دەکرد. ژمارەی کرێکاران لە چلەکانەوە تا ساڵی ١٩٥٨ لە کارگەو بیناو شوێنەکانی دی بەردەوام زیادی دەکرد. لە واقیعدا ئەو کارگانە زۆر بچوك بونو تابلۆی کارگەکانیش ئەوەندە بە بچوکی دەنوسران کە بەجوانی نەدەخوێنرایەوە، بەڵام تەنها بوونیان ئەوەی دەهێنا قسە لەسەر تازەگەرێتی بکرێو خۆمان بەرۆژئاواوە بلکێنین. لەسەردەمی حوکمی پاشایەتیدا چینی زەحمەتکێشان، چینێکی شاربی پێشکەوتوی روو لە زیادبون بو کە خوێندکارو سەربازو فەرمانبەرە بچوکو تەنانەت ئەفسەرە پایە نزمەکانیشی بەلای خۆیدا راکێشابو، ئەوەش بازنەیەکی سروشتی کاری حیزبی شیوعی عێراقی بو. دوورخستنەوەیان لە دەزگا سیاسییەکان هەڵەیەکی گەورەی



ڕژێمی پاشایەتی بو. پرەنسیپی بە ئازادی پەیوەندیکردن بەحیزبەوەو ئیمانی خودی حیزب بە پەیامەکەی بۆ ئەوە دانیپیانرا تا لە ڕێگەی بونیادی باوی کۆمەڵایەتیو چۆنێتی کارپێکردنی، جیاوازییەکان یەکلابکاتەوە، ئیدی بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەو راستییەی کە دوا ئامانجی حیزبی شیوعی عێراقی بریتیە لە: بەشۆڕشگێرکردنی سەرلەبەری ڕژێمی سیاسیو ئەو پەیوەندییە کۆمەڵاتیانەی لەسەری دادەمەزرێت.

عێراق پێش ساڵی ١٩٥٨ بەشێوازێکی گرنگ لەگەڵ سیناریۆی حیزبی شیوعی عێراقی جووتو تەبا بو. لەماوەی ئەو ساڵانەدا زۆرێك لە ئەنجومەنو کۆمەڵەی سیاسی دروست بون کە دواتر یەکیانگرت، پاشان هەڵوەشانەوە، ئنجا بەناوی تازەوە دروستبونەوە، ئەمانەش لە نێویاندا دەبینران: نوێنەرایەتی موڵکدارەکان، سەرۆك خێڵەکان، بۆرجوازی نوێ یا تازە پێگەیشتوەکان، بازرگانەکان، لایەنگر یا ناحەزانی بریتانیا یا گروپە ئایینییەکان، ئەفسەرانی دەورەی شەریف حسێن، لایەنگرانی پانعەرەبی، لیبراڵە دیموکراتەکان، نەتەوەگەرا جیاوازەکان، ریفۆڕمخوازەکانو دیکتاتۆرە چەپەکان... لیستێکی بێکۆتا. نایەکسانیو دوو جەمسەری ناکۆکو دژبەیەکیی هەژاریو دەوڵەمەندی بەجوانی لە تاکو کۆمەڵەو گروپپەندییەکاندا دەبینرا. بەهۆی نەبوونی سەرکوتکردنێکی گەورە بەبەراورد لەگەڵ ساڵانی دواتردا بیروڕا ئازادانەتر گوزارشتی لێدەکرا، دادگا قۆناغەکانی خۆی دەبڕیو بەناوی دەوڵەتەوە بەدەگمەن خەڵکی سەرکوتدەکرا. ڕێبازە سیاسیەکان، رۆژنامەکان، حیزبەکان، گروپە بەرژەوەندخوازەکان، ئاینو تاکەکان لە بواری گشتیدا پێگەی تایبەتی خۆیان هەبو، دەیانتوانی لەگەڵ یەکتریدا کێبەرکێو رکبەرایەتی بکەن.

ئەو جیهانە لە زۆر بەشی خودئاگا پێکهاتبو (لەلای شیوعییەکان "چینەکان" بو. گشتێك لەناو "گشتێکی" گەورەتری ئیداری یا ئابوری یا کۆمەڵایەتی شکڵی خۆی دەگرت)، بەڵام ئەو شکڵگرتنە هیچ شتێکی لە ناسنامە کۆنەکەیانی کەمنەدەکردەوە. سەرباری توندوتیژی لایەنەکانیش کەچی چینو حیزبو بزوتنەوەو ئاینو تاکەکان قابیلی ئەوە بون لە تەنیشت یەکەوە وەك خشتەی پازل (لوغز ـ puzzle) ڕێکبخرێن.

لەم خودئاگاییو سەربەخۆییەوە زەرورەتی پەیوەندی کردن بە ئەوانی دییەوە لە دەرەوەی چوارچێوەکەی شکڵی خۆیدەگرت.

سەرباری ئەوەی حیزبی شیوعی عێراقی بەدرێژایی حوکمی پاشایەتی حیزبێکی قەدەغەکراو بو، بەڵام لە هەلومەرجێکی لەوجۆرەدا پاکتاوکردنی حیزب لە تواناداا نەبو. لەگەڵ هەمو گوشارێکی سەرکوتکردنیشدا حیزب لە پەرچەکردارێکدا پێگەی خۆی وەردەگرتەوە. قەدەغەکردنی حیزبی شیوعی عێراق بوە مایەی ئەوەی وەك نوێنەری گروپە چەوساوەو زەحمەتکێشەکان، ئەوانەی بێبەشبون لەوەی نوێنەری رەسمییان هەبێت، پێگەی لەنێو جەماوەردا بەرزبێتەوە. تەنها بوونی حیزبی شیوعی عێراقی کۆمەڵگەی روبەروی زەرورەتێك دەکردەوە کە ئاسۆی دیموکراسییەت بەرفراوانتر بکات، ئیدی بەدەر لە دیدو بۆچونی نادیموکراسیانەی خودی حیزب، ئەوەش کارتێکی ئەخلاقی براوەی حیزبی شیوعی عێراقی بو کە لە سەردەمی پاشایەتیدا پێوەی پابەندبو، هەروەها لە دیدی میلەتیشدا سەرچاوەی شەرعییەتێکی گەورە بو.

لەدوای کودەتای ساڵی ١٩٥٨ەوە هەمو شتێك گۆڕانی بەسەردا هات. لەدوای تەقینەوەی قەوارە نارێکخراوەکان لە سیاسەتدا جیهانی "چینەکان"یش، داروخا. حیزبی شیوعی عێراقی لە شەوو رۆژێکدا بوە حیزبێکی جەماوەری نێو شەقامەکان، جەماوەرێك لە شەبەنگی (طیف) جۆراوجۆر پێکهاتبونو بە بێسەروبەرەیی لە دەوری حیزبی شیوعی عێراقیدا خڕببونەوە. لە سەرەتای پەنجاکاندا کێشی رێژەیی چینی کرێکار رووی لە کزی کرد، ئەمە لە کاتێکدا دەزگای دەوڵەتو کەرتی خزمەتگوزاریو پاشماوەی ناچونیەکی شارستانی ناپیشەسازی، گەشەی بەرچاوی بەخۆیەوە دەبینیو لەسەر داهاتی نەوتیش دەوڵەتی هاوچەرخ پەرەیدەسەند. جەماوەر لەدەوری حیزبی شیوعی خڕببونەوە تەنها لەبەر ئەوەی بوونی هەبو، ئەوانەی پەیوەندییان بەحیزبەوە دەکرد، بەدەر لە ئینتمای چینایەتیان ئەو ئەرکەیان جێبەجێ دەکرد، وەك خوێندکار، کرێکار، گوندنشین، روناکبیر، دوکاندار یا تاکە پەراوێزخراوەکان، ئەوانەی لە گوندەکانەوە کۆچیان بۆ شارەکان کردبو لە کوختە قوڕەکانی چواردەوری



بەغدا نیشتەجێ ببون، لەو شەبەنگانەبون کە لە دەوری حیزب خڕببونەوە. لە دوای کودەتاکەی ١٩٥٨ەوە چینە بەتواناکانی کۆمەڵگە رێگەی داروخانیان گرتەبەرو تەنها لە دەیەی ١٩٧٠دا بەعسییەکان ئەو دۆخەیان گۆڕی. چینی کرێکار لەو ساتەدا کە رێگای دەوروبەری تاقیدەکردەوە (پێش ساڵی ١٩٥٨) لە ساڵانی ١٩٥٨ ـ ١٩٦٨ دەستی بەداخوران کردو هەستی ناسکی وەك چینێك بەتەواوەتی تێکشکێنراو ئامۆژگاریکردنی حیزبی شیوعی عێراق دەربارەی سەرکردایەتی کردنی چینی کرێکار لە بۆشاییەکی بێماناادا بەجێمابو.

حیزبی شیوعی عێراقی لەبەر زۆری لایەنگرانی هاوسەنگی خۆی لە دەستدا کە نوێنەرایەتی دیاردەیەکی کۆمەڵاتیان لە عێراقدا دەکرد، هەروەکو لە زۆربەی وڵاتانی سێیەمدا دەبینرا. بەڵام ئەو جەماوەرە خەڵکانێکی دەمدەمی بونو شیوعییەکانی عێراق نەیاندەزانی چۆن ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکەن، هەروەکو روداوەکانی موسڵو کەرکوك دەریانخست. کێشەکە لەوێدابو کە ئەو جەماوەرەش وەك زۆرێنەی دانیشتوان، لایەنگری لە توێژێکی تازە دەرکەوتو دەکرد، ئەمە لە حاڵێکدا حیزبی شیوعی عێراقی نوێنەرایەتی کەمایەتییەکی گرنگی چینی کرێکارانی دەکرد، ئەم وەسفەش خۆی لەخۆیدا ئەوە روندەکاتەوە کە چینی پرۆلیتاریا یەکێك بو لە چینەکانی دی کۆمەڵگە. ئەو لایەنگرانە، بەپێچەوانەی لایەنگرانی جارانەوە لەڕووی سیاسییەوە سودێکی ئەوتۆیان بە حیزب نەدەگەیاند، بەڵکو بەوپەری سادەییەوە چینی کرێکاران لەبەر هۆگەلێك کە زۆربەیان هۆی پروپوچیی رووکەشیی بون لە دەوری حیزب خڕببونەوە. دەرکەوتنیان لەسەر شانۆی سیاسەت لەگەڵ داروخانی چینی فەرمانڕەواو لەناوچونی حکومەتی دیموکراسی پارلەمانی هاوڕابو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە حیزبی شیوعی عێراقی لە ئێستادا لە دونیایەکی نامۆی تازەی نەناسراودا دەژی کە گرنگترین خەسڵەتی لەنێوبردنی بەربەستی نێوان ناسنامەی هەر بەشێك (چینی کرێکار، گروپ، تاكو رۆژنامە)و دۆزینەوەی پەیوەندی بو لەگەڵ جەماوەردا. بەڵام لە دوای ساڵی ١٩٥٩ەوە "بەشەکان" توانای "بیرکردنەوە"و جیاوازییونیان لەگەڵ

"جەماوەر" لە دەســتداو ئەو دیوارو بەربەستە زاتییانەش داروخان بۆ ئەوەی وەك تاكو حیزبو چینو گروپی كۆمەڵایەتی دەربكەون.

بیرۆكــەی جەمــاوەر، بیرۆكەی ئەو گروپانەیە كە لەســەر توانەوەی تاكەكان لەنێو یەكتردا بونیاتنراوە، ئەوەش بیرۆكەیەكی زۆر سەرنجڕاكێشــەو ڕەگوریشــەی لە حەزو ئــارەزوی مرۆڤــدا هەیــە بۆ ئەوەی لــە كۆمەڵدا بژێــتو دیاردەكانی لــە هەمو ئاینو ئەزمونەكانــی جەنــگو ڕەوەندە سیاســییەكاندا دەبینرێ. چەمكی ســتالینی حیزبی شــیوعی عێراقی لەســەر ئەم بیرۆكەیــە بونیاتنرابو (بیرۆكــەی كۆمەڵگەیەك كە چینو گروپی تێیدا نیە، بەڵكو جیهانێكی یەكگرتوە لە مرۆڤایەتیداو لەسەر ئەوە بونیاتدەنرێ كە گشت تاكەكانی یەك ناسنامەیان هەبێتو لە هەمان كاتیشدا هیچ ناسنامەیەكیان نەبێت). بیرۆكەی جەماوەری لە دوای هاوینی ١٩٥٨ەوە وەك فاكتێكی كۆمەڵایەتی چەشنی لافاوێكی خرۆشاو هەمو كەسێكی لەگەڵ خۆیدا ڕادەماڵی، ئیدی لەو ڕۆژەوە تا ئەمرۆ ئەو بیرۆكەیە لە كولتوری سیاسەتی عێراقدا ڕەگی داكوتاوە. بەگشتی گۆڕینی چینــەكان بە جەماوەر هەمان ئەو ئایدیایەیە كە حیزبی شــیوعی لە سیاســەتی خۆیدا هیوای بۆ دەخواســت (بەرنامەی ئایندەی حیزب)، بەڵام چیدی لەگەڵ ڕێكخراوی حیزبێك كە چارەكە سەدەیەك چالاكی لە سیستمی پاشایەتیدا هەبو، سیستیماتیكانە نەدەهاتەوە. بۆیە شــتێكی سروشــتی بو بۆشــایەك لە نێوان واقیعو وشە سیاسییەكانی حیزبدا دەربكەوێتو وشــەكانی حیزب لە دیدی خەڵكی عێراقەوە جۆرێك لە دوبارە بونــەوەی بێمانــاو بێنــاوەرۆك دیاربكەوێت. بەیاننامــەی ١٩٥٨ی حیزبیش یەكەمین هەنگاوی ئەو ئاراستەیە بو.



## حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراكی:

حیزبی بەعســی عەرەبی ئیشــتراكی بەپێچەوانەی حیزبی شــیوعی عێراق، بەشــێوەیەكی ڕاســتەوخۆ خەباتیان ئاراستەی گشــت دەزگاكانی دەوڵەتی نەتەوەیی تــازە پێگەیشــتو دەكــرد، بەتایبەتــی جەختیــان لەســەر حكومــەتو كۆڵەكەكانی دەســەڵات دەكردەوە. بەعسییەكان پشتیان بەهیچ چینێكی كۆمەڵایەتی نەدەبەست، بەتایبەتــی ئەوانــەی لە ســایەی ڕژێمی پاشــایەتیدا پیــادەی دەســەڵاتیان دەكرد، یا پشــتیان بەهیچ ئەڵتەرناتیڤێكی دی نەدەبەســت كە پێیوابێت دوا فاكتەری مێژوویەو لەدوای ســاڵی ١٩٥٨ەوە بەشــێوازی ئاڵۆز كاری لەسەر عەقڵە ســەربازییە قاڵبوەكان دەكرد. بەعســییەكان وەك بزوتنەوە، ڕۆحی تێكۆشانو ئاراستە دینەمۆكانیان لەڕوونی ئامانجەكانیانەوە وەردەگرتو هەمو شكستەكانی حكومەتیان دەخستە ئەستۆی سنورە "ناشــەرعییەكانی" دەوڵەت. لە ڕاستیدا ئەو دوو شتەش (سنورو ڕوونی ئامانجەكان) هەمیشــە لە زەینی بەعســییەكاندا یەك شــت بون. لەم بوارەدا گفتوگۆ كردن ئاسان بو، چونكە لە ترۆپكی بیری ناســیونالیزم لە دەیەكانی ١٩٥٠ - ١٩٦٠دا كۆدەنگییەك لەسەر دەوڵەتی عەرەبی بوونی نەبو. لە پاڵ ئەوەشدا بە لەنێوبردنی پارلەمان، بونیادی ئیداریش نەما تا بتوانێت كاری سیاسی چینەكانو ئەوانی دی ڕێكبخات، بۆیە كاتێك چینــەكان جێگەی خۆیان بۆ جەماوەر چۆڵ كرد، ئیدی بەعســییەكان بەپێچەوانەی حیزبی شیوعی عێراقییەوە گوێبیستی لێدانی دەنگی گۆڕان بون.

عەفلــەق دەڵێت: "ڕۆڵــی جەماوەر لە جیهاندا گەیشــتە ئەوپەڕی بەهێزی خۆی، شۆڕشــی گەلانی ڕۆژهەڵات، بەپێچەوانەی ڕوداوەكانی ڕۆژئاوا، خەســڵەتی مرۆیی‌و ئازادیخوازانــەی هەیــە، چونكــە دژی ئیمپریالیــزم ئاراســتەدەكرێ... لەڕۆژئــاوا چەوســانەوەی چینایەتی هەیە، بەڵام ڕۆژهەڵات لە میلەتانی چەوساوە پێكدێت"[16]. بەعســییەكان بەنزیكەیی جەماوەرو میلەت بەیەك شــت دەزانــن، چونكە پێیانوایە لە

هەلومەرجی سیاسیو کۆمەڵایەتی عەرەبیدا، چین چەمکێکی تایبەتی نیە. کەچی شیوعییەکان تا ساڵی ١٩٧٠یش جەختیان لەسەر چینایەتی دەکردەوە: "چینی کرێکار، چینێکی پێشکەوتویی کۆمەڵگەی ئێمەیەو ڕۆڵی پێشڕەوی... لە ئەنجامی دەوڵەمەند بونی ناوەڕۆکی شۆڕشی دیموکراتی نەتەوەییو مانای نوێی کۆمەڵایەتیو پەیوەندی ئەم شۆڕشە بەپرۆسەی شۆڕشی جیهانییەوە بە بەردەوامی زیاد دەکات"[17]. بەعسییەکان بەپێچەوانەی حیزبی شیوعی عیراقەوە، سیاسەتی جەماوەرییان گرتەبەرو ساڵی ١٩٧٣ لە نوسراوێکی زیرەکانەی یەکێك لە ئیدارە تایبەتەکانی حکومەتی بەعس "پەروەردەکردنی جەماوەر"، ئەم وتانە هاتوە:

"ئایا شۆڕشی عەرەبیی هاوچەرخ، شۆڕشی تاکە چینێکە یا شۆڕشی گشت نەتەوەی عەرەبە بە هەمو چینو توێژەکانییەوە؟ ئایا ئەم شۆڕشە دەیەوێت چینە دیاریکراوەکان پاکتاو بکات؟ ئایا بەدوای بۆ نمونە شتێکی وەك دیکتاتۆری پرۆلیتاریا دەگەڕێت؟ لەم قۆناغە مێژووییەی ئێستادا، یا بەگوزارەیەکی دی، لەسایەی پەرتەوازەیی نەتەوەی عەرەبو پەلاماری زایۆنیزمو باڵادەستی ئیمپریالیزمدا، شۆڕشی عەرەبی ناتوانێت شۆڕشی تاکە چینێك بێت، بەڵکو شۆڕشی نەتەوەیەکە لەگەڵ دواکەوتنو دابەشبونو چەوسانەوەدا شەڕی دەستو یەخە دەکات.

لە ڕوانگەی بەعسدا ئایدیای میلەت لە قۆناغی شۆڕشدا بەمانای ئەو تاكو کۆمەڵو چینە شۆڕشگێڕانە دێت کە دەبنە کەرەستەی شۆڕش، هەروەها میلەت ئەو جەماوەرە ڕێکخراوو هەرەمەکییە (ئۆتۆماتیزم)یە کە دەبنە پێگەی شۆڕش. ئەگەر چینی کرێکار چینێکی سەرەکییە، ئەوا زۆر بەسادەیی ڕۆڵی سەنتەراڵ بۆ شۆڕشی عەرەبی دەبینێت، کە بریتیە لە بەرجەستەکردنی یەکێتی ئەو چینو کۆمەڵو تاکانەی لە پێناوی ئامانجەکانی شۆڕشدا تێدەکۆشن"[18].

لێرەدا جیاوازییەکی بەعسیانە لە نێوان چینەکانو میلەت لەم ئاراستەی خوارەوەدا دەردەکەوێت کە دەکرێ پێشبینی بکرێ: "جەماوەری عەرەبی، جەماوەرێکی چەوساوەو ستەمدیدەیە، بۆیە بەخاتری چەوسانەوەو قوربانی بونیان نوێنەرایەتی



ڕاستەقینەی نەتەوەیەکی بێگەرد دەکەن، هەروەها هێزو توانای نەتەوەش لەنێو ئەو جەماوەرەدایە"[19].

حیزبی شیوعی عێراقی لە کاروباری عەرەبیدا ڕوبەڕوی هەمان کارەسات بوەوە کە لە مەسەلە ناوخۆییەکانی دوای ١٩٥٨دا ڕوبەڕوی بوەوە، بەڵام بەئاراستەکی جیاوازو پێچەوانەوە. حیزبی شیوعی عێراقی لە بوونی سنوری نێوان وڵاتەکان ڕازی نەبو، بەڵام وەك مەسەلەیەکی بەڵگەنەویست وەریگرتبو، هەروەها لەسەر بنەمای دەوڵەتی نەتەوەش پێی قبوڵ بو. بەڕوخانی ڕژێمی پاشایەتی ئیدی ئەو کارەی تا ئەو دەمە لە واقیعی کۆمەڵایەتی ـ سیاسی کێشەك نەبو، لە فۆرمی کێشەیەکدا دەرکەوت. حیزبی شیوعی عێراقی کە لە ساڵانی پێش ١٩٥٨دا چالاکییەکانی لەسەر ناعەدالەتی ناوخۆی عێراق تەوەرەی دەبەست، لە ساڵانی ١٩٦٠دا خۆی لە بەرامبەر مەسەلەگەلێکدا دەبینییەوە کە لە سنوری دەوڵەتی عێراق زیاتر پەلیدەهاویشت.

لە ڕاستیدا داواکاری حیزبی بەعس بە "یەکگرتنەوەی هەنوکەیی" بەرامبەر بە فیدراڵییەتی نێوان دەوڵەتە عەرەبیەکان دانرابو کە دروشمێکی حیزبی شیوعی عێراق بو. ئەو پێشنیازەی حیزبی شیوعی عێراقی زۆر بەپەلە داڕێژرابو کە خودی حیزبیش زۆر بڕوای پێی نەبو. بۆ نمونە عامر عەبدوڵڵای تیوریستی ناوداری حیزبو ئەندامی مەکتەبی سیاسی لە شوباتی ١٩٥٩ لە باسێکی گشتیدا کە زۆرێك بیروڕای زانستی پێوەدیار بو، دەیویست ئەوە بسەلمێنێ کە سەرباری ئەوەی حیزبی شیوعی عێراقی وەك پرەنسیپ دژی یەکگرتنەوە نیە، بەڵام خودی پرۆسەی یەکێتی زۆر مەسەلەی ئاڵۆزی لەدوتوێیدا هەڵگرتوە[20].

بەهەر حاڵ فیدراڵییەتی ڕاستەقینە بوونی پێشوەختی ناسیونالیستێکی کەمینەی زۆر پێشکەوتو دەسەپێنێت (عێراقو سوریاو لوبنانو وڵاتانی دی)، بەڵام ئەو ناسیونالیستە وەك حەقیقەتێکی هەست پێکراو بوونی نەبو، بەڵکو دەکرێ بوترێ لە عێراقدا وەك هەستو هیوای عەرەبی بوونی هەبو. لەپاڵ ئەوەشدا وادەردەکەوێت کە حیزبی شیوعی عێراقی یەکێتی عەرەبی وەك تیوری پێقبوڵ بوبێت، بەڵام بەهۆی تایفییەتی

ڕووتەوە وەلاوەنرابو. جەختکردنەوەی حیزبی شیوعی عێراقی لەسەر دیموکراسییەت، بەتایبەتی دوای ڕوداوەکانی کەرکوك‌و موسڵ، تا ڕادەیەکی زۆر وەك هەڵوێستێکی ڕیاکارانە دەردەکەوت.

پانعەرەبیستەکان ئەو گفتوگۆیانەیان بردەوە، چونکە هاوڕێ لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سیاسەتی عێراقدا، ئەوانیش پەرچەکرداری خۆیان دەگۆڕێ، هەر چەندە پێگەیەکی زۆر لاوازیان لە وڵاتدا هەبو، بەڵام لەوەدا سەرکەوتوبون کە مەسەلەکە بخەنە بەرنامەی کاری خۆیانەوە، بەمشێوەیە بانگەوازی یەکگرتن لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتودا بەشێوازێکی هەڵە بەرامبەر لاوازی چەپ گەڵاڵە دەکرا. بەتەنها جەختکردن لەسەر خود یارمەتییەك بو بۆ دەرمانکردنی فروفێڵی چەپ. ئەو بڕوایەی پێیوابو کە یەکگرتنی دەمودەستی عەرەبی گرنگییەکی زۆری بۆ عێراق هەیە، لەماوەی ١٩٦٠ ـ ١٩٦٣ ئەڵتەرناتیڤێکی نایابی بۆ گرفتەکانی پرۆسەی یەکگرتنەوەیەکی ڕاستەقینە ئاشکراکرد، بەتایبەتی ئەو بڕوایە بۆ ئامانجێکی ڕوون دەوترایەوەو مەبەستی سەرنەگومکردنی ڕژێمێك بو کە هێدی هێدی جەماوەری لەکەمی دەدا.

حیزبی بەعس بە پێچەوانەی حیزبی شیوعی عێراقەوە دەرهاویشتەیەکی ئەسڵی جەماوەر بو، بەتایبەتی بەشێوازێك لەگەڵ ژیانی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی دوای ساڵی ١٩٥٨ عێراقدا بگونجێت. سیستمی حکومەتی پارلەمانی تاکە ئامرازێکی شەرعی بو کە دەیتوانی دژە ڕێوشوێنێك بۆ دەرکەوتنی جەماوەر، وەك هێزێك لە بنەوەو بوونی هێزی سەربازەکان لەسەرەوە، پێشکەش بکات. گرفتی سیاسی بەهۆی باڵادەستی نوێی جەماوەر، وەك بیرۆکەی گروپ‌و ڕاستییەکی کۆمەڵایەتی سەریهەڵدا. تێکەڵبونی خەڵکێکی زۆر بەکاری سیاسی هیچ گرفتێك دروست ناکات. هاودڵی جەماوەر لەگەڵ بەعسییەکاندا لە کاتی دادگاییکردنی ساڵی ١٩٥٩دا ئاماژەیەك بو بەوەی کە جەماوەر چەند بەخێرایی دەگۆڕێن. حیزبی شیوعی عێراقی نەیتوانی سود لە ڕوداوەکانی سەردەمی حوکمی پاشایەتی وەربگرێت. ڕۆڵی حیزب بۆ کێشکردنی جەماوەر لەسەر حیسابی هەمو شتەکانی دی بچوك بوەوە. ئەو ڕێسایانەی حوکمی



سیاسەتی دەکرد، گۆڕانی بەسەردا هات‌و بەعسییەکانیش گۆڕانی هەمو شتەکانیان لە بەرژەوەندی خۆیاندا دەبینی.

شکۆمەندی پانعەرەبیزم وەك فۆرمۆلەیەکی زۆر سادەو ڕادیکالیزمێکی چالاك‌و پەیامێکی ڕزگاریخوازو بەرزەفڕی عەرەبە چەوساوەو نەدارەکان دەردەکەوت. هەروەها لە جیاتی ئەو هەمو خەسڵەتە ئاڵۆزو نادروستانەی تایبەت بون بە گرفتە ڕاستەقینەکانی خەڵکییەوە، شەبەنگی شکۆمەندی ڕابردو بە پێداویستیە هەنوکەییەکان دەبەستراینەوەو لەم بەعس یا زیندوبونەوەیەش نەوەیەکی نوێ بەدیاردەکەوێت کە ڕۆحی عروبەی پێبقبوڵ بو. خود جەختکردن (التركيز الذاتي) بەرگی جیهانگەرایی پێ لەبەرکراو دەستی هاوڕێیەتی‌و هاوکاری لەدژی ئیمپریالیزم بۆ ملیۆنان عەرەبی وڵاتە دوورەکان درێژ کرد، ئەو عەرەبانەی ڕوبەڕوی ستەم‌و چەوسانەوە دەبونەوە هیچ پەیوەندییەکی تۆکمە یا بەرژەوەندییەکی ئابوری، یا تەنانەت یەك چارەنوسیش پێکەوەی نەدەبەستنەوە. وادەردەکەوت وەکئەوەی لێکنەچون‌و ناسیستماتیکی نێوان جەماوەر لە تاکە وڵاتێکدا مەزنترین فەزیلەتیان بێت، پاشان ئەو فەزیلەتە بۆ ئاستی پرەنسیپ بەرزبکرێتەوە، ئەو پرەنسیپەش یەکگرتن بو، کە تێیدا هەمو جەماوەری ناچونیەکی عەرەبی لە گشت وڵاتە عەرەبییەکاندا ڕێکبخرێن.

بزوتنەوەی پانعەرەبیزم ئایدیای کۆمەڵێکە کە وەك پۆلینێکی کۆمەڵایەتی ئاوارتە پەیوەندی بەجەماوەرە دەکات، هەروەها وەك بیرۆکەیەکی سۆسیالیستی عەرەبی کە داهێنانێکی بەعس بو، داوا لە هەمو کەسێك دەکات واز لە ناسنامەی خۆی بهێنێت‌و لەگەڵ ئەودا یەکانگیر بێت. لەمڕووەشدا پانعەرەبیزم مەزنترین پێشکەوتن‌و گۆڕان بو کە لە بیرۆکەی جەماوەر وەك گروپ باڵاتر بێت، چونکە پۆتۆپیایی جیهانێکی پڕ لە خوشك‌و برا بۆ نەرجسییەت دەگۆڕێت. لەم بارەیەشەوە پانعەرەبیزم وەك شێوازی بیرکردنەوە لە جوانییەکی زۆر بەهرەمەندە کە خەڵکی بۆ خۆی ڕادەکێشێت، هەروەکو چۆن پەپولە بەرەو مۆم دەڕوات.

## ئاوەژوو کردنەوەی فیکرەکان:

" ئێمەی شـیوعی لە رابردودا دەربارەی ئەوانەی دروشمی یەکێتی عەرەبیان بەرزدەکردەوە، ئاراسـتەیەکی گۆشەگیرمان هەبو. ئەو گەڵاڵەنامەیەی دوای شۆڕشی تەموزی ١٩٥٨ەوە پێشـکەمان کرد، گەڵاڵەنامەیەکی هەڵەو نادروست بو، نەدەبوایە دەنگی ناڕەزایی لەبەرامبەر بانگەوازی یەکێتی عەرەبی بەرزبکەینەوە"[21].

بەرواری ئەو نوسـینە بۆ ئابی سـاڵی ١٩٦٤ دەگەڕێتـەوە، واتە رێك هەژدە مانگ دوای روخانی رژێمی قاسـمو کەوتنی حیزبی شـیوعی عێراقی لەسەر دەستی رژێمی بەعس کە سـاڵی ١٩٦٣ لە رێگەی کودەتایەکەوە دەسەڵاتی گرتبوە دەست. حیزبی شـیوعی عێراقی بەمەبەسـتی گەڕانەوە بۆ ژیانی گشـتی هێندێك هەنگاوی مەزنی نا کە بەشـێوەیەکی سـەرەکی هاوکات بو لەگەڵ باشـتربونی پەیوەندی نێوان کۆماری یەکگرتـوی عەرەبـیو یەکێتی سـۆڤێت. بەڵام ئـەو گۆڕانکارییە تـا ماوەیەکی زۆر گۆڕانکارییەکی رووکەشـی بو، تا رادەیەکی زۆریـش رەنگدانەوەی ئەو خەتە بو کە لە مۆسـکۆوە رێنمایی دەکرا. ئاشکراکردنی فەزیلەتی پانعەرەبیزم، هەڵسەنگاندنەوەی رژێمی عارفی کردە کارێکی پێویست کە لە تشرینی دوەمی ١٩٦٣دا کۆتایی بەرژێمی بەعسو حکومەتەکەی هێنا. رژێمی نوێ راوکەی کێشـکردنی جەماوەر بو لە دژی ئیمپریالیزمو هەنگاوێکیش بو تا وڵات بۆ "کاروانی رزگاریخوازی عەرەبی" بگێڕێتەوە. لۆجێکی حیزبی شـیوعی عێراقیو ئاراستەی گۆڕانکارییەکەی لەگەڵ دەرئەنجامێکی تەڵخدا هاورابو، چونکە سەرکردایەتی شیوعی خۆی لەوە دەدزییەوە کە لە سەردەمی رژێمی پاشایەتیدا نوێنەرایەتی چی دەکرد:

" شـیوعییەکان کارێکی هەڵە دەکەن، گەر پابەندبن بە دیموکراتییەتی سیاسییەوە وەك پێشـمەرجێك بـۆ پشـتگیریکردن لـە هـەر یەکێتییەکـی عەرەبی. مەسـەلەی دیموکراسـی، بەمەسـەلەی ژیانی حیزبایەتیشـەوە، دەشێت لە پرۆسـەی یەکگرتنو



خەباتی جەماوەرییو قەناعەت پێهێنانیانو دەسـەڵاتی ئۆردوگای سۆسیالیستی لەسەر خودی سەرکردەکانی عەرەب، چارەسەر بکرێ"[22].

کاتێك سـەرۆك عـارف پەیوەندی لەگەڵ ناسـردا پچڕیو روویکـردە حکومەتی مەدەنـیو کۆمەڵگەی کـراوە (١٩٦٥ ـ ١٩٦٦)، حیزبی شـیوعی عێراقی "پەنجەی شـاراوە"ی ئیمپریالیزمی بریتانیاو مۆنۆپۆلی پەترۆڵـی لەپیلانەکەی عارفدا بەدیدەکرد. حیزبی شیوعی عێراقی بەم پەرچەکردارەی ئەوەی نیشاندا کە تا چ رادەیەك بەتوێژی پانعەرەبیزمەوە سەرقاڵەو لە هەستی جەماوەریی دوورکەوتۆتەوە.

ئایدیای جەماوەری لە بیرکردنەوەی گشـتی سیاسەتدا باڵادەست بو، هەر چەندە ماوەیـەك بو جەماوەر وەك هێزێکی راسـتەقینە لە شـەقام دوور کەوتبـووەوە، چونکە جەماوەر لە ماوەی شـوبات تا تشـرینی دوەم لەسـەر ئاسـتێکی بەرفراوانتر روبەروی توندڕەوی رژێمی بەعس ببوەوە. ساڵی ١٩٦٩ عەبدولرەحمان بەزاز، کە لە سەردەمی حوکمی عارفدا، دینەمۆی سـەرەکی بزوتنەوەی دیموکراسیی بو، بەتاوانی سیخوری دەسـتگیرکراوو بەوپەری دڕندەییەوە ئەشکەنجەدراو حیزبی شیوعی عێراقیش جگە لە جەختکردنەوە لەسەر تومەتەکانی پێشوی لە دژی بەزاز دەیتوانی چی دی بکات؟.

لە ساڵانی شەستەکاندا هێڵی یەکلاکەرەوەی نێوان پانعەرەبیزمو حیزبی شیوعی لە دیدی جەماوەرەوە زۆر ناسكو بێرەنگ بو. حیزبی شیوعی لە ساڵی ١٩٥٩دا دەیتوانی لەسـەر روداوەکانی کەرکوكو موسـڵ خۆی رەخنەبکات (ئیدی ئاسـتی ئەو رەخنە لەخۆگرتنە چەند بێت)، بەڵام لە ئێسـتادا هەمو شـتێك بەپیلانو دەسیسـە دەبینێ. لە پاڵ ئەوەشـدا ئەم بیرکردنەوە تازەیە بەشێوەیەکی زیاد لە بێبەهاکردنی دیموکراسی (لەڕووی تیورییەوە) تێکەڵو هاوڕا بو. ئەو زەمینە ئەخلاقییە بەرزەی حیزبی شـیوعی عێراقی لەسـەردەمی حوکمی پاشـایەتیدا خۆی لەسـەر راگرتبو، تەنانەت پێشئەوەی بەعس ساڵی ١٩٦٨ بەدوەم حوکمڕانی بگات بەرەو داوەشان رۆیشت بو.

گـۆڕانو ئاوەژووکردنـەوەی بیروبـاوەڕەکان لە نێوان ١٩٥٨ ـ ١٩٦٨دا باڵانسـی هاوسـەنگی سیاسـەتی عیراقی بەشێوازێك لاسـەنگ کرد کە لە بەرژەوەندی حیزبی

بەعسی عەرەبی ئیشتراکی کەوتەوە. ئەوەی بەعس لەسیاسەتدا نوێنەرایەتی کرد، لەنێو ئەو روناکبیرانەی زمانی رەســمی جەماوەربون، نەك هەر پێگە، بەڵکو دەسەڵاتیشیان پەیدا کرد. ئەو شەرعییەتەی تا ئەو دەمە لەلای حیزبی شیوعی عێراقی بو، دەگوێزرایەوە بۆ دوژمنە سەرەکییەکەیان، واتە حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی، ئەگەر چی هێشتا گشــت شیوعییەکان نەحیزبییان بەجێهێشــتبو، نە پەیوەندیشیان بە بەعسەوە کردبو. ئیدی حیزبی شــیوعی عێراقی بوە ئــەو بریکارەی چاوەڕوانی خۆبەدەســتەوەدان بو، پێش هەمو شــتێکیش دەبوایە ئەو میراتییە مێژووییە مەزنە رادەستی دوای ئەوەی خۆی بکات. حیزبی شــیوعی عێراقی، دێرینترین حیزبــی عێراقی بو (١٩٣٢ دامەزرا)و زۆر بەخێرایی بیروڕاکانی لە شــارە گەورەکاندا بڵاوبوەوە، بەجۆرێك کە پەنجا دەرسەدی لاوانــی هەمــو چینەکان لە ریزی ئەو حیزبەدا بــون[23]. جێبەجێ کردنی ئەو گۆڕانو گواستنەوەیەش کاتی پێویست بو.

هەروەرها خودی کۆمەڵگەش هەڵاوێردێکی زۆری لەبەر دەستدا نەبو. بەماوەیەکی زۆر پێشــئەوەی بەعس بۆ جاری دوەم حوکم بگرێتەدەست ژیانی کولتوری دوچاری خەفەکردن ببو. لە پاڵ ئەوەشدا زمانی سیاسەتی حیزبو رێکخراوەکان نەك هەروەکو جاران نەمابوەوە، بەڵکو لە حاڵەتی داروخانو پوکانەوەشــدا بو، وشــەکان بەریەکتر دەکەوتــن، بەجۆرێك کار گەیشــتبوە ئەوەی هەمویان یەك مانا ببەخشــنو جیاوازی گەورەو بچوکیش لە فیکردا مانای خۆیان لە دەستدابو، توانای بیرکردنەوەی سیاسیانە ماڵئاوایی لە کۆمەڵگە کردبو.

پێش ســاڵی ١٩٥٨ ئایدیاکان بەئاراستەیەکی پێچەوانە دەبزوان. بەعسیەکان چەند هەوڵو تەقەڵلا بدەن، دیسانەوە ناتوانن ئەو پشکە نادیدە بگرن کە حیزبە کۆمۆنیستە عەرەبییەکان لە هەڵگۆزینی فیکری بەعسدا هەیانبوە. ئەو پێگەیەی تیورەی کۆمۆنیزم لەســەر رێکخســتنو چەمکی ئیمپریالیزمو سۆســیالیزمو ئازادی لە فیکری بەعســدا پەیــدای کرد، زۆر گونجاوتر بو لەو پێگەیەی نەتەوەگەرای عەرەبی لەلای شــیوعی عێراقی پەیدایکرد. لە قۆناغی گواســتنەوەدا مانای ئەو ســێ وشــەیە بەشێوازێکی زۆر



نائاســایی پوچەڵو بێمانا بــو. "بەهەر حاڵ زمان بۆیە ناشــیرینو دزێو دەبێت، لەبەر ئەوەی فیکرمــان گێلانەیە، بەڵام پۆخڵی زمانەکەمــان وامانلێدەکات فیکری گێلانە هەڵگرین"[24]. ئێستاش روونیدەکەینەوە کە پوچەڵی ئەم سێ وشەیە چۆن رێگەیان بۆ فیکری گێلانە هەموار کرد.

## ئیمپریالیزم:

هەر چەندە ئیمپریالیزمو زایۆنیزم پشــکیان لە دارشــتنی فاکتە سیاسییەکانی عێراقدا نەبو، بەڵام پەیوەندی نێوان دەســەڵاتی دەوڵەتو ناشــەرعییەتی یەکپارچەیی ســنوری عێراق زیاد لە پێویســت ســودیان لەو دوو گوزارەیە وەرگرتــوە. ئیمپریالیزم یەکێکە لەو وشانەی کە لە سەردەمی لینینەوە لە جبەخانەی مارکسیزمەوە وەرگیراوەو ئەوانی دی ســودیان لێوەرگرتوە. بەعســییەکان تاکە گروپ نەبون کە ئەم وشەیەیان بەکاردەهێنــا، چونکە پەیوەســت بو بــە گرنگترین ئایدیۆلۆجیای جیهانی ســێیەم لە قۆناغی دوای جەنگی جیهانیەوە یەکەمەوە[25].

حیزبــی شــیوعی عێراقی لەســەردەمی پاشــایەتیدا تــا رادەیــەك ئیمپریالیزمی وەك مەســەلەیەکی تیوری وەرگرتبو: ئیمپریالیزم ئەو هێزەیە کە دەبێ بۆ نمونە بەهاوکاری یەکێتی ســۆڤێت دژایەتی بکرێ، یا لەجیاتی ئەوەی هاوپەیمانیو دۆســتایەتی لەگەڵ رۆژئاوادا دەبەســترێ، پێویستە هاوپەیمانێتی وڵاتە سوسیالیستەکان بکرێ. لە راستیدا رژێمی ماندێت (ئینتداب) حوکمڕانییەکی ناراســتەوخۆی بریتانیا بو لەسەر عێراق کە دواجار بەجۆرێك لەسەربەخۆیی سیاسی کۆتایی دەهات. ئیمپریالیزم لەناوخۆیی عێراقدا لە فۆڕمی چینی فەرمانڕەوادا خۆی بۆ حیزبی شیوعی عێراقی دەخستەڕوو. حەقیقەتی ئیمپریالیزم لە شــکڵی ئەو چینەدا دەردەکەوتو لە سیاسەتی عێراقدا پەیوەندی بەهیچ تیوەگلانێکی دییەوە نەبو.

کاتێك حیزبی شـیوعی عێراقی لەدوای جەنگی شـەش ڕۆژەی ١٩٦٧ عەرەب ـ ئیسـرائیل فیکـری پانعەرەبیزمی تەبەنی کرد، ئیدی ئیمپریالیـزم لەدیدی ئەو حیزبەوە مانایەکـی بەرفراوانتـری پەیداکردو بوە "دوژمنی سـەرەکی شۆڕشـی دیموکراسـی نەتەوایەتی"و ئەو بیرۆکە کۆنەش بوژایەوە کە دەیوت: "ئیمپریالیزم لە ناوخۆی وڵاتو لەنێـو دەرەبەگـو موڵکدارە گەورەکانو بۆرجوازی بچوکدا، دۆسـتی دژە شـۆڕشو سروشـتی هەیە"[26]. بەڵام ماوەیەك بو ئەو کەسانە هیچ شوێنەوارێکیان نەبو، چونکە ماڵو موڵکیان دەستی بەسەرا گیرابو، خۆشیان لە دەرەوەی وڵات لە تاراوگە ژیانیان بەسەر دەبرد، بۆیە هەر چەندە ئیمپریالیزم لە زەینیدا قەبەتر دەبو، زەمینەی مادی بەپێی تیورەی خودی حیزبی شیوعی عراق لەسەر ئەم دیاردەیە ناهەستیارتر دەبو.

لەلایەکی دی، زایۆنیزم لە جیهانی ئایدیۆلۆجیای حیزبی شیوعی عێراقیدا پێگەیەکی سروشتی نەبو. ئەو ڕایەشیان دەربارەی ئەم مەسەلەیە بۆ بانگەوازەکەی یەکێتی سۆڤێت لەمەڕ دابەشـکردنی فەڵەسـتین دەگەڕایەوە، ئەوەش ڕەئی هەمو حیزبە شـیوعییەکانی جیهانی عەرەبی بو. بەڵام هەڵوێسـتی حیزبی شـیوعی عێراقی لە ١٩٤٨ەوە چەندین کەڕەت گۆڕانی بەسەردا هاتوە.

بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی لەسەرەوە باسی لێوەکراوە، ئیمپریالیزم لەلای بەعسییەکان بەردی بناغەی ڕژێمی ئایدیۆلۆجیایەك بو کە لەگەڵ سیستمی دوای جەنگی جیهانی یەکەمدا هاتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاسـتەوە. لەڕووی سیاسیشـەوە، بێگومان ئەم سیستمە دەرئەنجامی ئەو بڕیارانە بو کە وڵاتە سەرکەوتوەکان لەسەر بنەمای بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان دەریانکردبو. کاتێك پێشەکی ناسنامەی عەرەبی بخرێتە بواری جێبەجێ کردنەوە (ئەم ناسنامەیە لەگەڵ ناسنامەی سوریاو عێراق ناکۆك بو)، ئیدی چەمکی ئیمپریالیزم بە ڕوونکردنەوەی مێژوویی لەمەڕ دابەشکردنی سەرزەمینی عەرەبی دیاریناکرێ، بەڵکو دەبێتە هۆی بەردەوامبوونی (بەتایبەتی لە عێراقدا منەکردنی ناسنامەی نوێ دەگەڕێتەوە بـۆ دوای ڕوخانـی ئیمپراتۆرییەتی عوسـمانی کە مێژوویەکی زۆر کۆنـی نەبو). ئەو بەیەکگەشـتنەی واقیعو ئیدراك کە ڕێگەی بە بەعسدا هەمو کاسەو گۆزەکان بەسەر



ئایدیای ئیمپریالیزمدا بشکێنێت، ئایدیای ئیمپریالیزمی دوچاری گۆڕان کردو لەکارتی حیزبی شـیوعی عێراقییەوە بۆ شتێکی دی گۆڕاو ناوەرۆکێکی ڕاستەقینەی گریمانەیی هەبو: ئایدیای بیانییەکی بەتوانا کە سەرچاوەی هەمو شەڕەنگێزییەکی ناوخۆ بو.

ئەو ئێسکە ڕووتەی ئیمپریالیزم پێویستی بەماینچە هەبو، زایۆنیزمیش ئە ماینچەیەی دابیندەکـرد. نمونەی دەسـەڵاتی ئیمپریالیزمـی فێڵبـازی زۆردار بەتەواوەتی لە هەمو جەنگەکانی عەرەب ـ ئیسـرائیل ڕووندەبێتەوەو شکسـتی ئەو جەنگانەش ئاماژەیە بۆ بوونی سـتونی پێنجەم کە خۆی لـە کۆنەپارێزی عەرەب، یەهودییەکانی نیشـتمانی عـەرەبو کـورد دەبینێتـەوە، ئەوانـەی هاوپەیمانیان لەگـەڵ ئیمپریالیزمـدا هەیە. بەمشـێوەیە بیرۆکەی سـێ کوچکەی نەفرەتلێکراوی دوژمنکار لە دایك بو کە بریتی بون لە ئیمپریالیزمو زایۆنیزمو کۆنەپارێزی عەرەبی، ئەوانەی گشـت هێزە ئازادیخوازە دڵسـۆزەکانی عەرەب ڕوبەرویان دەوەستنەوە. نابێت بەهیچ شێوەیەکیش ئەم ئامرازانە بەهەند وەرنەگیرێن، مادامەکی ڕێسا سەرەکییەکەی قبوڵکراوە. ئیدی درەنگ یا زوو هەمو مەسەلەیەکی سیاسی، چەند لۆکاڵیش بێت دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە پیلانی ئەو سێ کوچکەیەی کە ئیمپریالیزم پێگەیەکی مەزنی تیا داگیر دەکات.

لەڕووی ئایدیۆلۆجیاوە سـەرەکیترین دیاردەی ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە لە سیاسـەتی عەرەبیی سـاڵانی شەسـتەکانی سەدەی بیسـتەمدا بانگەوازێکی بەرفراوانی ئەمجۆرە بیرکردنەوەیە بو. ئەم گۆڕانە بەردەوامە پانعەرەبیزمی توشـی لێدانێکی کوشـندە کرد، کـە ناسـریزم لـەدوای شکسـتی شـەش ڕۆژەی ١٩٦٧ بەرجەسـتەترین فۆڕمی بو، تەنانەت بزوتنەوەی بەعسـیش بوە دوو باڵەوە، باڵی سـوریو باڵی عێراقی. شکستی سـەربازیی عەرەب لەو جەنگەدا کەسـایەتی ناسری ڕوشـاندو گورزێکی کوشندەی لـەو بیرۆکەیش وەشـاند کە پێیوابـو ڕژێمە پێشـکەوتوخوازەکانی عـەرەب دەتوانن شـتێك بەرامبەر بە ئیسرائیل بکەن. ئەو شکستە بوە مایەی ئەوەی مەسەلەی خەباتی چەکـداریو شۆڕشـگێرێتی جەماوەرێکی فـرە لە دەوری خـۆی خڕبکاتەوە، بەڵام کۆڵەکـە سـەرەکییەکانی جیهانبینی پانعەرەبیزمی لەنێونەبرد. خەباتی فەڵەسـتینیبوون

لــە دژی ئیســـرائیل‌و زایۆنیــزم، هەرێمایەتی بوونی بەعس لە ســوریاو عێــراق لەگەڵ چوارچێــوەی مەرجەعــی نەرێتیدا ناکۆك نەبــون، کە هەمو ڕوداوەکانــی بە ئاکامی کردەوەکانی "ئیمپریالیزم‌و زایۆنیزم‌و کۆنەپارێزی عەرەبی" دەزانی. نمونەی ئەم تەبەنی کردنەش لەنێو باڵە چەپەکانی بزوتنەوەی ڕزگاریبەخشــی فەڵەستینی لەدوای ١٩٦٧دا بەزۆری دەبینرێ، دەشــێت لە ئێستاشدا ئەو سێ فاکتەرە لەو ڕوونکردنەوەو بەیانانەدا ببینرێ کە لەسەر شەڕی ناوخۆیی لوبنانی عەرەب/موسڵمان دەوترێ. بۆیە کەلەپوری پانعەرەبیزمی وەك قۆناغێك لە قۆناغەکانی سیاســەتی عەرەبی لەدوای جەنگی شەش ڕۆژە لەوەدا نیە کە لە ماوەی نیو ســەدەدا نەیتوانی یەکێتی عەرەبی بهێنێتەدی، بەڵکو لەو شــێوازەدابو کە هەمو بوارەکانی سیاســەتی گرتبوەدەست، واتە لەو زمانەدا بو کە توێژە سەرەکییەکان بەکاریاندەهێنا.

شــتێکی سروشــتییە کە واقیعی پەرتەوازەیی دەوڵەتە عەرەبییەکان لە کۆتاییدا کار لەسەر ڕەخنەکردنی چۆنێتی پەرەســەندنی پانعەرەبیزم دەکات. ئەمجۆرە دەستەواژانە لەدووتوێی ڕوناکی ئەو کردەوانەدا دەردەکەوێت کە بەعس لەدەســەڵاتدا ئەنجامیداوە (ســاڵانی هەشــتاکان)، نــەك ئــەو کاتەی دەســەڵاتیان گرتەدەســت (لە ســاڵانی شەســتەکاندا). لە واقیعدا جیــاوازی نێوان لۆجیکی ناو فیکرێك‌و ئەو ڕاســتییەی لە واقیعــدا ڕوبەڕوی دەبێتەوە لێرەوە ســەرهەڵدەدا. کەلەبەری نێوان ئەم دوو مەســەلەیە لە سیاســەتی عەرەبیدا بەهۆی پەیوەندی پانعەرەبیزم بە کەلەپوری ئیســلامییەوە، زۆر گەورەیــە، هەروەها بەهۆی پێواری تەحەدایەکی ئاشــکرای ئەم کۆڵەکانەو بنەماکانی چوارچێوەی پانعەرەبیزم‌و بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاســتییەی کە ئیســرائیل دەوڵەتێکی فراوانخوازییــە، بەلانیکەمــەوە لە کەناری ڕۆژئاوادا، ڕەنگە (لــە بەد بەختییەوە بێت) کێشــەی پانعەرەبیزم کەلەبەرێکی گەورەتری لەو کەلەبەرەی کە ئێســتا تێیدا دەژی، تێبکەوێت.



## سۆسیالیزم:

"حیزبی بەعســی عەرەبی ئیشتراکی بەوە لە بزوتنەوەکانی دی جیادەکرێتەوە کــە یەکــەم بزوتنەوە بوە لە جیهانی عەرەبیدا مەســەلەی سۆســیالیزمی شانبەشــانی مەســەلەی نیشــتمانی بەکارهێناوە. بەعس پێیوابــو یەکێتی‌و ئازادی‌و سۆســیالیزم لە ئامانجە سەرەکییەکانەو بەشێوەیەکی ئۆرگانی پێکەوە بەستراونەتەوە. پێکەوە گرێدانی دیالیکتیانەی ئەو ســێ ئامانجە گرنگتریــن‌و ژیرترین تایبەتمەندی ئایدیۆلۆجیی حیزبی بەعس بو"[27].

لــە کۆنگــرەی دامەزراندنی ســاڵی ١٩٤٧دا حیزبــی بەعس، سۆســیالیزمی وەك فۆڕمێکی نمونەیی بۆ ڕێکخســتنی ئابوری دەوڵەتی عەرەبی یەکگرتو هەڵبژارد کە لە ئایندەدا دادەمەزرا، ئەوەش دوای گفتوگۆیەکی ســەرەکی لەنێوان زیاد لە دوو ســەد ئەندامی کۆنگرە ڕویدا، ئەگەرچی لەو ســەردەمەدا بەهێزێکی ســەرەکیی سیاســەتی عەرەبــی نەدەژمێردران. بەعس لە یەکەمین دەیەی دروســت بونیدا پێداگری لەســەر پەیامی پانعەرەبی‌و جودایی لە دوژمنە سەرەکییەکەی دەکرد کە حیزبی شیوعی سوری بو، بەڵام لە ساڵانی پەنجاکاندا گفتوگۆی جیدی‌و گەرم‌و گوڕتر دەربارەی چەمکی سۆســیالیزم ســەریهەڵدا. بەعســیەکان لە هەمو بزوتنەوەکانی دی زیاتر گرنگییان بە سۆسیالیزم دەدا، گۆڕینی ناوەکەشیان بۆ حیزبی عەرەبی ئیشتراکی لە ساڵی ١٩٥٢دا هەر لەو ڕوانگەیەوە ئەنجام درا. حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بەپێچەوانەی ساڵی ١٩٤٧ەوە لە بیرۆکەی خۆماڵی کردنی ئابوری دوورتر دەڕوانی، ئەو دەمەی کە تەنها ناوەرۆکێکی ناسیونالیستی‌و پانعەرەبی هەبو[28].

سۆسیالیســتی بەعس کاریگەری سۆسیالیســتی یەکێتی ســۆڤیێتی لەســەر بو، کە نمونەی دەوڵەتێکی بەهێزی نەتەوەیی بو، ئەو ڕێبازەی ڕوسیای قەیسەری دواکەوتویی لــە ماوەیەکی کورتــدا گەیاندە دەوڵەتێکی زەبەلاح، بەڵام بە بــەراورد لەگەڵ حیزبە

شـیوعییەکانی وڵاتانی عەرەبیدا، ئەوا ئیعجابی حیزبی بەعس بەنەتەوەگەرای ڕوسیای سۆڤێتی هاوڕای شـێوازی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی یەکێتی سۆڤێت بو. عەفلەق وەك بەڵگەیەك بۆ سەلماندنی ئەو ناسیونالیستە، سەرنجی بۆ ئەو ڕەفتارەی یەکێتی سۆڤێتیی سەردەمی جەنگی جەنگی جیهانی دوەم ڕادەکێشا. عەفلەق "سۆسیالیزمی عەرەبی" داڕشـت بۆ ئەوەی لە "سۆسیالیزمی ڕوسـی"ی جیابکاتەوە. ئەو ئایدیایەی سڵاڤیانە دەبینراو لەسەردەسـتی حیزبی شـیوعی عێراقی توتیانە دوبارەدەکرایەوە، لەسەردەستی حیزبی بەعسـی عەرەبی ئیشتراکی لە فۆڕمێکی ڕەسەنو سـەربەخۆدا بەدیارکەوت. ئیـدی زۆر بەخێرایی ئایدیای ئیشـتراکی عەرەبی لە سـەرجەم جیهانی عەرەبیدا بوە فاکتەرێکـی هاوبـەش[29]. ئەمڕۆ ئەو عەرەبانەی بەعسـی نین لـە یادیان چۆتەوە کە سەرەتا ئەم وشەیە بەعسییەکان هێنایانە ئاراوە.

زۆرێك لە ناسیونالیسـتەکانی جیهانی سـێیەم پێیانوابو سۆسـیالیزمو سۆسـیالیزمی سۆڤێتی سیستمێکی ئایدیاڵە بۆ جیهانی سێیەم، ئەو ئایدیاڵەی هێمای هیوای گەیشتن بە ئایندەیەکی پڕ دادپەروەریو یەکسـانی دەکات، ئەو سیسـتمەش بەهەمان شـێواز بەواقیعی یەکێتی سـۆڤێتو چینەوە گرێـدراوە. هەروەها جیاکردنەوەی کارگەکان لە گۆلاگ (Gulag) کارێك نیە بتوانێت کار لە دڵو دەرونی خەڵکی بکات. لەجیهانی عەرەبیدا دیاریکردنی ئەوەی پێی دەوترێ سۆسـیالیزم لە پێواری نەریتی سۆسـیالیزمی ڕۆژئاوادا ئەنجام دەدرێ. لە ویژدانی هەر تاکێکی عێراقیدا بۆ پرسـیاری "سۆسـیالیزم چیە؟" تەنها وەڵامێك هەیە: سۆسیالیزم واتە حکومەتی بەعس. تەنانەت عێراقییەکان بیر لەوەش ناکەنەوە کە جۆری سۆسـیالیزمی حیزبی شـیوعی عێراقی، ئەگەر چەرخ بسـوڕێتو دەسەڵات بگرنەدەست لە سۆسیالیزمی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی جیاواز دەبێت. بۆ بەدبەختی تەنانەت خودی حیزبی شـیوعی عێراقیش جیاوازییەکی لەو جۆرەی فەرامۆش کردبو.

حیزبـی بەعـس ڕوانینێکی تازەی زیندوو یا تەنانەت دەتوانرێ بوترێ مەسـیحییان لەسـەر ڕژێمی نوێی کۆمەڵایەتی هەبو، ئیدی بەدەر لەوەی لەسەر ڕوانینیان دەربارەی



موڵکایەتـی تایبەتو کەرتی گشـتیو خاوەنداریێتـی ئامرازەکانـی بەرهەمهێنان چی دەوترێ، بەڵام شۆڕش ئەو وشەیە بو کە بەشێوازێکی بێوێنە خستیانە پاڵ سۆسیالیزم. بەنزیکەیی هەمو وتەکانی حیزبە شـیوعییە عەرەبییەکانو ئەوەی ئەمڕۆ دەتوانن بیڵێن، کاتێـك لەگەڵ ئەزمونی بەعسـیەکان، وەك بزوتنەوەو حیزب لە دەسـەڵاتدا بەراورد دەکـرێ، ڕەنگو ڕووی خۆیان لەدەسـت دەدەن. بۆیە هیچ حیکمەتێکی پراکتیکی تیانیە لیستێك بەکارڕاییە تایبەت یا سیاسییەکان ئامادە بکەین کە ناوەڕۆکی سۆسیالیزمی بەعس دیاریدەکەنو دەشـێت بۆ هەر یەکێك لەو لیستانە ئاوارتەیەك فەراهەم بکرێ، هەروەها پێویسـتی بەلێهاتوییەکی زۆریش هەیە، لەجیاتی هەمو ئەوانەش سۆسیالیزمی بەعس زیاد لە هەر فۆرمێکی دی هەرسدەکرێ:

"سۆسـیالیزم شێوازێکی ژیانەو بەتەنها سیستمێکی ئابوری نیەو بۆ هەمو بوارەکانی ژیان شـۆڕدەبێتەوە ـ ئابوری، سیاسـی، پـەروەردەو فێرکردن، ژیانـی کۆمەڵایەتی، تەندروسـتی، ئەخلاقـی، ئەدەبـی، زانسـتی، مێژوویـیو سـەرجەم بـوارە گەورەو بچوکەکانی دی. سۆسیالیزمو ئازادیو یەکێتی، ناوی جودا جودای شتە جیاوازەکان نیە، بەڵام بواری جیاوازی یەك یاسای سەرەکین کە هەمویان لەو یاسایەوە سەرچاوە دەگرن"[30].

ئـەم وتەیە لەیەك ڕوانگەوە شـتێکی ئەوتۆمان پێنالێت: فیکر تا ئەو ئاسـتە سـوك بکرێـت، بێتام دەبێت. بەڵام ئەگەر دڵسـۆزیی نیاز گرنگ بێـتو عێراقییەکان تا چ ئاسـتێك لەدوای ١٩٦٨ەوە هەڵگری ئەو دڵسـۆزییە بون، ئەوا ئەگەر مرۆڤ بۆ دواوە بگەڕێتەوە، هەروەکو ڕەزاز لە "ڕوانینی بەعس بۆ ئازادی" دەڵێت، دەتوانێت لەو تاکە یاسا سەرەکییە تێبگات کە هەمو ئەو شتانە لەو یاسایەوە سەرچاوە دەگرن".

## ئازادی:

حیزبی بەعس هەمیشە سورە لەسەر ئەوەی کە ئازادی بێقەیدومەرج لە بەرژەوەندی جەماوەرەو تەنها لە دەوڵەتێکدا دێتەدی کە لە ئیرادەی خۆیانەوە سەرچاوەی گرتبێت[31]. مرۆڤ دەتوانێت بڵێت کۆماری ترس لە عێراقدا لەوجۆرە دەوڵەتەیە، هەروەها بەلانیکەمەوە مرۆڤ دەتوانێت هەستی بەعسییەك تێبگات کە بەدڵسۆزیی بڕوای بەوەیە دەوڵەتەکەیان ڕێگەی ئازادی ڕاستەقینەی گرتۆتەبەر.

ئازادی لە بەرژەوەندی جەماوەرە، لەبەر ئەوەی سەروەری نەتەوەیی لە بەرژەوەندیی ئەوە. ئەم ناسنامەیە سەرەتای دەسپێکی بەعسو زۆرێك لە بزوتنەوەکانی جیهانی سێیەم بو، بۆیە دەبینین گشت وشە زلەکانی دژە ئیمپریالیزمی پانعەرەبی دەربارەی فیکری ئازادیی لەسەر شەڕەنگیزی ئیمپریالیزم تەوەرە دەبەستێت. ئازادی تەنانەت لە بەرفراوانترین ئاستی کولتوری سیاسەتی عەرەبیدا هیچ کاتێك مانا ڕۆژئاواییەکەی بۆ سەروەری شەخسی نەبو، یا تاکی ڕزگار نەدەکرد لە بارگرانی فیکرو ئەو کردەوانەی لە دەوڵەت یا کۆمەڵگە بەگشتی سەرچاوەیان دەگرت. سەربەخۆیی بەشەکان (تاك، کۆمەڵ، کەمایەتیو فیکر) کە کۆمەڵگەی ئازاد پێکدەهێنن، دەبێ بەجۆرێك لە ئازاد وازی لێبهێنرێو مافی ئەوەشی هەبێت، نەبێتە بەشێك کۆمەڵگەیەکی گەورە (هەڵبەنە نەك بەشێوەیەکی ڕەها، بەڵکو تەنها لە هێندێك بواردا تاك ئازاد دەکرێ). ئەم چەمكو فیکرانە دەربارەی ژیانی تایبەتی کەسێتیو ئازادی بیروباوەڕو لێبوردەییو پاراستنی کەمایەتیو کۆمەڵێك مەسەلەی دی کە ڕەچاوی بەرژەوەندی مرۆیی دەکات، بۆ دیدو بۆچون وەردەگێردرێت، بەڵام لە مێژوویی سەرمایەداریدا سەروەری شەخسی فۆڕمی مافێکی ئەوتۆی وەرگرتوە کە هیچ بەربەستێك ڕێگەی وەکاربردنی کاری ئەوانی دی لێناگرێ، بەگشتی زۆرینەی جیهانی سێیەم هەمو لقەکانی مانای فیکریی سەروەری شەخسییان بۆ ئەم دوا مانایە کورت کردۆتەوەو



ئەو ماوە ڕوشنگەرییە سیاسییەشیان فەرامۆش کردوە کە پێش سەردەمی مێژووی هاوچەرخی ئەوروپا کەوتوە. ڕەنگە دەرکەوتنی پەرگیریو پۆچی لە کەلەپوردا ئەوە ڕوونبکاتەوە کە چۆن ئەمجۆرە بەهایانە هێشتا لە جیهانی ئیسلامیدا بەوپەڕی تواناوە بەرگری لە خۆیان دەکەن. هۆیەکان هەر چییەك بن، ڕاستییەکەی ئەوەیە تا ژمارەی ئەو کەسانەی لە جیهانی سێیەمدا تێکەڵ بە سیاسەت دەبن، زیاد بکات ئەوا ئەوانە وەك کۆمەڵەی نەتەوە نائازادەکان داواکارییەکانی خۆیان دەخەنەڕوو، کە دەیانەوێت لە ڕێگەی دژایەتی کردنی فیکری سەروەری کەسێتیدا خۆیان لە کۆتو بەند ڕزگار بکەن، کە لە ئێستادا وەك بیروباوەڕی چڵێسی خودخواو لەشێوەی سەرمایەداریو نەیاری سۆسیالیزم خۆی دەنوێنێت. لێرەدا دەبینین کە دیدو بۆچونی بەعس لەمەڕ ئازادی لەگەڵ ئەوەی لە جیهانی سێیەمدا باوە، جیاوازییەکی ئەوتۆی نیە.

بەڵام ڕووی دوەمی چەمکی ئازادی لە کن بەعس هەروەکو شبلی ئەلعەیسەمی باسی لێوەکردوە، بەستنەوەی سۆسیالیزمە بەئازادییەوە، ئەمەش بەمانای ڕەتکردنەوەی دیموکراسی بۆرجوازییە کە پرەنسیپی ئازادی ئاوەژوو دەکاتەوەو لە پشتەوە خەنجەری لێدەدا. دەتوانین لە دیدی بەعسەوە بڵێین، چەمکی لیبرالی ئازادی بەتێپەڕبونی کات دەپوکێتەوە تا جێگەی خۆی بۆ چەمکی دیموکراسی میلی چۆڵبکات[32]. ئەلعەیسەمی پەرەسەندنی فیکری بەعسیی لەمەڕ ئازادی لەسەر هەمان پەرەسەندنی مێژوو دانا کە چەمکی سۆسیالیزمی لەسەر دانرابو، بەڵام ئەوەش پرسیاری تایبەت بە پەیوەندی نێوانیان دەوروژێنێت. ئەو واتایە چییە کە ئازادی لەسەر دروست بوەو چیدی ئاوڕ لە ئازادی دەرەکیی (ئیمپریالیزم)و چەمکە نێگەتیڤەکەی ناداتەوە، بەڵکو دەنوارێتە چەمکە پۆزەتیڤەکەی ئازادی، واتە ئازادی بۆ شتێك یا کارێك، ئیدی بەدەر لەوەی پێی دەوترێ دیموکراسی میلی یا سۆسیالیستی یا یەکێتی عەرەبی[33].

ڕەهەندی دوەمی فیکری بەعس لەسەر ئازادی، گۆڕینی خاڵی جەختکردنە لە بەربەستەکانی سەر ڕێگەی کارکردنی خەڵکانی بیانی بۆ ئەو پرسیارە سەرەکییەی کە چ کەسێك حوکمڕانی دەکات. ئازادی پۆزەتیڤیزمی بەعس لە ئارەزوی خود حوکم

کردنو هێنانەدی بەرژەوەندی ڕاســتەقینەی شەخسییەوە سەرچاوە دەگرێ. هەژاریو دواکەوتــنو لەســەروی هەمو شتێکیشــەوە دوو کەرت بونی مرۆڤ بەســەر خۆیدا، بەربەســتی بابەتین لەســەر ڕێگەی هێنانەدی خوددا: بەهۆی ئەو شتانەوە، جیاوازیی بەرهــەم دێت، لەلایەکەوە، لەنێوان بارودۆخی واقیعی مرۆڤو هەمو ئەو بەرژەوەندییە ســاختەو گەندەڵییانەی بەرهەمی دەهێنێت، لەلایەکی دی، لەگەڵ ئەو حاڵەتەی کە خودی تێیدا بەرهەم دێتو هاوکاتە لەگەڵ بەرژەوەندی ڕاستەقینەی تاکدا.

حیزبــی بەعس بڕوای بەو فیکرەی لینین هەیە کە دەڵێت، بەرژەوەندی جەماوەری تەنها لە ڕێگەی ڕێکخســتنی حیزبەوە بە شــێوازێکی دروســت نوێنەرایەتی دەکرێ. حیزب گەنجینەی ڕاستەقینەی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەیە (لەوەش بترازێ پێی دەوترێ ئیرادەی گشــتی)و دەوڵەتیش ئامرازێکــە بۆ ئەوەی ئــەو بەرژەوەندییانە بەدیبهێنێت. لەمڕووەوە، ڕێبەرایەتی دەرکەوتەیەکی سروشتییە، چونکە پەیوەندی بە کەسایەتی خودی ڕێبەرەوە هەیە، نەك بەشــێوەیەکی ســاختەو لەڕێگــەی کاری هەمەلایەنەو کێبەرکێ لەگــەڵ ئەوانی دی (بۆ نمونە لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە) دەربکەوێت. هەنگاوی دووەم کــە ناکــرێ بەلاوەبنرێ، بریتیە لە دیکتاتۆری تاك حیزبیو حیزبی شــیوعی عێراقیش ناتوانێت بەتەواوەتی گوناهی ئەو دیکتاتۆرییەتە بخاتە گەردنی حیزبی بەعس[34].

دیموکراســی بۆرجوازی ئەم ڕووەی ئازادی ڕەتدەکاتــەوە، لەبەر ئەوەی ئەمجۆرە دیموکراسییە، هەروەکو عەفلەق دەڵێت، باڵ دەکێشێت بەسەر "یەکێتیەکی تەنراوی یەکانگیر"ی حیزبێکی شۆڕشــگێردا، چونکە حیزبی شۆڕشگێر "حکومەتی جێبەجێ کــردنو پارلەمانێك نیە کــە تەنها ڕەخنەبگرێو پەلامار بــداتو نارەزایی دەربڕێ". حیزب بریتیە لە نەتەوەیەك کە لە حاڵەتی شــکڵگرتنەو لەســەر بنەمای سایکۆلۆجیای شۆڕشگێڕێتی دروست بوە، ئەگەر ئەندامانی حیزب ڕۆحییەتێکی لەوجۆرەیان نەبێت، ئەوا حیزب نابوت دەبێ. ئەم مەرجانە تایبەتن بە شۆڕشی بەعس کە بەردەوام هەوڵدەدا بەپێــی پرەنســیپ، تاك ڕێکبخاتو بە بڕیــار ئاوێتەی هاوەڵەکانی بــکات. ئامانجی حیزبی بەعس ئەوەیە کە جەماوەری دەرەوەی حیزب بە هەمو پەیوەندییەکانییەوە لەناو



حیــزب کۆبکاتەوەو پاریزگاری بەرژەوەندییە ڕاســتەقینەیان بــکات. بەڵام لە واقیعدا جیاوازییەکــە ئەوەیە: جەماوەری ناو حیزب تێگەیشــتنێکی دیاریکــراوی بۆ ئامانجە داخراوەکانی حیزب هەیە، ئەمە لە کاتێکدا لە دەرەوەی حیزب ئەو ئامانجانە نابینن، چونکە بەکاریگەری کوشــندەی پروپوچ دەورەدراون. ئەو ئامانجە ئەوەندە گەیشتۆتە حاڵەتی کامڵبون کە چیدی بەهۆی تاکگەراییەوە خەوشــی تیا نابینرێ. بەرژەوەندی ڕاســتەقینەی جەمــاوەر کە "ئیــرادەی نەتەوەیە" حیزب دەکاتە ئــەو جومگەیەی کە جوڵەی لەســەر دەکات، هەروەها بەرێگەی ڕاســت ڕێنمایی ئەندامانی دەکات "بۆ ئەوەی لەنێو حیزبدا کەشوهەوایەکی پڕ لە چالاکیو دڵسۆزیو پەرۆشیو خۆنەویستی بخوڵقێنێ کە تێیدا ڕەگەزی خاسو خراپ بەبێ لەبەرچاو گرتنی عەقلییەتیان، لەگەڵ خۆیدا رادەماڵێت"[35].

ئازادی بەعس لەو ڕووەوە دەبێتە "سۆسیالیستی" کە ڕەگەزە سەرەکییەکانی بینای حیزبو کۆمەڵگە لە بنەرەتەوە زۆر لەیەکدەچنو ئەو ڕەگەزانەش جەماوەرو کۆمەڵگەی نــوێو نەتەوە یا حیــزب پێکدەهێنن. ئەو ڕەگەزانە لە ڕێگەی یاســای دڵســۆزییەوە بــۆ کۆمەڵگەیەکی نوێ ڕێنوێنی دەکرێنو شــەرعییەت وەردەگــرن. ئەندامێتی ڕەنگە شەخسی یا ئایدیۆلۆجی بێت، بەڵام بۆ هەموویان یەکسانە. ئەو یەکسانییەی بەعس لە ئەندامەکانی دەخوازێت هیچ خاســییەتو خەسڵەتی تاکەکەسی تێیدا نیە یا تەنانەت تاکایەتی خۆیشی لە دەست دەدا. لەڕووی سیاسیشەوە، یەکسانی باری کەسایەتی، بەواتــای لــە نێوبردنی هەمو جۆرە نایەکســانییەکی ئابوریو دواجاریش بەعســیبون، دەگەیەنێت.

لە ڕوانگەی بەعســدا یەکســانیو پێواری سەروەری لە دەوڵەتی سیاسییەوە دەست پێدەکات، پاشــان ڕێگەی کۆمەڵگە دەگرێتەبەر، بەڵام ئەم دۆخە بۆ حیزبی شــیوعی عێراقی بەتەواوەتی جیاواز بو: کاتێك لە بەرەی ئۆپۆزیســیۆندا بو نایەکســانی بابەتی ئابوری کە بەشــێوەیەکی سەربەخۆ بوونی هەبو، لە کۆمەڵگەیەکی چینایەتیدا کرۆکی گفتوگــۆی دژە ســەروەری پێکدەهێنــا. دیکتاتۆرییەتی چینی پرۆلیتاریــا، بۆ ئەوەی

یەکسانی کۆمەڵایەتی بخوڵقێنێت، ئازادی کارکردنی چینەکانی دی لەنێودەبات.

لە جیهانی هەمەڕەنگدا سەروەریو سەربەخۆیی پارچە پارچەو دابەشکراو (تاك، کۆمەڵ، رۆژنامەو حیزب) بە گرنگترین مەرجی پێشوەختی ئازادی سیاسی دەژمێردرێت، بەڵام ئەو ئازادییە لەبەر بوونی دەستەیەك لە نوێنەری چالاكو گەمەکاری کارامە بۆ کۆمەڵگە زامن ناکرێ. ئەو ئازادییەی وەك فاکتەرێکی سەربەخۆ کاری سیاسی دەکات، تەنانەت لەو ئازادییەش کە بەتەنها وازی لێدەهێنرێ، پێویستە بەرەسمی دەستەبەر بکرێ. بونیادی دەزگاکان ئەمجۆرە ئازادییە دەخوڵقێنێت، بەپێچەوانەی ئەوەشەوە ئازادی بوونی نابێت، بەبێ ئەو دەزگا رەسمیانە، تاك لەبەرامبەر هێزی نێوان لایەنە ناکۆکەکان، بەڵام وەك تاکێکی سەربەخۆ، ئازاد دەکرێت.

هەر یەك لە سەروەریو جۆرێك لە ئازادی دەزگایی کاتێك دەتوێنەوەو لەنێو دەچن کە فیکری جەماوەری بەسەر هەمو شتێکدا باڵادەست بێت. ئەوەش بیرۆکەی توانەوەی بە کۆمەڵە کە تێیدا تاکەکان لەنێو یەکتریدا دەتوێنەوە. هەنوکە لە باشترین هەلومەرجدا تەنها جۆرێك لە ئازادی کە بەشێوەیەکی لۆجیکی لە تواندا بێت، بریتیە لە ئازادی کارکردنی تاك لەگەڵ کۆمەڵداو قوربانیدانە لە پێناویدا، ئیدی سەروەریو سەربەخۆیی پێشمەرجی ئەم ئازادییە نیە، چونکە ئازادی بوە بە حاڵەتێکی فیکریو تەنها لەگەڵ هاتنەدی چاودێری ئاکارێکی باش دەستەبەر دەکات، لە پاڵ ئەوەشدا کاتێك لە "یەکێتی" واتێدەگەین کە ئارەزویەکی بەزێنەرەو تاك لەنێو جەماوەردا دەتوێنێتەوە، مانای ئەوە دەگەیەنێت کە هەمو جۆرە ناسنامەیەکی دی رەتدەکرێتەوە. لە بەرامبەر ئەوەشدا پێویستە لەسەر پانعەرەبیزم کار بۆ خەفەکردنی گشت نەتەوە لۆکاڵییەکانو هەمو جۆرە ناسنامەیەکی دی لە بابەت خێڵەکیو تایفیو تەنانەت خێزانیش بکات، ئەگینا پرەنسیپی جەماوەری پەرتەوازە جارێکی دی بۆ سەر شانۆی سیاسەت دەگەڕێتەوە. بەعس پێیوایە هاوڕابونی تاکو کۆمەڵ پێوەرێکی ئاساییو باوە کە لەگەڵیدا هەمو لادانەکان دەستنیشان دەکرێو بەخاتری ئازادی ئەخلاقیش هەمو لادانەکان دوور دەخرێنەوە. دەکرێ مرۆڤ لە پێناوی ئەو مەرجەدا خەبات بکات،



بەڵکو ئەوەی لێرەدا لەو خەباتە گرنگترە ئەوەیە: دەکرێ ئەو مەرجە بچێنرێ، بۆیە لەم هۆیەدا ئەو هێزە بەدیدەکەین کە گرنگییەکی زۆر بەمجۆرە سیاسەتە دەدا.

لەبواری گشتیدا ئەم توانەوە گشتگیرە هێندێك جار لە "کۆمەڵەی برایانی" وەك کۆمەڵە نهێنییەکان، سەربازان لە کاتی جەنگدا، قارەمانەکان، شەهیدان، دادگاییکردنی نۆرمبۆرگو هاندەرانی تیپی پێو تەنانەت لە نێو هێندێك لە هەڤاڵانی شۆڕشیشدا، دەتوانرێ بەدیبکرێ. تاك لە رێگەی ئەو کۆمەڵە تەمەن کورتەی برایانەوە بە ئەزمونێکی تەمەن کورتتری پڕ لە شادمانی راستەقینە گوزەر دەکات، ئەوەش لە نمونەی ئەو کەسانە دەچێت کە لە دونیایەکی پڕ لە شەڕەنگیزیدا خۆیان بەئاینەوە سەرقاڵ دەکەن. ئازادی چەند ساتێکی شادمانییە کاتێك دێتەدی کە فیکر بە تەواوەتی لەوی دیدا توابێتەوەو لەڕووی پرەنسیپەوە جەماوەری مرۆڤایەتی بەتەواوەتیو بەبێ هیچ گومانێك شکڵی خۆی وەرگرتبێت. ئەوەش هەمان ئەو ئازادییە بو کە جەماوەری تورە لە موسڵو کەرکوکو بەغدا لە هاوینی ١٩٥٩و زستانی ١٩٦٩ ئەزمونیان کرد. ئەمەش چەمکی بەعسە لەسەر ئازادی راستەقینە، ئیدی هەر چەندە هاتنەدی دەگمەن بێت، یا لەنێو ژمارەیەکی کەم لە دەروێشەکانیدا بێتەدی، لەبەر ئەوەی ئەم دیدە لوتکەی بەدیهێنانی خودو لێهاتوی دەنوێنێت.

لێرەدا هێزێکی متی سەرەکی هەیە کە بێگومان ئەو هێزە لە هەمو کەسێکدا بوونی هەیەو رەنگە لە غەریزەی مەزنی مرۆڤەوە بۆ خۆشەویستی کە لێوانلێوە بەسۆزداری سەرچاوە بگرێ (خۆشەویستی بۆ ئەوانی دی، خۆشەویستی فیکر یا خوداوەند یا نەتەوە)، بەڵام لە سیاسەتەدا ئەم غەریزە یا هێزە تەنها لەو کاتەدا دەردەکەوێت کە خەڵکانێکی زۆر بەجەماوەر دەگۆڕێن یا بەلانیکەمەوە خەباتێکی بێوچان لەو پێناوەدا دەکەن. ئەوەش ساتەوەختی راستەقینەی یەکلاکەرەوەیەو کاتێك دێتەدی کە مەودای نێوان مرۆڤەکان لەنێوببرێت، واتە ئازادی بەعس دەبێتە "یەکێتی"یەکی کامڵ، لەهەمان کاتیشدا هێزێکی زۆر رادیکاڵە کە جیاوازی نێوان مرۆڤەکان ناهێڵێت، ئەو هێزە لە زمانی بەعسدا خۆی لە سۆسیالیستدا بەرجەستە دەکات، لەبەر ئەوەی هەمو جۆرە

جیاوازی، مەسەلەیەكی تایبەت، سەربەخۆیی، ناكۆكی، سەروەری، سەربەخۆیی، هەمەڕەنگی، ئاكارو كەسایەتی لە نێودەبات.

بەعسیەكان بڕوایەكی تەواوییان بە دروشمی "یەكێتی، ئازادی، سۆسیالیزم" هەیە، بۆیە ئەو دروشمەیان كردوە بە ناونیشانی هەمو بڵاونامەكانو لەگشت شەقامو رۆژنامەو بەرەكانی پێشەوەی جەنگو لە هەمو كۆبونەوەكانو لەسەرووی وێنەی رێبەرەكەیان دەبێنرێ. ئەو دروشمە هێمای سەرەكی ناسنامەی بەعسەو ئەوەندەش دوبارەدەبێتەوە كە زۆرینەی خەڵك نیازی پشت ئەو دروشمەیان بیرچۆتەوە: ئەوجۆرە خەڵكانە ئەوەیان بیرچۆتەوە كە بەعس شتێكی تایبەتە، لەبەر ئەوەی پێداگری لەسەر ئەمجۆرە ئازادییە دەكات بۆ هەمو عێراقییەك، نەك تەنها بۆ هێندێكیان یا بۆ كاتێكی دیاریكراو، بەڵكو بۆ گشت كاتو سەردەمێك جەختی لەسەر دەكاتەوە.

## پێرست

1 ـ عەزیز ئەلحاج، مع الاعوام ـ بیروت: (الموسوعة العربية ١٩٨١) ٢٨١.

2 ـ عەباس كەلیدار وتارێكی بەناونیشانی "عەزیز ئەلحاج ـ شیوعییەكی رادیكاڵ" نوسیوە، تێیدا گەشتی ژیانی عەزیز ئەلحاج باسكراوە. گۆڤاری تكامل العراق الحديث، گروم هیلم، ١٩٧٩.

3 ـ بڕوانە حەنا بەتاتو: چینە كۆمەڵایەتییە كۆنەكانو بزوتنەوە شۆڕشگێڕەكانی عێراق، پریستۆن، چاپخانەی زانكۆی پریستۆن.

4 ـ هەمان سەرچاوەی پێشو. ١٩٨ ـ ١٩٩.

5 ـ كەلیدەر: تكامل، ١٨٦.

6 ـ ئەم هەوڵو كۆششە لە رێگەی نەجم مەحمود وەرگیراوە لە "السيرة في الحزب الشيوعي العراقي قضايا الخلاف في الحكومة الشيوعية العالمية" پاریس، ١٩٨٠ ، ٩٩ ـ ١٠١.

7 ـ چەپكێك لە بەتاتو، چینە كۆمەڵایەتییەكان، ٥ ـ ١١٠٣.

8 ـ گوتاری سەدام حسێن لە ٢٥/ شوبات/ ١٩٧٦، لە وتارەكەی پ. مانسفیڵد، عێراق: دەوڵەتی هاوچەرخ وەرگیراوە. تی. نیبلۆك. لەندەن ـ گروم هیلم. ١٩٨٢ـ ٦٨.

9 ـ سەدام حسێن "خەرەندێكی هاوبەش یا دوو خەرەندی ناكۆك، بەغدا، بڵاونامەی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراكی، ١٩٧٧، ١٨ ـ ٢١.

10 ـ لە تاراوگە لە عەزیز محەمەدیان پرسی، تا ئێستا لەو باوەڕەدایە كە چونە ناو ریزی بەرەی نەتەوەیی كارێكی دروست بوە. ئەو دوای ئەوەی لە پێناوی خەباتكردن لەدژی ئیمپریالیزم، جەختی لەسەر پرەنسیپی گشتی تایبەت بەدروستی كردنی هاوپەیمانی لەگەڵ "هێزە نیشتمانییەكان"دا كردەوە، وتی: "ئێمە هەرگیز نەمانوتوە بەرەی نەتەوەیی دوا قۆناغەو روبەروی كارەسات نابینەوە، هەروەها فریویشمان نەخواردبو، ئێمە پێمانوابو دەكرێ بەرە ئاوەژوو بكرێتەوە. داوەری كردن لەسەر ئەو كاروبارانە شتێكی ئاسانە كاتێك مرۆڤ لەدەرەوەی مەسەلەكان بێت". هۆكاری سەرەكی لە تێكچونی پەیوەندی، بریتی بو لەوەی كە بەعس لەو هەمو شتانەی لەسەری رێكەوتبوین پاشگەزبویەوە. بڕوانە راپۆرتی ٩٧ی مریپ (merip report)، حوزەیرانی ١٩٨١، ل٢٠ ـ ٢١. ئەگەر روونكردنەوەكەی وەكخۆی وەربگرین، ئەوا وەڵامدانەوەكەی ئەوە دووپاتدەكاتەوە كە بەڵگەنامەكە لەلای حیزب شیوعی عێراقی زۆر گرنگ بوە، ئیدی بەدەر لە پارێزی حیزبی بەعس، هەستیان دەكرد ناچارن ئەو هەوڵە بدەن، لەلایەكی دی، دوچاری وەهم ببونەوە، بۆیە دەبێ بڵێین ئەوەش قوڵی گێڵێتی رێبەرانی حیزبی شیوعی عێراقی دەردەخات.

11 ـ شۆڕشی ١٩٦٩ی عێراق: ئەزمونو ئاینده (لەندەن ـ چاپخانە ئیتاكا)، ٦٧ ـ ٦٨.

12 ـ هانا ئارێنت لە شیكردنەوەی بنەماكانی تۆتالیتاریزمدا ئەمە بە پێشمەرجێكی پێویست دەزانێت. بڕوانە:

- Hanna Arendt, The Origins of Totalitarianism (New York, Harcourt brace and Jovanovich, 1973). 421 – 422.

هەروەها بڕوانە کتێبی "توندوتیژی" هەمان نوسەر.
13 ـ ئەم بیرۆکەیەی "لە چینەکانەوە تا جەماوەر" لە بنەماکانی هانا ئارینتەوە وەرگیراوە، ل ٣٠٥ ـ ٣٠٦.
14 ـ حەنا بەتاتو، چینە کۆمەڵایەتییەکان، ٨٦٦.
15 ـ هەمان سەرچاوەی پێشو، ٨٢٩.
16 ـ میشیل عەفلەق، معركة المصير الواحد، بيروت، الموسوعة العربية، ١٩٧٩، ل٤٩ ـ ٥٠.
17 ـ دوەم کۆنگرەی حیزبی شیوعی عێراقی، بەرنامەو پێڕەوی ناوخۆی حیزبی شیوعی عێراقی، ١٩٧٠، ل ٥٧ ـ ٥٨.
18 ـ وەزارەتی راگەیاندن، في الفكر الاشتراكي، بغداد، منشورات الحرية.
19 ـ بڕوانە عەفلەق "معركة المصير، ١٧. عەفلەق هەمان بیرۆکە لە وتاری "تێکۆشان لە ڕێگەی یەکێتیدا، هەمان تێکۆشانی ڕێگەی جەماوەرە" ڕووندەکاتەوەو دەڵێت یەکێتی راستەقینە تەنها لە خوارەوە بەدیدێت.
20 ـ بڕوانە بەتاتو: چینە کۆمەڵایەتییەکان، ٨٣٠.
21 ـ هەمان سەرچاوە، ١٠٣٧.
22 ـ هەمان سەرچاوەی پێشو، ١٠٣٧ ـ ١٠٣٨، هەڵوێستی حیزبی شیوعی عێراقی لە ماوەی نێوان ١٩٦٣ ـ ١٩٦٨دا بەتایبەتی لەمەڕ مەسەلەی ناسنامەی عەرەبیدا گۆڕانی گەورەی بەسەردا هات، هەروەها لەنێو حیزبی شیوعی سوریشیدا هەمان گفتوگۆ لە ئارادا بو. ئەو کۆمەڵە بەڵگەنامەیە بەناونیشانی "کێشە جێناکۆکەکانی حیزبی شیوعی سوری، بڵاوبوەوە، بەیروت، خانەی ئیبن خەلدون، ١٩٧٢.
23 ـ ئەوەش وشەی سەرۆك پۆلیسی ئەو دەمە (بەهجەت عەتیە) بو، لە بەتاتو، چینە کۆمەڵایەتییەکان، وەرگیراوە.
24 ـ جۆرج ئۆروێڵ، "سیاسەتو زمانی ئینگلیزی"، لە هەڵبژاردەکانی نۆرت ریدەر (نیویۆرك ـ نۆرتن، ١٩٨٤)، ٢٥٦.
25 ـ بیڵ وۆرن لە کتێبی "ئیمپریالیزم، پێشەنگی کاپیتالیزم"، (لەندەن، ١٩٨٠، ل٢٥٦)، لێکۆڵینەوەی لەسەر ئابوری ئەم بیرۆکەیە کردوە. وۆرن، مارکسیەکی دوای جەنگی جیهانی دوەم بو گرنگی بە دوانەیی کەسایەتی کۆمەڵایەتی دەدا: یەکەم مارکسیزم وەك فەلسەفەی سۆسیالیزم، دوەم ناسیونالیزمی نوێ (ل٦)، بە گوتەی ئەو، تیوەرەی ئیمپریالیزمی لینین بونیادی سەرەکی تیوەرەی ئەو دوو لایەنە فەراهەمدەکات.
26 ـ بەرنامەی حیزب، ٥٧.
27 ـ شبل ئەلعەیسەمی حزب البعث العربي الاشتراكي: معركة العربية التأسيسية (بيروت، دار الطليعة، ١٩٧٨)، ٧١، ئەلعەیسەمی یاریدەدەری ئەمینداری گشتی سەرکردایەتی قەومی عەرەبی حیزبی بەعس بو لە بەغدا.
28 ـ مەبەستی ئەلعەیسەمی لە گوتەکەی پێشویدا هەمان شت بو، بەهەر حاڵ دەبی مرۆڤ ورد بێت دەربارەی ئەوەی کە بەعس هیچ مەبەستێکیان لە سۆسیالیزمدا نیە. بەتێپەربونی کات وشەی سۆسیالیزم لە





زمانی بەعسیەکاندا بەبی وشەی یەکێتیو ئازادی مانایەکی ئەوتۆی نەبو. بەعس لەساڵانی شەستەکاندا تەنها بیرۆکەی ئابوریی لە وشەی سۆسیالیزمدا بەدیدەکرد. بەمەبەستی دانپیانانێکی بەسۆز بە رۆڵی پێشەنگی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی لە پەرەپێدانی تیورەیەکی تەواو بۆ یەکخستنی سۆسیالیزمو پانعەرەبیزم، بزوتنەوەی نەتەوەگەراکانی عەرەب ـ ی باسل کوبەیسی بخوێنەرەوە، بەیروت، دار ئەلعەودە، ١٩٧٠ ـ ١٩٧١، ل ٧٠ ـ ٧١.
29 ـ لە کۆنگرەی شەشەمی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکیدا کەساڵی ١٩٦٣ بەسترا، دەربارەی گۆڕینی "ئیشتراکی عەرەبی" بە "ڕێگەی عەرەبی بەرەو سۆسیالیزم" گفتوگۆیەکی گەرم ئەنجام درا. ئەم کۆنگرەیە لوتکەی دەرکەوتنی تەوژمی چەپی لەناو حیزبی بەعسدا روونکردەوە کە شێوازی مارکسیستی نا ستالینی یا ئەنتی ستالینی قبوڵ کرد، پێش ماوەیەك حیزب لە وڵاتدا دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتبو، لە هەر دوو وڵاتەکەش چەپ لە لوتکەدا بو. کۆنگرە لەسەر گواستنەوەی شۆڕشگێرانەی کۆمەڵگەی عەرەبی فۆرمۆلەی زۆر رادیکاڵانەی داڕشت، فۆرمۆلەیەك کە لە بەرنامەی حیزبە شیوعییەکانی عەرەب زۆر زیاتر دەرۆیشت. یاسین حافزو جۆرج تەرابیشیو فەوزی تەرابولسیو چەندین کەسی دی، لەدوای سەرکەوتنی عەفلەق بەدەرکردنی چەپەکان لە حیزب، وازیان لە حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی هێنا. ئەوانە وەك روناکبیرانی مارکسیستیو ڕێبەرانی گروپی چەپگەرا ـ کە دوای شکستی ١٩٦٧ پێگەیەکی پڕشکۆیان پەیدا کردبو ـ رۆڵێکی گرنگیان لە سیاسەتدا دەگێڕا. تەرابیشی وەرگێرێکی سەرەکی بەرهەمەکانی تروتسکی بو، هەروەها تەرابولسی ڕێکخراوی کاری کۆمۆنیستی لە لوبنان دامەزراند. کۆمەڵەی شۆڕشگێری عەرەبی کە عێراقییە دوورخراوەکانی بریتانیا دروستیان کردبو، دەستیان لە بیروباوەری بەعس هەڵگرتو بەرەو تروتسکیزم رۆیشتن.
30 ـ بڕگەکان لە وتارێکی ساڵی ١٩٥٧ی مونیف رەزاز وەرگیراوە، "بۆچی ئێستا سۆسیالیزم؟"، رەزاز رۆژنامەنوسێکی ئەردەنیو پێگەیەکی بەرجەستەی لە حیزبدا هەبو. نوسینەکانی لەسەر سۆسیالیزم، یەکەمین هەوڵی سیستماتیکانە بو کە بۆ دەرچون لە چوارچێوەی فیکری عەفلەق دەژمێردرێت. جۆن دیلفن: "حیزبی بەعس: مێژوویی لە دەرکەوتنییەوە تا ساڵی ١٩٦٦، ستانفۆرد، چاپخانەی دەزگای هۆڤەر، ١٩٦٧. ل ٣٦ ـ ٣٧.
31 ـ ئەلعەیسەمی بەمشێوەیە شیتەڵکاری ئازادی لە روانگەی بەعسەوە دەست پێدەکات. بڕوانە "حیزبی بەعس"، ٦٩.
32 ـ هەمان سەرچاوەی پێشو، ٦٩ ـ ٧٠. رەنگە مەبەست لە گوزارەی "چەمکی ئازادی لیبرال" پەیوەندی بەرۆژگاری گەنجێتی عەفلەقەوە هەبێت کە هەر جارێك باسی لە پانعەرەبیزم نەدەکرد بەشێوەیەکی زۆر سەیر ئاماژەی بە ئازادی تاکەکەس دەکرد. دیموکراسی جەماوەری هاوتای ئازادی سۆسیالیزمە. لە بەشی چوارەمی ئەم کتێبەدا ناوەرۆکی ئەمجۆرە ئازادییە لە دوەم رژێمی بەعسدا بەناونیشانی "سەرچاوەی دەسەڵات" باسی لێوەکراوە.
33 ـ لە فیکری رۆژئاوادا ئەم جیاوازییە لە فۆڕمی گشتیدا شتێکی کۆنەو مێژووی بۆ سەردەمی رینیسانس یا

ریفۆرمی ئاینی دەگەڕێتەوە. بۆیە دەکرێ بەشێوازی زۆر جوداجودا قسەی لەسەر بکرێ. لێرەدا من وتەکانی ئیزیا بەرلین لەمەڕ "دوو چەمکی ئازادی" دەهێنمەوە کە لە چوار وتاریدا لەســەر ئازادی باســی لێوەکردوە، (ئۆکسفۆرد ـ چاپخانەی ئۆکسفۆرد، ١٩٨٤).

34 ـ هــەر کاتێك حیزب دەســەڵات بگرێتەدەســت، ئیدی پێــوەرەی تاك حیزبی دەبێــت (چ وەك حیزبی شــیوعی عێراقی کە خۆی بە تاکە نوێنەری پرۆلیتاریا دەزانێت، چ وەك حیزبی بەعس بەعەرەبی ئیشــتراکی کە ببێتە پێشــڕەوی شۆڕشــی عەرەبی) هێنــدە جیاوازی نابێت. لــەڕووی تیورییەوە حیزبی شــیوعی عێراقی دەتوانێت دیکتاتۆری پرۆلیتاریا دامەزرێنێت، بەڵام ئەو دەوڵەتەی دایدەمەزرێنێت لەلایەن گشت چینە ناوخۆییە دوژمنکارەکانــەوە گەمــارۆ دەدرێت، لەلایەکی دی، بەعســیش هەمو ئەو کەســانە دوور دەخاتەوە کە لەنێو جەماوەری تێکۆشەردا نەبێت، لەبەر ئەوەی خۆبەخشین پێوەری ئەندامێتی نەتەوەیە.

٣٥ ـ لێرەدا وتەکانی عەفلەق لە "معركة المصير"، ٥٤ ـ ٥٦ دەگوێزمەوە.

# بەشی هەشتەم

# کـــۆتـــــایی

## دوا چورتم

سـەدام حسـێن لـە سـەرەتای بەهـاری ١٩٨٠دا پلانـی بۆ هەڵایسـانی جەنگ لەگەڵ ئێراندا دادەڕشـت[1]، لە مارسـی هەمان سـاڵدا پەیوەندی دیپلۆماسی نێـوان هەردوو وڵات بچڕا، لە مانگی نیسانیشـدا شـێوازی ڕاگواسـتنو دەرکردنی شـیعەکان ـ سـتونی پێنجەم ـ ڕووی لە هەڵکشـان کرد. لە مانگـی تەموز ڕژێمی ئیسـلامی ئێران هەوڵی کودەتایەکی سەربازیی کە لەلایەن عێراقەوە پاڵپشتی لێدەکرا، پوچەڵکردەوە. بەگوێرەی حەکایەتی بەعس بەشـێك لە ناوچەی قەسـری شـیرین لە مانگـی ئابدا لە ژێر دەسـتی ئێرانیـەکان دەرکرا. لە بـەرواری ١١/ئەیلولی/١٩٨٠دا لـە دوای کردەیەکی سـەربازی نزیکـەی ١٣٠ کیلومەتر لە خاکی ئێـران کەوتە ژێر دەسـتی عێراقییەکانەوە[2]. لە ١٧ی ئەیلولدا بەرەسـمی پەیماننامەی جەزائیر لەلایەن عێراقەوە هەڵوەشـێنرایەوە. لـە دوای (٥) ڕۆژ جەنگێکی سـەرتاپاگیر بە پەلاماردانی دەیان فڕۆکەخانەی ئێرانی دەستی پێکرد.

سـەرباری زیادەڕەوی حەکایەتی ئێرانییەکان لەسەر نیازی عێراق، بەڵام چاودێران کۆکن لەسەر ئەوەی کە ڕژێمی ئێران بەدەسپێکردنی هێرشەکانی عێراق غافڵگیربونو





ئامادەگـی شـەڕێکی لەوجۆرەیـان نەبو. دیدەبانی ناوچە سـنورییەکان لە بوسـتانو شـوێنەکانی دی سـەربازو جبەخانەی پێویستیان نەبو، بۆیە ئەسـتەم بو بەو حاڵەتەوە بەرگـری بکەن. توانای فراوانخوازی ڕۆحانییە ئێرانییەکان لە مەودایەکی دووردا هەر چەندێك بێت، ئەوا ڕژێم لەو دەمەدا سـەرقاڵی کێشـە ناوخۆییەکانی نێوان کۆماری ئیسـلامیو بەنی سـەدرو لایەنگرەکانی بو. قەیرانی بارمتەکان لە لوتکەدا بو. گرژی نێوان گروپە ئوسوڵییەکانو هێزی پاسدارانو سوپایەکی لەبەریەکهەڵوەشاوە کە دەمێك نەبو زۆرێك لە ئەفسەرە پایە بڵندەکانی لە قەنارە درابون، بەتوندی لەئارادابو. عێراقو ئێران چەند مانگێك پێش ٢٢/ئەیلول/١٩٨٠ لە بەزاندنی سنور زۆر بەتوندی یەکتریان تاوانبار دەکرد، بەڵام ئەو ڕاسـتییەی کە گومانی تێیدا نەبو، حیزبی بەعس دەیویست ئەو پاساوانە بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی بە ئامانجە بەرفراوانەکانی بگات.

سـتراتیجی سەربازی عێراقی لەسەرەتای هەڵایسـانی جەنگدا واتەماشا دەکرا کە لە شـەڕی بروسکە ئاسای شەش ڕۆژەی ئیسـرائیل دەچێت. کردە سەربازییەکان بە جۆرێك پلانی بۆ دارێژرابو کە لە ماوەی دوو هەفتەدا کۆتایی پێبێت، ئەوەش ڕێکەوتی یەکێك لە جەژنەکانی ئیسـلام (جەژنی ڕەمەزان) بو، بەڵام لەڕووی سـەربازییەوە لە کۆتایی هەفتەی یەکەمی جەنگدا خراپی هەڵسـەنگاندنەکانی عێراق بەدیارکەوت[3]. بۆیە دەکرێ پاشماوەی جەنگەکە بۆ ئەم قۆناغانەی خوارەوە دابەش بکرێ: یەکەم، پێشـڕەوی لەسـەرخۆو پڕ هەزینەی عێراق کە بەدەسـت بەسـەراگرتنی خوڕەمشەهر کۆتایـی دێـت. دوەم، قەیران یا تێوەگلانی پێشـڕەوی هێزەکانی عێـراق لە بەهاری ١٩٨١دا. سـێیەم، زنجیرەیەك دژە پەلامارو هێرشـی ئێران کە کاریگەری جیاوازییان هەبو تا سەرئەنجام توانیان ساڵی ١٩٨٢ هێزەکانی عێراق بۆ سەر سنوری عێراق ـ ئێران بگێڕنەوە. چوارەم، بەردەوامبونی قەیران بۆ ماوەی سـێ ساڵ هاوڕابو لەگەڵ هێرشی شەپۆلە مرۆییە یەك لەدوای یەکەکانی ئێران بۆ سەر پێگە ترسناکو جێگیرەکانی عێراق. پێنجەم، قۆناغی پێشڕەوییە کیسەڵیو پڕهەزینەکانی ئێران لە ناو خاکی عێراقدا.

## جەنگ بەزمانی ژمارە:

ئەم جەنگە بە هەمو پێوەرێکی لۆجیکی، جەنگێکی زۆر گەورە بو. ژمارەی کوژراوەکانی نێوان هەر دوو لا بە نیو تا یەك ملیۆن کەس دەخەملێنرێ[4]. ژمارەی ئەو بریندارانەی ژیانیان بۆ گەڕایەوە زۆر کەم بون، ئەویش بەهۆی بەرزی پلەی گەرماو شێو نەبونی کەرەستەی پزیشکی پێویستەوە بو. ژمارەی بریندارەکانی شەش ساڵی جەنگی عێراق ـ ئێران لە کۆی بریندارەکانی چڵ ساڵی رابردوی شەڕەکانی عەرەب ـ ئیسرائیل زیاتر بو، تەنانەت ئەگەر سەد هەزار کوژراو بریندارى یازدەی ساڵەی شەڕی ناوخۆیی لوبنانیشی بۆ زیاد بکرێ، هەروەها ژمارەی زیانە مرۆییەکانی ئەم جەنگە یەکسانە بە ژمارەی زیانە مرۆییەکانی بیست ساڵەی شەڕی سەربەخۆیی ڤێتنام. وێرانکردنی شارە گەورەو بچوكو گوندەکانو ژمارەی ئەو ئاوارانەی لەم شەڕە کەوتونەتەوە زۆر زیاترە لەو ئاوارانەی لە دروستکردنی دەوڵەتی ئیسرائیلدا کەوتونەتەوە.

وێرانە ئابورییەکانی ئەم جەنگە لە زیانە مرۆییەکان سەرنجراکێشترە . وێرانکردنی دامەزراوە جێگیرەکان، زیانی بەفیرۆ رۆیشتنی بەملیارات دۆلاری لێکەوتۆتەوە، تێچوی مانگانەی شەڕ بە نزیکەی یەك ملیار دۆلار دەخەملێنرێو شەڕی تانکەکان پڕ هەزینە بو، پێشبینی دەکرێ لە ئایندەدا پرۆسەی ئاوەدانکردنەوە چەندین دەیەی بوێتو بەرزبونەوەو دابەزینی نرخی پەترۆڵیش دەچێتە پاڵ ئەو پێرستە، هەمو ئەوانە وێنەیەکی فریودەرانە بۆ پێوەرەکان دەخوڵقێنێت. رەنگە لە ئایندەدا هێندێك کۆمپانیاو حکومەتی بیانی سود لەم ژمارانە وەربگرن. سەبارەت بەوانیش ئەوجۆرە سەرقاڵییە لە هێندێك رووەوە پاساوی خۆی هەیە، بەڵام لە روانگەی ئەوانەی هەمو قورسایی ئەو جەنگەیان لەسەر شان بوەو بەشداری شەڕو کوشتنیان کردوە، بەئاسانی دەست شتن لە ژیان، نیشانەی هەڵوێستێکی ئەخلاقی بەهێزترە لە بەرامبەر داهاتی نەوتدا. پێویستە ئەوەش



بوترێ کە تێچوی یەك بەرمیل نەوت ـ عێراقو ئێران هەر دووکیان فرۆشیاری نەوتنو دەرامەتی مەزنی ئەو دوو وڵاتەش لەم رێگەیەوە دابین دەکرێ ـ هیچ پەیوەندییەکی بەشێوەی هەڵبژاردنی ژیانی خەڵکییەوە نیە. عێراقیو ئێرانییەکان بە شێوازێکی دژوار فێری ئەم وانەیە بون. لەمڕووەشەوە، بەدەر لە مەزنی رەهەندی وێرانە فیزیکییەکانی ئەم جەنگەی نێوان ئەو دوو وڵاتەو بەفیڕۆچونی ئەو هەمو داراییە، کەچی هێشتا پەی بە مەزنی ئەو جەنگە نابەن.

سەرباری ئەوەش گرنگترین بەشی جەنگی عێراق ـ ئێران لەسەر بەهای بەرمیلێك نەوت خۆی راگرتوە، چونکە بە داهاتی نەوت دەتوانرێ بەئاسانی چەك بکڕدرێتو رێژەی ئەو چەك کڕینەش بەجۆرێك بەرزدەبێتەوە کە هەر دوو بتوانن لەسەر ئاستێکی بەرفراوانتر یەکتری بکوژن. ئەم جەنگە تا رادەیەك جەنگ سەنگەر بو کە بەزۆری شەڕەکان لەسەر سنورەکان چەقیدەبەست، لەو حاڵەتەشدا ژمارەی کوژراوەکانی هەر دوو لە زەمەنێکی دیاریکراودا تەنها لەورووەوە گرنگی هەبو کە روبەروی کەمبونەوەی هێزی مرۆیی دەبونەوە، هەمان ئەو کێشەیەی کە ئەڵمانییەکان لە جەنگی جیهانی یەکەمدا روبەرویبونەوە.

هێزی مرۆیی هەر دوو لا بەتەواوەتی مۆبیلیزەکرا. عێراق یەك ملیۆن مرۆڤی لەبەرەکانی شەڕ سازو ئامادە کرد. ساڵی ١٩٨٦ هەر کەسێك لە خوار تەمەنی پەنجاو یەك ساڵییەوەبوایە بۆ خزمەتی سەربازی بانگهێشت دەکرا. فەراهەمکردنی خواردن بۆ ئەو ژمارەیە لەلایەن دەوڵەتەوە خۆی لەخۆیدا مەسەلەیەکی لۆجیستییەو پەیوەندی نوێی نێوان هێزی چەکدارو ئەو کۆمەڵگەیەی لێوەیهاتوە پێشاندەدا، بەڵام ژنان بەشێوەیەکی بێوێنە بۆ ئەرکی ئابوریو ئیداری بانگهێشت دەکران، ئابوری عێراق لە کاتی جەنگیشدا کارایی خۆیی هەبو، چونکە بەپلەی یەکەم ئابورییەکەی سەنتراڵی بو. پێش هەڵایسانی جەنگ بە ماوەیەکی زۆر دیسپلینی توند لەسەر هەناردەو هاوردەو دابەشکردنو بەرخۆرو بەرهەمهێناندا پیادە دەکرا. لە راستیدا ئابوری بەعس ماوەیەکی زۆر پێش هەڵایسانی جەنگ، ئابوری جەنگ بو، ئەوەش خاڵێکی گرنگ بو، بەڵام

نابێت کاریگەری کۆمەڵایەتی جەنگ لەسەر عێراق بەهەند وەرنەگیرێت. بریتانیا لە ماوەی جەنگی جیهانی دوەمدا هەمان هەنگاوی ئابوری هاویشتو دەرئەنجام چوار سەد هەزار کەسی لەدەستدا. بە وشەیەکی دی، گریمان ژمارەی کوژراوەکانی عێراق سێ سەد هەزار کەسە، ئەوا دیسانەوە کاریگەری کۆمەڵایەتی جەنگ لەسەر عێراق، لە کاریگەری جەنگی جیهانی دوەم لەسەر وڵاتانی بریتانیاو فرەنسا (شەش سەد هەزار کەس)و ئیتاڵیا (چوار سەدو دە هەزار کەس)و چیکوسلۆڤاکیا (چوار سەدو پازدە هەزار کەس)و هۆڵەندە (دوو سەدو دە هەزار کەس) زیاتر بو[5].

بەراوردکردنی ئەم جەنگە بە جەنگی جیهانی یەکەمەوە مانادارترە. تێکرای زیانەکانی بریتانیاو فرەنساو نەمساو هەنگاریا دوو بەرابەر بو لەماوەی جەنگی جیهانی دوەمدا، زۆرینەی کوژراوەکان لە سەربازەکان بەرەی جەنگ بونو کوژراوە مەدەنییەکان زۆر نەبون. جیابونەوەی بەرەی ناوچە ئاوەدانەکانو سەنگەرەکانی شەڕ خەسڵەتێکی سەرەکی جەنگی جیهانی یەکەم بو، هەر چەندە جەنگی عێراق ـ ئێرانیش بەو شێوەیە بو، بەڵام جودایی سەنگەرەکانی شەڕ لە ناوچە ئاوەدانییەکان لە جەنگی جیهانی یەکەم نەدەچو، چونکە بۆمباران کردنی شارو ناوچە ئاوەدانەکان لە شەش ساڵی یەکەمی جەنگی عێراق ـ ئێراندا بەگشتی تاکتیکێکی دەرونی بو. لە پاڵ ئەوەشدا رەفتارگەرای جەنگکردن لەگەڵ جەنگی جیهانی یەکەمدا لە دوتویدا لێکچونێکی نامۆ هەڵدەگرێت، ئەو لێچونە راستەقینەیەش خۆی لە دوبارە گەڕانەوەی گازی ژەهراویو ستراتیجییەتی شەپۆلی مرۆیی دەبینێتەوە (نەك جەنگی سەنگەر بە مانا ناسراوەکەی، بەڵکو داخراوەکەی).

جەنگی عێراق ـ ئێران، چەشنی جەنگی جیهانی یەکەم، یەکەمین جەنگی راستەقینە بو کە بەو قەوارەیە هاوڵاتیانی هەر دوو وڵاتەکە تێیدا تێوەگلابون، ئەم جەنگە، جەنگی نێوان دوو سوپا نەبو، بەڵکو جەنگێك بو تا ئاستێکی بەرفراوان دانیشتوانەکەیشی مۆبیلیزە کرابون. هەروەها جەنگێکی فراوانخوازی ئیمپریالیستی نەبو کە زلهێزێك بخوازێت ناوچەی دەسەڵاتی فراوان بکات، یا دەرئەنجامی پیلانی لایەنە بۆگەنەکان



نەبو کە بەوەکالەت کار بۆ بەرژەوەندی لایەنی دیاریکراو بکەن، بەلەبەرچاوگرتنی پەراویزی جەنگو مۆبیلیزە کردنی سەرچاوە مرۆییو کۆمەڵایەتییەکانی هەر دوولا، دەتوانرێ بوترێ کە جەنگی عێراق ـ ئێران، یەکەم جەنگی گەورەی جیهانی سێیەم بو. لەوەتەی بیرۆکەی جیهانی سێ دەرکەوتوە، جەنگێکی لەوجۆرە روویندداوە.

هەروەکو چۆن جەنگی جیهانی یەکەم لە مێژووی ئەوروپادا بێوێنە بو، جەنگی عێراق ـ ئێرانیش لە مێژووی پەیوەندی نێوان ئەو دوو وڵاتەدا وێنەی نەبو. هەر دوو جەنگی جیهانی بەشێوازێك ئەوروپای لە مێژووی خۆی دابڕی کە تائێستاش شارستانی رۆژئاوا هەوڵی لێتێگەیشتنی دەدا، بەهەمان شێوەش، جەنگی عێراق ـ ئێران، جەنگێکی مۆدێرنەو دەوڵەتێکی بیروکراتی بەدیسپلین لەدژی دەوڵەتێکی دی هەڵیگیرساند کە بەقۆناغی شۆڕشدا تێدەپەری. نە رۆشنگەری نەزۆکی عێراقو نە شۆڕشی رابردوبینی ئێران ناتوانن ئەوە رونبکەنەوە کە ئەم دوو دەوڵەتە لە سەدەی بیستەمدا چی دەبوونو بۆچی بەو شێوە دیاریکراوە مامەڵەیان لەگەڵ یەکتریدا کرد، ئەوەش روداوێکی گرنگو ترسناك بو کە سەرئەنجام هەمو عێراقیو ئێرانییەك لەسەر بنەمای فۆرمێکی نوێی حوکم درکی پێدەکەن، ئەو فۆرمەی لە دوای کۆلۆنیالیزمو قۆناغی دوای چەوسانەوەی ئیمپریالیستی دایانهێنا. رەنگە ئەو رژێمانەمان پێباش نەبێت کە ئەو هەمو کوشتارەیان بەدیاری بۆ هێناوین، بەڵام سەرەتای حیکمەت ئەوەیە کە لێکۆڵینەوە بکەین لەسەر ئەوەی کە ئەو رژێمانە بەرهەمی کۆمەڵگەو نەریتی سیاسی ئێمەیە، نەك بەرهەمی کامڵبونی مێژوویی کۆمەڵگەی ئێمە بێت، هەر لە دێر زەمانەوە تا هەنوکە، بەڵکو بەرهەمی سەردەمی نوێیە. ئەم جەنگە، هەروەکو جەنگی جیهانی یەکەم درزێکی قوڵی خستۆتە وشیاری نەوەکانی ئایندەی عێراق ـ ئێرانو بۆ چەندین ساڵی ئایندە ئیمانو هەڵوێستو بیروڕاو بەهاکانیان پێکدەهێنێت.

## هۆکاری کێشەکە:

هۆی ئەو جەنگە چی بو؟ لەم بارەیەوە سێ بەڵگە هەیە کە هیچ کامیان قاییلکەر نین‌و بەشێوەیەکی فراوان لەسەر ئەمانەی خوارەوە تەوەرە دەبەستن[6]:

١ ـ نەفرەت‌و بوغزی نەتەوایەتی‌و رەگەزی.

٢ ـ دڵەڕاوکێی شیعەکانی عێراق.

٣ ـ مەسەلەی سنور.

١ ـ هەستی دوژمنایەتی مێژوویی نێوان هەر دوو میلەتی عێراق‌و ئێران، بنەمای هەڵایسانی شەڕ پێکدەهێنێ، ئەگەر چی پەیوەندی بەکاتنانەوەکەشی نەبێت. جاسم عەبدولغەنی دەنوسێت: "بوغزی فارسی بەرامبەر بە عەرەب لە دەرونی ئێرانییەکاندا رەگیداکوتاوەو ئێرانییەکان هەمو داگیرکاریی سەر وڵاتەکەیان لە بیرکردوە، جگە لە پەلامارو داگیرکارییەکانی عەرەب"[7]. ئەو بیرۆکەی دوژمنایەتییەش لە دابەشبونی نەتەوایەتی (عەرەب لە بەرامبەر فارس) یا لە رەگەزپەرستییەوە (رەگەزی ئاری لە بەرامبەر سامی) سەرچاوەی گرتوە. ئەم روانینە بەگشتی لەلایەن عێراقییەکانەوە پەسەند دەکرێ‌و هێندێك جار لە نوسینی رۆژنامەکاندا وەك "هۆیەك" دەردەکەوێت کە بەشداری لە هەڵایسانی شەڕ کردوە[8].

باشترین بەڵگە بۆ ئەوەش لە بەشداربوانی خودی ئەو جەنگەوە دەخرێتەڕوو، بۆ نمونە یەکەمین پەرچەکرداری ئێرانییەکان لە بەرامبەر هێرش‌و پەلاماری عێراق ئاماژە بە "عەرەبە ناپاکەکان" دەکات، ئەو پەخشنامانەی ئاراستەی بەرەکانی جەنگ دەکرا، بەو دروشمە کۆنانە رازابونەوە کە سوکایەتی بەناوو ناوبانگی عەرەبی بێمێشك دەکرد، وەك ئەو عەرەبە پا پەتیانەی "شیری وشترو مارمێلکە دەخۆن". لەلایەکی دی، بەعسییەکانیش قسەیان لەسەر "بەربەرێتی"و "ئاگر پەرستی"و " رەگەزپەرستی" فارس دەکرد. سەدام حسێن بانگەوازی بۆ لەناوبردنی مەجوسەکان دەکرد.



بەعسییەکان لە پروپاگەندەکانی خۆیاندا هەرگیز ئاماژەیان بە ئێرانییەکان نەدەکرد، بەڵکو فارسییان بەکاردەهێنا، ئەوانەی لە رووی مێژووییەوە هەمیشە واتەماشا دەکران کە ئیمپراتۆڕەکەیان لەسەر حیسابی میلەتە چەوساوەکانی دی فراوان دەکەن[9].

شۆڤێنیزمی فارس بەرامبەر بە عەرەب پێشینەیەکی دورودرێژی هەیە، بەڵام بە ناوەرۆکێکی کولتوری. کاتێك تاران سەرنجێك دەدا لەسەر ئەوەی: "سەگی ئەسفەهان ئاوی سارد دەخواتەوە، بەڵام عەرەب لە بیاباندا کوللە دەخوات"، مەبەستی لە باڵابونی شارستانییە، بێئەوەی ئاماژە بە ناوەرۆکێکی سیاسی بدات. ئەم هەڵوێستە بەشێوەیەکی زۆر کەللەشەقانە لەنێو گشت چینە کۆمەڵایەتییەکانی ئێران، ئەوانەی بەزمانی فارسی قسەدەکەن، بوونی هەیەو بەیەکسانی‌و لەگەڵ جۆرێك لە سوکایەتی پێکردن بەسەر هەمو کەمایەتییەکانی دی ناو ئێراندا پیادە دەبێ.

بەپێچەوانەی ئەوەشەوە، پیاوانی ئاینی لە ساڵی ١٩٧٩ەوە هەوڵ‌و کۆششێکی بەرچاویان بۆ هەڵگرتنی مۆرکی فارسی‌و بەئیسلامیکردنی ئێران دەدا. لە زۆربەی وتەکانی خومەینیدا وشەگەلێکی عەرەبی بەرگوێدەکەوتن کە تا پێش کەوتنی شا لەلای زۆربەی ئێرانییەکان نەبیسترابون. زمانی عەرەبی لە ئێراندا شوێنی زمانە ئەوروپاییەکانی گرتەوەو لەپێش ناوهێنانیشدا وشەی "سەید" بەکاردەهێنراو هێمای مانگ، جێگەی "شێرو رۆژ"ی، کە ئاماژەیەك بو بۆ دروشمی فارسی کۆن، گرتەوە. لە دوای ٢٢/ئەیلول/١٩٨٠ەوە بەکارهێنانی وشەی عەرەبی زیاتر پارێزی لێدەکرا، تەنانەت کاتێك خومەینی ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە "عەرەب لە پشتەوە خەنجەر دەوەشێنن"، یا بەردەوام داوای لە جەماوەر دەکرد دژی سوپای یەزید ـ ی "سەدام حسێن" دەست بەشۆڕش‌و راپەرین بکەن، ئەو چەمکە میتافۆرییە (مەجازی) لە رەگوریشەی تایفییەوە سەرچاوەی دەگرت (شیعە لەدژی سونە)و هیچ پەیوەندییەکی بە شۆڤینیزم یا رەگەزپەرستی ئێرانییەوە نەبو. بانگەوازەکانی خومەینی ئاماژەیەك بو لەسەر روداوەکانی سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلام کە تێیدا عەرەبەکان بانگهێشتی (حسێنی کوڕی عەلی)یان کرد تا حوکمی عێراق بکات، پاشان لە بەرامبەر سوپای

یەزیــدی کوڕی مەعاوییە بەتەنها بەجێیانهێشــت، ئەوەش لە روانگەی شــیعەکانەوە زەوتکردنو داگیرکردنی خەلافەت بو. لە ســایەی هەمو هەلومەرجێکدا ئەم چەمکە خوازراوە رەگەزپەرستییە شۆڤینێزمی فارسی دەوروژاند، بەڵام دەبێ ئەوەش بوترێ کە رەگەزپەرستی ئێرانی یا پشتبەستن بە رەگەزی ئارییایی هیچ رۆڵێکی لە هەڵایسانی ئەو جەنگەدا نەبو، بەڵکو بە هەڵایسانی جەنگ سودیان لێوەردەگیرا.

رەگەزپەرستی بەعسیش رەگوریشەیەکی کولتوری هەیە، ئەگەر چی رەگوریشەیەکی زۆر قوڵــی نیە. عەجــەم رەگەزێکی نزمترە لە عەرەب کــە پەیوەندییەکی ناجێگیریان بە ئاینی ئیســلامەوە هەیــە. لەڕووی مەبدەئییەوە، رەگەزپەرســتی بەعــس لە بواری ئایدیۆلۆجی ـ سیاســیو لە رێگەی پروپاگەندەی سیاســییەوە دەســت پێدەکات، بۆ نمونە وتەکەی خێروڵا تولْفاح: دەبوایە خوداوەند ســێ بونەوەری دروست نەکردایە: فارسو یەهودو مێش، یا لە رێگەی هەوڵو کردەوە ترســناکەکانی پۆلیســەوە، فازیل بەراك وەك نمونە(10). بەعســییەکان لە ناکۆکی نانەوەی نێوان شیعەی عێراقو ئێراندا روبــەروی دژواری مەزن دەبونەوە، چونکە لەڕووی مێژوویيو کولتورییەوە هیچ جۆرە دوژمنایەتییــەك لە نێــوان خۆیــانو هاومەزهەبەکەیان لە ئێراندا بوونــی نەبو. لە هیچ وڵاتێکی عەرەبی دی، عەرەبو ئێرانی بەو قوڵییە تێکەڵ بەیەکتر نەبوبن. بەدڵنیاییەوە ئارییایی فارسو ســامییەتی عەرەب خورافەی واقعێکە لە شــوێنێك یا ناوچەیەك لەسەر بنەماکانــی زماندا هەیە، نەك لەنێو خەڵکیدا. ئەمجۆرە راســتیە ســەرەتاییانە، زەمینە بۆ چەمکێکی کۆنی وەك شــعوبییەت لە ســەردەمێکی هاوچەرخدا ئامادە دەکات، بەتایبەتــی ئــەوەی کە بتوانرێ لەگەڵ چەمکی شــعوبیەتدا دوژمن لــە ناوخۆدا پەیدا بکــرێ، ئەمەش بۆ لایەنگرانی پانعەرەبی کێشــێکی گــەورەی هەیە. هەڵبەتە کاتێك فارسی زمانان لەگەڵ عەرەبی زمانان پێکەوە دەژین، جۆرە بەریەککەوتنێك روودەدا، بەڵام ئەو بەریەککەوتنە زیاتر لایەنی ئایدیۆلۆجی هەیە تا لایەنی سیاسی، بۆیە ناتوانێت ببێتە مایەی هەڵایسانی جەنگی عێراق ـ ئێران.

بەهەمان خەسڵەتی جیاکار، ئەم جەنگەش وەك هەر جەنگێکی دی، هەر لایەك،



لایەکەی دی بەئەهریمەن وەســفدەکردو پاڵپشــتی لە هەمو هەوڵێك دەکرد بۆ ئەوەی بیخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. ئەمرۆ خومەینیزم ناخی شــۆڤینیزمی فارسی هەڵدەکۆڵێت، بەڵام بەعســییەکان تۆیی رەگەزپەرســتی دەچێنن. کاتێك لاشەکان کەڵەکە دەبون، هەر دوو قارەمانی حەکایەتەکە تەنها لەو شوێنانەی توانای روشاندیان هەبو، دەیانتوانی دەســت بە هەڵکۆڵین بکەن، پاشــان لە شــوێنەکانی دی کە حەزیان پێی هەبو. بە واتایەکی دی، ئەگەر شتە رووکەشییەکان بەلاوە بنێین، دەبینین هەر دوو شەڕکەرەکە تا قوڵایی رەگەزپەرستی رۆچو بون، کەچی سەردەمانێك تەنها پێستەکەیان دەخوراندو روبەروبونەوەیەکی رووکەشیان لەگەڵیدا هەبو.

مێژوو شتێکی ئەوتۆمان لەسەر ئەم جەنگە پێنالێت، جگە لە جەنگی مەزنی ساڵی ٦٣٦ زایینی نێوان عەرەبو فارس کە لە پێدەشــتی قادســیەدا هەڵایســاو ئێرانییەکان تێیدا شکســتیان هێنا. ئەم جەنگە ســۆزێکی جیاکار لە عێراقــدا دەوروژێنێت، لەبەر ئەوەی ئەم جەنگە بەرەســمی بە جەنگی قادســیەی سەدام دەناسرێت، بەڵام ئەوەی جێگەی گاڵتەجارییە ئەوەیە کە ئیمپراتۆرییەتی ساســانی لە بەرامبەر عەرەبدا شکستی خوارد، چونکە تا بیناقاقای لە گەندەڵی رۆچو بو، بە بڕوای زۆربەی مێژوونوســانیش ســەرکەوتنی عــەرەب لەو شــەڕەدا دەگەڕێتەوە بــۆ ئەوەی کە ئێرانییــەکان پۆل پۆل ســوپاکەیان بەجێدەهێشتو پەیوەندییان بە سوپای ئیسلامەوە دەکرد، ئەمە سەرباری ئەوەی کە خودی عێراق لەو دەمەدا ســەر بە ئیمپراتۆرییەتی ساســانی بو (پاشماوەی تیزفۆنی پایتەختەکەیان تا ئێســتاش لــە جوگرافیای عێراقدایە). هەروەکو دەبینرێ ئەم مێــژووە تژییە لە نوکتەی گاڵتەجاریو ســەرنجراکێش، بەهــەر حاڵ ئەوەش ناتوانێت ببێتــە مایــەی هەڵایســانی جەنگی عێراق ـ ئێــران، بەڵام تەنهــا دەتوانێت ـ ئەویش بە شــێوەیەکی نێگەتیڤانە ـ ئــەوە بخاتەڕوو کە چۆنو تا چەنــد عێراقیو ئێرانییەکان تازەگەرو نوێخوازن.

٢ ـ کاتێــك عێراق لــە حاڵەتی هێرشو پەلاماردانــەوە حاڵەتی بەرگری وەرگرت، ئیدی زۆر ئاســایی بو بانگەشــەی ئەوە بکات کە نائارامی شیعەکانی عێراق دەستی

ئێرانی لە پشتەوەیەو بەعسیەکان ناچاربون ڕێوشوێنی بەرگریکارانە بگرنەبەر بۆ ئەوەی بەر هەناردەکردنی شۆڕشی ئێران بگرن. سەرەتا بەعسییەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە پێش هەڵایسانی جەنگ لە ٢٢/ ئەیلول/ ١٩٨٠دا ئێران لە رووداوە سنورییەکاندا (١٨٧) جار دەستدرێژی کردۆتە سەر سنور، بەڵام هەرگیز وردەکاری ئەو دەستدرێژییانەیان ئاشکرا نەکرد. لە ناوەڕاستی هەشتاکاندا لە وتەکانی هێندێك وتەبێژی رەسمی وەرچەخانێك روویداو بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە بارودۆخی عێراق لە پێش ١٩٨٠دا لە شەڕی ناوخۆوە نزیك بوە، بەڵام لە روانگەی لێکۆڵیارانەوە چەند تەقینەوەیەكو هەوڵی تیرۆرکردنی تاریق عەزیز، جێگری سەرەك وەزیران لە نیسانی ١٩٨٠دا لەبەرامبەر سەقامگیری باری سیاسی ئەو دەمەی عێراق، ناتوانن عێراق لە شەڕی ناوخۆیی نزیك بکەنەوە، هەروەها ئەو لێکۆڵیارانە پێداگرییان لەسەر ئەوە دەکرد کە شۆڕشی ١٩٧٩ی ئێرانو سەرسەختی خومەینی کەشوهەوایەکی دەرونی ئەوتۆی خوڵقاند کە رێبەرانی بەعس قەناعەت بەوە بهێنن تا زووەو درەنگی نەکردوە کۆمەڵێك رێوشوێنی بەرگری یەکلاکەرەوە بگرنەبەر[11].

ئەو دیدوبۆچونەی رێبەر لەگەڵ حاڵەتی پرگومانی بەعسیدا، ئەستەمە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە بەرگری لێبکرێ:

**یەکەم:** دەوڵەتی بەعس لە کۆتایی حەفتاکاندا لە هەمو دەوڵەتەکانی دی مێژوویی هاوچەرخی عێراق دەوڵەمەندترو بەهێزتر بو، هەروەها توانی هەمو ئۆپۆزیسیۆنە رێکخراوەکانیش بهارێت.

**دووەم:** گەشەسەندنی تایفەگەرای شیعەی عێراق هەر لە بنەرەتەوە بەرهەمی شۆڕشی ساڵی ١٩٧٩ی ئێران نەبو. هەر چەندە شۆڕشی ئێران یارمەتی بەهێزبونی دا، بەڵام خودی بەعس لە بواری کۆمەڵایەتیو کەسیتێدا خوڵقێنەری تایفەگەرا بو.

**سێیەم:** شیعەگەرێتی عێراق بە پێچەوانەی ئێرانەوە بەپلەی یەکەم لایەنگری سیاسەت نەبو، بەڵکو تەنها رەنگدانەوەی رقو کینەی کۆمەڵایەتیو کولتوری نێوان سونەو شیعە بو.



**چوارەم:** رێکخراوە سیاسییە نوێکانی شیعەی عێراق (لە بابەت حیزبی دەعوە) کە رەنگە یارمەتیان لە ئێران وەرگرتبێت، بەڵام هێزگەلێکی بچوك بونو پێش هەڵایسانی جەنگ تێکشکێنرابون[12].

تەنانەت گەر ئەوەشمان پێقبوڵ بێت کە لەنێوشیعەکانی عێراقدا نائارامی هەبوەو لەگەڵ دەوڵەتی بەعسدا دەستەویەخەبون، کەواتە بۆچی عێراق لەبەر ئەو هۆیە بەرەو جەنگی ئێران رۆیشت؟ کاتێك کوردەکان بە پاڵپشتی شای ئێران شۆڕشیان هەڵایساند، بەعسیەکان شەڕیان لەدژی ئێران رانەگەیاند، بەڵکو لەجیاتی ئەوە پەنایان بۆ گفتوگۆی دیپلۆماسیو نێوبژیوانی بردو ساڵی ١٩٧٥ پەیماننامەی جەزائیریان لەگەڵ شادا مۆر کرد. ئنجا ئەگەر روودانی شەڕێکی لەوجۆرە کارێکی حەتمی بێت، کەواتە بۆچی جەنگ لەو شارانەوە دەستی پێکرد کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی شیعە مەزهەب بون؟ بۆچی هێرشو پەلاماردان بەو داواکاریانە دەستی پێکرد کە پێشتر عێراق دەیزانی ئێران پێی قایل نابێت، بۆ نمونە رزگارکردنی هەمو پاریزگاکانی خۆزستانو گێڕانەوەی سەروەری عەرەبی بۆ سەر هەر سێ دورگەی دەرەوەی کەنارەکانی ئیماراتی عەرەبی یەکگرتو کە شای ئێران ساڵی ١٩٧١ دەستی بەسەرا گرتبو؟ داواکارییەکانی عێراق لە ئێران لە ئەیلولی ١٩٨٠دا بە جۆرێك بو کە رەتکردنەوەی لەلایەن ئێرانەوە کارێکی بەڵگەنەویست بو. سەرباری ئەوەی ساڵی ١٩٨٢ تای تەرازوی ئەو جەنگە لە بەرژەوەندی ئێراندا شکایەوە، کەچی سەربازە شیعەکانی عێراق هەر لە بەرەکاندا شەڕیان دەکرد. لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە چۆن رژێمێك بتوانێت درك بەهەڵەکانی بکاتو هاوڵاتیانی خۆی روبەروی بەدبەختیو فەلاکەت بکاتەوە، دیسانەوە جەخت لەسەر وتەکانی پێشوی بکاتەوە؟ لە دیدی عێراقییەکانەوە ئەمە گرنگترین پرسیار بو، ئەو واقیعە رووتەی ئەوجۆرە پرسیارە گەڵاڵە دەکات، لەگەڵ ئەو تیورەدا ناکۆکە کە پێیوایە نائارامی شیعەکانی عێراق بەعسی والێکرد ئەو جەنگە هەڵگیرسێنێت.

٣ ـ "بەر لە هەمو شتێك جەنگ بەهۆی ناکۆکی سنورەوە بەرپا بو، بەتایبەتی ناکۆکی دورودرێژی ناوچەی روباری شەتولعەرەب"[13]. ئەم دیدەش وەك هەمو

هۆیەکانی دی جەنگ رەگوریشەی لە پاساوەکانی بەعسدا هەبو. هەروەها گشت ناکۆکییە سنورییەکان دەتوانرێ بە گفتوگۆ چارەسەر بکرێ، ئەویش بەو مەرجەی عێراق هێزەکانی لە خاکی ئێران بکشێنێتەوە، هەروەکو سەدام حسێن ساڵی ١٩٧٥ لە رێگەی گفتوگۆوە کێشەکانی لەگەڵ شای ئێراندا چارەسەر کرد. بەعسییەکان هەرگیز ئامادەنەبون ئەو پرسیارە سەرەکییە بکەن کە چ کەسێك دەستدرێژیکار بووەو چ کەسێك بەواقیعی دەستدرێژی کردۆتە سەر بڕیارەکانی داوەری نێودەوڵەتی. عێراق بەناکامییەوە ئاماژەی تایبەتی بە قەرەبوی شەڕ دەکردو بەعسیەکان ئامادەبون بێقەیدو مەرج بۆ بارودۆخی پێش هەڵایسانی جەنگ بگەڕێنەوە، ئەوەش تاوانی عێراقی بەدەسپێکردنی شەڕ کەمدەکردەوەو عێراقییەکان بە نەرمی نواندن متمانەیان بۆ خۆیان پەیداکردو ئێرانیان بە نەیاری ئاشتی‌و دەستدرێژیکار لە قەڵەم دەدا، تەنانەت ئێرانییە ئۆپۆزیسیۆنەکانو نەیارانی پیاوانی ئاینیش، ئەوانەی هیچ جۆرە سۆزێکیان لەگەڵ بەعسدا نەبو، لە بەرامبەر پێداگری رژێمەکەیان لە درێژەپێدانی جەنگ نارەزاییان دەردەبڕی‌و هێندێك لە داواکارییە سەرەکییە سنورییەکانی عێراقیان پێقبوڵ بو.

دەوران دەوری ئەم ململانێ‌و ناکۆکییە سنوریانە، تەمومژی ئەنقەست یا غەیرەقەست بوونی هەیەو هەموان لەسەر ئەوەش یەکدەنگ نین کە ناکۆکی سنوری هۆی هەڵگیرسانی جەنگ بێت. لەنێو ئەو هەمو بەڵگانەشدا ناتوانرێ بەئاسانی ئەنگیزەی سیاسی چاودێری بکرێ‌و بسەلمێنرێ. ئامادەکردنی پێرستێك بۆ گشت ئەو بابەتانەی دەبێتە مایەی هەڵایسانی جەنگ، ئەڵتەرناتیڤێکی ئاسانە بۆ ئەوەی بیر لە هەمویان بکرێتەوە[14]. مەسەلەی ململانێ سنورییەکان لە نێو ئەو نوسەرە ئەوروپییە رۆژئاواییانەی دەیانەوێت لەم جەنگدا لایەنگری لە عێراق بکەن، سەنگێکی زۆری هەیە. تا ئێستا لێکۆڵینەوە لەسەر زۆرێك لە هۆیەکانی جەنگ کراوە، بەڵام زۆر قایلکەر نین. لەنێو لایەنگرانی ئەو دیدوبۆچونەدا دوو پرسیاری جودا دێتە ئاراوە، ئایا لێرەدا مەسەلەی سنور هەیە کە پێویستی بەچارەسەرو یەکلاکردنەوە هەبێت؟ من لەم کتێبەدا سەروکارم لەگەڵ ئەم پرسیارەدا نیە، ئەگەر ئەگەر وەڵامی ئەم



پرسیارە پۆزەتیڤ بێت، ئەوا پرسیارێکی قوتدەبێتەوە، ئایا ئەو مەسەلەیە دەبێتە مایەی هەڵایسانی جەنگ؟.

تاریق ئیسماعیل لە کتێبی، عێراق ـ ئێران: رەگوریشەی ململانێ، لە چوار چێوەی درێژترین راڤەکردندا دەربارەی مشتومڕی سنوریی، هەوڵدەدا پاساو بۆ کاری سەرەکی عێراق لە هەڵگیرساندنی جەنگدا بهێنێتەوە، ئەویش لە رێگەی گێڕانەوەی بۆ داواکاری سنوریی کە لە رووی مێژووییەوە پەسەندەو لە رووی یاساییشەوە جێگەی گومان نیە. لە هەمان کاتدا دەڵێت ئەو داواکارییە مێژوویی‌و یاساییە کاتێك توندتر بووەوە کە شێوەی ئایدیۆلۆجیای بەخۆیەوە گرتو دەوڵەتی عەلمانی ئایندەبین‌و نوێخوزای عێراق روبەروی دەوڵەتی فراوانخوازی ئاینیی ئێران بووەوە.

ئیسماعیل لێکۆڵینەوەکەی بە یەکەمین پەیماننامەی ئاشتی نێوان ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی‌و سەفەوی (ساڵی ١٥٥٥) دەست پێدەکات. دوا بەدوای ئەو پەیمانەش زنجیرەیەك شەڕو پەیماننامەی دی دێت کە سەرئەنجام ساڵی ١٦٣٩ لە دوای دەرکردنی ئێرانییەکان لە خاکی عێراق لەلایەن سوڵتان موڕادی چوارەمەوە، پەیماننامەی زەهاو بەسترا[15]. بەگشتی لەوجۆرە ناکۆکییە سنورییانەدا ، ئەگەر بەراوردەکان رەنگی ناسیۆنالیستی لەخۆبگرێت، بەوشێوەیە قسە لەسەر خەڵکی دەکەن. ئەو هەڵە مێژووییانە بۆ پارێزگاریکردن لەوجۆرە لێکۆڵینەوانە بەکاردەهێنرێ[16]. (سەیر ئەوەیە هێندێك لێکۆڵیاری رۆژئاواییش کەوتنە داوی ئەوانەی لایەنگریان لەو تیورەیە دەکرد، بۆ نمونە دانێل پیپس دەڵێت ناوچە سنورییەکان فاکتەری سەرەکی جەنگ بون، ئەمە لە حاڵێکدا دوژمنایەتی نێوان عەرەب‌و ئێرانییەکان رەتدەکاتەوە، بەڵام پێویستە لێی بپرسین جگە لە دوژمنایەتی مێژوویی نێوان خەڵکی، چ شتێك پەیمانی ١٦٣٩ی نێوان ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی‌و سەفەوی بە سەدام حسێن‌و خومەینی پێکەوە دەبەستێتەوە؟). بە بەستنی پەیمانی زەهاو، چوارچێوەیەك بۆ کێشمەکێشە سنورییەکانی ئایندەش دانرا[17]. پاشان نوسەر بۆ ململانێی سەر خوزستان دەگەڕێتەوە تا دواجار دەگاتە پەیماننامەی ئەرزەرومی ١٨٢٣ تایبەت بە ئاو Watershed. ئەم

پەیماننامەیەش دواهەمین پەیمانی سنوری نێوان ئەو دوو وڵاتە بو، چونکە دوای ئەوە هێزی ئیمپریالی تازەنەفەس بە بەرژەوەندی جۆراوجۆرو ناکۆکەوە لە ناوچەکەدا خۆیان سەپاند، هەموشمان دەزانین چۆن مامەڵە لەگەڵ مەسەلە سنورییەکاندا دەکەن.

ئـەم رودواوە لـە پەیوەندی عێراق ـ ئێراندا زۆر گرنگو ترسـناك بووە کەسـانێکی کەم پێش هەڵایسـانی جەنگ لێی بەئاگابون، بەچاپگەیاندنی شـەش نەخشە کە لە یەکەم نەخشـەی پڕ وردەکاریدا ئەوە رووندەبێتەوە کە موحەمەرەو ئەبادانو سـنوری روباری بەهمەنشـیر، واتە بەشـی ئەوپەری رۆژهەڵاتی کارونو سـەرجەم ناوچەکانی شەتولعەرەبو زۆلکاوەکانی نێوان شەتولعەرەبو بەهمەنشیر وەك پارچەیەك لە خاکی عێراق دەسـت نیشـانکراوە (هەڵبەتە نە ئەو کاتەو نە سـەدەیەك دوای ئەوەش عێراق بوونی نەبوەو دواتر ئەم وڵاتە دروسـت بوە). سـەرچاوەکانی ئیسـماعیل کە رێگەی بۆ ئەوجۆرە نەخشـەیە هەموارکردبو، بەداخەوە خوێنـەر قاییل ناکات، چونکە هەمو کەسێك دەزانێت کە پەیماننامەی نێوان ئیمپراتۆرەکان لەم بەشەی جیهاندا بەخاتری ئامادەگی خیڵایەتی، هێڵی سنورەکانیان بەشێوەیەکی لێڵو ئاڵۆز پێناسەو دیاریکردوە. لە پاڵ ئەوەشـدا لە ئەرشـیفەکانی ئێراندا رەنگە سەدان نەخشـەی ئەوتۆ هەبێت کە لەگەڵ نەخشـەکانی ئیسـماعیلدا هاوئاهەنگ نەبێت. بەهەر حـاڵ، تەنانەت ئەگەر نەخشـەکانی ئیسماعیل دروسـتیش بێت، ئەوا ئەو خاکەی ئیسماعیل بەپێی پەیمانی ١٨٢٣ بۆ عێراقی تەرخان کردوە کەمترە لە ١٪ روبەری پارێزگای خوزستان، ئەمە لە کاتێکدا بەعسیەکان ساڵی ١٩٨٠ داوای هەمو پارێزگاکەیان دەکرد.

سـنوری پاریزگای عەرەبسـتان هەمیشـە ئاڵۆزو نادیار بوە، وشـەی عەرەبستان یا ناوچـەی ئەهواز دوو چەمك بون بەعسـیەکان بۆ ئەوەی شـاری ئەهواز بە عێراقەوە بلکێنن، بەکاریاندەهێنا، بەڵام رەنگە گشت یا سەرلەبەری ئەو پارێزگایەی ئێرانییەکان لە ئێسـتادا پێی دەڵێن خوزسـتان، بگەڕێتەوە یا نەگەڕێتەوە. ئەگەر عەرەبسـتان بەوە پێناسە بکرێ کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی عەرەبی زمانن (ئەوەش لەگەڵ ئایدیۆلۆجیای بەعسـدا دەگونجێت)، ئەوا پێشوازینەکردنو بەتوندی روبەروبونەوەی سوپای عێراق



لەلایەن خەڵکی ناوچەکەوە گرفتێکی زۆر دەوروژێنێت، سـەرباری ئەوەشو بەهەمان پێوەری بەعس، چەندین ناوچەی باشـوری عێراق، بە کەربەلاو نەجەفیشەوە، رەنگە بۆ بانگەشـەکانی ئێران کراوە بێت، بەتایبەتی بەعسـیەکان بە دەرکردنی شیعەکان، بەناوی ستونی پێنجەمەوە پێگەی ئێرانیان بۆ ئەوجۆرە بانگەشانە بەهێز دەکرد.

نەخشـەی دوەم رێکەوتنی سنوری سـاڵی ١٨٤٧ دیاریدەکات، بەڵام بە بۆچونی نوسەر، نەخشەکە "رەنگدانەوەی بەرژەوەندی گشتی ئیمپریالیزمە لەڕووی پەیوەندی بە سـەقامگیری ناوچەکانی دەسەڵات"[18]. لەم نەخشەیەدا، خورەمشەهر، ئەبادان، روباری بەهمەنشـیرو ناوچە زۆلکاوەکانی ناو خاکی ئێرانو شـەتولعەرەب بە سنوری عێـراق دادەنرێ. ئەمرۆ هـەر دوولا لەبەر هەمان هۆ ئـەو پەیماننامەیە رەتدەکەنەوە، بەڵام عێراق بەرووکەش دەڵێت پەیماننامەیەك ئیمپراتۆرییەتی عوسـمانی واژوی لەسەر کردبێت، بەهەقی خۆی دەزانێت رەتیبکاتەوە، ئەمە لەکاتێکدا ئێران لەو سـەردەمەدا سەربەخۆ بوەو ئێستاش پێویستە بەو پەیماننامەیەوە پابەندبێت. ئێرانیش لە عێراق زیاتر پەلدەهاوێتو دەڵێت میرزا محەمەد عەلی خان کە سـاڵی ١٨٤٧ واژوی لەسـەر ئەم پەیماننامەیە کردوە لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە سەرپشك نەکراوە واژوی لەسەر بکات. سەرچاوەو رەگوریشەکانی کێشمەکێشەکە بەهەمان شێوە بە لێڵیو ئاڵۆزی دەمێنێتەوە، هەر چەندە (١٨٠) لاپەرە لە پەیماننامەو یاداشتی رونکردنەوەو قەواڵەی یاسایيو داتاو گوتـاری بۆ زیاد کراوە، کەچی دیسـانەوە لێڵیو ئاڵۆزی هـەر بە هێزو توانای خۆی ماوەتەوە، تا لەناکاو تاریق ئیسـماعیل بە نەخشـەی شەشـەم دەگات کە ٦/ مارس/ ١٩٧٥ لە جزائیر دیاریکراوەو لەلایەن نەتەوە یەکگرتوەکانیشـەوە رەزامەندی لەسـەر دەبڕاوە.

ساڵی ١٩٧٥ عێراق لە کۆنگرەی جەزائیر بەشێوەیەکی رەسمی ملی بۆ داواکارییەکانی ئێران کەچ کرد (پێشتر لە ساڵی ١٩٣٢یشدا هەمان کاری کردبو) کە تێیدا بریار درا هێڵی سنوری نێوان هەر دوو وڵات لە ناوچەی شەتولعەرەب بەپێی پرەنسیپی تاڵوەگ Talweg دیارییکـرێ، واتە قوڵترین بنی روبار دەبێتە سـنور. لە بەرامبەر جەختکردنی

سەروەری هاوبەشی هەر دوولا لەسەر روباری سەر سنور، شای ئێران دەست لە پاڵپشتی کوردە یاخییەکانی باکور هەڵبگرێو هەر دوولاش رێز لە سنوری یەکتری بگرنو کۆتایی بەهەمو جۆرە پێشێلکارییەکی سنور بهێنرێ. ئەم پەیماننامەیە چەند رۆژێك پێش پەلامارەکەی ئەیلولی ١٩٨٠ لەلایەن عێراقەوە پوچەڵ کرایەوە، بەکورتی بارودۆخی رەسمی بۆ هەڵایساندنی جەنگ بەمشێوەیەی خوارەوە بو:

ئێران پێشتر پەیماننامەی جەزائیری بە (١٨٧) پێشێلکاری خستۆتە ژێر پێیەوەو گشت ئەو پێشێلکارییانەش لە چوار مانگی بەر لە هەڵایسانی شەڕ روویدا، بۆیە بە بۆچونی عێراق تەنانەت تاکە یەك پێشێلکاریش دەبێتە مایەی پوچەڵکردنەوەی پەیماننامەی ١٩٧٥ جەزائیر[19]. هەروەها داتای زۆرێك لە سەرکردە ئێرانییەکان خۆی لە خۆیدا بەڵگەیە لەسەر هەناردەکردنی شۆڕشی ئیسلامی، بۆیە تەنها بەپوچەڵکردنەوەی رێکەوتنامەکە رێڕەوی شەتولعەرەب بەپێی هەمو پەیماننامەکانی پێشو بۆ سەروەری عێراق دەگەڕێتەوە، لەبەر ئەوە هەر کەشتییەك کە بەشەتولعەرەبدا تێپەردەبێت، پێویستە ئاڵای عێراق هەڵبکاتو باجی کەشتیوانی بەدەوڵەتی عێراق بدات، سەرباری ئەوەش ناوچەی ئەهواز یا عەرەبستان، ساڵی ١٨٤٧ لە پەیماننامەی ئەرزەرومی دووەمدا بە شێوازێکی نادروست دراوە بە ئێران، ئەو ناوچەیە زۆرینەی دانیشتوانەکەی عەرەبنو رەچەڵەکیان بۆ سەردەمی فتوحاتی ئیسلام دەگەڕێتەوە کە ئێرانیش لەسەر دەستی ئیسلام فەتح کرا. دواجار هەر سێ دورگەی دەروازەی هورمز ـ یش (تونبی گەورەو تونبی بچوكو ئەبو موسا) کە ساڵی ١٩٧١ لەلایەن شاوە دەستی بەسەرا گیرا، دەبێ بۆ حوکمڕانی عەرەب بگەڕێتەوە.

هەڵگیرسانی جەنگی عێراق ـــ ئێران ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئێران یەك لایەنە دەیویست قەڵەمڕەوی خۆی فراوان بکات، بۆیە ئەگەر مەسەلەکە تەنها مەسەلەی خاكو هێڵی سنوری بێت، دەتوانرێ بوترێ کە هۆیەکەیشی هەمان شت بوە، هەروەکو چۆن خاك کرۆکی شەڕەکانی عەرەب ـ ئیسرائیل بوە. لۆجیکی تاریق ئیسماعیلو پاپیسو زۆرێکی دی هەمان لۆجیك بو، بەڵام دەشێت جەنگ لەبەر هۆی



ناچیزو بێبایەخ، یا تەنانەت لەبەر هۆی گەمژانەش هەڵگیرسێت. دورگەکانی مالفیناس (فۆکلاند)، ناوچەیەکی بەردەڵانەو تەنها باڵندەی بەتریق (پەنگوین)و کۆمەڵێك بریتانی چاو نەترسی تێیدا دەژی، ئەوانەی لە رۆژگاری ئیمپراتۆرییەتدا لەوێ مابونەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك لە ئەرجەنتینیو بریتانییەکان لەو باوەڕەدابون کە ئەو دورگانە شایانی ئەوەن شەڕیان لەسەر بکرێ، بەڵام ئەگەر حیزبی بەعس بەخاتری داواکارییە سنورییەکان دەست پێشخەری لە هەڵگیرساندنی شەڕدا کردبێت، ئەوا کارێکی زۆر گەمژانەی کردوە. ئایا ئەو پارچە زەوییە بچوکانە هێمای سەروەری بون؟

لە نێو ئەو داواکارییانەی کە لە روانگەی بەهای زاتی بەعسییەکانەوە بوە مایەی هەڵگیرساندنی جەنگ، پێویستە ئەوەش بوترێ کە گەورەترین داواکارییان (خوزستان) بەو مەبەستە بانگەشەیان بۆ دەکرد، چونکە سور دەیانزانی رەتدەکرێتەوە، بۆیە شتێکی روونو ئاشکرایە کە ئەوە زیاتر داوایەکی ئایدیۆلۆجی بو. بۆ نمونە دەکرێ بپرسین ئەگەر بەعسییەکان دەستیان بەسەر خوزستاندا بگرتایە چییان لێی دەکرد؟ بێگومان لەوە درودونگ نەدەبون کە ئەو پاریزگا پڕ لە نەوتە بەوڵاتەکەی خۆیانەوە بلکێنن. مەسەلەی هەر سێ دورگەی دەربەندی هورمزیش شتێکە دەبێ لە نێوان ئێرانو ئیماراتی عەرەبی یەکگرتودا چارەسەر بکرێ، بەڵام حیزبی بەعس ساڵی ١٩٧٥ بەشێوەیەکی ئاشکرا وازی لەو تێزە هێنا. دواتر ساڵی ١٩٨٠ بڕیاری ئەو دوو داواکارییە (خوزستانو سێ دوورگەکە) لە کاتێکدا وەرگیرا کە بڕیاری "جەنگێکی گشتگیر" لەگەڵ ئێراندا وەرگیرابو. ئەو داواکاریانەش زیاتر بیانویەك بو بۆ روخاندنی رژێمی ئیسلامیو دابەشکردنی ئێران، نەك بۆ ئەوەی حوکمی پاشایەتی بگێڕنەوە. تێکرای ئەو گوشارانەی دەخرانە سەر ئێران وێرانکارانەبونو ئاراستەی یەکپارچەیی خاکی ئێران دەکران بۆ ئەوەی زۆرترین بەشو پارچەی بە قەڵەمڕەوی بەعسییەکانەوە بلکێنرێ. بەعسییەکانو ئەو مەبەست نیازەی خۆیان نەدەشاردەوە، چونکە وایاندەردەخست کە ئیمانیان بەڕەوایەتی داواکارییەکانی خۆیان هەیەو ئەو داواکارییانەشیان بەجۆشو بەپەرۆشەوە لە دووتوێی ئایدیۆلۆجیادا نمایشدەکرد، بەڵام ناچاربون "واقعییەتی"

گشــت بەڵگەو بەڵگەهێنانەوەکانیان بخەنەڕوو، پێشــئەوەی راشکاوانەو رکو راست رایبگەیەنــن، تەنانەت حیزبی بەعس دەیتوانی لە حیکمەتی پشــت ئەوجۆرە وریایی‌و پارێزانەشــەوە تێبگات، بۆیە لەمڕووەوە هەرچی شــتێکیان دەربارەی نیازو ئامانجەکانی جەنگ بوتایە، تەنها دەیانتوانی خەڵکی ساوێلکەو خۆشباوەڕ هەڵفریوێن.

تەنها ســەروەری لەســەر شــەتولعەرەب دەمێنێتەوە. ئەگەر فۆرمالیزمی (شکلیات) رێکەوتننامــەی جەزائیــر بەلاوەبنێیــن، وادەردەکەوێت کە بەعســییەکان ناچار بون خۆبەخشــانە خۆیان رادەستی ئێران بکەن، ئیدی لەوە بەدواوە بۆ دەرفەتێك دەگەڕان خۆیــان لەو بارگرانییە رزگار بکەن‌و ســاڵی ١٩٨٠یش کاتێکی لەبار بو تا خۆیان لەو بارگرانییــە رزگار بکەن، تەنانەت ئەگەر ئەوەش قبوڵ بکەین کە ســاڵی١٩٨٠ کاتی هەڵوەشاندنەوەی رێکەوتننامەی جەزائیر بوەو عێراق تەنها بە بانگەشەی خۆی دوبارە حوکمڕانی شــەتولعەرەبی کردۆتــەوە، کەواتە ئامانجی هێرشــە بەربڵاوەکەی ٢٢ی ئەیلــول چی بــو؟ عێراق لە١٠ی ئەیلول یەك لایەنە ئەو هێڵــەی بەپێی بەڵگەنامەکان داوای حوکمڕانی دەکرد، خســتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، بەوەش ناوچە یا خاکێکی دی لەو دیو ســنورەوە نەمابو بەعس داوای بکات‌و بخوازێت داگیری بکات. بەعس بەو کارەی پەیڕەوی لە نمونەی ساڵی ١٩٧١ی شای ئێران دەکرد، کاتێك یەك لایەنە هەر ســێ دورگەکەی دەربەندی هورمزی خستە ژێر رکێفی خۆیەوە. لەدوای ئەوەی عێراق هێڵی ســنوری شــەتولعەرەبی داگیرکرد، ئێران ئامادەبو لە بەرامبەر کەشتیرانی لە شــرێتێکی چەند میلیدا ئالای عێراق هەڵبکات‌و باجی کەشــتیوانی بدات، یا نا، تەنانەت لەو حاڵەتەشــدا پێویستی بەهێرشــێکی بەربڵاو نەدەکرد، چونکە پێش‌و پاش ســاڵی ١٩٧٥ هــەر دوو وڵاتەکــە بەرگریان لە ســنورەکانی خۆیان دەکــردو لەگەڵ بێدەنگی لێکردن لە تێپەربونی کەشــتی لە شــەتولعەرەبدا مەســەلەکە بە فەرامۆشــی دەسپێردرا.



## قادسیەی سەدام:

لەلایــەن عێراقەوە هیچ هۆیەکی ئاشــکرا نیە کــە کردەوەکانی بەعس لەمەڕ بریاری هەڵایســانی جەنگ روونبکاتەوە. هیچ کام لــەو داواکارییانە ئەوەندە گرنگ نەبون کە بەنیاز پاکی‌و لە رێگەی دانوستانی هەر دوو وڵاتی دراوسێدا قابیلی چارەسەر نەبێــت، بەڵام ئەو ناوەی عێراقییەکان لە شــەڕەکەیان نا باشــترین کلیلی کردنەوەی لوغزی "هۆی" ئەو جەنگە بو.

قادسیەی سەدام سەرنجی بۆ میزاجێکی دەرونی رادەکێشا کە لە سەرەتای جەنگ لە ئەڵقەکانی بەعســدا باڵادەســت بو. ئــەوەش میزاجێك بو بە هیــچ پەیوەندییەکی بە بانگەشــەی خاوەنداریتییەوە نەبو، وەك خاوەنداریتی ناوچەیەکی تایبەت‌و دیاریکراو، کێبەرکێ بۆ دەســکەوتی ئابوری، چاوچنۆکی بۆ دەست بەسەراگرتنی خاکی ئەوانی دی‌و نیازی ئێران بەرامبەر عێراق. رژێمی عێراق بڕوایەکی زۆری بەخۆی‌و هەستێکی تایبەتیــی بە دەســکەوتەکانی هەبو، تا بیناقاقاشــی چەکدار ببو، خــۆی وادەبینی کە توانــای ئــەوەی هەیە پارێزگاری لە دەســکەوتە مێژوویی‌و ئامانجەکانــی پانعەرەبیزم‌و بەعــس بــکات. حیزبی بەعــس پێیوابو کاتی ئــەوە هاتوە بڕیــاری کارێکی دەرەکی یەکلاکەرەوە بدات، هەروەکو پێشــتر لەناوخۆیی وڵاتــدا بڕیارێکی لەوجۆرەی دابو، تا باڵادەســتی بەعسی عێراقی گەشــەکردو لە رووداوەکانی دونیای عەرەبی‌و ناوچەکە بۆ جیهانی دەرەوە بخاتەڕوو. ئەنگیزەکانی بەعس بەشــێوەیەکی ســەرەکی ئەنگیزەی سیاســی بــو، کە لە تۆکمەیــی بیروبــاوەڕی ئایدیۆلۆجییانەوە ســەرچاوەی دەگرت‌و بەمەبەســتی دەربەســت بونیان بەرامبەر بەو بیروباوەڕو ئامانجانــە بەڵگەیەکی زۆریان ئامادەکردبو. هەڵبەتە بەرژەوەندی ئابوری، مادی‌و ســتراتیجی ئەو فراوانخوازییە کەم نەبو (بۆ نمونە پاریزگای پڕ لە نەوتی خوزستان، سەرزەمینی نوێ، دەوازەیەکی باشتر بەســەر کەنداو)، تەنانەت ئەگەر هەلومەرجەکــەش وابخوازێت کە ئەو داگیرکردنە،

داگیرکردنێکی هەندەکی (جزئي) بێت، بەڵام کۆتایی ئەو سەرنجو بایەخە لە ئەنجامی گەشەسەندنی هێزی بەعسەوە دەهات کە زەرورەتی ئەوەش لە شوێنێکی دی سەریهەڵدەدا. ساڵی ١٩٨٠ هەمو هێزەکان لە رێبەرایەتی سەدام حسێندا چڕ دەبوەوە، ئەندازیارێکی دانپیانراوی گشت جوڵەیەکی ئەم جەنگە بو. ئەم مەسەلەیەش لەکن شارەزایان ئەوەندە بەڵگەنەویست بو کە نکۆڵیان لێی نەدەکرد. بڕیاری سەدام حسێن لە هەڵایساندنی جەنگدا قابیلی رەتکردنەوە نەبو، بەڵام زۆرجار گرنگی ئەم خاڵەش بە فەرامۆشی دەسپێردرێ یا بازی بەسەرا دەدرێ[20].

سەدام حسێن جۆرە هێزێکی زۆر تایبەتی پیادە دەکرد. خودی سەدام حسێن بەتەنها دەزگایەك بو، دەزگایەك کە هیچ کۆنترۆڵێکی لەسەر نەبو. رێبەرایەتییەکەی بە شێوەیەکی ئاڵۆز، پەیوەندی بە سۆزی پانوپۆڕی جەماوەری عێراقییەوە هەبو، هەروەکو دوا روداوەکانی جەنگ دەریاندەخست، کاتێك هەستی بڕوا بەخۆبون نەمابو، بەڵام دیسانەوە ئەو پەیوەندییە توانای خۆگونجاندنی هەبو. سەدام حسێن سەرۆکایەتیو رێبەرایەتی رژێمێکی دەکرد کە بەشێوازی لەسەرخۆ، بەڵام زۆر بەتۆکمەیی، توانی گۆڕان بەسەر گشت هۆکارە کاریگەرەکانی توندوتیژی کۆمەڵایەتیو توندوتیژی دەوڵەتی بەدیسپلین بهێنێت. سەرئەنجام پرۆسەی قەبەکردنی ئامرازەکانی توندوتیژی ـ سوپا، پۆلیس، دەزگا ئەمنییەکان، تۆڕەکانی هەواڵگری، میلیشیاکانی حیزب، بیروکراسییەتی حیزبو دەوڵەت ـ بەقۆناغی کودەتایەکی کلاسیکیدا تێپەری: ئامرازەکان بە ئامانج گۆڕان، لەنێوبردنی ئۆپۆزیسیۆنو پیادەکردنی هێز بوە ئامانجێکی ترسناكو هەمو ئەو سنورانەشی تێپەڕاند کە رۆژێك لە رۆژان هەیبو. جەنگ، هەر جەنگێك، دژی هەر کەسێك بێت، دەرئەنجامێکی حەتمی گەشەسەندنی بێسنوری ئامرازەکانی توندوتیژییە، بەتایبەتی کاتێك بۆ ئەوە پێکدەهێنرێ تا زۆرترین کەس توشی ترسو هەراسانیو دڵەڕاوکێ بکات. کەسایەتی سەدام حسێن لەم هەستە شۆڕشگێرییە گشتییەدا لەگەڵ سەرلەبەری رژێمێکی سیاسیدا تێکدەئاڵێت کە تاکێکی وەك ئەوی بەرهەمهێناوە بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی جێبەجێ بکات.



رەهایی دەسەڵاتی سەدام حسێن، کەسایەتی دەکاتە کەسایەتییەکی زۆر گرنگ لەم جەنگەدا، پێواری گوشاری راستەقینە لە ناو کۆمەڵگەی عێراقی، ئێرانیو جیهانی، یا تەنانەت لەنێو خودی حیزبی بەعسیشدا، هیچ شتێك بۆ ئەو کەسە ناهێڵێتەوە کە رۆژێك لە رۆژان بخوازێت بەشێوەیەکی بابەتی مشتومڕ لەسەر هۆیەکانی هەڵایسانی ئەو جەنگە بکات. گۆڕینی بەڵگە داهێنراوەکانی ئەوجۆرە حاڵەتە کە بەشێوەیەکی نەگۆڕ لە دەستی لایەنێك یا ئەوی دی دەمێنێتەوە، بۆ ململانێیەك کە خۆشبەختانە کەم کەس بڕوای پێی هەیە، خەسڵەت یا تایبەتمەندێتی فرە سودبەخشی هەیە. بەبۆچونی من هەمو ئەو مەسەلانەی پەیوەندی بەچۆنێتی هەڵایسانی ئەو جەنگەوە هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی چ شتێك بە مێشکی سەدام حسێندا گوزەری دەکرد، تەنانەت ئەگەر هەمو بڕیارەکانی دونیای سیاسەتیش لە زەینی نوێنەرانو خەڵکانی پەیوەندیدارەوە دەرچوبێت، بەڵام بڕیاری تایبەتی سەدام حسێن بەهەڵایسانی جەنگ مانایەکی سەربەخۆی هەیە، چونکە ئەم جەنگە هەر لەبنەرەتەوە جەنگیکی بێپاساو بو. لەڕووی مێژووییەوە، ئەم بڕیارە لە گەشەسەندنی گشتی حیزبی بەعسەوە سەرچاوە دەگرێ، هەروەکو بەڕوونی لە دەوڵەتی بەعسی عێراقەوە دەردەکەوێت. پێداگری ئەم کتێبە سەبارەت بەجەنگی عێراق ـ ئێران، بریتیە لەو وەسفە دارابیەی بەشداری کرد لەوەی بڕیارەکەی سەدام حسێن بێپاساو بێت. ناوەرۆکی ئەو بڕیارەش بە بەراورد بەم یا بەو فۆرمە بێپاساوە، بەتەنها دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پیاوێکی ئازادو سەربەست لەناو عێراقدا هەیە. لێرەدا هیچ حەتمییەتێکی مێژوویی لە ئایدیۆلۆجیای بەعس یا لە سروشتی رژێمی بەعسدا سەرچاوەی نەگرتوە کە سەدام حسێن ناچار بکات ئەم بڕیارە، نەك ئەو بڕیارە وەربگرێت.

هۆی نابەجێی ئەم رەهاگەرێتیە بە گرفت یا بەمەسەلەی بەرپرسیارێتییەوە پەیوەستە، لەبەر ئەوەی تاکە شێوازی سیاسیی ئاخاوتن لەسەر "هۆی" هەر کارێك یا کردەوەیەك کە دەرئەنجامی هەڵاوێردێکی ئازادانە بێت، پەیوەندی بەو ئاماژەیە هەیە کە کێ لە چی بەرپرسیارە، ئیدی بەکاربردنەکانی دی "بەڵگەو هۆ" دەکرێ بەوپەری ئەمانەتەوە

بدرێتە دەستی شارەزایان کاتێك پێکەوە گفتوگۆی لەسەر دەکەن، ئەویش دوای ئەوەی رووداوە گرنگەکان بەکۆتایی دەگەن. درەنگ بێت یا زوو، عێراقی‌و ئێرانییەکان ئەو پرسیارە لە خۆیان دەکەن کە کێ لە دەسپێکردنی جەنگ بەرپرسیار بوە؟ چ کەسێك درێژەی بەجەنگ‌و کوشتار دەدا، ئەوەی یەکسەر بەزەینی بەهەمو کەسێکدا گوزەر دەکات ئەوەیە کە بەرپرسیاری پرسیاری یەکەم خودی سەدام حسێن بوەو دەکرێ یەکسەر بە بەڵگەشەوە روونبکرێتەوە، بەڵام سەبارەت بە پرسیاری دوەم ناتوانرێت ئەو بە بەرپرسیار بزانرێت، هەر چەندە لە نێو خاکی عێراقدا لە ئیدارەدانی جەنگ بەرپرسیار بو.

خۆشەبەختانە یا بەدبەختانە، سەدام حسێن لەبەر هۆگەلێك جەنگی هەڵگیرساند کە لە ئایندەدا هیچ لێکۆڵیار ناتوانێت ئەو هۆیانە بسەلمێنێت. بۆ نمونە رەنگە کەسێك بتوانێت بەقەناعەتەوە بڵێت، شیعەی عێراق هەڕەشەیەکی راستەقینەی لە ناوخۆیی عێراقدا دروستنەدەکرد، بەڵام کەس ناتوانێت بەگومان نەبێت لەوەی کە سەدام حسێن پێی وانەبوە شیعە مەترسی یا نەدەبونە مەترسییەکی راستەقینە لەسەر رژێمەکەی، بۆیە شەڕێکی پێشوەختی هەڵگیرساند تا پێش لەو مەترسییە بگرێت. لە کۆتایی هەفتاکاندا ئەو جۆرە ئەرگیومێنتە قابیلی باوەڕپێکردن نەبو، بەڵام داوا لە خوێنەر دەکەم گەشتی جیاواز لە قوڵایی زەینی سەدام حسێندا بکەن، بۆچی لە دوای پاکتاوکردنە گەورەکەی ١٩٧٩دا ئەو جەنگە گشتگیرەی هەڵگیرساند.

وێنای شانۆی رووداوەکانی هاوینی ١٩٨٢ بکەن، ئەو بەروارەی بۆ بەستنی کۆنگرەی وڵاتە بێلایەنەکان لە بەغدا دیاریکرابو. پرۆسەی ئەو گۆڕانەش پشتگوێ مەخە کە بەسەر شارەکەدا هاتبو، کە لە کۆتایی حەفتاکاندا بڕیاری بەستنی کۆنگرەی تێیدا درا. بەغدا، ئەو شارەی تا ئەو کاتە بەهۆی خەرجی سەربازی‌و کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵایەتی‌و گەشەسەندنی بونیادی سەرەکی‌و کۆمەڵگەی پترۆکیمیایی، فەرامۆش کرابو، لە شەوو رۆژێکدا بۆ پێگەیەکی زەبەلاحی شارستانی گۆڕا: چاککردنی رێگەوبان، پارکی ئۆتۆمۆبیل، بینای تازە، بەرنامە یا پرۆژەی هاتوچۆی



نوێ‌و نۆژەنکردنەوەی ناوچە شارستانییەکان. بەڵێندەران‌و راوێژکاران لەسەرتاسەری جیهانەوە بەرەو بەغدا بەرێکەوتن‌و یاسای تایبەت دەرچو کە بەپێی ئەو یاسایە هەمو ئەو بەربەست‌و رێگرانە لەسەر ئەو پرۆژە هەڵبژاردانە هەڵگیرا کە هێما یا ناوەرۆکێکی سیمبولیان هەڵگرتبو. بەعسییەکان پۆشاکە جیاکارە شیکەکانیان دەپۆشی‌و دەسەڵاتی خۆیان بە شێوەیەکی تازە نمایشدەکرد، بەوەش بەوپەڕی پەرگیرییەوە بەهەمان ئاراستە دەرۆیشتن کە رۆژگارێك گاڵتەیان پێدەهات، کاتێك هەوڵیاندەدا لەو شتانە دووربکەونەوە کە بە وڵاتانی کەنداوی دەبەستنەوە. وێنای سەدام حسێنی سەرکەوتو بکە کە میوانداری کۆنگرەی عەرەبی دژ بە پەیماننامەی کامدیڤێد دەکات‌و لە بەغدا جبە یا دەسماڵی (وشاح) نوێی رێبەرایەتی جیهانی سێیەم لە فیدڵ کاسترۆ (سەردەمانێك لە شانی ناسرو تیتۆ بوە) وەردەگرێت‌و نیوەی خاکی خوزستان وەك غەنیمەتی ئێرانێکی پارچەپارچەکراو دابەشدەکات‌و دەبێتە سەرداری کەنداو.

لێرەوە دەتوانرێ بەشێوەیەکی لۆجێکی ئاماژە بەو خەونە بکرێ کە بەزەینی سەدام حسێندا گوزەری دەکرد، کاتێك هەڵاوێردەکانی پارسەنگ دەکرد. ئەو خەونە دەرفەتی بۆ سەدام حسێنی بەناوبانگ رەخساند بە وریاییەوە خودبڕوایی بۆ شێتی خۆبەگەورەزان (Megalomania) وەربگێرێت. نمایشکردنی سەرکەوتوانەی هێزی بەعس کە کەم بەهایی گرنگ نەبو، بوە مایەی ئەوەی سەدام حسێن بەتایبەتی‌و حیزبی بەعس بەگشتی لە پێگەی هەرێمایەتی جەمال عەبدولناسر زیاتر برۆن، کە لە دوای قەیرانی سویس خاوەنی گەورەترین جەماوەر بو. هەڵبەتە سیحرو کێشی کەسایەتی ناسر بەپێچەوانەی سەدام حسێنەوە لە دەستکەوتەکانی ناوخۆیی میسرەوە سەرچاوەی گرتبو، ئەوەش بوە مایەی ئەوەی جەماوەری عەرەبی لە سەرجەم جیهانی عەرەبییەوە خۆبەخشانە خۆشیان بوێت، سەدام حسینی لاوی تەمەن بیست ساڵەش کە لە رووداوەکەی سوێسدا تێکەڵ بەدنیای سیاسەت بو، یەکێك بو لە جەماوەرەکانی ناسر. لەلایەکی دی، ناسر ساڵی ١٩٥٦ لەدوای دەستدرێژی سێ قۆڵییەکەی سەر میسر بەدیارکەوت، ئەویش پاشئەوەی لەنێو کەڵبەی شکستی سەربازیدا سەرکەوتنی

سیاسی بەدەستهێنا، بەڵام سەدام حسێنی لەخۆبایی هەنگاوی گەورەی بەرەو لوتکەی ڕێبەری ڕەها نا، پێشئەوەی پلان بۆ سویسە تایبەتەکەی خۆی دارێژێت. سەدام بەپێچەوانەی ناسرەوە ڕێبەرایەتییەکەی لە ڕێگەی دژایەتیکردنی زایۆنیزمو ئیمپریالیزمەوە بەدەست نەهێنابو، بەڵکو دەیویست بە پەلاماردانی ئێرانو تێکشکاندنی شۆڕشی ئیسلامی (١٩٧٩) لە دەسکەوتە گەورەکانی ناسر زیاتر بەدەست بهێنێت. بۆیە ئەگەر لەو قومارەدا براوە بێت، ڕەنگە هەمان پێگەی ساڵی ١٩٥٦ی ناسری بەدەست بهێنێت، لە پاڵ ئەوەشدا، ئەو بڕیارەی کە زوو یا درەنگ جێبەجێی دەکرد، ترسو نائارامییەکی تازەی لێدەکەوتەوە.

ماوەی نێوان ١٩٥٦ ـ ١٩٨٠ هەمان ماوەیە کە جەنگی فراوانخوازی کۆلۆنی لە دیاردە تازە داهێنراوەکەی سەدام حسێن جیادەکاتەوەو ئەم دیاردەیەش هەمان دیاردەی یەکەمین جەنگی گەورەی نیشتمانییە لە جیهانی سێیەمدا، لەبەر ئەوەی سەدامگەرایی لە سیاسەتی عێراقیدا هەمان بایەخی هەبو کە خومەینیگەرایی لە سیاسەتی ئێراندا هەیبو، ئەم دیاردەیە ڕەگوریشەی لە توندوتیژیو لە قۆرغکردنی ئامرازەکانی توندوتیژیدا هەبو بۆ ئەوەی ئامانجی سیاسی بەدی بهێنێت. سەدامیزم خوێنڕشتن نیە، هەروەکو چۆن هێندێك کەس بە هەڵە بەو جۆرە بیردەکەنەوە، چونکە سەدام حسێن لەگەڵ هەڵچونی پاپادۆك یا عیدی ئەمین جیاوازی هەیە، سەدامیزم سیاسەتە بۆ ئەوەی بە ئامانجەکانی بگات.

لە پێناوی ئەوەی باشتر لەپەیوەندی دیاردەی سەدام حسێنو هاوڵاتیانی تێبگەین، پێویستە لەسەر تاك بڕوانێتە ئەودیوی ئەنگیزە شەخسییەکانیو ڕۆچێتە نێو قوڵایی خۆگونجاندنە کۆمەڵایەتییە بەرفراوانەکانو دەسەڵاتە ئەسڵییەکانەوە کە ڕێگەی بەکەسێکی وەك سەدام دا تا دوای خەونەکانی بکەوێت. جەنگی عێراق ـ ئێران پرسیاری بەسوێ لەلای عێراقییەکان دەوروژێنێت، بۆچی سەرباری ئاوەژوبونەوەی پارسەنگی جەنگ لە ساڵی ١٩٨١ ـ ١٩٨٢دا، کەچی سەدام حسێنو ڕژێمی بەعس نەروخان؟ بۆچی سەربازە شیعەکان سەرباری زۆری ژمارەیان لە ڕژێم هەڵنەگەڕانەوە؟



بۆچی تەواوی میلەتی عێراق لەگەڵ درێژەپێدانی جەنگ بون؟ چۆن ڕژێمێك دەربارەی هێرشو پەلامارەکانی هەڵەی لەهەڵسەنگاندنەکانی کردبێتو ئەو هەمو دەردەسەریو ماڵوێرانییەی بەسەر میلەتەکیدا هێنابێت، ئەمە لەپاڵ خرابی کاریگەری شەڕ لەسەر نەوەکانی داهاتو، کەچی هێشتا لەسەر قاچی خۆی ڕاوەستاوەو لەهەمو کاتێکی دی زیاتر سەقامگیرتر دەردەکەوێت؟ تەنانەت ئەگەر سبەینێش ڕژێم بروخێت، ئەوا دیسانەوە ئەو پرسیارانە هەر دەکرێنو بایەخی تایبەتیان دەمێنێت، چونکە لێرەدا خاڵی گەڕانەوە یا خۆدزینەوە لەبەرپرسیارێتی ئەو جەنگەو کوشتنی ئەو هەمو خەڵکەدا نیە.

فوئاد عەجمی دەربارەی شکستی ساڵی ١٩٦٧ دەنوسێت: "پەیوەندی نێوان جەنگو هاوڵاتیان لە نێوجەرگەو کوانوی دەوڵەتی هاوچەرخدا خۆی دەنوێنێت". هەمیشە جەنگ مەحەکی هەمو ڕژێمێکی سیاسییەو جەنگی شەش ڕۆژەش شکستی دەوڵەتە عەرەبییەکانی لە پەروەردەکردنی هاوڵاتی هاوچەرخدا ئاشکرا کرد، هەروەها ئەو ئارەزوەشی کوشت کە خەڵکی لە پێناوی دەوڵەتدا گیانی خۆیان بەخت بکەن"[21]. گریمان ئەوجۆرە هاوڵاتیبونە هێشتا لە هیچ وڵاتێکی عەرەبیدا دەرنەکەوتوە، کەواتە بۆچی لە جەنگی عێراق ـ ئێراندا "پەیوەندی جەوهەری نێوان جەنگو هاوڵاتیبون" ئەم فۆڕمە ئەسڵیە بە خۆیەوە دەگرێ؟ خەڵکی عێراق هێشتا پۆل پۆل دەمرن بێئەوەی هۆیەکی ئاشکراو دەستەهەستیان (ملموس) بۆ ئەو مردنەیان هەبێت یا هیچ لایەنێکی دی، هۆیەك دیارناکات، بۆچی؟

خەڵکی عێراق زۆر دەمێك بو هەمو جۆرە هەستێکی بڕوا بەخودیان لەدەستدابو، تەنها خودێکی دەستکرد بونی هەبو کە لەلایەن ڕژێمەکەیەوە پێی بەخشرابو. ئەوەش لە ئاکامی سیاسەتی دەستەگەرێتیو گەشەکردنی حیزبو گشت ئەو ئاماژانە بو کە پێشتر گفتوگۆیان لەسەر کراوە[22]. داوەشانی کەسایەتی عێراقی گرنگترین ڕوونکردنەوەیە دەربارەی ئەوەی بۆچی لە عێراقی بەعسدا لە نێوان دەسکەوتە سەربازییو نێوان بەردەوامی یا پەرێزی وەلائی سیاسی، هیچ پەیوەندییەك نەبو. وەلائی سیاسی میلەتی عێراق بۆ گشت وتەکانی ڕژێم لە ساڵانی یەکەمی جەنگدا، لەسەر

ئامانجە ئاشکراکانی جەنگ یا دەستکەوتەکانی لە مەیدانی جەنگدا بونیات نەنرابو.

پێش ساڵی ١٩٧٥ بەزەحمەت کەسێکت لە عێراقدا دەدۆزییەوە بڕوای بەبوونی ململانێی سنور هەبێت لەگەڵ ئێراندا، بۆیە بەدڵنیاییەوە زۆرینەی خەڵکی عێراق لە کاتی واژوکردنی ڕێکەوتننامەی جەزائیردا سەرسام بوون لەو گۆڕانە کتوپڕەی لە ئاراستەو ڕەفتاری ڕژێمی فەرمانڕەوادا رویدا، بەڵام هیچیان پەیوەندییان بەمەسەلەی شەتولعەرەبەوە نەبو. بەهەر حاڵ ئەو سەرسامییە لە گۆڕانی دراماتیکیانەی ئەو ڕێبازە بو کە دژی ڕژێمی شا ئاراستەدەکرا، بەتایبەتی مەسەلەی هەر سێ دورگەی تەنگەی هورمز کە چەندین ساڵ بو بابەتی ململانێی نێوان عێراقو ئێران بو، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجی خەڵکی بو ئەوەبو کە حیزبی بەعس ساڵی ١٩٧٥ دەستبەرداری شتێکی زۆر گرنگ ببو، لەوەش زیاتر، مەسەلەی ئابروچون بو، ئەو ئابروچونەش لە هەمو کەس زیاتر ئازاری ئەو کەسەی دەدا کە ئەم ڕێکەوتننامەی واژوکردبو کردبو، واتە خودی سەدام حسێن.

ساڵی ١٩٨٠ لە ناکاو بارودۆخەکە گۆڕانی بەسەردا هات، بەڵام بۆ ماوەیەکی کورت بو. پەرۆشی ستەمکار بۆ جەنگ پەیوەست بو بەو ئامانجانەوە کە پێویست بو ستایش بکرێو ڕێزی لێبگیرێ. خەڵکی هەستیان بەجۆرە ستەمێك دەکرد کە پێشتر هەستیان پێی نەکردبو. ئەوەش هەروەکو دادگاییە کارتۆنییەکانی ١٩٦٩ کە سێخورەکانی تیا دادگایی کران، ساتە وێنایەك بو بۆ پێشبینی کردنی کۆمەڵایەتی گەورەتر کە هەر لە بنەرەتەوە لەگەڵ ڕژێمی بەعسدا نەشونمای دەکردو لە ئێستاشدا لە کەسایەتی سەدام حسێندا بەرجەستە دەبێتو هێدی هێدیش ئەم پێداگریو پەرۆشییە لەگەڵ بەردەوامی سەربازانی عێراق لەسەر خاکی ئێرانو گۆڕانی هەڵویستی رەسمی عێراق لەسەر جەنگ، لە هەڵبەزو دابەزدا دەبێت. ئایدیای "هێرشو پەلامارە خاچپەرستانەکەی سەدام بەردەوام بو، ئەوەش گەواهیدەری یەکێتی نێوان سەدام حسێنو میلەتەکەی بو، هەروەها نیشانەی لێکترازان یا جیابونەوەی ئامانجە ئاشکراکانو دینامیکە بزوێنەرە رەسەنەکەی بو.



ترس بریتیە لەو چەسپەی کە ئەندامەکانی ئەم جەستە سیاسییە سەیرو نامۆییەی عێراق پێکەوە دەبەستێتەوە، هەمو ئەو ڕێکخراوانەی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ژێر کۆنترۆڵی حیزبی بەعس نەبون، لەنێوبران. جەماوەر لێکترازاو پارچە پارچە بو، ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەوە روونەدەکاتەوە کە بۆچی جەماوەر باوەڕی بە هەمو شتێك دەکرد. کۆمەڵگەیەك ئەو هەمو هەراو دەنگە دەنگەی لەگەڵ سیاسەتدا هەبو، ئێستا نەك هەر گوێڕایەڵو بێدەنگو سەرکوێر کراوە، بەڵکو بوە کۆمەڵگەیەکی ناسیاسی.

ترس هۆکاری ئەو گۆڕانکارییە بو، ئەو ترسەش لەوجۆرە ترسە نەبو کە مرۆڤ لە دراوسێکەی بترسێت، بەڵکو ئەو ترسەی وا لەمرۆڤ دەکات تەنانەت سڵ لەوەش بکاتەوە لەبەردەم منداڵەکانیدا قسە بکات. ئەو ترسە بوە بەشێك لە بونیادی سایکۆلۆجی هاوڵاتیانی عێراق. ئەو ترسەی بەتەواوەتی لە کەرەستەی خاوی عێراقی دروست بوە، هەر خۆیشی لەسەردەمی هاوچەرخدا کۆڵەکەیەکی سەرەکی جەختکردنەوەی نیشتمانپەروەرێتی بو. ئەو توندوتیژییەی لە کولتوری ناخودئاگای گروپەکانی کۆمەڵگە چەپەکرابو، جارێکی دی دەرکەوتەوە، چونکە ئەمجۆرە ترسە بەقوڵی خزایە نێو هەمو بوارەکانەوە، بەتایبەتی کە لە رابردودا لە نێو خێزانو سنوری دەرەوەی گروپەکانو پێگەو چینەکاندا بوونی هەبو، ئاکامی ئەمەش ڕژێمێکی تیرۆری راستەقینە بو کە رەگوریشە قوڵەکەی لەو ترسە مەزنەوە سەرچاوەی گرتبو کە خەڵکی بەرامبەر بەیەکتری هەیانبو.

ئەو خەسڵەتانەی کۆمەڵگەی عێراقی لە سایەی حوکمی بەعسدا بۆچون یا روانینێکی قوڵ دەربارەی ئامانج لە پرۆسەی سوککردنی پێگەی مرۆڤو دوا کارەساتی مرۆیی دەخوڵقێنێت، جگە لە پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی یەکانگیر شتێکی دی نیە، چونکە کۆمەڵگەیەك پەیوەندی لە سایەی هێزی تاریکیدا بێت، ناتوانێت روناکی یا هیوا لە دڵو دەرونی ئەندامەکانیدا بچێنێت. هێزی رەمەکی زیندومانەوە، مرۆڤ ئاگادار دەکاتەوە کە تەنانەت ئەگەر لەلایەن هێزەکانی ئێرانیشەوە تەفروتونابنو بەرەو رووی مەرگ ببنەوە، دیسانەوە لەلای بەعس بەسەرکەوتن دەژمێردرێت، چونکە بەمردنیان

بۆشاییەك دروستدەکەن‌و کوشتارێکی گەورەتریش لەدوای ئەو بۆشاییەوە روودەدا.

ئەم ئامادەگییە دەروونییەی عێراقییەکان بۆ پیادەکردنی زیاتری توندوتیژی لەناوخۆی عێراقدا، لە ئایندەدا توندوتیژییەکی ئەوتۆ بەرهەم دەهێنێت کە شەڕی ناوخۆی لوبنان لــە بەرامبەریدا وەك کێشــەیەکی ناچیــزی خێزانی، کە رق‌و بوغز تێیدا باڵادەســتە، دەردەکەوێت. لێرەدا شتێك نیە لەسەر باشی بەجێهێنانی (اداء) سوپای عێراق، کاتێك پارســەنگی جەنگ لە بەرژەوەندی پیاوانی ئاینی شــیعەدا دەشــکێتەوە. ئەو دیدەی پێیوایە پانعەرەبیزمی بەعس، ناســیونالیزمی رەســەنی عێراقی پایدارو ســەقامگیرکردو سوپاو کۆمەڵگەی عێراقیشی یەکانگیر کردو لەگەڵ نشونما کردنی تایفی‌و وەفاداری بۆ خێزان‌و بوغزی رەگەزپەرستی‌و مەزهەبە ئاینییەکانی کۆمەڵگەی عێراقی بەتەواوەتی ناتەبا دەکەوێتەوەو بەعس بە تەڵقیندان‌و لە هەمان کاتیشدا سنوردارکردنیان، خەڵکی لەو بارودۆخە شڵۆقە دەپاراست‌و لەوەی کە تێیدا بوون، دوور دەخستەوە. لە بەرامبەر ئەوجــۆرە وەحشــیگەراو درندایەتییە تازەیەی جیهانی ســێیەم، ئەو جوتیارە ســاکارە میســرییەی بەجلی ســەربازی پۆشــیوەو لە جەنگی شەش رۆژەی ســاڵی ١٩٦٧دا لە نیمچە دوورگەی ســینا چەکەکەی دادەنێت‌و خۆی لە جەنگ دەدزێتەوە، دەبێ ئەو کردەوەیەی بە نمونەی فەزیلەت بزانین.

## رێبەری کردنی جەنگەکە:

حیزبی بەعس لە رێگەی خۆنمایشکردنی لە دەرەوەی سنوری تایبەتی خۆیدا لە پرۆســەیەکی نوێی پشــکنین‌و بژارکردندا کە خەســڵەتەکانی رژێمی دەخستەڕوو، جەنگی لەگەڵ ئێراندا هەڵایســاند. سەدام حسێن ستراتیجییەتی سەرەتایی سەربازی عێراقی دیاریدەکردو زۆر بەوردی‌و توندی چاودێری گەورەترین‌و بچوکترین وردەکاری دەکــرد، تەنانەت لە هێندێك حاڵەتدا فەرماندەکانی بەرەی پێشــەوەی ســەنگەریش نەیاندەتوانــی کارەکانی خۆیان روونبکەنەوە[23]. لێکۆڵیارە ســەربازییەکان لە رەفتاری



هێزە چەکدارەکانی عێراق ســەریان ســورمابو، بۆچی ســەرباری باڵادەستی تەواوی هێزی ئاســمانی بەسەر ئێراندا کەچی بەترس‌و لەرزەوە سودیان لەو هێزە وەردەگرت؟ بۆچی لەو شــوێنانەی کە پێویســت بــو هێزی پیادە بچێتە جەنگــەوە، هیچ هێزێکی دی جێگــەی نەدەگرتــەوەو خۆیان لەو کارە دەپاراســت؟ یەکێك لــە لێکۆڵەرەکان پێیوایە "هۆی ســەرەکی شکســت نەهێنانی ئێران لە سەرەتای دەسپێکردنی جەنگدا دەگەڕێتەوە بۆ نەگونجاوی ســتراتیجو تاکتیکــی عێراقییەکان، نەك بۆ پەرچەکرداری لەپڕو ترسناکی سەربازە ئێرانیەکان"[24].

سەرباری ئەوەی ئەم هەڵگۆزینە پێویستی بە سەلماندن یا رێکەوتن نیە، بەڵام هەمو ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان لەسەر کارو کردەوە جەنگییەکانی عێراق کردوە، بە کارێکی ســەیرو ســەمەرەو حیرەتئامێز لەقەڵەمی دەدەن. هێرشە سەرەتاییە سێ قۆڵییەکانی سەر ئێــران، کــە بریتی بون لە رەوانەکردنی هێزێکی گەورە بۆ هەرێمی خوزســتان‌و جوڵە پێکردنی یەکەکان لە دەوروبەری مەهران‌و داگیرکردنی قەســری شــیرین لە باکور بۆ بەرگرتــن بو لەوەی هێزەکانی ئێران بەرەو بەغدا پێشــڕەوی بکەن، ئەوەش لەڕووی ســەربازییەوە کارێکی نایاب بو. بەڵام گرفتەکە لەو بیرکردنەوەیەدا بو کە دەیویســت گوشــارێکی گەورە لەســەر خوزســتان دروســت بکات. ســوپای عێراق نەچوە ناو شــارەکانەوەو لە چواردەوری شارەکاندا مۆڵی خوارد. لەم جەنگەدا سود لە تاکتیکی جەنگی جیهانی دوەم وەردەگیرا تا ســوپای ئێران لە مۆڵخواردن دەربهێنێت‌و پەرش‌و بڵاویکاتەوە. عێراقییەکان شــارەکانیان گەمارۆدا، چونکە لەو باوەڕەدابوون شارەکان لە ئاکامی تۆپباران‌و بۆمبارانی ئاســمانی خۆیان بەدەســتەوە دەدەن، تەنانەت لەســەر ئاستی تاکتیکیش چەکە قورسەکان کە عێراق تێیدا باڵادەست بو، لەلایەن ئەو هێزەی کــە بۆ لێکترازاندنی ســەنگەرەکانی بەرگری یا گەمارۆدانی هێڵــی بەرگری دانرابو، ســودیان لێوەرنەگیرا. تانکە پێشکەوتوەکان نەك هەروەکو تۆپ بەکاردەهێنرا، بەڵکو هێندێك جار بەمەبەســتی چەواشەکاری یا پاراستن لە نێو لمدا دەشاردرایەوە، بەهەر حاڵ حیزبی بەعس باڵادەســتی چەکداری بە شــێوازێکی ناکارا بەکاردەهێنا تا خۆی

لەشەڕی راستەوخۆی پیادە بپارێزێت[25].

ئەو وەڵامە گشتییەی بۆ روونکردنەوەی ستراتیجیەتی عێراق دەربارەی گەمارۆدانو داگیرکردنی شارەکانو شێوازی نائاساییان لە بڵاوکردنەوەی چەکە قورسەکان دەدرایەوە، ئەوە بو تا کەمترین زیانی مرۆییان لێبکەوێت، چونکە دانیشتوانی عێراق سێیەکی دانشتوانی ئێران دەبێت. لە یەکەمین سەرکەوتنی تاکتیکیدا کە داگیرکردنی خورەمشەهر بو " زۆری زیانەکانی عێراق وای لە فەرماندەیی سەربازی عێراق کرد لەجیاتی داگیرکردنی ئەبادان، گەمارۆی شارەکە بداتو خۆی لەشەڕی جادەو کۆڵان بە کۆڵان بە دوور بگرێت"[26]. بەڵام شاری ئەبادان خۆی راگرتو دوای ساڵێك بوە خاڵی دەسپێکی زنجیرەیەك دژە هێرشی ئێرانیو عێراقی ناچارکرد چەندین پاشەکشێ یەك لەدوای یەك بکات. ئیدی جەنگی بروسکەئاسا کە مەزندە دەکرا لە ماوەی حەوت تا چواردە رۆژ کۆتایی بێت، بە جەنگێکی ناکۆتای ماڵ وێرانکار گۆڕا.

"سەنگەرەکانی بەرەی ئێران لە یەك کاتدا لێوان لێو بو لە پشێویو قوربانیدان. مەلای مێزەربەسەر بەسواری ماتۆڕسکیلە ئاڵووالەکانیانو تفەنگەکانی سەرشانیان لەبەرەکانی پێشەوەی جەنگ سەربازەکانیان هاندەدا، هەروەها دروشمی ئاینی لە هەمو شوێنێکدا بەدیدەکرا. هێندێك جار هێزە کفنپۆشە ئێرانییەکان بەوپەڕی شادیو لێو بەخندەوە، بەمەبەستی شەهیدبون بەرەو بەرەکانی پێشەوەی جەنگ دەرۆیشتن. زۆر بەکەمی نیشانەکانی شەڕ لە پشت بەرەکانی جەنگدا بەدیدەکرا. بەپێچەوانەشەوە، ناوچە جەنگییەکانی عێراق لە پشت بەرەکانی جەنگ بەدرێژایی دەیان میل لە سەنگەری بەرگری تۆکمە تەنرابو، ئەمە سەرباری تانکو تۆپی داپۆشراو لە هەر دوولایی جادەکانەوە سەنگەریان بۆ لێدرابو، هەروەکو لە جەنگی جیهانی یەکەمدا پیادە دەکرا، ئەمە لە پاڵ ئەوەی شۆفلەکان دەیان خەنەکی قوڵو درێژیان لێدابو"[27].

بەتەنها بیرکردنەوە لەوەی کە سەدام حسێن لەکاتی جەنگدا زۆر گرنگی داوە تا خۆی لە زیانی مرۆیی بپارێزێت، بیرکردنەوەیەکی ساوێلکانەیە، کەواتە چی رژێمێك



والێدەکات کە تا ئەو ئاستە دڵسۆزیو وەفاداری میلەتەکەی بەدەست هێنابێت، کەچی بەشێوازی جۆراوجۆر خۆی لە روبەروبونەوەی دوژمن دەپارێزێت ـ بۆمبارانی سەربازانو خەڵکی مەدەنی بێئەوەی هیچ شتێك رەچاو بکرێ، تۆپبارانکردن بە تۆپی قورس، بەکارهێنانی گازی ژەهراوی، دروستکردنی ساتەری خۆڵ بۆ بەرگریکردن، دەریاچەی دەستکردو هێڵی بەرگری بەدرێژایی چەندین میل بۆ کاتی شکانو پاشەکشێ؟ [28].

وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەش شتێکی قورس نیە، ئەگەر مرۆڤ بیەوێت مەسەلەکە بەرێگەی سیاسی نەك بەشەڕ چارەسەر بکات. ئەگەر ترس، نەك نیشتمانپەروەرێتی یا بەعسیزم وەك بیروباوەڕ کە خەڵکی بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە بڕوای پێهێنابێت، ئەو رایەڵە بێت کە پەیکەری سیاسی عێراقیو سوپا پێکەوە گرێبدات، ئیدی کاتێك ئەو رایەڵەیە دەپسێت یا شل دەبێتەوە، کۆمەڵگەش درزی تێدەکەوێت. جەنگ حاڵەتێکی بێوێنە دەخوڵقێنێت، وەك سەرهەڵدانی ترسێکی ئەوتۆ کە گەورەتر بێت لە دوژمن، ئەو جۆرە حاڵەتانەش ترسێکی کتوپڕ لەو دڵسۆزیو وەفادارییە دەروژێنێت کە زۆر لە نسکۆیی ناوچەیی گەورەترە. ئەگەر سەربازانی عێراقی لەو دوژمنەی بەرامبەری وەستاوە زیاتر بترسن تا ئەو رژێمەی لە پشتەوەیان وەستاوە، ئیدی کارێك دەکەن کە هەر مرۆڤێکی بەهزر دەیکات، واتە یا چەکەکانیان دادەنێنو خۆیان رادەستی دوژمنەکەیان دەکەن یا رادەکەن. لە هەمو پاشەکشێ گەورەکانی عێراق بەرامبەر بەئێران هەمان شت روویداوە. ئەمەش ئەو هۆیانە روونەدەکاتەوە کە بۆچی ژمارەی یەخسیرەکانی عێراق سێ بەرامبەر بەژمارەی یەخسیرەکانی ئێرانە، بەدەر لە جیاوازی پلانی جەنگی هەر یەکێك لە دوو لایەنە شەڕکەرەکە (واتە زرێپۆشی عێراقی بەرامبەر هێزی مرۆیی ئێرانی).

ترس، نەک میتۆدی سۆڤێتی، رەفتاری سەرسەختانەی ناسروشتیو ترسنۆکانەی فەرماندە سەربازییەکانی عێراق لەمەیدانی جەنگدا روونەدەکاتەوە. بەتەنها ئاستی بیرۆکراسی یا باڵادەستی دەوڵەت لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی، پەیوەندی بە بەجێهێنانی

(أداء) سەربازییەوە نیە، ئەڵمانیاش لە هەر دوو جەنگی جیهانیدا هەمان بارودۆخی هەبو، بۆیە شکستی خوارد، بەڵام لەبەر ئەوەی بریتانیا پێڕەوی لە سیستمی دیموکراسی دەکرد، تۆکمەترین هێڵی بەرگری هەبو. سەدام حسێن لە هەمو کەس باشتر دەیزانی چ شتێك دەوڵەتەکەی راگرتوە، هەر چەندە دەشێت لەسەر توانای شۆڕشی ئیسلامی ئێران هەڵسەنگاندنی نادروستی کردبێت.

مرۆڤ پێویستی بە تێڕوانینێکی قوڵی سیاسی هەیە، نەك مەسەلەی جەنگی بۆ ئەوەی لەوە تێبگات کە بەعسیەکان لە کاتی هەڵایسانی جەنگدا بیریان لە چی دەکردەوە. بۆیە هەروەکو دەردەکەوێت عێراق هیچ تاکتیکێکی سەربازی پێشوەختی نەبو، لەگەڵ چەمکی بەرفراوانی سەربازی هەڵایسانی ئەو جەنگەدا گونجاو بێت. بەدڵنیاییەوە چاودێران هاوڕابون لەسەر ئەوەی کاتێك ئەو پلانەی جەنگی پێهەڵسا شکست بیهێنێت، هیچ پلانێکی ئەڵتەرناتیڤی دی نیە، هەروەکو دواتر شکستەکەی بەدیارکەوت. بێگومان سەدام حسێن پێیوابو ئەوەندەی زرێپۆشە عێراقییەکان بچنە ناو خاکی ئێرانەوە، ئیدی رژێمی خومەینی سەرنگوم دەبێ یا لە خراپترین حاڵەتدا ئێران ناچار دەبێت مەرجە ریسواکارەکانی قبوڵ بکات، بۆیە کاتێك ئەوە روویندەداو ئێران نەروخاو شوێن پێی خۆی قایم کرد، هەمو پلانو ستراتیجییەکانی سەدام بەتەواوەتی داروخان[29].

ئەمشێوازە بیرکردنەوە ئایدیۆلۆجییە دەربارەی مەسەلە سەربازییەکان، بەتەنها تایبەت نەبو بەئۆپراسیۆنە زەمینەکان، بۆ نمونە بەعس لەرۆژانی یەکەمی هەڵگیرسانی شەڕدا بڕیاریدا هێرشو پەلاماری کەرتی نەوت، بەبۆریو پاڵاوگەکانیشەوە نەدات، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت بەلەمە جەنگییەکانی ئێران ویستگەکانی هەناردەکردنی بەندەری فاوی عێراقیان ئاگرباران کرد کە بەتازەترین سیستمی کۆمپیوتەر بەرنامەرێژ کرابو، هەروەها هێزی ئاسمانی ئێران بیرە نەوتییەکانی دەوروبەری کەرکوكو موسڵیان بۆمباران کردو هەناردەکردنی نەوتی عێراق بەشێوەیەکی کاتی راگیراو تا ساڵی ١٩٨٧ عێراق نەیتوانی بۆ ئاستی پێش هەڵایسانی جەنگ بگەڕێتەوە. بەدرێژایی جەنگ هەمو



ئەو دەروازانەی دەیڕوانی بەسەر کەنداودا لەکار وەستابون. کاتێك بەرهەمهێنانو هەناردەکردنی نەوتی عێراق دادەبەزی، بەرهەمهێنانی پەترۆڵی ئێران بەرەو زیادبون دەرۆیشت، ئەمە لەکاتێکدا بەرهەمهێنانی نەوتی ئێران لەسەرەتای جەنگدا بۆ نزمترین ئاستی دابەزیبو. سەرباری وێرانکردنی پاڵاوگە ئێرانییەکانو هێندێك دەزگای ئابوری دی، بەڵام عێراق نەیتوانی رێگە لەگەیشتنی نەوت بۆ سەرچاوە ئاوییەکان بگرێت، هەروەکو لەسێ رۆژی یەکەمی جەنگدا روویدا. بەعسییەکان بیریان لەوە نەکردبوە گەر جەنگ هەمو دەزگا ئابورییەکان بگرێتەوە چی دەکەن، چونکە ئەوان پێیانوابو ئێران پەلاماری دەزگا ئابورییەکان نادات، ئەمەش هەڵەیەکی دی هەڵسەنگاندنیان بو.

رەنگە سەیرترین بڕیاری جەنگ بە بەکارهێنانی هێزی ئاسمانی عێراقەوە پەیوەست بێت. پێش ٢٢ی ئەیلول هەمو هێزی ئاسمانی عێراق لە وڵاتانی دورگەی عەرەبی، جگە لە یەمەنی باشور بڵاوببونەوە[30]. وادیاربو عێراقییەکان هێشتا حیسابیان بۆ هێزی ئاسمانی ئێران دەکردو بەهەند وەریاندەگرت. بەعسییەکان دەیانویست جەنگی بروسکەئاسا پیادە بکەنو دەیانویست دڵنیابن لەوەی کە جارێکی دی نابنە نێچیرێکی دەستەمۆو وەك هێزەکانی میسرو سوریا لە خەودا غافڵگیر نابن، چونکە ئەوەی ساڵی ١٩٦٧ لە جەنگی عەرەب ـ ئیسرائیل روویدا، وەسف ناکرێ.

کاتێك هێزی ئاسمانیان بەکارهێنا، لێکۆڵیارانی سەربازی بۆ تێگەیشتن لەوەی کە عێراقییەکان ئەنجامیان دابو، چەندین لاپەرەیان رەش کردەوە، تا بەو ئاکامە گەیشتن کە باڵادەستی عێراقییەکان بەسەر ئاسمانی جەنگدا رێگر بوە لەوەی ئێرانییەکان پەلاماری پێگە سەربازییەکانی عێراق بدەن[31]. کاتێك هێزی ئاسمانی پشتیوانی لە ئۆپراسیۆنە زەمینییەکان نەدەکرد، هەروەکو لەدوای جەنگی جیهانی دوەمەوە پێڕەوی لێدەکرا، ئەوە روونـدەبوەوە کە هەر دوو لایەنی شەڕکەر چەند لە هێزی ئاسمانی یەکتری دەترسن، چونکە هەر یەکێکیان پێیوابو ئەوی دی لە بواری ئاسمانیدا لە خۆی بەهێزترو بەتواناترە، بەڵام رەنگە روونکردنەوەی ساناتر هەبێت، ئەویش هێزی بەرێڤانی ئاسمانی عێراق، لە جیاتی ئەوەی فڕۆکەکانی دوژمن بخەنە خوارەوە، لە

فرۆکەکانی خۆیانیان دەدا (32).

بەکارهێنانــی فرۆکە جەنگییەکانی عێراق بە شـێوەیەکی ســەرەکی لەدژی ئێرانییە سـڤیلەکانو ئامانجــە ئابورییەکان لێکچونی ئــەم جەنگە بێوێنەیــە لەگەڵ جەنگی جیهانی یەکەمدا لێکنزیك دەکاتەوە. ئەمەش کاتێك روونتربوەوە کە شـەپۆلی مرۆیی ئێرانییەکان لە ســاڵی ١٩٨٢و شـوباتو مارسـی ١٩٨٤دا هەڵمەتیان بۆ ســەر بەسرە برد. هێرشـە ســەرەتاییەکانی عێراق بۆ ســەر ئێرانو رێکخسـتنی هێڵەکانی بەرگری عێراق لە قۆناغەکانی دواتردا، لەو مەســەلانەن کە ئەم لێکچونە زیاتر دەکات. بەڵام جیـاوازی ئەم جەنگە لەگەڵ جەنگی جیهانی یەکەمدا لەوەدایە کە جەنگی جیهانی یەکەم لە رێگەی پلانی جەنگیو ئامێرە جەنگییەکانەوە دیاریدەکرا (تۆپخانەو رەشاشە جێگرەکان کە رێگەیان لە پێشڕەوی هێزی پیادە دەگرت، بەڵام زرێپۆشو هێزی ئاگر توانای جوڵەیان نەبو)، کەچی لە جەنگی عێراق ـ ئێراندا سەربازەکان دەستەویەخەی شەڕێك بون کە هاوسەنگی لەگەڵ ئامرازەکانی جەنگدا نەبو، هەروەها بەتەواوەتیش جیاواز بو لەگەڵ ئەو مەشقەی پێیانکرابو.

ئــەم کێشــەیە چەندیــن رەهەنــدی هەیــە. ناکاراییو تێنەگەیشــتن لە شـێوازی بەکارهێنانی ئامێرە جەنگییە پێشکەوتوەکان، لەسەر ئاستی سەربازی ئاساییو فەرمانده بچوکەکانــدا فاکتەرێکی گرنگ بو، بەڵام بەتەنها تێنەگەیشــتنو لێنەهاتویی لاوازیو خراپی روونناکەنەوەو بەدڵنیاییشەوە دەربارەی رەفتاری فەرماندە پایە بەرزەکان هیچمان پێناڵێنو ئاسـتی ســتراتیجی بڕیار وەرگرتنیش دیارێناکات. لێرەدا جۆرێك لە نابینایی بــەردەوام لەکارکردنــدا هەبو کە ناکرێ بەتەنها بۆ نەزانین یــا لێنەهاتوییو گەلحۆیی بگێڕدرێتەوە. لە شەش ساڵی یەکەمی جەنگدا هیچ یەکێك لەو دوو دەوڵەتە شەڕکەرە نەیدەتوانی هەڵســەنگاندنێکی دروســت لەســەر خاڵە لاوازو بەهێزەکانی نەیارەکەی بــکات، یــا لە هەڵەکانی خۆی یــا هەڵەی ئەوانی دی، یا لە هێــزی ئەم یا ئەو پەند وەربگرێت. ئەمەش لەسەرەتای جەنگدا گرنگترین خەسڵەتی بیرکردنەوەی سەربازیی عێراقی بو، پاشان ئەمە بوە بەشێك لە خەسڵەتی بە بەرنامەی سەربازی ئێران (وشەی



بەرنامەرێژی بۆ وەســفکردنی فیکری ســەربازیی ئێرانی بەکاردەهێنرێ)، لەڕاستیدا لە شەش ساڵی یەکەمی جەنگدا ئەمە تاکە شێوازی نەگۆڕ بو.

کاتێك ســتراتیجییەتی جەنگی لەلایەن هەر دوو لایەنە شەڕکەرەکەوە بەدینەکرێ، جەنــگ بەجۆرێك بەگەمەیەکــی تاقەت پڕۆکێن دەگۆڕێت، کــە تێیدا ژیانی مرۆڤ بە نرخێکی ناچیز هەراج دەکرێ، ئیدی لێرەوە لێکچونی نێوان ئەم شــەڕەو جەنگی جیهانی یەکەم بەدی دەکەین.

لە هەمو بوارەکانی جەنگدا بڕیاری نادروســتو هەڵسەنگاندنی هەڵە یا زێدەڕەوی لــە تواناکانی مرۆڤدا بەدیدەکــرێ، هەروەها کەمتەرخەمیو گەلحۆیی بێوێنە لەوجۆرە کارانــەدا بەشــێوەیەکی ئاســایی روودەدەن، تەنانــەت بایەخنەدان بــە ژیانی خودی ســەربازان کەم تا زۆر بەدیدەکرێ، بەڵام سســتیو لاوازی بــەردەوام لە توانای هەر دوولا، هێندێ جاریش بێئارەزویی، بەتایبەتی لەلایەن ئێرانەوە بۆ ئەوەی بەشـێوازێکی واقعیانە کۆنترۆڵی ئەوی دی بکاتو نەبونی پلانی ســتراتیجی ژیرانە بۆ بەدواداچونی ئامانجەکانی جەنگ بۆ خستنی نەیارەکەیو بەتەواوەتی لەناوبردنی، تەنها لە جەنگی عێراق ـ ئێراندا وێنەی دەبینرێ.

دوای ســێ هەفتە لە هەڵایســانی جەنگو پێشــئەوەی هێزی یەدەکی بانگهێشت بکرێ، ســەدام حســێن دانی بەوەدا نا کە بەشــێوەیەکی جیاواز وێنای ئەم جەنگەی کــردوە، بەڵام لەجیاتــی ئەوەی بــڕیارێکــی روونو دروســت وەربگرێتو ئامانجی جەنگەکەی هەموار بکات، بڕیاریدا جەنگ بۆ ناوچە مەدەنینشینەکان بگوێزێتەوە(33).

لەدوای بۆمبارانی ئاســمانی، رۆکێتبارانیش دەستی پێکردو یەکەمین رۆکێتی زەمین بە زەمیــن بە دیزەفولــەوە نرا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە نەیارەکەی عێراق بەئاســانی سەرنگوم ناکرێ.

"رۆکێتەکان ســێ ناوچەی شــاری دیزەفولیان بەســەدان خانوو دوکانەوە کاولو وێــران کردو تەنهــا داروپەردویان لێمایەوە. تۆپخانەی عێراقییــەکان لەدوای هەڵدانی رۆکێتەکانەوە کاراتر بونو شــەوانەش لە جیاتی بنکەی ئاســمانی، ناوشاریان تۆپباران

دەکرد"[34].

رۆکێتباران کردنی دیزەفول لەدوای شکست یا گۆڕانی نەخشە یا پاشەکشێ رویندا، بەڵکو بەهۆی بارگرژی لەسەر ئاستی سەرکردایەتیو لە حاڵەتی پێشڕەوی هێزەکاندا رویدا، ئەگەر چی هێزەکان زۆر بەسستیو بێ هیچ ئامانجێکی دیاریکراو پێشڕەوییان دەکرد. ئەو نائومێدییەی زۆرێك لە دوانبێژەکان (معلق) بە هەڵە قسەیان لەسەر دەکرد، بەوەی عێراقی ناچار کردوە گازی خەردەلو دەمار بەکاربهێنێت، لەو قۆناغەدا بەتەواوەتی پێوار بو. سەدام حسێن نغرۆی چالاکی جەنگ ببو[35]. شتێکی بەڵگەنەویست بو کە بۆمبارانی شارەکانو وێرانکردنی دیزەفول، لەڕووی سەربازییەوە ئاکامێکی پێچەوانەی هێنایەگۆڕێ، ئەویش ئێرانییەکانی هاندا سەربازێکی بێشومار رەوانەی بەرەکانی جەنگ بکەن[36]. بانگەوازی خومەینی بۆ پێکهێنانی سوپایەکی بیست ملیۆنی، ئەو بانگەوازەی پێش هێرشو داگیرکردن وەك درۆیەك تەماشای دەکرا، لە ئێستادا بۆ سەربازگیری، بوە بە خەونێکی پێغەمبەرانە.

هەڵایسانی جەنگێکی وێرانکاری لەوجۆرە کە هیچ ئومێدێك بە سەرکەوتنی نەبو، دوو جۆر شێتیتی پێویستە: یەکەمیان دەست پێکردنی جەنگ بو، دوەمیان درێژەپێدانی جەنگ بو. لە ئێستادا من سەروکارم لەگەڵ یەکەمیاندا هەیە، ئەو جەنگەی لایەکیان عەقڵ لە دەستدەدا زۆر جیاوازترە لەو جەنگەی کە هەر دوو لای شەڕکەر عەقڵ لەدەست دەدەن، جیاوازییەکەش لە ژمارەی بەرکەوتوەکانو ئاکامو سروشتی جەنگەکەو ئەو هەڵوێستە ئەخلاقییەیە کە خەڵکی لە دژی ئەو شەڕە یا لە پشتگیری لێکردنی هەستی پێدەکەن، ئەمە سەرباری ئەوەی کاریگەری لەسەر حوکمی ئەو کەسانەی مردن دروستدەکەنو ئەوەی هانی بەردەوام بونیشیان دەدا، بەجێدەهێڵێت. کاتێك تەنها لایەنێك ستراتیجی ناعەقڵانە پیادە دەکات، ئیدی ئاراستەی ورە بەردانو نائارامیو تەنانەت یاخی بونیش زیاد دەکات، بەڵام بەتەنها دڵنیابون بەوەی هەر دوولا دەخوازن بەو ئاراستەیە برۆنو هیچ ئامانجێکی دەستەهەستیش (ملموس) لەو جەنگەدا لە ئارادا نەبێ، ئیدی ورەی سەربازییو دەربەستبون بەئایدیۆلۆجیای تایبەت



بەلایەنەکەی خۆیان زیاد دەکات. لە سەرەتای هەڵگیرسانی جەنگدا سوپای عێراق ورەی بەرز بو، بەڵام لەگەڵ داروخانی پلانو بەرزبونەوەی بەرگری ئێران، هێدی هێدی ئەو ورەیەش دادەبەزی. کاتێك ستراتیجییەتی شەپۆلی مرۆیی کارایی خۆی لە دەستداو ناوەرۆکی ئایدیۆلۆجیا بوونی ئاشکرا بو، دیسانەوە ورەی سوپای عێراقیش بەرزبوەوە. ئەو لێکۆڵیارانەی فاکتەری بەرزبونەوەی ورەی عێراقییەکان بۆ رۆحییەتی ناسیونالیستیان دەگێڕنەوە، لە ماهییەتی شێتانەی ئەو جەنگە تێنەگەیشتبون.

کاتێك ئێرانیەکان بێ حیسابکردن بۆ سەرکردە ئاینییەکان بەرگرییان لە نیشتمانو شارەکانیان دەکرد، زۆر بێزەبیانە دژی دوژمنێك دەجەنگان کە زۆر لە خۆیان بەتواناترو پڕچەکتر بو. هیچ شتێك ئەوەندەی بەرگری گیانبازانەی ئێرانییەکان لە خورەمشەهرو ئەبادان، سوپای عێراقی نەلەرزاند. شێوازی ئەو نەبەردە بەرگریکارانەیە لە شەڕی پارتیزانی دەچو، لەگەڵ بوونی قەناسەو دەستەی پەرشوبڵاو، بەرگرییەکی قورسیان لە بەرامبەر زرێپۆشو پێشڕەوی هێزی پیادەی دوژمن دەکرد. سروشتی ئەو جەنگە بەجۆرێك بو کە ژیانی پڕ بەها دەکردو تاکتیکەکانیش لەسەر هەمان تەوەرە شکڵیان دەگرت، بەڵام لەگەڵ بە هێزبوونی پێگەی ئێرانو رۆحانییەتی حوکمڕان، چەمکی سەربازیش بە شێوەیەکی بەرچاو گۆڕانی بەسەردا هات. بۆیە کاتێك رۆحانییەت ویستی جەنگ بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی پێشانی بدات موسڵمانی باش کێیە، دۆڕاندنو بردنەوەش بەتەواوەتی مانای جیاوازییان وەرگرت.

لە "بوستان" هێرشی شەپۆلی مرۆییانەی ئێران شکستێکی گەورەی بە عێراق هێناوو زۆریشیان لێ بەدیل گرتن. پروپاگەندەکان باس لەوە دەکەن کە ئەفسەرو سەربازە عێراقییەکان لە بەرامبەر هێرشی شەپۆلی مرۆیی هیچ پەرچەکردارێکیان نیشان نەداو نەیانتوانی درووێنەی ئەو خەڵکانە بکەن کە زۆر بەخێراییو بەهۆراکێشانەوە روبەرویان دەهاتن، حەقیقەتی ئەو حەکایەتە هەر چۆنێك بێت، دەبێ دان بەوەدا بنرێت کە خەڵکانێك هەن ئامادەیی گیانی خۆبەکوشتنیان تێیدایە، تەنانەت لە بەرامبەر مۆدێرنترین چەکدا دەتوانن پێشڕەوی بکەنو پێگەی سەربازی داگیر بکەن. لێرەدا

مەسەلەکە، مەسەلەیەکی بیرکاری پراکتیکییە: هاوکێشەیەکە لە ژمارەی مرۆڤەکان پێکهاتوە، ئەو خێراییەی پێی دەرۆن، ئەو ماوەیەی پێویستە یەك لایەنە بیبڕن، بە بەراورد لەگەڵ هێزی ئاگرباران‌و تێکرای خۆبەدەستەوەدانی لایەنی دووەم. ئێرانییەکان لەناوچەی بەسرە ئەم پلانەیان بەکارهێناوو لە هاوینی ١٩٨٢دا لە دوو پەلاماری جیاوازدا نزیکەی ١٠٠ هەزار کەسیان لێکوژرا[37]و نەیانتوانی دەست بەسەر بەسرەدا بگرن‌و رێگەی بەغدا ـ بەسرە ببڕن. بەتێپەربونی کات دەرامەتی هەناردەکردنی نەوت زیادیکردو زنجیرەیەك سەرکەوتن ورەی ئێرانییەکانی بەرزکردەوەو بەتاقیکردنەوەی هێندێك پێگەی بەهێزی عێراقی، جارێکی دی ئێرانییەکان پەلامارەکانیان دەست پێکردەوە. لە شوبات‌و ئازاری ساڵی ١٩٨٤دا نزیکەی نیو ملیۆن ئێرانی بۆ "دوا هێرش" ئامادەکران. لە روداوە سەرەتاییەکاندا (هەرگیز هێرشی سەرتاپاگیر دەستی پێنەکرد) بەعسیەکان گازی خەردەل‌و دەماریان ــ ئەو گازانەی کە عێراق خۆی دروستی دەکرد ـ دژی هێزەکانی ئێران بەکارهێناو زۆرێك لە سەربازانی ئێرانی، بە هەرزەکارە ساویلکە بێئەزمونەکانیشەوە بەرکەوتن. ئەو رۆژنامەنوسانەی بۆ یەکەمجار رێگەیان پێدرا سەردانی بەرەکانی جەنگ بکەن، روداوەکانیان بە زمانێك وەسفکردوە کە بەدەگمەن لە رۆژنامەی هاوچەرخدا وێنەی دەبینرێ. ئەو دیمەنانەی رۆژنامەنوسەکان لە دەوروبەری قورنە یا نەبەردی قزیل بینیبویان بە "فەرشی لاشەکان"، "دۆزەخی سەر زەوی" وەسفیان کردوە. سەربازە ئێرانیەکان‌و سوپای پاسداران‌و لاوە خۆبەخشەکان، ئەوانەی مەلاکان ورەیان بەرزکردبوەوە، نائومێدانە هەوڵیاندەدا هێڵەکانی بەرگری عێراق ببڕن:

"عێراقییەکان بە تۆپی قورس ئێرانییەکانیان وەك دروێنەی گەنم دەدورییەوە... دواجاریش زرێپۆشە عێراقییەکان بەرەو شوێنە مینرێژکراوەکانیان بردن‌و لەویشدا هەموویانیان تەفروتونا کردن...

سەربازێکی عێراقی کە شادی‌و کامەرانی لە روخسارە ماندوەکەی دەباری، دەڵێت: "ئێرانییەکانمان وەك مێروو قەلاچۆ کرد". ئەم چاوپێکەوتنە لە سەنگەرێکی



پێشەوەی بەرەکانی جەنگ‌و لە کاتێکدا بو کە سێ لاشەی سەربازی ئێرانی بە تۆزو خۆڵەوە بۆ دوو رۆژ دەچو، لەلای پای سەربازەکەوە کەوتبون، بێئەوەی کەسێك بیاننێژێت. هەروەها لاشەی سەربازە عێراقییەکانیش لەو قرچەی گەرمایەدا لە مەیدانی جەنگدا کەوتبون‌و چوار پەلیان لە ترس‌و ئێشوئازاری مردندا رەپ ببون، ئەمجۆرە بێبایەخییە بەرامبەر بەمردن، کارێك بو جێگەی بڕوا پێکردن نەبو"[38].

پەیامنێرە رۆژئاواییەکان چەند رۆژێك دوای تەواوبونی شەڕەکە گەیشتبون‌و لە بەرەکانی پێشەوەی جەنگیشدا قسەیان لەگەڵ پزیشکێکدا کردبو، کە دواتر بەهاورێیەتی بەرکەوتوانی چەکی کیمیایی رەوانەی ئەوروپا کرا، کاتێك پزیشکەکە قسەی لەسەر روداوەکانی کیمیاباران دەکرد لە ناخەوە توشی شۆك ببو: لاشەکان لە مەیدانی شەڕدا بەجێهێڵرابون، یەخسیرەکان لە شوێنی خۆیاندا گولەباران دەکران، بریندارەکانیان بەجێدەهێشت بۆ ئەوەی ببنە خۆراکی داڵ‌و بازەکان. هیچ دیاردەیەکی بەزەیی‌و میهرەبانی نەمابو، هەروەها پزیشکەکە دەڵێت، بەچاوی خۆم مێردمناڵم دەبینی بەزیندویتی دەسوتێنران‌و لاوانی عێراقی‌و ئێرانیم دەبینی کە بەدان‌و نینۆك بەرببونە گیانی یەکتری، توڕەیی‌و نەفرەتی دڕندانە روبەروی توڕەیی‌و نەفرەتی دڕندانە دەبویەوە"[39].

## لە جیاتی کۆتایی:

گەر بڵێین بەعسی‌و سەرکردە ئاینیەکانی ئێران مۆڵەتیان لە عەقڵی خۆیان وەرگرتبو،و بەشێوازێکی ناعەقڵانی رەفتاریان دەکرد، کاتێك لە مەیدانی جەنگدا پەیڕەویان لە ئامانجەکانیان دەکرد، بەتایبەتی ئامانجە شەخسییەکان، لەوە دەچێت گریمانەی شتێکی بەڵگەنەویست بکەین: هێندێك هەست‌و ئیدارکی هاوبەش لەلایەن هەر دوو لایەنی شەڕکەرەوە هەیە، لەمەشدا مەبەستمان حیکمەت‌و عەقڵ‌و شارەزایی سەربازی‌و تێگەیشتنی قوڵی تیورەیی‌و بەدڵنیاییشەوە مەبەستمان سۆزو

بەزەیی نیە، بەڵکو تەنها تێگەیشتنێکی گشتی مامناوەندییە. ئەم عەقڵو ئیدراکە بەهرەیەکی دەرونی عەقڵی تاك نیە کە پەیوەندی بە چەمکی تیوریو هەڵسەنگاندنی ئاکامەکانییەوە هەبێت، بەڵکو هەروەکو هانا ئارێنت دەڵێت: "زنجیرە بڕیارو تیورەی پێشوەختی ئێمەی مرۆڤە لەو جیهانەی کە هەمومان بەشداری تێیدا دەکەینو راستییەکانیش لەسەر ئەو جیهانە ئەندازەگیری دەکەین. ئەوەش هەستێکی قوڵی سیاسیە کە پەیوەندی بەرەفتارو کاروباری مرۆڤەوە هەیە".

هەر یەك لە سەدام حسێنو خومەینی تێگەیشتنێکی قوڵو بەرزیان هەیە کاتێك رەفتار لەگەڵ کاروباری ئەو جیهانە دەکەن کە خۆیان دروستیان کردوە، هەروەها توانای هەڵسەنگاندنی رەگەزی مرۆییان بە شێوازێك لە حیساباتدا وردو ژیرانە بو کە جیهانو خاوەن رایەکانی سەرسام دەکردو دوو پرسیاری گرنگیشی دەوروژاند: بۆچی رژێمەکەی سەدام حسێن نەروخا، کاتێك لە وتەکەی خۆی پاشگەزبووەوەو سەربازە شیعەکان لە ناویان نەبرد، ئەمە سەرباری ئەو پەرچەکردارە توندوتیژەی لە سەرەتای جەنگدا بەدیارکەوت؟ بۆچی خومەینی لە سەرکەوتنەکانیدا بەردەوام بو، ئەمە لە کاتێکدا زیانەکانی زۆر بێمانـاو بێوێنە بو؟ بەهەمان ئەندازەش کاتێك مامەڵە لەگەڵ یەکتریدا دەکەن، یا روبەروی هێزێکی بیانی دەبنەوە، ئەو هێزو توانایەی هەیانە بەخاڵێکی زۆر لاواز دەگۆڕێت. نەبونی عەقڵێکی دروست لە سادەترین فۆرمیدا لە عێراقی بەعسو ئێرانی ئیسلامیدا رەنگدانەوەیەکی دروستی عەقڵی ئەو کەسانە نیە کە ئەو دوو جیهانەیان دروستکردوە، یا عەقڵانیەتی ئەو گوناهبارانەی کەوتونەتە ژێر دەسەڵاتیانەوە، بەڵکو ئاکامی ژینگەیەکی ناواقیعبینانەیە کە لەسەر ئامانجی درۆزنانە دامەزراوەو تێیدا کۆتایی بە ژیانیان هاتوە، لە پێناوی ئەوەشدا بە خەرمانەیەك لە پیرۆزیی ساختە دەورەدراون.

ئەمجۆرە ئامانجانە هەمیشە لە دڵو دەرونی بەعسیەکاندا ئامادەگی هەبوە، ئیدی چ وەك بزوتنەوە یا کاتێك لە دەسەڵاتدا بون. بەگشتی فروفێڵەکانیان لە خەڵکی دەشاردرایەوە، بۆیە زەحمەت بو دەرك بە خەونو خەیاڵەکانی بەعس بکرێ، بەڵام



کاتێك بەعس دەسەڵاتی گرتەدەستو لەرێگەی رێکخستنی سەرلەبەری کۆمەڵگەوە جەختی لە دەسەڵاتی دەکردەوە، ئیدی ئەو خەیاڵە شاراوەییەی بزوتنەوە لە رێبەرایەتی سەدام حسێندا چڕکرایەوەو خۆی نمایش دەکرد.

لەگەڵ ئەوەشدا، تەنانەت دەسەڵاتی دەوڵەتیش لە روانگەی بەعسەوە سنوری خۆی هەیە، چونکە دەوڵەت بەسنوری واقیعێکەوە کۆتکراوە کە پەیوەندی سەرەکی دارشتنی سنوری نەتەوەیی نیە، بەڵکو وەك دوا رێگەیە بۆ شوێن پێی دونیای خەیاڵو دونیای واقیعی رەفتار دەکات، پاشان لە تواناداد دەبێت بەرەو گێژاوی فێڵبازەکانی وەك خۆی پەلکێشی بکات.

گەشەکردنی رێکخراوی بەعس لەناو خاکی عێراقدا ـ تا ئەو ئاستەی هەمو جۆرە ئۆپۆزیسۆنێکی لەناوخۆدا پاکتاوکردو رژێمێکی ترسو تۆقاندنی ئەوتۆی بەرهەمهێنا کە جگە لە هەڵاوێرد کردنی قوربانییەکانی لە هیچ شتێکی دی عەقڵانی نەبو ـ تا ئەو ئاستە چاوی بزوتنەوەی لەسەر راستیەکان کوێر کرد کە چیدی هیچ شتێکی دی نەدەبینی گەر دەستکردی خۆی نەبێت.

سەرکەوتنی بەرچاوی بەعس لە گۆشەگیرکردنی کۆمەڵگەی عێراق لە جیهانی دەوروبەریدا بە مەبەستی لەنێوبردنی هەر جۆرە هەڕەشەیەك لە دژی دەسەڵاتە رەهاکەی، بەتێپەربونی کات دژی حیزب شکایەوە. ئەو پیلانانەی لە ساڵانی یەکەمی حوکمڕانی بەعسدا بێبەزەییانە ریشەکێش کران، لە ئێستادا شێوەی خەونو خەیاڵی گرتوەو خەونە سەرەتاییەکانیش خەسڵەتی تەنها حەزێکی بێگەرد بون. بەعسییەکان دەربارەی هەمان خاڵی نوێلی ئەرخەمیدس جیهانێکی واقعیانەیان بونیات نا کە بوونو مانەوەی ئەو ئەو جیهانە واقیعییەش پەیوەندی بەهەمان خاڵی گریمانەییو خەیاڵییەوە هەیە کە لە واقیعدا بوونی نیە. سەدام حسێن هەروەکو دۆن کیشۆت دەیویست جیهانێکی لەوجۆرە بونیات بنێت، بەڵام لە واقیعدا هیچ خەسڵەتێکی دۆن کیشۆتی شاسواری وێڵو سەرگەردان نەبو.

جیهانی دەرەکی بەوجۆرەی لە ئیدارکی ئێمەی خاوەن عەقڵی دروست

دەردەکەوێت، لەلای سـەدام حسـێن قبـوڵ ناکرێ. لە گەرمەی شۆڕشـی ئێراندا، شـاپور بەختیارو سـەر لەشـکرەکانی دەوروبەری شـا، دڵنەواییان دەکرد کە شۆڕش لەساتەوەختی داتەپینەو تا بیناقاقای نوقمی گەندەڵی بووو جەماوەری ئێرانی چاوەڕوانی یەك ئاماژەی جەنابی دەکەن تا راپەرنو شـۆڕش سـەرکوت بکەن. سـەدام حسـێن پێویسـتی بەوجۆرە راوێژەی شـای ئێران نەبو، چونکە پێشتر ئەو ئەزمونە لە مێژووەوە فێربو، هەڵبژاردنی ناوی قادسـییەی سـەدامیش بۆ جەنگی عێـراق ـ ئێران بەڵگەی ئەوەیە کە زانیاری لەسەر مێژوو هەبوە. لە روانگەی سەدام حسێندا رواڵەتی شۆڕشی ئێران هەر لەسەرەتاوە روو لە نەمان بو، بەڵام ئەو ملیۆنان کەسەی لەسەر شەقامەکان رێپێوانیـان دەکـرد، ئەوانەی لە پێناویدا دەجەنگینو ئامادەبـون گیان بەخت بکەنو هەمو ئومێدو بەرخوازییەکانیان لە کەسـایەتی خومەینیدا بەرجەستە دەکرد، رێك لەو جەمـاوەرە عێراقییە دەچـون کە لە دادگاییەکانی کانونـی دوەمی ١٩٦٩دا ئاهەنگی سـەرکەوتنیان بەسـەر پیلانەکانی ئیمپریالیزمو زایۆنیزمدا دەگێرا. ئەو جیهانەی لەناو عێراقدا دایهێنابو، دەرکەوت بە روو سیاسی نیە.

سەدام حسێن پێیوابو عەرەبی خوزستان پێشوازی لە سوپا رزگارکارەکەی دەکەنو هـاوکاریو پاڵپشـتی لێدەکەنو چەك لەدژی دەوڵەتەکەیـان هەڵدەگرن، بەڵکو لەوە زیاتریـش درۆیشـت بەوەی لە ئێـران جیادەبنەوەو پەیوەندی بـە عروبەوە دەکەن کە کەلتوری شەرعی راستەقینەی خۆیانە، هەروەکو چۆن باپیرانیان لە پێدەشتی قادسیەدا ئەو کارەیان کردو لە ئیمپراتۆرییەتی پڕ توانای ساسانی هەڵگەڕانەوە، بەڵام ئەوان نەك هەر ئەو کارەیان نەکرد، بەڵکو لەو ناوچانەی زۆرینەی عەرەب بون، وەك خوزستانو ئەهواز شـەڕێکی قـورسو دەسـتەویەخەیان لەگەڵ سـوپای عێراقدا کـرد، ئەوەش بەپێوەری جیهانبینی سـەدام حسێن بۆ نادروستی هەڵسەنگاندن ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ خیانەتی عەرەب دەگەڕێتەوە. خەونی باڵادەستی بەسەر ئێرانو دابەشکردنی ئەو وڵاتە لەگەڵ جۆرێك پیلانگێری لە دژی بەعس هاوڕا بو، ئیدی چ بەگوێرەی خەونەکانی سـەدام یا بەپێی پیلانێك بێت، لەجیهانی سـەدامدا یەك شـتە. بۆیە ئەگەر سـەدام



حسێن تەنها لەبەر ئەوەی شیعەکانی عێراق هەڕەشەیەکی راستەقینە لەسەر رژێمەکەی دروسـتدەکەن، شەڕی هەڵگیرساندبێت، ئەوا هەمو شتانەی پێشتر لەسەر ئەم جەنگە وتومە وەك راسـتییەك بەهێزو توانای خۆی دەمێنێتەوە. سـەدام لەجیاتی ئەوەی لەسەر بنەمای وەهمی خۆبەزل زانین رەفتار بکات، دەیتوانی لەسەر هەمان بنەما کە لەگەڵ پیلانەکانی دی گرتییەبەر، ئەو پیلانەش لە رەگوریشەوە دەربهێنێت.

شـێتیو دێوانەیـی لەم مانا سیاسـییە وردەدا لـە حاڵەتێکدا روندەبێتـەوە کە هەر رووداوێکـی تایبەتو هەر گۆڕانکارییەك لە مەیدانی جەنگو لە هەمو ژیانی مرۆڤایەتی بەدەر لە پلەوپایەو سـامانو پێگەو گیانی گشـت تاکەکان بکاتە پاشـکۆی ئەمجۆرە ئامانجە وەهمییە دوور دەسـتە بێسـنورانە. لێرەشدا دوو روانگەی ناکۆك هەیە لەگەڵ روانگەی باقی مرۆڤی ئاسایی جیهان جیاوازییان هەیەو هەوڵدەدەن خۆیان لەو روانگە ئاساییە بەدوور بگرن.

کاتێك سەدام حسێن بەجیهان دەڵێت ئەگەر لەتوانایدابێت جەنگی جیهانی سێیەم هەڵدەگیرسـێنێت، پێشئەوەی خۆبەخشـانە واز لە دەسەڵات بهێنێت (پاشان بۆ هەتا هەتایە دەستبەرداری خورافاتی ئامانجە جەنگییەکانی دەبێت، ئەگەر ئەو خورافاتانەش بۆ پیلان بگۆڕێن، ئەوا رادەستیان نابێتو بوار بەپیلانەکان نادات)، رێك هەمان مانا لەزەینیدا هەبو.

کاتێك مرۆڤ لەگەڵ ئەوجۆرە خەڵکەدا مامەڵە دەکات، زۆر بەزەحمەت جیاوازی لە نێوان نیازێکی راستەقینەو پروپاگەندە دەکات. بەگشتی خەڵکی باوەر بە وشەکانی خۆیان دەکەن: پێشـنیازەکان چەند دڕندانە دەربکەوێت، ئەوا نابێت وەك وشـترمل سەرمان لە لمدا بچەقێنین بۆ ئەوەی ئەو دێوانەییە نەبینین.

زەحمـەتو دژواری کاتێـك خـۆی نمایـش دەکات کە ئێمەی مرۆڤی ئاسـایی هەوڵبدەیـن لە هۆیەکانی هەڵوێسـتی ئـەو خەڵکانە تێبگەینو ببینیـن کامیان پڕماناو کامیان بێمانا دەردەکەوێت.

پانتای عەقڵی دروستی گشتی لە دونیای بەعسو خومەینیدا، نەك هەر بەشێوەیەکی

ماقوڵ کار ناکات، بەڵکو دەشێت زیانبەخشیش بێت. بۆ نمونە لەڕوانگەی چاودێرانی بیانــی، عــەرەبو ڕۆژئاواییەکانەوە ســەدام حســێن لە ڕووی نائومێدییــەوە پەنای بۆ بەکارهێنانــی گازی ژەهراوی بردوە، بەڵام پێگەی ســەربازی ڕژێمی عێراقی ئەوەندە نائومێدانــە نەبــو تا پەنا بۆ ئەو چەکە ببات، کەچی پێشــتر لە بارودۆخی نائومێدانەتر ئەو چەکەی بەکارنەهێناوە، لەوەشــدا دەتوانرێ بوترێ تەنها لەبەر ئەوەی لەو دەمەدا چەکــی کیمیاییان چنگ نەکەوتبو. کیمیابارانی ئێرانییەکانو کوشــتنی بەکۆمەڵیان، بەدەر لە کوشــتنو نابوتکردنی دوژمن، ســودێکی دی بۆ بەعسییەکان هەبو، ئەویش پەرۆشیی شەهیدبونی لە قوربانییەکان دەسەندەوە. لێرەدا جیاوازی هەیە لە نێوان مردنی مرۆڤ بە ڕێژنەی گوللە، کاتێك بە خۆیو تفەنگەکەی دەستییەوە، بە پێدەشتەکاندا بــە دەم وتنەوەی ئەڵڵاو ئەکبەرەوە دوا هەناســە دەدا، لەگــەڵ ئەوەی چەندین هەفتە لەســەر قەرەوێڵەی سوچی نەخۆشخانەیەکدا گیان بسپێرێ، ئەمە ئەگەر نەخۆشخانە بۆ ئەو جۆرە مرۆڤانە دەست بکەوێت.

بەکارهێنانی چەکی کیمیایی کۆکوژ مەسەلەیەکی ئەخلاقی بەهەمو ڕەهەندەکانیەوە ڕوندەکاتــەوە، هەروەها ئەوەش ڕوندەکاتەوە، گەر ئەو دوو لایەنە شــەڕکەرە چەکی ئەتۆمییــان هەبوایــە چییان دەکرد؟ تەنها هــزری نەخۆشو نابەرپرســیار پێیانوایە گەر ســەدام حســێن چەکی ئەتۆمی هەبوایە، ئێرانــی بۆمباران نەدەکــرد. مانای هەبونی چەکی کۆمەڵکوژ، بەو نیازە نەگۆڕە دەست پێدەکات کە لە هەر شوێنێکدا بتوانرێ، بەکاربهێنــرێ، هەروەهــا هەبونــی ئەو چەکــە کە تایبــەت بۆ کوشــتنی بەکۆمەڵی خەڵکی مەدەنی دروســتکراوە، خۆی لە خۆیدا ئاماژەیــە بۆ نیازی تاوانکارانەی هەر حکومەتێك کە ئەو چەکەی هەبێت، بەدەر لە جۆرو چۆنێتی سیاسەتی ئەو دەوڵەتە. بەهەر حاڵ ئاســانکاریو گواســتنەوەو پێدانــی ئەمجۆرە توانایە بۆ ئــەو حکومەتەی دەســەڵاتی لەتوندوتیژییەوە سەرچاوەی گرتوە، وا لەو بەرپرسانەش دەکات بەشداری لەو توندوتیژییەدا بکەن، ئەمەش بەســەر حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی فرەنســادا پیــادە دەبێ کە لە ســاڵی ١٩٧٥ بەدواوە لەم ڕاگوزەرەدا هــاوکاری عێراقیان کردوەو



بەهاودەستی ئەو تاوانانە دەژمێردرێن.

لەم دوانگەیەوە پێویستە ئەو پرسیارە بکرێ کە پەیوەستە بەمانای لێکۆڵینەوە لەسەر عەقڵانیەت لە ڕەفتاری شــەڕەنگیزی ســەدام حســێندا، یا مافی ئەوەمان هەبێت لەو ســتراتیجییەتە ئاینییەی جەنگ وردبینەوە کە بۆ پاراســتنی دەســکەوتەکانی شۆڕشی خومەینی دارێژرابو، ئەو ســتراتیجییەی لە ڕێگەی کلیلێکەوە بەهەشتی بۆ یاوەرەکانی دابین دەکرد.

ئایا دەشــێت لێکۆڵینەوەیەکی لەوجۆرە ڕوناکی بخاتە ســەر سروشتی ئەم جەنگەو گرنگی بانهەرێمایەتی ڕونبکاتەوە؟ یا بەپێچەوانەوە، بەتەنها لێکۆڵینەوەیەکی لەوجۆرە قبوڵ کردنی هەمو ڕەهەندەکانی ئەم جەنگە ڕەتدەکاتەوە، پاشــان جیهانو چینەکانی لەناوبەرێت، بەمشێوەیەش زیاتر مانای یەکبونمان گەمارۆ دەداو مەودای قەلاچۆکردنمان وەك ڕەگــەزی مــرۆڤ زیاتر دەکات؟ هەمــو ئەوانەی لەبەر هەر هۆیــەكو بەناچاری هەڵوێســتیان لە بەرژەوەندی ئەم لایەن یا ئەو لایەنی شەڕکەر وەرگرتوە، ئیدی بەدەر لەوەی لە چی کاتێکی جەنگەکە ئەو هەڵویستەیان وەرگرتوە، ئەوا بێگومان بەدرێژایی ئەو ماوەیەی لەســەر ئەو هەڵوێســتەی خۆیان بون، تێکەڵ بەو دۆزەخە ئاکارییە بون. گرنــگ نیــە بزانرێ بۆچی ئــەو هەڵوێســتەیان وەرگرتوە، لەدەرەوەی ئــەو دوو وڵاتە شــەڕکەرە بون یا لەناوەوەی ئەو دوو وڵاتە بون، بەڕاســتی لە جەنگدا بون، یا لەسەر کەنــار ڕاوەســتابون، یا تەنانــەت کێ بون، چی بونو چی کارە بــون، لەبەر ئەوەی مەســەلەی سەرەکی بریتیە لەوەی سیاسەت هیچ پەیوەندییەکی بەو ڕەهەندە قوڵانەی جەنگێکی شێتانەی ترسناکی درێژخایەنەوە نیە.

سیاسەت، بواری ئاخاوتنی جەماوەرو کارلێکی (تفاعل) مرۆڤەکانە، بەپێچەوانەشەوە ئــەم بوارە دەتوانێت ببێتە هۆی ئەمجۆرە ململانێیەو بەدەســت پێکردنی کوشــتاریش توشــی سســتیو لاوازی دەبێتو کۆتایی بەئەرکەکەی دێت، بۆیە سیاسەت لە نێوان عێراقو ئێراندا لەو ساتەوەختەوە کۆتایی پێهات کە جەنگ هەڵایسا. بەماوەیەك پێش ئەوەش سیاسەت لە ناوخۆیی عێراقدا کۆتایی پێهاتبو، کە بۆ چۆنێتی دەست پێکردنی

جەنگ دەگەڕێتەوە. بۆیە بەدوور دەزانرێ ئەم جەنگە، جەنگێك بێت سیاسەت بەشێوازێکی دی تێیدا بەردەوام بێت، هەروەکو تیوریستی جەنگ، کلاوزفیتز دەڵێت، بەڵکو "بەردەوامبونی توندوتیژییەکی ناعاقڵانەو جڵەوپچڕاوە کە هێشتا سنوری دیارینەکراوە".

لە واقیعدا ئەمە سروشتی جەنگی عێراق ـ ئێران بو. سروشتێك لە ململانێیەکی ڕەگداکوتاوی دێرینی دوو جیهانبینییەوە سەرچاوەی گرتبو، کە نەك تەنها بەرامبەر بەیەك ناکۆك بون (چونکە گەر بەوجۆرە بوایە ئومێدی سازش‌و پێکەوە هەڵکردنیان هەبو)، بەڵکو ئەم دوو جیهانبینیە لە هەمو مرۆڤێکدا دەبینرا، تەنانەت ئەگەر لە دووری ئەوانیشەوە ڕابوەستایە.

ئەو دوو هێمایەی جەنگی عێراق ـ ئێرانی لەسەر پوخت دەکرایەوە بریتی بو لە ستراتیجییەتی شەپۆلی مرۆیی‌و گازی ژەهراوی، کە هیچ یەکێك لەو دوو ستراتیجییەش پەیوەندی بەستراتیجییەتی جەنگی ئاسایی‌و گەیشتن بە ئامانجی ئاشکرای سیاسییەوە نیە. ئەو دوو هێمایە خۆیان لەسەر مەرگ ڕاگرتبو کە بەدڵنیاییەوە خۆی لە خۆیدا ناسیاسی بون، ئیدی چی بەهۆی کوشتنی بەکۆمەڵی خەڵکی مەدەنییەوە بێت یا بەهۆی خودی سەربازەکانەوە بێت کە لە بەرەکانی جەنگدا دەکوژرێن. گازی ژەهراوی‌و شەڕی سەنگەر (ئەم ستراتیجییە جیاوازی لەگەڵ ستراتیجی شەپۆلی مرۆیی هەیە) لە داهێنانەکانی جەنگی جیهانی یەکەم بون، ئەویش جەنگێك بو گوزارشتی لە گەلحۆیی مرۆڤ دەکرد، چەشنی ئەوەی لە مەیدانی شەڕی "فیردن"دا دەبینرا، کە ڕەنگە دزێوترین کۆمەڵە لاشەی سەر ڕووی زەمین بێت. بەراوردکردنی جەنگی عێراق ـ ئێران بەجەنگی جیهانی یەکەمەوە بەراوردێکی بەجێیە، بەڵام زۆرجار بەڵگەهێنانەوەو هۆیەکانی ئەم بەراوردە نادروستن. گازی ژەهراوی‌و شەڕی سەنگەر لە داهێنانە تەکتیکییەکانی جەنگی جیهانی یەکەم بو، هاوکات لەگەڵ بەکارهێنانی تۆپخانەی قورس‌و ڕەشاش، بوە مایەی پەیدابونی هاوکێشەی کوشتنێکی بێوێنەی ئەم جەنگە، بەڵام لە جەنگی عێراق ـ ئێراندا بەپێچەوانەوە، هێماکان سەرچاوەیەکی تەکتیکیان نەبو، گەر بیشیانەوێت شایانی ئەو نازناوە بن، ئەوا پێویستە ڕۆچنە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکانەوە. گازی ژەهراوی بەردەستی بەعسی عێراق شێوازێکی کوشتن بو کە سەرچاوەکەی ئەو ترسە بو کۆمەڵگەی عێراقی پێکەوە دەبەستەوە، بەڵام ستراتیجییەتی شەپۆلی مرۆیی ئێرانییەکانیش هاوتای هەمان ستراتیجییەتە کە پێشوازی لە مردن دەکات، ئەویش نەك بەخاتری ئامانجی سیاسی کە پەیوەندی بەژیانەوە هەبێت، بەڵکو بەخاتری جیهانێکی دی، بۆیە دەبینین گازی ژەهراوی‌و ستراتیجییەتی شەپۆلی مرۆیی هێمایەکە، ئاماژە بە پرەنسیپەکانی جەنگی عێراق ـ ئێران دەکات، ئەمە لە حاڵێکدا ناتوانین هەمان شت لەسەر جەنگی جیهانی یەکەمدا بڵێین.

نوسەری ئەمەریکی، ویلیام فۆڵکنەر، لە ڕۆمانی "ئەفسانە ـ Afable"دا کە ڕوداوەکانی پەیوەندی بەجەنگی یەکەمەوە هەیە، باس لە داستانی هێرشێك دەکات. فەرماندەی تیپێکی فرەنسی دەیەوێت پەلامارێك بدات کە تەنها خۆیی‌و بەرپرسەکەی سەروی خۆی، دەرك بەشکستی پێشوەختی ئەو پەلامارە دەکەن. ڕێك لە ساتەوەختی هێرشدا تیپە هێرشبەرەکە هەڵدەگەڕێنەوەو گشت سەربازەکان ڕەتیدەکەنەوە لە سەنگەرەکانیان بێنە دەرەوەو پەلامار بدەن، وەکئەوەی پێشوەخت سوپای فرەنسی لەسەر هێرش نەکردن ڕێکەوتنیان کردبێت، چونکە هەمو سوپای فرەنسی ڕەتیانکردەوە هێرش بکەن، بەڵام سەیر لەوەدابو ئەڵمانەکانیش ئەو دەرفەتەیان بۆ دژە هێرشێك نەقۆزتەوەو تا ئێستاش کەس نازانێت چۆن‌و بۆچی لە هەمان کاتدا بەرەکانی ئەڵمانیاش بێدەنگ بون‌و جۆڵەیان نەکرد. ئەو ئەفسەرانەی لە توندی ئەو هەڵوێستە زمانیان بەسترا بو، بەمەبەستی ئەوەی بوونی خۆیان پێشان بدەن، کەوتنە تۆپبارانکردنی ئەو ناوچەیەی دەکەوتە نێوان هەر دوو بەرەکەوە.

فەرماندەی گروپێك بەمشێوەیە دەدوێت: "هێندێك کەڕەت دەتوانین ڕێگە بەسەربازەکانمان بدەین توشی نائومێدیمان بکەن، ئەوەش مەرجێکی سەرەکی چارەنوسی ئەو کەسانەیە کە بۆ هەمیشە لە پلەکانی خوارەوەدا خزمەت دەکەن. گەر بیانەوێت دەتوانن شەڕ ڕابگرن، هەروەکو پێشتر ئەو کارەیان کردوەو دەیشیکەن،

بەڵام ئەوەش ئــەرکی ئێمەیە نەهێڵین لەوە تێبگەن کە ئەوان بەریان بە شــەڕ گرتووە شەڕیان راگرتوە"[40]. ترسناکی مانای جەنگی عێراق ـ ئێران لەوەدایە کە سیناریۆییەکی لەوجۆرە قابیلی وێناکردن نیە. مەسەلەی گریمانەیی لەم جەنگەدا وەکئەوەی فۆڵکنەر وێنــای دەکات، بوونــی نیــە. خەیاڵدانی نوســەرێکی وەك فۆڵکنەر لە نەشــیانییەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەوەش مەسەلەیەکە هەرگیز قابیلی باوەڕکردن نیە.

کاتێك جەنگ لە پێناوی خاك، نەوت، مافی کەشتیوانیو پێگە ستراتیجییەکان یا تەنانەت نمایشکردنی هێزی دەوڵەت لە دەرەوەی سنوری دانپیانراودا، هەڵدەگیرسێت، گەمەکارانی سیاسی لە هەمو دونیادا دەتوانن حوکمی عەقڵانی ـ ئەگەر بەشێوەیەکی تیوریــش بێــت ـ بدەن، چونکە لە جەنگدا ئەو شــتانە لە مەترســیدا دەبن کە رۆحو گیانیــان نیە. ئەگەری ئەوەش هەیە کە ســەربازە ئەڵمانیو فرەنســیەکان لە جەنگی جیهانی یەکەمدا بەحیســابکردنی هۆیی کێشــەکان، بەو دەرئەنجامە گەیشــتبن کە ئەوانەی لێکیان نزیك دەکاتەوەو پێکەوەیان دەبەستێتەوە، زۆر زیاتر لەوانەی لەیەکتریان جیادەکاتــەوە، وەك بەرژەوەنــدی مــادی یا وڵاتپارێزی یا هەر شــتێکی دی. لەگەڵ ئەوەشدا، رەنگە جەنگ "پەیوەندی هێزەکان"ی نێوان دوو دەوڵەت بگۆڕێت، ئیدی چ بەشێوەیەکی کاتی بێت یا بەشێوەیەکی دی، ئەوەش فاکتەرێکی سیاسییە بەشداری لە هەڵایســانی جەنــگ دەکاتو دەشــێت لەبەرچاو بگیرێت. ئەمــەش مانای ئەوە ناگەیەنێت کە دەتوانرێ پێشــوەخت پێشــبینی دەرئەنجامەکانی جەنگ بکرێ یا لە بڕیار وەرگرتندا هەڵەو دڵەڕاوکێ بوونی نەبێت، بەڵکو دەمانەوێت بڵێین، بڕیاری شەڕ هەڵگیرســاندنو شــێوازی ئیدارەدانی لە زنجیرەیەك حوکمی سیاسییەوە هەڵدەقوڵێت کە بەنزیکەیی لەگەڵ واقیعدا دێتەوە یا هەڵســەنگاندنی ورد بەشێکە لە توانای لایەنە شەڕکەرەکان، هەروەها لە رێگەی ئەو حوکمانەوە دەشێت خوێندنەوەیەکی تا رادەیەك دروست بۆ کردەوەکانیان بکرێت.

ئەمجۆرە جەنگانە بریتیە لە "بەردەوامبونی سیاسەت بەشێوازێکی دی"، بەمشێوەیە ئەوانەی لە ســەنگەرەکانی جەنگدا روبەروی مــردن دەبنەوە، رەنگە لە واقیعدا بزانن



که ئەوانەی ئیدارەی مردنیان دەدەن بەشێوەیەکی بەردەوام کار دەکەن بۆ ئەوەی لەو چارەنوسە دووریان بخەنەوە.

بەپێچەوانەوە ئەگەر ئەوەی لە قوڵایی بوونی لایەنێکدا دەگوزەرێت، لەگەڵ ئەوەی لەقوڵایــی بوونــی لایەنی بەرامبــەردا دەگوزەرێت، لەحاڵەتی شــەڕو پێکدادان بێت، ئومێــدی دۆزینەوەی دیاردەی هاوبەشو ســازش بەنزیکەیی بوونــی نابێت. جەنگی عێراق ـ ئێران چ لە رووی سەرچاوەکانیو چ لە رووی بەردەوامبونییەوە لە پێکدادانێکی گەورەی دوو پیاو دەچێت کە توشــی جەنگێك بونو تا کۆتایی شەڕەکەش بەردەوام دەبــن. ئەگەر جەنگی نێــوان دوو وڵات تا کۆتایی بەردەوام نەبێت، لەبەر ئەوەیە کە هەر یەکێك لەو دوو لایەنە بەشــێوازێکی بێوێنە دەســەڵاتی سیاســی لە بوونی خۆیدا چڕکردۆتــەوەو ئەو دەســەڵاتە لــە حاڵەتی یەکەمدا لــە ترسو لە حاڵەتــی دووەمدا لە ئیمانەوە سەرچاوە دەگرێ.

ترسو ئیمان لە ئەنگیزە سەرەکیو جەوهەرییەکانی مرۆڤ دەژمێردرێت. لە هێندێك هەلومەرجــی تایبەتیدا مرۆڤ هاندەدا گیانی خۆیان بەخت بکەن، تەنها لەبەر ئەوەی پێیانوایە دەبێ شتێکی دی بکەن. ئەوانە هێزو دەسەڵاتی مەرگهێنەر دەخەنە بەردەستی رێبەرانو بڕیاری تایبەت بەجەنگیش، بێسنوری ئەو دەسەڵاتەی پێی بەخشراوە نیشان دەدا.

ناوەرۆکــی مۆڕاڵــی ئەم جەنگە کــە لە جەنگی ناوخۆی لوبنــان دەچێتو بەهیچ شــێوەیەك لە شەڕەکانی عەرەب ـ ئیسرائیل ناچێت، لەو راستیە ساکارەوە بەرجەستە دەبێت کە تەنها بەرودانی بەشــێك لە مرۆڤایەتیمان لێدەســەنێتەوە، ئەو مرۆڤایەتییەی پێشتر روبەروی لێدانی گەورە بۆتەوەو خەریك بوە لەناوبچێت.

1 ـ ئەم هەڵسەنگاندنە ستیفن گرومۆن لەم بەرهەمەی خوارەوە بەکاریهێناوە:
Stephen R. Grumon, The Iraq – Iran War: Islam Embattled. CSIS. Georgetown University (Washinton D. C. Praeger, 1982), 16.

2 ـ K Mclachian and G. Joffe, The Gulf War; A survey of Poltical Issues and Economic Consequences, Economic Intelligence Unit Special Report no. 176 (London, 1984), 37.

3 ـ بڕوانە هەواڵێك لە بەرەی عێراقەوە :
- d Fairhall in The Guardian, Oct, 29, 1980, entitled, "Blitzkreig Turns into long Winter War".
M. Woollacot in The Guardian, oct, 1, 1980.

4 ـ دی میدڵتــون لــە ئەیلولی ســاڵی ١٩٨٥دا لە ژمارە ٢٣ نیویۆرك تایمز لەســەر بنەمای هەڵســەنگاندنی پایتەختەکانــی ناتۆ بەرزترین هەڵســەنگاندنی ئامادەی کــردوەو زیانەکانی ئێرانی لە نێوان ٤٢٠ تا ٥٨٠ هەزار کوژراوو زیانەکانی عێراقیشــی بە ٣٠٠ هەزار کەس لە قەڵەم داوە. من لەدوای شــەڕی فاو کە لە شــوباتی ١٩٨٦دا رویدا، ١٠٠ هەزار کەس بۆ ئەو لیســتە زیاد دەکەم. بەپێی راپۆرتی بۆشــکۆف ســەرجەم زیانەکان دەگاتە ملیۆنو نیوێك کەس (بۆستۆن ساندی گلاب، ٢٢/ ئەیلول ١٩٨٥). هەمو ئەو خەمڵاندنانەی سەرەوە دەرئەنجامــی پیاچونەوەی ئەو ژمارە ســەرەتاییانەیە کە ســەرچاوە ئەمەریکییەکان ئامادەییــان کردبو. رەنگە رێبەرەکەی بەغدا هەرگیز لەمەڕ زیانە مرۆییەکانی پەی بەهەڵە گێلانەکەی خۆی نەبردبێت.

5 ـ سەرجەم کوژراوەکانی ئەوروپا لە جەنگی جیهانی دوەمدا، ٣٠ ملیۆن کەس بو، کە نیوەی کوژراوەکان بەر یەکێتی سۆڤێت دەکەوت. ژمارەکان لەم سەرچاوەیەی خوارەوە وەرگیراوە:
- Gordon Wright, The Ordeal of Total War; 1939 – 1945 (New York, Haroer, 1968), 263–64.
رایــت لە بەشــی یازدەهەمدا ئاماژە دەکات بەوەی کە ســەرجەم کۆمەڵگە گیــرۆدەی ئەو جەنگە بون. رایت لەم بەشــەدا کە لە ژێر ناوی "کاریگەری جەنگێکی گشــتگیر"ە، جەنگی ئێران ـ عێراق بە جەنگێکی گشتگیر دەزانێت.

6 ـ من لەگەڵ ئەو بیروباوەرە ناجدییانە باوەی رۆژهەڵات نیم کە دەوڵەتەکانیان پڕۆپاگەندەی بۆ دەکەن، بۆ نمونە پیلانێکی "ئێرانی ـ ئیسرائیلی ـ ئەمەریکی" لە تاران، یا پیلانێکی "عێراقی ـ ئەمەریکی ـ ئیسرائیلی" لە بەغدا گەڵاڵەکرا. لەم بوارەدا بگەڕێرەوە بۆ هەواڵی دیڤید هێرست لە بەیروت کە ٢٢/ تشرینی یەکەم/ ١٩٨٠ لە گاردیان بڵاوبۆتەوە، هەروەها بڕوانە هەواڵێکی تێروتەسەلتری فارتینو ڤلاکوت کە لە ١١/ تشرینی یەکەم/ ١٩٨٠ لە گاردیان بەچاپ گەیشتو لایەنگری عەرەبی چینی مامناوەندی لەسەر ئەو جەنگە روونکردەکاتەوە. وتاری ریچارد وی بۆڵیت بە ناونیشــانی "زمان، ئاگایی پێشــوەختو چارەسەرکردنی ململانێ" لەم کتێبەی خوارەوە پرسودە:
The Iran – Iraq war: New Weapons, Old Conflicts, ed, shirin Tahir – Kheli and shaheen Ayubi (New York, Praeger, 1983).

7 ـ jasimM. Abdulghani, Iraq and Iran; The years of Crisis (Baltimoore, 1984), 2.





8 ـ بۆ نمونە بڕوانە کتێبی حەسەن محەمەد تەوالبە: گفتوگۆکانی ململانێی عێراق ـ ئێران (بەیروت، ١٩٨٤)، ٦٠ ـ ٦١، هەروەها بڕوانە:
- P. Hunseler, "The Historical Antecedents of the shutt Al – Arab Dispute"
وتاری م. ئەلنەجارو ســەفوەت بەناونیشــانی "حوکمڕانی عەرەب لەسەر شەتولعەرەب لە سەردەمی بەنی کەعب"دا کە هەردوکیان لەم بەرهەمەدا بەچاپ گەیەنراون:
The Iraq – Iran War. Ed M. S. Al Azhary (London. Croon Helm. 1984).
دانیێل پاپیس ـ یش لە پێشەکی وتارەکەیدا (٤ ـ ٨) ئاماژەی بەم بابەتە کردوە.

9 ـ ئەمیــر تایــەر لــە هەواڵێکیدا لە رۆژنامەی هیراڵد تریبۆن لە ١٠/ تشــرینی یەکەم/ ١٩٨٠، بەهرە لەم زمانە رەگەزپەرســتییە وەردەگرێــت. بۆڵیــت ـ یش لــە وتاریکیدا بەناونیشــانی "زمان" لــە New Weopons, old conflicts، نمونەی دی وەك بەشێك لە شیکردنەوەی پێناسەو چەمکەکانی پەیوەست بە کێشمەکیشەکان کە هەر دوو لایەنی شەڕکەر بەکاردەهێنن، دەخاتەروو.

10 ـ بڕوانە بەشی یەکەمو شەشەم دەربارەی شعوبیەت.

11 ـ م. س . ئەلئەزهەری لە کتێبی The Iraq – Iran War ئەم بابەتەی هێناوەتەوە.

12 ـ بڕوانە بەشی ٣، ٤و ٧ی ئەم کتێبە.

١٣ ـ دانیێل پاپیس، پێشەکی، ل٤.

١٤ ـ ویلیــام ئیشــتادن مەیــر، هــۆکاری جودایی و ململانێی زۆر بە کێشمەکیشــێ کولتــوریو مێژوییو مشتومڕی شیعەو سونە دەزانێت. لە هۆکارە تایبەتیەکان، لەلایەکەوە، باس لە هەوڵو کۆششی ئێران دەکات بۆ هەناردەکردنی شــۆڕش، لەلایەکی دی، باس لە دەســەڵاتخوازی ســەدام حسێن دەکات، کە سەرئەنجام بڵێسەیەکی گونجاو لەسەر ململانێی شەتولعەرەب دروست دەکات، بڕوانە وتاری "شیکردنەوەی ستراتیجی" لە کتێبی تایەر خەلیو شاهین ئەیوبی کە پێنج هۆکاری باسکردوە.
(New Weapon, Old Confgict)، هەروەها Mellachlan – joffe, The Gulf war, 36 -37

15 ـ تاریق ئیسماعیل، هەمان سەرچاوە، ٢.

16 ـ لە وتارەکەی ئەلنەجارو ســەفوەتدا، بەناونیشــانی حوکمڕانی عەرەب لەســەر شــەتولعەرەب، بابەتێکی ســەرنجراکێش هەیە. لەم وتارەدا دەیانەوێت بەســودوەرگرتن لە وتەزای یەکێتی عەرەبی، هەڵســەنگاندنێك لەســەر شەڕە خێڵەکییەکانی چوار سەدەی بەر لەئێستا بکەن. نوســەرانی وتارەکە دەربارەی جۆلانێ کردنی وەفاداری خێڵەکان بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی یا سەفەوی روونکردنەوەیان داوە، بەڵام بێئاگا بون لەو گرفتەی لە نێوان زمانی وتارەکەیانو راستیەکاندا سەرهەڵدەدا.

17 ـ تاریق ئیسماعیل، هەمان سەرچاوە، ٢.

18 ـ هەمان سەرچاوە، ٦.

19 ـ هەمان سەرچاوە، ٢٧.

20 ـ بۆ نمونه پایپس لە پێشکەییەدا لەو تەنها ئاماژەیەی بە ڕۆڵی سەدام حسێن، دەنوسێت: "گریمان سەدام حسێن گەمژانە یا سەرچڵانە هەنگاوبنێت ـ تەنانەت ڕەخنەکارانیشی مل بۆ بەرژەوەندگەرای ئەو دەدەن ـ دیسانەوە پێویستە بوترێ کە سەدام لە ئەیلولی ١٩٨٠دا بەڵگەی جدی بۆ هەڵگیرساندنی جەنگ هەبو":
- Tahir kheli, Ayubi, New Weapons..... 4.

21 ـ Fouad' Ajami, The Arab Predicament; Arab Political thought and practice since 1967 (Camridge. 1982). 32 – 33.

22 ـ بڕوانە بەشی یەکەمو سێیەمی ئەم کتێبە.

23 ـ بۆ نمونە بڕوانە هەواڵێکی جان کیفنەر کە لە بارەگای هێزی فەرماندەیەکەوە ئامادەی کردوە کە تێیدا ئەو فەرماندەیە هەوڵی داوە جادەیەك لە بیابانەکانی دەرەوەی ئەهوازەوە دروست بکات. کاتێك فەرماندەی ناوبراو لەلایەن پەیامنێرانەوە وەگیردەهێنرێ، نازانێت ئەو جادەیە بۆچی لێدەدرێو سەرئەنجام دەڵێت: "ئێمە نەخشەی ڕێبەر جێبەجێ دەکەین". هیراڵد تریبۆن، ٢٢/ تشرینی یەکەم/ ١٩٨٠.

24 ـ ویلیام ئیشتادن مەیر لە پارامیتەرز، ڕۆژنامەی کۆلێجی جەنگی هێزە ئاسمانیەکانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا وتاریکی بەناوی "سیاسەتی سەربازیو ستراتیجی لە جەنگی کەنداودا" نوسیوە، ژمارە ٢، ل٢٨.

25 ـ لە نەبەردێکی ساڵی ١٩٨٥دا عێراقییەکان دوو لەشکری زرێ ـ یان بۆ تێکشاندنی هێزێکی ١٥٠٠ کەسی ئێرانی بەکارهێنا. عێراقییەکان زیانێکی گەورەیان لێکەوت، چونکە ئار. پی. جی بەدەستەکانی ئێران لە پشتی بەربەستێکی بچوکیشەوە تانکەکانی عێراقیان دەکردە ئامانجی خۆیان. بڕوانە هەواڵی جان کیفنەر لە نیویۆرك تایمز، ٢٨/شوبات/ ١٩٨٦.

26 ـ ئیشتادن مەیر، "جەنگی کەنداو"، ٢٩.

27 ـ کیفنەر، نیویۆرك تایمز، ٢٨/شوبات/ ١٩٨٦.

28 ـ لەنێو ئەو فیکرە زرنگانەی بەعس بۆ دروستکردنی بەربەست لەنێوان خۆیانو ئێرانییەکاندا دایهێنا، ئەو خەنەکە ئاوییە بو کە درێژییەکەی پازدە میلو پانییەکەیشی لەنێوان نیو میل تا سێ میل بو، بە میلیارد گالۆن ئاوی ڕوباری دیجلەو زۆلکاوی حوێزەیان لە ڕێگەی کەناڵێکی بیست یاردە پانەوە بۆ هەڵدا، بەوەش گەورەترین دەریاچەی دەستکردیان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دروستکرد. تا ئێستاش ئەو پرۆژەیە بەئاڵۆزی ماوەتەوە کە یەك میلیارد دۆلاری تێچوە. یەکێك لە شارەزاکان دەڵێت ئامانجی ئەو پرۆژەیە بریتی بو لەوەی عێراق توانای هەبێت سەرزەمینی ئێران نوقمی ئاو بکات. بڕوانە هەواڵی ١٣/تەموز/ ١٩٨٤ گاردیانو ١٣/ کانونی دوەم/ ١٩٨٥ ساندی تایمز.

29 ـ ئەم ستراتیجییە لە پەرەپێدانی پلانی سەرەکی یاری شەترەنجەوە نزیکە کە بەمردنی شا کۆتایی دێت، ئەوەش پشت بەدروستیی جوڵەی بەرامبەرەکەی دەبەستێت، تا بتوانرێ پلانەکە بخرێتە بواری جێبەجێ کردنەوە. گرومۆن: جەنگی عێراق ـ ئێران. ١٨. ئەدگار ئۆباڵاس، شێتەڵکاری سەربازی، هەمان شت دەڵێت. بڕوانە وتاری "جەنگی عێراق ـ ئێران: گێمی یەکەم"، پارامیتەرز ـ ڕۆژنامەی کۆلێجی سوپای وڵاتە





یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، ١١، ژمارە ١ (مارس ١٩٨١)، ٥٦.

30 ـ بڕوانە گرومۆن: جەنگی عێراق ـ ئێران، ١٧، و. کواندت ـ یش جەختی لەسەر کردۆتەوە، بڕوانە: پەرچەکرداری وڵاتانی کەنداوی عەرەبی، لە جەنگی عێراق ـ ئێراندا: مەسەلە جێناکۆکییەکانو دەرفەتی ئاشتی. نوسینی عەلی هیلال دسوقی (وقائع سمنار، جامعه برنستون، أغسگس سنه ١٩٨١)، ٤١.

31 ـ بڕوانە ڕاڤەکردنەکەی درو میدڵتۆن لە ئینتەرناسیونال هیراڵد تریبون، ١٥/ تشرینی یەکەم/١٩٨٠، دواتر هەڵسەنگاندنەکانی هەموار کرد.

32 ـ "لەناوەندی بیاباندا، پارچە تێکشاوەکانی فڕۆکەیەکی شەڕکەریان پێشاندایـن کە وەزارەتی ڕاگەیاندنی عێراق لە شوێنێکدا کۆیکردبوەوەو دەیانوت ئەوە پارچەکانی فڕۆکەیەکی فانتۆمی ئێرانییە. زەردەخەنەی سەر لێویان کاتێك وشك بو کە پەیامنێرێکی پۆڵۆنی بەوپەڕی ئەدەبەوە یەکێك لە پارچە تێکشاوەکانی فڕۆکەکەی پێشاندا کە بەزمانی ڕوسی لەسەری نوسراو بو "دەرچونی ناچاری"، ئیدی بۆمان دەرکەوت ئەو پارچانە، پارچەی فڕۆکەیەکی مێکی شەڕکەری عێراقییە، نەك ئێرانی. پاشان بەرپرسە عێراقییەکان هەر زۆر بەخێرایی کە سورهەڵگەڕابونو تورەییان لێدەباری بەرەو ئۆتۆمۆبیلەکەیان بردینەوە". لە ڕاپۆرتی کۆمەڵێك پەیامنێری ئۆبزێرڤەر لە بەرواری ٢٨/ ئەیلول/ ١٩٨٠. دێڤید فێر هۆڵ لە بۆنەیەکی دی دەڵێت: "گەورە فڕۆکەی ئەلیوشنی گواستنەوەی ڕوسی کە دەیویست لە فڕۆکەخانەی بەغدا بنشێتەوە لەلایەن عێراقییەکانەوە تەقەی لێکراو خرایەخوارەوە، گاردیان، ٢٩/ تشرینی یەکەم/ ١٩٨٠.

33 ـ سەدام حسێن بۆ یەکەمین جار ئامانجی جەنگی عێراقی، بەبۆنەی جەژنی قوربانەوە بۆ سوپا ئاشکرا کردو تێیدا بەم زمانە داوای ڕوخاندنی ڕژێمی خومەینی دەکرد: "بەراستی ئێوە شمشێری خوداوەندن لەسەر ڕووی زەمین، بۆ ئەوەی ملی دەستدرێژیکارانو پارێزەرانی خومەینی بقرتێنن"... لە ئینتەرناسیونال هیراڵد تریبۆن وەرگیراوە، ٢٠/ تشرینی یەکەم/ ١٩٨٠. لە هێندێك کاتی دی، سەدام حسێن بە مەبەستی ڕوخاندنی ئیمپراتۆریەتی ڕەگەزپەرستی ئێرانی، داوای چەکدارکردنی کەمایەتییەکانی ئێرانی دەکرد بۆ ئەوەی جهاد لەدژی خومەینی بکەن".

34 ـ ئەریك ڕۆڵۆ، گاردیان، ١٤/ تشرینی یەکەم/ ١٩٨٠، لە لیمۆندەوە وەرگیراوە.

35 ـ بڕوانە ئەو ڕاپۆرتەی جیمس ماکمانوس لە بەغدا لەسەر سەدام ئامادەی کردوە: "سەدام گەرماوی وشك (هەتاوی) لەچالاکی جەنگدا دەکات"، گاردیان، ٣٠/ تشرینی یەکەم/ ١٩٨٠. بەگوتەی ئەلیکس لەدوای تێپەڕبونی چوار ساڵ هێشتا ورەی عێراقییە مامناوەندییەکان بەرزە، ئەلیکس لە گەشتێکی دوو هەفتەیی بۆ عێراق، ڕاپۆرتێکی سادەی لەسەر بیروڕای خەڵکی ئامادە کردوە. کریستیان ساینس مونیتەر، ١٤/ تشرینی دوەم/ ١٩٨٤.

36 ـ ڕاپۆرتی ئەریك ڕۆڵۆ، وەك زۆرێك لە ڕاپۆرتی پەیامنێران کە لە شوێنی ڕوداوەکان ئامادەبون، جەخت لەسەر هەمان مەبەست دەکەنەوە. گوندنشینێکی پیری دیزەفولی بە ڕۆڵۆ دەڵێت: "گوێی ڕادێرە، ئێمە بە نینۆك بەم خاکەوە بەستراوینەتەوە، ڕەنگە بتوانن هەمو شتێك وێران بکەن، لەژێر خێوەتدا دەخەوین، بەڵام

دواتر بۆ سەر خاکو زەوی خۆمان دەگەڕێینەوە" گاردیان، ١٤/ تشرینی یەکەم/ ١٩٨٠.
37 ـ لـە هەڵسـەنگاندنەکانی دەزگای هەواڵگری ئەمەریکا، لە ئامادەکردنـی درۆ میدڵتۆن، نیویۆرك تایمز، ١٨/ شوبات/ ١٩٨٤.
38 ـ لەدوای شـەڕی خوێناوی زۆلکاوەکانی باکوری بەسـرە، بەسـەدان لاشـەی ئێرانی سـەر ئاو کەوتبون (ئەوەش لەدوای ئەوەی ئێرانییەکان گەلەکەشتییەکیان رەوانەی زۆلکاوەکان کرد کە پێکهاتبو لە ٥٠٠ بەلەمی بچوك، لە رێگەی رەشاشـی هیلیکۆپتەرەوە جەسـتەیان پارچەپارچە ببو)، من هەرگیز کوشـتاری لەوجۆرەم نەدیبو، لەدوای ژماردنی ٥٠٠ لاشـە، نەمتوانی درێژە بە ژماردنیان بدەم. جۆن سـوێن، پەیامنێری سـەندای تایمز لە ٤/ مارس/ ١٩٨٤، ئەم روداوەی گێڕاوەتەوە.
39 ـ سەندای تایمز، ٢٦/ شوبات/ ١٩٨٤.
40 ـ ولیام فۆڵکنەر: ئەفسانەیەك (نیویۆرك، راندۆم هاوس، ١٩٨٧)، ٤٥.

# پاشکۆ

لیستی ئەفسەرە پایە بەرزەکانو سەرکردە کۆنەکانی بەعسو دەوڵەتدارانو وەزیرانو پایەدارەکان لە ١٧/ تەموز/ ١٩٦٨ بەدواوە پاکتاوکراون.

| ناو | عەبدولرەزاق نایف | ئیبراهیم داود | ناسر ئەلهانی |
|---|---|---|---|
| بەرواری پاکتاوکردن | ٣٠/ تەموز/ ١٩٦٨ | ٣٠/ تەموز/ ١٩٦٨ | تشرینی دوەمی ١٩٦٨ |
| شێوازی گرتن | دەستگیرکراو دورخرایەوە، ساڵی ١٩٧١ بۆ یەکەمجار لە لەندەن هەوڵی تیرۆرکردنی دراو لە تەموزی ١٩٧٨ لە لەندەن تیرۆرکرا | لەئوردن، لەتاراوگە | بە شەو لەلایەن بەعسییەکانەوە رفێنرا، پاشان لاشە تیربارانەکەی لە ئاودا دۆزرایەوە |
| پێگەی لەدوای تەموزی ١٩٦٨ | سەرۆك وەزیران، ئەندامی ناوەندی سەرکردایەتی | وەزیری بەرگری، ئەندامی ناوەدی سەرکردایەتی | وەزیری دەرەوە |
| پیشەیی ئاسایی | ئەفسەر | ئەفسەر | دیپلۆماسو پسپۆرو رەخنەگری ئەدەبی |
| پەیوەندی حیزبی | حیزبی نەبو | حیزبی نەبو | حیزبی نەبو |



| ناو | ئیبراهیم فەیسەڵ ئەلئەنساری | عەبدولروحمان بەزاز | حەردان تکریتی | حەسەن نەقیب |
|---|---|---|---|---|
| بەرواری پاکتاوکردن | کانونی یەکەمی ١٩٦٨ | تشرینی یەکەمی ١٩٦٩ | ١٥/ تشرینی یەکەم ١٩٧٠ | تشرینی یەکەم/١٩٧٠ |
| شێوازی گرتن | دەرکرا، پاشان دەستگیر کراو بەتومەتی پیلانگێران لە ١٢ ساڵ حوکمدرا | ئەشکەنجەدراو بەتومەتی سیخوری کردن بۆ ئیسرائیل بە ١٥ ساڵ حوکم درا | دەرکراو هەمو پلەپایەکانی لێسەنرایەوەو لەکویت تیرۆر کرا | دەرکراو بوە باڵوێزی عراق لە ئیسپانیا، خانەنشینی سوپا بو |
| پێگەی لەدوای تەموزی ١٩٦٨ | فەرماندەی ئەرکان | پلەو پایەی نەبو | جێگری سەرەك وەزیرانو وەزیری بەرگریو جێگری فەرماندەیی گشتیو ئەندامی ناوەندی سەرکردایەتی بو | جێگری سەرۆکی ئەرکان بو |
| پیشەیی ئاسایی | ئەفسەر | دیبلۆماسو پسپۆر | ئەفسەر | ئەفسەر |
| پەیوەندی حیزبی | حیزبی نەبو | حیزبی نەبو | لە ساڵی ١٩٦١وە پەیوەندی بە بەعسەوە کردبو | لە ساڵی ١٩٥٨وە بەعسی بو |

| ناو | فواد ئەلرکابی | سەلاح عومەر عەلی | حەمەد شیهاب | نازم گزار |
|---|---|---|---|---|
| بەرواری پاکتاوکردن | تشرینی دوەم | ١٩٧٢ | ٣٠/حوزەیران / ١٩٧٣ | ٨/ تەموز/ ١٩٧٣ |
| شێوازی گرتن | لە زیندان کوژرا | دەرکراو بوە بالوێز لە سوید | لە پیلانی کودەتایەك بەدەستی گزار کوژرا | لە سێدارە درا |
| پێگەی لەدوای تەموزی ١٩٦٨ | هیچ نەبو | وەزیری ڕێنمایی‌و ئەندامی سەرکردایەتی قوتری بو | وەزیری بەرگری، سەرۆکی دەستەی ئەرکانو ئەندامی ناوەندی سەرکردایەتی | بەڕێوەبەری ئەمنی ناوخۆ بو |
| پیشەیی ئاسایی | ئەندازیار | ئەندامی حیزب | ئەفسەر | ئەندامی حیزب |
| پەیوەندی حیزبی | لە پەنجاکانەوە بەعسی بو، لە١٩٥٢ ـ ١٩٥٨ ڕێبەری حیزب بو | بەعسی‌و ئەندامی ناوەندی سەرکردایەتی بو | لەدوای ساڵی ١٩٦٨ پەیوەندی بە بەعسەوە کرد بو | لە پەنجاکانەوە بەعسی بو |



| ناو | عەبدولسەلام سامەرائی | ساڵەح مەهدی عەماش | عەبدولکەریم مستەفا نوسرەت | عەبدولکەریم شێخلی |
|---|---|---|---|---|
| بەرواری پاکتاوکردن | ١٩٧٠ | ٢٨/ ئەیلول/ ١٩٧١ | ئاب/ ١٩٧١ | ٢٨/ ئەیلول/ ١٩٧١ |
| شێوازی گرتن | هەمو پلەوپایەکانی لیسەنرایەوەو بوە باڵوێز لە هیندستان | هەمو پلەو پایەیەکی لێسەنرایەوەو کرا بەباڵوێز لە فینلاند | لە ماڵەکەی خۆیدا بەچەقۆ کوژرا | دەرکراو بوە نوێنەری عراق لە نەتەوە یەکگرتوەکان، لەناو ئۆتۆمۆبیلەکەی تیرۆر کرا |
| پێگەی لەدوای تەموزی ١٩٦٨ | وەزیری ڕاگەیاندنو وەزیری دەوڵەتو ئەندامی ناوەندی قوتری بو | جێگری سەرەك وەزیرانو وەزیری ناوخۆ (١٩٦٨ ـ ١٩٧٠)و ئەندامی ناوەندی قوتری بو | وەزیر | وەزیری دەرەوە، ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بو |
| پیشەیی ئاسایی | حیزبی | ئەفسەر | ئەفسەر | حیزبی |
| پەیوەندی حیزبی | لە ساڵی ١٩٥٠ بەعسی بو، ئەندامی ناوەندی قوتری | لە ١٩٥٢وە بەعسی بو، ئەندامی ناوەندی قوتری‌و نەتەوەیی بو | لە کۆتایی ١٩٥٠وە بەعس بو | بەعسی‌و ئەندامی ناوەندی قوتری‌و نەتەوەیی عەرەبی بو |

| ناو | تەها شەکەرچی | حەسەن حەیاری | داود ئەلجەنابی | دکتۆر عیزەت مستەفا | ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر |
|---|---|---|---|---|---|
| **بەرواری پاکتاوکردن** | ١٩٧٤ ـ ١٩٧٥ | ١٩٧٤ ـ ١٩٧٥ | ناوەراستی حەفتاکان | ئازاری ١٩٧٧ | حوزەیرانی ١٩٧٩ |
| **شێوازی گرتن** | زیندان | دەرکراو وەك مولحەقی سەربازی لە پاکستان دانرا | دەرکرا | دەکراو لە ماڵەکەی خۆیدا دەست بەسەر کرا | لە ماڵەکەی خۆی دەست بەسەرکراو، پاشان هێدی هێدی هەمو ئەرکەکانی لێسەنرایەوە |
| **پێگەی لەدوای تەموزی ١٩٦٨** | جەنەراڵ | فەرماندەی هێزە ئاسمانییەکان بو | فەرماندەی گاردی کۆماری بو | وەزیری تەندروستی ١٩٦٨ ـ ١٩٦٩، وەزیری کار ١٩٧٦، وەزیری شارەوانییەکان ١٩٧٧و ئەندامی سەرکردایەتی قوتری بو ١٩٦٨ ـ ١٩٧٧ | سەرکۆمارو فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانو وەزیری بەرگری (١٩٧٣ ـ ١٩٧٧) |
| **پیشەیی ئاسایی** | ئەفسەر | ئەفسەر | ئەفسەر | پزیشك | ئەفسەر |
| **پەیوەندی حیزبی** | نازانرێ | نازانرێ | نازانرێ | لە چلەکانەوە بەعسی بو، لە پەنجاکانەوە ئەندامی ناوەندی سەرکردایەتی قوتری بو | لەسەرەتای پەنجاکانەوە بوە بەعسیو ئەمینداری گشتی حیزبی بەعسو ئەندامی سەرکردایەتی قەومییە عەرەبەکان بو |



| ناو | محەمەد فازیل | نەعیم حەداد | عەبدولخالق سامەرائی | حەسەن مستەفا | سادق مستەفا |
|---|---|---|---|---|---|
| **بەرواری پاکتاوکردن** | ٩/ تەموز/ ١٩٧٣ | تەموزی ١٩٧٣ | تەموزی ١٩٧٣ | ١٩٧٤ ـ ١٩٧٥ | ١٩٧٤ ـ ١٩٧٥ |
| **شێوازی گرتن** | لە سێدارە درا | زیندان | بەحوکمی هەتاهەتایی زیندانی کراو لە پاکتاوەکەی ١٩٧٩ گولەباران کرا | زیندان | زیندان |
| **پێگەی لەدوای تەموزی ١٩٦٨** | سەرۆکی فەرمانگە سەربازی بەعس بو | ــــــ | ئەندامی ناوەندی سەرکردایەتی قوتری بو | جەنەراڵ | جەنەراڵ |
| **پیشەیی ئاسایی** | ئەفسەر | ئەندامی حیزب | فەرمانبەری شارەوانیو تیوریستی حیزب بو | ئەفسەر | ئەفسەر |
| **پەیوەندی حیزبی** | بەعسی بو | بەعسیو ئەندامی سەرکردایەتی قوتری بو | بەعسیو ئەندامی سەرکردایەتی قوتریو سەرکردایەتی قەومییە عەرەکان بو | نازانرێ | نازانرێ |

| ناو | غانم عەبدولجەلیل | محەمەد عایش | عەدنان حەمدانی | ریاز ئیبراهیم |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| بەرواری پاکتاوکردن | تەموزی ١٩٧٩ | تەموزی ١٩٧٩ | تەموزی ١٩٧٩ | تەموزی ١٩٧٩ |
| شێوازی گرتن | لە سێدارە درا | لە سێدارە درا | لە سێدارە درا | لە سێدارە درا |
| پێگەی لەدوای تەموزی ١٩٦٨ | بەرێوەبەری نوسینگەی جێگری سەر کۆمارو ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بو | ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بو | بەرێوەبەری گشتی نوسینگەی سەرکۆمارو وەزیری پلاندانان بو (١٩٧٦ ـ ١٩٧٧)، ئەندامی سەرکردایەتی قوتریو ئەندامی لیژنەی نەوت بو | وەزیری تەندروستی بو |
| پیشەیی ئاسایی |  | لە سەرکردەو رێکخەرەکانی حیزب بو | پارێزەرو حیزبی بو | حیزبی بو |
| پەیوەندی حیزبی | بەعسیو ئەندامی سەرکردایەتی قوتری بو | بەعسیو ئەندامی سەرکردایەتی قوتری بو | بەعسی بو | لە گەورە بەرپرسەکانی بەعس بو |



| ناو | موحی عەبدولحسێن رەشید | خالید عابد عوسمان | عەدنان حسێن | محەمەد مەحجوب | محەمەد عەبد |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| بەرواری پاکتاوکردن | ٢٠/ تەموز/ ١٩٧٩ | تەموزی ١٩٧٩ | تەموزی ١٩٧٩ | تەموزی ١٩٧٩ | تەموزی ١٩٧٩ |
| شێوازی گرتن | ناچارکرا لەبەرامبەر ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشدا ئیعتراف بکات، پاشان لەگەڵ هەمو ئەندامانی خێزانەکەیدا گولەباران کرا | لە سێدارە درا | لە سێدارە درا | لە سێدارە درا | لە سێدارە درا |
| پێگەی لەدوای تەموزی ١٩٦٨ | سکرتێری سەرکردایەتی قوتری بو | وەزیری کاروباری کورد، ئەندامی سەرکردایەتی قوتری بو | جێگری سەرەك وەزیران، بەریوەبەری نوسینگەی سەرکۆمار بو | وەزیری پەروەردەو ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بو | وەزیری پیشەسازیو ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بو |
| پیشەیی ئاسایی | حیزبی |  |  |  |  |
| پەیوەندی حیزبی | بەعسییەکی هەڵکەوتو، ئەندامی سەرکردایەتی قوتری بو | بەعسی بو | بەعسیو ئەندامی سەرکردایەتی قوتری بو | بەعسیو ئەندامی سەرکردایەتی قوتری بو | بەعسی بو |